**ناوی کتێب: فەرهەنگی کوردیی هەرمان (بەرگی یەکەم)**

- دانەر: عەلی نانەوازادە
- نەخشەسازی ناوەوە: طــە حسین
- بەرگ: محمد قادر
- سەرپەرشتی چاپ: هێمن نەجات
- چاپ: چاپی دووەم ٢٠٠٥
- ژمارەی سپاردن: (٣٢٣)
- تیراژ: (٧٥٠) دانە
- نرخ: (٥٠٠٠) دینار
- چاپخانە: چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە

زنجیرەی کتێب - ٢٧ - (١٣٠)

**ناونیشان**

**دەزگای چاپ و بلاوکردنەوەی موکریانی**

**هەولێر - پشت رۆژنامەی خەبات**

**پۆستی ئەلکترۆنی:** **asokareem@maktoob.com**

**ژمارەی تەلەفۆن:** 2260311

www.mukiryani.com



پێشکەشە بە هەرمان
کە ئەم و ئەو پێکەوە
گووران.

## چارەنووس

چارەنووس
نە ئەو سێوەیە لە بان سەری کوڕ
و
نە ئەو تیرەی کەوانی من.

چارەنووسی من
قورسایی سێوێکە لە بان سەرم؛
تیژایی تیرێکە لە سەر دڵم
و
دەستی لەرزۆکی کوڕم.

**ستۆکهۆڵم** ٩٤/١١/١٥



هەر زوو لێر و لەوێ، لە دێهات و لە نێو پیر و پیرێژنان هەرکات وشەیەکم دەبیست کە پێشتر نەمبیستبوو دەمقۆزتەوە و لە دەفتەرێکی بچکۆڵە دا دەمنووسیەوە و لە دواییش دەمکردە پەڕاوێزی ئەو فەرهەنگانەی کە هەمبوون هەتا دوارۆژ وەک ئامرازێک بۆ نووسینەکانی خۆم کەلکی لێوەرگرم. ئەوەی کە قەت پێمانەبوو بیکەم نووسینی فەرهەنگێک بوو. کارێک کە بە کاری خۆم نەدەزانی و چاوەڕوان بووم نەگبەتێک دانیشێ و تەمەنی دوور و درێژی بۆ تەرخان بکا. قەت پێمانەبوو کە ئەم نەگبەتە بۆ خۆم دەبم و هەر لە یەکەم رۆژی ئاوارەییم لە بەهەشتی بەرین و درۆیین و بێ دەرک و دەروازەی رۆژاوا، کە هەر کار و پووڵ و پارە و رابواردنە، دەست لە کار و دەرس هەڵدەگرم و دەگەڕێمەوە چەند سەدە لەمەوبەر و دەبمە چلەنشین و دە خەڵوە دا خۆم دەبەستمەوە و فێری ژیانی دەروێشانە و قەناعەت و کەم خواردن دەبم.

بە داخەوە ئەم کارە لێمبوو بە دۆڵپاکەی سەلیم جەوهەری و لینگی لێکردمە تۆق و زنجیر و بە خۆیەوە بەستمەوە و نەیهێشت وە دوای شێعر و شاعیری و چیرۆکنووسی خۆم کەوم و جگە لە خۆشی تووشی دوو سێ وردە دوای دیکەی فەرهەنگ و وشەشی کردم.

بە هەر حاڵ واهات و واش دەڕوا و ئەمەش بەرگی یەکەمی ئەم فەرهەنگە و واش نیە کە هێشتا خلاسیم هاتبێ و دۆڵپا دەستی لێهەگرتبێم و واش وێدەچێ هەتا دوایی ژیانیشم هەروا لە سەر شانم دەبێ.





# پێشەکی

زمان ئەندامێکی کارا و گرینگە لە پێوەندی هەمەلایەنەی کۆمەڵایەتی نێوان خەڵک دا. رادیۆ، تەلەویزیۆن، رۆژنامە، وتووێژ، دەرس، مەعامله و کەسب و کار و .... سەرلەبەیانی هەر چاو کراوە، زمان دەگەڕێ و گوێ دەبیسێ و چاو دەخوێنێتەوە. مێشک وەک کامپیۆتێر وەکار دەکەوێ. پێداویستییەکانی ژیان دەبنە وشە و رستە. ئاشکرایە نیاز و پێداویستی مرۆڤ لە ژیانی ئەمڕۆیی گەلان دا گۆڕاوە و رۆژ دەگەڵ رۆژیش دەگۆڕدرێ. ئەو نیازە تازانە وشەی تازەشیان بە دواوەیە و زۆر زوو ئەم وشە میوانانە دەبنە خانەخوێ و جێی خۆیان خۆش دەکەن و ئەگەر جێگەش تەنگ بوو لەوانەیە وشەگەلێک وەدەرنێن و خۆیان بە ئەرخەیانی پاڵ دەنەوە. لە ژیانی ئەمڕۆیی کوردستان دا ئەگەر چاوێک بە دەوروبەری خۆمان دا بگێڕین، لە زۆربەی ماڵەکان دا کەرەسەی وا دەبینین کە بیست سی ساڵ لەمەوبەر نەبوون و لەوانەیە ئەگەر باسیشت کردبا باوەڕیان پێنەکردبای. فاکس، ویدیۆ، سەماوەری بەرقی، کامپیۆتێر، کۆمباین، ئانتێن، بانک ... و سەدان وشەی لاوکی کە لە لاوە هاتوون و لە زمانی کوردیی میوان کراون، لە وتوێژی ئاسایی نێوخەڵک، لە بازاڕ، لە فێرگە و لە هەر شوێنێک، ئەم وشە میوانانە بە بێ پرینگانەوەی وێژەر و بێ نێوچاوان تێکنانی بیسەر، دەکوترێن و دەبیسرێن. باسی پاساژی تازەسازکراو، ماشێن پارک کردن، گەڕان لە پارکی شار، شاڵواری لی، ئامپێر، وات، ئۆرانیۆم، نەخۆشی وەک ئانژین و ئیدز و ... ئاشکرایە ئەم وشانە جێ بە هەندێک وشە لەق دەکەن و هی واشە هەر بە تەواوی ئاسەواری دەبڕێتەوە.

چ هاتنی ئەم وشانە بۆ نێو زمانی کوردیی و چ فەوتانی هەندێک وشە مەترسییەکی بۆ سەر زمانی کوردیی نیە، ئەوە رەوتی هەڵدان و بەرەو پێش چوونی ئاسایی هەر زمانێکە. لاوێکی کە ئێستا لە زانستگا دەرس دەخوێنێ بۆ دەربڕینی هەست و ویستی، پێویستی بە هەزاران وشەی تازە هەیە کە لاوێکی پەنجا ساڵ لەمەوبەر هەر گوێشی پێی نەدەبزووت. دوای هاتنی کۆمباین دەیان وشە کە پێوەندییان بە دروێنەوە هەبوو کەوتنە ئاویلکە دان و فەوتان و بارگەیان بەرەو وڵاتی

فەرهەنگ تێکەوەپێچا و لەو هەزارپیشەیە دا چاوەیەکیان بۆ خۆیان ئاوەدان کردەوە هەتا رۆژ و رۆژگارێک کەسێک لاپەڕیان هەڵداتەوە و بە سەریان کاتەوە. لەم دونیا پان و بەرین و پڕکارەساتە دا چ وڵاتێک دەتوانێ مەرزەکانی خۆی ببەستێ و تەواوی پێداویستییەکانی خۆی بۆ خۆی ساز بکا.

کاتێک لە رووسیە سەر و زمانم کراوە، پێموابوو زمانی رووسیی زمانێکی زۆر دەوڵەمەندە و زۆربەی وشەکانی هی خۆیەتی و هەر چیم دەبیست بە رووسییم وەردەگرت و بە رووسییم دادەنا، هەتا لە ماڵی ناسیاوێک چاوم بە فەرهەنگی وشەکانی لاوەکی نێو زمانی رووسیی کەوت کە ئەستوورایيەکەی هەر بە قەرا فەرهەنگەکەی خۆیان دەبوو. لە سوید دیتم کە پتر لە نیوەی وشەکانی زمانەکەیان لاوەکییە. فارسی ئەگەر عەرەبی لێدەرباوێژی وەک مریشکی ئاوەڕووتی لێدێ، خودی عەرەبییش هەروەتر و ئینگلیسی لە هەموان خراپتر. جا کەوایە زمانی کوردیی نە چاوی لەوان رەشترە و نە دەشتوانی رەشتر بێ. ئیمڕۆ پێوەندی نێوان گەلەکان بە سانیە و دەقیقە سەردەگرترێ و سەردەمی کاڵە هەڵبەستن و سەفەری کەر و بارگین دوایی پێهاتوە و ئاڵوگۆڕیی و نیاز بەم ئاڵوگۆڕییانە دیواری سنوورەکانی بەزاندوە.

فەرهەنگ کتێبێکی سەرچاویی و مەرجەعە. ئەرکی سەرەکی فەرهەنگ ، یارمەتی دان و ناساندنی وشە و پێناسی وشەیە بە کەسێک کە شارەزایی تەواو یا هەر ناسیاوی دەگەڵ وشە یا وشەگەلێک نیە. کاتێک کەسێک لە کتێبێک یا لە زمانی کەسێکەوە وشەیەک دەبیسێ و مانای ئەم وشە نازانێ پەنا بۆ فەرهەنگ دەبا و فەرهەنگ وەک پشت و پەنایەک دەبێ دەستی بگرێ و داواکەی بۆ بە جێ بێنێ و ناسیاوی تەواو بدا بە خوێنەر. دیارە زمان دە نێو خۆی دا کۆمەڵێک زمانی هەیە کە تا رادەیەک لێک جیان، زمانی رۆژانەی خەڵک دەگەڵ زمانی ئەدەبی جیاوازی هەیە، زمانی فەلسەفە و زمانی شیمی و زمانی فیزیک لێک جیان و هەموو ئەوانەش لە سەر بنەڕەتی یەک زمان پێکدێن و فەرهەنگی هەموو ئەوانەش دە زمانێک دا دەتوانێ لێک جیا بن و هەرکامیان ببن بە فەرهەنگێکی سەربەخۆ.

لە فەرهەنگەکانی کوردیی دا بەداخەوە هەتا ئێستا چ گرینگایەتییەک بەم زمانانەی نێو زمانەوە نەدراون و خۆیان لە کۆمەڵێک وشە پاراستوە. فەرهەنگنووسەکان پتر هەوڵی فەرهەنگێکی پەتی کوردییان داوە و لە رێبازی سەرەکی فەرهەنگ نووسین دوور کەوتوونەوە. چوارچێوەی ئەم فەرهەنگەی بەردەستتان زمانی رۆژانەی خەڵک و ئەدەبیات و تا رادەیەک وشەکانی زانستین.

ئەم فەرهەنگە ئاکامی ورد بوونەوەیەکی پتر لە بیست ساڵانەیە لە وشەی کوردیی و کارێکە کە دوازدە ساڵ پێوەی خەریک بووم و هەوڵ دراوە کەموکووڕی فەرهەنگەکانی دیکە تا رادەی توانا چارەسەر بکا و تەواوی ئەو وشانەی کە دە زمانی کوردیی دا هەن چ بێگانە و چ خۆماڵی رێز و حورمەتی خۆیانی پێبدرێ و هەنگاوێک بێ بۆ عیلمی کردنی فەرهەنگنووسیی کوردیی.

بە داخەوە ئەم فەرهەنگە وەک هەموو کارەکانی دیکە کارێکی تاکە کەسییە و ئاشکراشە کە تاکە کەس ناتوانی لە هەموو بارەکانی زمان قووڵ بێتەوە و کەموکوڕیی یەکجار زۆرە و هیوادارم کە لە داهاتوو دەستی یارمەتیدەری بۆ درێژ بکرێ و کۆمەڵێک خۆی پێوە ماندوو بکەن و پەنادەرێکی باش بێ بۆ خوێنەر.

لە پێداچوونەوەی ئەم بەرگە دا کۆمەڵێک دۆست و برادەر یارمەتیان داوم کە زەحمەتەکەیان شیاوی سپاس و رێز لێگرتنە: عبدالرزاق فەیلی (فەیلی)، سیراونی جەلالی (هەورامی ـ لهۆن)، کاروان (خۆشناوەتی)، رێژنە محمد مجید (کۆیی)، کاوە عەلی (کۆیی)، بەناز عەلی (هەورامی ـ لهۆن). هەروەها کاک ناسری رەزازی (ئەردەڵانی) کە دۆستانە ئەرکی پێداچوونەوە و خۆ پێوە ماندوو کردنەکەی بەو پەڕی دڵسۆزییەوە وە ئەستۆ گرت. دەستیان خۆش و قالبیان هەر ساغ بێ.





## شێوەی کاری ئەم فەرهەنگە

١ـ وشەی سەرەکی گەورەتر نووسراوە و ئەگەر هاووێنە و هاوتای هەبێ بەڵام ریشەکەیان جیا بێ بە ژمارەی لاتینی کە لە سەرەوەی نووسراوە لێک جیا دەکرێنەوە.

وەک:

**ئاش**[1]

**ئاش**[2]

**هاسان**[1]

**هاسان**[2]

×××

٢ـ کەوانە ( ) کە دوای وشە دێ؛

**ئەلف:** بەشی رێزمانی وشەی بە کورتکراوی تێدا دەنووسرێ کە نیشانەکانی لە لاپەڕەی کورتکراوەکان دا نووسراوە.

وەک:

**جان**[1] (نا.)

**جان**[2] (ئان.)

**غەزرین** (چا. ل)

**ب:** چەشن و رەگەز و سەر بوونی هەندێک وشەی بە کورتکراوی تێدا دیاری کراوە

وەک:





**خاڵخاڵۆکە** (گیانـ.)
**پا**[1](ئا.)
**دارەبەن** (گیا.)

×××

٣ـ کرۆشە [ ] کە دوای کەوانە دێ بەشی ریشەی تێدا دیاری کراوە و لێرەش دا زمانەکان و زاراوەکان بە کورتکراوەیی نووسراون کە لە لاپەڕەی کورتکراوەکان نیشانەکانی دیاری کراوە.

**ئەلف:** ئەگەر وشەکە بێگانە و لاوەکی بێ تەنیا بە هێنانەوەی سەرچاوەکە کۆتایی پێدێ.

وەک:

**گاز**[4] (نا.)[فەر: gaz لە یون: chaos]
**جەزیرە** (نا.)[عەر: جزيرة]
**خاچ** (نا.)[ئەرم: خاچ]
**ئابوونە** (نا.)[فەر: abonne]

**ب:** ئەگەر وشەکە کوردیی بێ هاوڕیشەکانی لە کۆن دا بە پێی توانا و دەست پێڕاگەیشتن لە زمانەکانی وەک (هیندی کۆن، ئەوێستا، سانسکریت، هەخامەنشی، پەهلەوی، ...) نووسراون و هاوکات هاوڕیشەکانی لە زاراوەکانی کوردیی دا (باکووریی، ناوەندیی، باشووریی، هەورامی و زازایی) دەست نیشان کراون و هەندێک جاریش لە زمانەکانی دیکەی هیندوئوروپاییش وشەی هاوڕیشە دیاری کراوە.

وەک:

**با**[1] (نا.)[ئێک: ڤاتە ـ ئەو: ڤاتە ـ پاز: وات ـ پار: وەد ـ سوغ: وەت ـ خوار: واد ـ پەه: ڤات. باک: با، بای ـ ناو: باـ باش: وا، با، باد، باگ ـ هەو: وا ـ زا: ڤا]
**ژن**[1] (نا.)[هیک: جەنەی ـ ئەو: جەنەی، جێنەی، گێنا، غێنا، غنا ـ پەه: ژەن،





زەن. رووس: zhena. باک: ژن ـ ناو: ژن ـ باش: ژن ـ هەو: ژەنی ـ زا: جەنی، ژنی]

**ستان** (پاشگـ.)[هیک: ستهەنه ـ ئەو: ستانه ـ هەخ: ستانه ـ سان: ستهانه ـ پەھ: ستان. باک: ستان ـ ناو: ستان، سان ـ باش: سان ـ هەو: سان ـ زا: ستان]

**پ**: ئەگەر وشەکە لێکدراو بێ، تەنیا بەشە دابەش کراوەکانی دیاری دەکردرێ و ریشەکەی دەچێتەوە سەر ئەو بەشانەی کە بە دابەشکراویی نووسراون وەک:

**دارکونکەرە** (گیانـ.)[دار1 + کون + کەر3 + ئە]

**رازدار** (ئان. فا)[راز1 + دار2]

**ئاوسا** (ئان. ل)[ئاو3 + سا1]

**ت**: ئەگەر وشەکە سەر بە زاراوەیەکە و لە شوێنی بنەڕەتی و سەرەکی ریشەکەی نووسراوتەوە، تەنیا زاراوە یا بن زاراوەکە نیشان دەدرێ.

وەک

**بازد** (نا.)[موک]

**شیڤ**[1] (نا.)[باک]

**ئاتەر** (نا.)[هەو]

**بەیە** (گیانـ.)[زا]

**ج**: ئەگەر وشەکە سەرچاوە و ریشەکەی نەدیترابێتەوە و روون نەبووبێتەوە بە نیشانەی پرسیارێک دە نێوەکەی دا دیاری کراوە.

وەک:

**ئاشۆ**[1] (نا.)[؟][ئەر]

**بز**[1] (ئان.)[؟]

**پرووش**[2] (نا.)[؟]

**ئاتی** (نا.)[؟][باک]

×××





٤ـ دوای لێکدانەوەی ریشە بەشی مانا لێدانەوە دێ.

**ئەلف:** مانا و ماناکانی وشە دەنووسرێ و لە تەواوی هاوماناکانی لە هەموو زاراوەکانی کوردیی کەلک وەردەگرترێ.

وەک:

**ئاش**[1] (نا.)[ئەو: ئەشە ( ئارد)، ئەشن، ئەسەن ( بەرد) ـ هەخ: ئەسەن (بەرد) ـ بەل: هەش، ئاش. باک: ئاش ـ ناو: ئاش، ئاسیاو ـ باش: ئاسیاو ـ هەو: ئاش، ئاسیاو، ئاساو ـ زا: ئارەیە، ئاریە، ئارێ] ١ـ ئامرازی هاڕینی گەنم و دانەوێڵە بۆ ئارد کردن کە لە دوو بەردی خڕی گەورە(بەرداش) پێک هاتوە. ئەم دوو بەردە لە سەر یەکن، ئەوەی بنەوە قایم کراوە و ئەوەی سەرەوە بە هێزێکی وەک ئاو، با یا مەکینە دەگەڕێ و دانەوێڵە دەهاڕێ و بە پێی ئەو هێزەی کە دەیگەڕێنێ چەند جۆری هەیە. ٢ـ ئەو شوێن وجێگایەی کەم ئەم دەزگایەی تێدا دامەزراوە. ٣ـ (ئا.)[باک] ئەندامێکی ماسوولکەیی و بە هێزی باڵندە دانەخۆرەکانە کە دوای چیکڵدانە و بەر لە گەدە هەڵکەوتوە و کاری هاڕینی دانی خوراوە، سیکەتۆرە.

**بەرداش** (نا. ل)[بەرد + ئاش1] بەردێکی خڕی گەورەیە کە تایبەت بۆ ئاش دەیتاشن. ئاش لە دوو بەرداش پێک دێ کە بەرداشی بنەوە نابزوێ و ئەوەی سەرەوە دەگەڕێ و دانەوێڵە دەهاڕێ، کەڤری ئاشی، بەردەهاڕ، بەراش، ئارسی.

**شاخ** (نا.)[پەه: شاک، شاخ. باک: شاخ ـ ناو: شاخ ـ هەو: شاخ ـ زا: شاخ] ١ـ زەقایی رەقی سەری هەندێک گیانداری وەک بەران، بزن، ئاسکە کێوی و .... ٢ـ لقی دار. ٣ـ بارووت دانی راوچی (لە بەر ئەوە کە لە شاخی حەیوان ساز کراوە). ٤ـ کێو، چیا. ٥ـ چیای بەردین. ٦ـ رەوەزە بەردیک بە چیاوە.

**ب:** ئەگەر وشەکە لە شوێنێک مانا کراوەتەوە و ماناکە لێکدراوەتەوە، دیسان مانا ناکرێتەوە و دەنووسرێ کە بڕوانێتە وشەی دیاری کراو کە بە کورتکراوەی « بڕ: » نیشان دەدرێ

وەک:

**ئارسی** (نا. ل)[ئار7 + سی (سەنگ)][زا] بڕ: بەرداش.

**جان**[1] (نا.)[باک ـ زا] بڕ: گیان

**خاڵەڕەشە** (گیا.)[خاڵ2 + ئە + رەش + ئە] بڕ: بارێزە / ٢
**هێڵە** (نا.)[هەو] بڕ: هێلکە

**پ:** لەم بەشە دا لە کاتی پێویست وێنە بۆ وشە دەهێنرێتەوە کە بە « :: » نیشان دەدرێ. لە وێنە هێنانەوەش دوو مەبەست لە بەر چاو گیراوە. ١ـ چلۆنایەتی دەربڕین و کار پێکردنی وشە لە رستە دا. ٢ـ سەلماندن و نیشان دانی هەبوونی ئەم وشەیە لە زمانی کوردیی دا.

وەک:

**ئاونشین** (ئان. فا)[ئاو3 + نشین] کەسێک کە دەگەڵ کەسی دیکە هاتوچۆ و هەڵسوکەوتی هەیە، هاودەم، هاونشین. :: میرسێوەدین بەگ پیاوێکە هەمیشە ئاونشینە بە دەوڵەتی تورکان و بە سوڵتانی / ئەوە لە دەرکی والی موسڵێ دادەبەزی بە میوانی (سەعید و میرسێوەدین ل ٩٢).

**ستان** (پاشگـ.)[هیک: ستهەنە ـ ئەو: ستانە ـ هەخ: ستانە ـ سان: ستهانە ـ پەه: ستان. باک: ستان ـ ناو: ستان، سان ـ باش: سان ـ هەو: سان ـ زا: ستان] ١ـ پاشگری جێ و شوێنە. **ئەلف:** نیشاندەری زۆری و فرە بوونە. :: گۆڕستان، گوڵستان، بێستان، دارستان. **ب:** جێ و شوێنی ژیانی گەل و نەتەوەیەک نیشان دەدا. :: کوردستان، لۆڕستان، عەڕەبستان، هیندوستان. ٢ـ پاشگری کات و زەمانە. :: زستان، تاوسان.

**بلام** (نا. ل)[بل (بەر) + ئام] قایشێکە لە تەنگەی ئەسپی سەرکێشەوە لە لغاو قایم دەکرێ بۆ ئەوە کە ئەسپ سەری هەڵناوێ یا سوار هەڵنەگرێ، بلاو. :: هیوای بەختەوەری ئەهات زیاد بێ بەڵام دێوەزمەی شەڕ / بە چوارناڵ ئەوە وەک ئەسپی سەرکێشی بێ بلام دێ (هێدی ل ٣٨١).

×××

٥ـ دوا بە دوای مانای وشە، چاوگی لێکدراو کە لەم وشەیە پێک دێ (یا زاراوە و کینایەیەک کە لەم وشەیە ساز دەبێ) وەک بەشێکی نەپساوە و لکاو بە وشە دێ. بە پێی لێکدانەوەی من وەها چاوگێک دەبێ لە بن وشەکان بنووسرێ و وەک

وشەیەکی سەربەخۆ دیاری ناکردرێن. ~ نیشانەی دووپاتە بوونەوەی وشەیەکە کە دەگەڵ چاوگ دێ.

وەک:

**پشتیوانی** (حم.)[پشتیوان + ئی] یارمەتی، کۆمەک، یاریدە، پشتگری، لاگری. ~ **کردن:** لاگری لە کەسێک کردن، پشتی کەسێک گرتن و یارمەتی دانی، پشتیوانی لێکردن. ~ **لێکردن:** بڕ: پشتیوانی کردن.

**بەرماڵ** (نا. ل)[بەر3 + ماڵ1] ١ـ دوو تەختە کوێنی گەورەیە کە بە بەر رەشماڵ و تاوڵیوە دەگرن هەتا بەری با و باران بگرێ. ٢ـ جاجمێکی گەورەیە کە پێخەفی تێوە دەپێچن. ٣ـ تەنراوێکی هەندێک چووکە کە پاک و خاوێن رادەگیرێ و نوێژی لە سەر دەکەن، دووگرد، جانماز. ~ **لە سەر ئاو گەڕان:** (کنـ.) زۆر نوێژ کردن و موسڵمانی چاک و خاوەن کەرامەت بوون، پیرۆز بوون.

**ئاوەکی**[2] (ئان. ل)[ئاو + ئەک + ئی] هەڵبڕانی مەڕ و ماڵات لە ران و چوونە نێو رانی دیکەوە. ~ **بوون:** تەرە بوون و تێکەڵ بوونی سەرێک یا چەند سەر مەڕ و ماڵات و چوونە نێو مێگەل و رانی دیکەوە، ئاوەکی کەوتن. ~ **کەوتن:** بڕ: ئاوەکی بوون.

**بۆڕ**[1] (نا.)[بڕ: بۆر1] ١ـ بەزیو لە شێعر و دمەقاڵە. ٢ـ (ئان)[زا] بڕ: بۆر 1. ~ **خواردن:** تێک شکان و بەزین لە شێعرشێعرێن و دمەقاڵە دا. ~ **دان:** بەزاندنی غەنیم لە شێعر و دمەقاڵە دا.

×××

٦ـ لەم بەشە ئەگەر وشەکە ناوی لێکدراو بە پیتی « ئی » ساز بکا دێ، کە بە || دیاری دەکردرێ. بە بڕوای من ئەم وشە لێکدراوانەش لە وشەی سەرەکی جیا نین و دەبێ لە بن وشەکە بنووسرێن و شیاوی باسیشە کە هیچ فەرهەنگێکی کوردیی ئەم وشانەی لەبەر چاو نەگرتوە لە حاڵێک دا کە دەورێکی زۆر گرینگ لە زمان و ئەدەبی کوردیی دا دەگێڕن و گەلێک مانای دیکە ساز دەکەن.

وەک:

**ئارام** (نا. ل)[ئا13 + رام][ئەو: رەم ـ پەه: رام، ئارەم ـ سان: رامەیەتی.





باک: ئارام ـ ناو: ئارام ـ باش: ئارام ـ هەو: ئارام] ١ـ ئۆقـره، حـەجـمين، برست، توانا. ⁘ ئەو ژانە سەرە ئارامی لێبڕیوم. ٢ـ هێدی و هێمن، لەسەرەخۆ. ⁘ هەتا خودا حەز دەکا پیاوێکی ئارام و لەسەرەخۆیە. ٣ـ بێدەنگ و بێ قرە، ئەهوەن. ⁘ کوێستان شوێنێکی ئارام و خۆشە. ٤ـ (ئاک.) یەواش، سەبر، بە ئەسپایی، ئارام ئارام. ⁘ ئارام بە رێگایە دا دەڕۆیشت. **ئارام ئارام:** وردەوردە، بە سـەبرا، لە سەرەخۆ. ⁘ ئارام ئارام بە لۆژەلۆژ / ئەوا بەرەو مـاڵ بوومەوە (ناڵەی جودایی ل ٣٠). **~ بوون:** ١ـ بێدەنگ بوون، ئارام گرتن، جووڵە نەکردنی گیاندار و بێ گیان، هەدادان. ⁘ رۆڵە تاوێک ئارام بە بزانین دونیا چ باسە! دونیا ئارام بوو کە حەمە وەدەرکـەوت. هات و هاوار بڕانەوە و هەمـوو ئارام بوون. ٢ـ هێدی بوون و کـەم بوونەوەی ئێش و ژان. ⁘ ئێستا باشترم ژانەکە هەندێک ئارام بوە. **~ بوونەوە:** ١ـ ژێر بوونەوە، ئۆقـره گـرتن، ئارام بوون. ⁘ دوای تاوێک منداڵەکـە ئارام بۆوە و دانیشت. ٢ـ دامرکـانی ئێش و ژان. ٣ـ بێـدەنگ بوونی ئاژاوە و هات و هاواری خـەڵک. **~ گرتن:** ئارام بوون، ئارام بوونەوە، حـەجـمين، هەدادان، داسەکنین، داکاسان. **~ لێبڕان:** ئۆقرە لێبڕان، ئارام لێهەڵگیران، حەجمین لێبڕان بە هۆی ئازار و دەرد و خەم، ئارام و قـەرار لێبڕان، ئارا و قـارا لێبڕان. ⁘ لەوەتی ددانم دێشێ شەوانە ئارامم لێبڕاوە. لە داخ ئەو کورەم ئارامم لێبڕاوە. **~ لێبڕین:** تێک دانی حەسانەوەی خەڵک، تێک چوونی هێمنایەتی، ئارام و قەرار لێبڕین، ئارا و قارا لێبڕین. **~ لێهەڵگرتن :** ئارام لێبڕین، ئارام و قـەرار لێهـەڵگرتن، ئارا و قـارا لێهـەڵگرتن. **~ لێهەڵگیران:** بڕ: ئارام لێبڕان. || **ئارامی دڵ:** ١ـ ئەو کەسـەی کە بوونی هۆی ئارام بوونەوە و ئەرخەیانی دڵە، کەسی خۆشەویست، منداڵ. ٢ـ (کنـ.) گراوی، یار، حەز. & ئارامی دڵان، ئارامی رووح، ئارامی گیان. ⁘ لە لایەک ئارامی دڵم بە عومری تۆ لە بەر چاوم هەڵگیراوە / لە لایەک دوژمنایەتی حەوت هەزار سوار پێی دە دەرکم ناوە (سەعید و میرسێوەدین ل ٨٦). ئەرێ خـەندەی دەمت ئارامی دڵ کانی حەیاتی من / لە سەر چی زیز دەبی؟ رووحت دەوێ؟ هانێ حەیاتی من (وەفایی ل ٩٠). **ئارامی دڵان:** بڕ: ئارامی دڵ. ⁘ فیدای گیانت بم ئارامی دڵان / بۆ دەکەی زاری و واوەیلا و گریان (بارام و گوڵندام ل ٩٥). مەڵێن بولبول مەناڵێنە کەوا گوڵ گوڵشەنی چۆڵ کرد / دڵارامی نەما چ بکا کە ئارامی دڵان رۆیی (وەفایی ل ٢٠٧). **ئارامی رووح:** بڕ: ئارامی دڵ. ⁘ بەبێ تۆ قـەت نەژیم، شـادیم نەمێنێ، دیدە بێ نوور بم / دەمێک ئارامی رووحم بە، حەیاتم، عومرەکەم، چاوم (وەفایی ل ٧٠). **ئارامی گیان:** بڕ: ئارامی دڵ. ⁘ ئیمامیش با بە دووی دا هەر بکا زاری هەتا ماوە / بە

زاری بانگی هاوالآن بکا، ئارامی گیان رۆیی (ئاوات ل ١١٣).

**تەپڵ** (نا.)[عەر: طبل] ١ـ ئامرازێکی مۆسیقایە، لە دەفرێکی نێو بۆش، کە لایەکی پێستێکی خۆش کراوی ناسکی لێدەدەن و بە دەست یا دار تەپەی لێدێ. لە کوردەواری دا پتر بۆ داوەت دەگەڵ تووزەلە و نای کەلکی لێوەردەگرن. ٢ـ (نا.) بەشێک لە کەللە کە دەکەوێتە نێوان پێشەسەر و پاشەسەر، تەپڵەسەر. **~ کوتان:** بڕ: تەپڵ لێدان. **~ لێدان:** دەنگ دەهێنان بە پێی هەوای مۆسیقا لە تەپڵ، تەپڵ کوتان. || **تەپڵی باز:** تەپڵێکی چووکەیە کە لە راو دا دەیکوتن هەتا مەل و باڵندە پێی هەڵفڕن و لە دوایی بازی تێبەردەن. :: سولْتان دەکاتن نازێ / بدەن لە تەپڵی بازێ / هات و گەییە سیوازێ (مان ل ٢٢). **تەپڵی بێعاری:** بێشەرمی و بێعەیایی ئاشکرا. * **تەپڵی بێعاری کوتان:** بێشەرمی کردن بە ئاشکرایی. **تەپڵی دڕاو:** (کنـ.) کەسی بێ رێز، بێ نرخ. **تەپڵی زڕاو:** (کنـ.) کەسێک کە نەنگ و خراپەکەی ئاشکرا بووبێ و بڵاو بووبێتەوە. **تەپڵی سەر:** بڕ: تەپڵەسەر. **تەپڵی شادمانی:** تەپڵی سەرکەوتن لە شەڕ دا. * **تەپڵی شادمانی لێدان:** بەرز کردنەوەی دەنگی تەپڵ لە شەڕ دا بە بۆنەی سەرکەوتن. :: بە قۆچ عوسمانی گوت: قوربان ئەمن دەرەقەتیان نایەم، تەپڵی شادمانی لەم لا لێدەدرێ و تەپڵی شادمانی لەو لا لێدەردێ، بەراستی ئەمن هەڵدێم (بەیتی سەعید و میرسێوەدین. سروە ژ ٧٥ ل٣٣). **تەپڵی گۆش:** بڕ: پەردەی گوێ. **تەپڵی گوێ:** بڕ: پەردەی گوێ. **تەپڵی نابوودی:** تێداچوون لە باری مادی و ئابوورییەوە. * **تەپڵی نابوودی لێدان:** راگەیاندنی تێداچوون لە باری مادی و ئابوورییەوە. **تەپڵی ئەمان:** تەسلیم، ئەمان. ***تەپڵی ئەمان لێدان:** تەسلیم بوون و ئەمان خواستن، راگەیاندنی تەسلیم و ئەمان. :: لە بەر تۆ چارەنووسی شووم و بەدفەڕ / ئەوەی قەت لێی نەدەم تەپڵی ئەمانە (تاریک و روون ل ١٥٦).

**سەرو** (نا.)[پەهـ: سەرڤ، سەرب. باک: سەلوی، سەروی ـ ناو: سەرو، سەوڵ، سەور، سەلو ـ هەو: سەوڵ] ١ـ دارێکی خۆڕسکە، گەڵاکانی تیژ و باریکن، هەتا ٢٥ میتر هەڵدەدا و قەفی دەگاتە دوو میتر، چێوەکەی سپی، یا زەردە و زۆر بە بایەخ و سەختە، بەرەکەی وەک بەری دارکاژ دەچێ بەڵام زۆر چووکەترە، ئەم دارە لە ناوچەی کوێستانی شین دەبێ و لە زستان دا گەڵاکانی ناوەڕێ و هەمیشە سەوزە، ناوی لاتینی ئەم Cupressus horizontalis, Cupressus sempervirens دارەن. ٢ـ (کنـ.) یار و گراوی بەژن و باڵا جوان. :: ئەوەندەم لەو قەد و باڵایە ئاشووب و بەڵا دیوە / لە سەیری سەروی باغم غایلەی غوولی بیابانە (مەحوی ل ٢٧٩). || **سەرووی ئازاد:** ١ـ سەرو. ٢ـ (کنـ.) بەژن و باڵای یار. :: سەرووی ئازادیش

لەبار و دڵکەش و بەرزە بەڵام / گیانەکەم من شێت و شەیدای لار و لەنجەی ئەم قەدەم (ناڵەی جودایی ل ٣٧). **سەروی جۆبار**: ١- سەروێکی لە پەنا ئاو و جۆبار رسکابێ. ٢- (کنـ.) قامەتی یار. & سەروی جۆیبار. :: خاڵی رووت داخی دڵی زامار و بیماری منە/ روومەتت گوڵ، قامەتی تۆ سەروی جۆیاری منە (ئەحمەد موختار ل ١٥٨). **سەروی جوێبار**: بڕ: سەروی جۆبار. :: عەزیزم رووحی شیرینم لە من بۆچی کەناری تۆ / وەرە سەر هەردوو چاوی من کە سەروی جۆیباری تۆ (وەفایی ل ١١٠). کە قامەتی بە دەر ئەخا قیامەت ئاشکار ئەکا / چ قامەتێ بە راستی لە سەروی جۆیبار ئەکا (بێخود ل ٣). **سەروی چەمەن**: بڕ: سەروی ناز. :: سەری زولفت چیە؟ عومری درێژم، تووتی ئامالم / قەدی بەرزت چیە؟ سەروی چەمەن، رووحی رەوانی من (وەفایی ل ٩٣) **سەروی خەرامان**: (کنـ.) گراوی بەژن و باڵا جوان و خۆشڕەوت. :: بە ئازادی لە کن خۆ شوهرەیە من مات و حەیرانم / گوڵ و نارنجی بەر هێناوە خۆ سەروی خەرامانت (وەفایی ل ٢٨) دڵی زاهید بە جارێ بۆ نەبێتە بولبول و قومری / لە لایەک گوڵ، لە لایەک جیلوەیی سەروی خەرامەنە (بێخود ل ٨٩). **سەروی رەوان**: (کنـ.) ١- بەژن و باڵای یار و گراوی ٢- گراوی بەژن و باڵا جوان. :: قومری وەرە هەرتا دەمرین پێکەوە بگرین / تۆ سەروی رەوانت چوە من رووح و رەوانم (وەفایی). دێت و رادەبرێ وەکوو سەروی رەوان من چ بکەم / کە بە قوربانی نەکەم رووح و رەوان من چ بکەم (هێمن) **سەروی سەهی**: ١- سەروێکی کە راست رسکابێ. ٢- (کنـ.) بەژن و باڵای بەرزی گراوی. :: هەموو سەروی سەهی سەریان نەوی کرد، باغەوان رۆیی / گوڵیش وا خۆی رنی، لایێ خەزان لایێ لە خۆ دانە (ئاوات ل ١١١). وەک بولبول، ئەی تازەگوڵم، پڕ بە دڵمە شەوق / وەک قومری، ئەی تۆ سەروی سەهی، پڕ بە ملمە تەوق (مەحوی ل ١٨٣). **سەروی کشمیری**: سەروی ناوچەی کشمیر، سەروی رێک و پێک و راست. :: پەرێشان زولفی تاتاری میساڵی ئەژدیهای جەنگی / نەزیری سەروی کشمیری قیامەت قامەتی شەنگی (حاجی قادر ل ١٤٩). **سەروی کێوی**: جۆرێک لە جۆرەکانی سەرو juniperus، مەرخ، وەرس، عەرعەر. **سەروی مەوزوون**: (کنـ.) یار و گراوی باڵا بەرز و رێک و پێک. :: خەرامی ناز ئەگەر هێنایە لەنجە سەروی مەوزوونت / وەکوو لەیلا، لە سەر رێ پرسشێ کە حاڵی مەجنوونت (مەحوی ل ٧٤). وەرە سەیری خیابان و بەیازی دەفتەری نالی / کە سەف سەف، مەسرەعی بەرجەستە ریزی سەروی مەوزوونە (نالی ل ٥٢٣). **سەروی ناز**: ١- جۆرێک سەروی بڵند و رێک و جوانە کە لە ماڵان دەچەقێندرێ، Cupressus fastigata ناوی لاتینی ئەم سەرووەیە. ٢- (کنـ.) گراوی باڵابەرز و

نازدار. بە غەمزەی نازەوە ئەو سەروی نازە کەی چوە گوڵشەن / کە نێرگس وا بوە چاوی سپی، سەروی بوە تۆپاڵ (مەحوی ل ٢٠٣) & سەروی چەمەن. **سەروی نازدار:** (کن.) یاری باڵابەرزی و بە ناز و غەمزە. :: ئەتۆ سەروێکی نازداری، ئەتۆ شۆخێکی گوڵزاری / بە دڵ وا چاکە بتگێرم، لە سەر چاوان، لە سەر دەستان (وەفایی ل ٨٦)

**دێو**[1] (نا.)[هیک: دێڤە ـ ئەو: دەئێڤا ـ سان: دێڤە ـ پەه: دێڤ. باک: دێڤ ـ ناو: دێو ـ هەو: دێو ـ زا: دێو، دێڤ، دێب] ١ـ گیانلەبەرێکی خەیاڵی مەزنە، بیچمی وەک مرۆڤە، ناحەز و کرێتە، دوو شاخی لە سەرە و کلکی هەیە. ٢ـ (کن.) مرۆی زەلام. ٣ـ (کن.) مرۆی زۆرخۆر. ٤ـ (مج.) هەر شتێکی لە چاو هاوشتی ئاسایی خۆی گەورەتر بێ. ٥ـ (کن.) مرۆڤی بێ هەست، لە مرۆڤایەتی بە دوور. || **دێوی سپی:** ١ـ دێوێکی نێو چیرۆکانە. ٢ـ (کن.) زستان. :: زستانە، بەفرە، حەشرە، وڵات پڕ لە ناڵەناڵ / دێوی سپی بە قینەوە هات، بۆتە پیرەزاڵ (ئاوات ل ١٤٨). **دێوی دەروون:** نەوس، رووحی خراپ لە نێو مرۆڤ دا.

×××

٧ـ دواین بەش تێبینییە سەبارەت بە وشە، ئەگەر هەست بە پێویستی یا کەم و کوڕی یا لێکدانەوەیەکی پتر سەبارەت بە وشە بکردرێ.

وەک:

**پاڵان** (نا.)[پەش: پالانە ـ بەل: پالام ـ فار: پالان. باک: پالان ـ ناو: پاڵان] بەرگێکی نێواخن کراو لە کایە، کە لە سەر پشتی کەر و بارگین و حەیوانی بارەبەر دادەنێن هەتا پشتی بریندار نەبێ، کورتان، کۆپان. **~ کردن:** پاڵان لە سەر پشتی بارەبەر دانان. || **پاڵانی قەجەری:** جۆرە پاڵانێک چووکتر و رێک و پێکتر کە وەک زین کەلکی لێوەردەگرن، کۆپانی قەجەری.

**تێبینی:** دوکتور مەحەممەدی موعین وشەی پاڵانی بردۆتەوە سەر چاوگی پاڵاوتن (بڕ: برهان قاطع ب ١ ل٣٥٧). پێمواپە دوکتور بە هەڵە بۆی چوە. پاڵان لە پەهلووک ـ ی پەهلەوی بە مانای پاڵ ـ ی کووردی کەوتوە، پاڵانچە لە کوردیی دا بە مانای ماسوولکەی تیغەرەی پشت یا ئەو تیسکە خورپەیە کە لە سەر پشتی بەران بۆ جوانی دەیهێڵنەوە و ئەوەش رایەکە بە قەوەتتر دەکا کە پاڵان شتێکە کە لە سەر پاڵ

یا تەنیشت دەبەسترێ و چ پەیوەندی بە پاڵاوتنەوە نیە.

**ئاسەوار** (نا. ل)[ ئاس + ئە + وار] ١ـ نیشانە و پێناسی ماددی لە نەتەوە یا عەشیرەتێک یا گیاندارێک وەک بەڵگەی بوونیان، شوێنەوار. :: هێشتا هیچ بەڵگەیەک لە ئاسەواری مادەکان نەدیتراوەتەوە. ٢ـ رەگەز، بەرە. ~ **برانەوە:** بنەبڕ کرانی رەگەز و بەرەی کەس یا گیاندار. :: شوکور ئەسپێ ئاسەواری براوەتەوە. ~ **برین:** بنەبڕ کردن و فەوتاندنی بە تەواوەتی کەسێک یا گیاندارێک. :: مەغوولەکان ئاسەواری گەلێک بنەماڵە و نەتەوەیان بڕی. ~ **مانەوە:** نەبڕانەوەی رەگەز و بەرەی کەس یا گیاندار. :: گەلێک نەتەوە لە مێژوو دا هەبوون کە فەوتاون بەڵام ئاسەواریان هەر ماوە. کابرا دەمێک ساڵە مردوە ئێستا ئاسەواریشی نەماوە. ~ **نەهێشتن:** نەمانەوە و بڕانەوەی شت یا گیاندار یا کەس، ئاسەوارنەمانەوە. :: منداڵ ئاسەواری کشمیش و گوێزیان نەهێشت.

**تێبینی:** بەشی یەکەمی وشە یانی ئاس دەگەڵ [هیک: ئاسا āsā ـ ئەو: ئەسەه asah ـ سان: ئاسە āsa، بە مانای شوێن، جێگا و هەروەتر دەگەڵ چاوگی ئاه āh لە ئەوێستا دا و ئاس ās لە سانسکریت و وێدا دا بە مانای دانیشتن] هاوریشەیە . بەشی دووهەم یانی وار لە هیندی باستان و سانسکریتی ڤەرە vara و ئەوێستایی و پەهلەوی ڤەر var بە مانای شوێن و ناوچە کەوتەوە و وار و هەواریش هەر لەم ریشەن بە گشتی ئاسەوار دەبێتە جێی دانیشتن یا شوێنی ژیان.

**درنج** (نا.)[پەه: درووج] دێو.

**تێبینی:** لە پەهلەوی دا درنج [دێڤ درووج] بە مانای دێڵەدێوی درۆ هاتوە کە خودی وشەکە هاوریشەیە دەگەڵ درۆ. وشەی درنج لە کوردیی دا پتر دەگەڵ دێو دێ. :: دێو و درنج.

**بۆرانی** (نا. ل)[بۆران + ئی] چێشتێکە بە هێلکە، کوولەکە یا باینجانی سوور کراوە دەگەڵ ماستی خاو کراوە و گەرم سازی دەکەن و دەیخۆن، بۆرناش.

**تێبینی:** بۆران ناوی ژنێکە کە بۆ یەکەم جار ئەو چێشتەی ساز کردوە، هەندێک بردویانەتەوە سەر بۆران دوخت کچی خوسرەو پەرویز (القاموس ل ٨٦) و هەندێکیش بردوویانەتەوە سەر بۆران کچی حسن سهل (برهان ب ١ ل ٣١٥). هەروەها بۆران لە زمانی پەهلەوی دا وەک ناوی کچ هاتوە و لە وشەی بۆر1 کەوتوە.

## ریزی ئەلفوبێی ئەم فەرهەنگە

بە داخەوە زمانی کوردیی هەتا ئێستا خاوەن ئەلفوبێیەکی ڕێکوپێک و تایبەتی و ستاندارد نیە. هەر چەند زمانەوانان بۆ دانانی ئەلفوبێ بۆ نووسینی زمانی کوردیی زۆر شارەزایانە و بە جوانی ئەم ئەرکەیان بەڕێوە بردوە بەڵام کاری هەرە سەرەکیان وەپشت گوێ داوە و ریزی پیتەکانی کوردییان نەنوسیوە، ئەوەیە کە نووکە تووشی ئەم گرفتە هەین. ئاخۆ کورد چەند پیتی دەزمانەکەی دا هەیە و شوێنی تایبەتی هەر کام لە کوێیە؟ هەتا ئیمرۆ سەیری هەر فەرهەنگ و پێرستێک دەکەی دەبینی هەر کام لەو کەس یان کەسانە بە وێست و دڵخواز و سەلیقەی خۆیان ئەلفوبێیەکیان ریز کردوە و کەلکی لێوەردەگرن. گرفتی هەرە گەورە ئەوەیە کە هەمووی ئەوانە بە لاسایی لە ئەلفوبێی عەرەبی ئەو پیتانەیان لە دوای یەک نوسیوە، سەیر ئەوەشە کە لە کاتی ریز کردنی وشەکان ئەم تەرتیبەیان رەچاو نەکردوە.

خاڵ لە فەرهەنگەکەی دا پیتەکانی زمانی کوردیی بە ٢٧ دانە داناوە و ئاوای ریز کردوون:

ا، ب، پ، ت، ج، چ، ح، خ، د، ر، ز، ژ، س، ش، ع، غ، ف، ڤ، ق، ک، گ، ل، م، ن، و، ھ، ی

زەبیحی لە قامووسی زمانی کوردیی دا پیتەکانی زمانی کوردیی بە ٣٦ دانە داناوە و ئاوای ریز کردوە:

ء، ب، پ، ت، ج، چ، ح، خ، د، ر، ڕ، ز، ژ، س، ش، ع، غ، ف، ڤ، ق، ک، گ، ل، ڵ، م، ن، و، ھ، ی

هەژار لە هەنبانە بۆرینە دا ریزی پیتەکانی کوردیی بە ٣١ دانە داناوە و ئاوای نووسیوە:

ئـ، ب، پ، ت، ج، چ، ح، خ، د، ر، ڕ، ز، ژ، س، ش، ع، غ، ف، ڤ، ق، ک، گ، ل، ڵ، م، ن، و، ۆ، ھ، ی، ێ





هەر لە سەرەتای پەیدا بوونی خەتی فینیقی ـ کە ئێستاکە بە باوکی زۆربەی خەتەکانی دونیا دادەندرێ و خەتی کوردییش یەک لەوانە ـ نەیانتوانی گرفتی پیتەکانی بزوێن چارەسەر بکەن و لە رۆژهەڵات هەتا ئیمرۆ ئەم گرفتە جێبەجێ نەبوە (جگە لە کوردیی) و ئەمەیە کە دە زمانەکانی عەرەبی و فارسی دا لە سەر و ژێر و بۆر بۆ ئەم مەبەستە کەلک وەردەگرن. بەختەوەرانە کورد ئەم گرفتەی چارە سەر کرد و پیتەکانی بزوێنی هێنا نێو ئەلفوبێ و نووسینەوە و هەنگاوێکی زۆر شارەزایانەی لەم بابەتەوە هەڵگرت، بەڵام هەروەکی کوترا ریزی ئەلفوبێیەکەی دیاری نەکرد و هەر کەس بە پێی لاسایی کردنەوە لە عەرەبی یا فارسی کە پیتی بزوێنیان دە ریزی ئەلفوبێیەکەیان دا نیە، ریزێک دیاری دەکەن. من پێموایە کە بۆ ئەلفوبێی کوردیی پیویستە کە هەتا رادەیەک ئەم شیوازە بشکێنین .ئێمە کە بۆ ساز کردنی نوسین بە زمانی کوردیی ئەم رچەمان شکاند بۆ دەبێ ستانداردی ئەلفوبێیەکەش نەشکێنین؟

**ریزی ئەلفوبێی ئەم فەرهەنگە**

ئـا ـ ب ـ پ ـ ت ـ ج ـ چ ـ ح ـ خ ـ د ـ ر ـ ڕ ـ ز ـ ژ ـ س ـ ش ـ ع ـ غ ـ ف ـ
ڤ ـ ق ـ ک ـ گ ـ ل ـ ڵ ـ م ـ ن ـ و ـ ئو ـ ئۆ ـ ئوو ـ هـ ـ ئە ـ ی ـ ئی ـ ئێ





# سەرچاوەکان

## کوردی


القاموس الكردی الحديث، كردی ـ عربی، تاليف الاستاذ علی سيدو گورانی، طبع فی الشرق الاوسط ١٩٨٥، عمان، اردن (القاموس)

امثال و حكم كردی، گردآورنده قادر فتاح قاضی، انتشارات دانشگاه تبريز، تبريز خردادماه ١٣٦٤ (امثال و حكم)

بێستوون، فەرهەنگی سۆرانی ـ هەورامی، دانانی: حامید درودی، حاتەم مەنبەری، ستۆکهۆڵم ١٩٩٨

پایزە، ئەحمەد بەحری، چاپ ١٣٧٣ (پایزە)

پەندی پێشینان، محمدی خاڵ، چاپی دووهەم ١٩٧١ (پەند)

تاریک و روون، گوڵبژێرێک لە شێعرەکانی هێمن، لەبڵاوکراوەکانی بنکەی پێشەوا (تاریک و روون)

خەییام بە کوردی، وەرگێڕ هەژار، سروش تهران ١٣٧٠ (خەییام)

دمدم، عەرەب شەمۆ، وەرگێڕ شوکور مستەفا، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا ١٩٧٥ (دمدم)

دیوانی ئاوات (سەیید کامیلی ئیمامی زەنبیلی) لە سەر نووسین و ئامادە کردنی سەیید نەجمەدینی ئەنیسی، چاپخانەی مهارت تهران، چاپی اول، بهار ١٣٦٥ (ئاوات)

دیوانی بێخود، کۆ کردنەوە و رێکخستن و لە سەر نووسینی محمدی مەلا کریم، چاپخانەی سلمان الاعظمی بەغدا ١٩٧٠ (بێخود)

دیوانی بێسارانی، کیومەرس نیک رەفتار، بەرگی یەکەم (بێسارانی)

دیوانی حاجی قادری کۆیی، لێکۆڵینەوە و لێکدانەوەی سەردار حمید میران، کەریم مستەفا شارەزا پێداچوونەوەی مسعود محمد، لە چاپکراوەکانی ئەمینداریێتی رۆشنبیریی و لاوانی ناوچەی کوردستان، ١٩٨٦ (حاجی قادر)

دیوانی حەقیقی، انتشارات صلاح الدین ایوبی چاپ اول ١٣٦٧ (حەقیقی)

دیوانی گۆران، سەرجەمی بەرهەمی گۆران بەرگی یەکەم، محمدی مەلا کەریم، چاپخانەی کۆڕی زانیاری عێراق، بەغدا ١٩٨٠ (گۆران)
دیوانی مەحوی، مەلا عبدالکریمی مدرس و محمدی مەلا کریم ئینتشاراتی سەلاحەدینی ئەییوبی ١٣٦٧ (مەحوی)
دیوانی مەولەوی، مەلا عبدالکریمی مدرس انتشارات محمدی(سقز) ١٣٦٧ (مەولەوی)
دیوانی نالی، مەلا عبدالکریمی مدرس و ... چاپی دووهەم، انتشارات صلاح الدین ایوبی ١٣٦٤ (نالی)
دیوانی وەفایی، محمد علی قەرەداغی چاپی دووهەم کۆڕی زانیاری کورد١٩٨٤ (وەفایی)
دیوانی ئەحمەد موختار جاف، عیزەدین مستەفا رەسووڵ، چاپخانەی الادیب، بەغدا ١٩٨٦ (ئەحمەد موختار)
فۆلکلۆری هۆنراوەکانی کوردی، محمد کریم شریف، چاپی دووەم، لە چاپ دانەوە و زیاد کردنی سعدالله اسماعیل شێخانی، چاپخانەی الحوادث، بەغدا ١٩٨٦ (فۆلکلۆر)
فەرهەنگی خاڵ، شێخ محمدی خاڵ، ٣ بەرگ، کتابفروشی محمدی، سقز ١٣٦٧ (خاڵ)
فەرهەنگی کشت و کاڵ، معروف قەرەداغی مەردۆخی، ٢ بەرگ چاپخانەی دارالسلام بەغدا ١٩٧٢ (کشت و کاڵ)
فەرهەنگی کوردی رووسی، سۆرانی، ق. کوردۆ، ز. یوسف، مۆسکۆ، دەزگای چاپەمەنی زمانی رووسی، ١٩٨٣
فرهنگ مردوخ، کردی فارسی عربی، تالیف، شیخ محمد مردوخ کردستانی، ناشر غریقی سنندج، ٢ بەرگ (مەردووخ)
قامووسی زمانی کوردی، زەبیحی ٢ بەرگ (ء و ب)، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد بەغدا ١٩٧٩ (قامووس)
سروە، گوڤار، ئینشاراتی سەلاحەدینی ئەیووبی (ئەوەندە ژمارەی کە هەمبوون) (سروە)
سێسەد هۆنراوەی فۆلکلۆری کوردی. کۆ کردنەوە و ئامادە کردنی: س. ئی . شێخانی. چاپخانەی الحوادث، بەغدا ١٩٩٠ (سێسەد هۆنراوە)
کاروانی خەیاڵ. خالد حسامی (هێدی). چاپی دووهەم چاپخانەی زانکۆی

سەلاحەدین، بەهاری ۱۹۹۷، هەولێر (هێدی)
لاله به دهستان، هاشم نانەوازادەگان، سوێد کارلستاد، ۱۹۹۳ (لاله به دهستان)
منظومه کردی بهرام و گلندام، ضبط و ترجمه و توضیح از قادر فتاحی قاضی، انتشارات موسسه تاریخ و فرهنگ ایران، شماره ۱۰. تبریز ۱۳٤۷(بارام و گوڵندام)
منظومه کردی سعید و میر سیف الدین بیگ، ضبط و ترجمه و توضیح از قادر فتاحی قاضی، انتشارات موسسه تاریخ و فرهنگ ایران، شماره ۲٤. تبریز ۲٥۳٥(سەعید و میرسێوەدین)
منظومه کردی شور محمود و مرزینگان، ضبط و ترجمه و توضیح از قادر فتاحی قاضی، انتشارات موسسه تاریخ و فرهنگ ایران، شماره ۱۲. تبریز ۱۳٤۸(شۆڕمەحموود)
مەم و زین، ئەحمەدی خانی، ئامادە کردن و پەراوێز نووسینی: هەژار، ئەنستیتۆی کوردی لە پاریس، پاریس ۱۹۸۹ (مەم و زین)
میرزا، فەتاح ئەمیری، ئینتشاراتی سەلاحەدینی ئەیووبی، ۱۳۷۲ (میرزا)
ناڵەی جودایی، هێمن، چاپخانەی (علاء)، بەغدا ۱۹۷۹ (ناڵەی جودایی)
وەلی دێوانە، عوسمان هەورامی، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا ۱۹۷٦(وەلی دێوانە)
هاوارەبەرە، فەتاح ئەمیری، ئینتشاراتی سەلاحەدینی ئەیووبی - ۱۳٦۹
هەنبانە بۆرینە - هەژار، ۲ بەرگ، انتشارات سروش، تهران ۱۳٦۸ (هەنبانە بۆرینە)
هیوا (ژمارەی یەک هەتا پێنج)، گۆڤار، ئەنیستیتووی کورد لە پاریس

**فارسی**

بررسی گویش بیرجندی، به اهتمام دکتر محمود رفیعی، از دکتر جمال رضایی، انتشارات هیرمند، چاپخانه حیدری، تهران ۱۳۷۷
برهان قاطع (٥ جلد)، به اهتمام دکتر محمد معین، موسسه انتشارات امیر کبیر، چاپ پنجم، تهران ۱۳٦۲ (برهان)





تات نشینهای بلوک زهرا، جلال ال احمد، چاپخانه میهن ۱۳۳۷
فرهنگ ایران باستان، پورداود انتشارات دانشگاه تهران، ۲۵۳۶ شاهنشاهی
فرهنگ زبان پهلوی، دکتر بهرام فرەوشی، انتشارات دانشگاه تهران ۱۳۵۸
فرهنگ فارسی، تالیف دکتر محمد معین ٦ جلد، موسسه انتشارات امیر کبیر، تهران ۱۳۷۱ (معین)
فرهنگ فارسی عمید، حسن عمید دو جلد چاپ هفتم تهران ۱۳٦۹ (عمید)
فرهنگ نامهای پرندگان در لهجەهای غرب ایران (لهجەهای کردی)، تالیف دکتر محمد مکری، موسسه انتشارات امیر کبیر، چاپ سوم تهران ۱۳٦۱ (فرهنگ پرندگان)
یادداشتهای گاثاها، پورداود انتشارات دانشگاه تهران ۲۵۳٦ شاهنشاهی
فرهنگ گویش کرمانی، مولف: محمود صرافی، انتشارات سروش، چاپ اول ۱۳۵۷
فرهنگ کوچک زبان پهلوی، د. ن . مکنزی، ترجمه: مهشید میرفخرایی، تهران ۱۳۷۳

**به زمانی دیکه**

1-Altiransches Wörterbuch - Christian Bartholomae Ber-(بارتۆلۆمە) lin 1961
2-HILFSBUCH DES PEHLEVI - H.S.NYBERG UPPSALA 1931

3- Svensk-Kurdiskt Lrxikon (nordkurdiska)- Reşo zîlan

4- Dictionnaire KURDE-FRANÇAIS par Auguste Jaba- BIBLIO

VERLAG. ONSNABRÜCK. 1975 (ژابا)
5- Kurdish-English, English- Kurdish dictionary, Baran Rizgar, london 1993
6- FERHENG - Kurdi/Tırki (Zazaki)- Munzur Çem- stokholm

7- FERHENG - Kurdi/Tırki, Türkçe/Kürtçe- DENG Yayınları 1992-

D.Izoli (ئیزۆلی)
8-KURDISCH-PERSISCHE FORSCHUNGEN, OSKAR MANN, BAND2, BERLIN 1930
9- DIE MUNDART DER MUKRI-KURDEN, TEIL 1, OSKAR MANN, BER
LIN,1906 (مان)
١٠ – فەرهەنگی سانسکریت ـ رووسی، کالیانۆڤا، مۆسکۆ ١٩٧٨
١١ – فەرهەنگی پەشتوو ـ رووسی، ئاسلانۆڤ، مۆسکۆ ١٩٦٦
١٢ – فەرهەنگی پەشتوو ـ دەری ـ رووسی، لێبێدێڤ، یاتسێڤیچ، کانارۆفسکی، مۆسکۆ ١٩٨٣
١٣ – فەرهەنگی ئێنسکلۆپێدیای شۆرەوی، پراخارۆڤ، مۆسکۆ ١٩٨٧





# کورتکراوەکان

| | |
|---|---|
| ئا. | ئاناتۆمی |
| ئار | ئارامیی |
| ئاس | ئاسێتیی |
| ئاک. | ئاوەڵکار |
| ئال | ئالمانی |
| ئام. | ئامراز |
| ئام. ل | ئامرازی لێکدراو |
| ئان. | ئاوەڵناو |
| ئان. فا | ئاوەڵناوی فاعلی |
| ئان. ل | ئاوەڵناوی لێکدراو |
| باش | باشووریی |
| باک | باکووریی |
| بڕ: | بڕوانە! |
| بەخ | بەختیاریی |
| بەل | بەلووچیی |
| پار | پارتیی |
| پاز | پازەند |
| پاشـ. | پاشگر |
| پەش | پەشتوو |
| پەهـ | پەهلەویی |
| پێشـ. | پێشگر |
| تات | تاتی |
| تاج | تاجیکیی |
| تال | تالشیی |
| تور | تورکیی |
| تەب | تەبەریی |
| جنا. | جێناو |
| چا. ل | چاوگی لازم |
| چا. م | چاوگی متعدی |
| چا. مخ | چاوگی مرخم |
| حر. | حرف ربط |
| حم. | حاصل مصدر |
| خوار | خوارەزمیی |
| خوت | خوتەنیی |
| ر. | ریشە |
| روس | رووسیی |
| زا | زازایی |
| ژ. | ژمارە |
| سان | سانسکریت |
| سور | سوریانیی |
| سوغ | سوغدیی |
| سۆر | سۆرانیی |
| شر. | شێوە رستە |
| عبر | عیبریی |
| عەر | عەرەبیی |
| فار | فارسیی |
| فەر | فەرانسیی |
| کنـ. | کنایە |
| گیا. | گیا |
| گیانـ. | گیاندار |
| گیل | گیلەکیی |
| لات | لاتینیی |

| | |
|---|---|
| لار | لاریی |
| لۆر | لۆڕیی |
| ماز | مازندەرانیی |
| مجـ. | مەجاز |
| مغو | مەغوولیی |
| منج | مونجیی |
| موک | موکریانیی |
| مۆس. | مۆسیقا |
| نا. | ناو |
| نا. چا | ناوی چاوگ |
| نا. ل | ناوی لێکدراو |
| نا. فا | ناوی فاعلی |
| نا. مفـ. | ناوی مفعولی |
| ناو | ناوەندیی |
| نز. | نیزامی |
| وشد. | وشەدەنگ |
| هس | هەڵیسەنگێنە |
| هەخ | هەخامەنشیی |
| هەو | هەورامیی |
| هند | هیندیی |
| هیک | هیندیی کۆن |
| ئۆر | ئۆردوو |
| ئەرم | ئەرمەنیی |
| ئەو | ئەوێستایی |
| یون | یوونانیی |
| یەغ | یەغنووبیی |
| ئەر | ئەردەڵانیی |
| ئەک | ئەکدیی |
| ئیتا | ئیتالیایی |
| ئیس | ئیسپانیایی |
| ئین | ئینگلیسیی |
| ئێک | ئێرانیی کۆن |



## ئیشارەکان

:: وێنە و نموونەی وشە لە رستە و شێعر دا .

/ جیا کردنەوەی دوو رستە یان بەند و بەیت لە یەکتر.

// دژبەری (متضاد) وشە

~ دووپاتە بوونەوەی وشە لە چاوگی لێکدراو دا .

|| ناوی لێکدراو

* چاوگی لێکدراوی وشە یا ناوێکی لێکدراو.





# ئـا

**ئا**[1] ١ـ یەکەمین پیتی ئەلفوبێی زمانی کوردیی . ئا ـ لە سەرەتا دا ـ لەبەر ئەوە کە بزوێنە پێویستی بە پیتێکی یارمەتیدەر بۆ دەربڕین هەیە و بۆ ئەم مەبەستە لە « ئـ » کەلک وەردەگرن یانی ئای سەرەتایی هەر چەند بە پیتێک دەناسرێ بەڵام لە راستی دا لە دوو پیتی ( ئـ + ا ) پێک هاتوە یانی بێدەنگێک و بزوێنێک. ئەم پیتە لە وشە دا بە سێ شێوە خۆ دەنوێنێ: ئا (ئاو، ئاسک)، ـا(باڵ، ماشێن) ـ ا(داڵ، زوان). (ا) دەگەڵ هەندێک لە پیتەکانی دیکە جێ گۆڕکێی هەیە. جێگۆڕکێی (ا) دەگەڵ ئە: بارزان ـ بەرزان، ئاسێرە ـ ئەستێرە، ... دەگەڵ ئێ: ئار ـ ئێر، پا ـ پێ، ... ٢ـ ناوی ئەم پیتە.

**ئا**[2] (ئاک.) بۆ مەبەستی وڵام دانەوە یان سەلماندنی مەبەستێک دەکوترێ و زۆر جار دەگەڵ کوتنی بە سەر هەڵتەکاندنیش مەبەستەکە دەنوێنن، بەڵێ، ئادی، ئەرێ، ئم. :: نان دەخۆی؟ ـ ئا . ئا وایە! **ئائا:** دوو پات کراوی ئا بە مانای بەڵێ ـ یە کە داگرتنێکێ پتر نیشان دەدا :: ئەرێ گوڵەکانت ئاو داون؟ ـ ئائا . کاکە نان و چات بۆ دانێم؟ ـ ئائا کوڕە ئەوە لە برسان دەمرم.

**ئا**[3] (پاش.) ١ـ سواوی پاشگری (دا)یە و زۆرتر لە هەندێک بن زاراوەکانی ناوەندی دا بەکاری دێنن، ئەم وشەیە لە نێو رستە دا هەمیشە دوای (لە، بە،...) و (دەگەڵ ناو یان کار)

دێ. :: لە مالا(ماڵ دا) خەریکی کار کردن بووم. لە نووسینا(نووسین دا) فرە پەلە مەکە! ٢ـ (ئام.) هەمان دا بێ ئامرازی زیادەی دیکە لە پێشەوەی رستەوە دێ. :: ئاوا (دا وا) مەکە! ئاخۆ (دا خوا) باوکم هاتۆتەوە؟ ئادەی (دادەی) برۆ دەرگا بکەوە.

**ئا**[4] (نا.) کورت کراو و سواوی وشەی ئاغایە لە وشەکانی تێکەڵاو دا و هەروەها کاتێک کە دەگەڵ ناو بێ. :: ئارەسوو دا وەرە ! ئابرا کەی وا دەبێ ؟

**ئا**[5] (ئام.) لە زاراوەی باکووریی دا ئامرازی زێدەی مێیینەیە. :: گولا سۆر، بەژنا زراف.

**ئا**[6] (ئام.) لە هەندێک بن زاراوەی باکووریی دا ئامرازی کۆیە. وێدەچێ کە سواو و سووک کراوەی ئان بێ. :: بەرخا دە چێرینە. سێڤا دفرۆشە.

**ئا**[7] (پاش.) بە ریشەی چاوگەوە دەلکێ و ئاوەڵناوی فاعلی ساز دەکا. :: زانا (زانین)، توانا (توانین)، بینا (بینین).

**ئا**[8] (ئام.) لە زاراوەی باکووریی دا خاوەن بوون و دارا بوون دەگەیەنێ. هی، ئی، هین. :: ئا من (هی من)، ئا مە، ئا وان.

**ئا**[9] (ئام.) لە کاتی سەرسوڕمان و شک لە راستی دا بەکار دەهێندرێ، کە مانای (بە راستی!) یان (راست دەکەی!) دەگەیەنێ :: ـ ئەگەر دەرس و دەورەکەت باش بخوێنی، دووچەرخەیەکت بۆ دەکڕم. ـ ئا، بڵێ بە گیانی تۆ!

ــ نامەی بابت کە چاوەڕێی بووی هات. ـ ئا، بە راستیتە! کەی هات؟

**ئا**[10] (جنا.)[زا] سێهەم کەسی تاک بۆ مێیینە لە زاراوەی زازایی دا، ئەو.

**ئا**[11] (پێشـ.) پێشگری کرداره لە زاراوەی زازایی دا بە مانای پاشگری (ئەوە) یا پێشگری (وە) لە ناوەندیی دا و پێشگری (ڤە) لە باکووریی دا. :: ئاکەردەنە (کردنەوە، ڤەکرن)

**ئا**[12] ناسەی کاری سێهەم کەسی تاک. :: شکا، دەخوا، خورا، دەکا.

**ئا**[13] (پێشـ.)[ئەو: ئا] ١ـ پێشگرێکی زێدەیە کە لە کۆنەوە ماوە و بوون و نەبوونی مانا تێک نادا. :: ئاغەڵ، غەڵ ـ ئاسۆ، سوێ. ٢ـ هەمان پێشگرە بەڵام مانایەکی دیکە دەدا بە وشە. :: ئاکار، کار ـ ئاپوورە، پوورە. ٣ـ هەمان پێشگرە

کـه له کـۆنەوە بە وشـەوە نووسـاوە و ئێستاكە لێک جوێ ناکرێنەوە و بە بێ ئەم (ئایە) بێ مـانا دەبێ. :: ئاوس، ئاخوڕ.

**ئا**$^{14}$ (ئام.) دوو ناو یا دوو ئاوەڵناوی دووپات کـراوە تێک دەکـاتەوە و ئاوەڵناوێکی نوێ سـاز دەکـا، ئاو2، ئـان4، ئـام4، بـە. :: دووڕادوور، سەراسەر، بەرابەر، پشتاپشت.

**ئا**$^{15}$ (ئام.) ئامـرازی بانگ کـردن و هاوار بۆ بردنە کـە بە ئاخـری ناوەوە دەلکێ، ئەی. (چونکە ئا بزوێنە ئەگـەر دوایین پیـتی ناوەکـە بزوێن بێ « ی » دەبێتە یارمەتی دەر). :: حاڵە بەدحاڵی لە شوێن و ماڵە وێرانی لە دوو / **مەحویا!** گەر ئەهلی حاڵی، حاڵ و ماڵم بۆ چیە (مەحوی ل ٢٩٤). **ساقیا!** وا بادەوە، وابادەوە/ روو لە لای من کـە بە جامی بادەوە (ناڵەی جودایی ل ١٢). خودایا.

**تێبینی:** ئەم ئامرازە لە زمانی فارسیەوە هاتۆتە نێو زمانی کوردیی و تەنیا لە ئەدەبی کلاسیک دا برەوی هەیە.

**ئا**$^{16}$ (پێشـ.)[هەو] بڕ: ئەم 1

**ئا**$^{17}$ (نا.)[لات: A] ئەندازەیەکی دیاری کراوە بۆ کاغەز کە لە ئا ـ وە دەست پێدەکا و بە ژمارە دێتە خوارتر. :: ئا١، ئا٢، ئا٥ و ...

**ئاب**$^{1}$ (نا.)[فار: آب] بە مانای ئاو ـ ە کە لە هەندێک وشەی تێکەڵاو کە لە فارسی وەرگیراون یا لە ئەدەبی کلاسیک دا دەبینرێ. || **ئابی بەقا:** بڕ: ئاوی بەقا. :: بۆ ماچی دەمی کوڵمە لە نێو پەرچەمی خاوی/ لەو زوڵمەتە بۆ ئابی بەقا نووری چرامە (وەفایی ل ١٣٥).

**ئاب**$^{2}$ (نا.)[عـبـر: اب، آب] ئاب یا ئەب ناوی مانگی یازدەهەمی سالی رۆمی و سووریانی و هەروەها مانگی یازدەی جوولەکەکان بەرابەرە دەگەڵ مانگی گەلاوێژی کوردیی و ئۆتی هەندەرانی و دەکەوێتە نێوان تەمووز و ئەیلوول، تەباخ.

**ئابا**$^{1}$ (نا. ل)[ئا4 + با (برا)][ئەر] کورتکراوەی ئابرا یا ئاغا برایە بە مانای برا گەورە، ئابرا.

**ئابا**$^{2}$ (نا.)[عەر: آباء] باوکەکان، باب و باپیران. ئاژداد، ئەژداد، جەد. :: ئابا و ئەژداد، جەد و ئابا.

**ئابات** (ئان.)[پەهـ: ئاپات. باک: ئاڤا ـ ناو: ئاوا] ئاوەدان، ئاوا. شێوەی کۆنتری وشەی ئاوایە کە دەگەڵ وشەکانی

تێکەڵاو دا وەک ناوی گوند و دێهات دا ماوەتەوە. ⁂ حەسەن ئابات، عەلی ئابات.

**ئاباد** (ئان.)[فار: آباد] ئاوا، ئاوەدان. شێوەی فارسی ئاوا یا ئاباتە کە بە هەندێک لە ناوی گوندەکان و شارەکانەوە نوساوە. ⁂ مەهاباد، شائاباد، غەوساباد

**ئاباژۆر** (نا.)[فەر: abat-jour] سەرپۆشێک کە لە سەر چرای دادەنێن هەتا شۆقەکەی وە زەوی کەوێ و چاو ئازار نەدا، سەرپۆشی چرا.

**ئابدار** (نا. فا)[ئاب1 + دار2][فار: آبدار] کەسێک کە لە دیوەخانی میر و بەگان ئەرکی ساز کردنی چا و قاوە و خواردنەوەی دیکە بوو، ئاودار. ⁂ دەهاتە کن ئەولادی شا روستەم بەگان، سێ سالان دەبۆ سەقا و سێیان دەبوو بە ئابدارە (مان ل ٢١٣).

**ئابدارباشی** (نا. ل ـ ئان. ل)[ئابدار + باشی] سەرۆکی هەموو ئەو کەسانەی کە لە ئابدارخانە کار دەکەن.

**ئابدارخانە** (نا. ل)[ئابدار + خانە] ١ـ ژووری ساز کردنی خواردنەوەی وەک چا و قاوە و شەربەت لە ماڵی بەگ و کۆشکی میران دا کە ئاودار لەوێ کار دەکا. ٢ـ بار و بنەی ئاوداری پاشا و سوڵتانەکان، بە نۆکەر و تەواوی کەرەسەوە. ⁂ فەرموو لە کۆڵمێکە ناسک دوو ماچ وەربگرە، لەبری نانە شەکرینە و لوقمەقازییە/ هەتا حەوت رۆژان برسی نابی، تێشووی خۆت پێیە، ئەوە لە ئابدارخانەی کەس دا نییە (لاس و خەزاڵ ل ٤٤). & ئاودارخانە

**ئابرا** (نا. ل)[ئا4 + برا][ئەر] لە بن زاراوەی ئەردەلانی دا برەوی هەیە و مانای کاک، کاکە و رێز گرتنی هەیە چا مەبەست برا گەورە بێ یان کەسێکی گەورەتر یان دۆست و ئاواڵ، ئابا، ئاغەبرا. ⁂ ئەگەر ئەم ئیشە بکەی بە ئابرام ئەیژم! ئابرا کەی وا ئەوێ!؟

**ئابڕوو** (نا. ل)[فار: آبرو] هەموو ئەو ئاکارباشییانەی مرۆڤ کە دەبنە هۆی پاراستنی کەسایەتی لە نێو کۆمەڵ دا. حەیا، نامووس، شەرەف، رێز، ئاوڕوو، ئاڤروو. **~ بران:** سووک بوون، ئابڕوو چوون. **~ بردن:** لە هەڵلا دان ولە قاو دانی کار و کردەوەی سووکی کەسێک کە لای خەڵک ناحەزە، سوکایەتی بە کەسێک یان کەسانێک کردن، حەیا بردن. ⁂ قیبلەکەم بەو زاری هەر وەک

غونچە بۆیە پێکەنی / دا بلێن خەندەی لە گوڵ دێ ئابرووی پەروین دەبا (وەفایی ل ٣). ~ **بردنە سەر لکی دار:** بە تەواوەتی ئابڕوو بردنی کەسێک وەها کە هەموو کەس پێی بزانێ. ~ **بڵاو بوون:** ئابڕوو چوون، سووک بوون لە لای خەڵک. ∷ دەڵێ: کارێکی گەورە قەوماوە / چلۆن ئابڕووم بوو بڵاوە / ئیختیارم دە مست کچێ ماوە (مان ل ٢٠١). ~ **بڵاو کردن:** ئابڕوو بردن، سووکایەتی بە کەسێک کردن. ~ **تکان:** سووک بوون، ئابڕوو نەمان، ئابڕوو رژان. ~ **تکاندن:** بێ ئابڕوو کردن، سووک کردن، ئابڕوو رژاندن. ~ **چوون:** سووک بوون، حەیا چوون، ئابڕوو تکان. ∷ بەو کارە ناحەزانە تازە ئابڕووی بە هەزار ساڵەمان دە نێو ئەو خەڵکە دا چوو. ~ **رژان:** بڕ: ئابڕوو تکان. ~ **رژاندن:** سووک کردن، ئابڕوو بردن، ئابڕوو تکاندن. ~ **کڕینەوە:** بە کار و کردەوەیەک بەری حەیا چوونی کەسێک گرتن. ∷ میوانمان زۆر و پێخەفمان کەم بوو، کاک رەسووڵی جیرانمان پێخەفی بۆ هێنایین و لە کن میوانەکان ئابڕووی کڕینەوە. ~ **لە روو هەڵگیران:** حەیا چوون، بێ ئابڕوو بوون، ئابڕوو نەمان.

∷ دەڵێ: مەتڵەبت چییە؟ کوتی: قوربان، ئابڕووم لە رووی هەڵگیراو، مەتڵەبی من هەر خاتوون ئەستێیە (مان ل ١٥٢). ~ **مان:** خاوەن ئابڕوو بوون. ∷ تازە کوا دەتوانین سەر هەڵێنین بۆ چما ئابڕوومان ماوە. || **ئابڕووی بە هەزار ساڵە:** (کنـ.) ئابڕووی هەمیشەیی، ئابڕووی بە یەکجاری. **ئابڕووی بە هەزار ساڵە چوون:** (کنـ) بۆ هەمیشە بێ ئابڕوو بوونی کەسێک بە بنەماڵە و تایفەکەیەوە لە ئێستا و داهاتوو دا. ∷ بە خوڵای! ئەمن ئابڕووی بە هەزار ساڵم چووە لە نێو ئێلانە / یانە پاکی بە قوڕ دەدەم، یانە تاڵان دەکەم حەمەدی باشاغانە (مان ل ٢٦٤). **ئابڕووی بە یەکجاری:** هەموو ئابڕووی مرۆڤ، تەواوەتی ئابڕوو. **ئابڕووی بە یەکجاری چوون:** (کنـ) ئابڕوو چوونی بە تەواوەتی، بێ ئابڕوو بوون بە یەکجاری.

**تێبینی:** ئابڕوو وشەیەکی فارسییە کە راستەوخۆ لەو زمانەوە هاتۆتە نێو زمانی کوردیی. ئابڕوو [ئاب + روو] لە دوو بەشی ئاب کە بە مانای گرشە و سەفایە و هەروەها روو پێکهاتوە کە بە گشتی یانی گرشە و سەفای روو. ئاوڕوو و ئاڤروو شێوەی کوردیی پێدراوی ئەم

وشەیەن.

**ئابڕووبراو** (نا. مـــفـ.)[لە: ئابڕوو بران] کەسێک کە لە بەر هۆیەک ریسوا کراوە و ئابڕووی نەماوە.

**ئابڕووبەرە** (ئان. فا)[ئابڕوو + بەر + ئە] ١ـ کەسێک کە بە کردار یان بە قسە لە بەر چاوی خـــەڵک ســـووکت بکا، ئابڕووڕێژ. ٢ـ منداڵ یا کەسێک کە قسە و نهێنی دایک و باوک یا هی کەسانێکی دیکە لە قاو بدا.

**ئابڕووتکاو** (ئان. مــفـ.)[ئابڕوو + تکاو] کـەسـێک کـە ئابڕووی نەمـــابێ، سووک، بێشەرم، بێحەیا.

**ئابڕووتکاویی** (حم.)[ئابڕووتکاو + ئیی]چلۆنایەتی ئابڕووتکاو، بێشەرمیی، بێـــحـــەیایی. ⁘ کـــورد نەتواوە و ئابڕووتکاویی و ریســـوایی مـــێـــژوو بۆ پۆلیسی رەزاخان مایەوە (چەپکێ گوڵ ل ٦).

**ئابڕووڕێژ** (ئان. فـــا)[ئابڕوو + رێژ] بڕ: ئابڕووبەرە. ⁘ ئابڕوو رێژە ویســالی یار و خوێنڕێژە فیراق/ عالەمی عیشق و مەحەببەت هەر بڕێژە، هەر بڕێژ (مەحوی ل ١٤٣).

**ئـابـڕووڕێـژیی** (حم.)[ئـابـڕووڕێـژ + ئیی] حەیا چوون، ئابڕوو نەمان.

**ئابشـــار** (نا. ل)[فـــار: آبشـــار] ١ـ [کـلاسـیک] ئاوهەڵدێر، تاڤگە، قـەڵوەز، قەڵبەزە. ⁘ بێ مـەحابا ئاو دەڕێژێ گەه بە فـــەور و گـــەه بـە دەور/ چاوی من موددێکە شێوەی ئابشاری گرتوە (نالی ل ٥٤٢). ٢ـ لێـــدانی توند و بە قـــەوەتی تۆپ لـە هەندێک یاری وەک پینگ پۆنگ و والیباڵ، کەبباسی.

**ئابلۆقە** (نا.)[تور: abluka لە ئیتا: abluka] گـەمـــارۆ، دەورە، دەورادەور، تەوق، ئەبلۆقە. ~ **دان:** گەمارۆ دان، دەورە گرتن، خستنە تەوق.

**ئابنووس** (گـیـــا.)[پەه: ئاپنووس لە یون: ebenos] دارێکە وەک دارە گـوێز گــــــەورە و بـەلک و پـۆیـە، لـە هـیـنـد و ماداگاسکار و چەند شوێنی دیکە دەڕوێ چێـوەکـەی پتـــەو و رەش و بە بـایـخـــە. disopyros ebenum ناوی عـیلمی ئەم دارەیـە. || **ئـابـنووسی شین:** دارێکـە تایبـەتی ئامریکای ناوەندیی، گەڵاکـانی شـێـوەی پەڕ دەدەن و گـوڵـەکـانی شین و هـێـــشـــوویـن، بەرەکــەی دەخـــورێ و چێـوەکـەشی زۆر باش و بەنرخـە، -Jac

aranda ناوی لاتینی ئەم دارەیە. (عەر: جکرندا)

**ئابنووسی** (ئان. ل)[ئابنووس + ئی] ١ـ هەرچی کە لە داری ئابنووس ساز بووبێ. ٢ـ رەش و سیا وەک رەنگی ئابنووس. ⁂ تەشی کە خستە بازی بە رانی نەرم و لووسی / دەکەوتە پاییووسی دوو زولفی ئابنووسی (وەفایی ل ١٩٤).

**ئابونمان** (نا.)[فەر: abonnement] پارەی پێشەکی گۆڤار و رۆژنامە یا حەقی ئەندام بوونی بەرق و تەلەیفوون و ئاو و هەر شتێکی لەم بابەتە. ~ **بوون:** بوونە ئەندام و بەشدار لە رۆژنامە، گۆڤار، تەلەفۆن و ... پێگ گەیشتنی بە رێک و پێکی یا مافی کەلک لێوەرگرتن. ~ **دان:** دانی پارەی پێشەکی بۆ هەر کام لە مەبەستەکانی سەرەوە. **خۆ ~ کردن:** پارەی ئابونمان دان و خۆ کردنە ئەندام.

**ئابۆری** (نا.)[باک] بڕ: ئابووری

**ئابووری** (نا.) ئیقتساد، بەڕێوە بردنی ماڵ، یانە یا وڵاتێک بە پێی داهات و خەرجەوە، ئابۆری.

**تێبینی:** سەیدۆ گۆرانی ئەم وشەی بە عەبۆر نووسیوە و بە وشەیەکی بۆتانی داناوە و دەگەڵ ebone ی فەرانسی هەر بەم مانایەی هاوسەنگ کردوە (بڕ: القاموس ل ٢٥). ئابووری لەوانەیە دەگەڵ ئاپوریشن āpurišn لە زمانی پەهلەویی بە مانای داهات و بەرهەم یەک ریشەیان هەبێ.

**ئابووریزان** (ئان. فا)[ئابووری + زان] کەسێک کە شارەزایی لە سەر زانستی ئابووری هەیە، کەسێک کە را و بۆچوونی لە سەر بار و دۆخی ئابووری هەیە و لێی دەزانێ، ئابووری ناس.

**ئابووریناس** (ئان. فا) [ئابووری + ناس] بڕ: ئابووری زان.

**ئابوونە** (نا.)[فەر: abonne] ١ـ کڕینی پێشەکی گۆڤار و رۆژنامە بۆ مانگێک یا چەند مانگ کە بەم پێیە فرۆشیار یا خاوەنەکەی، دەبێ شتی ئابوونە کراو بۆ ئەو کەسە بنێرێ یا ئەوەکە بۆی راگرێ. ٢ـ دانی پارەی مانگانە یا ساڵانە بە یانە یا حەقی ئەندامەتی بە رێکخراوە و حیزبەکان. ~ **بوون:** بوون بە ئەندامی کڕیاری گۆڤار و رۆژنامە. ~ **کردن:** خۆ یا کەسێکی دیکە کردن بە ئەندامی بۆ

پێشەکی کرینی گۆڤار و ڕۆژنامە.

**ئاپ** (نا.)[؟][باک] مام، ئاپۆ، برای باوک.

**ئاپا** (نا. ل)[ئاپ + ئا][باک] خوشکی باوک، مەت، پوور، میمک.

**ئاپارتومان** (نا.)[فەر: apparte-ment] ماڵێکی گەورە و چەند نهۆمی کە هەر نهۆمەی چەند خانووی سەربەخۆ و جیای تێدابێ، خانووبەرە.

**ئاپاندیس** (نا.)[لات: appendix] ریخۆڵەیەکی چووکی زێدەیە کە لە لای راستی لەشی مرۆڤ و لە بنی ریخۆڵەی کوێر دایە.

**ئاپاندیسیت** (نا.)[فەر: ap-pendicite] ئازارێکە لە ماسین و چڵک کردن ئاپاندیس تووشی مرۆڤ دێ و ژانی زۆرە و بە عەمەل کردن و هەڵگرتنی ئاپاندیس چارەی دێ، تۆقانی ئاپاندیس لەو حاڵە دا مرۆڤ دەکووژێ.

**ئاپزا** (نا. ل)[ئاپ + زا][باک] بڕ: ئامۆزا

**ئاپۆ** (نا. ل)[ئاپ + ئۆ][باک] برای باوک.

**ئاپۆژن** (نا. ل)[ئاپۆ + ژن][باک] بڕ: ئامۆژن.

**ئاپۆرە**[1] (نا.)[؟] ١- میوانی بانگ نەکراو، کەسێک کە بێ ئەوەی لێی بگێڕنەوە بچێتە شوێنێک، میوانی زیادی. ⁘ میوانی ئاپۆرەی زۆرە. (میرزا ل ٢٨). ٢- بێگانە، نەناسیاو، غەریبە.

**ئاپۆرە**[2] (نا. ل)[ئا13 + پۆر + ئە] بڕ: ئاپوورە. **~ دان:** بڕ: ئاپوورە دان.

**ئاپوورە** (نا. ل)[ئا13+ پوور + ئە] حەشیمەت، کۆمای خەڵک پێکەوە. ئاپۆرە. **~ دان:** کۆ بوونەوەی خەڵک لە دەوری یەک یا کەسێک، ئاپۆرە دان. ⁘ خەڵک لە مەیدانی شار ئاپوورەیان دابوو.

**تێبینی:** پوور یا پۆر لە ریشەی ئەوێستایی پەرو paru و پڕ - ی کوردیی بە مانای زۆر، فرە کەوتۆتەوە (بڕ: پڕ) و لە زاراوەی باکووریی دا پڕ هەمان مانای کۆنی خۆی راگرتوە. پەل و پۆل و پتر و هەندێک وشەی دیکەی کوردیی لەو ریشەن. جگە لەوە پوورە بە تەنیا لە کوردیی دا بە مانای شڵخەی هەنگە کە ئەویش هەر مانای زۆر و پڕ دەدا.

**ئاپەی** (ئاک.)[بڕ: پەی][زا] پشت، دوا، پەی، شوێن.

**ـ ئات** (پاشـ.) پاشگری کۆیە کە لە عەرەبی را هاتۆتە نێو زمانی کوردیی و برەوی کەمە، ـ ئان، گەل. :: باغات، مالات، خێلات.

**تێبینی:** دوای پیتی بزوێن (و، ج، ه) بە خۆوە دەگرێ. :: ئاغاوات، دێهات، میوەجات.

**ئاتاج** (نا.)[عەر: احتیاج] کەسێک کە پێداویستی هەبێ، موحتاج. :: شوکرئەوەندەم هەیە ئاتاجی کەس نەبم!

**ئاتر** (نا.)[هەو] بڕ: ئاگر

**ئاتروان** (نا. ل)[ئاتر + وان] کەسێک کە ئاگای لە ئاگری ئاورگە، ئاگاداری ئاگر.

**ئاتمۆسفێر** (نا.)[فەر: at-mosphere] ١ـ ئەو هەوایەی کە دەورودەوری زەوی گرتوە و تێکەڵاوێکە لە گازەکانی ئەزۆت، ئوکسیژێن، ئارگۆن، و ئیدرۆژێن و چەند گازی دیکە. ٢ـ پێوانەی قورسایی هەوا کە ١٠٣٣/٦ گرەم لە سانتیمیتری چوارگۆشە دایە. ٢ـ چلۆنایەتی دەوروبەر، فەزا. :: مەهاباد ئاتمۆسفێری کۆنی خۆی هەر پاراستوە.

(ئەم وشەیە لە ئاتمۆس بە مانای هەڵم و سفێرا ـ ی یوونانی بە مانای گۆ پێکهاتوە.)

**ئاتۆم** (نا.)[یوون:atomos] چووکترین کوت و بەشی عونسۆرە کە نابیندرێ و پێشتر لە سەر ئەم بڕوایە بوون لەوە پتر دابەش ناکرێ. ئاتۆم لە زەڕڕەی زۆر وردی پرۆتۆن و ئەلکترۆن و نۆترۆن پێک هاتوە. پرۆتۆنەکان لە ناوەندی ئاتۆم پێکەوە نووساون و ناوکی ئاتۆمیان پێک هێناوە و ئەلکترۆنەکان بە دەوری دا دەگەڕێن، ئەتۆم.

**ئاتۆمی** (ئان. ل)[ئاتۆم + ئی] هەر شتێک یا هەرچییەک کە پەیوەندی بە ئەتۆمەوە هەبێ، ئەتۆمی. :: بۆمبی ئاتۆمی، هێزی ئاتۆمی.

**ئاتوون** (نا. ل)[ئا13 + توون][باک] ١ـ قسڵ. ٢ـ کوورەخانەی قسڵ پێژان ٣ـ کوورەخانەی خشت پێژان.

**ئاتەر** (نا.)[ئەو: ئاتەر ـ هەخ: ئاتەر ـ پەه: ئاتەر][هەو] بڕ: ئاگر

**تێبینی:** لە ئەوێستا دا ئاتەر ناوی فریشتەی ئاگر بوە لە بەر ڕێز و مەزنایەتی بە کوڕی ئەهوورامەزدا ناویان بردوە.

**ئاتەران پاتەران ـ** قسەی تێکەڵ پێکەڵی کەسێک کە قسە دەپەڕێنێ، قسەیەک کە چی بە سەر یەکەوە نەبێ. هەڵیت و پەڵیت، هاتەران پاتەران، هەللەق مەللەق. :: ئەو ئاتەران پاتەرانەت لە چیە جوان قسان بکە بزانم دەڵێی چی.

**تێبینی:** وێناچی ئەم وشەیە ریشەیەکی هەبێ. چونکە کەسێک کە قسە دەپەڕێنێ چی بەسەر چیەوە نیە و کەس تێیناگا و لەوانەیە ئەم ناوە بێ مانایەش هەر لەوە پەیدا بووبێ.

**ئاتەش** (نا.)[فار: آتش][کلاسیک] ئاور، ئاگر. :: وێڵی ولاتی بێهۆشی، گێژی گێژاوی سەرخۆشی / ماسی سەراوی ئاتەشی، یا غەوسی سانی هیممەتێ (وەفایی ل ١٨١).

**ئاتەشەک** (نا. ل)[ئاتەش + ئەک] بڕ: ئاگرە

**ئاتەگ** (نا.) ١ـ داوێنی جلی درێژ کە لە سەرەوەی جلەکانی دیکە دەبەری دەکەن وەک کەوا و چاکەت، شاقەل ٢ـ داوێنی کێو و چیا، ئەتەک. :: قاز و قورینگ ئەگەر لە عاسمان دەگەڕێ/ گەورەیان هەیە؛ ئەگەر قاوەقاو دەکەن، دەچنەوە بۆ سەری کوێستان و ئاتەگی ئاستەڕێ (سەعید و میرسێوەدین ل ١١٥). ٣ـ ژێر کراسی ژنانە. ٤ـ داوێنی زین کە دەکەوێتە ژێر رانی سوار. ٥ـ داوێنی گیاندار. :: ولاغیان هەمووی سێ ساڵە/ شێرخەزاڵی و ئاتەگ کاڵە/ وەکوو باڵدار خاوەن باڵە (سەعید و میرسێوەدین ل ١٥٩). ~ **بڕین:** ١ـ بڕینی ئاتەگی جلی کەسێک کە کاری خراپ و نالەباری کردبێ بۆ سووک کردنی. ٢ـ (کن.) سووکایەتی پێکردن.

**تێبینی:** ئەتکە atka لە زمانی سانسکریت دا بە مانای جل و بەرگ و ئەو لیباسەی لە سەرەوە دەبەر دەکرێ هاتوە. هەروەتر ئەتەک etek لە زمانی تورکی دا بە مانای داوێنی جل و داوێنی چیا هاتوە.

**ئاتی** (نا.)[؟][باک] بڕ: فێ

**ئاجز** (نا.)[عەر: عاجز] ١ـ زیز، زوێر، زویر، عاجز. ٢ـ ئێش، رەنج، ئازار. ٣ـ بێدەستەلات، ناتوان، بێهێز. ٤ـ وەرەز، بێتاقەت. ~ **بوون:** ١ـ دڵ ئێشان، زوێر بوون. ~ **کردن:** دڵ ئێشاندن، زوێر کردن. **لێ ~ بوون:** دڵ لە کەسێک هێشان، لێ زوێر بوون. **لێک ~ بوون:**

دڵ لە یەکتر ئێشان. ∷ ئەو دوو برایە دەمێکە لێک ئاجزن و نێوانیان نیە.

**ئاجزیی** (حم.)[ئاجز + ئیی] ١ـ عاجزیی، نێواناخۆشیی، زیزیی، زوێریی. ٢ـ بێدەستەڵاتیی، بێهێزیی. ∷ هیچی پێنەدەکرا زۆر بە ئاجزیی دانیشت و ئەژنۆی دە باوەش گرت. ٣ـ کوێرەوەریی، زەحمەت. ٤ـ وەڕەزیی، بێتاقەتیی. **~ کێشان:** رەنج کێشان، تووشی زەحمەت بوون. ∷ کاکەمەم دەڵێ: بەنگینێ، بەڵەک چاوە!/ دە قۆشەنێ بگەڕە، بزانە کێها ئاجزیی کێشاوە. (مان ل ٤٤). **~ هەبوون:** نێواناخۆشیی هەبوون، دڵ لێک ئێشان.

**ئاجودان** (نا.)[فەر: adjudant] ئەفسەرێک کە لە خزمەت ئەفسەرێکی گەورەتر لە خۆی دایە و فەرمانەکانی وی بەڕێوە دەبا.

**ئاجور** (نا.) خشتی سوور، خشتی سوور کراوە لە کوورە دا.

**تێبینی:** ژابا ئاجور ـ ی بە عەرەبی کراوی ئاگور ـ ی فارسی داناوە (بڕ: ژابا ل ٢). هەروەها لە فەرهەنگەکانی فارسیش دا ئاجوریان بە عەرەبی کراوی ئاگر یا ئاگور بە مانای خشتی پێژراو نووسراوە و هیچ سەرچاوەیەکیان بۆ ئاگور و ئاگر دیاری نەکردوە. شک نیە کە ئەم وشەیە دەبێ هەمان ئاگر ـ ی کوردیی بێ.

**ئاجیر** (ئاک.)[زا] بڕ: ژێر

**ئاجیل** (نا.)[فار: آجیل] پستە، بادام، فندق و تۆو و کشمیش کە بۆ شەوچەرە دادەندرێ، چەرەز.

**ئاچار** (نا.)[تور: ئاچار] ١ـ هاچەر، کلیل ٢ـ ئەو ئامرازانەی کە پێچ و مۆرە دەکەنەوە. & ئاچەر

**تێبینی:** ئاچ لە چاوگی ئاچماک açmak بە مانای کردنەوە کەوتۆتەوە.

**ئاچخ** (ئان.)[تور: ئاچغ (کراوە) لە چاوگی ئاچماغ بە مانای کردنەوە] ١ـ رەنگی روون و کراوە دژی تۆخ. ∷ سووری ئاچخ، شینی ئاچخ. ٢ـ کراوە، ئاوەڵا. پتر بۆ دەرکە و پەنجەرە دەکوترێ. ئاچغ، ئاچوخ، ئاچوغ.

**ئاچغ** (ئان.) بڕ: ئاچخ

**ئاچوخ** (ئان.) بڕ: ئاچخ

**ئاچوغ** (ئان.) بڕ: ئاچخ

**ئاچەر** (نا.) بڕ: ئاچار

**ئاخ**[1] (نا.)[ئێک: ئاهـە ـ هیک: ئاسـە ـ پـەه: خـــاک ـ بـەل: هـاک. باک: ئـاخ] ١ـ خاک، خۆڵ. ٢ـ زەوی، هەرد.

**ئاخ**[2] (نـا. د)[بـاک: ئـاخ ـ نـاو: ئـاخ ـ بـاش: ئـاخ ـ هــەو: ئـاخ ـ زا: ئـاخ] ١ـ وشـەی دەربڕینی دەرد و ئێش، ئای، ئاه. ٢ـ وشـەی دەربڕینی خـەم و خـەفـەت، ئاخ و داخ. ٣ـ وشـەی بێدەستەڵاتی و هـەناسـە ساردیی. ‌:: ئاخ ئەگەر دەستم ڕۆیشتبا! ئاخ ئەگەر میلیۆنێکم هەبا! ~ **کێشان:** ئاخ هـەڵکێـشـان. ~ **هەڵکێشان:** هـەڵمژینی هـەوا و پڕ کردنی سییەکان و دانەوە دەری بە دەربڕینـی ئاخێک ئەودەم کـە مـرۆڤ بە تـەواوی خـەم و پەژارەیەک دەروونی داگرتوە، ئاخ کێشان، ئاخین.

**ئاخا** (نا.) بڕ: ئاغا

**ئاخافتن** (چا. ل)[باک] بڕ: ئاخاوتن1

**ئاخاوتن**[1] (چا. ل)[ئەو: ڤـەک، ڤـەچ ـ پەه: ڤاخـتـەن. باک: ئاخـافتن، ئاخفتن ـ ناو: ئاخاوتن] دەگەڵ کەسێک قسەکردن، وتووێژ کردن، پەیڤین، خەبەردان.

**تێبینی:** ئاخـاوتن و بێژتن1 بە مانای قسـە کردن هـەردووک یەک سـەرچاوەیان هەیە (بڕ: بێژتن1).

**ئاخاوتن**[2] (چا. م) بڕ: ئاخێوتن

**ئاخـبان** (نا. ل)[ئاخ1 + بان1][باک] بڕ: ئاخەبان/١

**ئاخـتف** (نا. ل)[ئاخ2 + تف][گـیل: ئاختوب][هەو] مـادەیەکی لیچقی زەرد یا سـپـیـیـە لە بـەر هەندێک نەخـۆشـی یا جگەرە کێشان لە سەر گەروو دەنیشێ و بە کـۆخـە لە زار دێتـە دەر، خڵت سـینە، بەڵغەم.

**ئاختە** (نا. ـ ئان.) بڕ: یەختە

**ئاخـــدار** (ئان. فـــا)[ئاخ2 + دار] کـــەسـێک کـــە ئاخ لـە دڵە، داخـــدار، خـەفـەتبـار. ‌:: ئاخ چراخ! چ ئاخ؟ ئاخ پـەی ئاخـــدارێ/ چون من خـــاترخـــار خەمبار داخدارێ (مەولەوی ل ٥٥).

**ئاخـر**[1] (ئام.)[عـەر: آخـر] مـەگـەر، ئاخـە، ئیـدی، ئیـتـر. ‌:: ئاخـر نـەمکوت وامەکە. ئاخر کەی وادەبێ برا!

**ئاخر**[2] (ئان.)[ عەر: آخـر] ١ـ دوایی، کۆتایی، پاشی هەموو شتێک و کەسێک، ئاخـیر، قـرڕە (لە یاری و کـایە دا). / / ئەوەڵ، هەوەڵ، یەکـەم. ٢ـ (نا.) ئەنجام و دوایی کـارێک یا شـتـێک. ‌:: ئاخـری شـــەڕەکـــەتان بە کـــوێ گـــەیشت. ٣ـ ئاخـرەت، دوارۆژ. ‌:: ئاخـرت خـێـر بێ! ~ **بوون:** لە پشت هـەمـــوان بوون،

دوای هەمـــــوان بوون، تەواو بوون. ∷ عەلی ئاخر کەس بوو کە هاتە ژوور. ئەمە جگەرەی ئاخر بوو کە کێشامان. ~ **بە خێر بوون:** ١ـ کۆتایی هاتنی ژیان بە خێر و چاکـــە. ٢ـ ئاکـــامی باش و چاک هەبوونی کارێک. ~ **بە خـێـر کـردن:** کۆتایی پێهێنانی ژیان بە خێر و چاکە. ∷ خودا ئاخرت بە خێر کا! || **ئاخری خەت:** ١ـ دوایین ئێزگەی پاس و ئوتووبووس. ٢ـ (کنـ.) دوایی رێگا و ئامانجێک، دوایین مەنزڵ. **ئاخری زەمان:** بڕ: ئاخرزەمان. **ئاخری عومر:** دوایین ساڵەکانی ژیان. ∷ هەتا ئێستا هەر خەریکی کار و کوێرەوەری بووم لەو ئاخری عومرەم دا دەمەوێ بە کەیفی خۆم بژیم.

**ئاخر**$^{3}$ (نا.)[باک] بڕ: ئاخوڕ

**ئاخرباز** (ئان. ل)[ئاخر1 + باز2] زارێکی کۆتربازانە و بەکۆترێک دەڵێن کە زۆر لە زەوی نزیک دەبێتەوە و لە سەرڕاوە هەڵدەستێتەوە.

**ئاخربەر** (ئان. ل)[ئاخر2 + بەر1] دوایین بەری وێنجە، کەوەر و شتی لەم بابەتە کە پتر لە جارێک بەر دەدەن، ئاخرتاش. ∷ ئاخربەری وێنجەکەمان درۆوە.

**ئاخربین** (ئان. فا)[ئاخر2 + بین2] کەسێک کە دوارۆژ و ئاکامی کار لە بەر چاو دەگرێ و رەمەکی و لەخۆوە کارێک ناکا. ∷ پیاو دەبێ ئاخربین بێ و هەروا بێ بیر کردنەوە خۆ پێدا نەدا.

**ئاخرتاش** (ئان. ل)[ئاخر2 + تاش (تاشین)][ئەر] بڕ: ئاخربەر

**ئاخرچۆڕ** (ئان. ل)[ئاخر2 + چۆڕ] ١ـ دوایین قومی ئاوەکی. ٢ـ ئاخرمناڵ، دواچۆڕ، پاشەبەرە.

**ئاخرخێر** (ئان. ل)[ئاخر2 + خێر] ١ـ کەسێک کە ژیانی بە خێر و خۆشییەوە تەواو دەبێ. / / ئاخرشەڕ. ٢ـ ئاکامی خێر و چاکی کارێک. ~ **بوون:** ١ـ کۆتایی هاتنی ژیان بە خێر و چاکەوە. ∷ خودا ئاخرخێرمان کا! ٢ـ دوایی هاتنی کارێک بە خۆشییەوە. ∷ سەری دانا لە سەر رووی تۆ، بە شوێنی زولفی تۆ دا چوو / وەفایی ئاخری خێر بێ، دەمێکە بێ سەر و شوێنە (وەفایی ل ١٤٦).

**ئاخر زەمان** (نا. ل)[ئاخر2 + زەمان] ١ـ دوایین دەورە و سەردەمی دونیا کە دەگاتە قیامەت و ژیانی دونیایی تەواو

دەبێ، پەسلان. ٢ـ (کنـ.) سەردەمێکی ناخۆش و گران کە کەس دە هانای کەسەوە نایە و هەرکەس دە خەمی خۆی دایە. ⁂ دەڵێی بۆتە ئاخر زەمان لە تینوان بخنکێی کەس چۆڕێکت ئاو ناداتێ! & ئاخری زەمان، ئاخرەت زەمان.

**ئاخرسەر** (نا. ل)[ئاخر2 + سەر] لە ئاکام، ئاخریکەی، ئاخرەکەی. ⁂ کاوە ئاخرسەر ئەو کچەی کە دەیەویست هێنای.

**ئاخرشەڕ** (نا. ل)[ئاخر2 + شەڕ] ئەو کەسەی ئاخری بە خێر تەواو نابێ و لە پیری دا ئەرکی دینی بەجێ ناهێنێ.

**ئاخرمناڵ** (ئان. ل)[ئاخر2 + مناڵ] بڕ: پاشەبەرە

**ئاخر و ئۆخر** (نا. ل)[ئاخر + و + ئۆخر] هەرە دوایی، ئاخری ئاخر، سنووری تەواو بوون. ⁂ ئاردمان پتر نەماوە ئەمە ئاخر و ئۆخریەتی.

**تێبینی:** ئۆخر بە تەنیا مانای نیە و بۆ داگرتنی پتر دەگەڵ ئاخر دێ، وێدەچێ گۆڕای ئاخر و ئاخر بێ.

**ئاخرکە** (گیانـ.)[ئاخ1 + رکە (ورکە)][باک] جۆرێک مێشوولەی وردە، رەنگی وەک خۆڵە، پیس پێوە دەدا و شوێن و جێگای پێوەدانی زۆر دەخورێ، Phle-botomus ناوی لاتینی ئەم گیاندارەیە، ئاخیرک، ئاخویرک، ئاخورک، پێشوولە، پینگۆک.

**ئاخرەت** (نا.)[عەر: ئاخرة] قیامەت، دونیای دیکە، ئاخری ئەم دونیایە

**ئاخرەت زەمان** (نا. ل)[ئاخرەت + زەمان] بڕ: ئاخرزەمان. ⁂ لەوان بوو رۆژی تەنگانە / لە کنیان ئاخرەت زەمانە / چەند گریان ئەو خاتوونانە! (مان ل ١٧).

**ئاخری** (ئان. ل)[ئاخر2 + ئی] ١ـ دوایین شت یا کەس. ⁂ لە ئاخری هەموان بێدەنگ دانیشتبوو. ٢ـ لە ئاکام، تەمای ئاخر، ئاخرسەر، ئاخریکەی، ئاخرێکەی، ئاخرەکەی. ⁂ ئاخری هەر بە قسەی خۆی کرد و رۆیشت.

**ئاخفتن** (چا. ل)[باک] بڕ: ئاخاوتن1

**ئاخل** (نا.)[باک] بڕ: ئاغەڵ

**ئاخلەوک** (نا. ل)[تور: یاغ (رۆن) + لاوە (تاوە)][باک] تاوە

**ئاخلێف** (نا. ل)[ئاخ1 + لێف][باک] ١ـ یەکەم مانگی بەهار، ئاخەلێوە،



خاکەلێوە. ٢ـ مێرگ، مێرغوزار.

**ئاخـڵـە** (نا.)[ عـەر: حلقـە][ئەر] ١ـ خـەرمـانەی دەوری مـانگ، خـرمـانە ٢ـ دیواریکی نزمـە لە قوڕ یا تەپاڵە کە وەک جەغز ساز دەکرێ و هەتا سەر سینگ یا باڵا بەرز دەکرێتەوە و کا و گژ و گیای تێدەکەن ٣ـ پەپکە، پاپۆکە، کەڵکە. **~ دان:** ١ـ خـەرمانە دانی مـانگ ٢ـ پاپۆکـە خـواردنی مـار. ٣ـ کۆ بوونـەوەی خـەڵک وەکوو جەغز لە دەوری کەسێک.

**ئاخمە** (ئان.)[؟][باک ـ زا] پرژ، بڵاو.

**ئـاخـن** (پـاشـ.)[لـە: ئـاخـنـین] ڕەگـی چاوگی ئاخنـین و ئاخنینـەوە کــــە بـە نـاوەوە دەلـکـێ و نـاوێـکـی تـازە یـا ئاوەڵنـاوی پێ سـاز دەکـا. ⁂ نێـوئاخن، باڵنجی پەڕئاخن.

**ئاخندراو** (نا. مـــف.)[لە: ئاخندران] دەفــر یا شــتــێکی باش داگــیــرابێ. ئاخنراو.

**ئـاخـنـدران** (چـا. ل)[بـر: ئـاخـنـین] کـوترانەوە و بـاش داگـیـرانی دەفـر یا شـتێکی نێوبـۆشی وەک جەواڵ و تەلیس وەها کە چی دیکە نەبا، ئاخنران.

**ئـاخـنـران** (چـا. ل)[بـر: ئـاخـنـین] بڕ: ئاخندران

**ئاخنراو** (نا. مــف.)[لە: ئاخنران] بڕ: ئاخندراو

**ئاخنین** (چا. م)[پەه: ئـاکـەنتـەن. ناو: ئـاخـنـین، ئـاخـنـینـەوە ـ هـەو: ئـاخـنـای] تێنان و پڕ کردنـی بۆشـاییـەک بە زۆرەوە وەها کــە هـەمــوو کــون و کـەلێنەکـانی بگرترێ، تـەپاندن ⁂ کـەندووکـەم لە ئارد ئاخنیــوە. بە پەڕۆ و پـاڵ وەها کـــەلێنی پەنجەرەکانی ئاخنیبوو با ڕێی دە ژوورێ نەدەکەوت.

**ئاخـنـینـەوە** (چا. م)[ئاخـنـین + ئـەوە] ســــــەر لـە نوێ ئـاخـنـین، ئـاخـنـین بـۆ مەودایەکی دوورتر و درەنگتر. ⁂ پەنیری ئەو ساڵمان ئاخنیوەتەوە.

**ئاخو** (نا.)[زا] بڕ: ئاخوو

**ئاخوا** (ئام. ل)[ئا3 + خوا2] ئامرازی پرسـیـار کـردن، ئاخـۆ، داخـوم، داخـودا، بڵێی، ئایا.

**ئـاخ و داخ** (نـا. ل)[ئـاخ + و + داخ] غـەم و حـەسـرەتی زۆر و پێکەوە، ئاه و داخ و نـاڵـەی زۆر تـێکـەڵ دەگــــــەڵ کـڕووزانەوە. ⁂ ئیــتــر ئەوجــار من و ژینێکی بێ وەی / ئیــتــر جـێی ئاخ و داخان بگرێ ئۆخەی (هێدی ل ١٤٨).

**ئاخور** (نا.)[باک ـ زا] بڕ: ئاخوڕ.

**ئاخورک** (گیانـ.)[باک] بڕ: ئاخرکە

**ئاخورە** (نا.)[زا] بڕ: ئاخوڕ

**ئاخــوڕ** (نا.)[ئەو: ئاکــوەرە ـ پەھ: ئەخــوەر، ئاخـڤـەر. بیـر: ئاخـۆر ـ فـار: آخـور ـ لۆر: ئـاھۆر. باک: ئافـر، ئافـەر، ئاڤر، ئاخور، ئاخر ـ ناو: ئاخوڕ ـ باش: ئاخوڕ ـ ھەو: ئاوڕ ـ زا: ئاخور، ئاخورە] جێگایەکە بە خشت یا قوڕ و بەرد سازی دەکەن، هەندێکی لە زەوی بەرز دەکەنەوە و ناوەکەی قووڵ دەکەن و ئالیکی بۆ وڵاغ تێـدەکـەن، دەمگە. ~ **لێگۆڕان:** (کنـ.) هـەوایـەکی دیکە دە کـەللە دابوون و خـۆ لێگۆڕان. || **ئاخــوڕی بەرز:** (کنـ.) لووت بەرز، بەفیز، تڕزل. **ئاخوڕی چەور:** (کنـ.) ساماندار و سایەچەور.

**ئاخــوڕاو** (نا. ل)[ئاخــوڕ + ئاو1] شـوێنێکی هەڵبەسـتراو و سـاز کراو لە داری نێوکۆڵکراو یا بەرد و قووڕ بۆ ئاو خواردنەوەی ئاژەڵ، کۆل.

**ئاخوز** (نا.)[؟][هەو] بڕ: ژەک

**ئاخون** (نا.)[ئەر] بڕ: ئاخوند

**ئاخـوند** (نا.)[فـار: آخـوند] مـەلای شیعەکان، ئاخون.

**ئاخ و ئۆخ** (نا. ل)[ئاخ2 + و + ئۆخ] دەنگی ژان و ئێش. ~ **کــردن:** دەنگ هەڵبـڕین لەبەر ئێش و ژان، ئـاخ و ئۆف کـردن. ~ **لێــبــڕین:** زۆر لێــدان لە کـەسـێک هـەتا دەمـی مـردن، وەها کـە دەنگی لێ دەر نەیە، ئاخ و ئۆف لێبڕین.

**ئــاخ و ئــۆف** (نـا. ل)[ئــاخ2 + و + ئۆف] بڕ: ئاخ و ئۆخ. ~ **کــردن:** بڕ: ئاخ و ئۆخ کردن. ~ **لێبڕین:** بڕ: ئاخ و ئۆخ لێبڕین.

**ئاخویرک** (گیانـ.)[باک] بڕ: ئاخرکە

**ئاخویە** (نا.)[زا] بڕ: ئاخوو

**ئاخــۆ** (ئام.)[ئا3 + خــۆ (خــودا)] ئامرازی پرسیار، ئاخوا، داخودا

**ئاخۆڕان بخۆڕان** (نا. ل)[؟] شێواوی، چ بە سـەر چیەوە نـەبوون، کەس بە کەس نەبوون، هەرکـەس بۆ خـۆی، ئاخـۆڕان زاخۆڕان، بشێوە.

**ئاخـۆڕان زاخـۆڕان** (نا. ل)[مـوک] بڕ: ئاخۆران بخوران

**ئاخــوو** (نـا.)[؟][باک: ئـاخــوو ـ زا: ئاخو، ئاخویە] ژەهر، ژار.

**ئاخە** 1 (نا.) ئاغا، ئاخا

**ئاخـە** 2 (ئام.)[بڕ: ئاخـر1] ئاخـر،

ئەخە، مەگەر. ⁙ ئاخە نەمکوت وا مەکە رۆڵە گیان!

**ئاخەئاخ** (نا. د)[ئاخ2 + ئە + ئاخ2] ئاخی پەیتاپەیتا و لە سەر یەک، ئاخ و ئۆف. ⁙ ئەرێ ئەو ئاخەئاخە چیە داناوەتەوە؟ هەر ئاخەئاخیەتی.

**ئاخەبان** (نا. ل)[ئاخ1 + ئە + بان1] ١ـ داپۆشینی بانی ماڵ بە گڵ و خۆڵ پاش دارەڕا کردن و پێش سواغ دانی، گڵەبان، خاکەبان، هەڕەبان، ئاخبان. ٢ـ چاوە خانوویەکی سەربانەکەی تەخت بێ. ⁙ کیژ هەر کیژێ دووگوندانە / جێگای خۆشیان ئاخەبانە / کیژیان جوانە لۆ کوڕانە (فۆلکلۆر ل ٤٦). ٣ـ [باک] خەڵکی یەک خاک، هاوشاری.

**ئاخەبانوو** (نا. ل)[ئاخە1 + بانوو] بڕ: ئاغابانوو

**ئاخەلێوە** (نا.)[ئاخ1 + ئە + لێو + ئە] یەکەم مانگی بەهار (بڕ: خاکەلێوە)

**ئاخیر** (ئان.) بڕ: ئاخر2

**ئاخیرک** (گیان.)[باک] بڕ: ئاخرکە

**ئاخین** (چا. ل)[باک] بڕ: ئاخ هەڵکێشان.

**ئاخیە** (نا.)[عەر: اخیە][ئەر] گوڵمیخ، سینگ، مێختەوێڵە.

**ئاخێز** (نا.) حاڵەتی کەسێک کە دانیشتوە و بۆ نیشان دانی هەستان لە بەر کەسێک هەندێک خۆی دەجووڵێنێتەوە، خێز. **~ کردن:** نیوە هەستان بۆ ڕێز، جووڵەیەک بە پاشەوەی لەش دان بۆ هەستان بەڵام هەڵنەستان. ⁙ وسوو بۆ ڕێز لە مەلا ئاخێزێکی کرد و دانیشتەوە.

**تێبینی:** ئاخێز لە چاوگەی ئاخێزیتەن و ئاخیستەن ـ ی پەهلەویی و خێزیای؟ هەورامی بە مانای هەستان کەوتوە.

**ئاخێوتن** (چا. م)[ئەو: یەئۆگ ـ پەه: ئایۆختەن ـ ناو: ئاخاوتن، ئاخێوتن] لنگ دانی وڵاغ، لێخورین، ئاژۆتن. ⁙ لە کوردوستانی باخێوێ / لە بەغدایێ سەر ببزێوێ / ئێران و توران بشێوێ. (مان ٢٩٧). لە عەرسەی شێعر دا، ئەحمەد عەجایب شەهسوارێکە/ لە مەیدانا بزانە ئەسپی خۆم چۆنی دەئاخێوم (ئەحمەد موختار ل ٨٦).

**تێبینی:** ئایۆختەن āyōxtan لە زمانی پەهلەویی یەئۆگ yaog لە ئەوێستا دا بە مانای ساز و ئامادە

کـردنی ئەسپ و لێـخـورین و ئاژۆتن هاتوه.

**ئاخێـوەر** (ئان. فـا)[لە: ئاخـاوتن1] قسەکەر، بێژەر. :: ئاخێوەرانی کورد لە خوراسان زۆرن.

**ئاد** (جنا.)[هەو] سێهەم کەسی تاکی نێر، ئەو.

**تێبینی:** پیتی داڵ لەم وشەیە دا وەک پیـتـی " ذ " دەردەبردرێ کـە تایبـەتی زاراوەی هەورامییە.

**ئـادا**¹ (نـا.)[؟][بـاک] هـەرەس، هەڵپەرتاوتنی دار و درەخت، ئادە.

**ئادا**² (نا. ل)[؟][ئەر] خوشکی گەورە بە تایبەت لە زمان منداڵەوە.

**ئادار**¹ (نا.)[بڕ: ئاسار1] ئەم وشەیە دەگەڵ پادار دێ و مانای بناغە و بنەڕەت دەدا، ئاسـار1. :: ئاداری لە سـەر پاداری نەماوە.

**ئادار**² (نـا.)[سـور: آذار،آدار] شەشەمین مانگی سوریانی کە بەرابەرە دەگەڵ یەکەم مانگی بەهار، مانگی بەر لە نیسان، هادار، ئازار، مارس. :: ئادار ناڕوا بە بێ دۆ / نیسان ناڕوا بە بێ جۆ (پەند).

**ئادارک** (گـیـا.)[ئادار2 + ک][باک] گیایەکی خۆڕسکی بەهارییە، هەتا نیو گوزێک بەرز دەبێتەوە، لە نێو مێرگ و مێرغوزاران دەڕوێ، گەڵاکانی گرنی گرنی و گوڵەکەی تاک و ڕەنگێکی مۆری مەیلەو سووری هەیە، Anemone pulsatilla ناوی لاتینی ئەم گیایەیە، گولاڵە، گوڵاڵە سوورە.

**ئاداش** (نا. ل)[تور: adaş] دوو کەس کە هاوناو بن و یەک ناویان هەبێ. (بۆ وێنە دوو کەس کە ناویان کەریم بێ دەبنە ئاداشی یەکتر)، هاوناو.

**ئادامس** (نا.)[؟] بنێشتی ساز کراوی کارخانە، چەققە.

**ئادان** (نا.)[باک] ١ـ ئەو شتانەی کە لە شیر ساز دەبن، لەبەنیات. ٢ـ خۆراک، چێشت. ٣ـ بەرهەم، داهات، حاسڵات.

**تێبینی:** ئادان هاوڕیشەیە دەگەڵ ئەدەنە adana بە مانای چێژ لە چاوگی ئەد ad ـ ی سانسکریت بە مانای خواردن.

**ئادر** (نا.)[زا] بڕ: ئاگر

**ئادرجـا** (نـا. ل)[ئادر + جـا][زا] ئاورگ، ئاگردان.



**ئادرگــان** (نا. ل)[ئادر + گــان][زا] ئاورگ، ئادرجا، ئاگردان.

**تێبینی:** گان و هەروەتر جا، گا و گ (لە ئاورگ دا) لە ریشــەی ئەوێســتــایی گاتو gātu و گاس gās ـ ی پەهلەویی بە مانای جێ و جێگا کەوتوون.

**ئادرنال** (نا.)[فــەر: adrenal] دوو لووی چووکی ســەر گــورچیلەن کــە لە بەشی ناوەندی ئەم لوویانە هۆرمۆنێک بە ناوی ئادرنالین دەدەڵێ دەچێــتــە نێــو خۆێنەوە.

**ئادرنالین** (نا.)[فــەر: adrenaline] هۆرمۆنێکە کە لە ئادرنال دەدەڵێ و پلەی زەختی خوێن دەباتە سەر.

**ئــادرە** (نــا. ل)[ئــادر + ئــە][زا] بــڕ: ئاگرە

**ئادرێس** (نا.)[فەر: adresse] ١ـ ناو و نیشانی ماڵی کەسێک یا شوێنێک. ٢ـ ناو و نیــشــانێک کــە لــە ســەر کــاغــەز و پاکەت دەنووسرێ، عینوان، ئەدرێس.

**ئادل** (نا.)[زا] بڕ: ئاگر

**ئادە** (نا.)[باک] بڕ: ئادا.

**ئادەم** (نـا.)[عـــــەر: آدم] ١ـ بـاوکی مرۆڤ، باوکە ئادەم، مێردی حەوا، یەکەم مـرۆڤ بە پێی ئایینی سـامـیـەکـان کـە بەرابەرە دەگەڵ مەشیەی ئارياییەکان.

بە پێی بڕوای موسڵمانان ئادەم یەکەم کەس بوو کە خودا لە خاک سازی کرد و حـەوای خـێـزانی لە دەندەی چەپی ئادەم ئافراند و لە بەهەشتی دانان و خواردنی گەنم یا سێوی لێ قەدەغە کردن. دوایی شـەیتـان فریوی دان و گەنمی دەرخـوارد دان و لـە بـەر ئـەوە خـــودا لـە بـەهـەشـت دەری کردن و ئەوانی خستە زەوی. ئادەم ســەد ســاڵ لە بـەر خــودا پاڕاوە هـەتا تۆبەکـەی قـەبووڵ کـرد. بـەو پێـیـە دەڵێن بەرەی ئێـسـتـای مـرۆڤ لە گۆی زەوی دا لە ئادەم و حـەوا کەوتوونـەوە. ٢ـ مـرۆڤ، ئینسان، کەس

**ئادەمی** (ئان. ل)[ئادەم + ئی] مـرۆڤ، ئینسان

**ئادەمـــیـــزا** (ئان. ل)[ئـادەمی + زا] بەشـەر، مرۆڤ، ئـینسان، ئەو کـەسـەی لە بەرەی ئادەم کەوتوە. ئادەمیزاد

**ئادەمـــیـــزاد** (ئان. ل)[ئادەمی + زاد] بەشـەر، مرۆڤ، ئادەمیزا .

**ئادەی** (ئام.)[ئـا3+ دەی] ئـامـــــرازی هـاندان، دادەی، ها دەی، دەی. ⁂ ئادەی لە منوو نەکـەوێ ئەم بارەم دەگەڵ دەست

دەنێ.

**ئادی** (ئاک.)[ئەو: زی] ١ـ بەڵێ، ئا، ئەدی، ئەرێ. ﺒ ئادی وایە! ـ منداڵەکان لە دەرێن؟ ـ ئادی! ٢ـ ئامرازی پرسیارە، ئەرێ. ﺒ ئادی برسیت نیە نانت بۆ بێنم؟

**تێبینی:** دوو پیتی د و ز ئاڵوگۆڕیان لە ئەوێستـــاوە بۆ کـــوردیی زۆرە وەک: زەستە، دەست ـ زرەیەه، دەریا ـ زێرێد، دڵ.

**ئـادی و بـۆدی** (نـا. ل)[ئـادی + و + بۆدی] تەفرە، سەفسەتە. **~ کردن:** ئا و بۆ کردن، بۆ گێژ کردن و تووشی هەڵە کـــردنی لایەنی بەرپرســـیـــار و خـــۆ پەڕاندنەوە، سەفسەتە کردن.

**ئار**[1] (نا.)[باک] بڕ: ئارد

**ئار**[2] (نا.)[باک] بڕ: ئاگر.

**تێبینی:** ئار لە زاراوەی باکووریی دا برەوی هەیە و لە زاراوەی کـــلاســـیکی هەورامی دا هـەندێک جـــــار بەرچاو دەکـەوێ و لە زاراوەی ناوەندیی دا تەنیا لە هەندێک پەند و مـــەتەڵ دا بە کـــار دەبردرێ ﺒ ئاری ســـاج کـــەرێم، بێ بە ماچ کەرێم (پەند). ئاو و ئار، هار و مار ئامانیان نیە (پەند).

**ئار**[3] (نا.)[عەر: عار][باک ـ زا] عار، شەرم، شوورەیی، عەیب.

**ئار**[4] (پاشـ.) ١ـ بە ناوەوە دەلکێ و ناوێکی تازە ســاز دەکا. ﺒ (بن) بنار، (ژەنگ) ژەنگار، (نسێ) نســـار. ٢ـ بە ریشـــەی هەندێک چاوگـــانەوە دەلکێ و (ناوی مەسدەر) ساز دەکا. ﺒ کوشتار، پرسـیـار، وتار. ٣ـ بە ریشـەی چاوگەوە دەلکێ و دەیکاتە ناو یا ئاوەڵناوی فـاعیلی. ﺒ فرۆشیـار، کڕیار. ٤ـ بە ریشەی چاوگەوە دەلکێ و ناو ساز دەکا. ﺒ مردار، زانیار.

**ئار**[5] (نا.)[ســـۆر] بڕ: ئاڵ3. **~ بوون:** بڕ: ئاڵ بوونەوە

**ئار**[6] (نا.)[سۆر] بڕ: ئاڵ1

**ئار**[7] (نا.)[بڕ: ئاش1] لە هەندێک وشـــەی لێکدراو دا مـــانای ئاش دەدا و هـاوتـای ئاریەی زاراوەی زازاییـــە. ﺒ ئارسی، ئاروانچی.

**ئار**[8](نـا.)[فـــەر: are] ئەندازەیەکـە بەرابەر دەگەڵ سەد میتری چوارگۆشە. ﺒ هیکتارێک بەرابەرە دەگەڵ سەد ئار.

**ئارا**[1] (نا.) ١ـ پەیوەندی و نێوانی دوو یا چەند کـەس دەگـەڵ یەکـتـر، بەین،

دۆستـایەتی، نێـوان. :: بارام دەمـێکە هات و چۆم ناکا ئارای دەگەڵم نەماوە. ٢ـ هۆگری، پێخۆش بوون و حەز لە ئیش وکارێک یا خواردەمەنی یەک. :: ئارات دەگەڵ سەما چۆنە؟ ـ ئارام دەگەڵی نیە. ٣ـ مـابەین، مـەودا، نێـوان، دووری دوو شت لە یەکتر. ٤ـ هەبوون، لە گۆڕێ . **لە ~ دا بوون:** لە گـــــۆڕێ دابـوون، هەبوون. :: هەستە با بڕۆین لێرە چ دە ئارا دا نیە.

**تێبینی:** ئەم وشەیە لە ئەسڵا بە مانای سـێـهـەم (دووری دوو شـتی مـاددی لە یەکتـر) بوە، بەڵام بەرەبەرە جێگەی بۆ ئەوانیتر چۆڵ کردوە. لە زمانی لاتیندا AREA بە جێ خرمان کوتراوە و هەر ئەم وشەیە لە زمانی ئینگلیسی دا هەیە و بە (مەساحەت، مەڵبەند، دالانی تەنگی درێژ کە لە ناو ماڵەوە بچێ بۆ ژێرخان و ژێرزەمـــینان) دەکـــوترێ، لە تورکی ئازەربایجان دا هەر بە مانای سێـهـەم وەرگیراوە. (قامووس ب ١ ل ١٢).

**ئارا**[2] (پاشـ.) رازێنەر، جـــوانکەر. بەدوای ناوەوە دەلکێ و ناوی فاعلی ساز دەکـــا. :: بەزم ئارا، دلآرا. دەمـــێکی هەستـە پێ قوربان جەماڵت عالەم ئارا کە/ بزانن نەخلی تووبا، باغی جەننەت خار و خاشاکە (وەفایی ل ١٢٨).

**تێـبـینی:** ئارا هـەر بەم مـانایەوە لە ئاراسـتنی فـارسی بە مـانای رازاندنەوە کەوتوە و بە ئەدەبی کلاسیک دا هاتۆتە نێو زمانی نوێی کوردیی.

**ئـارا**[3] (نـا.)[؟][زا] نـان و چـایـی بەیانی، بەرچایی.

**ئارا**[4] (نا.)[سۆر] بڕ: ئالآ1

**ئاراف** (نـا. ل)[ئـار2 + ئـاف][بـاک] شـیـو و کـوڵ، ئـاوی سـاز کراو بۆ جل شوشتن. [بڕ: ئاراو]

**ئاراق**[1] (نا.)[باک] ئارەق. بڕ: ئارەق1

**ئاراق**[2] (نا.)[زا] ئارەقە. بڕ: ئارەق2

**ئارام** (نا. ل)[ئا13 + رام][ئەو: رەم ـ پەھ: رام، ئارەم ـ سان: رامـەیەتی. باک: ئـارام ـ نـاو: ئـارام ـ بـاش: ئـارام ـ هـەو: ئارام] ١ـ ئۆقرە، حەجمین، بڕست، توانا. :: ئەو ژانـە سـەرە ئـارامی لێـبـڕیوم. ٢ـ هێـدی و هێـمن، لەسـەرەخـۆ. :: هەتا خـودا حــەز دەکـا پیـاوێکی ئارام و لەسـەرەخـۆیە. ٣ـ بێـدەنگ و بێ قـرە، ئەهوەن. :: کوێستان شوێنێکی ئارام و خـۆشـە. ٤ـ (ئاک.) یەواش، سـەبر، بە ئەسـپـایی، ئارام ئارام. :: ئارام بە

ڕێـگـایــە دا دەڕۆیـشــت. **ئـارام ئـارام:** وردەوردە، بە ســـەبرا، لە ســـەرەخـۆ. ∷ ئارام ئارام بـە لۆژەلۆژ / ئەوا بەرەو مـاڵ بوومـــەوە (ناڵەی جــودایی ل ٣٠). **~ بوون:** ١ـ بێــدەنگ بوون، ئـارام گــرتن، جـووڵە نەکـردنی گـیـاندار و بێ گـیـان، هەدادان. ∷ ڕۆڵە تـاوێک ئـارام بە بزانین دونیا چ باسە! دونیا ئارام بوو کە حەمە وەدەرکـــــەوت. هـات و هـاوار بڕانـەوە و هەمـوو ئارام بوون. ٢ـ هێدی بوون و کەم بوونەوەی ئێش و ژان. ∷ ئێستا باشترم ژانەکە هەندێک ئارام بوە. **~ بوونەوە:** ١ـ ژێر بوونەوە، ئۆقرە گرتن، ئارام بوون. ∷ دوای تـاوێک منداڵەکــە ئارام بۆوە و دانیـشت. ٢ـ دامـرکـانـی ئێش و ژان. ٣ـ بێـدەنگ بوونی ئاژاوە و هات و هاواری خــەڵک. **~ گــرتن:** ئارام بـوون، ئارام بوونەوە، حـەجـمین، هەدادان، داسـەکنین، داکـاســان. **~ لێبڕان:** ئۆقرە لێبڕان، ئارام لێـهەڵگـیران، حـەجـمین لێبڕان بە هۆی ئازار و دەرد و خـەم، ئارام و قـەرار لێـبـڕان، ئارا و قـارا لێبـڕان. ∷ لەوەتی ددانم دێشێ شــەوانە ئارامم لێـبـڕاوە. لە داخ ئەو کــوڕەم ئارامم لێـبــڕاوە. **~ لێبڕین:** تێک دانی حـەسـانەوەی خـەڵک، تێک چوونی هێـمـنایەتی، ئارام و قـەرار لێــبــڕین، ئارا و قــارا لێـبــڕین. **~ لێهەڵگرتن :** ئارام لێبڕین، ئارام و قەرار لێـهەڵگرتن، ئارا و قارا لێـهەڵگرتن. **~ لێهەڵگیران:** بڕ: ئارام لێبڕان. || **ئارامی دڵ:** ١ـ ئەو کـەسـەی کە بوونی هۆی ئارام بوونـەوە و ئەرخــــەیانی دڵە، کـــەسـی خـۆشـەویست، منداڵ. ٢ـ (کنـ.) گـراوی، یار، حـەز. & ئارامی دڵان، ئارامی رووح، ئارامی گیان. ∷ لە لایەک ئارامی دڵم بە عـومـری تۆ لـە بەر چاوم هەڵگـیـراوە/ لە لایەک دوژمـنـایەتی حــەوت هـەزار ســوار پێی دە دەرکـم نـاوە (ســــەعـــــیـــــد و مـیـرسـێـوەدین ل ٨٦). ئەرێ خـەندەی دەمت ئارامی دڵ کـانی حـەیاتی من/ لە سەر چی زیز دەبی؟ رووحت دەوێ؟ هانێ حـــەیاتی مـن (وەفــــایـی ل ٩٠). **ئارامی دڵان:** بڕ: ئارامی دڵ. ∷ فیدای گیانت بم ئارامی دڵان/ بۆ دەکـەی زاری و واوەیلا و گریان (بارام و گوڵندام ل ٩٥). مـەڵێن بولبول مەناڵێنە کەوا گوڵ گوڵشەنی چۆل کـرد/ دڵارامی نـەمــا چ بکا کــە ئـارامی دڵان رۆیی (وەفـــــایـی ل ٢٠٧). **ئارامی رووح:** بڕ: ئـارامی دڵ. ∷ بەبێ تۆ قـــەت نەژیم، شادیم نەمێنێ، دیدە بێ نوور بم/ دەمـــێک ئـارامی رووحـم بـە، حــــەیاتم، عومرەکەم، چاوم (وەفایی ل ٧٠). **ئارامی**

**گیان:** بڕ: ئارامی دڵ. ⁙ ئیمامیش با به دووی دا هەر بکا زاری هەتا ماوه/ به زاری بانگی هاوالان بکا، ئارامی گیان رۆیی (ئاوات ل ١١٣).

**ئارامگا** (نا. ل)[ئارام + گا3] ١- شوێنی ئارام گرتن و حەسانەوه، جێ حەسانەوه، حەساوگه. ⁙ هەرکەسێ رۆیی بۆ لای ئارامگا (سەعید و میرسێوەدین ل ٢٨). خەڵک بڵاوەیان کرد و هەرکەرس چۆوه ئارامگای خۆی. ٢- وچان، هەدا، ئۆقره. ⁙ جا ئەو هەلی، گەردنی دەکەمەوه حەوزی کەوسەر و بەژنی دەکەمەوه به بەیداغی رۆمیانه/ له بن وی دا ئیستراحەت دەکەم، ئەو هەله دەگەرمەوه ئارامگا و وچانه (شۆڕمەحموود ل ٨٤). ٣- ماڵ، خانوو، مەسکەن. ⁙ من دەڵێم مەسکەن و ئارامگەیی جانانه دەچم/ ئەو دەڵێ سەربەسەری تێکچووه وێرانه نەچی (ئاوات ل ١٣). ٤- (مجـ.) گۆڕ، کڵکۆ، قەبر. & ئارامگه.

**ئارامگه** (نا. ل)[ئارام + گه1] بڕ: ئارامگا.

**ئارام و قەرار** (نا. ل)[ئارام + و + قەرار] ئۆقره، حەجمین، ئارا و قارا.

**~ لێبڕان:** بڕ: ئارام لێبڕان. **~ لێبڕین:** بڕ: ئارام لێبڕین. **~ لێهەڵگرتن:** بڕ: ئارام لێهەڵگرتن. **~ لێهەڵگیران:** بڕ: ئارام لێهەڵگیران.

**ئارامی** (ئان. ل)[ئارام + ی] ١- ئەهوەنی، هێمنی، بێ شەڕ و شۆڕی. ٢- بێدەنگی، بێ هەست و خوستی.

**ئاران**[1] (نا.) ١- شوێنی دەشتەکی گەرم که مەڕدار و مەلی کۆچەر زستانان رووی تێدەکەن، قشلاخ، گەرمەسێر، گەرمیان، گەرمێن. // زۆزان ⁙ ئەو له زۆزان من له ئارانی دەژیم / کێ دەڵێ ئەمنیش وەلی دێوانه نیم (ناڵەی جودایی ل ٢١). ٢- شوێنی تەخت و بێ تەپۆڵکه، دەشتایی بچووک. ٣- [ئەر] زەوی تەخت، نەرمان. ٤- [باک] بیاوان، بیروون، چۆلگه.

**تێبینی:** من پێموایه بنەمای وشەی ئاران [ئار (ئاریا) + ئان (پاشگری شوێن)] دەچێتەوه سەر ئەریەن aryan به مانای ئاریایی و هاوڕیشەوە و هاومانایه دەگەڵ ئالان (به لەبەر چاو گرتنی ئاڵوگۆڕی دوو پیتی ر و ل) که ناوچەیەکه له کوردستان له نزیک سەردەشت و هەروەها ناوی هۆزێکه له

دەرســـــیم و پیــــــران. ئالان و ئاران هـەردووک بـە مـــــانای ولات و نـاوچـەی ئاریاییــەکــانـە. هەروەتر ئاران و ئالان ناوی نـاوچـەیەکـە کـە ئێسـتـاکـە ناوی ئازەربایجـانی رووسـیــەیە و دیارە کـە پێشـتـر مـادەکانی لێ نیشـتـەجێ بوون، یونانییـەکان و رۆمـەکـان پێیان کـوتوە Albania و ئەرمەنییەکان بە ئاغوانەک و عەرەبەکان بە ئەرران ـ یان ناو بردوە.

جگە لەوە وشەکانی area و arena لە زمانی ئینگلیسی و area و arean و areal لە سویدی دا بە مانای مەیدان و مـەسـاحـەت، سـەتح، ناوچە. هـەروەتر areal لە رووسی دا بە مـانای ناوچـەیە کە هەموویان بە گشتی لە area لاتینی بـە مـانـای مـەیدان و مـــەسـاحـــەت وەرگـیـراون هاوڕیشـەی ئەم وشـەیەن لە زمانەکانی ئەورووپایی دا.

**ئاران**[2] (نا.)[؟][بـاک] ئێش، ئازار، ئەزیەت

**ئاران**[3] (چا. ل)[سۆر] بڕ: ئالان

**ئاراندن**[1] (چا. م)[لە: ئاران2][باک] ئەزیەت دان، ئێشاندن.

**ئاراندن**[2] (چا. م)[سۆر] بڕ: ئالاندن

**ئـاراو** (نـا. ل)[ئـار2 + ئـاو1][بـاک: ئاراڤ ـ ناو: ئاراو ـ هەو: ئاراو] کەفاوی دوای جل شوشتن کە هێشتا بۆی هەیە جلی دیکەی تێدا بشـۆی، پاشـاراو، پەسـاو. زوو مـاڵە فـەقـیـر یا نۆکـەر و دەست کورت لەم کەفاوە دا جلەکـانیان دەشووشت.

**تێبینی:** بە پێی مانای ئاراڤ بەشی یەکەمی ئەم وشەیەم بردۆتەوە سەر ئاگر، چونکە زوو بۆ شـوشـتنی جل و جـۆرٍ لە مـاڵ یا لە دەم رووبار ئاگـریان سـاز دەکـرد و ئاویان گـەرم دەکـرد و بـە بێ ئـاوی گــەرم جل خــاوێن نـەدەبوونـەوە، وێدەچێ وشـەکە پێشـتـر ئار و ئاو بووبێ و دوایی لێک و لووس بوە و بۆتـە ئاراو و ماناکەشی لە موکریان هەندێک خزیوە و بۆتە کـەفـاوی دوای جل شـوشـتن کـە هێـشـتـا بۆی هـەیە جلی دیکەی پێ بشۆی.

**ئارا و قـارا** (نا. ل)[ئارا + و + قارا] بڕ: ئارام و قەرار.

**ئاریێش** (گیـا.)[ئار (کـەر) + بێش (گوێ)][زا] بڕ: کەروێشک.

**ئارتیشۆک** (گیا.)[فەر: Artichaut] گـیــایەکی خـۆڕسک و دەسـچـێنە، ریشەکەی ئەستوورە، گەڵاکانی گەورە و



گرنی گرنین، رووی گەڵاکانی سەوز و بنەوەی کورکی سپی پێوەیە، ساقەت راست و گوڵەکانی مۆر و جوانن، بەرەکەی قاوەیی و هەودای سپی پێوەیە، قیچکە و گەڵا ناسکەکانی دەخورێن، هەروەتر لە گەڵا و ساقەتەکەشی بۆ دەرمان کەلک وەردەگرن، Cynara scolymus ناوی لاتینی ئەم گیایەیە، کەنگری فەرەنگی.

**ئارج** (گیا.)[؟][باک] جۆرێک قامیشی قورس و نێو پڕە، رەنگی جوانە و هەتا بیست میتر بەرز دەبێتەوە، گەڵاکانی درێژ وەک گەڵای خورمایە و بەرەکەی هێشوییە، لە لاسکەکەی گۆچان و داردەست دروست دەکەن و لە گەڵاکەی رایخ و چەشنێک کەندر و لە ناوکەکەی جۆرێک دەرمان. ئەم قامیشە چونکە لە هیندوستان دەڕوێ قامیشی هیندیشی پێدەڵێن، حەیزەران.

**ئارجۆن** (ئان.)[زا] بڕ: هەرزان

**ئارخەیان** (ئان.)[تور: ئارخایان] دڵنیا، خاترجەم، ئەرخەیان. **~ بوون:** دڵنیا بوون، خاترجەم بوون، ئەرخەیان بوون. :: لەو منداڵە ئارخەیان نیم دەترسێم بەڵایەکی بە سەر خۆ بێنێ.

**~ کردن:** دڵنیا کردن، خاترجەم کردن، ئەرخەیان کردن.

**ئارخاڤک** (نا. ل)[ئار1 + خاڤ + ک][باک] بڕ: ئارد و رۆن.

**ئارد** (نا.)[ئەو: ئەشە ـ پەه: ئارت، ئارتەک. باک: ئارد، ئار، ئارڤان ـ ناو: ئارد ـ باش: ئارد ـ هەو: هارد، هاردێ ـ زا: ئارد، ئاردی] ١ـ ئەو ماکەیەی کە لە پاش هاڕینی گەنم دەمێنێتەوە و دەکرێ بە نان و هەندێک چێشت و خواردەمەنی دیکەی وەک حەڵوا، کولێرە، نێوساجی و ... ٢ـ هاڕاوی دانەوێڵەیەک کە بۆ خواردن دەست دەدا وەک: جۆ، برینج، نۆک. ٣ـ وردکراو و کوتراوی هەندێک بەر و میوەی وەک بەڕوو و توو. ٤ـ تۆز و ورکەی دار و چێو دوای مشار کردن و برین. :: ئاردە مشار. || **ئاردی نێو دڕوان:** (کنـ.) پڕژوبڵاو، پەخش و پەریشان، دەربەدەر. ***بوونە ئاردی نێو دڕوان:** پەخش و پەرێشان بوونی کۆمەڵێک لەیەک وەها کە نەکرێ کۆ بنەوە، لێک بڵاو بوون، دەربەدەر بوون. :: ئەو ماڵ و منداڵە وا لێک بڵاو بوون، بوونە ئاردی نێو دڕوان. ***وەک ئاردی نێو دڕوان لێکردن:** (کنـ.) پەخش و بڵاو کردن، دەربەدەر کردن، وەک تۆوی هەرزن

لێکردن.

**تێبینی:** وشەی ئارد بە تەنیا مەبەست لەهاڕاوی گەنمە و دەگەڵ هەر هاڕاوێکی دیکە، دەبێ ناوی دانەوێڵەکەش بێ. :: ئاردی جۆ، ئاردی سەرداری، ئاردەنۆک، ئاردەتوو، ...

**ئارداویی** (ئان. مـف.)[ئارد + ئاویی2] کەسێک کە تۆزی ئاردی لە سەر نیشتبێ یا دەستی لە ئارد دابێ یا خۆی تێوەردابێ، هارداوی. **خۆ ~ کردن:** (کنـ.) ١ـ کەسێک کە هیچ کاری نەکردوە بەڵام بە رواڵەتی پێسی وا نیشان دەدا کە کاری کردوە. ٢ـ بە درۆ خۆ تاوانبار کردن بۆ کار و کردەوەیەک کە نەتکردوە.

**ئارداوێژ** (نا. ل)[ئارد + ئاوێژ] ١ـ کاری هاویشتن و فڕێ دانی ئارد لە نێوان دوو بەرداشەوە، ئاردەشان. ٢ـ (کنـ.) دەم و راوێژی خۆش یا ناخۆشی کەسێک.

**ئاردکێش** (نا. ل)[ئارد + کێش (کێشان)] جۆرێک بێڵی چووکی دارینە بۆ کۆ کردنەوە و لابردنی ئارد لە دەوری بەرداش و دەردانی لە قوڵکە.

**ئاردماڵک** (نا. ل)[ئارد + ماڵ3 + ک] پەڕۆ و پاڵێک کە بۆ خاوێن کردنەوەی دەورووبەری بەرداشەکان کەلکی لێوەردەگرن.

**ئاردوو** (نا. ل)[ئار2 + دوو2][باک] بڕ: ئاوردوو

**ئارد و رۆن** (نا. ل)[ئارد + و + رۆن] خواردەمەنیەکی گەرمە لە ئارد و رۆن و دۆشاو یا شەکر کە پتر بۆ ژنی تازەزاو و زەیستان سازی دەکەن، گۆیا بۆ گەرم داهاتن و وێک هاتنەوەی برینەکانی لەشی زۆر باشە، ئارخاقک، پەڵوولە، میوانی.

**ئاردەبا** ( نا. ل)[ئارد + ئە + با9] ئارد و ئاوی تێکەڵ کراو و کوڵاو کە بۆ دەباغی کەلکی لێوەردەگرن.

**ئاردەبارە** ( نا. ل)[ئارد + ئە + بارە3] هەندێک ئاردی زێدە کە ئاشێر لە هەر بارێک ئارد وەک دەستخۆشانە و حەقی بار دەیدا بە ئاشەوان، ئاردەوارە، قرەمز.

**ئاردەبرنج** (نا. ل)[ئارد + ئە + برنج1] برینجی هاڕاو کە بۆ فرنی و هەندێک شیرنی دەکاری دەکەن، ئاردەبرینج.

**ئاردەبرینج** (نا. ل)[ئارد + ئە +



بڕینج][موک] بڕ: ئاردەبرنج

**ئاردەبێژ**(ئان. ل)[ئارد + ئە + بێژ2] هەر شتێکی کە زۆر ورد هاڕابێتەوە و وەک ئارد دابێژترابێ. **~ کردن:** دابێژتنی شتی هاڕاو.

**ئاردەتوو** (نا. ل)[ئارد + ئە + توو] تووی ویشکی کرەکراو کە زۆرتر لە ناوچەی هەورامان دەیکەن، دەیخۆن و دەیفرۆشن.

**ئاردەجۆ** (نا. ل)[ئارد + ئە + جۆ1] ئاردی جۆ، هاڕاوی جۆ.

**ئاردەشان** (نا. ل)[ئارد + ئە + شان (شاندن)][ئەر ـ هەو] بڕ: ئارداوێژ

**ئاردەشلە** (نا. ل)[ئارد + ئە + شل + ئە] هەویری زۆر شل لە ئارد و ئاو کە وەک چرێش کەلکی لێوەردەگرن، ریتکە، ئاردەشیلە.

**ئاردەشیلە** (نا. ل)[ئارد + ئە + شیلە] بڕ: ئاردەشلە

**ئاردەڵ** (نا.)[روس: ordinaretse] فەرمانبەرێک بوە کە لە بەر دەستی والییەکانی ئێران دا و فەرمانەکانی والی جێبەجێ کردوە، گزیر، یاساوڵ، پێشخزمەت، ئەردەڵ، وەردیان.

**ئاردەڵۆک** (نا. ل)[ئارد + ئە + ڵۆک] بڕ: ئاردەڵووک.

**ئاردەڵووک** (نا. ل)[ئارد + ئە + ڵووک] ١ـ بڕ: ئاردەڵووکە/١. ٢ـ بڕ: ئاردەڵووکە/٢. ٣ـ هەرچی کە لە شێوە دا وەک ئارد سپی و ورد بێ. & ئاردەڵۆک.

**ئاردەڵووکە** (نا. ل)[ئارد + ئە + ڵووکە] ١ـ هەندێک ئارد کە لە قوڵکەی ئاش دا دەمێنێتەوە. ٢ـ بەفرێکی ورد و ویشکە کە دەست تەڕ ناکا و بە سانایش تۆپەڵ ناکرێ. & ئاردەڵووک، ئاردەڵۆک.

**ئاردەمشار** (نا. ل)[ئارد + ئە + مشار] تۆز و بڕەمشاری دار و چێو و تەختە کە بە هۆی مشار کردن دەڕژێتە سەر زەوی و وەک ئارد ورد و نەرمە، بڕە٤، هاردەمشار.

**ئاردەنۆک** (نا. ل)[ئارد + ئە + نۆک] ئاردی نۆک، هاڕاوی نۆک.

**ئاردەوا** (نا. ل)[ئارد + ئە + وا3] چێشتێکی شلە لە ئارد، پەڵۆ، پەڵووکە.

**ئاردەوارە** (نا. ل)[ئارد + ئە + وارە] بڕ: ئاردەبارە

**ئاردی** (نا.)[زا] بڕ: ئارد

**ئارزی** (نا.)[باک] بڕ: ئارەزوو

**ئـــارزیـــنـــگ** (ئـا.)[بـڕ: زنج][بـاک] چەنەگە، چەنە.

**ئارژنگ** (گــیـــا.) ١ـ دار بەڵاڵووک (کـشت و کـاڵ ب ١ ل ١٢). دارێکە وەک بەڵاڵووک داردەسـتی لێ دروست ئەکرێ (خـــاڵ ب ١ ل ٤٥)، هـارژنگ. ٢ـ [باک] چلکە و داری وشک، چرپی.

**تێبینی:** ئەرژەن لە زمانی فارسی دا و ئەرچەن لە راوێژیی کرمانی دا دارێکە لە دەستەی بادامییەکان و لە تیرەی گوڵ سووران، لە کوێستان و لێرەوار دەڕوێ کـە چەند جـۆری هـەیە Amygdalus ناوی لاتینی ئەم دارۆکـەیە (بڕ: مـعین ب ١ ل ٢٠٠).

**ئارسم** (نا.)[؟][باک] نەخـۆشـیـیـەکی ئاهۆدارە کـە لە بەر سـەرمـا وێکەوتن و هەوای مـیکرۆباوی تووشی مـرۆڤ دێ. هەلامەت، زوکام، پەسیف.

**ئارسەنیک** (نا.)[یون: arsenikon] مــادەیەکــە لـە رەنگی پۆڵا بـە ژمــارەی ئەتۆمی ٣٣ و وەزنی تایبەتی ٧،٥، خۆی سـەمی نیـە بەڵام ئۆکسـیـدەکـەی کـە ئارسەنیکی سپی پێدەڵێن زۆر سەمییە، زەرنیخی سپی.

**ئارسی** (نا. ل)[ئار7 + سی (سەنگ)][زا] بڕ: بەرداش.

**ئارشـە** (نا.)[فـەر: archrt] دارێکی باریکی تایبـەتـە، نزیک نیـوگـەز درێژە، چەند داوی کلکی ئەسـپی وێدەخـەن و کەمان و کەمانچەی پێدەژەنن.

**ئارشـیــتـێکت** (نا.)[لات: -archi tectura لـــە یـــون: architekton] نەقـشـەکـێـشی خـانوو و ئاپارتومـان، مێعمار.

**ئارشـیــو** (نا.)[لات: archivum لە یوو: archeion] ١ـ کـۆمـەڵە سـەند و بەڵگە و شـــتی دیکەی لەم بابەتە. ٢ـ شـوێنی پاراستن و راگـرتنی سـەنەد و بەڵگە و پەروەندەی پاراســتــراو. **~ کـردن:** پاراسـتن و راگـرتنی سـەنەد و بەڵگە و هەر شـتێکی دیکە کە بۆ دوارۆژ پێویستە و دەبێ بمێنێتەوە لە شـوێنێکی تایبەتی کە بۆی تەرخان دراوە.

**ئارڤـان** (نا. ل)[ئار1 + ڤـان][باک] زمـهـەر، زمـهـار، ئـازووقـەی ئارد، ئارد، ئاروان.

**ئارڤانە** (گیانـ.)[ئارڤان (ئاروان1) + ئە][باک] وشتری مێ، دوندل.

**ئارکــۆرک** (نا. ل)[ئار2 + کــۆرک]



[باک] ماشه، مقاش.

**ئارگـــا** (نا. ل)[ئار2 + گـــا3][پەھ: ئاتورگـاس][هـەو] ئاورگ، ئاورخـــانە، ئاگردان.

**ئارگۆش** (گیانـ.)[ئـار (کەر) + گۆش] [زا] بڕ: کەروێشک

**ئارگـــۆن 1** (نا ـ ئان.)[ئار2 + گـــۆن] [پەھ: ئاتورگـۆنەک] لە رەنگی ئـاگـر، لە چەشنی ئاگر.

**تێبینی:** گۆن دەگەڵ گەئۆنەی ئەوێستا بە مـــانـای چەشـن، وەک و ئـاســـا هـاو ریشـــەیە.[ئـەو: گـــەئۆنـە ـ پەھ: گـــۆن، گۆنەک]

**ئـارگــــــۆن 2** (نا.)[لات: Argon] گـــازێکی بێ رەنگ و بێ بۆنـە، یەک لە سـەدی هەوای پێک هێناوە و لە هـەندێک گازی ئاگرپژێنان دا هەیە.

**ئارگـــووش** (گـیـــانـ.)[ئـار (کـــەر) + گووش][زا] کەروێشک.

**ئارگـــووشـک** (نا. ل)[ئار (ئـاڵوو1) + گووش + ک][باک] بڕ: ئاڵوو1

**ئارم** (نا.)[فـەر: arme] نیشـانەیەکی تایبەتی بۆ ناسـاندنی شت، کەس، شوێن یا گەلێک، نیشانە، دروشم.

**ئارمانج** (نا.)[باک] بڕ: ئامانج

**ئـارمـــووش 1** (نـا.) بڕ: ئـاوریشـم. ؞؞ شـازولفی دێنە خوارێ، بسکی ئارمووش و گـەردە / لە ولاتی غـەریبـیـانم هەمـوو جەرگم کەرت کەردە (سێسەد هۆنراوە ل ٣٢).

**ئـارمـــووش 2** (نا.)[؟][باک] خـــرت و خـاڵی ترێ دوای کـوشـین، تلّـتـەی ترێ، پرووش. (هس: پرووش2)

**ئاروان 1** (گـیـــانـ.)[؟] وشــتـــری سێ ساڵەی نێر یا مێ، بەرزە.

**ئــــاروان 2** (نـــا. ل)[ئــــار1 + وان] ئازووقەی ئارد، ئارد، ئارڤان.

**ئـاروانـچـی** (نـا. ل)[ئـار7 + وان + چی] بڕ: ئاشەوان

**ئاروان لۆک** (گــیـــانـ.)[ئاروان1 + لۆک] وشتری نێری چوار ساڵە.

**ئاروان وشـــتـر** (گـیـانـ.)[ئاروان1 + وشتر] وشتری مێی چوار ساڵە.

**ئاروانە** (گـــیــــانـ.)[ئاروان1 + ئە] وشتری چوار ساڵەی نێر یا مێ.

**ئاروێ** (گیا.) بڕ: ئاروو

**ئاروێش** (گـیـانـ.) [ئار (کـەر) + وێش

(گوێ)][زا] بڕ: کەروێشک.

**ئـارۆ** (ئـاک. ل)[ئـا16 + رۆ][هـەو] ئەمڕۆ، ئەوڕۆ، ئیڕۆ.

**ئارۆز** (ئان.)[سۆز] بڕ: ئاڵۆز

**ئارۆش** (گـیـانـ.)[ئار (کـەر) + ئۆش (گۆش)][زا] بڕ: کەروێشک

**ئاروو** [1] (گـیـا.)[پەهـ: خـیـار. باک: خـیار، ئـاروو، هـاروو ـ ناو: هارۆ، هاروو، هـاروێ، ئـاروێ، ئاروو، خـەیار، خـیـار ـ باش: خـیار ـ هەو: خـیار ـ زا: خـەیار] ١ـ بڕکـەیەکـە وەک بـڕکـەی کـاڵەک دەچێ و گەڵاکانی پان و گڕنی گڕنییە، گوڵێکی زەردی هـەیە کە لە دوایی دەبێتە قیچکە و بـەرێکی درێژ و ئـاوداری شــیـنی هـەیـە، Cucumis sativus نـاوی لاتینی ئـەم بڕکـەیەیـە. ٢ـ بەری ئـەم بڕکـەیە کــە لە پێشدا پێی دەڵێن قیچکە و کە پێگەیشت گــەورە دەبێ و دەبێــتــە خــەیار کــە مـــیـــوەیەکی درێژ و ئـاودارە، بە کـــاڵی دەخورێ و بۆ سـالاد و ترشیاتیش کەلکی لێوەردەگرن، خـەیار کە لە تەمـەنی تورتی تێپەڕی و پیر بوو پێی دەڵێن کـالیار کە بێستانچی بۆ تۆو رایدەگرن، گوڵبەسەر.

**تێبینی:** ئاروو و هـاوناوەکـانی دەگەڵ خـەیار هەرچەند بـە دوو وشـەی جـیـاواز دیاری دەکـــەن بـەڵام لـە راســـتـی دا هـەردووک هـەر یەک وشـــەن و تـەنیـــا پیـتـەکانیـان جێ گـۆڕکیـان دەگـەڵ یەک کـردوە. لە پـێشـدا ئاڵوگـۆڕی (ئـ) دەگـەڵ (ﻫ) کە ئەوە وێنەی زۆرە (ئاواڵ ـ هاواڵ، ئـارۆ ـ هـارۆ) دوایـی ئـاڵ و گــــۆڕی (ﻫ) دەگـەڵ (خ) کە ئەوەش هـەم لە کوردیی دا و هـەم لـە زمـــانەکـــانی کـــۆن دا وێنـەیان زۆرە (هـوون، خـــوون ـ خـــۆر، هـوور ـ خـەزوور، هەسوورە) و لە ئاکام (ئوو، ئۆ، ئـوێ) کــە بـە ئار یـا هـارەوە نووســـاون پاشگرن. هەروەتر وشـەی کـالیاریش هەر ئەم وشـــەیە کـــە مـــانـایـەکی دیکە و سیمایەکی دیکەی بەخۆوە گرتوە.

**ئاروو** [2] (ئا.) لای سـەرەوەی نێو زار، مـــەڵاشـــوو، ئاســـمـــانەی دەم. (هـس: ئارووک، ئاڵوودار).

**ئارووش** (گیانـ.)[ئار (کەر) + ئووش (گووش)][زا] بڕ: کەروێشک.

**ئارووک** (نـا. ل)[ئـاروو2 + ک][باک] بەری لای ژوورەوەی سەربان، میچ.

**تێـبـینی:** ئاروو یـا ئاری لـە وشـــەی ئاریک دا نازانم لە چ ریشـــەیەکـە بەڵام هەمــان ئاڵوو ـ ی زاراوەی نـاوەندییـە لە وشەی ئاڵوودار دا.



**ئاروونگ** (گـــیـــا.)[پەهـ: ئالەگ (هەڵووژە)][باک] ١ـ قـەیسی، شـــلانی، زەردالوو، زەردەلوو. ٢ـ قەیسی ویشک

**ئارە** (نا.)[سۆر] بڕ: ئاڵ2

**ئارەخــچن** (نا. ل)[ئارەخ (ئارەق) + چن] بڕ: ئارەقچن

**ئارەزوو** (نا.)[پەهـ: ئارزۆک، ئارزووک. بـاک: ئـارزی ـ نـاو: ئـارەزوو ـ بـاش: ئـارەزوو ـ هـەو: ئـارەزوو] ١ـ ئـاوات، دڵخـواز، کـاو. ٢ـ ئیـشـتـیـا، مـەیل، هەوەس، تاسـە. ٣ـ هیـوا، چاوەڕوانی. ٤ـ دڵخـواز. **~ کردن:** ١ـ داوخـواز کـردن، بـە ئاوات بـوون. ٢ـ مـــەیلی شـــتـــێک هـەبوون، بـە تاســـە بـوون. ⁙ دەمـــێکە ئارەزووی دیتنی دایکم دەکەم. ئارەزووی دەســتـاوی دەکـەم. **~ هەبوون:** ١ـ بە ئاواتەوە بوون. ٢ـ هیـوا هەبوون. ٣ـ مەیل هەبوون، ئیشتیای شتێک کردن.

**ئارەزووباز** (ئان. فـــا)[ئارەزوو + باز4] کەسێک کە مەیلی جنسی هەبێ، هەوەسباز.

**ئارەزووبازیی** (حم.)[ئارەزووباز + ئیی] کار و کردەوەی کەسی ئارەزووباز، هەوەسبازیی.

**ئارەزووکار** (ئان. ل)[ئارەزوو + کار] ئاواتەخـواز، تاسـەبار، ئارەزوومـەند. ⁙ شـەماڵ بـۆ لیمـۆم ئارەزووکارە/ لیمـۆی نەدیوم لە عالەم دیارە (بارام و گوڵندام ل ٧١).

**ئارەزووکـاریی** (حم.)[ئارەزوو کـار + ئی] بڕ: ئارەزوومەندیی

**ئارەزوومــــەند** (ئان. ل)[ئارەزوو + مـــەند][پەهـ: ئـارزۆمـــەند] بە ئـاوات، ئاواتەخواز، ئارەزووکار، تاسەبار.

**ئارەزوومـەندیی** (حم.)[ئارەزوومـەند + ئیی] تاســـەباریی، ئاواتەخـــوازیی، ئارەزووکـــاریی. ⁙ شـــەرحی دەردی ئارەزوومەندیی لە کەس تەئسیری نابێ/ ئەو کـەسـە دەردم دەزانێ گـەر لـە یاری خۆی جودا بێ (وەفایی ل ١٧٠).

**ئارەق** (نا.)[عـــەر: عـــــرق] ١ـ خـــواردنـەوەیـەکی ئاڵکۆڵدارە کـــە لە کـشـمـیش و سـێـو و خـورمـا و هـەندێک مـیـوەی دیکە سـازی دەکـەن و ٤٠٪ بۆ سـەرێ ئاڵکۆڵی تێـدایە و خـواردنەوەی سـەرخـۆشـی دێنێ. بۆ گـرتنی ئارەق لە پێشـدا ئەو میوەی کە دەیانەوێ بیکەنە ئارەق چاک خـاوێنی دەکـەنەوە و دان و داری زێدەی لێـدەگرن و لـە کـووپەیەکی دەکــــەن و ســــــەری دادەپۆشن هـەتا

دەترشێ. دوایە لە دەفـرێکی تایبـەتی دەکـەن (دوو دەفـرە کـە بـە لوولەیەک بە یەکەوە پەیوەندیان هەیە) کە بۆ ئەم کارە سـاز کـراوە. لە سـەر ئاگـری دادەنێن و دەیکوڵێنن، هەڵم بـە لوولەی دەفـرەکـە دا دەچێتـە دەر و لە سەری دیکەی دەفرەکە کە سارد کراوە دیتە دەر و دەبێتە ئارەق. ~ **کێشان:** سـاز کـردنـی ئارەق بەو شێوانەی کە کوترا، ئارەق گرتن. ~ **گرتن:** سـاز کردنی ئارەقی خـواردنەوە و ئارەقی گـیـا و گـوڵ، ئارەق کـێشـان. ‖ **ئارەقی دوو کـوڵ:** ئارەقـێکە کـە بـۆ زیاد کـردنی ئاڵکۆڵەکـەی جـارێکی دیکەشی دەکوڵێننەوە و هـەتـا ٦٠٪ و پـتر ئـاڵکۆڵی هەیە. ٢ـ خـواردنەوەیەکی بێ ئەلکۆلە کە لە گەڵا و ریشـەی هەندێک گیا و گوڵ بۆ دەرمـان دەیگرن.بۆ گرتنی ئـەم ئارەقـە ، گژ و گیا لە مـەنجەڵێکی گەورە دەکەن و ئاوێکی کـەمـی تێـدەکـەن و دەفـرێکی چووکتریش لە سەر گیایەکان دادەنێن و سـەری مـەنجـەڵەکـە تەشـتـی لە سـەر دادەنێن و بە قـوڕ دەوری دەگـرن هـەتا هەناسـەی نەیەتە دەر. ئاگـر دەکـەنەوە و دە نێو تەشـتەکەی سەر مـەنجەڵیش ئاوی سـاردی تێدەکەن کە هەڵمی ناو مەنجەڵ دەکـاتەوە ئاو و دەڕژێتـە ناو دەفـری چووکـەوە و دەبێـتـە ئارەق. ‖ **ئارەقی جاترە:** ئارەقێکە کە لە جاترە دەگیرێ و بۆ زگ ئێـشـە و خـاوێن کـردنـەوەی گـەدە دەیخـۆنەوە، هـەروەها وەک عـەتر دەگـەڵ چا دەیخـۆنەوە. **ئارەقی سـووسـەنبـەر:** ئارەقێکە کە لـە سـووسـەنبـەر دەگیرێ و تامێکی توند و تیژی هەیە و بۆ زگ ئێشە و هەندێک نەخـۆشی دیکە بە کـار دێ. **ئارەقی شاتەرە:** بۆ لیر و نەخۆشی پێست کـەلکی هەیە و لە شـاتـەرە دەگـرترێ. **ئارەقی نەعنا:** ئارەقێکە لە نەعنا دەگیرێ تام و بۆنێکی توندی هەیە و بۆ نارەحەتی گـەدە و ژانە زگ دەیخـۆنەوە. **تێـبـینی:** ئارەقی گـیـا و گـوڵ زۆرن و دیارە لە زۆربەی گـیـایەکـانی دەرمـانـی ئارەق دەگـرترێ بەڵام لە کـوردەواری دا پـتـر ئارەقی ئەو گـیـانـە دەگـرترێن کـە نووسراوە. ٣ـ بڕ: ئارەقە

**ئارەقـاویی** (ئان. مـف)[ئارەق/٣ + ئاویی2] کەسـێکی لەشی بە ئارەقە تەڕ بووبێ و ئارەقـەی پێـوە دیار بێ. ⁂ هەمـوو کراسـەکـەت ئارەقاوییـە زوو بڕۆ بیگۆڕە دەنا نەخۆش دەکەوی.

**ئارەقـچن** (نا. ل)[ئارەق/٣ + چن] کڵاوێکی چووکی کون کونە کە لە بەن و دەزوو دەیچنن بۆ ئەوەی تەپڵـە سـەر



ئارەقەی نەکا، تەقیلە.

**تێبینی:** چن لە چاوگی هەڵچنین بە مانای هەڵمژین کەوتوە و ئارەقچن بە گشتی یانی ئارەق هەڵمژ.

**ئارەقخۆر** (ئان. فا)[ئارەق/١ + خۆر] کەسێک کە زۆر ئارەق دەخواتەوە.

**تێبینی:** ئەم وشەیە لە فارسیەوە هاتۆتە نێو زمانی کوردیی چونکە ئەگەر کوردیی با دەبا بووبا بە ئارەقخۆرە و خۆرە لە رەگی خواردنەوە کەوتبا نەک لە خواردن. وەک ئاوەخۆرە، شیرەخۆرە، مەمکەخۆرە.

**ئارەقخۆریی** (حم.)[ئارەقخۆر + ئیی] کاری ئارەقخۆر. ~ **کردن:** ئارەق خواردنەوە.

**ئارەق فرۆش** (ئان. فا)[ئارەق/١ + فرۆش] کەسێک کە کاری فرۆشتنی ئارەق بە خەڵکە.

**ئارەق فرۆشیی** (حم.)[ئارەق فرۆش + ئیی] ١ـ کار و پیشەی ئارەق فرۆش. ٢ـ (نا. ل) دوکانی ئارەق فرۆشتن.

**ئارەقگیر** (نا. ل)[ئارەق/٣ + گیر (گرتن)] ١ـ جلی ژێرەوەی کراسی مرۆڤ بۆ ئەوەی ئارەقەی لەش هەڵچنێ، فانیلە.

٢ـ کوتە لیبادێکە لە ژێرەوەی زینی ئەسپ بۆ هەڵچنینی ئارەقە، ژێرزین، نەرمەزین، تەکڵتوو.

**ئارەقە** [1] (نا.) [عەر: عرق] ١ـ تەڕایی و ئاوەکی یەک کە لە لوویەکانی ژێر پێستی لەشی گیاندار دێتە دەر و ٩٩٪ ئاوە و ١٪ی خوێ و ئووره و هەندێک مادەی دیکەیە. لەشی گیاندار بۆ هەڵسووڕانی خۆی پێویستی بە کالۆری هەیە و بۆ دابین کردنی ئەم کالۆرییە خۆراک دەسووتێنێ و دە کاری دەکا و یەکێک لە رێگاکەنی چاوەدێری کردنی گەرمای لەش کە دە مێشک دایە دەردانی ئارەقەیە هەر ئەوەیە کە بە گەرما و خۆ ماندوو کردن ئارەقەیەکی پتر دەکەین. ئارەق، ئەرەق، هارەق، خوویدان، خوو، خۆی، خۆ. ٢ـ هەڵم و هالاو کە لە بەر سەرمای دەر و گەرمای ژوور لە سەر شووشەی پەنجەرەکان دەنیشێ، هالاو. ~ **پێکردن:** ١ـ خەجاڵەت کردنەوەی و بە شەرم داخستنی کەسێک وەها کە ئارەقەی بکا. ٢ـ ئەستاندنی شتێک یا جێ بە جێ کردنی کارێک بە قسە و تکای زۆر وەها کە ئەو کەسە ماندوو بکا. :: هەتا رازی کردم دووچەرخەی بۆ بکڕم ئارەقەی پێکردم. ~ **دەردان:**

هاتنە دەری ئارەقــە لە لەش، ئارەقــە کردن. ~ **رشتن:** ئارەقە کردن پتر لە رادەی ئاسایی لە بەر زەحمەت و کار و کوێرەوەری. ~ **کردن:** ١ـ هاتنە دەری ئارەقە لە لەش، ئارەقە دەردان. ٢ـ (کنـ.) شەرمەزار بوونەوە، خەجاڵەت بوونەوە. || **ئارەقەی رەش و شین:** ئارقەیەکی یەکجار زۆر بە هۆی خۆ ماندو کردنێکی لە رادە بە دەر، ئارەقەی شین و مۆر. * **ئارەقەی رەش و شین دەردان:** ئیـغـراقـە بۆ ئارقەیەکی پتر لە حاڵی ئاسایی کردن بە هۆی کارێکی گرانەوە، ئارەقەی رەش و شین رشتن، ئارەقەی شین و مۆر دەردان. :: هەتا ئەو تا گەنمەم بە کۆڵ گەیاندەوە ئارەقەی رەش و شینم دەردا. ***ئارەقەی رەش و شین رشتن:** بڕ: ئارەقەی رەش و شین دەردان. **ئارەقەی سارد:** ئارەقەیەک کە لە کاتی هەندێک نەخۆشی هەست بە سەرما دەکرێ و هەروەتر لە کاتی ترسان لە لەش دێتە دەرێ. **ئارەقەی شەرم:** ئارەقەیەک کە لە بەر خەجاڵەتی و شەرم لە نێوچاوانی مرۆڤ پەیدا دەبێ. **ئارەقەی شین و مۆر:** بڕ: ئارەقەی رەش و شین. * **ئارەقەی شین و مۆر دەردان:** بڕ: ئارەقەی رەش و شین دەردان.

**ئارەقە**[2] (نا.)[عەر: عرقە] دارێکە کە کاتی دیوار دانان لە بۆ قایم بوون و شکست نەهێنان لە دیواری هەڵدەکێشن، دیمەک.

**ئارەوانچی** (ئان. ل)[ئار7 + ئە + وان + چی][زا] بڕ: ئاشەوان

**ئارەیە** (نا.)[زا] بڕ: ئاش1

**ئاری**[1] (نا. ل)[ئار2 + ئی][ئەو: ئاتریە ـ پەش: ئیرە][باک] خۆڵەمێش، ژیلەمۆ، ئەو شتەی لە پاش ئاگر دەمێنێتەوە.

**ئاری**[2] (نا.)[پەه: یار. باک: ئاری، هاری ـ ناو: یاری] یاریدە، کۆمەک.

**ئاری**[3] (نا.) بڕ: ئاریا

**ئاریا** (نا.)[ئەو: ئەئیریە ـ هەخ: ئەرییا ـ سان: ئاریا] هۆزێکی کۆنی هیند و ئورووپا کە زۆر زوو بە یەکەوە دەژیان و دوایی بە دوو بەشی گەورەی هیندی و ئێرانی دابەش کران و کورد یەکێک لەوان بوو کە لە ناوچەیەک کە ئێستا ناوی کوردستانە خۆی گرتەوە، ئاری.

**تێبینی:** مانای سەرەکی وشەی ئاریا یا ئاری بە مانای دۆست و ئاواڵە.

**ئاریباری** (گیا.)[سۆر] ١ـ هەڵووچە، هەڵووژە. ٢ـ بڕ: ئاڵووباڵوو

**ئـاریــک** (نـا. ل)[ئـاری + ک][بـڕ: ئارووک][باک] بڕ: میچ1

**ئاریکار** (ئان. فـا)[ئاری2 + کـار] کەسێک کە یارمـەتی کـەسی دیکە دەدا، یاریدەدەر، هاریکار.

**ئاریکاریی** (حم.)[ئاریکار + ئیی] هاریکاریی، یارمەتیی.

**ئاریلە** (ئان. ل)[ئاری؟ + لە] پیـاوێک کە خوو و خدەی و ئاکاری ژنانی هەبێ، ژنانی، ژنانیلە. (هس: ئاڵی)

**ئارینۆک** (گـیـا.)[ئاری + نۆک] بڕ: لەپە

**تێبـــینی:** ئاری لـە چاوگی هاڕین کەوتوە و دەبێتە نۆکی هاڕاو.

**ئاریە** (نا.)[زا] بڕ: ئاش1

**ئارێ**[1] (ئـام.) بـەڵێ، ئـادی، ئـەرێ. ⁂ گەردشی چاوت قەراری عاشقی مسکین دەبا/ ساحیری چاوبەستە ئارێ، دڵ دەکێشێ دین دەبا (وەفـایی ل ٣). ئارێ واجبەن تانەی بەدکاران/ پەی گەرمیی بازاڕ عەشق دڵداران (مەولەوی ل ٤٣٩). || **ئارێ ئارێ:** هەمان مانای ئارێ دەدا بە داگرتنێکی پترەوە، ئائا. ⁂ دڵ لە سـەر پەرچەمی شێواوە ئەسیری زەنەخە/ ئارێ ئارێ ئەوە دێوانەیە زیندانی دەوێ (وەفایی ل ٢٠٥).

**ئارێ**[2] (نا.)[زا] بڕ: ئاش1

**ئارێخ** (نا.)[؟][باک] بزماری گەورەی چێـــویی یا ئـاسن کــــە وڵاغی پێدەبەستنەوە، سینگ، مێختەوێڵە.

**ئارێزە** (ئان.)[؟][زا] کراوە، ئاوەڵا.

**ئاڕاستە** (نا. مف.)[فار: آراستە] ١ـ پێشکەش. ٢ـ رازاوە. ٣ـ رێکوپێک کراو، ئامادە. ~ **کردن:** ١ـ پێشکەش کردن ٢ـ ئامادە کردن ٣ـ حەواڵە کردن.

**تێبینی:** ئاڕاستـە (رازاوە) لە چاوگی ئاراستەن ـ ی فارسی بە مانای رازانەوە پەڕیوەتە نێو زاری کوردەکانی باشوور.

**ئاڕایش** (نا. چا)[فـــار: آرایش] ئاڕایشت، رازانەوە. ~ **کردن:** جوان کردن، رازاندنەوە.

**ئاڕایشت** (نا. چا) بڕ: ئاڕایش

**ئاڕایشگا** (نا. ل)[فـا: آرایشگاه] شوێنێک کە پیـاو یا ژن سەریان کورت دەکەنەوە یا مۆدێلی دەگۆڕن، سـەلمانی، سەرتراشخانە، سەرتاشخانە.

**ئـاڕپیـــــجی** (نز.)[ئین: R.P.g] چەکێکی شەڕە، شێوەی بازووکا دەدا،



سووکە و تاکە کەس هەڵیدەگرێ، لە سەر شـــان دادەندرێ و دەهاویشـــترێ، بۆ تەقـاندنی مـەکـینە و بە تایبـەت تانک کەلکی لێوەردەگرن.

**ئاز**[1] (نا.)[باک] خـۆراک، چێـشت، ئاش.

**تێبینی:** ئەم وشە بە تەنیا نەماوە و دەگەڵ هەندێک ناوی لێکدراو دەبیندرێ و شێوەیەکی دیکەیە لە وشەی ئاش کە هاوڕیشەیە دەگەڵ ئاچە āča ـ ی سانسکریت بە مانای چێشت و خۆراک.
:: ئازپێژ، ئازچی.

**ئاز**[2] (ئان.)[؟] سەخت، چەتوون، دژوار. :: بۆ میوانی خانۆی کورد دەچم، بەڵام ڕێگا ئاز و چەتوونە و شارەزا نیم، ... (دمدم ل ١٠٤).

**ئاز**[3] (نا.)[ئەو: ئازی ـ پەه: ئاز] تەماح، چاونەزێریی.

**ئاز**[4] (نا.)[؟][زا] بەرە، پشت.

**ئازا**[1] (ئان.)[بر: ئازاد][باک: ئازا ـ ناو: ئازا ـ هەو: ئازا ـ زا: ئازا] ١ـ بوێر، نەترس، بەجەرگ. ٢ـ خێرا، گورج و گۆڵ، زیرەک، وریا. ٣ـ ئازاد، وێڵ، بەرەڵڵا. ~ **بوون:** ١ـ نەترسان، وێران، بە جەرگ بوون. ٢ـ خێرا بوون، گورج و گۆڵ بوون لە کارێک دا، زیرەک و وریا بوون. ~ **چوون:** رویشتنی خێرا بەرەو کارێک. ~ **کردن:** ١ـ پەلە کردن لە جێ بە جێ کردنی کار، خێرا بوون. ٢ـ خۆش بوون لە تاوان و قەرز و خەتای کەسێک. :: سەفەری حەجم بە دەستەوەیە هاتووم گەرنم ئازا کەی! ـ گەرنت خۆش و ئازا بێ! **خۆ ~ کردن:** سینگ وە پێش دان و خۆ بە نەترس نیشان دان. :: ئەوە بۆ خۆت لە سەر مە ئازا کردوە!

**تێبینی:** ئازا ئەگەرچی لە ریشەی ئازاد کەوتۆتەوە بەڵام لە خولی زمان و زەمان دا بە فڕێ دانی پیتی داڵ ئاڵوگۆڕی بە سەر داهاتوە و بە مانای بنەڕەتی خۆی (ژمارە ٣) جگە لە یەک دوو رستە دا نەبێ بە کار ناهێندرێ.

**ئازا**[2] (نا.)[عەر: اعضاء] ئەندامی لەش. :: هێندەم تێهەڵدا ئازای بەدەنیم نەهێشت. ئازای لەشم دێشێ.

**ئازاب** (نا.)[عەر: عذاب] ئازار، زەحمەت، سەخڵەتی، ئەزیەت، عازاب، عەزاب. :: منداڵ بێ ئازاب گەورە نابێ. ~ **بە هیـچی چوون:** بە ئاکام نەگەیشتن و رەنج بە خەسار بوون. ~ **دان:** ئەزیەت دان، کەسێک تووشی

زەحمەت و ئازار کردن. **~ کێشان:** زەحمــــەت و کــوێرەوەری کــێــشــان، سـەخڵەتی کێشان، ئازار کێشان. :: پوورم هەتا ئەو ماڵ و حاڵەی پێکەوە نا و منداڵەکانی گەورە کرد ئازابێکی زۆری کێشا. **بە ~ بوون:** زەحمەت هەبوون، بە زەحمەت بوون. :: ئەو میوانانە زۆر بە ئازابن.

**ئازاتی** (حم.)[ئازا1 + تی][باک] بڕ: ئازایەتی

**ئازاد** (ئان.)[هیک: ئاجــــاتە ـ ئەو: ئازاتە ـ پەه: ئــازات. بـاک: ئـازاد ـ نـاو: ئازاد ـ هەو: ئازاد ـ زا: ئازاد] ١ـ عەبد و بەندەی بەردراو. ٢ـ کەسێک کە لە بند و زیندان رزگــای بوە یا باڵندەیەک کــە لە قـــەفـــەس هاتۆتە دەر، وێڵ، بەرەڵڵا. ٣ـ ســەربەست. ٤ـ رزگـار، قـوتـار. ٥ـ ژنێک کە رووی خۆ لە پیاو ناگرێ. ٦ـ ناوە بۆ نێرینە. **~ بوون:** ١ـ بەربوون لە کۆت و بـەند، رزگـــــار بـوون. ٢ـ دوایی هـاتـنـی کۆیلەیی و بەندەیی ٣ـ سـەربەست بوون. ٤ـ رزگـار بوون. **~ کـردن:** ١ـ بەردان، بەرەڵڵا کـردن. ٢ـ ئیزنی سـەربەخۆیی و بە کـەیفی خـۆ جـووڵانەوە دان ٣ـ رزگـار کــردن. ٤ـ ســـەربەست کـردن و رزگـــار کردنی خۆ یا وڵات.

**ئازادە** (ئـان. ل)[ئـازاد + ئـە][پـەه: ئازاتەک] ١ـ کـەسێک کـە بەندەی کـەس نیـە. ٢ـ سـەربەست، ئازاد. ٣ـ رەســەن، نەجیب، شەریف.

**ئازادیی** (حم.)[ئـازاد + ئیـی][پەه: ئازاتییـە] ١ـ رزگـاریی. ٢ـ خـڵاسـیی، نەجات. ٣ـ سەربەستیی.

**ئازادیخوا** (نا. فا)[ئازادی + خوا4] بڕ: ئازادیخواز

**ئازادیخواز** (نا. فا)[ئازادی + خواز] کەسێک کە ئازادی و سەربەستی ویست و مەبەستی یەتی، رزگاریخواز.

**ئازادیخوازانە** (ئان. ل)[ئازادیخواز + ئانە] کـار و کـردەوە و خـــەباتێک کــە پەیوەندی بە ئازادیخـــوازیەوە هـەبێ. :: خـــەباتی ئـازادیخـــوازانە، بزووتنـەوەی ئازادیخوازانە، بیروڕای ئازادیخوازانە.

**ئازادیخـوازیی** (حم.)[ئازادیخـواز + ئیی] ئازادیی ویستن، داواکاری ئازادیی بوون.

**ئـازار1** (نـا.)[ئەو: زەر ـ پـەه: ئـازار. باک: ئـازار ـ نـاو: ئازار ـ بـاش: ئازار ـ هەو: ئازار] ١ـ ئێش، ژان :: ئەو دەســتە شـکـاوەم ئـازاری زۆرە. ٢ـ ئـاهـۆ، پەتـا،

نەخۆشی :: ئازارەسی، ئازارە باریکە، ئازاری گولی. ٣ـ نەخۆشی و ئافەتی گیاندار جگە لە مرۆڤ. :: مریشک ئازاریان تێکەوت و هیچیان نەمان. ٤ـ ئەزیەت، عەزاب. :: هارەهارِی ماشێن گوێم ئازار دەدا. ~ **پێگەیاندن:** ئەزیەت کردنی کەسێک، ئازار دان، سەدەمە لێدان. ~ **پێگەیشتن:** سەدەمە وێکەوتن، ئێش پێگەیشتن :: دەستم ئازاری پێگەیشتوە، بەڵام جێی مەترسی نییە. دوێنێ کەوتم بەڵام چ ئازارم پێنەگەیشت. ~ **تێکەوتن:** نەخۆشی و ئاهۆیەک کە لە گیاندار دا پەیدا دەبێ. :: قەلەکانمان ئازاریان تێکەوتوە لەوانەیە هەموان بکووژێ. ~ **دان:** ئەزیەت کردن، نارەحەت کردن، عەزاب دان. :: هات و هاواری منداڵان ئازارم دەدا. ~ **گرتن:** تووشی ئازار و نەخۆشی بوون. :: ئازارێکم گرتوە بە هیچکەس چارەی نایە. ~ **گەیاندن:** ئەزیەت کردن، ئازار دان، سەدەمە لێدان. ~ **گەیشتن:** بڕ: ئازار پێگەیشتن. || **ئازاری سی:** بڕ: ئازارە باریکە. **تێبینی:** چونکە میکرۆبی ئەم ئازارە پتر لە سی یا سیپەلاک دەدا و خراپی دەکا بەم ناوە کراوە.

**ئازار**$^{2}$ (نا. فا)[لە: ئازاراندن] بە ناوەوە دەلکێ و مانای ئازاردەر دەدا. :: عەجەب ماوم بە چاوت وا بە بیماری دڵازارە/ چ کافر میللەتە یارەب، لە مەستی دایە هوشیاری (وەفایی ل ١٨٧). گیان ئازار، گەل ئازار، ژێر دەست ئازار.

**ئازار**$^{3}$ (نا.)[عەر: ئاذار لە سور: ئادار] بڕ: ئادار2

**ئازاراندن** (چا. م)[ ئەو: زەر ـ پەه: ئازاریتەن. باک: ئازراندن ـ ناو: ئازاراندن] ئازار دان، ئەزیەت کردن. :: ئەو سەگەی مەئازارێنە رۆڵە گوناهە!

**ئازارە باریکە** (نا. ل)[ئازار1 + ئە + باریک + ئە] نەخۆشییەکی ئاهۆدارە کە لە ئێسک، گورچیلە و سیپەلاک دەدا و نەخۆش رۆژبەرۆژ لاوازتر و کەم خوێنتر دەکا و هەر لەبەر ئەو کزی و باریکییە کە ناویان ناوە ئازارە باریکە یا دەردە باریکە. ئازاری سی، دەردەباریکە، سیل، سیل و دیق.

**تێبینی:** میکرۆبی ئەم ئازارە لە ساڵی ١٨٨٢ زایینی لە لایەن پرۆفسۆر کۆخ دۆزراوە و بە ناوی باسیلی کۆخیان کرد. جگە لە مرۆڤ، ماڵاتیش تووشی ئەم



ئازارە دێن.

**ئازاله** (نا.)[باک] بڕ: ئازاڵە

**ئازاڵە** (نا.)[تات: ئازا. باک: ئازالە ـ ناو: ئازاڵە] سووتەمەنی وەک تەپاڵە و شیاکەی ویشک کراو، ئاوردوو، کەشکوور.

**ئازان** (نا.)[عەر: اذان][زا] راگەیاندن و خەبەر دانی کاتی نوێژ لە مزگەوتەوە بۆ کۆ بوونەوەی موسڵمانان، ئەزان، بانگ.

**ئازانە** (ئاک. ل)[ئازا1 + ئانە] بڕ: ئازایانە. ⁂ رۆستەمی مازەندەران ئەو وەختە دەستی بردەوە / هاتە رێی دێوی سپی ئازانە دەستی کردەوە (حاجی قادر ل ١٢٧).

**ئازاو** (نا.)[عەر: عذاب] رەنج، ئازار، ئەزیەت، عازاب، عەزاب، عازاو.

**ئازاهی** (حم.)[ئازا1 + هی][باک] بڕ: ئازایەتی

**ئازایانە** (ئاک. ل)[ئازا1 + ئانە] کار و کردەوەیەک کە بە ئازایەتی بکردرێ، بوێرانە، نەترسانە، ئازانە. ⁂ زۆر ئازایانە لە کابرای زەلام چوە پێشێ.

**ئازایەتی** (حم.)[ئازا + یەتی] بوێری، نەترسان، بە جەرگ بوون، ئازاتی، ئازاهی. ⁂ ئەگەر ئازایەتی ئەوەیە پیاو لە ژنەکەی بدا من قەت ئازا نیم.

**ئازایی** (حم.)[ئازا1 + ئی] بڕ: ئازایەتی

**ئازپێژ** (نا. فا)[ئاز1 + پێژ][باک] ئاشپەز، چێشت لێنەر، ئازپێش، ئازچی.

**ئازپێش** (نا. فا)[باک][ئاز1 + پێش (پێژ)][باک] بڕ: ئازپێژ

**ئازچی** (نا. ل)[ئاز1 + چی][باک] بڕ: ئازپێژ

**ئازراندن** (چا. م)[باک] بڕ: ئازاراندن.

**ئازمان** (نا.)[باک] بڕ: ئاسمان

**ئازمایش** (نا. چا)[فار: آزمایش] هەڵسەنگاندنی شتێک، تاقی، ئازمایشت، ئەزموون. ~ **کردن:** تاقی کردنەوە.

**تێبینی:** ئازمایش لە چاوگی ئازموودەن ـ ی فارسی و ئەزمووتەن ـ ی پەهلەویی بە مانای تاقی کردنەوە کەوتوە و ئەزموونی کوردییش هەر لەو ریشەیەیە.

**ئازمایشت** (نا. چا) بڕ: ئازمایش

**ئازمایشگا** (نا. ل)[ئازمایش + گا3] شوێنێک کە لەوێ بە کەرەسەی زانستی مەسەلە یا شتێک بە تاقی دەکەنەوە یا لێی دەکۆڵنەوە.

**ئازمین** (نا.)[زا] بڕ: ئاسمان

**ئازمێن** (نا.)[زا] بڕ: ئاسمان

**ئازنا** (نا.)[بڕ: ئاژنە][زا] مەلە

**ئازنج** (نا. ل)[ئا13 + زنج2][باک] ماڵ، خانووی لە چێو و قامیش سازکراو، زنج، ئازنگ.

**ئازنگ** (نا. ل)[ئا13 + زنگ (زنج2)][باک] بڕ: ئازنج

**ئازنە** (نا.)[بڕ: ئاژنە][زا] مەلە

**ئازوباز** (نا. ل)[ئاز3 + و + باز (بەزە)] بڕ: ئازوبەزە

**ئازوبەزە** (نا. ل)[ئاز3 + و + بەزە] شێوە رستەیەکە لە کاتی وە ئەستۆ گرتنی ئەرکێک دەکوترێ، ئۆباڵ، ئازوباز. ∷ ئازوبەزەت بە ملم ئەگەر درۆت دەگەڵ بکەم.

**تێبینی:** هەروەکی زەبیحی نووسیویەتی ئاز دەچێتەوە سەر ئەوێستایی ئازی azi و پەهلەویی ئازaz بە مانای تەماح، هەروەها بەزە دەچێتەوە سەر بەژە و بەچەکی پەهلەویی بە مانای تاوان و بە گشتی دەبێتە تەماح و تاوان یانی تەماح و تاوانەکەت وە ئەستۆی من کەوێ. (بڕ: قامووس ب ١ ل ٢٣).

**ئازووخە** (نا.) بڕ: ئازووقە

**ئازووقە** (نا.)[تور: azık] ١ـ خواردەمەنی و خۆراک و دانەوێڵەی پاشەکەوت کراو. ٢ـ تێشووی سەفەر و رێگا. & ئازووخە. ~ **داخستن:** هەڵگرتن و پاشەکەوت کردنی خۆراک و خواردەمەنی و دانەوێڵە بۆ ماوەیەکی درێژخایەن. ∷ ساڵ درەنگە و هێشتا ئازووقەمان دا نەخستوە.

**ئازەب** (ئان.)[عەر: عذب] کوڕ یا کچی پێگەیشتوو کە هیشتا زەماوەندی نەکردوە، عەزەب، عازەب.

**ئازەبە** (نا.)[عەر: عذب] زیپکەیەک کە لە سەردەمی عەزەب بوونی کوڕ یا کچ لە سەر رووی پەیدا دەبێ، عازەبە، زیپکە، جۆش.

**ئازیز** (ئان.)[عەر: عزیز] عەزیز، خۆشەویست، بەرێز، لەبەردڵان، عازیز.

**ئازیزە** (نا. ل)[ئازیز + ئە] ناوی مەقامێکی فۆلکلۆری کوردییە. دەردی دڵ و راز و نیازی ئەویندارێک دەگەڵ

گراویە:

ئازیز سەرێکە مـن دێشێ / دڵی منی ماڵ وێرانێ چەندی دەکاتەوە ژانێ / ئاورێکم بەربۆتەوە دەروونێ / بڵێسەم پەرپوەتە دەروونخانێ / نە بە بای دەکووژێتەوە، نە بە نمەنمەی دە بارانێ....

**ئازیەت** (نا.)[عەر: عـزاء] پرسـە، سەرەخۆشی، تازیە.

**ئازیەتبـار** (ئان. ل)[ئازیەت + بار] کەسی خاوەن مردوو کە سەرەخۆشی لێدەکەن، تازیەدار.

**ئازیەتباری** (حم.)[ئازیەتبار + ئیی] لە حاڵی تازیە دابوون، تازیەداریی.

**ئازیەتی** (ئان. ل)[ئازیەت + ئی] ١ـ پرسـە، تازیە. ٢ـ هەرچی پەیوەندی بە ئازیەتەوە هەبێ.

**ئاژ**[1] (ئان.)[لە: ئاژنین] حـاڵی هەر شتێکی کونجرکونجر، زوور، زبر./ / لووس.

**ئاژ**[2] (نا.)[باک] شـووڵ و لقی تازەڕوا و ناسکی دار. (هس: ئاژۆ1)

**ئاژا** (ئاک. ل)[ئا + ژا (جـا، جێ)][ئەو: ئەثرا ـ هـەو: ئاگـە][ژا] ئەوێ، لەوێ.

**ئاژاژک** (نا.) بڕ: ئاژاشکە

**ئاژاژکی** (نا.)[هەو] بڕ: ئاژاشکە

**ئاژاشکە** (نا.)[لۆر: ئاژئاژکی. ناو: ئاژاژک، ئاژاشکە، ئاژەنگ ـ باش: ئاژاژگی ـ هەو: ئاژاژکی] ١ـ باوێشک. ٢ـ مچوڕک، تەزوو.

**ئاژاژگی** (نا.)[هەو] بڕ: ئاژاشکە

**ئاژاڵ** (نا.)[باک] بڕ: ئاژەڵ

**ئاژاڵ**[1] (نا.) بڕ: ئاژەڵ

**ئاژاڵ**[2] (نا.)[بڕ: ئاژۆ1][ئەر] گیا و گۆڵ، گژ و گیا.

**ئاژاڵدار** (ئان. فـا)[ئاژاڵ1 + دار] کەسێک کە ئاژەڵ رادەگرێ، خاوەن مەڕ و بزن و ماڵات، ئاژەڵدار.

**ئاژاڵداریی** (حم.)[ئاژاڵدار + ئیی] ئاژاڵ راگرتن، کار و پیشەی ئاژەڵدار.

**ئاژان** (نا.)[فـەر: agence] پۆلیس، پاسەوان، شورتە.

**ئاژانخـانە** (نا. ل)[ئاژان + خـانە] یانەی ئاژان و پۆلیس، شارەوانی.

**ئاژانس** (نا.)[فـەر: agence] ١ـ هەواڵدەری، هەواڵنێری. ٢ـ شـەریکە یا

شوێنێک کە بە نوێنەرایەتی کار و باری شەریکەیەکی دیکە رادەپەڕێنێ.

**ئاژاولە** (نا. ل)[ئاژاو + لە] بڕ: ئاژاوە

**ئاژاوڵە** (نا. ل)[ئاژاو + ڵە] بڕ: ئاژاوە

**ئاژاوە** (نا.)[پەه: ئاشۆپ. باک: ئاژاوە ـ ناو: ئاژاوە، ئاژاوڵە، ئاژاولە] ١ـ شەڕ و هەڵڵا و ئاڵۆزی و پشێوی ولات و شار و ناوچەیەک، ئەدەم کە حاڵەتی ئاسایی تێکدەچێ و بێ قانوونی پەیدا دەبێ. ٢ـ شەڕ و کێشەی نێوماڵ و خەڵک. ٣ـ فیتنە، پشێوی. & ئاشێۆ، ئاشۆ. ~ **تێخستن:** پێک هێنانی ئاڵۆزی و شێواوی. :: بەر لە هاتنی ئەو ماڵەی جیرانمان، ژیانێکی زۆر ئارام و خۆشمان هەبوو ئەوان هاتن و ئاژاوەیان دە ژیانی مە خست. ~ **خستنەوە:** بڕ: ئاژاوە گێڕان. ~ **گێڕان:** ساز کردنی هەڵڵا و شەڕ و فیتنە، ئاژاوەگێڕی کردن. :: کاری حەمە هەر ئاژاوە گێڕان و بەشەڕ دانی خەڵکە. ~ **نانەوە:** ئاژاوە خستنەوە، ئاژاوە گێڕان. :: ئەو هەتیوە لە سەر ئەو کچە ئاژاوەیەکی لەم دێیە ناوەتەوە مەگەر خودا بزانێ.

**تێبینی:** ئاژاوە لە چاوگی ئاشۆپتەن ـ ی پەهلەویی و شێوانی کوردیی کەوتوە و هاوڕیشەیە دەگەڵ ئاشێو و ئاشۆ لە بن زاراوەی ئەردەڵانی دا. هەروەتر من پێموایە بە لەبەر چاو گرتنی هاوتاکانی ئاژاوە ئەم وشەیە لە دوو بەشی [ئاژاو + ئە (پاشگر)] پێک هاتوە.

**ئاژاوەچی** (نا. فا)[ئاژاوە + چی2] کەسێک کە کاری تێک دانی باری ئاسایی ولات و ماڵ یا شەڕ هەڵایساندن دە بەینی خەڵک دایە، ئاژاوە گێڕ.

**ئاژاوەگێڕ** (نا. فا)[ئاژاوە + گێڕ1] بڕ: ئاژاوەچی.

**ئاژاوەگێڕی** (حم.)[ئاژاوەگێڕ + ئیی] کار و کردەوەی ئاژاوەگێڕ. ~ **کردن:** ساز کردنی هەڵڵا و شەڕ و فیتنە، ئاژاوە گێڕان.

**ئاژداد** (نا.)[عەر: اجداد] باب و باپیر، ئابا، جەد، ئەژداد.

**ئاژن** (ر.)[لە: ئاژنین] ١ـ بە ناوەوە دەلکێ و ئاوەڵناوی مفعولی ساز دەکا. :: دەرزی ئاژن، سووژن ئاژن ٢ـ بە ناوەوە دەلکێ و ناوی ئامێر ساز دەکا. :: ددان ئاژن. ٣ـ (نا.) کاری ئاو دان و داشتن. ~ **کردن:** دابەش کردنی ئاو لە ماکاو را بۆ نێو دێراوەکانی بێستان و موچە و باغ، ئاودێران، ئاو لێنان. || **ئاژن**

**ئاژن:** کون کون بە شتی نووک تیژ. **~ بوون:** کون کون بوون بە شتی نووک تیژ. ꞉꞉ دوکتور ئەوەندەی دەرزی لێداوم سمتم ئاژن ئاژن بوە. **~ کردن:** کون کون کردن بە دەرزی و شتی نووک تیژ.

**تێبینی:** ئاژن لە چاوگی جەن jan یا گەن gan ـ ی ئەوێستایی و ژەن žan ـ ی پەهلەویی کەوتۆتەوە بە مانای لێدان. لە کوردیی دا وشە و چاوگێکی یەکجار زۆر لەم چاوگانە کەوتوون بەڵام هەر کام بۆ مانایەک بەکار دەبردرێن کە لە شوێنی خۆی باسی لێدەکردرێ. ꞉꞉ ژەندن، هەژیان، راژاندن، و...

**ئاژنە** (نا.)[هیک: سنا(خۆ شوشتن) ـ ئەو: سنا(خۆ شوشتن). بیر: ئاشنا ـ فار: شنا. باک: ئاژنە، ئاژنی، ئاشنی ـ زا: ئازنا، ئازنە] مەلە

**ئاژنی** (نا.)[باک] بڕ: ئاژنە

**ئاژنین** (چا. م)[ئەو: جەن، گەن. هەخ: گەن. پەه: غەن، ژەن. باک: ئاژنین ـ ناو: ئاژنین] ١ـ کون کردن، تێرا کردن بە ئامراز و شتی نووک تیژی باریک (دەرزی، درەوو، سووژن، و ...). ꞉꞉ بۆ خاڵ لێدان دەبێ باسکت بە دەرزی باژنی. ٢ـ زوور کردن و کونجڕ کونجڕ کردنی بەرداش کاتێک دانەوێڵە باش نەهاڕێ و بیرازی بوێ. ٣ـ کۆڵین و دەردانی خواردەمەنی نێوان ددانەکان بە چیلکە یان ددان ئاژن.

**ئاژواندن** (چا. م) بڕ: ئاژۆتن

**ئاژۆ** [1] (نا.) ئەم وشەیە بە تەنیا نایە و مانای گیا و خۆراک دەدا، ئاژاڵ2. ꞉꞉ شەواوژۆ، بۆژۆ. **~ دان:** بە شەو لەوەڕاندنی ئاژەڵ لە وەرزی بەهار دا، شەواژۆ، شەوبەکێو.

**تێبینی:** ئاژۆ هاوڕیشەیە دەگەڵ ژووی žūy پەهلەویی لە چاوگی žūtan ژووتەن بە مانای خواردن و قووت دان کە بۆ گیاندارانی ئەهریمەنی هاتوە. (هس: ئاژاڵ2 و گژ و ئاژ2)

**ئاژۆ** [2] (ر.)[لە: ئاژۆتن] ١ـ بە ناوەوە دەلکێ و مانای داکوتان و بۆ پێشەوە چوون دەدا. ꞉꞉ رەگاژۆ، ریشاژۆ. ٢ـ کەسێک کە شتێک لێدەخورێ یا وەپێش خۆی دەدا، لێخور. ꞉꞉ خولام و دوو ئاژۆی وشترەکانی هەموو بە چەکەوە لە دەوری وەستا بوون ... (دمدم ل ٣٩).

**تێبینی:** ئازە لە ئەوێستا دا لە وشەی نەڤازە nav-āza و ئاجە لە هیندی کۆن دا لە وشەی ناڤاجە nāv-āja دا بە

مانای ناواژۆ، کەشتی لێخور هاتوون.

**ئاژۆتن** (چا. م)[هیک: ئەجەتی ـ ئەو: ئەز ـ باک: ئاژۆتن ـ ناو: ئاژۆتن، هاژۆتن، ئاژواندن] ١ـ تاو دان و لێخوڕینی وڵاغی سواری. ٢ـ لێخوڕینی مەکینەی ماتۆڕی. ٣ـ لێخوڕین و وەپێش خۆ دانی ماڵات و گاجووت. & لێخوڕین، رانین. **ئاژۆتنە سەر:** هێرش بۆ بردن، پەلامار دان، هەڵکوتانە سەر. ‌:: نیوە شەو دوژمن ئاژۆتیە سەرمان بەڵام چی پێنەکرا.

**ئاژووتن** (چا. م)[؟][باک] هاوار کردن، قیژاندن، نەڕاندن.

**ئاژەڵ** (نا.)[باک: ئاژال ـ ناو: ئاژاڵ، ئاژەڵ ـ باش: ئاژەڵ ـ هەو: ئاژەڵ] حەیوانی وردە، مەر و بزن، مەڕ و ماڵات.

**ئاژەڵدار** (ئان. فا)[ئاژەڵ + دار2] کەسێک کە پێشەی راگرتنی ئاژەڵە، ئاژاڵدار، مەڕدار، گەلەدار.

**ئاژەڵداریی** (حم.)[ئاژەڵدار + ئیی] کار و پێشەی ئاژەڵدار، ماڵات راگرتن، مەڕداریی، ئاژاڵداریی، دەوڵەتداریی، گەلەداریی. ‌:: ئێستاکە ئاژەڵداریی وەک کۆن زەحمەتی نیە.

**ئاژەنگ** (نا.)[هس: ئاژاشکە] وەنەوز، خەونوچکە، وێژینگ. **~ لێدان:** وێژینگ دان. ‌:: ئەمما سیامەند خەوی لێدەکەوت و خەجێش ئاژەنگی خەوی لێدەدانە (گەنج ل ٣٦٣).

**ئاژیر** (نا. ل)[ئا13 + ژیر] جۆرێک زەنگی تایبەتی ئاگادار کردنەوەیە کە لە سەر ئامبولانس و ماشێنی پۆلیس و مەکینەی دیکە دادەندرێ. **~ لێدان:** راگەیاندنی مەترسی لە شتێک یا وریا کردنەوە بە لێدانی پەیتا پەیتای زەنگێکی تایبەتی یا چرایەکی تایبەتی. ئاژیر لە کاتی شەڕ کە مەترسی بۆمبارانیش هەیە لێدەدرێ.

**ئاژینە** (نا.)[ئاژ + ئینە] ١ـ دارێکە کە دەگەڵ بەرداش دەگەڕێ و دان وردەوردە لە گەرووی بەرداش دەکا بۆ هاڕین، چەقچەقە، چەقچەق، چەقچەقۆک، چەقەنە. ٢ـ چەکوچی پۆڵای تایبەتی سەر گرنی گرنییە کە بەرداشی پێ زوور دەکەنەوە.

**ئاس** 1 (نا.)[بر: ئاسیاو] ئەم وشەیە بە تەنیا نەماوە یا بە تەنیا دەکار ناکرێ و لە هەندێک وشەی لێکدراو دا دەبیندرێ. ‌:: ئاساو، ئاسیاو.

**ئاس** 2 (گیان.)[؟] گیاندارێکی کێویی

گۆشتخۆرە، درێژایی لەشی لە لمبوزیەوە هەتا سەر کلکی ٣٥ سانت دەبێ، رەنگی کەوڵەکەی لە زستان دا سپییە و لە کاتی دیکە دا مووی سەر پشتی قاوەییەکی روون و بن زگی زەردێکی روونە. گیاندارێکی دڕ و بوێرە و شاڵاو دەباتە سەر باڵندە و کەروێشک و مار. کەوڵەکەی بە نرخە و راوچی لەبەر کەوڵەکەی راوی دەکەن، Ictis ermin-ea ناوی لاتینی ئەم گیاندارەیە، قاقوم.

**ئاس**[3] (نا.)[؟] ١ـ رووت و رەجاڵ. ٢ـ دۆڕاو بە تەواوی، سوخت. ~ **بوون:** ١ـ رووت و رەجاڵ بوون. ٢ـ دۆڕان و هیچ پێنەمان لە قومار دا، سوخت بوون.

**ئاس**[4] (نا.)[فەر: as] یەکێک لە پەڕەکانی قومار و کایە کە خاڵێکی لە سەرە، تەکە.

**تێبینی:** ئەم وشەیە ناوی واحیدی پارە و پێوانە و کێشانی کۆنی رۆمانێکان بوە و لە لاتینی وەرگیراوە کە مەعنای (فلس، شایی)یە (قامووس ب ١ ل ٢٧).

**ئاسا**[1] (پاشـ.)[ناو: ئاسا ـ هەو: ئاسا ـ زا: سێ] پاشگرێکە بە ناوەوە دەلکێ و ئاوەڵناو ساز دەکا کە مانای وەک و چەشن و وێچوون دەدا، وەک، مینا :: هەر من دەلو ئاسا نە قەهر چاهم / هەر من چون مەجنوون چارە سیاهم (وەلی دێوانە ل ٨٣). مانگاسا، دێواسا، پەری ئاسا، دیناسا. (هس: لاسا)

**ئاسا**[2] (نا.)[عەر: عصا] داردەستی دەروێش، عاسا، عەسا، گۆچان، دارئاسا، دارهاسا. :: وە سەر گەردانی سارای چۆڵم دا / وە ئاسا و کەشکۆڵ پۆست کۆڵم دا (وەلی دێوانە ل ٤١). دەیانگوت: هیچ میرمان قەبووڵ نین، ئەو کەشکۆڵ و ئاسایەی بگێڕەوە بە دواوە (مان ل ١٧٨).

**ئاسار**[1] (نا.)[ئەر] ١ـ بنەڕەت، بناغە. ٢ـ بڕ: ئادار1. :: ئاساری لە سەر پاداری نەماوە!. ٣ـ ئاسەوار، شوێنەوار. ~ **بڕانەوە:** شوێنەوار نەمان، ئاسەوار بڕانەوە. :: رووی دە ماڵە میرزێندینی کرد، قەتی یەک خەلاس نەبوو، یەکی نەماوە / هەتتا بە جارێکی ئاساریان بڕاوە. (مان ل ٨٠). ~ **بڕینەوە:** شوێنەوار نەهێشتن، بنەبڕ کردن، ئاسەوار نەهێشتن. :: کوڕەکان کوتیان: «دایە، ئابڕوومان مەبە، دەیبەتڵێنین بە دزییە / ئەگەر مام غەڵیفە بزانێ، ئاسارمان دەبڕییە (مان ل ١٦٧).

**تێبینی:** ئاسا āsā لە هیندی کۆن دا و ئەسەه asah لە ئەوێستا دا و ئاسە āsa لە سانسکریت دا بە مانای شوێن و جێگا هاتوون. (هەروەها بڕوانە تێبینی ئاسەوار)

**ئاسار**² (نا.)[عەر: آثار (کۆی اثر)] نیشانە و شوێنی ماوەی شتێک.

**ئاسانە** (نا.)[عەر: اثاثە][هەو] کۆی ئەساس لە عەرەبی دایە بە مانای کەرەسە و شمەکی نێو ماڵ، ئەساسە. ∷ مزانۆ هەم شەرت وەرین شکەستەن / ئاساسەی ئەسباب بەین نۆش بەستەن (وەلی دیوانە ل ٤٥).

**ئاسان** (ئان.)[ پەه: ئاسان. باک: هێسان، ئاسان ـ ناو: هاسان، ئاسان، سانا ـ باش: ئاسان ـ هەو: ئاسان ـ زا: ئاسان] ١ـ بێ گیر و گرفت، نە دژوار و نە سەخت. ٢ـ بێ ڕەنج، بێ کوێرەوەری. ٣ـ گران، سەقیل. **~ بوون:** کار و ئێش و مەسەلەیەک کە سەخت نەبێ، سانا بوون، هاسان بوون. **~ بوونەوە:** گران و سەقیل نەمان، هاسان بوونەوە، سانا بوونەوە. ∷ دەرس خوێندن ئێستاکە ئاسان بۆتەوە زوو زۆر گران بوون. **~ کردن:** لە گرانی و سەختی کەم کردن، هاسان کردن، سانا کردن. **~ کردنەوە:** کەم کردنەوە گرانی و سەقیلی، هاسان کردنەوە، سانا کردنەوە. ∷ ئیمڕۆکە هاتوچۆیان زۆر ئاسان کردۆتەوە. **بە ~ زانین:** بە سەخت و قورس دانەنانی کار و مەسەلەیەک، پێ هاسان بوون، پێ ئاسان بوون. ∷ لە ئولکەی عیشقەدا بێ چوونە سەر دار / بە ئاسانی مەزانە بوونە سەردار (مەحوی ل ١١٩). **پێ ~ بوون:** پێ گران و سەقیل نەبوون، بە ئاسان زانین.

**ئاسانسۆر** (نا.)[فەر: Asce seur] دەزگایەکە کە بە هێزی کارەبا کار دەکا و لە ئاپارتومان و خانووبەرەی چەند نهۆمی دا بۆ بردنە سەر و خواری مرۆڤ و بار کەلکی لێوەردەگرن.

**ئاسانە** (نا.)[هەو ـ ئەر] بڕ: ئاستانە. ∷ ڕەوانتەر جە هەرس وە سەد قەترە و دەو / تا وە مەکۆگەی ئاسانەکەی ئەو (مەولەوی ل ١٥٣).

**ئاسانی** (حم.)[ئاسان + ئی][پەه: ئاسانییە] چلۆنایەتی کار و مەسەلە و قسەیەک کە مرۆڤ بە بێ زەحمەت تێبگا و لێی حاڵی بێ، سانایی، هاسانی. ∷ بە ئاسانی وە سەر کێو کەوتین.



**ئاساو** (نا. ل)[هەو][ئاس1 + ئاو] بڕ: ئاسیاو

**ئاســـاوان** (نا. ل، ئان. ل)[ئاســـاو + وان][هەو] بڕ: ئاشەوان

**ئاســـایی** (ئان.)[ئاســـا 1 + ئی] ١ـ هەرچێک کە لای خەڵک سەیر نەبێ، باو، ئیعتیادی، مەعمووڵی. :: لە سووچێکی شار ژیانێکی ئاساییمان تێپەڕ دەکرد. ٢ـ (ئام.) وەک، چەشنی. :: نەســـیـــمێ نەفـــەس مـــەســـیح ئاســـایی / تەسکین بەخش زام دڵ شناسایی (وەلی دێوانە ل ٤٦). خـــۆت ئاســـایی. شـــێـــرئاســـایی پەلاماری دوژمنی دا. (هس: لاسایی)

**ئاسپار** (نا. ل)[ئەو: ئەسبارەی ـ پەهـ: ئەسڤار][زا] بڕ: سوار

**ئاسپـــایی** (حم.)[ئاسپا + ئی] بڕ: ئەسپایی

**ئاســـپـــرین** (نا.)[فـەر: aspir ine] حەب و قورسێکی سپی و بێ بۆنە کە بۆ دامـــرکـــاندنی ژان و تێ و ئازاری لەش دەیخۆن.

**ئاسپزە** (نا.)[زا] بڕ: ئەسپێ

**ئاست** (نا.)[ئەو: ئەستە. ناو: ئاست، عاست، حاست] لە رستە دا زۆر کەم بە تەنیایی دێ و پتر دەگەڵ ئامرازی بە (بەم، بەو، بەهۆو) و لە (لەم، لە هۆو، لەو،...) دێ و ئەم مانایانە دەدا: ١ـ پەنا، تەنیشت، لا. :: لە ئاست خۆت دانیشە. دوکانەکە لە کێها ئاستی هەڵکەوتوە. ٢ـ بەرانبـــەر، رووبەڕوو. :: لە ئاست ئەم رووداوە نازانم چ بکەم. لە ئاست بابم لە شەرمان سەرم هەڵنایە. & حاند، حەنا.

**تێبینی:** ئەستە asta لە ئەوێستا دا بە مانای ماڵ، شوێنی دانیشتن و جێ سوکنا و نیشتمان هاتوە.

**ئاستار** (گیان.)[زا] بڕ: ئاستۆر

**ئاستارە** 1 (نا.)[زا] بڕ: ئەستێرە

**ئاستارە** 2 (گیان.)[بڕ: ئاستۆر][زا] ماین

**ئاســتـــان** (نا.)[بڕ: ئاســتـانە][باک] ناوچە

**ئاستانە** (نا.)[پەهـ: ئاستانەک. باک: ئاستان ـ ناو: ئاستانە، ئاسانە ـ هەو: ئاســـتـــانە، ئاســـانە] ١ـ پێـــشـــخـــانە، کـەوشکەن. ٢ـ بەردەرگـا، بەرمـاڵ. ٣ ـ (کنـ.) بەردەرگای گراوی و یار. :: کەلب کۆی یارم / کەلب پاسەبان ئاستانەی یارم (وەلی دێوانە ل ٦٦). ٤ـ (مـــجـ.) دەرگای شێخ و پیاوی ئایینی و پیرۆز.

**ئاسترۆنۆمی** (نا.)[یون: astronomia] بڕ: ئەستێرەناسی

**تێبینی:** ئاستروٚی یونانی بە مانای ئەستێرە دەگەڵ ئەستێرەی کوردیی یەک ریشە و رەگەزیان هەیە (بڕ: ئەستێرە)

**ئاستک** [1] (نا.)[زا] بڕ: ئێسک

**ئاستک** [2] (نا.)[ئەب: ئوستی ـ گیل: ئاستین ـ فار: ئاستین ـ پەش: لەستوونەی. زا: ئاستک، ئاستە] بەشێک لە پۆشاک کە دەست دادەپۆشێ، سەردەست.

**ئاستورە** (گیان.)[زا] بڕ: ئاستۆر

**ئاستۆر** (گیان.)[ئەو: ستەئۆرە ـ پەه: ستۆر ـ زا: ئاستۆر، ئاستورە، ئاستار، ئاستارە (ماین)] ئەسپ، هەسپ.

**ئاستۆرە** (نا.)[زا] بڕ: ئەستێرە

**ئاستە** [1] (نا.)[زا] بڕ: ئێسک

**ئاستە** [2] (نا.)[زا] بڕ: ئاستک2

**ئاستەر** (نا.)[پەه: ئاستەر. لۆر: ئاسەر ـ فار: آستر. باک: ئاستار ـ ناو: ئاستەر، ئەستەر، ئاسەر ـ هەو: ئاسەر ـ زا: ئەستار] ١ـ پارچەیەک کە لە دیوی ژوورەوەی جل و بەرگ دەیدروون، بەر. ٢ـ رەنگێکە کە بەر لە لێدانی رەنگی ئەسڵی لە ئاسن و دەرک و دیوار و پەنجەرەی دەدەن هەتا هەم رەنگەکە هەڵمژێ و هەمیش جاری دووهەم رەنگ هاسانتر و باشتر خۆ بگرێ و پەڵە و عەیبی تێنەکەوێ.

**ئاستەم** (نا.) جووڵانەوەیەکی زۆر کەم، زۆر بە ئارامی. :: ئاستەمێکی پەنجەرەی کردەوە و چاوی لە دەرێ کرد. ٢ـ سەخت، دژوار، زەحمەت، ئاستەنگ، ئەستەم.

**تێبینی:** ئەستانەک لە زمانی پەهلەویی بە چەندین مانا هاتوە: ئاتاج، هەژاریی، بەدبەختیی، بەڵا، ئافەت، زیان، گوناه. پێموایە وشەی ئاستم و ئەستەم بە مانای سەخت و دژوار دەگەڵ ئاستەنگی باکووریی هەریەک وشە بووبێن و لە داویی ئاستەم پیتی " گ "ی سواوە و لە بەر قورسایی " ن " بۆتە " م ".

**ئاستەنگ** (نا.)[بڕ: ئاستەم][باک] کاتی سەخت و تەنگ، گران، دژوار، ئەستەم، تەنگانە :: پیاو دەبێ بۆ رۆژی ئاستەنگ و سەخت خۆی ئامادە کا.

**ئاستیگماتیسم** (نا.)[فەر: astig-matisme] عەیبێکە تووشی چاو دەبێ و ئەو کەسە ناتوانێ بە روونی و بە



تەواوی شتێک ببینێ و پەڵە ڕەش دێتە بە چاوی. ئەم عــەیبـــە لەوانـەیە هـەر لە منداڵیــەوە پـەیدا بێ، ئێــســتــاکــە بە چاویلکەی تایبەتی چارەسەر دەکردرێ.

**ئاسرمە** (نا.) بڕ: ئاشرمە

**ئاسـفـالْت** (نا. )[یون: asphaltos] قیر و خیزی تێکەڵاو کە بۆ خۆش کردن و ڕێک و پێک کـردنی شــەقـام و کـووچە و کـۆلان، هـەروەها ئێـســتـاکـە لە جـیـات گـڵـەبان و سـواغی سـەربان بۆ قـایمتـر بوون، کـەلکی لێـوەردەگـرن، ئیـسـفـاڵت، قیرەتاو.

**ئاسک** (نا.)[هیک: ئاســـەڤ ـ ئەو: ئاسـو، ئاسـەڤ ـ سـان: ئاسـەڤ ـ سـوغ: ئاســوک ـ پەھ: ئاهـووک، ئاهـووگ. باک: ئـاسـک ـ نـاو: ئـاسـک ـ بـاش: ئـاسـک، ئـاسـی ـ هـەو: ئاسک (نێـــــر)، ئاسکە (مێ)] ١ـ گیانداریکی گوانداری کێویە، کـــاوێژ دەکـــا، دەست و لاقی باریک و درێژن، چاو ڕەشی جوان و خێرایە و بە ڕەوە دەژین و گۆشتێکی ناسک و بەتامی هــەیــە، Antilope dorcas نــاوی لاتینی ئەم گیانـدارەیە، ئاسکەکێوی. ٢ـ (مجـ.) خێرا و تیژڕەو.

**ئاسـکۆڵ** (نا. ل)[ئـاسـک + ئـۆڵ] ١ـ ئاسکی بچووک، کاراسک. ئاسکۆڵە. ٢ـ ناوە بۆ کچان

**ئاسکۆڵە** (نا. ل)[ئاسک + ئۆڵە] بڕ: ئاسکۆڵ.

**ئـاسـکـە** (نـا. ل)[ئـاسـک + ئـە][هـەو] ئاسکی مێ

**ئاسکەکـێـوی** (نا. ل)[ئاسک + ئە + کێوی] بڕ: ئاسک

**ئـاسـم** (نـا.)[فـــــــەر: Asthme] نەخۆشی هەناسـەبڕکە و پشـوو سـواری کە بە گیرانی سی یەکان تووشی مرۆڤ دەبێ و پتر لە سەتڵووجەم ڕا دێ.

**ئاسـمـان** (نا.)[هیک: ئەسـمـەن ـ ئەو: ئەســـمـــەن، ئـەســـەن، ئەشـــەن ـ هـەخ: ئەسمەن، ئەسەن ـ سـان: ئەسمەن ـ پەھ: ئەســـمـــان، ئاســـمـــان. باک: ئـازمـــان، ئەزمـان، ئەزمێن، ئـاسـیمـان، ئاسـمـان، ئەســـمـــان، عـــەزمـــان ـ ناو: ئاســـمـــان، عاسمان ـ باش: ئاسمان ـ هەو: ئاسمان ـ زا: ئاســـمـــێن، ئاســـمـین، ئاســمــیــە، ئاسـیـمـان، ئازمـێن، ئازمین، ئەزمـان، ئەزمـوو.] ١ـ فەزای بێ بن و شینی سـەر زەوی کـە مـانـگ و ئەسـتـێـرە و هـەتاوی تێدایـە، حـەوا، فـەزا. ٢ـ بەشـێک لە فـەزا کە لە بان سـەری ئێمـەیە. ٣ـ هـەر کام لە

حەوت قاتەکانی ئاسمان بە پێی بڕوای کۆن. ⁙ لە حەوت ئاسمانان چ شک نابەم. ٤ـ شوێنێک کە دەست نەیگاتێ، سەر، بڵند. ~ **رووخان:** (کنـ.) کارەساتێکی گەورە قەومان. ~ **لە بەر چاو تاریک بوون:** (کنـ.) ١ـ هیچ نەدیتن لە بەر تووڕەیی زۆر. ٢ـ بێ هیوا و خەمبار بوون لە بەر کارەساتێکی گەورە. **چوونە** ~: ١ـ وە حەوا کەوتنی ئەو مەکینە و شتانەی کە دەفڕن. ٢ـ (مجـ.) تەقینەوەی شتێک. ٣ـ (کنـ.) زۆر تووڕە بوون و ڕاپەڕین لە سەر جێ. ٤ـ (کنـ.) زۆر پاڕانەوە، لاڵانەوە. ⁙ بچیە ئاسمانێش قڕانێکت نادەمێ. ٥ـ (کنـ.) مردن. **دەست بەرەو** ~ **بەرز کردنەوە:** (کنـ.) دوعا کردن و پاڕانەوە لە خودا، داوای نیازێک لە خودا کردن. || **ئاسمانی حەوتەم:** دوایین قاتی ئاسمان بە پێی بڕوای کۆن، ئاسمانی حەوتەمین. **ئاسمانی حەوتەمین:** بڕ: ئاسمانی حەوتەم. ⁙ سێ پەری لە ئاسمانێ حەوتەمین بەستوویانە لەنگەرە/ لە سەر کۆشکی کاکەمەمی هەڵدەنیشتن ئەوبەر ئەوبەرە. (مان ل ٢٦).

**ئاسمانە** (نا. ل)[ئاسمان + ە] بەشی لای ژوورەوەی سەربان، میچ. || **ئاسمانەی دەم:** مەلاشوو، مەلاژگ، ئاسمانێ دەڤ.

**ئاسمانی** (ئان. ل)[ئاسمان + ی] ١ـ ڕەنگی شینی وەک ڕەنگی ئاسمان، ئاوی، عابی. (شینایی ئاسمان بە هۆی ئەو هەوایەیە کە دەوری زەوی گرتوە.) ٢ـ هەر شتێکی پەیوەندی بە ئاسمانەوە هەبێ. ٣ـ هەر شتێک کە لە ئاسمانەوە هاتبێتە خوار. ⁙ قورئان کتێبێکی ئاسمانییە. ٤ـ هەرچی لە باری ناسکی و لەباری و جوانی لە زەوی دا وێنە و هاوتای نەبێ، ڕووحانی. ⁙ دەنگی ئاسمانی، ڕەوتی ئاسمانی.

**ئاسمە** (نا.)[زا] بڕ: ئاشم

**ئاسمین** (نا.)[زا] بڕ: ئاسمان

**ئاسمی** (نا.)[زا] بڕ: ئاشم

**ئاسمیە** (نا.)[زا] بڕ: ئاسمان

**ئاسمێن** (نا.)[زا] بڕ: ئاسمان

**ئاسن** (نا.)[ئەو: ئەیەە، ئەیەنگە ـ سان: ئایەس ـ پەه: ئاسەن، ئاسێن، ئاهێن، ئاهەن، ئاسیین. تات: ئاسێن، ئاهێن ـ فار: آهن ـ بیر: ئاهێن ـ لۆر: ئاهێ. باک: هەسن، ئێسن ـ ناو: ئاسن ـ باش: ئاسن ـ هەو: ئاهین، ئاسن ـ زا:

ئاسن، ئۆسن] کانزایەکە سەخت و قایم، لە کۆنەوە ناسراوە. ئاسن لە کانی دا پتر بە شکڵی ئاوێتەیە  کە لە کوورە دا دەیتوێننەوە و ئاسنی خالیس بە دەست دێنن. ناوی شیمی Fe یە و ١٥٣٠ دەرەجەی گەرما دا دەتوێتەوە و گەلێک کەرەسەی سەنعەتی بە ئاوێتە لێ ساز دەکەن. **ئاسنی سارد بە فوو نەرم کردن:** (کنـ) دەست دانە کارێکی گەورە و قورس بەبێ یارمەتی و پشتیوانی کەسی دیکە و سەرنەکەوتن. **ئاسنی سارد کوتان:** (کنـ.) کاری بێ کەلک و بێ ئاکام کردن.

**ئاسنجاو** (نا. ل)[ئاسن + جاو؟] قاپ و قاچاغی سازکراو لە زەرد و مس و فلزی دیکە، هیربار.

**ئاسندڕک** (نا. ل)[ئاسن + دڕک] سیمێکی کانزای دوو لۆیی ئەستوور و تایبەتییە کە لە مەودای بستێک کەمتر دا لەم سیمە شتێکی وەک دڕکێکی چەند سوویان لێهاڵاندوە. لەم سیمە بۆ پەرژین و دەوری شوێنێک گرتن و شوێنی نیزامی کەلکی لێوەردەگرن وەها کە کەس نەتوانێ لێی تێپەڕێ.

**تێبینی:** ئەم وشە تازە داتاشراوە و وەرگێڕاوێکە لە داتاشراوە فارسییەکەی (سیم خاردار).

**ئاسنڕفێن** (نا. ل)[ئاسن + رفێن (رفاندن)] شتێکە کە ئاسن و هەندێک کانی دیکە بۆ لای خۆی رادەکێشێ و پێوەی دەنووسێ، جۆری سرووشتێکەی لە کانی دەردەکێشرێ و جۆری دەستکردیشی کوتێک ئاسن یا پۆڵایە کە بە ئەلکتریسیتە یا بە سرووشتێکەی دەیکەنە ئاسنڕفێن.

**تێبینی:** ئەم وشەیە لە وشەی داتاشراوی (آهنربای) فارسی بۆ زمانی کوردیی داتاشراوە.

**ئاسنگەر** (نا. ل، ئان. ل) [ئاسن + گەر][پەهـ: ئاسینکەر، ئاسینگەر ـ باک: هاسنکەر، هاسنگەر، هەسنگەر ـ ناو: ئاسنگەر، ئاسینگەر ـ باش: ئاسنگەر ـ هەو: ئاهینگەر، ئاسنگەر] کەسێک کە سەر و کاری دەگەڵ ئاسنە و لە ئاسنی رووتی ئامرازی ئاسنینی وەک سەرەپاچ و پێمەرە و مەڵەغان، داس و... ساز دەکا.

**ئاسنگەرخانە** (نا. ل)[ئاسنگەر + خانە] دوکان و جێی کاری ئاسنگەر، ئاسنگەری/٢.

**ئاسنگەریی** (حم.)[ئاسنگەر + ئیی]

١ـ پیشە و کاری ئاسنگەر. ‌:: ئێستا ئاسنگەری وەک جاران زۆر باوی نەماوە. ٢ـ (نا. ل) بڕ: ئاسنگەرخانە.

**ئاسنەواڵە** (نا. ل)[ ئاسن + ئە + واڵە] کەل و پەلی ساز کراو لە ئاسن کە لە کار کەوتوون و کەلکیان نەماوە، وردە ئاسنی بێ کەلک.

**ئاسنین** (ئان. ل)[ئاسن + ئین][پەھ: ئاسێنێن] ١ـ هەر شت و شمەکێک کە لە ئاسن ساز کرابێ. :: دەرکەی ئاسنین جێ دەرکەی چێوینی گرتۆتەوە. ٢ـ قایم و سەخت وەک ئاسن. :: مستی ئاسنین.

**ئاس و پەلاس** (ئان. ل)[ئاس3 + و + پەلاس](کنـ.) رووت و قووت، رووت و رەجاڵ، نەدار. **~ بوون:** رووت و قووت بوون، هیچ نەبوون، نەدار بوون. **~ کەوتن:** رووت و قووت بوون، لە دەست دانی تەواوی دەسمایە و دار و نەداری ژیان. **بە ~ دا چوون:** (کنـ.) پاکانە کردن، جل و بەرگی خۆ دادڕین بۆ پاکانە کردن لە خۆ.

**تێبینی:** زەبیحی ئەم وشەیەی بردۆتەوە سەر ئاس ـ ی پەهلەویی بە مانای بەرد و پەلاس بە مانای کوێن (بڕ: قاموس ب١ ل ٣١).

**ئاسۆ** (نا.)[پەھ: سووک، سۆک (لا، بەر) ـ باک: ئاسۆ، هەسوو ـ ناو: ئاسۆ، ئاسۆگ، سوێ ـ هەو: ئاسۆ] ١ـ ئەو شوێنەی کە ئاسمان و زەوی لەبەرچاو دەگەنە یەک، سەرملە. ٢ـ (مجـ.) روانگەی بیر و تێڕوانین.

**ئاسۆگ** (نا.) بڕ: ئاسۆ

**ئاسۆیی** (نا. ل)[ئاسۆ + ئی] خەتی بە درێژایی و موازی ئاسۆ و زەوی.

**ئاسوودە** (نا. مفـ.)[لە: آسودن] ١ـ بێغەم و خەفەت، راحەت. ٢ـ ئارام، بێدەنگ. ٣ـ حەساوە. **~ بوون:** ١ـ بێغەم بوون، راحەت بوون. :: هەتا منداڵەکەی نەدیتەوە دڵی ئاسوودە نەبوو. ٢ـ لە کۆڵ بوونەوەی گیر و گرفت. ٣ـ حەسانەوە. :: خۆزگەم بە خۆی مرد و ئاسوودە بوو. **~ کردن:** ١ـ خاترجەم کردن، دڵنیا کردن. :: کوتم ناچینە سەفەر و ئاسوودەم کرد. ٢ـ لە کۆڵ کردنەوەی گیر و گەفتی کەسێک. ٣ـ (کنـ.) کوشتن و لە ناو بردنی کەسێک.

**تێبینی:** ئاسوودە لە چاوگی ئاسوودەن ـ ی فارسی کەوتوە بە مانا و هاومانای حەسانەوە و راستەوخۆ لە فارسییەوە هاتۆتە نێو زمانی کوردیی.

**ئاسوودەیی** (حم.)[ئاسوودە + ئیی] راحەتی، ئارامی، بێ شەڕ و شۆڕی، دڵنیایی. :: باڵینجەکەی لە بن سەری نا و بە ئاسوودەیی بۆی نوست.

**ئاسەڕ** (نا.)[هەو ـ ئەر] بڕ: ئاستەڕ

**ئاسەوار** (نا. ل)[ ئاس + ئە + وار] ١ـ نیشانە و پێناسی ماددی لە نەتەوە یا عەشیرەتێک یا گیاندارێک وەک بەڵگەی بوونیان، شوێنەوار. :: هێشتا هیچ بەڵگەیەک لە ئاسەواری مادەکان نەدیتراوەتەوە. ٢ـ رەگەز، بەرە. ~ **برانەوە:** بنەبڕ کرانی رەگەز و بەرەی کەس یا گیاندار. :: شوکور ئەسپێ ئاسەواری بڕاوەتەوە. ~ **بڕین:** بنەبڕ کردن و فەوتاندنی بە تەواوەتی کەسێک یا گیاندارێک. :: مەغوولەکان ئاسەواری گەلێک بنەماڵە و نەتەوەیان بڕی. ~ **مانەوە:** نەبڕانەوەی رەگەز و بەرەی کەس یا گیاندار. :: گەلێک نەتەوە لە مێژوو دا هەبوون کە فەوتاون بەڵام ئاسەواریان هەر ماوە. کابرا دەمێک ساڵە مردوە ئێستا ئاسەواریشی نەماوە. ~ **نەهێشتن:** نەمانەوە و بڕانەوەی شت یا گیاندار یا کەس، ئاسەوارنەمانەوە. :: منداڵ ئاسەواری کشمیش و گوێزیان نەهێشت.

**تێبینی:** بەشی یەکەمی وشە یانی ئاس دەگەڵ [هیک: ئاسا āsā ـ ئەو: ئەسەه asah ـ سان: ئاسە āsa، بە مانای شوێن، جێگا و هەروەتر دەگەڵ چاوگی ئاه āh لە ئەوێستا دا و ئاس ās لە سانسکریت و وێدا دا بە مانای دانیشتن] هاوریشەیە . بەشی دووهەم یانی وار لە هیندی باستان و سانسکریتی ڤەرە vara و ئەوێستایی و پەهلەویی ڤەر var بە مانای شوێن و ناوچە کەوتەوە و وار و هەواریش هەر لەم ریشەن بە گشتی ئاسەوار دەبێتە جێی دانیشتن یا شوێنی ژیان.

**ئاسی** (نا.)[باش] بڕ: ئاسک

**ئاسیاو** (نا. ل)[ئاس1 + ئی + ئاو] [پەه: ئاسیاو، ئاسیاڤ، ئاسیاپ. فار: آسیاب ـ تات: ئاسیا. ناو: ئاسیاو ـ هەو: ئاساو، ئاسیاو] ئاشێکی بە ئاو دەگەڕێ، ئاشی ئاوێ ، ئاش.

**تێبینی:** ئاس و ئاش هەر یەک وشە و یەک ریشەن و تەنیا دوو پیتی ش و س ئاڵ و گۆڕیان دەگەڵ یەک کردوە و لە زاراوەکانی کوردیی دا وێنەی زۆرە. زمانناسان ئاس ـ یان بردۆتەوە سەر ئەسەن ـ ی ئەوێستایی بە مانای بەرد و

ئاسیاو دەبێتە بەردێک کە بە ئاو دەگەڕێ. جگە لەوە لە ئەوێستا دا وشەی ئەشە بە مانای ئارد هاتوە و بۆی هەیە دەگەڵ ئاش و ئاس هاوریشە بێ و هەر بۆیە لە ریشەی ئاش1 دا نووسراوە.

**ئاسیاوان** (نا. ل)[ئاسیا + وان] بڕ: ئاشەوان

**ئاسیاوچی** (نا. ل)[ئاسیاو + چی] [هەو] بڕ: ئاشەوان. ∷ سەدای ئاسیاوچی مەیۆ پەیاپەی / ئاساو خاڵی یەن نەوبەتەن سا دەی (مەولەوی)

**ئاسید** (نا.) بڕ: ئەسید

**ئاسیدە** (نا.)[عەر: عصیدة] خواردەمەنییەکی شیرینە کە بە ئارد و رۆن و دۆشاو ساز دەکردرێ، هەڵوای بە دۆشاوی.

لە پێشدا ئاردەکە لە رۆن دا باش سوور دەکەنەوە و لە دوایی دۆشاوی بە سەر دا دەکەن و چاک تێکەڵی دەکەن هەتا پێدەگا و دەیخۆن.

**ئاسیمان** (نا.)[باک ـ زا] بڕ: ئاسمان

**ئاسین** (نا.)[عەر: یس] ناوی یەکێک لە سوورەتەکانی قورئانە، یاسین

**ئاسینگەر** (نا. ئان.)[ئاسین + گەر] بڕ: ئاسنگەر

**ئاسیو** (نا.)[تەب: سیب. فار: آسیب ـ پەش: ئاسێب][ئەر] ئازار، زەرەر، زیان، ئێش، دەرد.

**ئاسێ** (نا.)[؟] ١ـ شوێنی سەخت و چڕ، ئەستەم. ∷ دەڵێ: شا! جێ ئاسێیە، ئەز نایچۆمێ / هیمدادی بۆ دێ لە رۆمێ / دەنشکێنێ، تێگ دەدا کۆمێ، ... (مان ل ١٤). ٢ـ دژوار، گران. ٣ـ گەمارۆ ٤ـ گیر، حاسیە، عاسیە. & حاسێ. ~ **بوون:** ١ـ لە گەمارۆ کەوتن، دەورە دران. ∷ دوژمن لە هەر چوار لاوە دەهات، بە تەواوی ئاسێ ببووین. ٢ـ گیر خواردن، گیر کردن، تووش بوون. ∷ بە دەست ئەو کارەوە چاک ئاسێ بووم، نازانم چی لێ بکەم. دەستم لەو کونە دا ئاسێ بوە نایەتەوە دەرێ. ~ **دان:** گەمارۆ دان. ∷ دوژمن بە تەواوی ئاسێی دابووین. ~ **کردن:** ١ـ تووش کردن، گرفتار کردن، حاسێ کردن. ٢ـ خۆ بەستنەوە، زیندانی کردن. ∷ حەسەن ماوەیەکە خۆی لە ماڵێ ئاسێ کردوە و نایەتە دەر. ٣ـ گەمارۆ دان، لە گیر خستن. ∷ خەڵکی قشڵاخان چەند سەربازێکیان ئاسێ کردبوو، گاشەبەردیان بە سەر دا غلۆر دەکردەوە.

(دمدم ل ٢٣٢)

**ئاش**[1] (نا.)[ئەو: ئەشـــــە ( ئارد)، ئەشن، ئەســەن ( بەرد) ـ هەخ: ئەســەن (بەرد) ـ بەل: هەش، ئاش. باک: ئاش ـ ناو: ئاش، ئاسیاو ـ باش: ئاسیاو ـ هەو: ئاش، ئاسیاو، ئاساو ـ زا: ئارەیە، ئاریە، ئارێ] ١ـ ئامـــرازی هاڕینی گـــەنم و دانەوێڵە بۆ ئارد کردن کە لە دوو بەردی خـڕی گـەورە(بەرداش) پێک هاتوە. ئەم دوو بەردە لە ســـەر یەکن، ئەوەی بنەوە قایم کراوە و ئەوەی سەرەوە بە هێزێکی وەک ئاو، با یا مـــەکـــینە دەگـــەڕێ و دانەوێڵە دەهاڕێ و بە پێی ئەو هێزەی کە دەیگەڕێنێ چەند جـــۆری هەیە. ٢ـ ئەو شوێن وجێگایەی کەم ئەم دەزگایەی تێدا دامـــەزراوە. ٣ـ (ئا.)[باک] ئەندامـێکی مـــاســـوولکەیی و بە هێـــزی باڵندە دانەخۆرەکانە کە دوای چیکڵدانە و بەر لە گەدە هەڵکەوتوە و کاری هاڕینی دانی خوراوە، سیکەتۆرە. ~ **بەرمێن بوون:** دان هاتنی زۆر بۆ ئاش. ~ **فیـچقـە کـردن:** کـون بوونی دۆلاش و دەرپەڕینی ئاو بە تەوژم لە کونەکـەوە. ~ **کـران:** ڕێک خـشـینی بەرداشـەکان وە یەکـتـر لەبەر کـەمی دان. ~ **کـەمـەرە کـردن:** جـووتن و قـەڵت و بڕ کـردنی دان لەبری کردنە ئارد لەبەر خاو بوونی دان. ~ **میـزتن:** کرانەوەی کونی بەرداشی بنەوە و پێدا چونەوە خواری دان. :: ئەو ئاشە لە میـزتن بێ هەر دەمیـزێ. (پەند) ~ **نانەوە:** ١ـ ســـاز کـــردنی ئاش، ئاش دروست کـــردن. ٢ـ (کنـ.) کـــەســـێک تووشی گێرە و کێشە کردن، ساز کردنی کێرە و کێشە بۆ کەسێک. **لە ~ زۆر پێــچـــوون و لە ڕێ پەلە کـــردن:** (کنـ.) قـەرەبووی لە دەسـتـچـوو کـردنـەوە، پەلە کـردن بۆ جـێـبـەجێ کـردنـی کـارێک. **لە حەوت ئاشان دەنکەجۆیەک شک نەبردن:** (کنـ.) ڕووت و قـووت بـوون، هیچ نەبوون، زۆر هـەژار و نـەدار بـوون، لـە حـــــــەوت ئاسـمـانان ئەسـتێرەیەک شک نەبردن. ‖ **ئاشی ئاگر:** ١ـ مەکینەیەکە بە کارەبا کار دەکـا و جـێی هێـزی ئاوی گـرتـۆتەوە، ئاشـی مـەکـینە. ٢ـ (کنـ.) کـەسی هار و هـاج و بەدفـەڕ. **ئاشی ئاو(ێ):** کۆنتـرین جـۆری ئاش لە کـوردسـتـان کە بە هێزی ئاو دەگەڕێ و هێشتاش برەوی هەرماوە. ئاش بە تەنیاش مەبەست لەم ئاشەیە. :: ئاشـی ئاو بـە ئاو دەگـەڕێ (پـەند) **ئاشی ئاور :** بڕ: ئاشـی ئاگـــر. **ئاشی با:** ئەو ئاشـەی کـە بە هـێـزی با کـار دەکـا و لە وڵاتانی دی باو بوە. **ئاشی زۆردار:** (کنـ.)

دەســــتـــەڵات و حکوومــــەتی زۆردارانە.

***ئـاو دە ئاشـی زۆردار کـــــردن:** (کنــ.) یارمـــەتـی زۆردار و دەســـتـــەڵاتدار دان.

**ئاشی قـاوە:** ئامـرازێکی چووکی درێژە، کارخانە لە کانزای سازی دەکا، خـەڵک بۆ هـاڕینی دەنکی قــاوە یا ئاڵەتی دیکە کـەلکی لێـوەردەگـرن. **ئاشی کـرێوە:** ١ـ ئاشێکی کە بەرداشەکەی خێرا بسووڕێ و زووزوو گەنم بهاڕێ و بیداتە دەر وەها کــە تـەپ و تۆزی هـاڕینی وەک کـــرێوەی بەفـر دیاری بکا. ٢ـ (کنـ.) زووزوو قسـە کـــردن و نۆرەی کـــەس نەدان. ⁘ دەڵێی ئاشی کرێوە خۆ لە قسـان نۆرەی کەس نـادا. ٣ـ (کنـــ.) زووزوو و بە پـەلە نـان خواردن. **ئاشی مەکینە:** بڕ: ئاشی ئاور

**ئاش** $^{2}$ (نـا.)[ پەه: ئاش. باک: ئاش ـ نـاو: ئـاش ـ بـاش: ئـاش ـ زا: ئـاش] ١ـ چێـشت. ٢ـ چێـشــتـێکی شـلە کــە بە دانەوێڵە (نۆک، برینجی گردە، باقلە،...) و ســەوزی ســاز دەکـرێ و مــاست یا دۆ کەشکی تێکەڵ دەکەن و پیواز ڕۆنیشی بە سـەر دادەکەن و دەیخۆن. ئاش بە پێی ئەوە کـە نێوەڕۆکەکەی چی تێبکەن چەند جـۆری هەیـە. ٣ـ چێشـتی شـلە بۆ پڵاو، خـــۆرشت، شـلە. ٤ـ شـــووی پـارچـە و کراس، دەق، ئاهار.

**تێـبـینی:** ئاش لە چاوگـەی ئەد ad و ئەس as ـ ی ســـانسکریت بە مـــانـای خواردن کەوتوە. هس: ئاز1

**ئـــاش** $^{3}$ (نـــا.) بـــڕ: ئـاشـــت. **~ بـوونـەوە:** بـڕ: ئـاشـت بـوونـەوە. **~ کردنەوە:** بڕ: ئاشت کردنەوە.

**ئاشاخە** (ئان.)[تور: aşağı (ژێر، بن، نزم)] ١ـ هەمـــوو شــتـــێکی خــراپ و بێکەڵک. ٢ـ مـیـوەی ڕزیو و گـەندەڵ کـە شـیـاوی خـواردن نەبێ. ٣ـ حـەیوانی بێ برەو لە جەڵەب دا. & ئاشاغە.

**ئاشاغە** (ئان.) بڕ: ئاشاخە

**ئاشانە** (نا. ل)[ئاش1 + ئانە] باجێکە کە ئاشەوان لە جیات حەقی دانانی ئاش دەیدا بە ئاغـا و ئەربابی ئەم ناوچـەیە و بە پێی کـــەم و زۆری مــــزاش دیاری دەکردرێ.

**ئاشبگیر** (نا. ل)[ئاش1 + ب + گیر] گـــرتـنی ئاش و بـە تـاڵان بردنی ئـارد و گەنمی نێو ئاش لە لایەن دز و چەتەوە.

**ئاشبـەتاڵ** (شـر.)[ئاش1 + بەتاڵ] ١ـ رسـتـەیەکـە ئاشـەوان کـاتێک دانـی بۆ هـاڕین نـەمـــا هـەرا دەکـــا هـەتا ئـەوەی باراشـی هـەیـە بیـــهـێنێ، ئاشـــدۆڵ. ٢ـ (کنـ.) کــار و خـــەباتی نیـــوەچڵ و واز

لێهێنراو. **~ کردن:** ١ـ هەرا کردنی ئاشەوان بۆ باراش. ٢ـ دەست هەڵگرتن لە کار و خەبات، ئیشێک بە نیوەچڵی هێشتنەوە.

**ئاشپەز** (نا. فا)[ئاش2 + پەز2] کەسێک کە چێشت ساز کردن لە ئەستۆی ئەوە، چێشت لێنەر، چێشتکەر، چاشتکەر، ئاشچی، ئاشپێژ، ئازپێش، ئازچی.

**تێبینی**: پەز لە چاوگی پۆختەن (پختن) ـ ی فارسی بە مانای پاتن کەوتوە. ئەم وشەیە لە فارسی را هاتۆتە نێو زمانی کوردیی و کوردییەکەی ئاشپێژ یا ئازپێش ـ ە.

**ئاشپەزخانە** (نا. ل)[ئاشپەز + خانە] شوێنی ساز کردنی چێشت لە ماڵان و لەو جێگایانەی خۆراک دەفرۆشن، چاشتخانە، متبەق.

**ئاشپەزیی** (حم.)[ئاشپەز + ئیی] کاری چێشت لێنان، کاری ئاشپەز.

**ئاشپێژ** (نا. فا)[ئاش2 + پێژ][باک] بڕ: ئاشپەز

**ئاشت** (نا.)[ ئەو: ئاخشتی ـ پەه: ئاشت. باک: ئاش، هاش ـ ناو: ئاشت، ئاش ـ هەو: ئاشت، هاشت ـ زا: ئاشت] وەستانی شەر و ناکۆکی و دوو بەرەکایەتی و پێک هاتن و مەسڵەت کردنی لایەنەکان. **~ بوونەوە:** پێک هاتن و ڕێک کەوتنەوەی لایەنەکان، ئاش بوونەوە. ::: دوای دوو ساڵ نێوان ناخۆشی دەگەڵ ماڵە خاڵم ئاخریکەی ئاشت بووینەوە. **~ کردنەوە:** پێک هێنانەوە و ڕێک خستنەوەی لایەنەکانی نێوان ناخۆش، ئاش کردنەوە. ::: ئەو ژن و مێردەی ئاشت کردەوە. ئامریکا بە تەمایە جوولەکە و عەرەبی پێکەوە ئاشت بکاتەوە.

**ئاشتەبا** (نا.)[؟] شت، تشت. ::: هیچ ئاشتەبای خودا شک نابا.

**ئاشتی** (حم.)[ئاشت + ئی][پەه: ئاشتییە] برانەوەی شەڕ و هەڵلا و ڕێکەوتنی لایەنەکانی شەڕ، هاشتی.

**ئاشتیخواز** (نا. فا)[ئاشتی + خواز] کەسێک کە داواکاری ئاشتی و دژی شەڕە، لایەنگری ئاشتی.

**ئاشتیخوازیی** (حم.)[ئاشتیخواز + ئیی] دژی شەڕ بوون و داواکاری ئاشتی و هێمنایەتی بوون.

**ئاشچی** (نا. فا)[ئاش2 + چی] بڕ: ئاشپەز

**ئاشخاڵ** (نا.) بڕ: ئاشغاڵ

**ئاشخاڵدان** (نا. ل)[ئاشخاڵ + دان4] بڕ: ئاشغاڵدان.

**ئاشخانە** (نا. ل)[ئاش2 + خانە] شوێنی فرۆشتنی چێشت و خۆراک، چێشتخانە.

**ئاشدۆڵ** (شر.)[ئاش1 + دۆڵ] بڕ: ئاشبەتاڵ

**ئاشرمە** (نا.)[ناو: ئاسرمە، ئاشرمە، هاشرمە، هێشرمە] کوتە چەرمێکی هەندێک پانە کە لە کورتانەوە دێتە سەر کەفەڵی ئێستر و بارگین.

**ئاشغاڵ** (نا.)[؟] ١ـ هەر شتێکی شیاوی فڕێ دان، زبڵ، زبڵ و زاڵ. ٢ـ (مجـ.) مرۆڤی هیچ و پووچ و خوێڕی. & ئاشخاڵ.

**ئاشغاڵدان** (نا. ل)[ئاشغاڵ + دان4] دەفری ئاشغاڵ تێکردن، جێگای زبڵ، زبڵدان، ئاشخاڵدان.

**ئاشڤان** (نا. ل)[ئاش1 + ڤان][باک] بڕ: ئاشەوان

**ئاشڤانی** (حم.)[ئاشڤان + ئی][باک] بڕ: ئاشەوانی

**ئاشق** (نا. فا)[عەر: عاشق] ١ـ کەسێک کە ئەوینی دە دڵ دا بێ و حەز لە کەسێک بکا، ئەویندار، دڵدار. ٢ـ دڵبەندی زۆر بە شتێک، هۆگر، گیرۆدە. :: ئاشقە راو، ئاشقە کار. ٣ـ گۆرانی بێژ و شایەری ئازەری. ~ **بوون:** ١ـ ئەویندار بوون، گیرۆدەی کەسێک بوون. ٢ـ هۆگر و گیرۆدەی شتێک یا کارێک بوون. :: ئاشقی چاوی کەژاڵ و گەردنی پڕخاڵ نیم / ئاشقی کێو و تەلان و بەندەن و بەردم ئەمن (تاریک و روون ل ٤٩). ~ **کردن:** ١ـ کەسێک لە داوی ئەوین خستن. ٢ـ کەسێک هۆگر و کیرۆدەی کار و شتێک کردن.

**ئاشقانە** (ئان. ل، ئاک. ل)[ئاشق + ئانە] ١ـ وەک ئاشق، بە شێوەی ئاشق. ٢ـ هەرچی کە پێوەندی بە ئاشقانەوە هەبێ. :: گۆرانی ئاشقانە، فیلمی ئاشقانە. & ئەویندارانە.

**ئاشقایەتی** (حم.)[ئاشق + ئایەتی] حاڵەت و شێوەی ئاشق، کردەوەی ئاشق، ئەوینداری، ئاشقی، حەزلێکردوویی.

**ئاشقبەند** (نا. ل)[ئاشق + بەند] خشڵێکی سەر سینگی ژنانە کە بە چەندین جۆری هەیە، سینەڕیز.

**ئاشق پیشە** (ئان. ل)[ئاشق + پیشە]



کەسێک کە کار و پیشەی ئاشقایەتییە.

**ئاشقکوژ** (ئان. فا)[ئاشق + کوژ] ١ـ کەسێک کە ئاشق و ئەویندار دەکووژێ. ٢ـ کچێک کە روو نەدا بە دڵدارەکەی و زوڵمی لێبکا.

**ئاشقکوژیی** (حم.)[ئاشقکوژ + ئیی] کار و کردەوەی ئاشقکوژ.

**ئاشقـە** (نا. ل)[عەر: عاشق] ماری نێری ئەویندار کە هەمیشە دەگەڵ ماشقە (ماری مێ) دەگەڕێ و دەژی./ / ماشقە. :: مارێکی ئاشقە لەو دەوروبەرانە دەگەڕێ پێم وایە ماشقەکەیان کوشتوە.

**ئاشقە و ماشقە** (نا. ل)[ئاشقە + و + ماشقە][عەر: عاشق و معشوق] ١ـ کچ و کوڕێک کە ئەوینداری یەکن و یەکتریان خۆش دەوێ و بێ یەک هەڵناکەن، دڵدار و دڵبەر. ٢ـ جووتە مارێکی نێر و مێ کە بە یەکەوە دەژین. لە کوردەواری دا کوشتنی یەکێک لە وان باش نیە و ئەوی دی وە شوێن تۆڵە دەکەوێ و بەو کەسەوە دەدا و دیکووژێ.

**ئاشـــقی** (حم.)[ئاشق + ئی] بڕ: ئاشقایەتی

**ئاشک** (نا.)[پەه: ئەشکەمب][باک] گەدە، مەعدە.

**تێبینی:** ئەشکەمب لە پەهلەویی دا بە مانای زگ و ورگ هاتوە.

**ئاشکار** (ئان.)[باک] بڕ: ئاشکرا

**ئاشکرا** (ئان.)[ ئەو: ئاڤییشیە ـ پەه: ئاشکاراک، ئاشکارەک. باک: ئاشکەرە، ئاشکار، ئەشکەرە ـ ناو: ئاشکرا ـ باش: ئاشکرا ـ هەو: ئاشکرا ـ زا: ئەشکەرا] ١ـ دیار، بەرچاو، روون، پەیدا، مەعلووم. ٢ـ دەرکەوتنی نهێنی کار، قسە و مەسەلەیەک. ٣ـ حاڵی هەرچی کە پێویستی بە بەڵگە و روون کردەوە نەبێ، بەڵگەنەویست. ~ **بوون:** ١ـ وەدیار کەوتن، پەیدا بوون :: سوارەکان لە سەرەوەی ئاوایی ئاشکرا بوون. ٢ـ دیار بوون، روون بوونەوە، روون بوونەوەی مەسەلەیەکی نهێنی. ئاشکرایە کێ ئەو دزیەی کردوە. سبەی دووی ئاشکرا دەبێ دۆست و دۆژمنت کێیە. ~ **کردن:** ١ـ روون کردنەوە، نیشان دان. ٢ـ دەرخستنی نهێنی کار، قسە یا مەسەلەیەک. ٣ـ دەرخستن و ناساندنی کەسێکی شاراوە. :: پەنام بردە ماڵێکی، خاوەن ماڵ دەستبەجێ ئاشکرای کردم و گرتیانم. **پێ** ~

**کردن:** روون کردنەوە و ئاشکرا کردنی کار، قسە یا مەسەلەیەک بە کەسێکی دیکە. :: ئەوەندەیان تێهەڵدا هەتا دزییەکەیان پێ ئاشکرا کرد. **خۆ ~ کردن:** خۆ نیشان دان بە خەڵک، خۆ ناساندن، خۆ وەدیار خستن. :: لە ترسی گرتن ماوەیەکە خۆی ئاشکرا ناکا. دەڵێی لێمان زیزی ئەرێ ئەوە بۆ خۆت ئاشکرا ناکەی. **خۆ لێ ~ کردن:** خۆ بە یەکتر ناساندنی کەسانێک کە پێشتر یەکتریان ناسیوە یان بە جۆرێک پێوەندیان بە یەکتر هەیە بەڵام یەکتریان نەدیوە. :: باب، کوڕەکەی نەدیتبوو هەتا کوڕە خۆی لێ ئاشکرا نەکرد نەیزانی ئەوە کوڕیەتی. **لێ ~ کردن:** دەرخستنی نهێنی و رازی کەسێک لە لایەن کەسێکەوە کە ئەم مەسەلەیە بزانێ، ئاشکرایی لێ کوتن. :: قسەکەی لێ ئاشکرا کرد و لە کن خەڵک شەرمەزاری کرد. **لێک ~ بوون:** ١- دەرکەوتنی راستەقینە لە نێوان دوو یا چەند کەس. ٢- یەکتر ناسینەوەی دوو یا چەند کەس. **لێک ~ کردن:** دەرخستن و بڵاو کردنەوەی شتی نهێنی لە لایەن کەسێکەوە سەبارەت بە کەس یا کەسانی دیکە.

**ئاشکرایی** (حم.)[ئاشکرا + ئیی] چلۆنایەتی مەسەلە یا شتێک بە روونی و بە بێ گرێ و گۆڵ. // نەهێنی. **~ لێکوتن:** دەرخستنی نهێنی کار، مەسەلە یا قسەیەک لە لایەن کەسێکەوە کە چلۆنایەتی ئەم مەسەلەیە بزانێ، لێ ئاشکرا کردن، راستی لێکوتن.

**ئاشکەرە** (ئان.)[باک] بڕ: ئاشکرا

**ئاشگێڕ** (ئان. فا)[ئاش +گێڕ (گێڕان)] رادەیەک لە ئاو کە بتوانێ ئاشێک وەگەڕ بخا. :: ئەو جۆگەیە ئاشگێڕی چاکە. ئامێرزا بەشی ئاشگێڕێکی ئاو لە چۆم شکاندبوو.

**ئاشماس** (نا. ل)[ئاش2 + ماس [ئەر] بڕ: ئاشماست.

**ئاشماست** (نا. ل)[ئاش2 + ماست] جۆرێک ئاش کە بە سەوزی و دانەوێڵە ساز دەکرێ و لە دوایی ماستی بە سەر دادەکەن، ئاشماس.

**ئاشم** (نا.)[پەه: ئاییشم. زا: ئاسمە، ئاشمە، ئاسمی، ئاشم، ئەشم، ئەشمە، ئەشمی] مانگ، هەیڤ.

**ئاشمە** (نا.)[زا] بڕ: ئاشم

**ئاشنا** (ئان.)[پەه: ئاشناک، ئاشنا.

باک: ئاشنا ـ ناو: ئاشنا ـ باش: ئاشنا ـ هەو: ئاشنا] ناسیاو، دۆستایەتی دووراودوور. // بێگانە :: کاک سمایل ئاشنای باوکمە. ٢ـ شارەزا، بەڵەد. :: ئاشنای ئەو ناوچەیە نیم. ئاشنای ماڵەکەتانم تۆ برۆ من خۆم دێم. ٣ـ دوکاندارێک کە هەمیشە کەل و پەلی پێویستی لێدەکڕدرێ. ~ **بوون:** ١ـ ناسیاو بوون دەگەڵ کەسێک کە پێشتر نەتدەناسی. ٢ـ بەڵەد بوون و جێگەیەک فێر بوون کە بەر لەوە ئاشنا نەبوو. ~ **پەیدا کردن:** بڕ: ئاشنا گرتن. ~ **کردن:** ١ـ دوو کەس دەگەڵ یەک ناسیاو کردن. ٢ـ کەسێک فێرە شوێنێک کردن. ~ **گرتن:** ناسیاو بوون دەگەڵ کەسێک، ئاشنا پەیدا کردن.

**ئاشنا و رۆشنا** (نا. ل)[ئاشنا + و + رۆشنا] کۆمەڵە ناسیاوی کەسێک. :: کاکم ئاشنا و رۆشنای زۆرە هەر کەس دەگاتێ سڵاوێکی لێدەکا.

**تێبینی:** زەبیحی وشەی رۆشنای بردۆتەوە سەر (روو + شناس) یانی ئەوەی کە هەر بە روو دەناسرێ و دۆستایەتێکی ئەوتۆی دەگەڵ نەگێرابێ. (بڕ: قامووس ب ١ ل ٣٨)

**ئاشنایەتی** (حم.)[ئاشنا + یەتی] پەیوەندی نێوان دوو کەسێک کە یەکتر دەناسن، ناسیاوی.

**ئاشوەستا** (نا. ل)[ئاش1 + وەستا] وەستای ئاش نانەوە، کەسێک کە ئاش ساز دەکا و ئەگەر خراپ بوو چاکی دەکاتەوە.

**ئاشوەستایی** (حم)[ئاشوەستا + ئی] کار و پیشەی ئاش وەستا.

**ئاشۆ¹** (نا.)[؟][ئەر] کێم و هەوای برین، چڵک، زۆخ، زووخ، ئاشوو.

**ئاشۆ²** (نا. ل)[ئا13 + شۆ] ١ـ ئاژاوە، پەشێوی، هات و هاوار و تێک چوونی باری ئاسایی، ئاشێو، پشێونە.

**تێبینی:** ئاشۆ لە پێشگری ئا و شۆ لە چاوگی شێڤەنی پەهلەویی و شێوانی کوردیی کەوتوە. هس: ئاژاوە

**ئاشۆ پاشۆ** (ئان. ل)[ئاشۆ2 + پاشۆ] خەونی تێکەڵ پێکەڵ و ئاڵۆز.

**تێبینی:** ئاشۆ هەروەکی نوسراوە ئاشۆی دووهەمە و پاشۆ مانایەکی نیە و وەک پێکەڵ کە دەگەڵ تێکەڵ دێ و ئاڵۆزییەکی پتر نیشان دەدا.

**ئاشوو** (نا.) بڕ: ئاشۆ1

**ئاشـــووب** (نا.)[فـــار: آشـــووب] [کلاسیک] ئاژاوە، ئاشێو، ئاشۆ2. ¤ لە چاوم خوێنی جاری کرد و هەم ڕەنگی لە ڕوو بردم / ئەم ئاشـــووبی دڵ و دینە بە لێوی ئاڵ و چاوی کاڵ (مەحوی ل ٢٠٢).

**ئاشووت** (نا.)[؟][باک] بڕ: ڕنوو

**ئاشـــووتە** (نا. ل)[ئاشـــووت + ئە] [باک] بڕ: ڕنوو

**ئاشـــووژن** (نا. ل)[ئا13 + شـــووژن] [باک] بەنێکی ڕێســـراوە بۆ دروونەوەی ســـەری جـــەواڵ و تەلیس، بەندروو، ئارشووژن.

**ئاشــە بە تەندوورە** (نا. ل)[ئاش1 + ئــە + بــە + تــەنــدوور + ئــە] یــاری و کایەیەکی منداڵانەیە، ئاشە بە تەندووڕێ، ئاشــەبەتەنوورە، ئاشــەتەنووڕێ، کــەری سووری پشت درێژ.

کایەکە بەم جۆرەیە: کۆمەڵە منداڵێک لێک کـۆ دەبنەوە و دوو کـەســی گـەورەتر یامەلا لێکیان دادێن و دەبنە دوو دەستە. دەستەیەک تێدەکەوێ. دەستەی تێکەوتوو لـە دەوری یەک کـــۆ دەبنـەوە و ســـەر بـە ســـەری یەکـــەوە دەنێن، دەســـتـــەی دووهەمیش حەول دەدەن خۆ باوێنە سەر پشـتـیـان، مـــەلای دەســـتـــەی تێکەوتوو ئەرکی ئاگاداری لە دەستەی خۆی هەیە و بە دەوری دەســتـەکەی دا دەخـولێتەوە و ئەویش حـەول دەدا یەکێک لەوان پیس کا و ئەگەر دەسـتی وە لەشـی یەکیان کەوت ئەوە نۆرەکەیان دەگۆڕدرێتەوە.

**ئاشە بە تەندووڕێ** (نا. ل)[ئاش1 + ئــە + بــە + تــەنـــدوور + ئـــێ] بـــڕ: ئاشەبەتەندوورە

**ئاشە بە تەنوورە** (نا. ل)[ئاش1 + ئە + بە + تـەنوور + ئـە] بڕ: ئـاشـــــە بـە تەندوورە

**ئاشە تەندوورە** (نا. ل)[ئاش1 + ئە + تەندوور + ئە] جـۆرە ئاشێکە کـە دۆڵاشی لە بەرد و قـسڵ بۆ هەڵدەبەسـتن هەتا ئاو بە فیڕۆ نەچێ و بە ئاوی کەمیش بگەڕێ، ئاشـــێک کــە تـەندوورەی هەبێ، ئاشـــە تەنوورە.

**ئاشە تەنوورە** (نا. ل)[ئاش1 + ئە + تەنوور + ئە] بڕ: ئاشەتەندوورە.

**ئاشـەتەنووڕێ** (نا. ل)[ئاش1 + ئە + تەنوور + ئێ] بڕ: ئاشە بە تەندوورە.

**ئاشـــەڤـــان** (نا. ل)[ئاش1 + ئە + ڤان][باک] بڕ: ئاشەوان

**ئاشـەوان** (نا. ل، ئان. ل)[ئاش1 + ئە



+ وان][باک: ئاشـڤـان، ئاشـەڤـان ـ ناو: ئاشـەوان، ئاسیاوان ـ باش: ئاسیـاوان ـ هـەو: ئـاســــــــاوان ـ زا: ئـارەوانـچـی، ئاروانچی] بەرپرسی ئاش، ئەو کەسـەی ئاش هەڵدەسـوورێنێ و دانـەوێڵە دەکـاتە ئارد.

**ئاشـەوانیی** (حم.)[ئاشـەوان + ئیی] کـار و پیشـەی ئاشـەوان، ئاشـڤـانی. ∷ ئاشەوانیی هەر ئەوە نیە خۆت ئارداویی کەی. لەوە بەدوا ئاشـەوانیی ئەو ئـاشـە ناکەم.

**ئاشـیـانە** (نا.)[پەه: ئاشـیـان] هێـلانەی مـەل و باڵندە. ∷ نازانم ئەو سیسارکە کەچەڵە چییە، دایمە ئاشیانە و هێـلانەی لە سـەر پشـتی تۆ داناوە (شێخ فەرخ ل ٢٨).

**ئاشێرە** (نا.)[عەر: اشارة] ئیشارە، ئیشارەت، ئاماژە.

**ئاشـێـڕ** (نا. فـا)[ئاش1 + هێـڕ (هاڕین)] کـەسێک کـە باراش بۆ ئاش دەبا. ∷ لەوەتی مـام پیـرۆت بۆتە ئاشەوان ئاشێڕ زۆر بوون.

**ئاشێو** (نا.) بڕ: ئاشۆ2

**ئاغـا** (نا.)[مەغ: ئاغـا، ئاقـا] ١ـ ئەرباب، خـان، بەگ. ٢ـ بۆ ڕێز و بە گەورە دانان بە ناوی پیاو دەلکێ لە پاش و لە پێش ناو تۆفـیـری نیـە. ∷ ئاغـا حەسەن، حەسەن ئاغا. ٣ـ مێرد، شـوو، پیـاوی مـاڵ. ∷ ئەرێ ئاغـای ئەو خـانمە کێیە. خـانم و ئاغـا ٤ـ باوک، باب. ∷ مەگەر ئاغام نەیکوت حەقت نیە شەو دێر بێیتەوە! ٥ـ مامۆستای فێرگە. ٦ـ مـرۆڤی چاک و بەڕێز. ∷ زۆر کـوڕێکی ئاغـایە. ٧ـ داشـێکی دامـە کـە دەگـاتە ئاخر ماڵی غەنیم و توانایی هەڵسووڕانی پتـر دەبێ. & ئاخـا، ئاخـە، ئاغـە. ~ **بڕینەوە:** خـواردنی ئەو داشـەی کـە بۆتە ئاغا لە کایەی تەختەدامە دا. ~ **کردن:** گـەیاندنی داشی دامـە بە ئاخـر خـانی غەنیم.

**ئاغـابانوو** (نا. ل)[ئاغـا + بانوو] پارچەیەکی پنۆک پنۆک و خاڵخاڵی ڕەش یا سـوور و یا ڕەنگی دیکە بە تەخـتی سپی، چوار گۆش و بڕاو و ئامادەیە پیاو لە سـەر دەیبـەسـتن، جـەمـەدانی، جەمەدانە، جامانە، جامانی، جامەدانی، جامەدانە، ئاغەبانوو، ئاخەبانوو.

**ئاغـاژن** (نا. ل)[ئاغـا + ژن] ژنی ئەرباب و خان، خێزانی ئاغا کە بەم ناوە بانگی دەکەن، خانم

**ئاغاڵە** (نا. ل)[ئاغا + لە] نازناوێکە بۆ کوڕی نازدار و خۆشەویست بە مانای ئاغا چکۆڵە.

**ئاغایانە** (نا. ل)[ئاغا + ئانە] ١- باجێکە ئەرباب یا دەرەبەگی ناوچە لە لادێی و جوتێری ژێر دەستەڵاتی وەری دەگرێ. ٢- (ئان. ل) وەک ئاغا، کردار و شێوەی ئاغا. ∷ کاک بایز زۆر ئاغایانە دەجووڵێتەوە پووڵ و پەینی لە لا یەکە.

**ئاغایەتی** (حم.)[ئاغا + یەتی] بە ئاغا بوون، ئەربابیەتی، ئاغاتی.

**ئاغایی** (حم.)[ئاغا + ئی] بڕ: ئاغایەتی

**ئاغزوونە** (نا. ل)[ئاغز (تور: زار) + زوون (زوان) + ئە] ئاڵقەیەکە لە کانزا دروست دەکرێ و زمانەیەکی باریکی پێوەیە و لە سەری قایش و کیف و بەندی سەعات دەدرێ بۆ بەستنی ئەو کەرەسانە، ئاڵقەزوونە، ئاوزوونە.

**ئاغزە** (نا.)[تور: ئاغز (زار، دەم) + ئە] کوتە کاغەزێکی چووکە لوولەی دەکەن و لە بنی جگەرەی هەڵپێچراوی دەنێن بۆ ئەوە تووتنەکەی نەڕژێتە نێو زار یا دەرەوە، بنک/١، بنکە جغارە، دەمە.

**ئاغووش** (نا.)[فار: آغوش] [کلاسیک] بەر، باوەش، ئامێز.

**ئاغە** (نا.) بڕ: ئاغا.

**ئاغەبانوو** (نا. ل)[ئاغە + بانوو] بڕ: ئاغابانوو.

**ئاغەبرا** (نا. ل)[ئاغە + برا] بڕ: ئابرا

**ئاغەڵ** (نا.)[ئا13 + غەڵ] ١- ئەشکەوت یا شێوە ئەشکەوتێک کە لە نێو کێو سازی دەکەن و مەڕ و ماڵاتی تێدەکەن. ٢- شوێنێک لە ماڵ کە وەک خانوو بۆ داکردنی مەڕ و ماڵات سازی دەکەن. ٣- چواردیواری سەر دا نەپۆشراو لە دەشت بە بەرد یا چەپەر بۆ داکردنی مەڕ و ماڵات. & غەڵ

**ئاف** (پێشـ.)[بڕ: ئاو3] پێشگرە بە مانای ئاو3، هاو کە تەنیا لە وشەی ئافتا دا دەبیندرێ.

**ئافات** (نا.)[عەر: ئافات کۆی ئافەت] بڕ: ئافەت. **تێبینی:** ئافات هەر چەند لە عەرەبی دا کۆیە بەڵام لە کوردیی دا هەر وەکوو ئافەت بە کار دەبردرێ.

**ئافاق** (نا.)[عەر: آفاق، کۆی افق] ١- قەراغەکانی ئاسمان، ئاسۆ، ئاسۆگ، سوێ. ٢- دنیا، جیهان. ∷ چ قەسر و

دائیـره و تاقیّ، تیـا تۆ تاقی ئافـاقی / نەی و مـوتریب، مـەی و سـاقی، گـوڵ و بولبول هەموو جووتن (نالی ل ٣٢٨). بەم هـەمـــوو تـەبعـــە رەوانە، بـەو هـەمـــوو هـۆنراوەوە / چاکـە نـەبمە شـــۆهرەیی ئافاق و هەر ئاوارە بم (ئاوات ل ١٥).

**ئافـتـا** (نا. ل)[ئاف (بڕ: ئاو3) + تا] هاوتا، بەقـــەرا، هـاوچەشـن. ‌:: ئەگـــەر چاوی خـۆم بە یـایەزینیّ هـەڵدەهێنـانە / ئەو خـاتوونەم دیوە ئافـتـای کاکـەمـەمی جوانە (مان ل ٢٧).

**ئافتاب** (نا.)[فار: آفتاب][کلاسیک] ئافتـاو، هەتاو، خۆرەتاو. :: شـەو ئەگەر تۆ مـاهتـابی ئینتزاری تـا بە کەی / ڕۆژ ئەگـەر تۆ ئافـتـابی بۆچ لە هەوران نـایە دەر (وەفایی ل ٤٢).

**ئافـــتـــاو** (نا.)[ئاف + تاو][پەه: ئەفتـاپ] تاو، هەتاو، خۆر، خۆرەتاو. :: ئافتـاو جـەمینان جـەمین شـۆڵەی شـەم/ چەنی قیبلەی من مەوینان وە چەم (وەلی دێوانە ل ٣٣). سبـحـەینیّ ئەگەر ئافتـاو دەرپەڕییـە/ مـاڵمـاڵ ئـەویّ ڕۆژیّ دەهاتە بازاڕییە. (مان ل ١٠٥).

**تێـبـینی:** ئاف نازانم لـە کـام ریشــە و سـەرچاوەیە، هـەرچی هـەیە هـەمان « هـە » یە کـە لـە وشــەی هەتاو دایـە. پوور داود ئـاف ـ ی بـە مـــــانـای ڕووناکـــــیی و درەوشـــــانـەوە دانـاوە، کـــــەچی چ سـەرچاوەیەکی بۆ دیـاریی نەکردوە. (بڕ: یشتها ل ٣٠٥).

**ئافـتـاو گـەردان** (نا. ل)[ئافـتـاو + گەردان] بڕ: بەرچاوکە/٢.

**ئافـتـاوە** (نا. ل)[ئاف + تاوە][باک: ئافـتـاوە ـ ناو: ئافـتـاوە، ئەفتـاوە ـ باش: هەفتاوە ـ هەو: ئەفتاویّ] دەفرێکە پێشتر لە زەرد و تـەنەکـە و مس دروست دەکـرا بەڵام ئێسـتـا لە پلاستـیک سـاز دەکریّ، لوولەیەکی هـەیە دەگەڵ دەسکێک و خۆی وەک تونگەیەکـە، ئاوی تێـدەکـریّ و بۆ دەسـت و چاو شــــوشتن و دەسـنوێژ لـەو شــوێنانـەی ئاوی شـێـرە نیــە کـەلکی لێوەردەگرن و کاتی دیکە لە ئاودەست بۆ خـۆ شـوشـتـنەوە، مــەسین، مــەسـینە، مـسینە، لوولینە، مەعدەنی، مسینک. ‖ **ئافتاوە و لەگەن:** ئافتاوە دەگەڵ دەفرێکی قـووڵی دیکە بە ناوی لەگـەن کـە پێشـتـر بـەر لـە نـان خــــــواردن و دوای دسـت هەڵگرتن و تەواو بوون لە خـواردن یـا بۆ هەر مەبەستێکی دیکە دەست و پەلیان لە سـەر دەشوشت.

**تێبینی:** ئاف لەم وشەیە دا بە مانای ئاو ـ ە کە لە ئاف یا ئاڤ ـ ی ئەوێستایی هەر بە مانای ئاو لە وشەکانی āfant و āvant بە مانای دەفری ئاو یا ئاودان کەوتوە. ئافتاوە بە گشتی دەبێتە تاوە یا دەفری ئاو. هس: ئامان1

**ئافتاوەدار** (نا. ل)[ئافتاوە + دار] کەسێک کە لە دیوەخان ئیشی هەڵگرتنی ئافتاوە بۆ سەر دەستاوی میر و ئەرباب بوو. ⁘ من کەمتەر کەنیز پەرستار تۆم/ من ئافتاوەدار، خزمەتکار تۆم (خانا ل ٢١٩).

**ئافتۆمات** (نا.)[روس: avtomat] ١ـ شتێک کە لە خۆیەوە کار بکا،ئۆتۆمات، خودکار ٢ـ جۆرێک چەکە. لە تفەنگ چووکتر و لە دەمانچە گەورەترە و لە کاتی شەڕی دووهەمی جیهانی ناو و چەکەکەی هاتۆتە نێو زمانی کوردیی.

**ئافر** (نا.)[باک] بڕ: ئاخوڕ

**ئافران** (چا. ل)[باک] خوڵقان، ساز بوون.

**ئافراندن** (چا. م)[پەه: ئافرییتەن. فار: آفریدن ـ لۆر: ئافەرییێ. باک: ئافراندن ـ زا: ئافەرناییش] خوڵقاندن، ساز کردن، داهێنان.

**ئافراو** (نا. مفـ.)[لە: ئافران] خوڵقاو، سازکراو.

**ئافرەت** (نا.)[عەر: عورة] ١ـ مێینەی مرۆڤی بە مێرد، ژن. ⁘ ئافرەتی کورد زۆر فەقیر و بەستەزمانن. ٢ـ وشەی بانگ کردنی خێزان و ژنێک لە لایەن شووییەکەیەوە، ژنەکێ. ⁘ دا ئافرەت چایەکم بۆ تێکە! & عافرەت، عەورەت.

**تێبینی:** عەورەت لە زمانی عەرەبی دا بە مانای شتێک کە پیاو شەرمی لێدەکا و هەروەتر شەرم و دەزگای جنسی پیاو و ژن هاتوە. ئافرەت دەبێتە شتێک کە پیاو دەیشارێتەوە و شەرم لە نیشان دانی دەکا. ئەورەتە یا عەورەتە لە زمانی پەشتووی دا و عەورەت لە زمانی فارسیش دا بە مانای ژن دەکار دەکردرێن.

**ئافرێنەر** (ئان. فا)[لە: ئافراندن] ١ـ ئەوەی کە هەموو شت و چتی ساز کردوە، خودا. ٢ـ داهێنەر، سازکەر، خوڵقێنەر.

**ئافەت** (نا.)[عەر: آفت] ١ـ بەڵا. ⁘ بنازم من بە کوفری زولفی تۆ ئەی ئافەتی ئیسلام / کە ئەستۆبەندی

جیزیەی خستە مل ئیمانی خاس و عام (مەحوی ل ٢١٥). ٢ـ ملۆزمی دەغڵ و دان. ٣ـ نەخۆشی مەڕ و ماڵات. & ئافات.

**ئافەرەم** (نا.) بڕ: ئافەرین

**ئافەریم** (نا.) بڕ: ئافەرین

**ئافەرین** (نا.)[ئەو: ئافریڤەنە ـ پەه: ئافرین. باک: ئەفەرین، ئافەرین ـ ناو: ئافەرەم، ئافەریم، ئافەرین ـ هەو: ئافەریم، ئافەرین] ١ـ وشەی پێهەڵکوتن و هاندان، بارەکەڵڵا. :: ئافەرین کورم بۆ خۆت و بۆ ئازایەتیت! دیمەنی شیرین و کولْمی سوور و بەژنی رێک و پێک / کەس تەماشای تۆی نەکرد وەک من کە نەیکوت ئافەرین (هێدی ل ١٧٤). ٢ـ بۆ تەوس و لاتاو پێدادان لە کار و کردەوەیەکی نەباش کە یەکێک دەیکا. :: ئافەرین کورم! ئەوە بوو قەول و بەڵێنیت، ئافەرین بۆ ئەو دەرس خوێندنەت!

**ئاڤ** (نا.)[باک] بڕ: ئاو1

**ئاڤا** (ئان.)[باک] بڕ: ئاوا1

**ئاڤادان** (ئان.)[باک] بڕ: ئاوەدان

**ئاڤادانی** (نا. ل)[ئاڤادان + ئی][باک] بڕ: ئاوەدانی

**ئاڤاکی** (نا. ل)[ئاڤ + ئاک + ئی][باک] بڕ: ئاوەکی1

**ئاڤاهی** (نا. ل)[ئاڤا + هی][باک] بڕ: ئاوایی

**ئاڤدەستخانە** (نا. ل)[ئاڤدەست + خانە][باک] بڕ: ئاودەست

**ئاڤر** (نا.)[باک] بڕ: ئاخوڕ

**ئاڤرنگ** (نا. ل)[ئا13 + ڤر (بڕ) + نگ][زا] بڕ: برینگ

**ئاڤرینگ** (نا. ل)[ئا13 + ڤر (بڕ) + ئینگ][زا] بڕ: برینگ

**ئاڤرێژ** (نا. ل)[ئاڤ + رێژ][باک] بڕ: ئاودەست

**ئاڤرێژخانە** (نا. ل)[ئاڤرێژ + خانە][باک] بڕ: ئاودەست

**ئاڤڕ** (نا.)[باک] بڕ: ئاوڕ

**ئاڤزێ** (نا. ل)[ئاڤ + زێ2][باک] ١ـ کانی و سەرچاوەیەک کە بەهاران هەندێک ئاویان هەیە و بە هاوین ویشک دەبن، کوێرەکانی، تەڕەزن، زەناو، ئاوەزێ. ٢ـ ئاودز، ئاوەدز.

**ئاڤزێم** (نا. ل)[ئاڤ + زێ2 + م] بڕ:

**ئاڤـــژەن** (نا. ل)[ئاڤ + ژەن][باک] [پەھ: ئاپزەن] مەلەوان

**تێبینی:** ئاپزەن āpzan لە پەهلەویی دا بە مانای شۆرکە هاتوە.

**ئاڤـــژەنی** (حم.)[ئاڤـــژەن + ئی] مەلەوانی

**ئاڤس** (ئان.)[باک] بڕ: ئاوس

**ئاڤشلە** (نا. ل)[ئاڤ + شلە (شـیلە)] [باک] بڕ: ئاوقۆرە

**ئاڤشـیلە** (نا. ل)[ئاڤ + شـیلە][باک] بڕ: ئاوقۆرە

**ئاڤک** (نا. ل)[ئاڤ + ک][باک] تۆوی پیاو بڕ: ئاو 1/٧.

**ئاڤێتن** (چا. م)[باک] بڕ: ئاویشـتن

**ئاقـــار** (نا.)[؟] ١ـ دەورووبەر، ئاست، نزیکایی، مـەڵبـەند، ناوچە، هەقـار :: بە ئاهـم گـەر رەقیبـانت بسووتێن ئـەی گوڵی رەعنا / مـەڕەنجـە تۆ خـودا، شـوعلە لە ئاقاری چقڵ چ بکا؟ (مەحوی ل ١٤). ٢ـ دەشت، سـارا. :: کچ مـام مـامـزە لە ناو ئاقاری / روومەت شەکرەسێو دەیگرم بە زاری (سـێـســەد هـۆنراوە ل ١١٠). ٣ـ [باک] بەرینایی

**ئاقشـقە** (نا.)[؟] پەنجـەرە، دوودەری، دەلاقە. :: تەمـەشـای کرد گـومبـەزێک لە دوور دیارە/ ئـەو گـومـبـەزە تەنشـت بە ئاقـشـقـەیە، چوار تـەرەفی بە حـەسـارە. (مان ل ٢١٧)

**ئاقڵ** (ئان.)[عەر: عاقل] ١ـ ژیر، زانا، زیرەک، بە مـێـشک. :: گـرێیـەکی شـێت لێی دەدا سـەد ئاقڵ پێی ناکـرێتـەوە. ٢ـ رێک و پێک و دروست جـــووڵانـەوە ئـەو جۆرەی کە زانایانەیە. :: ئاقڵ دانیشە و ئاقڵ نـان بخـۆ! ٣ـ (نا.) هـۆش، مـێـشک، فام، ئەقڵ. ~ **بڕین:** تێگەیشـتن و حاڵی بوون لە مـەسـەلەیەک یا شتێک ئەوەندەی کە مێـشک هەڵیدەگرێ، ئاقڵ پێشکان، ئەقڵ بڕین، ئەقڵ پێـشکان، ئەقڵ گـرتن. :: ئەوەی ژن دەیکا پیـاو ئاقـڵی نایبـڕێ. ~ **بوون:** ١ـ هـاتنەوە ســـەرخـــۆ و پێگەیشـتن، هـاتنەوە سـەر رێی راست. :: حـــەمـــە لەوەتی ژنـی هێنـاوە ئاقڵ بوە و شەوانە زوو دێتەوە. ئینسان هەتا سەری وە بەردی ئـەلحـەدی نەکـەوێ ئاقڵ نـابێ. ٢ـ ئارام و هـێـدی ئەو جـۆرەی شـیـاوی کـەسی ئاقـڵـە. :: منداڵەکان ئەورۆ زۆر ئاقڵ بوون. ~ **پێـشکان:** تێگەیشـتن، حـاڵی بـوون، ئاقڵ بڕین، ئەقڵ پێـشکان. :: منداڵی ئەم زەمـانە ئاقـڵیـان بە شـتی

سـەیر دەشکێ. هەرچی بیـر لەو مەسەلەیە دەکەمەوە ئاقڵم پێی ناشکێ. ~ **تێکچوون:** خەرفان، شێت بوون، مێشک شڵەقان، ئاقڵ گۆڕان، ئەقڵ تێکچوون، ئەقڵ گۆڕان، لێویان. ∷ بارام لە تاوی ئەو کچە تەواو ئاقڵی تێکچوە. ~ **دان:** تێگەیاندن و وریا کردنەوەی کەسێک لە لایەن کەسێکی زاناتر و تێگەیشتووتر، ئەقڵ دان. ∷ خودا ئاقڵت داتێ بۆ خۆت و بۆ کارت. ~ **دە چاو دا بوون:** (کنـ.) تێنەگەیشتن و بیر نەکردنەوە، رواڵەت دیتن و بیر لە نێوەرۆک نەکردنەوە، ئەقڵ دە چاو دابوون. ~ **دە چۆک دا بوون:** (کنـ.) بێ ئاقڵ بوون، ئاقڵ نەبوون، کەمایەسی دە بیر و مێشک دابوون. ~ **دە کەللە دا نەمان:** (کنـ.) ناحاڵی بوون، تێنەگەیشتن، بێ ئەقڵ بوون. ∷ هیچکەس لەبەر داد و واوەیلا ئاقڵی دە کەللەی دا نەماوە (لاس و خەزاڵ ل ٦٣). ~ **سووک بوون:** لە کەمایەسی دانی ئەقڵ و هۆش، نەفام بوون و تێنەگەیشتن، ئەقڵ سووک بوون، ئەقڵ گۆڕان. ∷ ئەو کابرایە هەندێک ئاقڵی سووک بوە. ~ **کردن:** سزا دان و تەمبێ کردن بۆ تێگەیشتن و حاڵی بوون. ∷ وام تێهەڵدا بۆ بابیم ئاقڵ کرد. ئەو کەسەی رەگەزی خراپە بە من و بە تۆ ئاقڵ ناکرێ. ~ **کەسک و سوور بوون:** (کنـ.) ئاقڵ بوون و پێگەیشتنی منداڵ، تەمەن و سەردەمی لێکدانەوە و تێگەیشتنی منداڵ. ~ **گرتن:** بڕ: ئاقڵ بڕین. ~ **گۆڕان:** لە سەر رێبازی دروست نەمان و کاری نادروست و بێ بیر کردن، ئەقڵ گۆڕان. ∷ کاکم ئاقڵی گۆڕاوە بە پاییز دەیەوێ قورەکاریێ بکا. ~ **لێ پەشۆکان:** سەر لێشێوان، ئاقڵ تێکچوون. ∷ دەیگوت: کیژێ سەرم لێشێواوە، عاقڵم لێ پەشۆکاوە/ کەس نەیدیوە بە شەو، رۆژ لە مەغریبێ سەری دەرهێناوە (مێر و وەفا ل ٧٨). **دە ~ دابوون:** بڕ: دە ئەقڵ دابوون. **لە ~ بە دوور بوون:** بڕ: لە ئەقڵ بە دوور بوون. ‖ **ئاقڵی پوخت:** ئەقڵ و مێشکی کامل و پێگەیشتوو. ∷ دەبێ ئێمە بە فێڵ ئاقڵی پوختی پکەین خاوە (لاس و خەزاڵ ل ٦٣). **ئاقڵی خاو:** زەین و ئەقڵێک کە ناکامل بێ و پێنەگەیشتبێ.

**ئاقـڵانە** (ئاک. ل)[ئاقڵ + ئانە] زانایەنە، تێگەیشتوانە، جووڵانەوەی وەک کەسێکی ئاقڵ و زانا. ∷ ژن هێنان لەو تەمەنە دا ئاقڵانە نیە.

**ئاقـڵـدار** (ئان. فـا)[ئاقڵ + دار2] کەسی خاوەن ئەقڵ، کەسێک کە ئەقڵی هەیە، زانا، ئەقڵدار، ئاقڵمەند. :: ئەوە دەیانگوت کـورێک هاتوە/ ئەوە چەند نەجیب و بەلیغ و زرینگ و ئاقڵدارە (بەیتی سەعید و میرسێوەدین ـ سروە ژ ٧٢ ل ٤٢).

**ئاقڵمەند** (ئان. ل)[ئاقڵ + مەند] خاوەن ئەقل، زانا، تێگەیشتوو. :: ئەوە ئاقڵمەندان بە منیان دەگوت: مامی ردێن سپییە / ئەو خاڵەی ئەتۆ چاوت پێکەوتووە.../ هەر شاری وەکوو بەغدا دە قیمەتی خاڵی سینگی خەزاڵێ دا نیە (لاس و خەزاڵ ـ سروە ژ ٨٧ ل ١٢).

**ئاقڵیی** (حم.)[ئاقڵ + ئیی] زیرەکیی، وریایی، تێگەیشتوویی

**ئاقیبەت** (نا.)[عەر: عاقبة] ١ـ ئاخری هەر شتێک، ئاخر، دوایی. :: گەلەک شوکر و سابیرم چونکە ئەمری خودایە / ئاقیبەتمان مردنە دنیا لۆ کەس نەمایە (سێسەد هۆنراوە ل ١٢٦). ٢ـ ئاکام، ئەنجام، نەتیجە. :: ئاقیبەتی شەریکایەتییان بوو بە دوژمنایەتی.

**ئاقیدە** (نا.)[عەر: عقیدة] بڕوا، باوەڕ، ئیمان، ئەقیدە.

**ئاقیق** (نا.)[عەر: عقیق] بەردێکی کوارتزییە بە چەندین ڕەنگ لە سروشت دا هەیە کە باشترین و بە بایختترینی سووری ئاڵووباڵوویی یە و دیکەنە بەرمووری ژنان و نەقیمەی ئەنگوستیلە، یاقیق. || **ئاقیقی ڕەش:** بەردێکی سەخت ورەقی گرکانییە کە ڕەنگێکی کەسکی مەیلەوە ڕەشی هەیە. **ئاقیقی سوور:** جۆرێک ئاقیقە کە ڕەنگی سووری ئاڵووباڵووییە و لە گەوهەرسازی دا کەلکی لێوەردەگرن. **ئاقیقی یەمەنی:** جۆرێک ئاقیقی سوورە کە لە وەڵاتی یەمەن دەست دەکەوێ.

**ئاک**[1] (نا.)[ئەو: ئەکە ـ پەه: ئاک] عەیب، شوورەیی.

**ئاک**[2] (نا.)[زا] بڕ: هێلکە

**ئاک**[3] (پاشـ.) بە ڕەگی چاوگەوە دەلکێ و ناو ساز دەکا. :: پۆشاک، خۆراک.

**ئاکادێمی** (نا.)[فەر: Academie] ناوی باغێک بوو لە ئاتێن کە ئەفلاتوون لەوێ دەرسی فەلسەفەی دەداوە و ئێستاکە بۆ کۆڕ و ئەنجومەن بە کار دەبردرێ کە خەریکی لێکۆڵینەوەی مەسەلەکانی ئەدەبی و زانستی و



مەسەلەی دیکەن. :: ئاکادیمی زانست، ئاکادیمی فەرانسە.

**ئاکادیمیسێن** (نا.) ئەندامی ئاکادێمی

**ئاکار** (نا.)[ئا13 + کار] کار و کردەوە، ئەخلاق، رەوشت. :: لە ئاکاری بووکەکەم رازی نیم، دەبێ ئاکاری باشتر بکا. ~ **هەڵگرتن:** کردەوە، خوو و خدە و ئاکاری کەسێک لەبەر چاو گرتن. :: ئەو کورەم ئاکاری خراپ نەبێ هەڵیناگرێ!

**ئاکارباش** (ئان. ل)[ئاکار + باش1] کەسێک کە ئاکار و کار و کردەوەی باش بێ، خوو و رەوشت باش. :: ئەو دەیویست بووکێکی ئاکارباش و رەفتارچاک و وریا و بە مشوور و ماڵداریکەری هەبێ. (تاریک و روون ل ٢٥).

**ئاکارباشیی** (حم.)[ئاکارباش + ئیی] کردەوەی باش و چاک، پلەبەرزی لە کاری چاک دا.

**ئاکاردیۆن** (نا.)[فەر: accordden] ئامێرێکی مۆسیقایە، لە شان دەکردرێ و ریزێک دوگمەی هەیە کە بە هێنان و بردنی بای تێدەکردێ و بە پەنجە بە سەر داهێنان دەنگیان لێوە دێ. ئەکاردیۆن.

**ئاکاژوو** (گیا.)[فەر: acajou] دارێکی خۆرسکی لێرەوارەکانی ئامریکایە، رەنگی چێوەکەی سوورە و بۆ ساز کردنی شتی بە بایەخ و گرانبایی کەلکی لێوەردەگرن.

**ئاکاسیە** (گیا.)[فەر: acacia] بڕ: ئەقاقیا

**ئاکام** (نا.)[ئا13 + کام][ناو: ئاکام ـ هەو: ئاکام] دوایی کارێک، ئاقیبەت، نەتیجە. ~ **وەرگرتن:** گەیشتنە ئاکام و نەتیجە. :: هیچ ئاکامێکمان لەو کارە وەرنەگرت. **بە ~ گەیاندن:** کار و مەسەلە و هیوایەک هەتا دوایی و سەر بردن، پێگەیاندنی کارێک. **بە ~ گەیشتن:** گەیشتنە نەتیجە و دوایی کارێک. :: لە شەریکایەتی دا بە هیچ ئاکامێک ناگەین. ~ **هەبوون:** دوایی و ئاکام و نەتیجە هەبوونی کار و مەسەلەیەک.

**ئاکتێر** (نا.)[فەر: acteur لە لات: actor] کەسێک کە لە سەر شانۆ یا سینەما و تەلەویزیون دەور دەگێرێ، دەورگێڕ، ئەکتەر، شانۆگەر، هونەرپیشە.

**ئاکرۆبات** (نا.)[یون: akrobat

وەرزشکار یا کەسێکی کە لە سیرک کار دەکا و کاری سەیر و قورسی وەک بەسەر تەناف دا ڕۆیشتن و خۆ هەڵسووراندن لە سەر بارفیکس و پاراڵێل دەکا.

**ئاکواریۆم** (نا.)[لات: aquarium لە: aqua (ئاو)] دەفرێکی پڕ لە ئاوی شووشەیی گەورە یا چووکە، گیاندارانیاوی وەک ماسی وردی تێدا ڕادەگرن و بۆ خۆ خافڵاندن و جوانی لە سووچێکی ماڵ یا شوێنێک دادەندرێ.

**ئاگا** (نا.)[پەه: ئاکاس. باک: ئاگاه ـ ناو: ئاگا ـ باش: ئاگا ـ هەو: ئاگا، هاگا] ١ـ خەبەر، هەواڵ. ፡፡ دەمێکە ئاگام لە ئاسۆ نیە نازانم لە کوێیە. ٢ـ وەخەبەر، بە ئاگا، بێدار. ٣ـ زانا، تێگەیشتوو، ئاگادار. ～ **بوونەوە:** ١ـ وەخەبەر هاتن، لە خەو هەستان، بە ئاگا هاتن. ፡፡ بەیانی کە ئاگا بوومەوە دیتم کەس لە ماڵ دا نەماوە. ٢ـ هاتنەوە سەرخۆ دوای بێهۆشی یا مەستی و گێژی. ～ **کردن:** هەست کردن، هەست پێکردن، پێزانین. ፡፡ عەبە هێند خەوی گرانە دەرزیشی تێڕاکەی ئاگا ناکا. ～ **کردنەوە:** وە خەبەر هێنان، کەسێک لە خەو هەستاندن. ～ **لە خۆ بڕان:** ئاگا لە خۆ نەمان، لە سەر هۆش نەمان، گێژ و وێژ بوون، بێهۆش بوون. ～ **لە خۆ بوون:** چاوەدێری خۆ کردن بۆ ئەوەی تووشی نەخۆشی و بەڵا و گیر وگرفتێک نەهاتن. ٢ـ لە سەر هۆش بوون، وریا بوون. ～ **لە دەمی (دم) خۆ بوون:** (کنـ.) وریا بوون بۆ قسەی پیس نەکردن و جنێو نەدان، دەمشڕی نەکردن، ئاگا لە زاری خۆ بوون. ～ **لە زاری خۆ بوون:** (کنـ.) بڕ: ئاگا لە دەمی خۆ بوون. ～ **لە کونگی (قوونی) خۆ نەبوون:** (کنـ.) وریا نەبوون و گێژ بوونێکی لە ڕادەبەدەر. ～ **لە خۆ نەمان:** بڕ: ئاگا لە خۆ بڕان. ～ **لە مەحموودی بێزەواد نەبوون:** (کنـ.) تێنەگەیشتن، نەفامین، ئاگادار نەبوون. ～ **لێبوون:** ١ـ چاوەدێری لە کەسێک یا شتێک کردن. ፡፡ خەمی داشقەکەت نەبێ ئارخەیان بڕۆ من ئاگام لێی دەبێ. ئاگات لە منداڵەکان بێ تا دێمەوە. ٢ـ زانین، پەی بردن، خەبەردار بوون. ፡፡ ئاگام لێیە بە دزی ژنت مارە کردوە. ٣ـ دیتن. ፡፡ ئاگام لێبوو کێ ئەو شووشەی شکاند. ～ **لێبڕان:** هۆش لە سەر نەمان، لە بیر کردن و بێخەبەر بوون لە کار و مەسەلە و کەسێک. ፡፡ دایکم بە هەویای پوورم



ئاگای لە مە بڕاوە. ~ **لێهەبوون:** خەبەردار بوون، ئاگا لێبوون، زانین.

**ئاگادار** (ئان. فا)[ئاگا + دار2] ١ـ خەبەردار ٢ـ کەسێک ئاگای لە دونیا هەیە، تێگەیشتوو، زانا. ٣ـ چاوەدێر، پارێزەر. ~ **بوون:** ١ـ خەبەردار بوون، پەی بردن و زانینی مەسەلەیەک. ٢ـ پارێزان، ئاگا لێبوون، راگرتن. :: خودا ئاگادارت بێ. ~ **بوونەوە:** وریا بوونەوە دوای تێ گەیشتنی مەسەلەیەک. :: کاتێک کابرای بەنگییم دیت ئاگادار بوومەوە کە ئالوودە بوون چ لە پیاو دەکا. ~ **کردن:** راگەیاندنی هەواڵ و خەبەرێک لە مەڕ مەسەلەیەک بە کەسی دیکە. ~ **کردنەوە:** وریا کردنەوی کەسێک لە بابەت مەسەلەیەک کە نایزانی. :: ئاسۆم بە قسان ئاگادار کردەوە کە ئاکامی دزین بە کوێ دەگا.

**ئاگاداریی** (حم.)[ئاگادار + ئیی] ١ـ راگەیاندنی مەسەلەیەک بە خەڵک بە نووسراوە یا هەواڵ، (اطلاعیە). ٢ـ کۆمەڵێک باس و خەبەر سەبارەت بە کەسێک یا مەسەلەیەک، زانیاریی. (اطلاعات). ٣ـ خەبەرداریی، زانین. :: بە ئاگاداریی چوار کەسان ژنیان لێ مارە کرد. ~ **پێدان:** زانیاریی سەبارەت بە کەسێک یا مەسەلە و شتێک دان بە کەسێک. ~ **کردن:** چاوەدێری کردن، ئاگا لێبون. ~ **لێکردن:** چاوەدێریی کەسێک یا شتێک کردن، راگرتن. ئاگا لێبوون. :: باش ئاگاداریی لەم کتێبانە بکە با نەدڕێن. ~ **وەرگرتن:** زانیاریی وەرگرتن سەبارەت بە کەس و مەسەلە و کارێک. :: ئاگادارییەکی تەواوم سەبارەت بە چلۆنایەتی کاری ئەم دەزگایە لە کارخانەکەی وەرگرتوە. ~ **هەبوون:** ١ـ خەبەر دار بوون، زانین. ٢ـ تێگەیشتن، زانیاریی هەبوون.

**ئاگاه** (نا.)[باک] بڕ: ئاگا

**ئاگاهی** (حم.)[ئاگا + هی][باک ـ هەو] بڕ: ئاگایی

**ئاگایی** (حم.)[ئاگا + یی][پەه: ئاکاسیە] ١ـ ئاگا، خەبەر. ٢ـ ئاگاداریی، لێزانین. ٣ـ بێداریی، بەخەبەریی. & ئاگاهی، هاگایی.

**ئاگر** (نا.)[هیک: ئەگنی ـ ئەو: ئاتەر، ئاتر، ئاثر، ئاتێرێ ـ هەخ: ئاتەر ـ پاز: ئاذور ـ سان: ئەگنی ـ پەه: ئاتەر، ئاتور ـ روس: agon. باک: ئار، ئاگر، ئێگر ـ ناو: ئاور، ئاگر ـ باش: ئاگر ـ هەو: ئەیر، ئێر، ئاهیر، ئاتر، ئاتەر، ئاویر، ئاور،

ئـایـر ـ زا: ئـادر، ئـادل] ١ـ رووناكـی و گڕێک کە لە سووتان بەدی دێ و یەکێک لە چوار مـادەی ئاو، ئاگر، با و خـاکـە. بەشەر لە کۆنەوە ئاگری ناسیوە و بۆ خۆ پاراستن لە سـەرمـا وچێـشت لێنان و رووناکی کەلکی لێوەرگرتوە و هەر لەبەر ئەوە بە پیرۆزیان داناوە و حەولیان داوە کە قەت ئاورگیان نەکووژێتەوە و وجاخ کـوێر نـەبن... ٢ـ (مـجـ) گـەرمـای زۆر، تینی یاو و تێ. :: نیوە شەوێ هەستام دیتم منداڵ وەک ئاگر دایسێ. بە قرچەی نیوەڕۆیە ئاگر لە ئاسمان دەبارێ. ٣ـ (مـجـ.) سـوور هەڵگەڕان و ڕەگی مل دەرپەڕین لە بەر رق و تووڕەیی. ٤ـ (مـجـ.) تەقە و تەقاندن بە باڕووت. ٥ـ (کنـ.) مـرۆڤی بە تین و بەگوڕ و بە هەست. ٦ـ (کنـ.) منداڵی بەدفەڕ و نەحەجماو. ~ **بردن:** ئاور گرتنی سـانای شتێک. :: پووش و پەلاشی ویشک زوو ئاگر دەبەن. ~ **بووژاندنەوە:** بڕ: ئاگر گەشاندنەوە. ~ **بەربوون:** ئاگر گرتن بە هۆیەکی نادیارەوە. :: ئاگر دە مەزرایە بەربوو و چی نەهێشت. ~ **بەربوونەوە:** سوتمان، ئاگر دە جێیەک کەوتن، ئاگر کەوتنەوە. ~ **بەردانەوە:** ١ـ ئاور تێبەردان، سووتاندن. ٢ـ (کنـ.) بەدفەڕ، بزۆز، کەسی شلووق و نەحەجماو. :: ئەو منداڵە حەجمینی نیە ئاگری لە وڵات بەرداوە. ~ **پێبوون:** (کنـ.) زۆر بە پەلە رۆیشتن. :: چێ ئەوە بۆ بە پەلە دەڕۆی دەڵێی ئاگرت پێیە! ~ **پێکردن:** هەڵایساندن، ئاگر هەڵکردن. ~ **پێوەنان:** ئاگر تێبەردان، ئاگر هەڵکردن. ~ **تین دان:** ١ـ خۆش کردنی ئاگر بە تێوەردان یا بە سووتەمەنی لر سەر دانان. ٢ـ (کنـ.) خۆش کردنی ناکۆکی نێوان دوو لایەن. & ئاگر خۆش کردن. ~ **تێبەربوون:** ١ـ ئاگر گرتن بە هۆیەکی نادیار، ئاگر بەربوون، ئاگر گرتن. :: ماڵە کاک کەریمی دوێ شەو ئاگری تێبەربوو. ٢ـ (کنـ.) دڵ پێسووتان، زگ پێسووتان، بزەیی بە کەسێک داهاتن. :: بۆ دەستی شکاوی ئەو منداڵە وەختە ئاگرم تێبەربێ. هەتا منداڵە سەغیرەکانی کاکم دەبینم ئاگرم بۆیان تێبەردەبێ. ٣ـ جنێوێکی سەر زاری ژنانە بە منداڵان. :: رەببی ئاورت تێبەربێ رۆڵە! ~ **تێبەردان:** ١ـ ئاگر دان، سووتاندن. :: هەموو ماڵەکەی ئاگر تێبەردا. ٢ـ (کنـ.) کەسێک بە قسە یا کردەوەیەک داخدار کردن، چزاندن. ~



**تێچوون:** ١ـ ئاگر گرتن، ئاگر تێکەوتن. ٢ـ (کنـ.) بەغیلی و ئێرە بردن بە کەسێک. ∷ چاوی بەرایی هیچ نادا بە خۆشی خەڵک ئاگری تێدەچێ. ~ **تێکەوتن:** ئاگر تێبەربوون، سووتان، ئاگر دەگیان بەربوون. ∷ رەببی ئاگرت تێکەوێ رۆڵە ئەوە بۆ هەدادانت نییە. ~ **خۆش کردن:** ١ـ ئاور تێن دان بە تێوەردان یا دانانی سووتەمەنی لە سەری بۆ ئەوەی ئاگر دانەمرکێ، ئاگر تین دان. ٢ـ (کنـ.) هەڵایساندن و خۆش کردنی ناکۆکی و دوو بەرەکایەتی پتر دە نێوان دوو لایەک کە بەینیان خۆش نیە، فیتنە گێڕاندن. ~ **دان:** ١ـ ئاگر تێبەردان، سووتاندن. ٢ـ تەقە کردن، گولله و تۆپ هاویشتن، تەقاندنەوەی هەر شتێک بە باڕووت وەها کە ئاگری هەبێ. ٣ـ بە قسە و فیشاڵ یەکێک لە مەیدان دەر کردن. ~ **داگیرساندن:** ئاگر هەڵکردن، ئاگر هەڵایساندن. ~ **دامەزراندن:** دانانی کەرەسەی ئاگر و ئاگر ساز کردن. ~ **کردنەوە:** ١ـ ئاگر هەڵکردن، ئاگر هەڵایساندن، ئاگر نانەوە. ٢ـ (کنـ.) ساز کردنی شەڕ و فیتنە نانەوە، ئاگر نانەوە. & ئاورۆچکە کردنەوە، ئاگرۆچکە کردنەوە. ~ **کووژاندنەوە:** دامرکاندنی ئاگر و خامۆش کردنی. ~ **کەوتنەوە:** بڕ: ئاگر بەر بوونەوە. ~ **گرتن:** ١ـ سووتان، ئاور تێبەربوون. ٢ـ (کنـ.) ئێرەیی پێبردن، تووڕە بوون و هەڵچوون، توند و تیژ بوون و حەجمین لێهەڵگیران. ∷ لەوەتی کاکم بۆتە دوکتور فلانی لە داخان ئاگری گرتوە. ٣ـ (کنـ.) تامەزرۆییەکی یەکجار زۆر بۆ کەسێک یا بۆ شتێک بە تایبەت لە باری سێکسەوە. ~ **گەشاندنەوە:** خۆش کردنی ئاگر و پۆلوو بە باوەشێن یا ئامرازێک کە با ساز دەکا، ئاگر گەش کردنەوە. ~ **گەش کردنەوە:** ئاگر گەشاندنەوە، ئاگر خۆش کردن. ~ **لە دەم دا بوون:** (کنـ.) زۆر توند قسە کردن، توند توند قسە کردن. ~ **لە گۆڕی کەسێک هەستان:** (کنـ.) هۆی ئاژاوە و شەڕ و کێشە و فیتنە بوون. ∷ ئەو شەڕە هەمووی خەتای تۆیە ئاگرەکەی لە گۆڕی تۆ هەڵدەستێ. ~ **لێبارین:** ١ـ تووشی بەڵا بوون، تووشی بەدبەختی و چارەرەشی بوون. ٢ـ زۆر تووڕە بوون. ∷ جارێ خۆ دە بابم مەگەیەنە هەتا خاو دەبێتەوە ئێستا ئاگری لێدەبارێ. ~ **نانەوە:** بڕ: ئاگر کردنەوە. ~ **هەڵایساندن:** ئاگر کردنەوە، ئاگر

هەڵکردن. ~ **هەڵکردن:** ئاگر کردنەوە، ئاگر هەڵایساندن. **بۆ ~ هاتن:** (کن.) زۆر بە پەلە بوون و نەگیرسانەوە لە شوێنێک. :: دەتکووت بۆ ئاگری هاتبوو هەر نەهاتە ژوورێ چایەکی بخواتەوە. **لە سەر ~ دانیشتن:** (کن.) بێ ئۆقرە بوون و بە پەلە بوون بۆ ڕۆیشتن، حەجمین نەگرتن لە شوێنێک و بە تەمای هەستان و ڕۆیشتن بوون، دانەسەکنین. || **ئاگری بن کا:** (کن.) مرۆڤی لەبنەوەبڕ و ئاژاوەچی کە بنەمای شەڕ و کێشە دەنێتەوە، ئاوری بن کا، ئاگری ژێر کا. **ئاگری بێ ئامان:** ١- ئاگری گەورە و گران کە کوژاندنەوەی زۆر سەخت بێ و هەموو شت بسووتێنێ. :: بەنگین دەڵێ: میر، ئاورێک دە ماڵە قەرەتاژدینی بەربوو، چ ئاورێکی بێ ئامانە! / ئەگەر هەڵنەستی، ئێستا شاری جزیرێ دەسووتێ، دەبێ وێرانە (مان ل ٧٢). ٢- (کن.) بەڵا و بەدبەختی و چەرمەسەرییەک کە چارەسەر کردنی زۆر سەخت بێ. * **ئاگری بێ ئامان تێبەربوون:** (کن.) ١- تووشی بەڵا و بەدبەختییەکی گەورە هاتن. ٢- جنێوێکی سەر زاری ژنانە بە منداڵان. **ئاگری بێ دووکەڵ:** ئاگری گەشاوە، ئاوری سوور.

**ئاگری جەرگی:** (کن.) منداڵ، ئاوری جەرگی. * **ئاگری جەرگی هەڵگرتن:** (کن.) تاسەی دیتنی منداڵ کردن. **ئاگری ژێر کا:** بڕ: ئاگری بن کا. **ئاگری سوور:** پۆلووی ڕەژی یا دار کە چاک گەشابێتەوە و دووکەڵ نەکا، ئاوری سوور. ***خۆ دە ئاگری سوور هاویشتن:** (کن.) بە هێند نەگرتنی مەترسی، نەپرینگانەوە لە هیچ شتێک. :: بۆ وەدەست خستنی پووڵ و پارە خۆی دە ئاگری سووریش داوێ. **ئاگری غەزەب (ێ):** ١- بەڵایەک کە بە غەزەب لە لای خودا ڕا بێتە خوار. ٢- (کن.) منداڵی بێحەیا و بەدفەڕ. ٣- (کن.) پیاوی هەڵسووڕ و ئازا کە بۆ گەیشتن بە مەبەستێک هەدادانی نەبێ. & ئاوری قودرەت، ئاگری قودرەت، ئاوری غەزەب. * **ئاگری غەزەب(ێ) تێبەربوون:** (کن.) ١- تووشی بەڵا و غەزەبی خودا هاتن. ٢- جنێوێکی سەر زاری ژنانە بە منداڵان. & ئاگری قودرەتێ تێبەربوون. **ئاگری قودرەت(ێ):** بڕ: ئاگری غەزەب. * **ئاگری قودرەت(ێ) تێبەربوون:** (کن.) بڕ: ئاگری غەزەب تێبەربوون. **ئاگری نەورۆز:** ئاگرێک کە بە بۆنەی سەری ساڵ و دەست پێکردنی نەورۆز دەیکەنەوە.

**تێبینی:** ئەگنی لە ویدا دا خودایەکی مەزن و ئاگاداری ئاگر بوە و دوو وشەی ئاگر و ئێگر چوونەوە سەر خزمایەتی زمانەکانی هیندی و ئیسلاڤی و بە لە بەر چاو گرتنی ئەوە کە زمان و دینی هیندی کۆن لە زمان و دینی ئەوێستا کۆنترە لەوانەیە ئاگر ناوی خودای ئاگری بەر لە دینی زەردەشت و یەکێک لە خوداکانی ئەدەمی کوردەکان بووبێ و دوای هاتنی دینی زەردەشت خێوی ئاتەر جێگای گرتبێتەوە. (بڕ: ئاتەر)

**ئاگراو** (نا. ل)[ئاگر + ئاو1] ١- ئاوەکی داغ و گەرم وەک ئاگر. ٢- بادە، شەراب. ⁂ گوڵاو و ئاگراوە بادە ئەمشەو/ تەرەبناکە مەی و ساقی غەزەبناک (مەحوی ل ١٨٦).

**ئاگراویی** (ئان. ل)[ئاگر + ئاویی2] گەرم و گوڕ وەک ئاگر، لە چەشنی ئاگر، ئاوێتەی ئاگر. ⁂ دەڕۆم بەو ڕێگە دا شەرتە هەتا ماوم بە یادی یار/ بە هیوای دڵ، بە مەیلی دڵ، دڵێکی گەرم و ئاگراوی (ئاوات ل ١٧).

**ئاگرباران** (نا. ل)[ئاگر + باران](کنـ.) ١- شەڕی قورس و دابارینی گوللەی زۆر. ٢- گەرمایەکی لە رادە بەدەر

**ئاگربازیی** (حم.)[ئاگر + بازیی] لە حەوا کردنی فیشەک و تەقەمەنی رەنگاوڕەنگ لە جەژن و شادی و خۆشی دا، گڕگڕان.

**ئاگربڕ** (نا. ل)[ئاگر + بڕ] کاری کووژاندنەوە و بەر گرتنی ئاگر کە بەر بۆتە شوێنێک (ماڵ، رەز، باغ،...). ~ **کردن:** دامرکاندنی ئاگر، کووژاندنەوەی ئاگر.

**ئاگربەر** (نا. ل)[ئاگر + بەر] بڕ: ئاگربەرە

**ئاگربەرە** (نا. ل)[ئاگر + بەر + ئە] پووش و پەڵاش و هەرچێکی زوو ئاگر بگرێ، ئاگربەر.

**ئاگربەس** (نز.)[ئاگر + بەس] وەستانی شەڕ و تەقە دە نێوان لایەنەکەی شەڕ بە پێی نووسین یا دەربڕینی پەیمانێک بۆ ماوەیەکی کورت یا بۆ ماوەیەکی زۆر. ~ **دان:** وەستاندنی شەڕ لە لایەن دوو دەستەی شەڕەوە، تەقە وەستاندن.

**ئاگرپارە** (ئان. ل)[ئاگر + پارە] ١- پریشکی ئاگر. ٢- (کنـ.) منداڵی دڕ و شەڕانی و زۆر بزۆز. ٣- (کنـ.) زیرەک و وریا و بەدەست و برد.

**ئاگــرپژێن** (نا. ل)[ئاگــر + پژێن] کـێوێک کـە لە زارکی سـەر ترۆپکەکـەی مـــادەی شـل و ســـووتێنـەر و هەڵمـی گــۆگــردی لێــدەرژێ یا بۆ دەورووبـەر دەیپرژێنێ، بورکان، گڕکان.

**ئاگرپەرست** (نا. فا، ئان. فا)[ئاگر + پەرست] ١ـ کەسێک کـە ئاگر بە پیرۆز دادەنێ و دەیپـەرسـتێ. ٢ـ کـەسـێک کـە بڕوای بە دینی زەردەشتە، زەردەشتی. & ئاورپەرست

**ئاگرپەرستیی** (حم.)[ ئاگرپەرست + ئیی] بڕوا و ئایینی کـەسی ئاگرپەرست، ئاورپەرستیی.

**ئاگرخـانە** (نا. ل)[ئاگر + خـانە] ١ـ کوورەی ئاسنگەر ٢ـ تونخـانەی حـەمام ٣ـ جێ ڕەژی سەماور. & ئاورخانە.

**ئاگرخۆرە** (نا. ل)[ئاگر + خۆر2 + ئە] ١ـ (گـیانـ.) مـەلێکی گـەورەی مل درێژە، ســـەری چووک و دندووکی پانە، چاوی دریشت و لینگی درێژە، باڵی چووکـە و ناتوانـێ بفـڕێ بەڵام چاک رادەکـا، باڵای دوو میـتر و نیـو و سـەد کیلۆش قورس دەبێ. گـیا و گـیانداری چووک دەخـوا و زۆرتر لە ئافـریقـا دەژی و ناوەکـەی لەوە کەوتوە کە گۆیا ئاگر دەخوا، وشـترمر.

٢ـ مـەلێکی خـەیاڵیە، زۆر جوان و خۆش ڕەنگە، دندووکی ٣٦٠ کـونی تێدایە، لە سـەر دوندی کێوێکی بەرز هەڵدەنیشێ و با لەو کـونانە دەدا و دەنگی سـەیری لێ دێتە دەر و مـەلی دیکە لێی کۆ دەبنەوە و ئەویش چەند دانەیان ڕاو دەکا و دەیخوا و دەڵێن مرۆڤ مۆسیـقـای لە دەنگی ئەو وەرگــرتوە. گــۆیا هەزار ســاڵ دەژی و کاتێک کـە مـەرگی نزیک دەبێـتەوە دار و ئێــزینـگێکی زۆر کــۆ دەکـــاتەوە، باڵ دەوەشـێنێ و ئاورینگ لە باڵی دەبنەوە و دار ئاگر دەگرن و ئەویش دەسـووتێنێ و لە نێـو خـۆڵەمـێش دا هێلکەیەک پەیدا دەبێ و لـەم هێلکەیە قـەقنەسـێکی دیکە سـەر دەردێنێ و هەر بۆیەش جووتی نیە، قەقنەس.

**ئاگرخۆشکەر** (ئان. فا)[ئاگر + خۆش + کەر] کەسێک کە ئاگری شـەڕ و هەڵڵا خۆش دەکا، کەسێک کـە پەرە بە نێوان ناخــۆشی و شـــەڕ دەدا. :: حـــەســـەن ئاگـرخـۆشکەری ئەو بنـەماڵەیـە، هـەرچی شەڕ و کێشەیە دەبن سەری ئەو دایە!

**ئاگـر خـۆشکەرە** (نا. فـا) [ئاگـر + خـۆش + کـەر + ئە] کـەسێک، یا هۆیەک کە ببێتە هۆی پەرەگرتنی شـەڕ و هەڵڵا.



**ئاگــردان** (نا. ل)[ئاگــر + دان4] ١ـ قــوڵکەیەکــە وەک تەندوورێکی چووک لە نێو ژووری ماڵەکان سازی دەکەن و پتر پۆلوو ئاگری بۆ دێنن و تێیدەکەن بۆ ژوور گــەرم کـــردنەوە و هــەروەهــا بۆ گـــەرم راگـــرتنی چێـــشـــتی ســـاز کـــراو و زستانانەش کورسی لە سەر دادەخەن. کوانوو، کوانگ، ئاورگ، کۆرک، کۆرکە، ئاوریا، ئـارگــا، هـارگــا، ئـادرجــا. ٢ـ جـــێگای پۆلووی گـــەشـــاوە لە بنی ســەمــاوەری رەژی دا. ٣ـ نۆهەمین مـانگ ســاڵ و ســێــهــەم مــانگی وەرزی پـایز، سەرماوەز، سیخوار، سیخوار لە پشت، قەوسی پایزێ.

**ئاگر گەشکەرە** (نا. ل)[ئاگر + کەش + کەر + ئە] بڕ: ئاوربووژە

**ئاگـر گـەشکەرەوە** (نا. ل) [ئاگـر + گەش + کەر + ئەوە] بڕ: ئاوربووژە.

**ئاگرگیـرە** (نا. ل)[ئاگر + گیر + ئە] وردە دار و گوێنی و لقی ناسکی دار کە زوو ئاگـر دەگـرن و لەبنی دار و ئێـزنگی گەورەتری دادەنێن هەتا بە گڕەکەی ئاگر بکەنەوە، دەستـەچیلە، چاوگە، دەسـاگر، بناورە.

**ئاگرمـەلووچ** (گیـانـ.)[ئاگر + مـەل + ئووچ][باش] بڕ: خەزایی

**ئاگرمـەلیچ** (گیـانـ.)[ئاگر + مـەل + ئیچ][باش] بڕ: خەزایی

**ئاگــرۆچکە** (نا. ل)[ئاگـر + ئۆچکە] [پەه: ئاتەرۆک] ئاوری چووک کە منداڵان بۆ کایە دەیکەنەوە، ئاورۆچکە، ئاگرۆکە. **~ کــردنەوە:** ١ـ ئـاگـــری چـووکـــە هەڵکردن. ٢ـ (کنـ.) سـاز کردنی شـەڕ و فیتنە نانەوە، ئاژاوە نانەوە. & ئاورۆچکە کردنەوە.

**ئاگرۆک** (نا. ل)[ئاگـر + ئۆک] ١ـ بڕ: ئاگرە/٢ و ٤. ٢ـ [باک](کنـ.) ئاژاوەچی، فیتنەگێڕ، مایەفیتنە.

**ئاگـرۆکـە** (نا. ل)[ئاگـر + ئۆک + ئە] بڕ: ئاگرۆچکە

**ئاگرودوو** (نا. ل)[ئاگر + و + دوو] ١ـ ئاوردوو ٢ـ ئاگر و دووکەڵ، کە مەبەستە لە ئاوەدان بوون و بە حـاڵ و مـاڵ و ژیان و تێری لە ماڵ. :: یا خـودا ئـاگـرودووت لە مـــارێ نەکـــرێتـــەوە! (تووک و نزای ژنان). **~ بران:** مـــاڵ وێران بـوون، تووشی بەڵا بوون وەها کە ئاگر لە ماڵ نەکرێتەوە و رووناکی و رزقی ببڕدرێ.

**تێبینی:** ئەو مەبەستە دەچێتەوە سەر ئەو سـەردەمـەی کە شـەمـچـە و شـقـارتە

نەبوە و هەر ماڵێک هەمیشە ئاگری ئایساوە و ئاگر نیشانەی گەرمی و رووناکی و دووکەڵ نیشانەی نان کردن و تەسەل بوونی ئەو ماڵە بوە و وەها ماڵێک ئاوەدان و وجاغی رۆشن بوە.

**ئاگـــــرە** (نا. ل)[ئاگـــــر+ ئە] ١ـ نەخۆشییەکە کە لە بەر نزیکی دەگەڵ کەسی سیفلیسی پەیدا دەبێ و بە میراتیش بە منداڵ دەگا. ئاگرە لە سەر سیرەتی پیاو دەبێ و تەنیا بە هەندێک دەرمانی وەک پێنی سیلین چاک دەبێتەوە و ئەگەر زوو چارە نەکردرێ کوێری و فەلەجی بەدواوەیە، سیفلیس، هاوڵە فەرەنگی. ٢ـ نەخۆشییەکی پێستە کە پتر منداڵ تووشی دەبن و لە پێشدا چەنە و لارووومەتیان زیپکەی وردی لێ دێتە دەر کە زنچکاوی زەردیان لێدێ و لە دوایی بڵاو دەبێتەوە و شوێنی دیکەی لەش دادەگرێ، ئاگرەکە، ئاگرۆک، ئاورە، ئارە. ٣ـ جۆرە نەخۆشییەکە ئەدات لە کشت و کاڵ، گەڵای زەرد و وشک ئەکات، ئەیفەوتێنێ (کشت و کاڵ ب ١ ل ١٥). ٤ـ شەرا گرەیە کە بدات لە مەرەزە و بێفەوتێنێ، ئاگرۆک (کشت و کاڵ ب ١ ل ١٥).

**ئاگرەکە** (نا. ل)[ئاگر + ئە + کە] بڕ:

**ئاگـرەگرە** (نا. ل)[ئاگـر + ئە + گڕ + ئە] ئاورێک کە لە پووش و پەڵاشی زۆر یا گوێنی بەرز دەبێتەوە و زوو دادەمرکێ و پۆلووی لە پاش بە جێ ناهێنێ، ئاورەگرە.

**ئاگـــــری** (نا. ل)[ئاگـــر + ئی] ١ـ ئاگرپژێن، گڕکان. ٢ـ ناوی کێوێکە لە کوردستانی بەر دەستی تورکیە.

**ئاگـــرین** (ئان. ل)[ئاگـــر + ئین] لە چەشنی ئاگر، لە رەنگی ئاگر، وەکوو ئاگر، ئارگۆن، ئاورین، ئاهیرین، ئایرین.

**ئاگـە** (ئاک.)[ئا + گـە][هەو] ئەوێ، لەوێ.

**ئال**[1] (نا.)[باک] بڕ: ئالی

**ئال**[2] (نا.)[عەر: ال] ١ـ بنەماڵە، بەرە. دەگەڵ ناوی پێغەمبەر یا کەس و کاری دێ و مەبەست لە بنەماڵەی پێغەمبەرە. :: ئالی مەحەممەد، ئالی عەلی، ئالی رەسووڵ. روو رەشی دەرگای خودام و سەرفکەندەی مستەفا / شەرمەساری رۆژی حەشر و مل کەچی ئالی عەبا (ئاوات ل ٩). ٢ـ بنەماڵەی گەورەی دیکە. :: قوبووری پڕ لە نووری ئالی بابان پڕ لە رەحمەت بێ/ کە بارانی کەفی

ئیحسانیان وەک هەوری نیسان بوو (رەزا)

**ئالا** (نا.)[باک] بڕ: ئالا1

**ئالاف** (نا.)[باک] گڕ، بڵێسەی ئاگر.

**تێبینی:** ئەو وشەیە دەگەڵ هالاوی زاراوەی ناوەندیی یەکە و ماناکانیان هەندێک لێک خزیوە. لە ئەدەبیاتی فارسیش دا ئالاف بە مانای بڵێسە هاتوە.

**ئالاستن** (چا. م)[باک] بڕ: لێستنەوە

**ئالان** (نا.)[؟][باک] گەڕانەوەی دەنگ، زایەڵە.

**ئالاندن** (چا. م)[باک] بڕ: ئالاندن

**ئالباز** (ئان. ل)[ئال (هاو) + باز3 [زا] بڕ: ئامباز2

**ئالبۆز** (ئان. ل)[ئال (هاو) + بۆز (باز3)][زا] بڕ: ئامباز2

**ئالبۆمین** (نا.)[فەر: albumine] مادەیەکەی هەندێک سوێرە کە لە گیا و گیاندار دا هەیە و بەشی هەرە زۆری سپێنەی هێلکە لەم مادەیەیە.

**ئالستن** (چا. م)[باک] بڕ: لێستنەوە.

**ئالفا** (نا.)[یون: alpha] یەکەم پیتی ئەلف و بێی زمانی یوونانی کە لە ریازی و فیزیک دا دە کاری دەکەن.

**ئالک** (نا.) بڕ: ئالیک

**ئالکۆڵ** (نا.)[فەر: alcool لە عەر: الکحول] ئاوەکییەکە تام و بۆنێکی توندی هەیە، زوو ئاگر دەگرێ و لە ٧٨ درجە دا دەکوڵێ و لە ١١٢ دەرەجەی ژێر سیفر دا دەیبەستێ و لە کەربۆن و ئیدرۆژێن و ئۆکسیژێن پێک هاتوە. ئالکۆڵ بە گشتی دوو جۆرە. یەکەم ئالکۆڵ ئیتیلیک یا ئالکۆڵی سپی لە ترێ و کشمیش دەیگرن و بۆ خواردنەوە دەبێ و پیاو سەرخۆش دەکا. دووهەم ئالکۆڵ متیلیک یا ئالکۆڵی دارە و بۆ خواردنەوە نابێ و بۆ سووتان و هەندێک ئیشی سەنعەتی و بزیشکی کەلکی لێوەردەگرن. (مەحەممەد زەکەریای رازی یەکەم کەسێک بوو کە ئالکۆڵی لە شەراب گرت و ناوی نا الکحول.)

**ئالکۆڵی** (ئان. ل)[ئالکۆڵ + ئی] ١ـ کەسێک بە تەواوی ئالوودەی ئارەق و خواردنەوەی ئالکۆڵدار بوە و هەمیشە دەیخواتەوە. :: دوێنێ کابرایەکی ئالکۆڵیم تووش بوو و داوای پارەی لێکردم. ٢ـ هەر شتێکی کە بە ئالکۆڵ

کار دەکا یا ئالکۆلی تێدایە. :: چراتۆری ئالکۆلی، سـوبەی ئالکۆلی و ... ٣ـ خواردنەوەیەک کە ئالکۆلی تێدا بێ وەک ئاوجۆ و شەراب.

**ئالمانج** (نا.)[باک] بڕ: ئامانج

**ئالمۆدە** (ئان.)[فـەر:a.la mode] ١ـ بە پێی مـۆد، باوی ڕۆژ، شـتی تازەباو و داهاتوو. ٢ـ مـۆد و نەریتـێک کـە لە فـەرهنگەوە هاتبێ. :: چەندی لێ جوانە هاتوچۆی قـەلا/ بەرگی ئالمۆدە، دەدانی تەلا (کانی مرادان ل ٥٨). & ئەلمۆدە

**ئالو** (ئان.)[باک] بڕ: ئاڵ3

**ئـالـوج** (نـا. ل)[ئـالـوو + چ][زا] هەڵووچە، هەڵووژە.

**ئالومـینیـۆم** (نا.)[فـەر: -alumin ium] کانزایەکی سپی و سووکە کە لە ٦٦٠ دەرەجە دا دەتوێتەوە، نیشانەی ئەم کـانزایە لە شـیـمی داAL ە، فـافـۆن، بافۆن.

**ئالۆز** (ئان.)[باک] بڕ: ئاڵۆز

**ئالۆش** (نا.)[باک] بڕ: ئاڵۆش

**ئالوو** (نا.)[باک] بڕ: ئاڵوو1

**ئالوودە** (نا. مـفـ.)[فـار: آلودە] ١ـ ئۆگری زۆر و لە ڕادەبەدەر بە شـتێک یا کەسـێک. :: ئالوودەی تریاک، ئالوودەی کتێب. ٢ـ تووش، گرفتار. ٣ـ پاشگرە بە مـانای تێکەڵاو، ئاوێتـە، پیس (بڕ: ئاوی2). :: گـەرد ئالوودەن دەور مـەزار لەیلێ / ئاوپاشی و مـاڵاش لازمـەن خـەیلێ (مـەولەوی ل ٣٦٣). ~ بوون: ١ـ فـێـر بوون و گـیـرۆدە بوونی لە ڕادەبەدەر بە شـتـێک یا کـەسـێک. :: وەها ئالوودەی ماڵ و منداڵی خۆیەتی بە بێ وان سـاتێک هەڵناکا. ٢ـ گـرفـتـار بوون، تووش بوون.

**تێبینی:** ئالوودە لە چاوگی ئالوودەن ـ ی فارسی بە مانای پیس بوون، تێکەڵاو بوون، ئاوێتە بوونە کەوتوە و ڕاستەوخۆ هاتۆتە نێو زمانی کوردیی.

**ئالەت** (نا.)[عـەر: آلت] ١ـ ئامـراز، ئامـێر، کـەرەسـە. ٢ـ (کنـ.) ئامـرازی جنسی ژن یا پیـاو. ‖ **ئالەتی دەست:** کـەس یا وڵاتی ژێر دەست کـە کـەس یا وڵاتێکی دیکە بۆ سەرکوت و نیازی خۆی کـەلکی لێ وەردەگـرێ. :: شـا ئالـەتی دەستی ئامریکا بوو.

**ئالی** (نا.)[پەه: ئالەک ـ باک: ئالی، ئال ـ ناو: لا] بەر، سـوێ، لایەن، لا. :: دەست بۆ ئالییێ مە درێژ دکە. ‖ **ئالی**



**سوور:** هەرمێ یا سێو کە لایەکی سوور بێ، لاسوور.

**ئالیاژ** (نا.)[فەر: alliage] ١ـ تێکەڵاوێکی تواندراوە لە دوو یا چەند کانزا دەگەڵ یەکتر. ٢ـ ئەو کانزایەی کە بەم شێوە ساز دەبێ. ( بۆ وێنە لە تێکەڵاو کردنی مس و قەڵایی زەردە ساز دەبێ.)

**ئالیک** (نا.)[عەر: علیق] ژەمە کا و جۆ کە دەیدەن بە وڵاغی بەرزە، ئالک. **~ دان:** کا و جۆ لە بەر وڵاغان ڕۆ کردن. **~ ی دوو وڵاغ پێ بەش نەکران:** (کنـ.) دەست و پێ سپیلکە و کارنەکەر بوون، توانایی بەڕێوە بردنی کارێکی چووکە نەبوون.

**ئالیگاتوور** (نا.)[ئین: alligator] جۆرێک سووسەماری ئامریکاییە کە درێژایی نزیک پێنج میتر دەبێ.

**ئالین** (چا. ل)[باک] بڕ: ئالان

**ئالێرژی** (نا.)[یون: allos ergon] لیر دەرکردن و حەساس بوون بە هەندێک بۆ و خواردەمەنی یا ئاو و هەوا.

**ئاڵ** [1] (ئان.)[ئەو: ئەورشە ـ سان: ئەروسە ـ پەه: ئارووس ـ روس: ئالیی. ناو: ئاڵ، ئار ـ باش: ئاڵ ـ هەو: ئالا] ڕەنگی سووری کاڵ، پەمەیی. :: قژ کاڵی، لێو ئاڵی، پرشنگی نێگا کاڵ/ ئەی کچە جوانەکەی سەر گۆنا نەختێک ئاڵ (گۆران ل ٤٥).

**تێبینی:** ئەوێستایی و پەهلەویی ئەم وشە بە مانای سپییە، سانسکریتەکەی هاومانای کوردییە، هەروەها هەل لە زاراوەی زازا دا بە مانای ڕەنگی بۆر هاتوە کە دەگەڵ ئاڵ هاوڕیشەیە. ئەوجار هەڵ یا ئاڵ لە وشەکانی ئاڵەتانج و هەڵەتانجیش بە مانای سەوز هەر لەم ڕیشەیەن.

**ئاڵ** [2] (نا.)[بیر: ئال. ناو: ئاڵ، ئاڵە، هاڵە، ئارە] بوونەوەرێکی خەیاڵییە و ژنی زەیستان یا منداڵەکەی دەکووژێ، ئاڵی زەنگی، ئاڵی زەنگان. **~ بردنەوە:** مردنی ژنی زەیستان یا منداڵەکەی. :: ژنی زەیستان نابێ تەنیا بمێنێتەوە دەنا ئاڵ دەیباتەوە. **~ لێدان:** ژنێک کە تووشی نەخۆشی ئاڵ بوە. :: پوور بەسێ ئاڵ لێی دا و شێتی کرد. || **ئاڵی زەنگی:** بڕ: ئاڵ 2. **تێبینی:** زەنگ بە مانای تاریکی خەست هاتوە، یانی ئاڵی شەوەزەنگ کە لە تاریکی دا دەژی و بە تاریکی دێ، هەر ئەوە بوو کە دیوی ژنی زەیستانیان هەمیشە ڕووناک رادەگرت.

**ئاڵی زەنگان:** بڕ: ئاڵی زەنگی. ∷ لە قسان ئاڵی زەنگانی / وەکی دی ریخ لە لینگانی (امثال و حکم ل ٣٧٤)

**تێبینی:** زەمانی زوو ژن لە ماڵ دەزا و قابیلە و ماما بۆ زانی یاریدەیان دەدا و بە دەست و کەرەسەی میکرۆباوی منداڵیان دەزاند و نێوکیان دەبڕی، هەر ئەو میکرۆبە دەبوو بە هۆی شێت بوونی ژن یا کوشتنی ژن یا منداڵ. خەڵک ئەم هۆیەیان دەبردەوە سەر بوونەوەرێک بە ناوی ئاڵ. هەر لەبەر ئەوە ژنی ژەیستانیان لە ژووری بە تەنیا نەدەهێشتەوە هەتا حەوتووی چووبا.

**ئاڵ**[3] (ئان.)[باک: ئالو ـ ناو: ئاڵ، ئار، هار ـ هەو: هاڵ] ١ـ حاڵەتێکە دوای خواردنی شتی ترشی وەک سماق یا هەلووچە و هەناری ترش بە سەر ددانەکان دادێ و مرۆڤ ناتوانێ خواردەمەنی باش بجوا و ئەزیەت دەدرێ. ئەم وشەیە تەنیا دەگەڵ چاوگی بوونەوە دەکار دەکردرێ. ٢ـ ترش. ∷ ئاڵ و بۆڵ. ～ **بوونەوە:** کول بوونی کاتی ددانەکان بە ترشی خواردنی زۆر. ∷ هێندە هەڵووچەی ترشمان خوارد ددانەکانمان هەموو ئاڵ بوونەوە.

**ئاڵ**[4] (پاش.) پاشگری وێچوون و نیسبەت دان کە بە ناوەوە دەلکێ و ناوێکی دیکە ساز دەکا. ∷ چەنگاڵ، چەتاڵ، گەرداڵ.

**ئاڵا**[1] (نا.)[باک: ئالا ـ ناو: ئاڵا، ئارا ـ باش: ئاڵا ـ هەو: ئاڵا] ١ـ پارچەیەکە هەر وڵاتەی دروشم و ڕەنگ و نیشانی خۆی لە سەر دەکێشێتەوە وبە ناوی پێناسی ئەم وڵاتە هەڵیدەدا، بەیداغ، بەیداخ، بەیاخ. ٢ـ هەر ئەو پارچەیەیە کە یانەی گەورە، ناوەند و ڕێکخراوەکان بە دروشمی تایبەتی خۆیان هەڵیدەدەن. ٣ـ کوتە پارچەی زیادی کە منداڵان دەیکەنە جل و بەرگ بۆ بووکۆڵەکانیان واڵا، ئاڵەبووک، ئاڵابووک. ٤ـ (مجـ.) بەرز. ∷ باڵای ئاڵای شەنگ سەد بەڵا پێوەن/ دووکانچەی شادی دەردینان شێوەن (مەولەوی ل ٨٣). ～ **بڵند کردن:** ئاڵا هەڵکردن، بەرز کردنەوەی ئاڵا. ～ **ڕاوەشان:** ئاڵا شەکانەوە. ～ **ڕاوەشاندن:** ئاڵا شەکاندنەوە. ～ **شەکانەوە:** جوڵانەوەی ئاڵا بە با یا بە دەست کەسێکەوە. ～ **شەکاندنەوە:** جوڵاندنەوە و ڕاوەشاندن و بەرز کردنەوەی ئاڵا. ～ **هەڵکردن:** بەرز کردنەوەی ئاڵا، هەڵێنانی ئاڵا، ئاڵا

هەڵدان، بەیداغ هەڵکردن :: لە بازاڕی ئالا هەڵکردن و ئالا ڕاوەشانە / عەتر پرژاندن و عەتر ڕژانە (سەعید و میرسێوەدین ل ٩١). ~ **هەڵدان:** بڕ: ئالا هەڵکردن. **وە بەر ~ی پێغەمبەر کەوتن:** (دوعا) وە بەر ڕەحمەتی خودا کەوتن ، دەگەڵ تاقم و دەستەی پێغەمبەر چوونە بەهەشت.

**ئالا²** (ئان.) بڕ: ئاڵ1. :: ئاد مارۆ بە ویر تەرزەکەی باڵات/ ئەو دیدە مەستت، ئێد خاڵ ئالات (مەولەوی ل ٢٣٥).

**ئالا³** (نا.)[؟][هەو] قەڵەم، خامە.

**ئالابووک** (نا. ل)[ئالا1/٣ + بووک] بڕ: ئاڵەبووک

**ئالابێژ** (نا. چا)[ئالا (ئاڵە) + بێژ2] بڕ: ئاڵەبێژ

**ئالات** (نا.) بڕ: ئاڵەت2 و 1

**ئالاچغ** (نا.)[تور: ئالاچیق] ١ـ هۆدەیەکی کۆچەرەکانە کە دیوارەکانی لە لبادە و لێک دەدرێن و لە کاتی ماڵ گواستنەوە لێک جیا دەبێتەوە. ٢ـ کەپر.

**ئالاچی** (ئان. ل)[ئالا + چی] بڕ: ئالادار. :: ... هەمزە و هەبباس و هەیدەرە / دەگەڵ مەقلووبی پەڕ بە سەرە / ئالاچی سوڵتان سەمەرە. (مان ل ١٩).

**ئالادار** (ئان. فا)[ئالا1 + دار] ١ـ کەسێک کە لە پێشەوەی سپا یا کۆمەڵێک ئەرکی هەڵگرتنی ئالای پێدراوە. ٢ـ (کنـ.) سەرۆک و سەردەستەی تاقمێکی ناڕازی. & ئالاچی، ئالاهەڵگر، بەیاخدار، بەیداخدار، بەیداغدار.

**ئالاداری** (حم.)[ئالادار + ئیی] کاری ئالادار، ئالاهەڵگریی، بەیداغداریی، بەیداخداریی.

**ئالاش** (نا.)[؟] زەل و قامیشێک کە دوای دارەڕا لە سەری ڕۆ دەکرێ و گڵەبانی لە سەر دەکەن، پردوو، سەرمیچ، پەردوو، لیشامە، لیشمە، هەلاش.

**ئالامەت** (نا.) بڕ: هەلامەت

**ئالان** (چا. ل)[باک: ئالین ـ ناو: ئالان، هالان، ئاران] پێچرانی شتێکی درێژ لە شتێکی دیکە، لێهالان. :: بە داو هەر تارە بۆ من بۆتە تارێک / لە پێم ئالاوە زولفی تار و ماری (وەفایی ل ١٨٣). مارێکی قەف ئەستوور لە دار ئالابوو.

**ئالاندن** (چا. م)[ئالان + دن] لێبەستن و پێچانی هەر شتێکی درێژ لە شتێکی

دیکە، لێهالاندن، هالاندن، ئاراندن، ئالاندن. ؛؛ لەبەر سەرئێشە دەسرەیەکی لە سەری ئالاند و درێژ بوو.

**ئالاهەڵگر** (ئان. فا)[ئالا1 + هەڵگر] بڕ: ئالادار

**ئالاهەڵگریی** (حم.)[ئالاهەڵگر + ئیی] بڕ: ئالاداریی

**ئالایی** (ئان. ل)[ئالا2 + ئی] رەنگاورەنگ، چەند رەنگ، ئاڵ و والا، ئاڵ و واڵ.

**ئاڵ برە** (نا. فا.)[ئاڵ2 + بڕ/٧ + ئە] کەسێک کە چارەی ژنی ئاڵ لێدراو دەکا.

**تێبینی:** هەندێک جار ئەو ژنەی کە ئاڵ لێیدەدا بەم جۆرە چارەیان دەکرد. ژنێک کە پێشتر منداڵەکەی ئاڵ بردوویەتەوە یا پیاوێک کە ژن یا منداڵەکەی ئاڵ برووبەتیەوە دەیانهێنا و ئەویش چەند جار پرچی ژنی تووش بووی دەکێشا یا ئەوە کە ژنەکە لەچکە و پیاو جەمەدانی خۆیان دەدایە هەتا چل شەوان لە سەری یا لە قەدی ببەستێ.

**ئاڵبۆم** (نا.)[فەر: album] دەفتەرێک کە وێنە، تەمر و شتی لەو بابەتەی لە سەر پەڕەکانی دەدەن.

**ئاڵتوون** (نا.)[تور: altın] زێڕ، تەڵا.

**ئاڵتوونی** (ئان. ل)[ئاڵتوون + ئی] ١ـ هەر شتێکی کە لە زێڕ ساز کرابێ. ٢ـ رەنگی زەردی وەک رەنگی زێڕ. & زێڕن، زێڕین، تەڵایی.

**ئاڵتی رەم** (نا. ل)[تور] ئەندازەیەکە بۆ کێشان کە دەبێتە پەنجاوپێنج گرەم.

**تێبینی:** ئالتی لە تورکی دا یانی شەش و رەم سواوی درەمە یانی شەش درەم.

**ئاڵچاخ** (ئان.)[تور: alçak (نزم)] کەسی سووک و چرووک کە لە نێو خەڵک دا حورمەتی نەبێ، خوێڕی، ئاڵچاغ.

**ئاڵچاغ** (ئان.) بڕ: ئاڵچاخ

**ئاڵدۆز** (نا.)[تور: yaldız] رووکێشی زێر و زێو لە سەر فلزی کەم بایخ، ئاوەزێر و ئاوەزێو. ؛؛ ئاسنگەرم بۆ بێنن بە مشتەرییە / بۆم دوورووس بکا رکێفی ئاڵدۆز، دانە لغاوی هەوێزە مرواریيە. (مان ل ١٩٧). **~ کردن:** رووکێش کردنی فلز و کانزای کەم بایەخ بە زێڕ یا زێو، ئاوەزێو کردن، ئاوەزێڕ کردن.

**ئاڵدۆزکاریی** (حم.)[ئاڵدووز + کار + ئیی] کار و پیشەی رووکێش کردنی



کانزا.

**ئاڵشت** (نا. چا)[تور: alış] ئاڵوگۆڕ، گۆڕین، گۆڕینەوە. ~ **کردن:** گۆڕینەوە، ئاڵوگۆڕ کردن.

**ئاڵشک** (نا.)[؟][ئەر] شتێ و نمێکە وەک بەفرکە لە کاتی سەرمای ژێر سفر لە سەر زەوی و گیا و چیمەن دەکەوێ، زوقم، سیخوار، خووس، خووسار.

**ئاڵش وێرش** (نا. چا)[تور] بڕ: ئاڵ و وێر

**تێبینی:** ئاڵش لە چاوگی تورکی ئالماق بە مانای وەرگرتن و وێرش لە چاوگی وێرماق بە مانای دان کەوتوە و بە گشتی یان دان و ستان

**ئاڵف** (نا.)[عەر: علف] گیای دروای ئیشک کراو کە زستانان دەیدەن بە ماڵات.

**ئاڵفانە** (نا. ل)[ئاڵف + ئانە] باجێکە لەجیات حەقی لەوەڕ و درووني گیا بۆ داخستنی دەدرێ بە ئاغا و دەرەبەگ.

**ئاڵفتە** (نا. مف.) هۆگر، ئالوودە، خوو پێگرتوو. :: هێند ئاڵفتەی سینەمایە هەموو رۆژێ دوو سێ فیلمان دەچێ.

**تێبینی:** ئەم وشەیەش لە زمانی کوردیی دا مەسدەرەکەی لە بیر چۆتەوە و لەوانەیە، یەکەندەردوو بە بیران دا بێ کە لە (الفة)ی عارەبی وەرگیراوە، بەڵام مەسدەری (ئالۆفتەن) بە مەعنای (ئاشق بوون) کە لە فارسی دا هەیە و زۆر زۆر کەم دە کار دەکرێ، ئەم گومانە ناهێڵێ (قامووس ب ١ ل ٥٨). ئالۆفتە لە فارسی دا بە مانای شێواو و پەریشان هاتوە.

**ئاڵفجاڕ** (نا. ل)[ئاڵف + جاڕ][ئەر] شوێنی لەوەڕ و درووني ئاڵف، لەوەڕگە، گیاجاڕ.

**ئاڵقە** (نا.)[عەر: حلقە] ١ـ شتی خری نێو بۆش کە دوو سەرەکەی گەیشتبێتەوە یەک، ئەڵقە، ئاخڵە. ٢ـ ئەنگوستیلەی دەزگیرانیی کە کور و کچی نیشانەکراو دە قامکی یەکدی دەکەن. ٣ـ جورە گوارەیەکە لە فلزی کەم بایخ کە دەروێش و مریدی شیخان لە گوێی دەکەن (پتر لە لا گوێیەک دەکردرێ). ٤ـ جۆرە گوارەیەکی ئاسایی و کەم بایخ بوو کە زوو بۆ ناسینەوەی کویلە و بەندە و غوڵام دە گوێیان دەکرد. ٥ـ کۆ بوونەوەی خەڵک لە دەوری کەسێک یا شتێک بە شکڵی جەغز. ٦ـ بڕ: ئاڵقەی زێڕ. || **ئاڵقەی زێڕ:** خشڵێکە لە زێڕ کە کە لە سەر کۆچکەی دەدروون و دەکەوێتە سەر لاجانگ و

زۆرتر لە نێـو ژنانی مـەنگووڕ دا باوە. **ئاڵقەی ونبوو:** رەگەزی گیانداریکە بە پێی فەرز کە دە نێوان مەیموون و مرۆڤ دایە و گۆیا مرۆڤی ئێستا درێژەی ئەم رەگەزەیە، لەم ئاڵقە ونبوویە هێشتا هیچ بەڵگە و نیشانەیەک نەدیتراوەتەوە.

**ئاڵقە بەگوێ** (ئان. ل)[ئاڵقە + بە + گوێ] حاڵی مرۆڤێک کە ئاڵقەی دە گوێ دایە و بۆتە بەندە و ناچار گـــوێ لە فەرمانی خاوەنی بگرێ، گوێ رایەڵ، ئاڵقە لە گوێ. ٢ـ (کنـ.) فەرمانبەر، گوێ بیست، گوێ لە مشت، بەندە.

**ئاڵقە بەگوێیی** (حم.)[ئاڵقەبەگوێ + ئیی] فەرمانبەریی، گوێ بیستیی، بەندەیی، گوێ رایەڵیی، ئاڵقە لە گوێیی.

**ئاڵقەتیز** (گیا.)[؟] گیایەکی خۆڕسکە، زۆر بەرز نابێتەوە، ساقەتی قەف قەف و شینە. کاتێک بیشکێنیەوە ئاوەکییەکی وەک شیری لێدەتکێ کە لە سەر کلۆ قەندێکی دەکەن و بۆ رەوانی کەلکی لێوەردەگرن، ئاڵقەتیس.

**ئاڵقەتیس** (گیا.) بڕ: ئاڵقەتیز

**ئاڵقەڕێز** (نا. ل)[ئاڵقە + رێز] ریزە زنجیرێکە، بنەکەی وەک بزماری دوو سەر وایە و لە دەرکەی دەکوتن و لە پشتەوە پەرچی دەدەنەوە و سەرەکەی دیکەی ئاڵقەیەکی گەورەترە کە دەچێتە نێو ئاڵقەیەکی جیا کە لە چوارچێوەی دەرکە دراوە و دەرگای ماڵ یا دوکانی پێدادەخەن. ~ **کردن:** داخستنی دەرگا بە ئاڵقەڕێز.

**ئاڵقەزوونە** (نا. ل)[ئاڵقە + زوون (زوان) + ئە] بڕ: ئاغزوونە

**ئاڵقەلەگوێ** (ئان. ل)[ئاڵقە + لە + گوێ] بڕ: ئاڵقە بەگوێ

**ئاڵقەلەگوێیی** (حم.)[ئاڵقەلەگوێ + ئیی] بڕ: ئاڵقە بە گوێیی

**ئاڵقە و کۆچکە** (نا. ل)[ئاڵقە + و + کۆچکە] کۆچکەیەک کە بە ئاڵقەی زێڕ نەخشاوە و ژنە مەنگوور بۆ جوانی لە سەریان دەبەستن.

**ئاڵک** (ئا.)[بڕ: ئاڵوو1][ئەر] بڕ: لوو

**ئاڵ و بۆڵ** (ئان. ل)[ئاڵ3 + و + بۆڵ] ترێیەک کە هێشتا تامی مەیلەوترشە و ماویەتی بە تەواوی بگا، بۆڵەتەمە، بۆڵەتەمێ، بەرەکە. ~ **بوون:** ترش و شیرین بوونی بەرسیلە، بۆڵەتەمێ تێکەوتن.

**ئاڵوگۆڕ** (نا. چا)[ئاڵ + و + گۆڕ] ١ـ

کاری گۆڕینەوەی شتێک بە شتێک بێ ئەوەی پارە لە گۆڕ دابێ، ئاڵوویر. ٢ـ کاری گۆڕینەوەی دوو شت لە یەک جۆر. ٣ـ کاری سەرتاپێ گۆڕینی جل و بەرگ. ٤ـ تێکچوونی بار و دۆخی پێشوو. ~

**بەسەر داهاتن:** گۆڕان و تێکچوونی بارودۆخی پێشوو و هەڵدانی بارودۆخی نوێ. ⁞ خەڵک وەک جاران نەماون ئاڵوگۆڕیان بە سەر دا هاتوە. ~

**کردن:** ١ـ گۆڕینەوەی دوو شت دەگەڵ یەکتر بێ ئەوەی پارەیەک بدرێ یا وەرگیرێ. ⁞ تایەکم ئارد دەگەڵ بزنێک ئاڵوگۆڕ کرد. ٢ـ گۆڕینەوەی دوو شتی یەکجوور. ⁞ کۆتەکانتان ئاڵوگۆڕ کەن. ٣ـ گۆڕینی جل و بەرگ. ⁞ بچۆ حەمام خۆت بشۆ و جلەکانت ئاڵوگۆڕ کە!

**تێبینی:** ئاڵ لە ئالماغ ـ ی تورکی بە مانای وەرگرتن و گۆڕ لە گۆڕینەوەی کوردیی کەوتوە و مانای گشتی دەبێتە وەرگرتن و دان یا دان و ستان، ئەوەش دەگەڕێتەوە ئەو سەردەمەی کە پارە و پووڵ دەوری سەرەکیان نەبوە و شتیان لە جیاتی شت داوە. ئێستاکە مانای ٤ یانی گۆڕانی باری وڵات (ئابووری، سیاسی و کۆمەڵایەتی) جێی بە ماناکانی دیکە تەنگتر کردوە.

**ئاڵ و واڵ** (ئان. ل)[ئاڵ1 + و + واڵ] ڕەنگاوڕەنگ، ئاڵ و والا، ئالایی. ⁞ خەملی چیا و چەمەن بە سپی و سەوز و زەرد و سوو/ دار و دەوەن بوە بە هەزار ڕەنگی ئاڵ و واڵ (حەقیقی ل ٥١).

**ئاڵ و والا** (ئان. ل)[ئاڵ1 + و + والا] ڕەنگاوڕەنگ، ئالایی. ⁞ بەس بێ جێلوەی زولف و خالان! ئاشقی ڕوخساری خۆت/ ئاڵ و والای خولدی ناوێ تالیبی دیداری خۆت (وەفایی ل ٣١)

**ئاڵوویر** (نا. چا)[تور: ئال (ئالماغ) + و + وێر (وێرماغ)] بڕ: ئاڵوگۆڕ/١

**ئاڵوێنی** (نا.)[؟] ١ـ چەشنێک قەیسی کە دەنکەی شیرینە ٢ـ دەنکی شیرنی قەیسی. & هەڵوێنی.

**ئاڵۆ** (نا.)[؟][ئەر] برای دایک، لالۆ، لالە، خاڵ.

**ئاڵۆز** (ئان.)[باک: ئالۆز ـ ناو: ئاڵۆز، ئارۆز، هاڵۆز ـ هەو: ئاڵۆز] ١ـ هەموو شتێکی ڕێسراوی درێژی لێک هالاو (کاموا، بەن، دەزوو و...) ٢ـ تووک و پرچی شانە نەکراو. ٣ـ بار و دۆخی شێواوی وڵات کە کەس کەس نەناسێتەوە. ٤ـ کەسی شێواو و ئاگا لە

خۆ نەماو. ٥ ـ مەسەلەیەکی گران و بە گرێ و گۆڵ. ٦ـ پیاوی توورە و تۆسن و بەد ئەخلاق. ٧ـ ئەسپی تۆڕ و سەرکەش کە زۆر گوێ ناداتە سوار. ٨ـ ڕۆژی سارد و تووش و کرێوەی زستان . ٩ـ تێکەڵ پێکەڵ. بێ سەر و بن. ‹‹ دوێنێ شەوێ خەونێکی ئاڵۆزم دیت. ~ **بوون:** ١ـ تێک هاڵانی کەلاف و ڕێسراوی درێژی وەک بەن و دەزوو. ٢ـ تێک هاڵانی پرچی درێژ و دانەهێنراو. ٣ـ شێوانی باری ئاسایی وڵات. ٤ـ شێوان و تێک چوونی باری ئاسایی کەسێک. & ئاڵۆسکان، ئاڵۆزکان،ئاڵۆزان. ~ **کردن:** ١ـ تێک هاڵاندنی ڕێسراوی درێژ کە لێک کردنەوەی گران بێ. ٢ـ تێک دانی سەر و پرچی شانە کراو. ٣ـ تێک دانی باری ئاسایی وڵات. ٤ـ تێک دان و شێواندنی باری ئاسایی کەسێک. & ئاڵۆزاندن.

**ئاڵۆزان** (چا. ل)[لە: ئاڵۆز] بڕ: ئاڵۆز بوون. ‹‹ عەنبەری سارا وتم زوڵفی، نەباتی میسری لێو / زوڵفی ئاڵۆزا، وتی لێوی کە ناوی من نەبات (مەحوی ل ٥٩).

**ئاڵۆزاندن** (چا. م)[لە: ئاڵۆزان] بڕ: ئاڵوز کردن

**ئاڵۆزاو** (نا. مف.، ئان. مف.)[لە: ئاڵۆزان] چلۆنایەتی ئاڵۆز بوونی ئەو حاڵەتانەی لە ئاڵۆز دا هاتوون (بڕ: ئاڵۆز)، ئالۆزکاو، ئالۆسکاو. ‹‹ شل و مل و سایەگەردن سەریان لە سایەی پەنجەران دەرهێناوە / زولفیان دەڵێی ئاوریشمی خاوە و نەئاڵۆزاوە (سەعید و میرسێوەدین ل ١٥٥).

**ئاڵۆز پاڵۆز** (نا. ل)[ئاڵۆز + و + پاڵۆز] تێکەڵ پێکەڵ، شێواو، ئاڵۆز پڵۆز، ئاڵۆز و بڵۆز.

**ئاڵۆزپڵۆز** (نا. ل)[ئاڵۆز + و + پڵۆز] بڕ: ئاڵۆزپاڵۆز

**ئاڵۆزکان** (چا. م)[لە: ئاڵۆز] بڕ: ئاڵۆز بوون

**ئاڵۆزکاو** (نا. مف.، ئان. مف.) [ لە: ئاڵۆزکان] بڕ: ئاڵۆزاو

**ئاڵۆز و بڵۆز** (نا. ل)[ئاڵۆز + و + بڵۆز] بڕ: ئاڵۆز پاڵۆز

**ئاڵۆزیی** (حم.)[ئاڵۆز + ئیی] ١ـ شێواویی وڵات ٢ـ تێکەڵ پێکەڵ بوونی بیر و مێشک. ٣ـ دوودڵیی، شک.

**ئاڵۆسکان** (چا. م)[لە: ئاڵۆز] بڕ: ئاڵۆز بوون



**ئاڵۆسکاو** (نا. مـفـ.، ئان. مـفـ.)[لە: ئاڵۆسکان] بڕ: ئاڵۆزاو

**ئـاڵـۆش** (نـا.)[بـاک: ئـالـۆش ـ نـاو: ئاڵۆش ـ هـەو: ئـاڵۆش] ١ـ نـەخـــۆشـی پێست کـە لە نێـوگـەڵ دەدا و پیـاو هەر دەیخـورێنێ و هـەڵیـدەکـرێنێ، خـارشت، خـوروو، قنگەخـرۆکـە، حـەکـە. ٢ـ (کنـ.) ژنی پێخۆش و خوروودار، حەکەدار.

**ئاڵۆشــاویی** (ئان. مـــفـ.)[ئاڵۆش + ئاویی2] حـاڵی کـەسـێک کـە ئالۆشی هەیە، ئاڵۆشدار، بە ئاڵۆش.

**ئاڵۆشدار** (ئان. فا)[ئاڵۆش + دار] بڕ: ئاڵۆشاوی

**ئاڵـوو**[1] (نـا.)[پەه: ئالەگ (هـەڵووژە)] ١ـ (ئـا.)[باک: ئـالوو ـ نـاو: ئـاڵوو ـ باش: ئـاڵـوو] دوو لـووی بـچــــــووکی بـادامی گەروون لە ژێر چەنە. ئیشی ئەم لوویانە سـاز کردنی گرمـۆڵەی سپی بۆ لەشە و هەندێک جـار لە بەر شـاڵاوی مـیکرۆب چڵکێ دەکـا و دەمـاسـێ، ئارگـووشک، مـەرازە. ٢ـ (گـیـا.) هەڵووژە، هەڵووچە. ~ کــەوتن: بڕ: ئاڵوو هـاتن. ~ گرتنەوە: بڕ: ئاڵوو هەڵدانەوە. ~ هاتن: چڵک کـردنی ئاڵووکان و هـەڵمسـانیـان، ئاڵوو کـەوتن. ~ هەڵدانەوە: دامـاڵینی ئاڵوو لە دیوی دەرەوە بۆ چاک کردنەوە و نیشتنەوەی، ئاڵوو گرتنەوە.

**تێبینی:** ئاڵوو (ئاروو، ئالوو) بە گشتی بە مـانـای خـڕ و گـرمـۆڵەیە و لە گـەلێک وشـە دا ئەم مانایـە نیشـان دەدا. ⁂ لوو، ئاڵووباڵوو، شـەفـتـالوو، هوڵوو، زەردالوو، ئاروونگ، ئاڵگ.

**ئاڵـوو**[2] (پاشـ.) بـە نـاوەوە دەلکێ و ئاوەڵناو سـاز دەکا و مـانـای تێکەڵ بوون و ئاوێتە بوون دەدا، ئاوی، ئاو. ⁂ زامێ ژارئـاڵوو، بێ دەوا و دامێ / مـــەزانـوون جـەی زام، مـەوینون کـامێ (بێسـارانی ل ١٤٦). خەواڵوو

**تێــبـینی:** ئاڵـوو لە چاوگـێکی لە بیـر کـراوی کـوردیـی (ئاڵاوتن) هـاوریشــەی ئامـێتن کەوتۆتەوە ئەم چاوگە بە شێـوەی ئـالووتـەن لە پـەهـلـەویـی و بـە شـــێـــوەی ئالوودەن لە فـارسـی دا هـەیە. ئەم چاوگە هێشتا لە پاڵاوتن دا ماوە کە مانای دژی خۆی دەدا.

**ئاڵووباڵوو** (گـیـا.)[ئاڵوو1 + باڵوو][باک: هـەلهـەلـووک ـ ناو: ئاڵووبەڵاڵووک، بـەڵاڵووک، هـاڵووبـەڵاڵووک، ئـاریبــــاری] دارێک و بەری دارێکە شـێـوەی گـێـلاس دەدا، بەرەکەی مزرە، سوورێکی مـەیلەوە

ڕەشە، بە ڕووتی دەخورێ، مرەبا و ڕوب و شەربەت و تەنانەت شەرابیشی لێ ساز دەکەن، بۆ وێشک کردنیش دەست دەدا، Prunus brigantica ناوی لاتینی ئەم دارەیە.

**ئاڵووبخارا** (گیا.)[ئاڵوو1 + بخارا] جۆرێک هەڵووچەی ترشە کە ئیشک دەکردرێ و لە بۆ ترش کردنی هەندێک چێشت کەلکی لێوەردەگرن، هەڵووچە پاوەیی، هەڵووچەڕەشە، هەڵووژەڕەشە.

**تێبینی:** بوخارا شارێکە لە کۆماری ئوزبەکستان.

**ئاڵوو بەلاڵووک** (گیا.)[ئاڵوو1 + بەڵ + ئاڵوو + ک] بڕ: ئاڵووباڵوو

**ئاڵوودار** (نا. ل)[ئاڵوو + دار1] دارێکی ڕاست و درێژ کە زۆر ئەستوور نیە و لە خانووبەرە ساز کردن دا بۆ دارەڕا کەلکی لێوەردەگرن.

**تێبینی:** ئارووک یا ئاریک لە زاراوەی باکووریی دا بە مانای میچ هاتوە و وشەی ئاروو و ئاڵوو هەریەکن و تەنیا ئاڵ و گۆڕی بە سەر دوو پیتی **ل** و **ر** دا هاتوە کە وێنەی یەکجار زۆرە. بەم پێودانە ئاڵوودار دەبێتە داری میچ.

**ئاڵهـا** (نا.)[؟][ئەر] مەیل، تاسە، ئارەزوو، ئیشتیا، ئەڵها :: ئاڵهای سەفەرم کردگە.

**ئاڵە** (نا.)[بڕ: ئاڵ2] ١ـ بڕ: ئاڵ2. ٢ـ مووروویەکی ڕەنگ سپی یا شیری ڕەنگە کە لە بەرمووری ئاڵە و شەوەی دەکەن. (بڕ: بەرمووری ئاڵە و شەوە).

**ئاڵەبووک** (نا. ل)[ئالا1 / ٣ + بووک] کوتە پارچەی زیادی کە کچۆڵان دەیکەنە جل و بەرگ بۆ بووکەکانیان، جل و بەرگی بووکۆڵە، ئالابووک، واڵەبووک.

**ئاڵەبێژ** (نا. چا)[ئاڵە (هێڵەگ) + بێژ2] کاری دابێژتنی هاڕاو بە پارچەی کون کونی ورد یا بە هێڵەگی کون ورد، ئالابێژ، واڵەبێژ. ~ **کردن:** دابێژتنی هاڕاو بە هێڵەگی ورد یا کوتە پارچەیەکی کون کونی ورد، ئالابێژ کردن، واڵەبێژ کردن.

**ئاڵەبێژ کراو** (ئان. مف.)[لە: ئاڵەبێژ کردن] هاڕاوی ورد دابێژراو بە هێڵەگ یا پارچەی کون ورد، دابێژراو. :: خوێی ئاڵەبێژکراو.

**ئاڵەت**[1] (گیا.)[؟] بەری گیایەکی ساقەت درێژ و باریکە و لە دار دەهاڵێ و لە شوێنی گەرم وەک هیندوستان دەڕوێ و هەتا سی ساڵان بەر دەدا. بەرەکەی

دەنکێکی ورد و رەشــە و زۆر تیـژە و بە هێــشــوویـە، لە کـــوردەواری ئەم دەنکە دەهارن و لە چێشتی دەکەن. & بیبەر، ئیسۆت، ئیسیوەت، ئالات.

**ئاڵەت²** (نا.)[عــــەر: آلة] ١ـ داری چووکی داتاشــــراو و ســــاز کــــراو بۆ پەنجەرەی قەدیم. هەر پەنجەرەیەک دەیان ئاڵەتی دەویست و بـە شـکڵی چـووک و جـــوانی هـەندەسـی لێکیـــان دەبەست و کوتە شووشـەیەکی سپی یا رەنگیشیان تێدەگرت. ئێستا لە هەندێک شوێنی کۆن ئەم جـۆرە پەنجـەرانە مـاون کـە بە ئاڵەت ســـاز کـراون. ٢ـ داری چووک و خـــڕی داتاشراو بە شێوەی شیش و میل کە لە شوێنی پاڵ دانەوەی کورسی و سەندەڵی و نیم تەختی دەگرن. & ئالات، ئاڵەتە.

**ئاڵەتانج** (گیـانـ.)[ئاڵ1 + ئە + تانج] جـۆرێک مـراوی کـێویی، رەنگی سـپی و خاڵخاڵە، پەڵەیەکی سەوزی سێ سووچی لـە ســـەرە، گــۆشـــتی دەخـــورێ و راو دەکـردرێ، Tadorna tadorna ناوی لاتینی ئەم باڵندەیە، هەڵەتانج.

**تێبینی:** ئاڵ لەم وشـەیە دا بە مـانای رەنگی کەسک یا سەوز هـاتوە. بە گشتی رەنگی ئاڵ لە زمانەکانی هیند و ئێرانی دا رەنگێکی یەکدەست نیە و هەر کام بۆ رەنگێکیان بە کار بردوە. لە زمانی کۆنی تەبەریی دا ئال بە مـانای سـەوز هـاتوە. (بڕ: ئاڵ1).

**ئاڵەتە** (نا.)[ئەر] بڕ: ئاڵەت2

**ئاڵەتە کێـوییلە** (گیا.)[ئاڵەت1 + ئە + کێو + ئییلە] گیایەکی خۆڕسکە پتر لە دەم جۆبار و ڕۆبار شین دەبێ گوڵی مۆر و بە هێشوویە و تام و بۆنی توند و تیژە.

**ئاڵە فــەرەنگ** (ئان.)[فـــەر: a la franque] کـەسـێک کـە جل و بەرگی فـــەرەنگی دەبەر دەکــا و لـە ژیانی دا لاسای ئەوان دەکاتەوە، فەرەنگی مەئاب، ئەلمۆدە.

**ئاڵەقـۆق** (گیـا.)[ئاڵ1 + ئە + قـۆق (کۆک)] بڕ: ئاڵەکۆک

**ئاڵەکۆک** (گیا.)[ئاڵ1 + ئە + کۆک] ١ـ لە یەکەم گیا خۆڕسکەکانی بەهارییە کــە زۆرتر لە پەنا پەڵە بەفــران ســەر دەردێنێ، بە قـەرا بستێک لە زەوی بەرز دەبێتەوە، گەڵاکانی لە شنگ دەچێ بەڵام تووکن و هەندێک پانتـــرن، گـــوڵەکـەی زەردن و بنێکی خــــڕیان هـەیە کـــــە دەخورێ، ئاڵەکۆک هەموو ساڵێ لە سەر بنجی خۆی سەرهەڵدەداتەوە و لە گوڵ و

ریشەی بۆ دەرمانیش کەلک وەردەگرن، primevere ناوی لاتینی ئەم گیایەیە، ئاڵەقۆق، هەڵەکۆک، هاڵەکۆک، پەڵووک.
٢ـ (کنـ.) دیاری هەژارانە. ؛؛ دیاری شوان ئاڵەکۆکە. || **ئاڵەکۆکی نێو دوو بەردان:** (کنـ.) کەسێک کە لە هەموو لایەکەوە زەخت و زۆری بۆ دێنن.

**ئاڵەم** (نا.) بڕ: عـالـەم. ؛؛ تەک دا تاریکی ئەو لای تەریکی / ئاڵەم چەنی نوور کەرد هام شەریکی (مەولەوی ل ٢٤٥).

**ئاڵی** (ئان.) پیاوی ژێر دەست و گوێ لە مستی ژن، پیاوێک کە ترسی لە ژنەکەی هەیە. ~ **بوون:** لە ژن ترسان و لە ژێر ئەمری ژن دا بوون.

**تێبینی:** بەرامبەر بەم وشەیە لە کۆیە (هۆمەر = عومەر) و ئەو دوایانەش لە سلەیمانی (یۆسف) باوە، جا ئەوەی کە بۆ ئەم مەبەستە هەر ناوی (شەخس) بە کار دێ، دەمهێنێتە سەر ئەم باوەڕە کە ئەسڵی ئەم وشەیەش (عەلی) بێ. (قامووس ب ١ ل ٦٤). وشەی ئاریلە کە پێک هاتوو لە [ئاری + لە]یە گومان دەخاتە سەر ئەم بۆچوونەی زەبیحی و شیاوی پتر لێکۆڵینەوەیە بە لەبەر چاو گرتنی ئەوە کە دوو پیتی ل و ر ئاڵوگۆڕییەکی زۆریان هەیە و شک نیە کە ئاڵی و ئاری هەر یەک وشەن. (هس: ئاریلە)

**ئام**[1] (نا.)[عەر: عم][باک] برای باوک، مام.

**ئام**[2] (پێشـ.)[بڕ: ئاو3] هەم، هاو ؛؛ ئامپا، ئامپیاڵە، ئامیار.

**ئام**[3] (چا. مخ) هات، هام ؛؛ ئاموشۆ

**تێبینی:** ئام لە چاوگی ئامای هەورامی بە مانای هاتن کەوتوە و تەنیا لە وشەی ئاموشۆ دا دەبیندرێ و پەڕیوەتە نێو زاراوەی ناوەندیی و شێوەی هام ـ یشی لێبۆتەوە.

**ئام**[4] (ئام.)[بڕ: ئا14] دوو ناو یا دوو ئاوەڵناوی دووپات کراوە تێک دەکاتەوە و ئاوەڵناوێکی نوێ ساز دەکا. ؛؛ بەرامبەر

**ئاماج** (نا.) بڕ: ئامانج. ؛؛ ڕۆح چە تەن پەڕواز مۆژەی مەستێکم / ئاماج تانەی خاس و کە.ستێکم (وەلی دیوانە ل ٨٧).

**ئامادە** (ئان.)[باک: ئامادە ـ ناو: ئامادە ـ باش: ئامادە] ساز، تەیار، حازر. ~ **بوون:** ساز بوون، تەیار



بوون، حــازر بوون. ~ **كـردن:** ســاز كردن، حازر كردن، تەيار كردن.

**ئامادەیی** (حم.)[ئامادە + یی] ئامادە بوون، حــازریی، تەیاریی. :: ئامــادەیی خـــۆم بۆ چوونـه ســـەیران و گـــەشت راگەیاند.

**ئامار** (نا.)[لە: ئامارتش][پەھ: ئامار] ١ـ رادە و ئــەنــدازە بــە پــێــی بــژار و لێكدانەوە، بژار، ژمارە. :: بە پێی ئامار هەمـوو سـاڵێ ... منداڵ لە دایک دەبن و ... کەس دەمرن. ٢ـ [زا] ژمارە

**تێبینی:** فارس ئەم وشەیەی لە زمانی پەهلەویی دەرکێشاوە و لە جیات sta-tistique بە كـــاری دێنــێ و ئـەویش زانســـتــێكە كـــە بە بژار و ژمـــارە رووداوەكان و ژیانی كۆمـەڵایەتی نیشـان دەدا وەک بژاردنی رادەی حـەشـێـمـەتی وڵات یا شـارێک. هەر چەند ئەم وشـە لە زمـانـی فـارسی را هاتۆتە نێـو زمـانـی كوردییـەوە بەڵام خزمایەتی و نزیكایەتی ریشـەیی دە گـەڵ كـوردیی زۆرترە. [بڕ: ژماردن].

**ئامارات** (نا. ل)[ئامـار + ئات][باک] ئامــراز، ئامــێــر، كــەل و پـەلی كـــار، ئـەســبــاب. ئامـــوورەت :: ئامـــاراتی دارتاشی.

**تێبینی:** ئەم وشـە لە ئامـێر كەوتوە و كۆی ئاتی پێوە نراوە.

**ئامارگەر** (ئان. ل)[ئامار + گەر][پەھ: ئامارگەر] كەسێک كە كاری سەرژمێری و ئاماری بە دەستەوەیە.

**ئاماژ** (نا.) بڕ: ئامانج

**ئامـاژە** (نا.)[بڕ: ئامـانج] ئیـشـارە، هێما.

**تێبینی:** ئاماژە هاوریشە و هاومانای ئامانجە و لە مانای بنەڕەتی خۆی یانی نیـشـــانە هـەندێک لەقـــاوە و مـــانـای ئیشارەی بە خۆوە گرتوە.

**ئاماسان** (چا. ل) بڕ: ئاوسان

**ئامـــاســـیـــاگ** (نا. مــفـ.)[لە: ئاماسیان][ئەر] بڕ: ئاوساو

**ئاماسیان** (چا. ل)[ئەر] بڕ: ئاوسان

**ئامال** (ئان.)[پەھ: هەمال] نزیک بوون و شـێـوە دان لە حـاڵ و رەنگێک، وێچوو، مـەیلە. :: ئامـاڵ شـێت، ئامـاڵ فـەقیـر، ئاماڵ شین، ئاماڵ سوور.

**تێبینی:** وشـەی ئامـاڵ دەگـەڵ وشـەی ئـاواڵ هـەر یـەک ســـــەرچاوە و یـەک

ریشـەیان هەیە هەرچەند کـە ماناکـەیان هەندێک لێک دوور کەوتۆتەوە. لە زمـانی پەهلەویی دا هـەمال هەم بە مـانای ئاواڵ و هەواڵە هـەمیش بە مـانای وەک و شێوە و ئاماڵ و چەشن.

**ئامـان**[1] (نا.)[ئەو: ئاڤـەنت، ئافـەنت ـ سـان: ئاپۆڤـەنت ـ پەه: ئاپۆمـەند. باک: ئامان ـ ناو: ئامـان، ئاوان ـ باش: ئامان] دەفـر و قـاپ و قـاچاغی چێـشت تێـدا خواردنی نێو ماڵ.

**تێبینی:** ئاڤەنت āfant لە ئەوێستا و هاوتاکانی بە گشتی لە ئاڤ یا لە ئاپ بە مـانای ئاو پێک هاتوون و مـاناکـەیانی ئـاودار و ئـاودانـە، هـەروەتـر ئـاوێـژدانـە āveždāna ـ ش لە ئەوێستا دا هەر بە مانای ئاودان یا دەفری ئاو هاتوە. ئامان و ئاوان لە دوو بەشـی [ئـام، ئـاو + ئـان] پێک هاتوون ئام شـێـوەیەکی دیکە لـە وشەی ئاو ـ ە و ئان سواوی دان ـ ە یانی وشـەکـە بـە گـشـتی ئـاودان ـ ە. (هس: ئافتاوە)

**ئامـان**[2] (نا.)[عـەر: امـان] ١ـ تکا و رجا بۆ وریا بوون و چاوەدێری باشتر لە شت یا کـەسێک کردن، دەخیل، ئەمان. ⁂ فریوی هەر هەوەسبازێ مەخۆ ئەی تازەگوڵ ئامـان / سـبـەینان ئارەزووی یارێکی دی و هـاوسـەر دەکـا شـەونم (ئاوات ل ٢٥). ئـامـان منداڵێنە نەکـەن بچنە سەر چۆم، ئامان ئەو منداڵە دەست لەو سـۆبـەیە نـەدا. ٢ـ زاڵە، بێـزار. ⁂ ئامـان لە زۆڵمی زاڵم. ٣ـ ناوەی مێینە لە نێـو مـەنگوڕان دا. **~ بۆ بردن:** پەنا بردنە بەر کەسێک و ئامان خواستن. ⁂ لە ترسی بابی ئـامـانی بۆ باپیری بردوە. **~ خواستن:** پەنا بردنە بەر کەسێک لە ترسـان بۆ پاراستن. **~ لەبەر هێنان:** داوای ئامـان لێکردن، پەنا بۆ بردن، ئامـان خـواستن. ⁂ بازێکی چەنگ بە خوێنە/ ئیکلامێی لێ بکێشە، ئامـانێ لە بەر بێنە (مـان ل ١٨٦). **وە ~ خستن:** ئۆقرە لێبڕین، هێمنایەتی لێبڕین، وە زاڵە هێنان. ⁂ دز و چەتە وڵاتیـان وە ئامـان خستوە. **وە ~ هاتن:** وە زاڵە هاتن، بێزار بوون. ⁂ لە دەست ئەو ژیان و چەرمەسەرییە وە ئامـان هاتووم. **وە ~ هێنان:** زۆر ئەزیەت و ئازار دانی کەسێک، وە زاڵە هێنان.

**ئامانج** (نا.)[پەش: ئەرمان، ئەرماند ـ فار: ئارمان. باک: ئارمانج، ئاڵمانج ـ ناو: ئامانج، ئاماژ ـ هەو: ئاماج] ١ـ شتێک کە دادەکرێ و بۆ تیر هاویشتن دەست

نیشان دەکرێ، ئاماژ، نیشانە. ٢ـ مەبەست، ویست، دۆز. :: پیاو دەبێ لە ژیانی دا ئامانجێکی هەبێ.

**تێبینی:** ئەم وشەیە لە ئارمانجی زاراوەی باکووریی هاتۆتە نێو زمانی ئەدەبی ناوەندیی و ئاماژ و ئاماژەشی لێبۆتەوە. ئامانج لە بنەڕەت دا بە مانای نیشانە بوە و بەمانای مەبەست بە مەجاز هەر لە نیشانە کەوتوە.

**ئامانەت** (نا.)[عەر: امانة] ١ـ شتێکی کە بۆ ماوەیەک لە لای کەسێک دادەندرێ و دوایی وەردەگرترێتەوە، ئەمانەت. :: هەندێکم پووڵ بە ئامانەت لە لای کاک برایم داناوە هەتا لەم سەفەرە دێمەوە بۆم راگرێ. ئەم کتێبە دەتوانی بە ئامانەت وەریگری. ٢ـ ئاگا، چاوەدێریی. (بەو مانایە دەگەڵ چاوگی بوون دێ) & ئەمانەت. ~ **بوون:** ئاگا لێبوون، چاوەدێریی کردن، پاراستن. :: ئەو کەوشە ئەگەر ئامانەتی بێ بەشی چوار ساڵی دەکا. **بە ~ دانان:** شتێک لە لای کەسێک دانان بۆ ماوەیەک هەتا ئاگاداری لێبکا و دوایی لێی وەربگیرێتەوە. **بە ~ وەرگرتن:** شتێک بۆ ماوەیەک لە کەسێک ستاندن و لە دوایی دانەوەی. :: ئەو کتێبانەم لە کتێبخانە بۆ دە رۆژان بە ئەمانەت وەرگرتوە.

**ئامانەتدار** (نا. فا)[ئامانەت + دار2] ١ـ کەسێک کە ئامانەت راگرێ، ئەمانەتدار. ٢ـ جێ بڕوا، دەستپاک، ئەمین.

**ئامانەتداریی** (حم)[ئامانەتدار + ئیی] ١ـ کار و ئاکاری ئەمانەتدار. ٢ـ دەستپاکیی، دروستیی، ئەمینیی.

**ئامانەتیی** (حم.)[ئامانەت + ئیی] ماڵ یا هەر شتێک کە وەک ئەمانەت دراوە بە کەسێک، بە ئامانەت داندراو.

**ئاماوزێ** (نا. ل)[ئاماو؟ + زێ2] مشەمما یا پەڕۆیەکی تەنکە کە دە شەمی هەڵدەکێشن و لە سەر کوانی دادەنێن هەتا کێمەکەی هەڵمژێ.

**ئاما و لوای** (چا. مخ)[هەو] بڕ: ئاموشۆ

**ئامبار** (نا.)[باک ـ زا] بڕ: ئەنبار

**ئامباز**[1] (ئان. ل)[ئام2 + باز2] دوو کەسی کە یەکتر دەباوەش دەگرن و تێک دەبەزێن، تێک گەوزینی دوو کەس دەگەڵ یەک جا بۆ شەڕ بێ یا بۆ یەکتر دە باوەش گرتن لە خۆشەویستییان. ~



**بوون:** خۆ پێدادان و دەباوەش گرتن، ئاوقا بوون، تێک بەزین. :: هەر لە دوورەوە دیتی ئامبازی بوو و بە عەرزی دادا. **~ی یەکتر بوون:** بە هەڵەداو بۆ لای یەکتر چوون و یەکتر دە باوەش گرتن بۆ شەڕ یا لە خۆشەویستیان.

**تێبینی:** باز دەچێتەوە سەر ریشەی ڤەزەی vaz ئەوێستایی بە مانای رۆیشتن و چوون و بەزینی کوردیی، ماناکەی دەبێتە بەرەو یەک چوون و تێک بەزین. زەبیحی بازی بردۆتەوە سەر بازوو یا باسک (بڕ: قاموس ب ٢ ل ٦٧).

**ئامباز**$^2$ (ئان. ل)[ئام2 + باز3][پەھ: ئەمباز، هەمباز. ناو: ئامباز، هەمباز ـ زا: ئالباز، ئالبۆز] هاوڕێ، هەڤاڵ، ئاواڵ، هەمباز، ئالبۆز. :: ئامبازی زیندانم مەکە وەکوو کاکەمەم و خاتووزینی (مێر و وەفا ل ١٠٤).

**ئامبولانس** (نا.)[فەر: am-bulance] ماشێنی تایبەتی نەخۆشخانەکان بۆ راگوێزتن و هێنان و بردنی نەخۆش و بریندار و تەنانەت مردوو.

**ئامپا** (ئان. ل)[ئام2 + پا1] جووتبەندەی دەوڵەمەند و حاڵخۆش لە دێهات دا، هاوپایە، هاوشان. :: دیارە ئاغا پێکەوە نێوانیشیان ناخۆش بێ، رعێت و ئامپا گفتوگۆیان دەگەڵ یەکتری هەیە (لاس و خەزاڵ ل ١٤٥).

**ئامپیاڵە** (ئان. ل)[ئام2 + پیاڵە] دوو کەس کە هەمیشە بە یەکەوە ئارەق دەخۆنەوە و هاودەم و هاوراز و هاوبڕوای یەکترن، هاوپیاڵە.

**ئامپێر** (نا.)[فەر:ampere] واحیدی ئەندازەگرتنی تەوژمی بەرق.

**ئامدەم** (ئان. ل)[ئام2 + دەم] ١ـ هاوڕێ، ئاواڵ، رەفیق. ٢ـ هاوقسە، هاوزمان. & هاودەم. :: جا فایدەی چی؟ هەر کەسە دەگەڵ ئامدەمی خۆی دەتوانێ قسە بکا و بچێتەوە رێ و شوێنی جێ ژوانێ (سەعید و میرسێوەدین ل ١٠)

**ئامراز** (نا.)[پەھ: ئەوزار، ئەفزار، ئەبزار، ئەفچار. باک: ئامارات، ئامووروەت، ئامراز ـ ناو: ئامر، ئامێر، ئامراز، ئەمراز] ١ـ کەرەسە و ئەسباب و دەزگای کار و ئیش. :: تەور ئامرازی داربڕینە. ئامرازەکانی سەرتاشینم بۆ بێنە با سەری ئەم منداڵە کورت کەمەوە.

٢ـ لە ڕێزمـــــان دا بە مـــــانای ئەدات (Article) هەڵبــژاردراوە. ‖ **ئامــرازی دەست:** کەس یا دەوڵەتی گوێ لە مستی دەســـتــەڵاتدارێک بۆ هەڵســـووڕاندنی کـــاروبار و دەســـتـــوورەکـــانی ئەو دەستـەڵاتدارە. ⁙ شا ئامرازی دەستی ئامریکا بە دژی خەڵکی کورد بوو.

**ئامـــــراز** (ئان. ل)[ئام2 + ڕاز] دوو کەس کە برِوای تەواویان بەیەکە و باسی دڵی خـۆیان لە لای یەک دەکەن، هاوڕاز. ⁙ زگم دەسووتا من بە حاڵی خۆ / کۆتر نابێـتـە ئامــڕازی هـەڵۆ (ســەعـیـد و میرسێوەدین ل ٤٢)

**ئامـسـا** (ئان. ل)[ئام2 + سا1] بڕ: ئاوسا

**ئامـسـەر** (ئان. ل)[ئام2 + سـەر] بڕ: هاوسەر

**ئامـشـۆ** (چا. مخ)[ئام3 + شـۆ] بڕ: ئاموشۆ. ~ **کردن:** بڕ: ئاموشۆ کردن.

**ئامشۆکەر** (نا. فا)[لە: ئامشۆ کردن] بڕ: ئاموشۆکەر

**ئامـــفی تیـــاتر** (نا.)[یون: am-phiteatron] ١ـ شـوێنی دانیـشـتنی سـەیرکـەران لە یونان و ڕۆمی کۆن، کـە ڕیزەکـــانی پلیکانی و بازنـەیی بوو و نێـوەڕاسـتـەکـەی گـۆڕاییـەک بوو کـە بەرنامـــەیان تێــدا دەگــێــڕا. ٢ـ هـەر شـوێنێکی نوێی بەم شـێوە کـە نمایشی تێدا بدرێ.

**ئامک** (نا. ل)[ئام1 + ک] خـوشکی باوک، پوور، میمک، ئامکە.

**ئامکوف** (ئان. ل)[ئام2 + کــوف؟] هاوشـــان، بەرابەر، هاوپایە، ئاوکـوف، ئاوقـوف. ~ **بوون:** هاوشـان و بەرابەر بوون، وەک یەک بوون، لە یـەک پلە و پایە دا بوون. ⁙ بۆ کەس نییـە خـەبەرێکم بۆ بەرێ بۆ عێلی باڵەکان و مەملەکەتەکەی باڵەکـیـیــە/ بڵـێن پێنج هەزار کـــەس ئامکوفی ئاقـە سـوارێک نیـیـە (لاس و خەزاڵ ل ١٥٤).

**ئامـکە** (نا. ل)[ئـامـک + ئـە][زا] بڕ: ئامک

**ئامـــلانە** (ئان. ل)[ئام2 + لانە] دوو دڵداری پێک گـەیشـتـوو، هاودەم، ئاومل، هاوژین، ئاولانـە. ~ **بوون:** هـاودەم و هــاوژین بــوون، بــە یــەکـــــــەوە بــوون، دەســتـەمــلانی یەک بوون. ⁙ جـا ئەمن بۆچیـمـە ئەو زیندەگـانی و ئەو ژیانە / کــەســێکی دیکە لە ســینگ و بەرۆکم بگێرێ پەنجانە/ میراتی شۆڕمەحموود

لەگەڵی ببێتەوە بە ئامالانە (شۆڕەمەحموود ل ٩٠) باسکت ئاوێزانی گەردن پکەم، بڵێن ئەوە ئاشقە و ماشقەی مارن وا بوونەوە ئاملانە (لاس و خەزاڵ ل ٤٢).

**ئامنان** (نا.)[زا] بڕ: هاوین

**ئامنۆن** (نا.)[زا] بڕ: هاوین

**ئامنوون** (نا.)[زا] بڕ: هاوین

**ئاموشۆ** (چا. مخ)[ئام3 + و + شۆ] هاتوچۆ، چوونە لا، ئامۆشۆ، ئامشۆ، ئامەشۆ، هامۆشۆ. ~ **کردن:** هات و چۆ کەسێک کردن، سەر لە کەسێک دان، ئامشۆ کردن. ៖ کەریم دەمێک ئاموشۆمان ناکا. دەگەڵ یەک ئام و شۆتان هەیە؟

**تێبینی:** ئەم وشە لە زاراوەی ناوندی دا بە تایبەت لە موکریان برەوی زۆرە کەچی ریشەی دەگەڕێتەوە سەر زاراوەی هەورامی، نازانم ئەم وشە کەی و چۆن هاتوەتە ناو ئەو زاراوە. ئام لە چاوگی ئامای بە مانای هاتن و شۆ لە چاوگی شیای بە مانای چوون کەوتوە.

**ئاموشۆکەر** (نا. فا)[لە: ئاموشۆ کردن] کەس یا کەسانێک کە هات و چۆی شوێنێک دەکەن، هات و چۆکەر، ئامشۆکەر. ៖ ماڵە بابم ئاموشۆکەریان زۆرە.

**ئامۆ**[1] (نا. ل)[ئام1 + ئۆ] برای باوک، ئاپۆ، مام، مامۆ. (لە زاراوەی ناوەندیی دا بە تەنیا بە مانای مام ناکوترێ بەڵام لە هەندێک ناوی تێکەڵاو دا دەبیندرێ ៖ ئامۆژن، ئامۆزا.)

**ئامۆ**[2] (ر.) ریشەی چاوگی لە بیر کراوی ئامۆتن بە مانی فێر کردن. ៖ دەستەمۆ (دەست ئامۆ) ، نامۆ (نا ئامۆ)

**ئامۆچ** (ر.) بڕ: ئامۆژ

**ئامۆچیار** (ئان. ل)[ئامۆچ + یار] بڕ: ئامۆژگار

**ئامۆچیاریی** (حم.)[ئامۆچیار + ئیی] بڕ: ئامۆژگاریی. ~ **کردن:** بڕ: ئامۆژگاریی کردن.

**ئامۆزا** (نا. ل)[ئامۆ1 + زا] پەیوەندی نێوان منداڵەکانی دوو یا چەند برا دەگەڵ یەکتر، منداڵی مام، مامۆزا.

**ئامۆزازا** (نا. ل)[ئامۆزا + زا] پەیوەندی نێوان منداڵەکانی ئامۆزا دەگەڵ ئامۆزای ئەو کەسە یا دەگەڵ منداڵەکانی ئەو کەسە، مامۆزازا، بن ئامۆزا.



**تێبینی:** بۆ دیاری کردنی ئەوە کە ئامۆزازای کامەیانە لە ناساندن و رستە دا دیاری دەدا. وەک: " ئاسۆ ئامۆزازای منە " یا " من و ئاسۆ ئامۆزازاین ".

**ئامۆژ** (ر.)[پەه: ئامۆژ، ئامۆچ، ئامۆز. باک: ئامۆژ - ناو: ئامۆژ، ئامۆچ - هەو: مۆچ] ئەم وشەیە بە تەنیا نایە و لە هەندێک وشەی لێکدراو دا ماون و مانای فێر دەدا.

**تێبینی:** چاوگەی ئەو وشە و چەندی وشەی دیکە لەم رەگە لە کوردیی دا لە بیر چۆتەوە و دەبێ وشەی نزیک بە ئامۆتن بووبێ بە لە بەرچاو گرتنی وشەکانی دەستەمۆ و نامۆ و چاوگی پەهلەویی ئەم وشەیە ئامۆختەن -āmōx tan بە مانای فێر کردن، راهێنان. ئامۆچ و ئامۆژ و ئامۆز رەگی ئێستای ئامۆختەن - ن.

**ئامۆژگار** (ئان. ل)[ئامۆژ + گار][پەه: ئامۆژەکار] کەسێک کە ئامۆژگاری دەدا، پەنددەر، نەسیحەت کەر، رێ پێشاندەر، ئامۆچیار، ئامۆژیار.

**ئامۆژگاری** (حم.)[ئامۆژگار + ئیی][پەه: ئامۆژەکارییە] نەسیحەت، پەند، فێر کردنی چاکە و خراپە، ئامۆژیاریی، ئامۆچیاریی، مۆچیاریی. **~ کردن:** نەسیحەت کردن، پەند دان، ئامۆژیاریی کردن.

**ئامۆژن** (نا. ل)[ئامۆ1 + ژن] پەیوەندی نێوان ژنی برایەک دەگەڵ منداڵەکانی براکانی ئەو کەسە، ژنی مام، ژن ئاپ، ژنام، مامۆژن، مامۆژەنی.

**ئامۆژیار** (ئان. ل)[ئامۆژ + یار] بڕ: ئامۆژگار

**ئامۆژیاریی** (حم.)[ئامۆژیار + ئیی] بڕ: ئامۆژگاریی. **~ کردن:** بڕ: ئامۆژگاریی کردن.

**ئامۆشۆ** (چا. مخ)[هەو] بڕ: ئاموشۆ. ‡‡ خەیر وەڵڵا تا گیان نە تۆی قەفەس بۆ / کەم کەم ئامۆشۆی ئامای نەفەس بۆ (مەولەوی ل ٣٥٢).

**ئامۆنیاک** (نا.)[یون: ammoniak] گازێکە بێرەنگ و بۆن تیژە، لە هەوا سووکترە و دەگەڵ ئاو تێکەڵ دەبێ و لە نوشادور و قسڵ بە دەستی دێن. لە بزیشکی و سەنعەت دا کەڵکی لێوەردەگرن و فۆرمۆلەکەی $NH_3$ یە.

**ئامۆنیۆم** (نا.)[فەر: ammonium] فلزێکی فەرزییە کە هێشتا بە حاڵەتی ئازاد نەدیتراوەتەوە و وایان داناوە کە لە

ئەملاحی ئامۆنیاک دا هەیە.

**ئامور** (نا.) هاوتای نیر کە یەکێکە لە دوو پارچەی سەرەکی بۆ جووت. ئامور لە دوو کوتی باسک یا باسکێش و دەندە پێک هاتوە (بڕ: باسکێش و دەندە)، هەوجاڕ، ئێرەقە، یەرەق. || **ئاموری رژد:** ئامورێکی باشە کە زۆر دەچێتە خوار و باش دەکێڵێ. **ئاموری ماڵە:** ئامورێک کە چاک ناچێتە نێو عەرزەوە و کەم دەچەقێ، هێس. **ئاموری هێس:** بڕ: ئاموری ماڵە.

**تێبینی:** ئامور هەمان وشەی ئامێرە و ماناکەی تەنگەبەر بۆتەوە. (بڕ: ئامراز)

**ئامورەت** (نا.)[باک] بڕ: ئامارات

**ئامە** (نا.)[ئەر] دایک.

**ئامەد** (نا.)[فار: آمد (هات) لە چاوگی آمدن (هاتن)] پێشهاتی باش، بەخت، هات، شانس.

**ئامەشۆ** (چا. مخ)[ئام3 + ئە + شۆ] بڕ: ئاموشۆ :: لە بەینی نوور و زوڵمەت ئامەشۆ سەر ناگرێ مەحوی / نیگارم بۆیە پێمی وت لە من هاتن، لە تۆ رۆیین (مەحوی ل ٢٥٢).

**ئامیار** (ئان. ل)[ئام2 + یار] [هەو] ئاواڵ، هاوڕێ، دۆست، یاریدەدەر.

**ئامیان** (نا.) بڕ: هەوێن

**ئامیب** (نا.)[فەر: Amibe] گیاندارێکی یەک خانەیە کە لە ئاوی شیرین و جێگای شێدار و ئاوی حەوز دا دەژی، چەندین جۆری هەیە کە جۆرێکیان لە ریخۆڵەی مرۆڤ دا پەیدا دەبێ و دەبێتە هۆی ئیسهالی خوێنی.

**ئامیتن** (چا.)[ئەو: میەز ـ پەھ: ئامێختەن ـ فار: ئامیختەن] تێکەڵ کردن، لێکدانی دوو شت، ئامێتە کردن // پالاوتن

**ئامیتە** (نا. مف.)[لە: ئامیتن][ئەو: ئاهیتە ـ پەھ: ئامێختەک ـ ناو: ئامیتە، ئامێتە، ئاوێتە، ئاویتە] تێکەڵ، لێکدراو. ~ **بوون:** تێکەڵاو بوون، تێکەڵ بوون. ~ **کردن:** تێکەڵاو کردن، لێکدان.

**تێبینی:** لە ئەوێستا دا ئاوەڵناوی ئاهیتە بە مانای دژوێن و چەپەڵ و پیس هاتوە یانی شتێک یا کەسێک کە پیسایی تێکەڵاوی بوە و دەگەڵ ئامیتە یەک ریشە و رەگەزیان هەیە.

**ئامیر**1 (نا.) بڕ: ئامراز

**ئامیر**2 (نا.)[عەر: امیر] ١ـ سەرۆک،

سەرکردە. ٢ـ لەقەبی بنەماڵەی شا. & ئەمیر، میر.

**ئامیربەتالیۆن** (نا. ل)[ئامیر2 + بەتالیۆن] بڕ: سەرپەل

**ئامیرهێز** (نا. ل)[ئامیر2 + هێز] کەسێک کە سەرکردایەتی هێزی پێشمەرگەی ناوچەیەکی بەدەستەوە، سەرۆک هێز.

**ئامین**[1] ( نا.)[زا] بڕ: هەوێن

**ئامین**[2] (نا.)[عەر: آمین لە عبر: امین] وشەیەکە دوای دوعا و پاڕانەوە دەکوترێ بە مانای قسەکە وەدی بێ یا دوعاکە قەبووڵ بێ.

**ئامێتە** (نا. مف.)[لە: ئامیتن] بڕ: ئامیتە

**ئامێر** (نا.) بڕ: ئامراز

**ئامێز** (نا.)[پەه: ئامێز، ئامێچ ـ باک: هامبێز، هەمبێز، هەمێز، همبێزـ ناو: ئامێز، هامێز، مێز، هەمێز] ١ـ شوێنێکە دەکەوێتە نێوان سینگ و هەر دوو دەست کە بەرەو سینگ داکێشراوە. ׃׃ مانگەشەو خۆشە مانگ لەپەڕێزێ / دۆستی جوانت بێ پڕ بە ئامێزێ (فۆلکلۆر). ٢ـ رادەیەک لە دەست کە دەکرێتەوە و شتێک بە خۆیەوە دەگرێ، بۆ هەڵگرتن. ׃׃ ئامێزێک دار بێنە، ئامێزێک گیا.& باوەش، باوش. **~ پێدا کردن:** شتێک یا کەسێک دە باوەش گرتن. **~ تێوەرهێنان:** دە باوەش کردن، ئامێز پێداکردن. ׃׃ هەرچەندی حەولی دا، وەڵاغێک لە بەر ئەوی نەکشاوە / لە سەر چەنگان رۆیی، ئامێزی دە کوڕی خۆی وەرهێناوە. (مان ل ١٣٩). **~ لەبەر وەرێنان:** دەباوەش کردن، ئامێز پێدا کردن، ئامێز تێوەرهێنان. **بە ئامێزەوە بوون:** کەسێک یا شتێک لە باوەش دا بوون. ׃׃ عەلی منداڵەکەی بە ئامێزەوە بوو و دەڕۆیشت. **دە ~ گرتن:** دە باوەش کردن.

**تێبینی:** ئامێزلە چاوگەی ئاویتن بە مانای تێکەڵاو بوون کەوتوە و لە ئامێژەن دا ئەو مانایەی هێشتا راگرتوە. لە پەهلەوی دا ئامێز و ئامێچ بە مانای تێکەڵاو لە چاوگەی ئامێختەن ـ ی پەهلەویی و میەز ـ ی ئەوێستایی هاتوە و لە فارسیش دا ئامیز هەر بەو مانایەوە لەو چاوگەیە پەیدا بوە و مانای بنەڕەتی یانی دوو کەس کە تێکەڵاوی یەکتر دەبن. (بڕ: ئامیتن)

**ئامێژە** (نا.)[بڕ: ئامێژەن] بڕ: هەوێن

**ئامێژەن** (ئان. ل)[ئامێژ + ژەن] ١ـ تێکەڵاو، ئامێتە، تەڤ لە هەڤ ٢ـ (نا.) بڕ: هەوێن. **~ کردن:** ١ـ تێکەڵاو کردنی دوو یا چەند شت دەگەڵ یەک. ⁘ ئەو خاک و گەچە دەگەڵ یەک ئامێژەن کە! ٢ـ بڕ: هەوێن کردن.

**تێبینی:** ئامێژەن لە ئامێژ + ژەن پێک هاتوە و یەکێک لە دوو پیتی ژ فەوتاوە. ئامێژ لە چاوگی میەز ـ ی ئەوێستایی و ئامیچ ـ ی پەهلەویی بە مانای تێکەڵ و ئامێتە کەوتوە و ژەن لە غەن ـ ی ئەوێستایی بە مانای لێدان کەوتوە و بە گشتی یانی تێکەڵ کردن.

**ئامێن** ( نا.)[زا] بڕ: هەوێن

**ئان**[1] (پاشـ.)[پەه: ئان] ١ـ پاشگری کۆی ناوی نەکەرە، گەل. ⁘ داران، کچان و کوڕان، شاران. دایکان ببینە و کچان بخوازە. **تێبینی:** چونکە دەست پێکەری ئەم پاشگرە پیتی بزوێنە هەر کات دواین پیت بە بزوێن تەواو بێ لە بەر ئەوە کە دوو پیتی بزوێن دەگەڵ یەک ناخوێندرێنەوە هەندێک ئاڵ و گۆڕی بە سەر دادێ. دوای بزوێنی « ئا » و « ئێ » و « ئی » و « ئۆ » پیتی « ی » دەبێتە یارمەتی دەری و لە نێوانان دا سەر هەڵدەدا. ⁘ برایان، ئاغایان، چرایان. هەرمێیان، دەرپێیان. حاجی یان، پەری یان. برۆیان، درۆیان. دوای بزوێنی « ئوو » پاشگر وەک خۆی دەمێنێتەوە و دواین بزوێن دەگۆڕێ و دەیکاتە « و » یا ئەوە کە بە دوای « ئوو» پیتی « و » دەبێتە یارمەتی دەر، بەڵام لە ڕێنووسی ئەدەبی و هەروەها وتوێژیش دا پتر بزوێنەکە دەسوون. ⁘ مێروان، مێرووان (مێروو)، سێروان، سێرووان (سێروو)، دڕوان، دڕووان (دڕوو). دوا بزوێنی « ئە » دیسان پاشگر ناگۆڕدرێ بەڵام بزوێنەکە دەقرتێنێ. ⁘ کەران (کەرە)، بەڕان (بەڕە)، ... ٢ـ بە دوای کات و زەمانەوە دەلکێ و نیشاندەری زەمانە. ⁘ بەیانان، نوێژی شێوان، ئێواران. بەهاران خۆت تەڕ مەکە، زستانان خۆت گیر مەکە (پەند). ٣ـ پاشگرە بۆ نیشان دانی شوێن و جێگا. ⁘ لەندی شێخان، قەبران، ئالان. ٤ـ پاشگرە بۆ نیشان دانی بەزم و شادی و کۆ بوونەوەی خەڵک. ⁘ خەنەبەندان، خەتنەسووران، شیرنی خۆران. ٥ـ کار و کردەوەیەک نیشان دەدا کە لە زاتی دا کۆی تێدایە بەڵام نیازی کۆی تێدا نیە. ⁘ دەچمە ماسیان. زۆر قسان مەکە! ٦ـ بە

ئـاوەڵنـاوەو دەلکێ و دەیکـاتـە نـاو. ⁙ باریکان، ئەستووران.

**ئان**[2] (ئام.)[بڕ: یا] یا، یان. ⁙ ئان تۆ بیخۆ ئان من دەیخۆم.

**ئان**[3] (ئام.) یەکێک لە پێنج ناسەی چاوگەیە. ⁙ دان، هەستان، مان، هەڵدان.

**ئان**[4] (ئام.)[بڕ: ئا14] نێوگر و نێوبژی دوو وشەی هاومانا و هاوتا. ⁙ بەرانبەر، سەرانسەر، دەوراندەور.

**ئان**[5] (نا.)[عەر: آن] زەمان، کات، دەم، زەمانێکی کورت. ⁙ خەرێکی نان خواردن بووین لەو ئانە دا لە دەرگایان دا. ئانێکی پێ نەچوو هاتەوە.

**ئاناتۆمی** (نا.)[یون: Anatome] زانستێکە کە لە سەر لەش و چلۆنایەتی ئەندامەکان و پەیوەندی نێوان ئەوان دەکۆڵێتەوە.

**ئانارشی** (نا.)[فەر: anarchie] ١ـ ئاژاوە، شێواوی. ٢ـ وڵاتێک کە شێواوە و قانوونی ڕێزی نەماوە.

**ئانارشیست** (ئان.)[فەر: anarchiste] ئاژاوەچی، ئاژاوەخواز.

**ئانارشیزم** (نا.)[یون: anarchia] لاگریی لە شێواوی و ئاژاوە ٢ـ بیر و باوەڕێکی سیاسی کە خۆشی و خۆشبەختی خەڵک لە رووخانی دەوڵەتەکان و قانوونەکانی وان دا دەبینی و بۆ ئەم مەبەستە ئاژاوەنانەوەی کردۆتە ئامانجی سەرەکی.

**ئاناناس** (گیا.)[فەر: ananas] ١ـ دارێکە کە لە ئامریکا و چەند وڵاتی ئورووپا دەڕوێ. گەڵای درێژ، گوڵەکانی هێشوویین و بە ساقەتەکەیەوە نووساوەن، بەرەکەی دریشت و ئاودار و بە تامە، هەروا دەخورێ و بۆ کەمپووت و مرەباش کەلکی لێوەردەگرن، Bro-melia ananas ناوی لاتینی ئەم دارەیە. ٢ـ میوە و بەری ئەم دارە.

**ئاناهیتا** (نا.)[ئەو: ئەناهیتە] فریشتەی ئاگاداری ئاو، ئەناهیت، ناهید. هەروەها ئەستێرەیەکە کە دەبێتە هاوتای ڤینووسی یوونانیەکان.

**تێبینی:** لە روانگەی ئاریکانەوە دوای ئاگر، ئاو لە هەموان گرینگتر بوە و بۆ ئەو فریشتەیەک قایل بوون بە ناوی ئاناهیتا. لە ئەرێدویسوور یەشت دا ناهید ژنێکی جوان، باڵا بەرزی شۆخ و شەنگ، کەمەر تەنگی مەمک قوت کە



شیـاوی پەرەسـتنە و شیـری ژنی تازە زاوان دەداو رزق و رۆزی و ماڵ و سامان بە دەست ئەوە و ... ناسـاندراوە. لە سـەردەمی پاشـایەتی مـادەکان چەندین پەرستگا بۆ ناهید ساز کراوە و یەکێک لەوان لە سـەردەمی سێهـەمین پادشـای ماد هووەخشـتەرە (٥٧٥ ـ ٦٥٢ ی بەر لە زایین) لە کـەنگاوەر سـاز کـرا کـە گـەورەترین پەرسـتگای زوو بوە و ئێستاکەش شوێنەواری هەر ماوە.

ئاناهیـتا لە [ئەن + ئاهیـتە] پێک هاتوە. ئەن پێشگرە بە مـانای نە، نا و ئاهیـتە یانی ئاویتـە، پیس، چڵکن و بە گشتی یانی نائاوێتە، خاوێن، بێگەرد.

**ئانبار** (نا.)[باک] بڕ: ئەنبار.

**ئانتـراکت** (نا.)[فـەر: entre'acte] پشـوو دانی نێـوان فـیلم و نمایش یا کۆڕی مۆسیقا کە خەڵک دەحەسێنەوە.

**ئانتـیک** (نا.)[لات: antiquus] ١ـ هەر شتێکی لە کۆنەوە مابێ، کەل و پەلی زەمانی زوو، عەتیقە. ٢ـ شتی بە بایخ و گران، عەنتیکە.

**ئانتی بیـۆتیک** (نا.)[فـەر: anti-biotique لـە یـون: anti bios] جـۆرێک دەرمانن کە بۆ چارەی هەندێک نەخۆشی کە بە هۆی باکتریەکان پێک دێ کـەلکی لێ وەردەگـرن، ئانتی بیـۆتیکەکان کە بە ناوبانگترینیـان پنی سیلینە لە قارچک و باکتری دەگرترێ و میکرۆب دەکووژن.

**ئانتـیـن** (نا.)[لات: antenna] ئامـرازێکی فلزی تایبـەتیـە بۆ گـرتن و ناردنی شـەپۆلی رادیویی، تەلەویزیون و کـەرەسـەی هەواڵنێـریی کـە بە پێی پێداویستی چووک و گەورە و بەرزە. ؛؛ ئانتێنی رادیۆ، ئانتێنی تلویزیۆن

**ئانژین** (نا.)[لات: angina] چڵک کـردنی ئاڵوو و ئاڵوو هـاتن و گـەروو ئێشەی دوای هەڵامەت کە سەر ئێشە و چەق و چۆی بە دواوەیە.

**ئانسێکلۆپێدی** (نا.)[یون] کتێبێک کە تەواوی وشەکان و زاراەکانی زانستی و ئـەدەبی زمـانێکی تێـدابێ، دایرة المعارف.

**ئانقەس** (ئاک.) بڕ: ئانقەست

**ئانقەست** (ئاک.)[عەر: عن قصد] کار و کردەوەیەک نائاسـاییی کـە بە زانینەوە بیکەی، عـەمـد، عـەمـدی، ئانقـەس، ئەنقـەس، ئەنقـەست. ؛؛ بە ئانقـەست قەندانەکەی شکاند.

**ئانکا** (ئاک.)[ئا + نکا][باک ـ زا] نووکە، هەنووکە، هەرئێستا، ئانوها، ئانۆکا، ئانها. (بڕ: نووکە)

**ئانگژا** (نا.)[؟] دەستەویەخە، گژ.
**~ بوون:** بە گـژ دا چوون، دەستەویەخە بوون. ⁙ هەر لە دوورەوە چاوی پێکەوت ئانگژای بوو. ئانگژای مەبە لێی گەڕێ با بڕوا.

**ئانگشتانە** (نا.)[زا] بڕ: ئەنگوستیلە

**ئانوها** (ئاک.)[ئا+ نوها][باک] بڕ: ئانکا.

**ئانۆفێل** (گیاند.)[فەر: anophel] مێشوولەی مالاریا، مێشوولەیەکە کە میکرۆبی مالاریا رادەگوێزێ، Anopheles maculipennis ناوی لاتینی ئەم مێشوولەیە.

**ئانۆکا** (ئاک.)[ئا + نۆکا][باک] بڕ: ئانکا

**ئانها** (ئاک.)[ئا + نها][باک] بڕ: ئانکا

**ئانە** 1 (جنا.)[بڕ: ئەو][هەو] ئیشارە بۆ دوور، ئەو، هۆو.

**ئانە** 2 (پاش.) پاشگرێکە و ئەم مەبەستانە پێک دێنێ. ١ـ پاشگرە بە ناوەوە دەلکێ و ئاوەڵکاری لێ ساز دەکا کە مانای وەک، وێنە و شێوەی ئەو شتە دەدا. ⁙ پیاوانە، ژنانە، شێرانە، کوردانە. ٢ـ بە ئاوەڵناوەوە دەلکێ و ئاوەڵکاری بە مانای وەک و بەم شێوەیە لێ ساز دەکا. ⁙ ئازایانە، ژیرانە، زانایانە. ٣ـ بە ناوەوە دەلکێ و ناوێکی تازە ساز دەکا بۆ کرێ و هەقی ئیش کە بدرێ بە کەسێک. ⁙ جێژنانە، مەعاشی مانگانە، سەرقەڵەمانە. ٤ـ بە ناوەوە دەلکێ و ناوێکی تازە ساز دەکا کە بۆ کۆمەڵێک باج کە دەرەبەگ و ئاغا وەریدەگرن دەکاردەکردرێ. ⁙ هەوارانە، گیسکانە، مڵکانە، پووشانە، بزنانە.

**تێبینی:** چونکە دەست پێکەری ئەم پاشگرە پیتی بزوێنە ئەگەر دواین پیتی وشەکەش بزوێن بێ ئاڵ و گۆڕییەکی فۆنۆتیکی بەدی دێنی کە هەر وەک تێبینی ( ئان1)ە. ⁙ هەڵۆ، هەڵۆیانە ـ برا، برایانە

**ئانە** 3 (نا.)[تور: ana][ئەر] ١ـ دایک. ٢ـ داپیر، دایەگەورە.

**ئانی** 1 (پاش.) ١ـ بە ناوەوە دەلکێ و

ئاوەڵناو ساز دەکاکە مانای وەک و شێوە دەدا، ئانە٢. :: ژنانی (پیاوی ژن خدە)، سەگانی (وەک سەگ زیرەک). ٢ـ بە ئاوەڵناوە دەلکێ و ناو ساز دەکا. :: وشکانی. ٣ـ بە ناوەوە دەلکێ و ئاوەڵناو ساز دەکا. :: شەڕانی.

**ئانی** 2 (نا.)[بڕ: هەنی2][باک] عەنی، نێوچاوان، نێوچەوان. ‖ **ئانی ڕەش:** کەسێک کە چارەی رەش بێ، عەنی رەش، بەدبەخت، چارەڕەش.

**ئانیسک** 1 (نا.)[باک: ئیسک، خیسک ـ ناو: هانیسک، ئانیسک، هەنسک، ئەنیسک، هەنیسک ـ باش: نیسک؟ ـ هەو: هەنسک] حاڵەتێکی وەک نزگەرەیە کە دوای گریانی زۆر لە بەر تێک چوونی بارودۆخی ئاسایی هەناسە تووشی ئەو کەسە دێ. ~ **دان:** تووشی ئانیسک بوون ، هەنیسک دان. :: ئەو منداڵە بەستەزمانە هێند گریاوە لە خەویش دا هەر ئانیسکان دەدا.

**ئانیسک** 2 (نا.)[ئەر] بڕ: ئانیشک

**ئانیشک** (نا.)[هیک: ئەرەتنی ـ ئەو: ئەرێثنی ـ هەخ: ئەرەشنی، ئەرشنی ـ پەه: ئەرشنێز، ئەرشنێزەک. تات: ئەرشێنیە، ئەرێشکەنجیە. باک: ئەنیشک، عەنیشک، ئێنیشک، هەنیشک ـ ناو: ئانیشک، هانیشک، ئەنیشک، هەنیشک، ئانیسک ـ هەو: هەرەژنێ، هەرەژنە، هەرێژن ـ زا: هەرچەنە] ١ـ (ئا.) بەندی نێوان زەند و باسک لەو جێیە کە دەست دەنوشتێتەوە و ئێسکەکەی دەردەپەڕێ، قنگانیسک، بەلەمرک، مرک، کوڕنیش. :: میوانی خوشکی رۆن لە ئانیشکی. ٢ـ ئەو شوێنە لە پۆشاک کە دەکەوێتە سەر ئانیشک. :: ئانیشکی چاکەت، ئانیشکی کەواکەی پینە کردبوو. ~ **تێکوتان:** لێدانی ئانیشک لە کەسێک بۆ بێدەنگ کردنی یا بۆدەربڕینی رق و تووڕەیی. ~ **چەقاندن:** داکوتانی ئانیشکی دەستێک یا هەر دوو دەست بە درێژ بوون لە سەر زەوی یا بە دانیشتن لە سەر شوێنێک بۆ لەنگەر گرتنی چەنگەی ( پتر لە حاڵی بیر کردنەوە ئەم کارە دەکەن). ئانیشک داکوتان، ئانیشک دادان، ئانیشک خستنە سەر. ~ **خستنە سەر:** بڕ: ئانیشک چەقاندن. :: ئانیشکی خستە سەر سەنیر و سەرخەوێکی بۆ شکاند. ~ **دادان:** بڕ: ئانیشک چەقاندن. ~ **داکوتان:** بڕ: ئانیشک چەقاندن.

**ئانیشکە** (نا. ل)[ئانیشک + ئە] ١ـ

لوولەیەکی تەنەکە یا لاستیکیە کە دوو لوولەی راستی دیکە لە سووچێک بە یەک دەلکێنێ. ئەم لوولەیە بە شکڵە ئانیشکی دەستە و بۆ لوولە کێشی ئاو و لوولەی کوورە لە شوێنانەی کە ڕێی لوولەکە خوار دەبێتەوەکەلکی لێوەردەگرن. ٢ـ دارێکی دوو لکە کە لە ئاش دا بەکاری دێـنن و بەرداشی پێ بەرز و نەوی دەبێتەوە و بەم چەشنە باراشەکە ورد یا درشت دەهاڕدرێ. ٣ـ ئەو شوێنەی کۆڵان کە پێچ دەخواتەوە و دەکەوێتە سەر کۆڵانێکی دیکە. ⁂ رکێفیان هێنایە و بە چوارناڵە ئانیشکەی کۆڵانیان جێ هێشت و دوور کەوتنەوە. (میرزا ل ٨٦).

**ئانین** (چا. م)[باکـ] بڕ: هێنان

**ئانێ** (پاشـ.) ١ـ بە ناوەوە دەلکێ و ناوێکی تازە بۆ کایە و یاری دروست دەکا هەر لەو ناوە، ئێن. ⁂ تۆپانێ، جگانێ. ٢ـ بۆ تەحدید بە کار دێ. ⁂ ئەوەتانێ (ئەوەتا)، هەهانێ (هەها)، هۆوەتانێ (هۆوەتا).

**ئاو**[1] (نا.)[هیک: ئاپ، ئەپ ـ ئەو: ئاپ ـ هەخ: ئاپی ـ پەه: ئاپ. فار: آب ـ پەش: ئۆبە ـ بیر: ئۆو ـ لۆر: ئۆو ـ تات: ئۆوە. باک: ئاڤ ـ ناو: ئاو ـ باش: ئاو ـ هەو: ئاوی ـ زا: ئاو، ئاوە، ئاوکە] ١ـ ئاوەکییەکی شل و بێ بۆن و تام و ڕەنگە کە بە شێوەی جۆر بە جۆر دەدیترێ، وەک کانیاو، چۆم و رووبار، دەریا و ئوقیانوس. سێ بەشی گۆی زەوی داگرتوە و یەکێک لەو مادەیانەیە کە ژیان و مان بە بوونی ئەوەوە بەندە. هەروەها یەکێک لە چوار مادەکانی (ئاو، خاک، با، ئاگر)ە. مرۆڤ هەر لە سەرەتای پەیدا بوونی لە دەور و بەری ئاو ژیاوە و جێگایەک ئاوی لێ زۆر بووبێ ئاوایی و گوندیان لێ ساز کردوە. لە شیمی دا لە دووبەش هیدرۆژێن و بەشێک ئۆکسیژن دروست بوە$H2O$. لە باری فیزیکییەوە لە پلەی گەرمای سەد دەرەجە دا دەکوڵێ و دەبێتە هەڵم و ئەم هەڵمەش لە دوایی دا دەبێتەوە بەفر، باران، گللێرە، ئاونگ، زوقم و دێتەوە زەوی . ئاو لە سیفر دەرەجە دا دەیبەستێ و دەبێتە سەهۆڵ. ٢ـ تراو و تەڕایی ئەو میوە و بەرانەی کە بۆ خواردنەوە دەست دەدەن. لەم وشانە دا ئاو بە ناوی وشەکەوە دەلکێ. ⁂ ئاوی گێزەر، ئاوی ترێ، ئاوی سێو،... ٣ـ فرمێسک، تەڕایی چاو. بەو مانایەش وشەی چاو دەبێ دەگەڵ ئاو بێ (بڕ: ئاوی چاو). ⁂ کاتی ماڵاوایی چاوی پڕ

بوو لە ئاو منیش بە خۆم نەبوو، ئاو لە چاوم هاتە خوارێ و گریام. ٤ـ ئارەقە. :: هێندەی کار کردبوو ئازای لەشی وەسەر ئاو گەڕابوو. ٥ـ ئاوەکی هەندێک کانزا بە تایبەت کانزای بە بایخ کە لە سەر کانزای کەم بایخی دەدەن وەک ئاوی زێڕ و ئاوی زێو. ٦ـ بە ناوێکەوە دەلکێ و مانای ئاوەکی بوونی یا تێکەڵاو بوونی دەگەڵ ئاو دەدا. :: سەهۆڵاو، باراناو، تاماو، ماستاو، پیازاو. ٧ـ ئاودەست، ئاودەستخانە. :: چوونە سەر ئاو، کناراو. ٨ـ (مجـ.) بریقە، شۆق. :: ئەو گەوهەرە نوکتە کە لە نالی دەدزن خەڵق/ ئاوی نیە وەک ئاگری بێ شۆقی دزانە (نالی ل ٤٨١). مەوقووفی نیگاهێکە بفەرمووو بە تەرەحوم / ژەنگاوییە ئاوی نیە ئاوێنەیی سینە (وەفایی ل ١٤٨). ٩ـ [باک: ئاڤک ـ زا: ئاوی] تۆوی نێرینەی گیانلەبەران بە تایبەت هی پیاو، ئاوی پشت. ١٠ـ ئاوەکییەک کە لە بەر نەخۆشی یا هەڵمسان لە چاو یا شوێنێکی دیکە پەیدا دەبێ. ~ **بۆ ڕژان:** (کنـ.) لە سەرەتاوە فێرە کار و کردەوەیەک بوون، ڕاهاتن. :: ئەو کوڕەم ڕۆژێ هەتا دە تەمەنی نەدەمێ ناچێتەوە فێرگە نازانم چی لێبکەم تازە ئاوێکە بۆی ڕژاوە. ~ **بۆ گەرم کردن:** ١ـ گەرم کردن و ئامادە کردنی ئاو بۆ شوشتنی مردوو. ٢ـ (کنـ.) لە مردن نزیک بوون، بە مردوو تێگەیشتن. :: جارێک کەوتوویيم گرت و لە مردن گەڕامەوە تەنانەت دەیانگوت ئاومان بۆ گەرم کردووی و کفنمان بۆ بڕیوی (تاریک و ڕوون ل ٩). ~ **بە ئاگر (ئاور) داکران:** (کنـ.) کووژانەوەی شەڕ و هەڵلا و فیتنە. ~ **بە ئاگر (ئاور) داکردن:** (کنـ.) کووژاندنەوەی شەڕ و هەڵلا. ~ **بە خۆ داکردن:** حەمام کردنی سەرەکی، دووش گرتن. :: ئاوێک بە خۆم دادەکەم و زوو دێمە دەرێ. ~ **بەردان:** ١ـ کردنەوەی ئاوی شێرە و ڕژانی ئاو لە لوولەوە. :: ئاوەکەی بەردە با ئەو گوڵانە ئاو دەم. ٢ـ بڕ: ئاو بەردانەوە. ~ **بەردانەوە:** بەردانی ئاو لە شوێنێکی کە ئاو لێی کۆ بۆتەوە بۆ شوێنێکی دیکە. بۆ ئەم کارە لە گۆل و ئەستێر یا لە لە هەر شوێنێکەوە کە ئاوی زۆر بێ جۆگەیەک دەبڕن و ئاو بەم جۆگەیە دا دێتە خوار و دەچێتە نێو کەردووکان و بەم جۆرە بێستان و باغ ئاو دەدەن، ئاو بەردان. // ئاو گرتن :: ئاوەکەی بەردابۆوە نێو کەوەرەکان و



خۆی خەریکی نان خواردن بوو. ~ **تێزان:** ١ـ زار پڕ بوون لە ئاو بە دیتنی شتی ترش یا باسی خواردنێک کە تامەزرۆی بی ٢ـ ئاڵ و بۆڵ بوونی ترێ. ٣ـ ئاو لە چاو هاتن لە بەر پیواز چاک کردن.& ئاو تێگەڕان. ~ **تێگەڕان:** بڕ: ئاو تێزان. ~ **تێوەردان:** خولاندنەوەی ئاو دە شتێکی قووڵ دا بۆ شوشتنێکی سەرەتایی. :: ئاوێکی دە زارت وەردە، ئاوی دە قاپەکان وەردا. ~ **چنین:** ئاو گرتن لە میوە و بەرێک کە ئاودارن. ~ **خواردنەوە:** ١ـ نۆشینی ئاو، نۆشین، ڤەخارن. ٢ـ (کنـ.) کارێکی زۆر سانا و هاسان. :: ئەسپ ئاژۆتن بۆ من وەک ئاو خواردنەوە وایە. ~ **خۆش کردن:** شیلەوتین کردنی ئاو، تێکەڵ کردنی ئاوی سارد و گەرم. ~ **دادان:** ١ـ هەڵمژینی ئاو، ئاو هەڵچنین. :: ئاو دایدا ژووڕێ و چ ولاتی نەهێشتین. کەوشەکەم چ کەلکی نەماوە ئاو دایدەداتە نێوەکەی. ٢ـ نەخۆشییەکە لە لاقی ولاغی بەرزە دەدا و جومگەیان هەڵدەمسێ و دەڵێی ئاوی تێدایە. ~ **داشتن:** ئاودان و دێرانی زەوی و دەغڵ و دان و باغ و باخچە، ئاو دێران. ~ **دان:** ١ـ داشتن و دێرانی زەوی و زار، تێراو کردنی گژ وگیا. ٢ـ تێراو کردنی مالاّت. ٣ـ سوور کردنەوەی ئامرازی تیژی وەک کێرد و خەنجەر و شەمشیر و کتوپڕ دە ئاو نان بۆ ئەوەی سەختتر و قایمتر بن. ٤ـ ئاو دانە دەست کەسێک. ~ **دانەوە:** ١ـ دەلاّنەوەی ئاو لە نێو هەر شتێکی ئاودار بۆ دەرەوەی خۆی. // ئاو هەڵچنین. :: دیوارەکەمان ئاو دەداتەوە، تەماتەکە ئاوی داوەتەوە و چێشتەکەی خۆش کردوە. ٢ـ تیژ کردنەوە و هێنانەوە سەر باری پێشووی دمی کولی هەندێک ئامرازی وەک پاچ، پێمەرە، بیور، تەوەرداس و ... لە ئاسنگەری، دمە زەرد کردن. ~ **دە ئاوەڕۆ کردن:** (کنـ.) لە ئەندازە تێپەڕاندن، لە رادەبەدەر خراپە کردن. ~ **دەردان:** بەتاڵ کردنی ئاوی شوێنێکی قوڵ ( حەوز و چاڵ و ...) بە دەفرێک. ~ **دە گون (گونان) گەڕان:** (کنـ.) پێکەیشتن و باڵغ بوونی کور کە توانایی و مەیلی جووت بوونی هەیە. :: شەمزین ئاوی دە گونان گەڕاو دەبێ ژنی بۆ بێنین دەنا ئابروومان دەبا. ~ **دە گیرفانی کەسێک وەردان:** (کنـ.) هەموو پوول و پارەی کەسێک وەرگرتن و گیرفان بەتاڵ کردن. ~ **دێران:** بڕ:

ئاوداشتن. ~ **زایینە دەم:** بڕ: ئاو لە دەم زان. ~ **شکان:** لا دانی ئاوی بەردراوەی کشت و کاڵ لە ڕێگەی خۆی لە بەر هەر هۆیەک. ∷ ئاوەکە لە کەمی داوە وا بزانم لە جێیەک شکاوە. ~ **شکاندن:** لادان و گوازتنەوەی ئاوی بەردراو بۆ لایەنێکی دیکە. ~ **کردن:** ١ـ لێدان و پرژاندنی هەندێک ئاو بە سەر نان یا شتی دیکە بۆ نەرم بوونەوەیان. ∷ نانەکان ئاو کە با نەرم بنەوە. ٢ـ ئاو لە چاو گەڕان و قەتیس بوونی لە بەر نەخۆشی یا هۆی دیکە. ٣ـ پەیدا بوونی زنچکاو لە کوان و برین دا. ٤ـ (کنـ.) خورد کردنەوە و فرۆشتنی کاڵای لە سەردەست ماو. ~ **کێشان:** گواستنەوەی ئاو لە سەرچاوە و رووباران بۆ ماڵان، کارێک کە ئاوکێش دەیکا. ~ **گرتن:** ١ـ بەری ئاو گرتن و کۆ کردنەوەی لە گۆل و ئەستێر دا بۆ زۆر کردنی ئاو . // ئاو بەردانەوە. ∷ کورم ئاوەکە بگرە هەتا دوایی بێستانەکە بدێرین. ٢ـ ئاودار بوون و ئاو تێگەڕانی بەر و میوە. ٣ـ کوشینی میوە بە دەزگا بۆ ئاوەکەی. ∷ ئەو سێوانە بۆ ئاو گرتن خراپ نین. ~ **گرتنەوە:** بەستنی بەری ئاوی بەردراوی سەر کشت و کاڵ یا بەستنەوەی ئاوی شێرە. ~ **لە ئاوەڕۆ بران:** (کنـ.) بڕانی جێر و بەرەکەت، لە برەو کەوتن و قازانج نەکردن. ~ **لە ئاوەڕۆ دەرکردن:** (کنـ.) لە باری ئاسایی چوونە دەری کار و ئاکار، بێ حەیایی کردن، نالەبار جوولانەوە. ~ **لەبەر دڵ ڕۆیین:** ١ـ دڵ دەخێڵەوە چوون و هێڵنج دان ٢ـ زۆر برسی بوون، دڵ دەبوورەوە چوون لە برسان. ~ **لەبەر هەڵنیشتن:** (کنـ.) میز بەخۆ داکردن، میز لەبنە خۆ کردن. ~ **لە دڵ هاتن:** (کنـ.) ئیشتا کردن و مەگیرانی کردنی ژنی زگپڕ. ~ **لە دەسکاونگ دا کوتان:** (کنـ.) لە کاری بێسوود و بێ کەلک، ئاو لە دینگا کوتان. ~ **لە دەم زان:** ١ـ زار پڕ بوون لە ئاو بە خواردن یا دیتن یا بیستنی شتی ترش. ٢ـ ئیشتا چوون لە خواردنێک. & ئاو لە دەم گەڕان، ئاو زایینە دەم. ~ **لە دەم گەڕان:** بڕ: ئاو لە دەم زان. ~ **لە دینگا کوتان:** (کنـ.) بڕ: ئاو لە دەسکاونگ دا کوتان. ~ **لێچوون:** ئاو ڕژان لە دەفرێک کە درز و کونی هەبێ. ∷ ئەو قاپە ئاوی لێدەچێ پێم وایە بنەکەی کون بوە. ~ **لێ نەخواردنەوە:** (کنـ.) خۆ نەپاراستن لە کارێک، بەرێوە



بردنی کارێک بێ یەک و دوو لێکردن. ∷ کەریم بۆ دەستەڵات وە چنگ خستن لە هیچ ناپرینگێتەوە تەنانەت پیاو کوشتنیش بێ، ئاوی لێ ناخواتەوە. ~ **نەپالاوتن:** (کنـ.) شێلگیر بوون، سوور بوون لە سەر بیر و باوەڕ. ∷ مام وسوو هێند موسڵمانە ئاوێ ناپاڵێوێ! ~ **وا رژان:** (کنـ.) هەر کار و کردەوە و مەسەلەیەک کە وەک قانوونی لێهاتبێ، وابوون، بەمجۆرە بوون، داب بوون. ∷ ئاو وا رژاوە هەر پیاو بۆ ژنان/ قەراریان بووە و هاتوونە ژوان (سەعید و میرسێوەدین ل ٤٨). ~ **هاتنەوە:** تێر بوون و راحەت بوونی پیاو ئەودەم کە تۆوەکەی دەرێژێ. ~ **هەستان:** زیاد بوونی ئاوی چۆم و رووبار و دەرچوون لە بەستێنی خۆی بە هۆی بارانەی زۆر. ~ **هەڵچنین:** ئاو کێشانە نێو خۆی هەندێک شت، ئاو هەڵمژین. ∷ ئەو دیوارە نمی هەیە پێمــوایە ئاوی هەڵچنیوە. ~ **هەڵکردن:** بەردانی ئاو بۆ سەر بێستان و زەوی بۆ داشتن، ئاو هەڵگرتن. ~ **هەڵگرتن:** بڕ: ئاو هەڵکردن. ~ **هەڵمژین:** کێشانی ئاو بۆ نێو خۆ، ئاو هەڵچنین. ~ **هەڵێنجان:** هەڵێنجان شێوەیەکە لە هەڵکێشان

بەرەو سەرەوە . دەرهێنان و هەڵکێشانی ئاو لە چاڵاو و هەر شوێنێکی قووڵ. ~ **هێنان:** ١ـ راگوێزتن و بردنی ئاو بە سەتڵ و دەفر لە کانی و چەم بۆ ماڵەوە. ٢ـ پەیدا بوونی ئاوی رەش یا سپی لە چاو. ∷ چاوم ئاوی هێناوە. ٣ـ هەڵمسان و خڕ بوونەوەی ئاو لە رەفیسکەی یەکسم دا. ~ **هێنانەوە:** خۆ رەحەت کردن بە دەست، ئاو هاتنەوە بە دەسپەڕ. ~**ی بێ لغاو خواردنەوە:** (کنـ.) ئەنجام دانی کارێک بە کەیف و ئارەزووی خۆ و گوێ نەدان بە قسەی کەس و هیچ شتێک، هیچ بۆ گرینگ نەبوون. **بوونە ~:** ١ـ تواوەی سەهۆڵ و شتی بەستوو. ٢ (کنـ.) بە خۆ داشکانەوە لە بەر ئاشکرا بوونی مەسەلەیەک، خەجاڵەت بوونەوە. ∷ کە بابم زانی درۆم دەگەڵ کردوە لە شەرمان بوومە ئاو. ٣ـ (کنـ.) شەرم کردن، خەجاڵەت کێشان. ∷ ئەو کابرا بێ شەرمە لە کن ژنان باسی سیرەتی پیاوانی دەکرد نازانم بۆ نەبوو بە ئاو. **بە ~ دادان:** (کنـ.) بەتڵاندن و فەوتاندنی پووڵ و دەسمایە و سامان، دە ئاو کردن. ∷ میراتی بابی بە مانگێک بە ئاوی دادا و بەتڵاندی. **بە ~ دا هاتن و بە نان دا**

**خـوران:** (کنـ.) لەپڕ و بێ هیچ بەڵگە بە جێ مـانێک و زۆر بـە سـەیری ون بوون. ⁙ ئەو کـڵاوە تازەم هەر ئێـستـا لە بەر چاو بـوو هەر ئاوڕم داوە نەمـابوو دەڵێی بـە ئـاو دا هـات و بە نـان دا خـــورا! **دە ~ کـردن:** (کنـ.) خـەسـار کـردن، بەتلاندن، بە ئاو دادان. **دە ~ هەلاتن:** چوونـە ژێر ئـاوی (چۆم و حــــەوز) و هاتنەوە دەر بۆ مەبەستی خۆ شوشتن یا غوسل دەر کردن یا هەر شتێکی دیکە. ⁙ کوتیان: بڕۆوە ئێـستا ئەمە دە ئاوی هەڵدێینەوە، ئێستا دەگەڕێینەوە بە دواوە (تحفە ل ٥١٢). **دە ~ هەڵکێشان:** ١ـ شتێک دە نێو ئاو نان و دەرهێنانەوە. ٢ـ شـوشـتـنەوەی و خـاوێن کردنـەوەی جلی کەفاوی و سابوون لێدراو بە ئاوی خاوێن و پاک.. ٣ـ خـــووســـــان، تـەڕ بوونـی تەواوەتی لەش لە بەر باران. **کـاری ~ هەبوون:** پیــویست بـە ئاودەسـتـخـانە هەبوون، تەنگان. **لە ~ دان:** لە چۆم و رووبـار پـەڕیـنـەوە. **لـە زۆر ~ دان و نەهێشتن ئەژنۆ تەڕ بوون:** (کنـ.) دونیا زۆر دیتن و ناسـین، بە ئەزمـوون و زۆر زیرەک و وریا بوون. **وە سـەر ~ گـەڕان:** ١ـ هەسـتـانـی ئاو لە شـوێنێک وەها کـە هەمـوو شـتـێک وە سـەر خـۆی بخـا. ٢ـ (کنـ.) زۆر ئارەقە کردن، تەڕ بوونی لەش بە ئـارەقـەیەکی زۆر. ⁙ ئازای لەشی وە سـەر ئاو گەڕاوە. ‖ **ئاوی بەقـا:** بڕ: ئاوی ژیـان. ⁙ هـات بـەهـار ئـەممـا لـە پـاش بارانـە بۆ چیـمــە کـەپەنک/ یا لـە پاش مــــردن چ ســــوودێکی هـەیە ئاوی بەقا(ئاوات ل ١٥٥). لێـوی تۆ ئاوی بەقا من خـزرم/ فــەیزی تۆ رەحـمـــەت و من سـەوزەگیـا (نالی ل ١٢٥). **ئاوی پشت:** تۆوی پیـاو، سپـەرم، شـاوەت. **ئاوی تاڵ و ســـوێر:** (کنـ.) کـــوێرەوەیری و رەنج. ***ئاوی تاڵ و ســوێر خـواردنەوە:** (کنـ.) کوێرەوەری و زەحمـەت زۆر دیتن، رەنج و مەینەت چێشتن. **ئاوی تۆبە:** ئاوێک کە لە کـاتی تۆبـە کـردن دا بە سـەر دادەکرێ. *** ئاوی تۆبە بە سەر داکردن:** تۆبە کردن و پاک بوونـەوە لە گـوناه. ⁙ قـادر ئاوی تۆبـەی بە ســەر قـەحـپــەیەک دا کـرد و هێنای. **ئاوی چاو:** ١ـ هێزی بینینی چاو، رووناکی چـاو، بینـایی، ســـۆمـــا. ٢ـ فـرمـێسک، تەڕایی چاو، ئاوی دیدە. ⁙ الحذر مـەحوی لە نەوحـەی بێ گـوناهان الحذ/ ئاوی چاوی بوو جیهانی دا بە قڕ تۆفانی نووح (مـەحوی ل ١٠٢). ***ئاوی چاو دادان:** ١ـ روون کـــردنـەوەی چاو بـە چاو لە جـوانی کـردن ٢ـ چاو ترسـێن

کردن، کەسێک لە خۆ یا مەسەلەیەک ترساندن، ئاوی چاو سەندن. * **ئاوی چاو داهاتن:** لێڵ بوونی چاو و کز بوونی هێزی بینین لە بەر پیری یان نەخۆشی، سۆمای چاو نەمان. ⁂ هێندە چاو لە رێی کورەکەی بوو ئاوی چاوی داهات. * **ئاوی چاو رۆرژان:** کوێر بوون، سۆما و بینایی چاو نەمان، بینایی چاو رژان. ⁂ دوژمن ئەگەر چاوی پێت پکەوێ، ئاوی چاوی رۆدەرژێ، دادەنیشێ بە کوێرییە (لاس و خەزاڵ ل ٩٠). * **ئاوی چاو سەندن:** ١ـ کوێر کردن و لێڵ کردنێکی تایبەتی بێ ئەوەی کە چاو ناشیرین بێ و پێشتر لۆتی کە ورچیان هەڵدەپەراند وایان لە ورچ دەکرد هەتا رانەکا و پەلاماری کەس نەدا. ٢ـ ترساندن، تۆقاندن، زراو بردن، ئاوی چاو دادان/٢. **ئاوی حەیات:** ١ـ بڕ: ئاوی ژیان. ⁂ خزر ئەگەر چاوی حەیاتی برییە ئاوی حەیات/ من لە خاکی دەری جانانەمە چاوی حەیات (مەحوی ل ٦٣). هەموو عومری ئەبەد تێیدا نیە خۆشی دەمێک مەستی/ خدر ئاوی حەیاتی بۆچ بوو فێری شەرابی با (تاریک و روون ل ١٣٩). ٢ـ (کنـ.) شتی زۆر باش. ⁂ رۆنێکە تای نیە دەڵێی ئاوی حەیاتە. **ئاوی حەیوان:** بڕ: ئاوی ژیان. ⁂ ئیشارەی یەک سەر ئەنگوشتی، مەهی لەو دوورەوە شەق کرد/ هەر ئەو ئەنگوشتە بوو دەتوت فەوارەی ئاوی حەیوانە (مەحوی ل ٣٩). **ئاوی خزر:** بڕ: ئاوی ژیان. ⁂ سیاپۆشن لە داخی خەت و خاڵ و لێو و روو و زوڵفت/ وەنەوشە و میسکی چین و ئاوی خزر و لالە و عەنبەر (مەحوی ل ١٣١). زوڵمەت نەدیدە چونکە گەیشتی بە ئاوی خزر/ تۆ نامریت و عالەم ئەکا یەک بە یەک وەفات (بێخود ل ٩٨). **ئاوی خواردنەوە:** ئاوێک کە خاوێن بێ و بکرێ بیخۆیەوە. **ئاوی خەزایی:** ئەو ساڵانەی کە کوللە زۆر دەبن و شالاو دەبەنە سەر دەغڵ و دان لەو شوێنەی کە خەزایی زۆرە کەسێک کە ئارەقی نەخواردبێتەوە و زینای نەکردبێ و بە قەولی کوردیی دۆخینی بە حەرام نەکردبێتەوە، دەچێ ئاو لە کانی دێنێ و بە دەغڵ و دانەکەی دادەکەن و لە سەر ئەم بڕوایەن کە خەزایی بە شوێن ئەو ئاوە دا دێ و کوللەکان دەخوا، جگە لەوانە ئەو کەسەی کە ئاو لەو کانیاو تایبەتییە دێنێ نابێ ئاوڕ داتەوە دەنا خەزاییەکان بە شوێنی دا نایەن، ئاوی عەینەمەل. ⁂ کوللەت کەوتە ناو

شـینایی/ بۆی بێنە ئاوی خـەزایی (بۆ کوردستـان ل ٨٠). **ئاوی دەم:** لیک، تف، ئـاوی زار. **ئـاوی دیـدە:** ئـاوی چـاو، فرمێسک. ‌‌:: مەگەر هەر یاری نەقشینم ببێتـە نەقشبـەندی دڵ/ کـە نـەقشی غەیری رەنگی ئەو بـە ئاوی دیدە شۆرابێ (نـالی ل ٦٠٠). نەمـــامی قـــامـــەتی پـەروەردەی ئـاوی دیـدەکــــەی مـن بـوو/ کـەچی گـوڵچـینی بـاغی وەسـڵـی ئەو ئێستـاکە ئەغیـارە (مـەحـوی ل ٤٦٣). **ئاوی رەش:** مـاکـەی نەخـۆشییـەکە کە لە چاو دەدا و چاو کوێر دەکا (ئین: glau-coma). ***ئـاوی رەش داهـاتـن:** ئـاوی رەش لە چـاو پەیدا بوون و کــوێر بوون. **ئـاوی زار:** تـف، لـیـک، ئـاوی دەم. **ئـاوی زەمزەم:** ئاوێکە حاجی لە چاڵاوی زمزم لە مـەککەوە بـۆ مـتـفـەڕک دەگـەڵ خـۆیان دەیهـێنن. :: بێت و گـەر دەسـتـم کـەوێ ماچی دەمی تۆ چاوەکەم/ رووڕەشم گەر تەرکی ئـاوی زەمـزەم و کـەوسـەر نەکـەم (ئەحمـەد موختـار ل ٨٥). **ئاوی ژیان:** ١ـ ئاوی کانییـەکی ئەفسـانەیی و خـەیاڵییـە (کـانی حـەیات) لە نـاوچەیـەکی تاریکی دونیـــا هـەڵکەوتوە و هـەر کــــەس لێی بخواتەوە نامرێ و گۆیا خدری پێغەمبەر لەم ئاوەی خواردۆتەوە و بۆیە پێی دەڵێن خـــدری زینـدە، ئاوی حـــەیات، ئاوی حـەیوان، ئـاوی بەقـا، ئـاوی خـزر، ئاوی ژین. :: گەر زەمزەمی یان دای بنێ ئاوی ژیانـی/ ناچاری دەبێ رۆچی بە سـینەی خـاکـا (خـەییـام ل ٤). ٢ـ (کنـ.) زار و دەمی یار و گـراوی. **ئاوی ژین:** بڕ: ئاوی ژیان. **ئاوی سـپی:** بڕ: ئـاوی مـرواری. **ئاوی شەوێ:** ئاوێکی کـە لە گۆزە دەکرێ و بۆ شـەو دادەندرێ هەتا سـارد بێ. :: بۆ ئـاوی شـەوێ گـۆزە شکاوێک لامـە / فـرمـێسکی وشک نابنەوە بێ ئارامـە (خەییـام ل ٧٠). *** خـۆ لە ئاوی شـەوێ پاراستن:** مـحافـزەکـار، کـەسێک کە خـۆی لە هـەر شـتێکی ساویلکەش دەپارێزێ، لە ئاوی شـــەوێ پارێز کـردن. **تێـبــینی:** موسـڵمانێک کە نەوسی خۆی کوشـتوە و هـەر خـــەریکی نـوێژ و رۆژوو و تـاعـــەتە، شـەوانە کە تینووی دەبێ و نەوس داوای ئـاوی ســـاردی لـێ دەکـــا ئاوی گـــۆزە ناخـواتـەوە هـەتا نەوسـی بکووژێ. *** لە ئاوی شـەوێ پارێز کـردن:** بڕ: خـۆ لە ئاوی شـــەوێ پـاراستن. :: کـوتیـان: نـا؛ مـام رێـوی تـۆبـەی کــــردووە؛ هـەمـــوو رۆژێ بەڕۆژووە، لە ئاوی شـەوێ پارێزێ دەکـا، دەچێــتـــە حـــەجێ (مـــان ل ٧). **ئاوی عـــەینەمـــەل:** بڕ: ئـاوی خــــەزایی. **ئاوی**

**کـەوسـەر:** ئاوی حـەوزی کـەوسـەر لە بەهەشت. ‌‌‌ئاوی کـەوسـەر نۆشی سۆفی بێ کە من / ئاوی ئینسان یەعنی مـاچی دەم دەخـۆم (نالی ل ٢٩٧) ئەو فرمێسکە هێندێک بڵێن: بە قیمەت گرانە، ئەتڵەسە، گەوهەرە/ بە ئارەقی سینگی بڵێن: خێر ئەوە ئاوی کەوسەرە (لاس و خـەزاڵ ل ٥٧). **ئاوی مـرواری:** نەخـۆشـیـیـەکی چاوە کـە پتـر لـە بەر تەمەنی زۆر و پیری یا بە هۆی مـەرەزی قـەند یا ئازار بینینی چاو پەیدا دەبێ. عـەدەسی گلێنەی چاو تار دەبێ و بەری سۆمای چاو دەگرێ و تەنانەت کوێریش دەکا. ئاومرواری رەق و نەرمی هەیە کە ئاومـرواری رەق پتـر لە پیـری دا سـەر هەڵدەدا بەڵام ئاومـرواری نەرم لە هەر تەمەنێک دا دەتوانێ ببێ. ناوی عیلمی ئەم نەخۆشییە cataracte یە. & ئاوی سپی، ئاومرواری.

**ئاو**[2] (ئام.)[بڕ: ئا14] دوو ناو یا دوو ئاوەڵناوی دوویات کراوە تێک دەکاتەوە و ئاوەڵناوێکی نوێ سـاز دەکـا. ‌‌‌ شەواوشەو، دەستاودەست، پشتاوپشت، دووراودوور، رەنگاورەنگ.

**ئاو**[3] (پێشـ.)[هیک: سەم ـ ئەو: هەم، هەمـە ـ هەخ: هەم، هەمـە ـ پەه: هەم. باک: هاڤ، هەڤ ـ ناو: ئام، ئاو، ئاف، هاو، هام، هەم، هەو، ئەو ـ باش: هاو ـ هەو: هام ـ زا: ئام، ئەم، هەم] پێشگرێکە کە لە پێشـەوەی وشـە دا دێ و مـانای شـەریک بوون و بەیەکەوە بوون دەدا. ‌‌‌ ئاودەنگی، ئاوماڵ، ئاوسا.

**ئـاو**[4] (ئـام.) بـە رەگـی چـاوگـی نادیارەوە(مصدر مجهول) دەلکێ و ناوی مـفـعوول سـاز دەکـا. دڕاو (دڕان ـ دڕ)، خوراو، براو، شکاو، نەماو.

**ئاوا**[1] (ئان.)[پەه: ئاپات ـ باک: ئاڤا ـ ناو: ئـاوا ـ باش: ئـاوا ـ هـەو: ئـاوا] ١ـ ئاوەدان. ٢ـ بە دوای ناوی شـار و گـوند (بە تـایبـەت ناوی ئەو کـەسـانـە کـە ئەم شـوێنانەیان بنیات ناوە) دەلکێ، ئابات، ئاوێ. ‌‌‌ هـەمـزاوا، مـەجـبـووراوا، کـەریماوا، سـەیداوا. **~ بوون:** بڕ: ئاوەدان بوون. ‌‌‌ بە یـادی دڵبـەری سـەوداگـەرم وێرانە ئاوا بوو / هـەمـوو بازاڕ و شاری دڵ کەوا بێشەوق و سەودا بوو (ئاوات ل ٢٤). رەببی مـاڵتـان هەر ئاوا بێ و سـفـرەتان رەنگین! **~ بوونـەوە:** بـڕ: ئـاوەدان بـوونـەوە. **~ کردن:** بڕ: ئاوەدان کردن. **~ کردنەوە:** بڕ: ئاوەدان کردنەوە.

**ئـــاوا**[2] (ئـاک. ل)[ئــا + وا] ١ـ بــەم جۆرە، بەم شێوەیە. ‌‌:: جا قسـە کردن ئــاوا دەبــێ، نــابــێ ئــاوا بــێ. ٢ـ بــۆ ســــەرســــوڕمــــان یـا بـە دڵ نەبـوونـی مــەبەسـتـێک دەکـوترێ. :: کـە ئاوا یانی ئاغـا نـایە!؟ & ئاوهـا، ئاوەهـا، وەهـا، وا، ئەهوا، ئەها، پاسە.

**ئاوا**[3] (ئان.)[باک: ئاڤـا ـ نـاو: ئاوا ـ بــاش: ئــاوا ـ هــەو: ئــاوا] ون، نــادیــار، ئاودیو. :: رۆژاوا. **~ بوون:** ١ـ پەڕین و لـەبـەر چاو نـەمــــان یا چوونـە پشت کـێـوانی خـۆرەتاو و مــانگ و هـەسـێـرە، پـەڕیـن. // هـەڵاتـن. :: بـە ئـاوا بـوونـی نوری ون دەبێ خـورشـید و ئەم شـەمسـە / لە ئـاوا بوونیـا نوور و ئـیـزائەی سـەد دوو چەندانە (مــەحــوی ل ٤٣٧). ٢ـ ون بوون و لەبەر چاو نەمانی گیاندار کە بۆ پشــتـی بـەرزایی یـەک شـــۆڕ دەبـنـەوە، ئاودیو بوون. :: هـەر لـەو گـردە ئـاوا بین دەگـەینە رەشمـاڵان. ئاسکەکە ئاوا بوو و خۆی دەرباز کرد. ٣ـ لە هەندێک ناوچەی کوردسـتـان بۆ مردنی کەسـی ناموسڵمان بە کــاری دەبـەن، مــردن. :: خـدرە جــوو دوێنێ ئاوا بوو.

**ئاوات** (نا.)[ســان: ئـاکــووتە ـ پـەهـ: ئـایـەفت. نـاو: ئاوات ـ هـەو: ئـاوات] کــاو، ئارەزوو. **~ بردنە بن (ژێر) گڵ:** مردن و بـە ئـارەزوو نـەگــــــەیشـتن. :: زۆرم پێـخـۆشـە زەمـاوەندی کـوڕەکـەم ببـینم، دەترسم ئـەو ئاواتـەم بـەرمـــە بن گڵ. **بە ~ خــــــواسـتن:** بـە ئـارەزوو بـوونـی مـــەبـەســــتـــێک، بە ئاواتەوە بـوون. :: دەیگـوت: بە ئـاواتم خــواســتــبــوو ئـەتۆ دەمـدەیـەی خـەبـەری مـردنی مـەرزینگانە! (شـۆڕەمەحـموود ل ٨٨). **بە ~ گەیشتن (گەیین):** بە مرازی و کاوی خۆ گەیشتن، ئـاوات پـێک هـاتـن. **بە ئـاواتـەوە بـوون:** ئـاواتـەخــــــواز بـوون بـۆ وەدی هـاتـنـی ئارەزوو. :: بە ئاواتەوە بوو بۆ جارێکیش بێ سواری فڕۆکە بێ. **~ پێک هاتن:** بڕ: بە ئاوات گەیشتن.

**ئاواتەخــواز** (نا. فــا، ئان. فـــا)[لە: ئاوات خـواسـتن] ١ـ کـەسـێک کـە زۆر بە تـاســــەی شــــتــــێکەوە بـێ و بە ئـاوات بیخوازێ، تاسـەدار. :: ئاواتەخوازی نان و کەبابێکی خۆشم. ٢ـ ئارەزوو کردن بۆ چارەی کـاری کەسـێک. :: ئاواتەخـوازم بە ژن و منداڵت بگەیەوە.

**ئاواتەخواستە** (نا. مف.، ئان. مف.) [لە: ئاوات خـواسـتن] ١ـ شـتـێک، کارێک یا هەر چی کە بە ئاوات خواسترابێ. ٢ـ (کنـ.) کـەسـی زۆر خۆشـەویت بە تایبـەت

منداڵ کە بە ئاوات خواسترابێ. ؛؛ عەلی ئاواتەخواستەی دایک و بابیەتی.

**ئـاوار** (نـا. ل)[ئـاو + ئـار 1 ][بـاک] خواردنێکی شیرنە لە ئاو و ئارد و شەکر یا دۆشاو، هەڵوا.

**تێبینی:** هەرچەند وشەکە نیشان دەدا کە دەبێ لە ئاو و ئارد پێک هاتبێ بەڵام وای بۆ دەچم (وائار) بوە و لە دوایی لەبەر قورسی وائار بۆتە ئاوار، چونکە لە زاراوەی باکووریی دا بە ئاو دەڵێن ئاڤ یانی وشەکە دەبا ئاڤار، با. وا بە مانای خواردنە و لە هەندێک وشەی دیکە دا ماوە (شۆروا، ماستاوا...) و ماناکەی دەبێتە خواردن یا چێشتی ئارد.

**ئاوارتـن** (چا. م)[؟][باک: ئـاوارتن ـ ناو: هەڵاوارتن] ١ـ جوێ کردنەوە و دەر هاویشتنی بەشێکی کەم لە کۆ و کۆمایەک، هەڵاوارتن، جوێ کردنەوە. ٢ـ جوێ کردنەوە و هەڵبژاردنی شتێک یا کەسێکی تایبەتی لە نێو کۆمەڵ و کۆمایەک.

**ئاوارتە** (ئان. مـف.)[لە ئاوارتن] ١ـ جوێ کراوە، دەرهاویشتراو، وەلانراو. ٢ـ تایبەتی، مستثنی.

**ئاوارە** (ئان.)[لە: ئاوارتن] ١ـ کەسێک کە لە شوێنی ژیانی خۆی دوور کەوتبێتەوە. ٢ـ کەسێک کە لە شوێنی ژیانی خۆی دەرکرابێ. ٣ـ هەڵاتوو، راکردوو. ٤ـ ون، بێ ناو و نیشان. ٥ـ هەڵوەدا، سەرگەردان، دەبەدەر، تەرە، تەرا، تار، رەهەندە. ~ **بوون:** ١ـ دەربەدەر بوون، لە ماڵ و حاڵی خۆ هەڵبڕان، هەڵوەدا بوون. ٢ـ دەرکران. ٣ـ سەرگەردان بوون. ~ **کردن:** ١ـ دەربەدەر کردن، کەسێک یا گیاندارێک لە ماڵ و لانی خۆ دوور کردنەوە. ٢ـ دەرکردن، وەدەرنان.

**ئـاوارەیـی** (حـم.)[ئـاوارە + یـی] دەربەدەریی، هەڵوەدایی، سەرگەردانیی.

**ئاواز** (نا.)[پەه: ئـاواز] ١ـ دەنگی خۆش و بە ئاهەنگی باڵندە، نەغمە. ٢ـ گۆرانی، ستران. ٣ـ دەنگی ئامرازی مۆسیقا، هەوا، ئاهەنگ. ٤ـ دەنگی خۆشی خشڵ و کەرەسەی دیکە. ؛؛ ئاوازت نایە لە کرمەک و گوارە/... خرینگەت نایە لە قەتارە (لاس و خەزاڵ ل ٥٨). ٥ـ دەنگی تێپەڕین و دەرچوونی تیر، هازە، هازەهازی تیر. ؛؛ ئاوازی تیر و شەققەی هانیشک و دەنگی سمی ولاغ وا دەبۆوە بڵاوە/ هەندێک دەیانپرسی: عاسمان رووخا یان ئاوە،

سێڵاوه (لاس و خەزاڵ ل ٥٥).

**تێبینی:** ئاواز لە ریشەی ڤەچ vač یا ڤەک vak- ی ئەوێستا بە مانای وتن و کوتن کەوتوە. (بڕ: بێژتن2) لە کوردیی دا هەر لەم ریشەن: وشە، وێژ، بێژ، راوێژ، لاوک، لاوژە، هەوا...

**ئاوازە** (نا.)[ئاواز + ە] ١- دەنگ دەر کردنی ناو، ناوبانگ. ꞉꞉ ئاوازەش بەرز بێ جە گەردین شاران / بڵند کەردە بێ نام نامداران (وەلی دێوانە ل ٩٥). ٢- دەنگ، ئاهەنگ. ꞉꞉ سەعید ئەگەر دەرۆیی، وەک شەهێن و تەڕلانی/ وچانی بە ولاغ نەدا هەتا کەوتە بەیانی/ ئاوازەی زەنگوڵان دێ، دەگەیشتە یەک کاروانی (سەعید و میرسێوەدین ل ٧١). ٣- کوتە چەرمێکی چووکە لە کەوانی جۆڵایی دا کە ژێی دەکەوێتە سەر بۆ ئەوەی کە لۆکە لێی گیر نەبێ.

**ئاوازەخوان** (نا. فا، ئان. ل)[ئاواز + ە + خوان2] کەسێک کە گۆرانی و ئاواز دەڵێ، گۆرانی بێژ، خۆشخوان، ستران بێژ، ئاوازەخوێن، گۆرانیچڕ.

**ئاوازەخوێن** (نا. فا)[ئاواز + ە + خوێن2] بڕ: ئاوازەخوان.

**ئاواژوو** (ئان. مف.) بڕ: ئاوەژوو

**ئاواژی** (ئان. مف.)[باک] بڕ: ئاوەژوو

**ئاواق** (ئان.)[؟][ئەر] شوێنی چۆڵ، چۆلگە، چۆل و هۆل، بەتاڵ.

**ئاواڵ** (نا. ل)[ئاو3 + ئاڵ][پاز: هەم ئەیار. پەه: هەماڵ، هەماهل. باک: هەڤال - ناو: ئاواڵ، ئاوەڵ، هەواڵ، هاواڵ - زا: هەڤال] ١- دۆست، هاوڕێ، رەفیق لە نێو مرۆڤ دا. ٢- دۆست و پێکەوە بوون لە نێو گیانداران دا. ꞉꞉ کۆتر قەت نەبۆتە ئاواڵی سەقری/ سەقر دڕندەیە، خاترجەم بە کۆتری دەگرێ (سەعید و میرسێوەدین ل ٢٣٢) ٣- ناسیاو و دۆست لە بەر هۆیەک وەک پێکەوە خوێندن یا کار کردن. ꞉꞉ ئاواڵ دەرس، ئاواڵکار، ئاواڵ زاوا. ٤- هاوتا، چەشن، مینا، وەک. ꞉꞉ ئاواڵکراس.

**تێبینی:** هەندێک لە زمانەوانانی کورد ئاواڵیان بردۆتەوە سەر (ئاو + ئاڵ) و ئاویان بردۆتەوە سەر پێشگری ئاو3 بە مانای هاوبەشی و ئاڵیان بە مانای لا (طرف) داناوە. (بڕ: قامووس ل ٧٩) و (گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد بەرگی شەشەم ل ٣٨٠ کە دیارە هەر بۆچوونی زەبیحی یە و لەویان وەرگرتوە). بە بڕوای من تەنیا نیوەی ئەم بۆچوونە



راستە و بەشی دووهەم لە سەر ئاڵ تەنیا بۆچوونێکی رواڵەتییە. ئاڵ دەچێتەوە سەر وشەی یار و بە لەبەر چاو گرتنی ئەم وشەیە لە پازەند دا (هەم ئەیار)، ئاڵ و گۆڕی بە سەر پیتی ر دا هاتوە و بۆتە ڵ یا ل بەو پێیە وشەکە دەبێتە ئاویار کە ئاڵ و گۆڕی بە سەر دا هاتوە و بۆتە ئاواڵ و هەڤاڵ و ... و ماناکەشی یانی هاوبەش لە دۆستایەتی دا.

**ئاواڵایەتی** (حم.)[ئاواڵ + ئایەتی] دۆستایەتی، هاورێی و بەین و نێوانی دەستەبرا و دەستەخوشک. دۆستایەتی، هەڤالتی، هەڤالی، ئاواڵەتی. :: هەتا دەمێنین ئاواڵایەتیمان تێک ناچێ.

**ئاواڵ دوانە** (ئان. ل)[ئاواڵ + دوانە] دوو کوڕ یا دوو کچ کە هاوکات و دەگەڵ یەک لە یەک دەبن، دوانە، جمک، لفەدوانە. :: گوتیان: قوربان ئێمە هەردووکمان ئاواڵ دوانەین. ئاواڵ دوانەش بە شەرعی خودا و پێغەمبەر دوو نەفەر بە یەک نەفەر حیسابە. (بەیتی سەعید و میر سێوەدین بەگ - سروە ژ ٧٥)

**ئاواڵ دەرس** (ئان. ل)[ئاواڵ + دەرس] پەیوەندی نێوان کەسانێک کە بە یەکەوە لە شوێنێک دەرس دەخوێن، هاوکلاس. :: ئیجازەم بدە بۆ نێو رەفیق و ئاواڵدەرس و متمانە/ چومکە سەفەرەکەمان گەورە و گرانە (مێر و وەفا ل ٧٠).

**ئاواڵ زاوا** (ئان. ل)[ئاواڵ + زاوا] پەیوەندی نێوان دوو پیاو کە ژنەکانیان خوشک بن، ئاوەڵ زاوا، هاوزاوا، هەڤ لنگ، هەمزەما، براکە.

**ئاواڵ شوان** (نا. ل)[ ئاواڵ + شوان] یاریدەدەری شوان بۆ ئاگاداری و لەوەڕاندنی مەڕ و ماڵات کاتێک کە ئاژەڵ زۆرن و بە تاکە کەسێک هەڵناسوورێ. :: قەر نانی خوارد و هەڵستا؛ بەرخی وەرگێڕا، چووە دەشتێ. بە بەند بە ئاواڵ شوانانی گوت (مان ل ٢٥٩).

**ئاواڵ کراس** (نا. ل)[ئاواڵ + کراس] دەرپێی ژنانە، دەلینگ.

**ئاواڵ منداڵ** (ئا.)[ئاواڵ + منداڵ] کیسەیەکە لە نێو پزدانی ژنی زگپڕ کە بە بەندی ناوکەوە پەیوەندی دەگەڵ منداڵ هەیە و ئۆکسیژن و خۆراکی بۆ دەبا و شتی زێدە وەردەگرێ، ئەم پەردەیە پاش هاتنە دەری منداڵ دێتە دەرێ، ئاوەڵ/٢، هەڤالۆک، هژی، پلار. (لات: placenta)

**ئاواڵە** (ئان.)[؟][ناو: ئاوەڵا، ئاواڵە، ئاوەڵە، وارا، والا ـ زا: ئارێزە] ١ـ حاڵی شتێک کە کراوەتەوە. // داخراو. ⁂ پەنجەرەی ئاواڵە، بەرۆکی ئاواڵە. ٢ـ رەنگی روون، ئاچغ. ⁂ ئەو پارچە هەندێک ئاواڵەتر با بۆ کراس زۆر جوان دەبوو. ٣ـ برینێک کە سەرەکەی قرتماغەی نەگرتبێ؟ ~ **بوون:** ١ـ هەر چی کە کرابێتەوە و دانەخرابێ. ⁂ وەختایەک خەوت لێکەوتبوو زاری ئاواڵەبوو. هەموو دەرگاکانی ماڵێ ئاواڵەن. ٢ـ روون بوون و کراوە بوونی رەنگ. ~ **کردن:** کردنەوە و دانەخستن. ⁂ بەو سەرمایە یەخەی ئاواڵە کردبوو. ئەگەر رۆیشتی دەرگاکەی ئاواڵە کە! ~ **هێشتنەوە:** کردنەوە و دانەخستن. ⁂ پەنجەرەکان بکەوە و ئاواڵەیان بێڵەوە با بایەکمان وێکەوێ.

**ئاواڵەتی** (حم.)[ئاواڵ + ئەتی] بڕ: ئاوالایەتی

**ئاوان**[1] (ئان.)[هەو ـ ئەر] بڕ: ئاوەدان

**ئاوان**[2] (نا.) بڕ: ئاونگ2

**ئاوان**[3] (نا.)[ئەر] بڕ: ئامان1

**ئاوان**[4] (نا. ل)[ئاو1 + ئان] ئەو حەقەی ئاشەوان لەبری هارینی دانەوێڵە لە ئاشێری دەستێنێ، ئاواناش، مزاش.

**ئاواناش** (نا. ل)[ئاوان4 + ئاش] بڕ: ئاوان4

**ئاوانتە** (نا. چا)[تور: avanta لە ئیتا: avanta] ١ـ وەدەست خستن و دەست بە سەر داگرتنی شتێک بە فڕ و فێڵ. ٢ـ خۆڕایی، مفتە، بەلاش.

**ئاوانتەچی** (نا. فا)[ئاوانتە + چی] ١ـ کەسێکی کە بە فڕ و فێڵ و کەڵەک دەست بە سەر ماڵی خەڵک دابگرێ، دەسبڕ، مفتەخۆر. ٢ـ (ئان. فا) حاڵی کەسی دەسبڕ و خاپێنەر و فێڵەزان.

**ئاوانس** (نا.)[فەر: avance] ١ـ مۆڵەت، مەودایەکی دیکە لە کایە دا هەتا کەسێک بتوانی جارێکی دیکە شانسی خۆی بە تاقی کاتەوە، قان. ٢ـ پێشەکی دان، وە پێش خۆ دانی کەسێک لە یاری دا. ⁂ وەرە تەختەی بکەین دوو ئاوانسیشت دەدەمێ. (یانی تۆ دوو و من هیچ).

**ئاوانە** (نا. ل)[ئاو1 + ئانە2] ئەو باج و حەقەی کە بابەتی ئاو دەستێندرێ یا دەدرێ، حەقی کرێ و کەلک وەرگرتن لە ئاو.

**ئاوانی** (نا. ل)[ئاوان1 + ئی][ئەر]



بڕ: ئاوەدانی

**ئاواهی** (نا. ل)[ئاوا1 + هی][باک]
بڕ: ئاوایی

**ئاوایی** (نا. ل)[ئاوا1 + ئی][ئەو: ئایەپتە، ئەیەپتە ـ پەه: ئاپاتییە. باک: ئاڤاهی، ئاواهی ـ ناو: ئاوایی ـ باش: ئاوایی] ئەو شوێنەی ئاوەدان کراوەتەوە، گوند، دێ، دێهات، لادێ، دەگا.

**ئاوبارە**[1] (نا. ل)[ئاو1 + بار (بەر7) + ئە] پلووسکێکی گەورەیە لە دار یا تەنەکە کە لە بێستان و مووچە و مەزرا کەلکی لێوەردەگرن و ئاو لە شوێنی بڵندەوە بۆ شوێنی نزم دەبا و زەوی پێ دەدێرن، قەمتەرە.

**ئاوبارە**[2] (نا. ل)[ئاو1 + بارە3] شیرەی گوڵ کە هەنگ دەیمژێ و دەیکاتە هەنگوین.

**ئاوباز** (نا. ل، نا. فا)[ئاو1 + باز4] کەسێک کە مەلە باش دەزانێ، مەلەوان.

**ئاوبردە** (نا. مف.)[لە: ئاو بردن] ١ـ هەر شتێک کە ئاو بیبا. ٢ـ (کن.) خەسار، بە فیڕۆ چوونی شتێک. ⁂ مەکەن لۆمەی من و کەزیەی بڵاوی / کە ئاوبردەی جوانی و ئاڵ و واڵاین (ئاوات ل ٩٣).

**ئاوبڕ** (نا. ل)[ئاو1 + بڕ (بڕین)] ١ـ دەرد و ئازارێکە لە خواردنەوەی ئاوی سارد بە تایبەت زستانانە تووشی ماڵات دەبێ. ٢ـ ئەو شوێنە لە چۆم یا جۆگەی گەورە کە جۆگەیەکی چووکی لێ جیا دەکەنەوە و لەوێوە ئاو بەردەدەنەوە.
**~ بوون:** تووشی نەخۆشی ئاوبڕ هاتن.

**ئاوبەر** (نا. ل)[ئاو1 + بەر7] بڕ: ئاوکێش

**ئاوبەرە** (نا. ل)[ئاو1 + بەر7 + ئە] جۆرە هەنگێکی کارگەرە کە ئیشی بردنی ئاو بۆ شەڵخەیە.

**تێبینی:** ئەو بەشەی هەنگ کە لە شوێنی خۆی وەڕێ دەکەوێ ئەوەندە بەرز دەبێتەوە کە کۆمەڵگای خۆیانی لێ نەدیو نەبێ، جا هەر بەو بەرزە فڕێی را لادێیی کورد دەیناسن و لە هاتوچۆ کردنی دا کۆمەڵگای هەنگی کێوی پێ دەدۆزنەوە. (قامووس ب ١ ل ٨٢)

**ئاوبەند** (نا. ل)[ئاو1 + بەند] ١ـ بەرهەڵستێکە لە بەرد و دار و شتی دیکە کە لە پێش ئاوی چۆم یا جۆگەی گەورەی هەڵیدەبەستن هەتا ئاو لە پشتی پەنگ بخواتەوە، ئەم کارەی بۆ چەند مەبەستە:

بۆ بەرگری لە سێلاو، بۆ ئاو داشتن و هەروەها بە شێوەیەکی گەورەتر بۆ بەرهەم هێنانی بەرق و کارەبا، بەند، بەنگە، سەد. ٢ـ نەخۆشییەکە لە بەر کۆ بوونەوەی ئاو و تەڕاوی زۆر لە ورگی مرۆڤ دا پێک دێ و زگ هەڵدەمسێ. نەخۆش هەر چی ئاو دەخواتەوە تینوایەتی ناشکی و هەر داوای ئاو دەکاتەوە، ئیسقایی.

**ئاوبەندیی** (حم، نا. ل)[ئاو1 + بەند + ئیی] ١ـ بەستنی بەری ئاو. ٢ـ کاری میزان کردن و هێنانە سەر فۆڕمی ماتۆری ماشێنی تازەساز. **~ کردن:** ئارام لێخورینی ماشێنی تازەساز هەتا ماتۆڕەکەی فۆڕم بگرێ.

**ئاوپاچ** (نا. ل)[ئاو1 + پاچ] بڕ: ئاوپاش

**ئاوپاش** (نا. ل)[ئاو1 + پاش2] دەفرێکە وەک ئافتاوە زوو لە تەنەکە ساز دەکرا و ئێستاکە پتر پلاستیکە. لە ئافتاوە گەورەترە و ئەو شوێنەی کە ئاوی پێدا دێتە دەرێ وەک دووشی حەمام وایە و بۆ ئاو داشتنی گوڵ و باخچە یا ئاو پرژێن کردنی حەوش و بەردەرک کەلکی لێوەردەگرن، ئاوپاچ، ئاوپژێن، ئاوپرژێن، ئاورشێن.

**ئاوپاشیی** (حم.)[ئاوپاش + ئیی] بڕ: ئاوپرژێن/٢. **~ کردن:** بڕ: ئاوپرژێن کردن. ❊ مەنزڵگەی دیدەم ئاوپاشی کەردەن/ چەشمەنداز بەرز بێ تۆز و گەردەن (مەولەوی ل ٤٠٠).

**ئاوپاڵ** (نا. ل)[ئاو1 + پاڵ (پالاوتن)] ١ـ دەفرێکە پتر لە فافۆن یا پلاستیک ساز دەکرێ، بن و دەورووبەری کون کونە و ئەو چێشتانەی کە ئاوی زێدەیان هەیە یا سەوزی خواردن دوای شوشتنەوە لەم دەفرەی دەکەن هەتا ئاوەکەی بچۆڕێتەوە، سووزمە. ٢ـ مەلاقەی گەورەی کون کون کە بۆ هەڵگرتنی چێشت یا شتی دیکەی ئاودار کەلکی لێوەردەگرن و هەتا ئاوەکەی دەگەڵ نەیە، پاڵێن.

**ئاوپرژێن** (نا. ل)[ئاو1 + پرژێن] ١ـ بڕ: ئاوپاش. ٢ـ کاری ئاو بە زەوی داکردن بە ئاو پاش یا دەفری دیکە، ئاوپاشی، ئاورشێن. **~ کردن:** ئاو بە زەوی وەرکردن بە ئافتاوە یا ئاوپاش بەر لە ماڵین بۆ بەرگری لە هەستانی تۆز یا بۆ فێنک کردنەوەی وڵات.

**ئاوپژێن** (نا. ل)[ئاو1 + پژێن] بڕ:



**ئاوپەڕ** (نا. ل)[ئاو1 + پەڕ2] ١- تۆپە دارێکی ئەستووری نێوەڕاست کون کراوەیە کە لەو ئاشانەی ئاویان کەمە دەکوترێتە زارکی لای خوارەوەی دۆلاش هەتا ئاو بە تەوژم لە پەڕەی ئاش بدا و توندتر بیخلوێنێتەوە، زەنبوور، زەمبوورە. ٢- جۆرە نەخۆشییەکە تووشی ئاژاڵ ئەبێ بە هۆی خواردنەوەی ئاوی سارد و سەهۆڵاوەوە لە زستان دا (کشت و کاڵ ب ١ ل ١٧). (هس: باپەڕ)

**ئاوپەڕین** (ئان. ل)[ئاو1 + پەڕین] زەوییەک کە ئاو داشتنی دژوار و سەخت بێ.

**ئاوجز** (نا. ل، ئان. ل)[ئاو1 + جز] بڕ: ئاودز

**ئاوجۆ** (نا. ل)[ئاو1 + جۆ] خواردنەوەیەکی کەم ئالکۆڵە کە لە جۆ سازی دەکەن، مزرە، بیرە.

**ئاوجۆساز** (نا. فا)[ئاوجۆ + ساز] کەسێک کە لە جۆ ئاوجۆ ساز دەکا.

**ئاوجۆسازی** (حم.)[ئاوجۆ ساز + ئیی] ١- پیشەی ئاوجۆساز. ٢- شوێن یا کارخانەیەک کە ئاوجۆ ساز دەکا.

**ئاوجۆفرۆش** (نا. ل)[ئاوجۆ + فرۆش] کەسێک کە دوکانی ئاوجۆفرۆشی هەیە و ئاوجۆ دەفرۆشێ

**ئاوجۆفرۆشیی** (حم.)[ئاوجۆ فرۆش + ئیی] ١- ئیشی ئاوجۆ فرۆشتن. ٢- (نا. ل) شوێنی ئاوجۆ فرۆشتن

**ئاوخانە** (نا. ل)[ئاو1 + خانە] بڕ: ئاودەست

**ئاوخواز** (ئان. فا)[ئاو1 + خواز] خواردن و خۆراکێک کە دوایی تینوایەتی دێنێ، ئاوکێش، ئاوبەر. :: سەروپێ ئاوخوازە پیاو دەبێ ئاوی زۆر لە سەر بخواتەوە.

**ئاوخۆر** (نا. فا)[ئاو1 + خۆر] کەسی تینوو کە مەیلی ئاو خواردنەوەی هەیە، ئاوخۆرە. لە شوێنێک کە خەڵک زۆر کۆ بوونەوە کەسێک ئاو دەگێڕێ و هەرا دەکا رەحمەت لە ئاوخۆر و هەر کەس تینوو بێ بانگی دەکاتە لای خۆی.

**ئاوخۆرە** (نا. ل)[ئاو1 + خۆرە] بڕ: ئاوەخۆر

**ئاوخۆریی** (نا. ل)[ئاوخۆر + ئیی] ١- دەفرێک کە ئاوی تێدەکرێ و لە سەر سفرە یا لە شوێنێک بۆ ئاو خواردنەوە هەر وا دادەندرێ، پاچ، پەرداخ، تونگە ٢-

لیوانی گەورە کە ئاوی پێ دەخۆنەوە، شەربە، ئاوەوەرە. ٣ـ ئەو ئاسنەی دەچێتە ناو دەمی ئەسپەوە، دانە لغاو. ٤ـ مێشک و نێوی دار و درەخت کە ئەرکی هەڵمشتن و گەیاندنی ئاو بە لک و پۆی دارە، ئاوەخۆرە، ئاوخۆرە. ٥ـ شوێنی ئاو خواردنەوە یا ئاو پڕ کردن لە چۆم و جۆبار و گۆل.

**ئاودار** (ئان. ل)[ئاو1 + دار2] ١ـ شوێنێک یا ناوچەیەک ئاوی زۆر بێ، پڕئاو. // بێ ئاو :: کوردستان ناوچەی ئاوداری زۆرە ٢ـ میوەی بە ئاو و تەڕ و تازە. :: هەرمێ کرووزی میوەیەکی ئاودارە. ٣ـ گەوهەر و بەردی بە بایخ کە گرشە و بریقەی زۆرە. ٤ـ شەمشیر و تیغی ئاودراو و تیژ. ٥ـ کەسێک کە لە دیوەخانی میر و بەگان ئەرکی ساز کردنی چا و قاوە و خواردنەوەی دیکە بوو، ئابدار.

**ئاودارخانە** (نا. ل)[ئاودار + خانە] ١ـ ژووری ساز کردنی خواردنەوەی وەک چا و قاوە و شەربەت لە ماڵی بەگ و کۆشکی میران دا کە ئاودار لەوێ کار دەکا. ٢ـ بار و بنەی ئاوداری پاشا و سوڵتانەکان، بە تۆکەر و تەواوی کەرەسەوە. & ئایدارخانە

**ئاوداریی** (حم.)[ئاودار + ئیی] ١ـ کار و پیشەی کەسی ئاودار. ٢ـ (نا. ل) خورجی کەرەسە و ئەسبابی ئاودارخانە.

**ئاودامان** (ئاو. ل)[ئاو3 + دامان2] کراسی درێژ یا کەوای درێژی ژنان کە داوێنی بگاتە گوێزینگی پێ، ئاودامێن. :: لە سەر قەبرەکان داری ئەرخەوان / وەک بووکی تارا سەوزی ئاودامان (گۆران ل ١٣٧)

**ئاودامێن** (ئان. ل)[ئاو3 + دامێن] بڕ: ئاودامان

**ئاودڕ** (نا. ل)[ئاو1 + دڕ] شوێنێک لە دەشت و کێو یا بەستێنی بەرزی رووبار کە بە لافاو یا هەستانی ئاو دادڕابێ، ئاودڕکە، ئاودڕگە. :: پاش نوێژی نیوەڕۆیە کە مەڕ دێتەوە شاخی، لە جێگایەکی پەنا، لە کن ئاودڕێک دانیشتبوو؛ ... (سەعید و میرسێوەدین ل ٢٢)

**ئاودڕکە** (نا. ل)[ئاو1 + دڕ + کە] بڕ: ئاودڕ

**ئاودڕگە** (نا. ل)[ئاو1 + دڕ + گە] بڕ: ئاودڕ

**ئاودز** (نا. ل)[ئاو1 + دز] شوێنێک کە بە قەڵشت و درزەکانی دا ئاو دێتە دەر.



٢ـ (ئان. ل) بڕ: ئاوەدز. ~ **کردن:** بڕ: ئاوەدز کردن.

**ئاودووزەک** (نا. ل)[ئاو1 + دووز(دز) + ئەک] ١ـ ئامرازێکە لە شووشە یا پلاستیک کە سەرێکی تیژی هەیە، دەرمانی ئاوەکی پێ هەڵدەمژن و پێی لە لەشی مرۆڤ دەکەن، دەرزی، شرینقە. ٢ـ ئامرازێکی چووکەیە لە سەری شووشەی دەرمانی ئاوەکی دادەنێن هەتا بە دڵۆپ دەرمانی پێ هەڵمژن و لە چاو یا لووت و شوێنی دیکەی بکەن، قەترەچکێن.

**ئاودەر** (نا. فا، ئان. فا)[ئاو1 + دەر3] ١ـ کەسێک کە ئاو دەدا بە خەڵک، ئاوگێڕ. ٢ـ بڕ: ئاودێر

**ئاودەس**[1] (ئان. ل)[ئاو3 + دەس] بەرابەر، هاوتا. ∷ نمەبۆ پیری و تەن ناتەوانیت / وەی دوو فەردەوۆ ئاودەس جوانیت (مەولەوی ل ١٠٧).

**ئاودەس**[2] (نا. ل)[ئاو1 + دەس][ئەر] بڕ: ئاودەست

**ئاودەست** (نا. ل)[ئاو1 + دەست] دیوێکی چووکە لە سووچێکی حەسار یا نێو ماڵ سازی دەکەن ومیز و گوی لێدەکەن. شوێنی دەست بە ئاو گەیاندن، ئاودەستخانە، ئاوخانە، پێشاو، مبال، مستەراح، مستەراو، ئاودەس، کناراو، ئاڤرێژ، دەستاڤ، ئاڤدەستخانە، دەستاڤخانە، ئاڤرێژخانە، ئەدەبخانە.

**ئاودەستخانە** (نا. ل)[ئاو1 + دەست + خانە] بڕ: ئاودەست

**ئاودەڵێن** (ئان. ل)[ئاو1 + دەڵێن (دەلاندن)] ١ـ دەفری گڵێنە بە تایبەت گۆزە کە ئاو دەدەنەوە دەرەوە و ئاو فێنک رادەگرن. ٢ـ گۆل و ئەستێرێک کە ئاو دابدەن.

**ئاودەم** (نا. ل)[ئاو1 + دەم1] ئاوی زار، لیک، لیکاو.

**ئاودەنگ** (ئان. ل)[ئاو3 + دەنگ] ١ـ دوو یا چەند کەسێک یەک بیر و رایان هەیە، هاو بیر و بڕوا، هاودەم. ٢ـ دوو یا چەند کەسێک کە بە قسە دەگەڵ یەکتر وەرزی دەشکێنن، هاودەنگ.

**ئاودەنگیی** (حم.)[ئاودەنگ + ئیی] کەسێک کە ماڵ یا خەڵک یا کەسێک بە قسەکانی خۆشن و وەڕەزیان پێدەشکێ، هاودەنگی. ∷ لەوەتی وسێن چۆتە سەفەر ئاودەنگیی ماڵمان بڕاوە. عەلی بۆ ئاودەنگیی خراپ نیە.

**ئاودیو** (ئاک. ل)[ئاو (ئەو2) + دیو] ون، ئاوا. ~ **بوون:** ئاوا بوون، لەبەر

چاو ونبوون. **~ کردن:** لە بەر چاو ون کردن. ៖ دز هاتن و مێگەلیان ئاودیو کرد و بردیان.

**ئاودێر** (نا. فـا، ئان. فـا)[لە: ئاودێران][ناو: ئاودێر، ئاویار ـ هەو: ئاویار، ئاوێر] کەسێک کە کاری ئاو دێران و ئاو داشتنی مووچە و باغ و بێستانی بە دەستەوە، ئاودەر/٢. ៖ خەللاقی بێ فتووری، سوڵتانی بێ قسووری / رەززاقی مار و مووری، ئاودێری دێمەکاری (حاجی قادر ل ١٤٣).

**ئاودێریی** (حم.)[ئاودێر + ئیی] ئاو داشتنی زەوی و زار، ئاویاریی. **~ کردن:** ئاو داشتن، ئاو دێران.

**ئاور** 1 (نا.) بڕ: ئاگر. || **ئاوری بن کا:** بڕ: ئاگری بن کا. **ئاوری سوور:** بڕ: **ئاوری بێ دووکەڵ:** ئاوری گەشاوە کە ئیدی دووکەڵ نەکا، ئاگری بێ دووکەڵ، ئاگری سوور. ៖ شێواوی خەزنەدار، دڵت هەڵەشەیە/ دایمە ئاوری بێ دووکەڵت لە سەر دڵی هەیە (سەعید و میرسێوەدین ل ١٥٢). **ئاوری غەزەب:** بڕ: ئاگری غەزەب. **ئاوری قودرەت:** بڕ: ئاگری غەزەب.

**تێبینی:** من پێموایە کە وشەی ئاور لە پێشدا ئاگور بوە و لە دوایی لەبەر قورسی پیتی گ سواوە.

**ئاور** 2 (ئان.)[زا] بڕ: ئاوس

**ئاورا** (ئان.)[؟][هەو] برسی، برچی.

**ئاورایی** (حم.)[ئاورا + ئی][هەو] برسێتی، برسیایەتی.

**ئاوربووژە** (نا. ل)[ئاور1 + بووژە (بووژاندنەوە)] دەفرێکی چووکی کون کونە، بە قەرا پیاڵەیەک دەبێ، لە سیم سازی دەکەن، دەسکێکی هەندێک درێژی هەر لە سیم بۆ ساز دەکەن، رەژی تێدەکەن و ئاگری دەدەن دوایی هەڵیدەسووڕێنن هەتا رەژی دەگەشێتەوە و دەبێتە پۆلوو. ئەم پۆلوویانە زۆرتر بۆ قەنە و سەماوەری رەژی کەلکی لێوەردەگرن، تاولەمە، ئاگر گەشکەرەوە، ئاگر گەشکەرە.

**ئاورپەرست** (نا. فا، ئان. فا)[ئاور1 + پەرست] بڕ: ئاگرپەرست

**ئاورپەرستیی** (حم.)[ئاور پەرست + ئیی] بڕ: ئاگرپەرستیی

**ئاورخانە** (نا. ل)[ئاور1 + خانە] بڕ: ئاگرخانە

**ئـاوردان** (نـا. ل)[ئـاور1 + دان] بـڕ: ئاگردان

**ئاوردوو** (نا. ل)[ئاور1 + دوو2] دار و ئێزینگ و دەوە و تەپاڵە و سووتەمەنی کۆ کراوە بۆ تەندوور و سۆبە، سووتەمەنی، ئاردوو، ئازاڵە، کەشکوور.

**ئـــاورگ** (نـــا. ل)[ئـــاور1+ گ] ١ـ شوێنێکە لە متبەق یا جێگایەکی دیکە بۆ ئاور سـازی دەکـەن و چێـشـتی لە سـەر سـاز دەکـەن. ٢ـ شـوێنێکە لـە دیواری ژوور دا سـازی دەکەن بۆ ئاور کردنەوە و وڵات گەرم داهێنان، بوغاری. ٣ـ شوێنی پیـرۆزی ئاگـر بوو کـە زەردەشـتـیـەکـان ئاوریان تێدا دەپاراست و نەیاندەهێشت ئاگر قەت بکووژێتەوە. ٤ـ قوڵکەیەکە وەک تـەنـدوورێکی چـووک لـە نێـــو ژووری مـاڵەکـان سـازی دەکـەن و پـتـر پۆلوو ئاگری بۆ دێنن و تێیدەکەن بۆ ژوور گەرم کـردنەوە و هـەروەها بۆ گـەرم ڕاگـرتنی چێـشـتی سـاز کـراو و زسـتـانـانەش کـورسـی لە سـەر دادەخـەن، کـوانوو، ئاگـردان، کـۆرک، کـۆرکـە، ئادرجـا، ئادرگان، ئاوریا.

**ئـاورنـگ** (نا. ل)[ئـاور1 + نگ] بـڕ: ئاورینگ. ~ **دان:** بڕ: ئاورینگ دان

**ئاورۆچکە** (نا. ل)[ئاور1 + ئۆچکە] بڕ: ئـاگـرۆچـکـە. ~ **کـردنەوە:** بڕ: ئاگرۆچکە کردنەوە.

**ئاورە**$^{1}$ (نا.) بڕ: ئاگرە

**تێبینی:** لە ئەوێستا دا نەخۆشییەک بە ناوی ئەرە ara هـاتوە بـەڵام روون نیـە بە چ نەخۆشییەک کوتراوە.

**ئاورە**$^{2}$ (ئان.)[زا] بڕ: ئاوس

**ئـاورە شـین** (نـا. ل)[ئـاور1 + ئـە + شین] گـریان و شـینێکی بەکـوڵ و لە قوڵایی دڵەوە کە ژێر بوونەوەی چەتوونە.

**ئاورەگڕە** (نا. ل)[ئاور1 + ئە + گڕ + ئە] بڕ: ئاگرەگڕە

**ئـاوریا** (نـا. ل)[ئـاور1 + یا2][هـەو] ئاورگ، ئاگردان.

**ئاوریشم** (نـا.)[پـەه: ئـەبرێشـــم، ئەبرێشـۆم، ئەپـەرێشـوم. باک: هەڤرمش، هارمـووش ـ ناو: ئارمـووش، هـەرمـووش، هـەورێشم، ئاوریشم، هـەوریشم ـ باش: ئـەورشـم، ئـەوریـشـم ـ هـەو: هـاورێـشم، هەورێشم] لیکاوی کـرمـێکە بە ناوی کرمی ئاوریشم کە هەودای زۆر باریکە و ئەم کـرمـە لـە دەوری خـۆی دەتەنێ، لە دوایی ئـەم گـــڵـــۆڵانە بە هـەڵمی ئاو

دەکەنەوە هەتا چەمسەرەکەی دەدۆزنەوە و دوایی چەند دانەی بە یەکەوە با دەدەن و لە شتێکی دەهاڵێنن و بۆ چنینی جل و بەرگ دە کاری دەکەن. چنراوی ئاوریشم نەرم و بریقەدار و بە بایخە. ~ **بە لاہار هەڵنەگرتن:** (کنـ.) زۆر بەدەعێ بوون، بەپۆز بوون، لووت لە سەر بوون. ‖ **ئاوریشمی خاو:** ١ـ ئاوریشمی نەڕێسراو کە بۆ چنینی هەندێک پارچە یا نەخشاندنی کەرەسەی دیکە کەلکی لێوەردەگرن. ٢ـ (کنـ.) زۆر جوان. :: سەمەنبۆ دەتکوت ئاوریشمی خاوە، هێندە جوانچاک بوو (بارام و گوڵندام ل ٥١). **ئاوریشمی گشت:** ئاوریشمی بادراو و باریک ڕێسراوە کە بۆ ریشووی شەدە و پێچ و هەندێک شتی دیکە کەلکی لێوەردەگرن.

**ئاوریشمدۆز** (نا. ل)[ئاوریشم + دۆز2] ١ـ پارچە یا شتی دیکە کە بە ئاوریشم نەقش و نیگاری لێکێشرابێتەوە. ٢ـ (ئان. ل) حاڵی هەر شتێکی کە بە ئاوریشم نەخشێنرابێ. :: دە برۆن و رامەمێنن، وەستای سەرڕاجم لە بۆ بێنن / تەقەڵتووی ئاوریشمدۆزم بۆ پێک بێنن (مان ل ١٩٧). ٣ـ کەسێک کە بە ئاوریشم نەقش و نیگار ساز دەکا. :: ئەو شارە دوو ئاوریشمدۆزی باشی هەیە.

**ئاوریشمی** (ئان. ل)[ئاوریشم + ئی] بڕ: ئاوریشمین

**ئاوریشمین** (ئان. ل)[ئاوریشم + ئین] هەرشتێک کە لە ئاوریشم ساز کرابێ، ئاوریشمی.

**ئاورینگ** (نا. ل)[ئاور1 + ئینگ] ١ـ پریشکی ئاگر کە لە کاتی سووتانی دار و ئێزینگ یا کوتانی ئاسن دەپەڕێ، پزووسک، پزووسکە، پرووسک، پرووسکە، پریسک، پریشک. ٢ـ بریقە، بریسکە. & ئاورنگ. ~ **دان:** ١ـ پریشک لە ئاگر بوونەوە. ٢ـ بریقە دان، بریسکانەوە. ٣ـ (کنـ.) توورە بوون و کەف پڕژاندن. & ئاورنگ دان.

**ئاوڕ** [1] (نا.)[؟] وەرسووڕاندنی سەر بە خێرایی بۆ دواوە و سەیری کەس یا شتێک کردن. ~ **دانەوە:** بۆ دواوە ڕوانین، سەیری پشت سەر کردن. ~ **لێدانەوە:** ١ـ ڕوانین بۆ دواوە بۆ سەیر کردنی کەسێک. ٢ـ (کنـ.) سەرنج دان، بە هێند گرتن، لا لێکردنەوە، ئاوڕ وێدان. ~ **وێدان:** بڕ: ئاوڕ لێدانەوە. ‖ **ئاوڕی (بە) خێر:** شانس، بەخت، خۆشی.

***ئاوڕی (بە) خێر لێدانەوە:** بەخت روو تێکردن.

**ئاوڕ**[2] (نا.)[هەو] بڕ: ئاخوڕ

**ئاوڕشێن** (نا. فا)[ئاو1 + رشێن] بڕ: ئاوپرژێن/١ و ٢. **~ کــردن:** بڕ: ئاو پرژێن کردن

**ئاوڕۆشنکەرە** (گیانـ.)[ئاو1 + رۆشن + کەر3 + ئە][ئەر] بڕ: ئاڕوونکەرە

**ئاوڕۆشنەوکەرە** (گیانـ.)[ئاو1 + رۆشن + ئەو + کەر3 + ئە][ئەر] بڕ: ئاوڕوونکەرە

**ئاوڕۆنکە** (گیانـ.)[ئاو1 + ئە + رۆن + کە][سۆر] بڕ: ئاوڕوونکەرە

**ئاوڕوو** (نا.)[ئاو1/٨ + روو] بڕ: ئابروو

**ئاوڕووت** (نا. چا)[ئاو1 + رووت][ئەر] بڕ: ئاوەڕووت. **~ کــردن:** بڕ: ئاوەڕووت کردن.

**ئاوڕوونکەرە** (گیانـ.)[ئاو1 + روون + کەر3 + ئە] جانەوەرێکی چووکی باڵدار و قاچ درێژە، لە سەر ئاوی کانیاوان دەبێ و خێرا دێت و دەخزێ و قوڕ و لیتەی کانی خاوێن دەکاتەوە و بۆیە هەر ئەو ناوەی لێندراوە، ئاوڕوونکەرەوە، ئاوڕۆشنکەرە، ئاوڕۆشنەوکەرە، ئاوەڕوونکە، ئاوەڕۆنکە، قوڕاویلکە. (عەر: دبیب)

**ئاوڕوونکەرەوە** (گیانـ.)[ئاو1 + روون + کەر3 + ئەوە] بڕ: ئاوڕوونکەرە.

**ئاوڕەنگ**[1] (ئان . ل)[ئاو3 + رەنگ] ١ـ هەر دوو یا چەند شت و کەسێک کە لە یەک رەنگن. هاوڕەنگ ٢ـ دوو یا چەند کەس یا شتێک لە یەک شێوەن، هاوتا، هاورەگەز.

**ئاوڕەنگ**[2] (نا. ل)[ئاو1 + رەنگ] ١ـ هەرچی رەنگی وەک رەنگی ئاو بێ، لە رەنگی ئاو، ئاویی، عابی، ئابی. ٢ـ شێوەیەکە لە نەققاشی کە بە ئاو دەگەڵ رەنگ دەکردرێ.

**ئاوڕێژ** (نا. ل)[ئاو1 + رێژ] بڕ: ئاوڕێژگە

**ئاوڕێژگە** (نا. ل)[ئاوڕێژ + گە] ئەو شوێنەی کە ئاوی ناوچەیەک دەچێتەوە سەر ناوچەیەکی دیکە و تێکەڵاوی ئاوێکی گەورەتر دەبێ، ئاوڕێژ، ئاوەڕۆ/٣ (مصب)

**ئاوڕێش** (نا. ل)[ئاو3 + ریش] دەگەڵ چاوگی بوون دێ و مانای پەلامار دەدا. **~بوون:** پەلامار دان، ئانگژا بوون، بە



گژ دا چوون. ‹‹ دوێنی کاک ئەحمەد هەر چاوی بە من کەوت ئاوڕێشم بوو.

**ئاوڕێگە** (نا. ل)[ئاو1 + ڕێگە] کونێک لە بنی دیواری ماڵان کە ئاوی باران و ئاوی ڕژاوی تورمپا بەم کونە دا دەچێتە کۆڵان، ئاوەڕۆ.

**ئاوز** (نا.)[لە: ئاوزان] ئەقڵ، فام، ئاوەز.

**ئاوزا** (ئان. ل)[ئاو3 + زا] حاڵی دوو یا چەند کەسێک کە لە یەک زمان و کات دا زابن و تەمەنیان یەک بێ، هاوتەمەن، هاوزا، هاوزێ، ئاوزێ. ~ **بوون:** هاوتەمەن بوون. ئاوەڵەکانم هیچی ئاوزای خۆم نین من لە هەموویان چووکترم.

**ئاوزان** (چا. ل) خاوەن ئەقڵ و ئاوەز بوون، پێگەیشتن، فامین، تێگەیشتن، زانین، ئاوزین، ئاوزیان.

**تێبینی:** ئاوزان و ئاوزین و ئاوزیان کە بە مانای فامین و تێگەیشتن بۆ مرۆڤ هاتوون، دەبێ پێشتر بۆ گەیشتن و گەیینی میوە و بەرەوە هاتبێ کە ئاویان تێدەزێ و ئاودار دەبن و پێدەگەن و لەویشەوە وشەی ئاوز یا ئاوەز پەیدا بووبێ یانی مرۆڤی گەیشتوو و بە ئەزموون.

**ئاوزوونە** (نا. ل)[ئاو (ئاغز) + زوون (زمان) + ئە] بڕ: ئاغزوونە

**ئاوزەنگی** 1 (نا. ل)[؟] ئاویلکە، گیانەڵڵا، سەرەمەرگ، ئاوزینگ، ئاوەزینگ، هەوزینگ، گیان کەنشت. ~ **دان:** گەیشتنە دەمی مردن، ئاویلکە دان، گیان کەنین.

**ئاوزەنگی** 2 (نا. ل)[ئاو3 + زەنگ2 + ئی] ئاڵقەیەکە لە کانزا سازی دەکەن، لە خوانی زین بە هۆی لوقمەوە شۆڕ دەبێتەوە و هەتا بەر زگی وڵاغ دێ و پێی تێدەنێن و دەچنە سەر زین و وڵاغیشی پێ تاو دەدەن، ڕکێف، زەنگوو، زەنگی. ~ **پێدا هێنان:** خێرا لێخوڕینی وڵاغ بە لێدانی ئاوزەنگی لە کەلەکەی، ئاوزەنگی لێدان، ئاوزەنگی تێ تەقاندن. ~ **تێتەقاندن:** بڕ: ئاوزەنگی پێدا هێنان. ~ **داگرتن:** ١- پێ داگرتن لە سەر ئاوزەنگی بۆ ڕاگرتن و نەڕۆیشتنی وڵاغ. ٢-(کنـ.) پێ داگرتن لە سەر کارێک، پێ چەقاندن. ‹‹ ئاوزەنگی دامەگرە هەتا بەیانش بگری ناهێڵم بچیە دەرێ. ~ **لێدان:** بڕ: ئاوزەنگی پێدا هێنان.

**تێبینی:** زەنگ لەم وشە دا لە ریشەی [هیک: جەنگها ـ ئەو: زێنگە، زەنگە، زێنگرە، زەنگرە ـ پەه: زەنگ] بە مانای پێ کەوتوە. لە کوردیی دا بە تەنیا نەماوە بەلام بە شێوەی زەنگ، زینگ هەر بەم مانایە لە هەندێک وشە دا خۆ دەنوێنێ وەک: گوێزینگ، زەنگاڵ، زەنگوو.

**ئاوزەنگی تەقێن** (ئاک. ل) [ئاوزەنگی2 + تەقێن] بڕ: ئاوزەنگی کوت. ⁙ لەشکر وروژا، سوار فڕێن فڕێن / کەوتنە شوێنی سوار ئاوزەنگی تەقێن (گۆران ل ١٥٠)

**ئاوزەنگی دار** (ئان. ل)[ئاوزەنگی2 + دار2] حاڵی لاقی کەسێک کە پشتەکەی کەوانی و زەق بێ و دەرپەڕیبێ.

**ئاوزەنگی کوت** (ئاک. ل) [ئاوزەنگی2 + کوت1] خێرا لێخورینی ولاغ بە ئاوزێنگ لێدان، رکێف کوت، ئاوزەنگی تەقێن.

**ئاوزیان** (چا. ل)[ئەر] بڕ: ئاوزان

**ئاوزین** (چا. ل) بڕ: ئاوزان

**ئاوزینگ** (نا. ل) بڕ: ئاوزەنگی1

**ئاوزێ** (ئان. ل)[ئاو3 + زێ2] بڕ: ئاوزا

**ئاوژی** (نا. ل)[ئاو1 + ژی] ئەو گیا و گیاندارانەی کە لە ئاو دا دەژین، گیانداری ئاوی.

**ئاوس** (ئان.)[ئەو: ئاپوثرە ـ پەه: ئەپوس، ئابوس. باک: ئاڤس ـ ناو: ئاوس ـ باش: ئاوس ـ هەو: ئاوس ـ زا: ئاور، ئاورە] ١ـ ژنی زگپڕ، دووگیان. ٢ـ گیانلەری زگپڕ. ٣ـ دار و درەختی بووژاوەی سەرە بەهار کە خەریکی چەکەرە دەر کردنن. ⁙ باری لێ قورس ئەبێ داری ئاوس / چەتر ئەنگێوێ ئەبێتە تاوس (هێدی ل ٢٢٧). ٤ـ هەورێک کە بارانی پێوە بێ. ٥ـ (کنـ.) زگ دان و هەڵمسان لە داخان و ئێرەیی. ⁙ لە داخ ئەو کارە گەوجانەی وەختە ئاوس بم. ٦ـ (مجـ.) نزیک بوونەوە لە رووداو و قەومانی کارەسات یا رووداوێک. ⁙ دایکی زەمان ئاوسی بەسەرهاتێکی قورس و گران بوو. ~ **بوون:** ١ـ زگ پڕ بوونی ژن و مێینەی گیانداری گواندار. ٢ـ چەکەرە دەر دان و بووژانەوەی دار و درەخت ٣ـ (کنـ.) داخدار بوون و ئێرەیی بردن بە کەسێک. ~ **کردن:** زگ پڕ کردن. ٢ـ (کنـ.) داخدار کردن.

**تێبینی:** وشەی ئەوێستایەکەی بە

تەواوی ئاپوێره تەنو ـ یە و ئەوێســتــا ناسـان بردۆیانەتەوە سـەر [ئا + پوس + تەن] پوس بە مانای کوڕ یا بێچوو کە لە چەند وشـەی کوردیی دا بە شێوەی پس ماوەتەوە (بڕ: پس) و تەن بە مانای لەش کە بە گشتی دەبێتە ئەو کەسـەی منداڵی دە لـەش دایـە. هـەروەتـر ئـاوس زۆرتـر مـەبەست لە زگپڕ بوونی گیانداره و بۆ ژن پتـــر وەک تەوس و لاتاو بەکـــار دەبردرێ.

**ئاوسـا** (ئان. ل)[ئاو3 + سـا 1][پەم: هەمسایەک] ١ـ کەسێک کە ماڵی لە پەنا مـاڵی کـەسـێکی دیکە دایە. :: شـێرکـۆ ئاوسـای ئێمـەیە. ٢ـ دوو مـاڵی دیوار بە دیوار کـە لە پەنا یەکن وهێند نزیکن کـە سـا یان نسـێیان کەوتۆتە سـەر یەک. :: ماڵە شێرکۆ ئاوسای ئێمەن. ٣ـ دوو یا چەند ناوچە (دێ، شار، وڵات) کە لە پەنا یەکن. & دراوسێ، هـاوســا، ئامــســا، هاوسێ، ئاوسێ، جیران.

**ئاوساگ** (نا. مفـ.)[لە: ئاوسان] بڕ: ئاوساو

**ئاوســـــان** (چا. ل)[ناو: ئـاوســـان، ئاوسیـان، ئاماسـان، ئاماسیـان ـ هەو: مـاسـای] ١ـ با کردن و ئەسـتـوور بوونی شـوێنێکی لەش بە نەخۆشی یا کەوتن و ئـازار پـێـگـەیـشـتن و هـۆی دیکـە. :: هـەنگەژاڵە پێـــوەی داوە و ئـازای لەشـی ئاوسـاوە. ٢ـ ئـەسـتـوور بوونـی شـوێن و جێگایەک. :: ئەو دیوارە ئاوی هەڵچنیوە و ئاوسـاوە دەبێ چارەیەکی بۆ بکەین. & هەڵمـــســـان، هەڵامـــســـان، پەنەمـــان، پەنەمیان، پەنمین.

**تێـبـــینی:** هاوتا و هاوریشـــەی ئەم وشـــەیە لە فـــارسـی دا بە شـێـــوەی ئاماسیدەن و ئاماهیدەن هەر بەو مانایە هاتوە.

**ئاوساندن** (چا. م)[لە: ئاوسان] بوونە هۆی ئاوسان، هەڵمساندن.

**ئاوسـاو** (نا. مـفـ.)[لە: ئاوسـان] ئەو شـــوێنەی لەش کـــە ئەســـتـــوور بوە، ئاماسیاگ، ئاوسیاگ، هەڵمساو، پەنماو. :: برایم بە دەســـتـی ئاوســـاو دروێنەی دەکرد.

**ئاوسـاویی** (حم.)[ئاوســـاو + ئیی] ئەنجـامی ئـاوســان، هـەڵمــســاویی. :: ئاوساوییەکەی هێشتا نەنیشتۆتەوە.

**ئاوسیاگ** (نا. مفـ.)[لە ئاوسیان] بڕ: ئاوساو

**ئاوسیان** (چا. ل) بڕ: ئاوسان



**ئاوسێ** (نا. ل)[ئاو3 + سێ2] بڕ: ئاوسا

**ئاوشان** (ئان. ل)[ئاو3 + شان] دوو یا چەند کەس کە لە یەک پلە و پایە دان و چیان لە یەکتر زیاد نیە، هاوشان، هەمبەر.

**ئاوشنگ** (ئان. ل)[؟] وەشیر هاتنەوەی مەڕ و بزنی بێچوو مردوو کە شیری ویشک کردبێ.

**ئاوفرۆش** (ئان. فا)[ئاو1 + فرۆش] کەسێک کە ئاوی لە چۆم و دەراوانی دێنا و لە شار بە خەڵکی دەفرۆشت. ⁂ پیاوێکی ئاوفرۆش لە شاری غەزنەی دا ئاوفرۆشی دەکرد. ...(مان ل ٣).

**ئاوفرۆشیی** (حم.)[ئاوفرۆش + ئیی] پێشە و کاری ئاوفرۆش.

**ئاوقا** (نا. ل)[ئاو3 + قا] گژ، پەلامار، ئاوڕێش، ئاوقە، ئەوقە. ~ **بوون:** پەلامار دان وتێک بەزین ، یەخەی یەکتر گرتن بۆ شەڕ.

**تێبینی:** قا یا قە من پێم وایە شکڵی گۆڕاوی یەخە یا یەقەیە و وشەکە لە ئەسڵ دا ئاویەقە بوە و لە دوای لێک و لووس کراوە و بۆتە ئاوقا یا ئەوقە، هەرچەند زەبیحی بردوویەتیەوە سەر قەد (بڕ: قاموس ب ١ ل ٨٩).

**ئاوقوف** (ئان. ل)[ئاو3 + قوف (کوف)][سۆر] بڕ: ئامکوف

**ئاوقۆرە** (نا. ل)[ئاو1 + قۆرە] ئاوێک کە لە قۆرە و بەرسیلە دەگرترێ. ئەم ئاوە دە بوتری یا دەبە دا هەڵیدەگرن و بۆ ترش کردنی چێشت دە کاری دەکەن، ئاقشیلە، ئاقشلە.

**ئاوقە** (نا. ل)[ئاو3 + قە] بڕ: ئاوقا.
**ئاوقە بوون:** بڕ: ئاوقا بوون.

**ئاوکوف** (ئان. ل)[ئاو3 + قوف] بڕ: ئامکوف

**ئاوکێش** (نا. فا)[ئاو1+ کێش] ١- کەسێک کە لە چۆم و رووبار ئاو بۆ مالان دەبا، پێشەی ئاوکێشی، ئاوبەر. ٢- (ئان. ل) خۆراک و خواردنێک کە دوایی مرۆڤ تینوو دەکا و ئاوی زۆرتر لە رادە دەخواتەوە.

**ئاوکێشیی** (حم.)[ئاوکێش + ئیی] پیشەی کەسێک کە ئاو بۆ مالان دەبا.

**ئاوگۆشت** (نا. ل)[ئاو1 + گۆشت] چێشتێکی کوردەوارییە، گۆشت و پەتاتە و تەماتە و هەندێک جار نۆک و بامیە و هەڵووچەی ترشیشی تێدەکەن،

دەیکوڵێنن و ئاوەکەی تێدەکوشن و گۆشتەکەش یا بە نان دەیخۆن یا ئەوەکە هەڵیدەشێلن، شۆروا، شۆربا، شۆرباو، گۆشتاو، ئاو و گۆشت.

**ئاوگەردان** (نا. ل)[ئاو1 + گەردان] جۆرێک کەوچکی گەورەیە، دەسکێکی درێژی هەیە و بنەکەی بە قەرا جامێک دەبێ، پێشتر پتر لە مس ساز دەکرا و قورس بوو و ئێستاکە فافۆن جێی گرتۆتەوە، بۆ چێشتی نێو مەنجەڵی گەورە، بۆ ئاوی کوڵیو هەڵێنجان دەکاری دەکەن، کەوچێز، ترار.

**ئاوگیر** (نا. ل)[ئاو1 + گیر] کەسێک کە لە حەمام خزمەتی خەڵک دەکا، شاگرد حەمامچی.

**ئاولانە** (ئان. ل)[ئاو3 + لانە] دوو دڵداری بە کاوی یەک گەیشتوو و دەستەملان و پێکەوە، هاودەم، هاوژین، ئاومل، ئاملانە. ⁂ برای تۆ دەیانگوت هەتا ئەمە بژین هەر بە ژینە هەر بەمانە / خەج و سیامەند نابنەوە بە ئاولانە (بەیتی خەج و سیامەند).

**ئاولەمە** (نا. ل)[ئاو3 + لەمە (زگ)] ١ـ منداڵی نێو زگی دایک کە هێشتا بە تەواوی خۆی نەگرتوە، جەنین. ٢ـ منداڵی لە بەرچوو. ٣ـ بەرخ و کاریلە کە دوای سەربڕینی مەڕ و بزن دەریان دێنن و بۆ خواردن دەبن. & ئاوڵەمە، ئاوڵمە

**ئاولیمۆ** (نا. ل)[ئاو1 + لیمۆ] ئاوێک کە لە لیمۆی ترش دەگرترێ. ئەم ئاوە بۆ ترش کردنی چێشت وخواردنی وەک سالاد و سووپیش کەلکی لێوەردەگرن.

**ئاولاویی** (ئان. ل)[ئاوڵە + ئاویی2] کەسێک کە لە ئاوڵە رزگاری هاتوە بەڵام شوێنی پۆرگەکانی پێوەمابێ، کونج، گڕوێ، گڕۆ.

**ئاوڵمە** (نا. ل)[ئاو3 + (ڵمە)لەمە (زگ)] بڕ: ئاولەمە

**ئاوڵە** (نا.)[پەه: ئاپیلەک. ناو: ئاوڵە، هاوڵە ـ باش: ئاوڵە ـ هەو: ئاوڵە، هەوڵێ] ١ـ نەخۆشییەکە لە مرۆڤ و زۆربەی گیاندارانی وەک گاو و مەڕ و بزن و باڵندە و یەکسم دا سەر هەڵدەدا، پۆرگ سەر پێست دادەگرێ و تاو و تێی دەگەڵە، خروێکە، خروێلکە، خروێلە، خروێنکە، خرووکە، خوری، خوریک. ٢ـ بڕ: بلۆق. ⁂ لەب وە تەمای دڵ چەند حەسرەتش بەرد / پێش ئاوڵە کەرد فرسەتش ناوەرد (مەولەوی ل ١٥٧). ⁓ **دەردان:** دەردان و پەیدا بوونی پۆرگی ئاوڵە لە لەش.



**~ کردن:** بلۆق کردن. **~ کوتان:** لێدانی واکسەنی دژی ئاوڵە لە لەش.

**ئاوڵەکوت** (نا. فا، ئان. فا)[ئاوڵە + کوت1/٣] کەسێک کە واکسەنی ئاوڵە لە خەڵک دەدا.

**ئاوڵەمە** (نا. ل)[ئاو3 + لەمە (زگ)][ بڕ: ئاولەمە

**ئاوماڵ** (ئان. ل)[ئاو3 + ماڵ2] ١- پەیوەندی دوو یا چەند کەسی هاوبەش و شەرێک دە شتێک دا، هاوماڵ. ٢- [ئاو3 + ماڵ1] دوو یا چەند دراوسێ لە ماڵێک دا. & ئاوماڵە2

**ئاوماڵک** (نا. ل)[ئاو1 + ماڵ3 + ک] ١- دار و چرپی و پووش و پەلاشێک کە ئاو دەگەڵە خۆی دەیهێنێ و لە بەستێنی فڕێ دەدا و بۆ سووتاندن و ئاور کردنەوە دەکاری دەکەن. ٢- هەر شتێک کە ئاو دەگەڵ خۆی لە شوێنێکەوە هێنابیەتی شوێنێکی دیکە. & ئاوماڵە1.

**ئاوماڵە**1 (نا. ل)[ئاو1 + ماڵ3 + ئە] [ئەر] بڕ: ئاوماڵک

**ئاوماڵە**2 (ئان. ل)[ئاو3 + ماڵ1 و 2 + ئە] بڕ: ئاوماڵ

**ئاومرواری** (نا. ل)[ئاو1 + مرواری] بڕ: ئاوی مرواری.

**ئاوملـ** (ئان. ل)[ئاو3 + مل] ١- دوو گای لێک بەستراو کە بە یەکەوە جووت دەکەن. ٢- هاودەم، هاوڕێ، هاوژین، ئاولانە. **~ بوون:** هاودەم بوون، پێکەوە بین. **~ کردن:** لێک بەستنەوەی دوو ولاغ بۆ جووت دەگەڵ یەکتر. :: رۆڵە گیان بڕۆ گاسووری دەگەڵ گابۆر ئاومل بکە.

**ئاون** (نا.) بڕ: ئاونگ2

**ئاونشین** (ئان. فا)[ئاو3 + نشین] کەسێک کە دەگەڵ کەسی دیکە هاتوچۆ و هەڵسوکەوتی هەیە، هاودەم، هاونشین. :: میرسێوەدین بەگ پیاوێکە هەمیشە ئاونشینە بە دەوڵەتی تورکان و بە سوڵتانی / ئەوە لە دەرکی والی موسڵێ دادەبەزی بە میوانی (سەعید و میرسێوەدین ل ٩٢).

**ئاونشینیی** (حم.)[ئاونشین + ئیی] هاونشینیی، هاودەمیی.

**ئاونگ**1 (نا.) ١- شێ و نمێکە شەوانە لە سەر گەڵا و پەلکی گوڵان دەنیشێ. خوناو، شەونم، قەراو. :: زێوی ئاونگ بۆتە ملوانکەی ملی گیابەند و خاو/ هەر تروسکەی دێ و دەلەرزێ

بای لە ســــەر بێ یا هـەتاو (هێـــدی ل ٣٠٤). ٢ـ هێـشوو ترێ کە هاوینان بەر لەوەی باران لێی بدا بە بەن لە مــیــچی شـوێنێکی وەک ژێرخـان هەڵیداوەسن بۆ زسـتــان دەیخــۆن، ئاوەنگ، مـێـلاق. ٣ـ شــتـێکی شـورکـراوە و هـەڵواسـراو لە بنەوەی هەندێک سـاعـەتی گـەورە کـە راست و چەپ دەکا و دەبێتە هۆی گەڕی میلەکانی سەعات، پاندۆڵ.

**تێـبـینی:** ئاونگ لە ریشــەی ڤـەئێگ vaeg ـ ی ئـەوێســـتــایی بە مــانـای هـەڵاوەسین کـــەوتوە. خـــودی ئاونگ لە (ئا13+ ونگ) پێک هاتوە زەبیـــحی لە ئـاونــگـی ١ نـەدواوە و ئـاونــگـی ٢ ی بردۆتەوە ســەر ئاویختـەنی فـارسی. لە حــاڵێک دا کــە هـەڵاوەسین ( هـەڵ + ئاوەس + ین) زۆر لە ئاویختەن (ئاویخ + تەن) بەم وشـەیە نزیکترە بە لـە بەر چاو گرتنی ئەوە کە چاوگەی ئاوەسین نەماوە و ئێسـتـاکـە بە پێشگری هەڵ دەکـار دەکردرێ (بڕ: قامووس ب ١ ل ٩٤)

**ئاونگ**$^{2}$ (نا.)[ئەو: هـاڤــــەنە ـ پەه: هـاڤــــەن. باک: هـاوان، هـەوەنگ ـ ناو: ئاونگ، ئاون، ئاوان ـ باش: هاوەن ـ هەو: ئاوان، هاوان] دەفرێکی کەمێک قووڵە کە پێـشــتـر لە چێـو و بەرد دەیانتـاشی و ئیـمـرۆکـە پتـر لە ئاسن و زەرد سـازی دەکەن و دەسکێکی هەیە و داو و دەرمان و قاوە و هەندێک ئاڵەتی تێدا دەسوون یا دەکـوتن، دەسکاونگ، هەڤنگ دەســتــە، دەسگ هاوەن.

**ئـاونـە** (نـا. ل)[ئـاو1 + نـە (نـەی)] دارێکی درێژووکــەی نێـــو بۆشـی وەک دارجگەرەیە لە قــەننە دا کــە ســەرێکی دەچێتە نێو شـووشـەی ئاوەکە و سەرێکی دەچێتـە نێو داری قـەننە کە گەورەترە و دووکەڵی تەماکۆ رادەکێشێتە نێو ئاو و دەیباتەوە و دەمی قەننە، میلاو.

**ئاو و ئاگر** (نا. ل)[ ئاو1 + و + ئاگر] (کنـ.) بەڵا، مەترسی یەکجار زۆر. ؛؛ ئاو و ئاگر ئەمانیان نیە (پەند ل ٢٢). **خۆ بە ~ دادان:** (کنـ.) ئەنجـام دانی کارێک و نەپرینگانەوە لە هیچ مەترسییەک.

**ئاو و خـــــاک** (نا. ل)[ئاو1 + و + خاک] وڵات، نیشتمـان. ؛؛ نەسیبم هەر نەبوو لەم ئاو و خاکە، بشـمرم بێ جێم / بە دەردی خـۆمـەوە دەتلێـمـەوە بێ ئاو و گڵ چبکەم (ئاوات ل ٢٠).

**ئاو و گڵ** (نا. ل)[ئاو1 + و + گڵ] ١ـ وڵات، نیشتمان. ؛؛ گەلی کچانی چاو بە کل فـریشـتـەکـانی ئاو و گڵ/ دەمێ کـە



دەچنە گوڵ چنین بە عەینی هی خەزاڵی سڵ (حەقیقی ل ٤٧). هەموو منداڵی ئەو ئاو و گڵەین. ٢ـ (کنـ.) نەسیبی مەرگ، ئەجەل. ۞ ئاو و گڵ کابرای غەریبی هێنا و لێرە مرد. ٣ـ (کنـ.) شوێنی مەرگی مرۆڤ. ٤ـ رسکان، سرشت. ۞ هەر چووینە نزیکی وان بە دیمەن/ دیمان نە لە ئاو و گڵ وەکی مەن (مەم و زین ل ٢٧١). **~ی شوێنێک بە نەسیب بوون:**(کنـ.) ئەو شوێنەی مرۆڤ لێی دەمرێ، خاک و گڵی شوێنێک بە نەسیب بوون. ۞ ئەگەر شێرەکە ئەمنی بەتڵاند، دیارە ئاو و گڵی ئێرەم بە نەسیب بووە، ئەگەر شێرەکەم بەتڵاند دیارە ئەنگۆ شل بزووتوونەوە (لاس و خەزاڵ ل ١٣).

**ئاو و گۆشت** (نا. ل)[ئاو1 + و + گۆشت] بڕ: ئاوگۆشت

**ئاو و هەوا** (نا. ل)[ئاو1 + و + هەوا1] بارودۆخی هەوا بە لە بەرچاو گرتنی سەرما و گەرما، با و بۆران و تەواوی ئەو رووداوانەی ئاتمۆسفێر کە زانستی هەواناسی لێی دەکۆڵێتەوە. ۞ زستانان کوردستان ئاو و هەوایەکی ناخۆشی هەیە.

**ئاوها** (ئاک. ل)[ئا + وها] بڕ: ئاوا2

**ئاوهەڵدێر** (نا. ل)[ئاو1 + هەڵدێر (هەڵدێران)] ئاوێک کە لە سەر رێ تووشی هەڵدێر دێ و لە بەرزاییەوە دەڕژێتە خوارەوە و دیمەنێکی جوانی هەیە، تاڤگە، تاف، تافگە، قەڵبەزە، قەڵوەزە، سوول، سوولاف، رێژگە، سیپەل.

**ئاوەچۆڕ** (نا. ل)[ئاو1 + ئە + چۆڕ] تکانەوەی ئاو لە کەل و پەلی هەڵخستراو. **~ کردن:** هەڵخستنی کەل و پەلی شۆراو بۆ دادان و تکانی ئاوەکەی. ۞ پەتووکان بەرە دەرێ و ئاوەچۆڕیان کە!

**ئاوەچۆڕە** (نا. ل)[ئاو1 + ئە + چۆڕ + ئە] ١ـ تکانەوەی ئاو لە شتی دە ئاو هەڵکێشراو. ٢ـ تکانەوەی ئاو لە بەفر لە سەرەتای بەهار ٣ـ (کنـ.) تکانەوەی ئارەقە لە لەش. ٤ـ تکانەوەی ئاو لە لووت بە هۆی نەخۆشی و هەڵامەت. ۞ سەرمایەکی پیسم خواردوە کەپۆم هەر ئاوەچۆڕەیەتی.

**ئاوەخانە** (نا. ل)[ئاو1 + ئە + خانە] قوتوویەکی تەنەکەیە کە لە بنی لانکەی منداڵ هەڵداوەسرێ و بلوێری دێتەوە نێوی و میزی منداڵ لەوێ دا کۆ

دەبێتەوە.

**ئاوەخۆرە** (نا. ل)[ئاو1 + ئە + خۆرە] ١ـ مێشک و نێوی دار و درەخت، کە ئەرکی هەڵمشتن و گەیاندنی ئاو بە لک و پۆی دارە، ئاوخۆری. ٢ـ قورقرۆچکە، قۆرگ، گەروو. ٣ـ راوی کەو لە کاتی هاتنە سەرئاو بۆ ئاو خواردنەوە، ئاوەوەرە. ٤ـ ئەو ئەندازە لە لمبۆزی حەیوان کە لە کاتی ئاو خواردنەوە دا دەچێتە نێو ئاو و تەڕ دەبێ. & ئاوخۆرە

**ئاوەدان** (ئان.)[هەخ: ئاڤەهەنە (ئاوایی) ـ پەه: ئاڤەهەن ، ئاوەهەن (ئاوایی)، ئاپاتان. باک: ئاڤادان ـ ناو: ئاوەدان، ئاوان ـ باش: ئاوەدان ـ هەو: ئاوەذان] ١ـ شوێن و جێگایەک کە پیت و بەرەکەتی تێدایە، جێ ژیانی خۆش کراوی خەڵک و ئینسان، ئاوا/١. // وێران. ٢ـ (مجـ.) قەرەباڵغی و هاتوچۆی خەڵک بۆ شوێنێک. :: قاوەخانەیەکی ئاوەدانە هاتوچۆی لێنابڕێتەوە. ~ **بوون:** ١ـ هات و چۆ و قەرەباڵغی لە شوێنێک دا هەبوون. ٢ـ نەبڕانەوەی پیت و بەرەکەت و وێران نەبوونی شوێنی دانیشتنی ئینسان. ئاوا بوون :: ماڵت سەد جار ئاوەدان بێ. شارۆێران پێشتر شوێنێکی ئاوەدان بوو. ~ **بوونەوە:** ١ـ پتر هات و چۆ کردنی خەڵک بۆ شوێنێک. :: بە زستان مزگەوت ئاوەدان دەبێتەوە. لەوەتی تلویزیۆنم داناوە قاوەخانە ئاوەدان بۆتەوە. ٢ـ سەر لە نوێ ساز بوونەوەی شار و دێ و شوێنی ژیانی چۆڵ یا وێرانی خەڵک، ئاوا بوونەوە. :: ئەم ژوورەم تازە ئاوەدان کردۆتەوە. ~ **کردنەوە:** ١ـ سەر لە نوێ ساز کردنەوە و بنیات نانەوەی شار و وێرانی. ٢ـ نیشتەجێ بوون لە شوێنێکی چۆڵ و تێدا ژیانی. :: کاک حەمە دیوێکی بۆ خۆی ئاوەدان کردۆتەوە و بە ماڵ و منداڵەوە لێی دانیشتوە.

**ئاوەدانی** (نا. ل)[ئاوەدان + ئی] ١ـ جێی ژیانی مرۆڤ ( شار، دێ و ...)، ئاوایی. :: بە زستان لە ئاوەدانی زۆر دوور کەوتنەوە جێی مەترسییە. دەروێشێک دوور لە ئاوەدانی لە نێو ئەشکەوتێک دا دەژیا. ٢ـ ئاودەنگی، کەسێک یا شتێک کە ماڵ یا خەڵک پێی دەحەسێتەوە و نەبوونی هەست پێ دەکرێ. :: لەوەتی ئەحمەدی کورم چۆتە سەفەر ئاوەدانی ماڵ بڕاوە. چرا ئاوەدانی ماڵە. ٣ـ (مجـ.) قەرەباڵغی و کۆ بوونەوەی خەڵک لە شوێنێک. ٤ـ

(حــم.) جـــێگەی ئاوەدان // چۆلی، وێـرانـی. & ئـاوانـی. **بـە ~ زانـین:** کەسێک بە ماڵ و حاڵ و میوانگر دانان و لـێ لادان، بـە پـیـــــاو دانـان. ؛؛ بـە ئاوەدانیت دەزانم بۆیە هاتوومە ماڵەکەت. **پشت لە ~ کردن:** لە نێو خەڵک چوونە دەر و روو لە چۆلگە کـردن، دوور بوونەوە لە خەڵک.

**ئـاوەدز** (نـا. ل، ئـان. ل)[ئـاو1+ ئـە + دز] حــاڵی برینێک کـە ئاوی مــژتبێ و هەڵمـسـابێ. ئەم برینە درەنگتر خـۆش دەبێتەوە و جێ برین دەکزێتەوە، ئاودز، ئاوجـز. **~ بوون:** هەڵمـسانی برین بە تەڕ بوونی برینەکە، ئاوەدز کردن :: رۆڵە بەو دوستە براوەت قاپان مەشۆ دەستت ئـاوەدز دەبـێ. **~ کـــردن:** بـڕ: ئـاوەدز بوون.

**ئاوەڕۆ** (نا. ل)[ئـاو1 + ئە + ڕۆ4] ١ـ کـونێک بوو لە بنی دیواری مــاڵان کـە ئاوی باران و ئاوی ڕژاوی تـورمــپـا بەم کـــونـە دا دەچۆوە کــۆڵان، ئـاوڕێگە. ٢ـ لوولەیەکە لە بن زەوی دایە و ئاوی زێدەی حــەمــام و پـیـســایی ئـاودەست بـەوێدا دەچێــتــەوە بـاڵ لوولەیـەکی گــەورەتر و دەڕژێتە نێو چۆمەوە. پێشتر ئەم لوولەیە یا لە لووله سـمیتی کوت کوت بوو کە بە دوای یەک دا ریزیان دەکـرد یا ئەوە کـە هـەر لـوولـەیـان دانـەدەنـا و عــــــەزیان هـەڵدەکـــەند و وەک جــۆگـــەی ســـەر داپۆشـراو ئاوەکـە پێی دا دەڕۆیشت. ٣ـ بـاری ڕژان و شــــــۆڕ بـوونـەوەی ئـاوی ناوچەیەک بۆ سـەر ناوچەیەکی دیکە کـە لە کار و باری ملکیایەتی و دابەش کردن دا ئـەو ناوچـەی کـــە ئـاوەڕۆی دێتـــەوە سـەری ناوچەکانی دیکە سـەر بەو دەبن، ئاوڕێژگە. & ئاوەڕێژ. **~ چوونەوە سەر:** پێـوەندی و لکانی نـاوچەی بچـووک کـە ئـاوەڕۆیان دەڕژێتــە ســـەر ناوچـەیەکی گـــەورەتر، ئـاوەڕۆ هـاتـنەوە ســـەر. ؛؛ ئاوەڕۆی جــانداران دەچێــتــەوە ســـەر مـەهاباد. **~ هاتنەوە سـەر:** بڕ: ئاوەڕۆ چوونەوە ســەر. ؛؛ سێ بـیـیـان لە پشت شـنـۆیـە، ئـاوەڕۆی دێتـــــــەوە شـنـۆیـە (شۆڕمەحموود ل ٥)

**ئـاوەڕووت** (نـا. چـا)[ئـاو1 + ئـە + ڕووت] مـریشک یا باڵندەی سـەر براوی تووک لێکراوە بە ئاوی گـەرم، ئاوڕووت، ئاوەکـوڵ/٢. **~ کـردن:** لێکردنەوە و دارنینیی پـەڕی مــــریشک یا باڵندەی سەربڕاوە بە ئاوی گەرم.

**ئاوەڕوونکە** (گـیـانـ.)[ئاو1 + ئە + ڕوون + کە] بڕ: ئاوڕوونکەرە

**ئاوەڕێژ** (نا. ل)[ئاو1 + ئە + ڕێژ] بڕ: ئاوەڕۆ

**ئاوەڕێس** (نا. ل)[ئاو1 + ئە + ڕێس] جۆرێک لە جۆرەکانی ڕستنی خوری کە دانستە بە باریکی دەیرێسن و لە کاتی ڕستن جار جارە دەستیان تەڕ دەکەن. ڕێسراوی لووس و باریک.

**ئاوەز** (نا.) بڕ: ئاوز

**ئاوەزا** (نا. ل، ئان. ل)[ئاو1 + ئە + زا] بڕ: ئاوەزێ

**ئاوەزینگ** (نا. ل)[؟] بڕ: ئاوزەنگی1

**ئاوەزێ** (نا. ل)[ئاو1+ ئە + زێ2] پارچە زەوییەک کە بەهاران هەندێک ئاوی لێ هەڵدەقوڵێ و بە هاوین ویشک دەبن، زۆنگ، زەناو، ئاوەزا، ئاڤزێ، ئاڤزێم.

**ئاوەزێڕ** (ئان. مف.)[ئاو1 + ئە + زێڕ] هەر فلزێکی کەم بایخ کە بە زێڕ رووکێش کرابێ، زێڕکفت، رووکێشی زێڕین، تامزێڕ. ~ **کردن:** رووکێش کردنی خشڵ یا هەر کانزایەکی دیکە بە زێڕ.

**ئاوەزێو** (ئان. مف.)[ئاو1 + ئە + زێو] رووکێش کردنی فلزی کەم بایخ بە زێو، رووکێشی زێوین، تامزیڤ. ~ **کردن:** رووکێش کردنی خشڵ و هەر کانییەکی کەم نرخی دیکە بە زێو.

**ئاوەژوو** (ئان. مف.) ١ـ پێچەوانەی باری ئاسایی، پشت و روو، بەرەواژ، ئاواژی، واژی، ئاواژوو. ⁂ دیوی ئاوەژووی ئەم پارچەیە کێها لایەتی؟ ٢ـ جل و بەرگی پشت و روو کراو. ⁂ ئەوە بۆ ئەم کراسەت ئاوەژوو دە بەر کردوە؟ ~ **کردن:** بڕ: ئاوەژوو کردنەوە. ~ **کردنەوە:** ١ـ هەڵسووڕاندنەوە و وەرگێڕانی شتێک بە باری پاشی دا. ٢ـ هەڵگێڕانەوەی جل و بەرگ بە بەری دیکەی دا.

**تێبینی:** ئاوەژوو دەچێتەوە سەر ریشەی ئەوێستایی ئەپاچ و ئەپاک بە مانای دوا، بەرەو دوا، پشتەوە، پاش.

**ئاوەژەنە** (نا. ل)[ئاو1 + ئە + ژەن + ئە][هەو] بڕ: ئاوەشکێنە

**ئاوەسوو**[1] (ئان. مف.)[ئاو1 + ئە + سوو (سوان)] ١ـ بەرد یا هەرشتێکی کە زۆر لە بن ئاو مابێتەوە یا ئاو زۆری بە سەر دا ڕۆیشتبێ و لێک و لووس بووبێ. ٢ـ حاڵی هەر شتێکی تەڕکراو و بە هەسان و بەردەزوورە لێک و لووس کراو.

خشتی ئاوەسوو، هەڵماتی ئاوەسوو. ٣ـ (کنـ.) مرۆی بێ چاو و ڕووی و بێشەرم، چەقاوسوو. ~ **بوون:** ١ـ لێک و لووس بوون بە ئاو. ٢ـ (کنـ.) بێ چاو و ڕوو و بێشەرم بوون، چەقاوەسوو بوون. ~ **کردن:** ١ـ لێک و لووس کردن بە ئاو. ٢ـ (کنـ.) بێشەرم و بێحەیا و بێ چاو و ڕوو بار هێنان.

**ئاوەسوو** 2 (ئان. ل) ١ـ ژنێک کە منداڵی نەبێ، نەشۆر، نەزۆک. ٢ـ گیانداری مێینە کە بێچووی نەبێ، قسر، ئەستێور، ئەستەویر.

**تێبینی:** بیچم و مانای ئەو وشەیە وا نیشان دەدا کە لە [ئا + وەس + ئوو] کەوتبێ. ئا لە ئە ـ ی پەهلەویی کە پێشگرە بە مانای نە، بێ. وەس بە مانای پس، منداڵ و ئوو ئامرازی چووک کردنەوە و بە گشتی دەبێتە بێ منداڵ، نائاواس.

**ئاوەسەر** (نا. ل، ئان. ل)[ئاو1 + ئە + سەر] زەوییەک کە ئاو هەڵنەمژێ و لە کاتی ئاو دان دا ئاو هەروا لە سەری بمێنێتەوە، شۆنە، ڕەقەن.

**ئاوەشکێنە** (نا. ل)[ئاو1 + ئە + شکێن + ئە] ١ـ بەردێکی گەورە کە لە سەر جۆگەی ئاشی دادەنێن، هەتا لە کاتی وەستاندنی ئاش ئاو نەیەتە نێو جۆگەوە و بە شوێنێکی دیکە دا بڕوا. ٢ـ بەرهەڵستی بەر ئاو بۆ شکاندنەوەی بە لایەکی دیکە دا، ئاوبڕ. & ئاوەژەنە.

**ئاوەشی** 1 (نا. ل) نەخۆشییەکە لە گوانی مەڕ دەدا، گوانی دێشێ، ڕەق دەبێ و نادۆشرێ. ~ **بوون:** تووشی نەخۆشی ئاوەشی و گوان ڕەق بوون هاتن.

**تێبینی:** بیچم و مانای ئەم وشەش هەروەک ئاوەسوو2 وا نیشان دەدا کە لە [ئا + وەش + ئی] کەوتبێ.

**ئاوەشی** 2 (ئان. ل)[ئاو1 + ئە + شی؟] پەڵە دەغڵێک کە لە بەر ئاو دانی زۆر یا لەبەر بارانەی زۆر کە بە سەری دا باریوە ویشک بوە. ~ **بوون:** ئیشک بوونی پەڵە دەغڵێک لە بەر ئاوی زۆر.

**ئاوەکوڵ** (نا. ل)[ئاو1 + ئە + کوڵ] ١ـ کوڵاندنی جل و بەرگ و هەر شتێکی دیکە پیس لە ئاو دا بۆ کوشتنی مێکرۆب. ٢ـ بڕ: ئاوەڕووت. ٣ـ ئاوی کوڵیو.

**ئاوەکی** 1 (ئان. ل)[ئاو1 + ئەک + ئی] شتی شلی وەک ئاو، تراو، ئاقاکی.

(عەر: مایع)

**ئاوەکی**[2] (ئان. ل)[ئاو + ئەک + ئی] هەڵبڕانی مەڕ و ماڵات لە ڕان و چوونە نێو ڕانی دیکەوە. **~ بوون:** تەرە بوون و تێکەڵ بوونی سەرێک یا چەند سەر مەڕ و ماڵات و چوونە نێو مێگەل و ڕانی دیکەوە، ئاوەکی کەوتن. **~ کەوتن:** بڕ: ئاوەکی بوون.

**تێبینی:** ئاو لەم وشەیە دا دەچێتەوە سەر ئامیتن و تێکەڵ بوون. بڕ: ئاوی2

**ئاوەڵ** (نا.) ١ـ بڕ: ئاواڵ. ٢ـ (ئا.) بڕ: ئاواڵ منداڵ

**ئاوەڵا** (ئان.) بڕ: ئاواڵە

**ئاوەڵانە** (نا. ل)[ئاوەڵ + ئانە] خەڵاتێکە کە مەڕدار دەیدەن بە شوان لە کاتی مزگێنی هێنانی یەکەم بێچووی تازەزاو.

**تێبینی:** هەر چەند مانای وشەکە لەوە دەچێ کە لە هەواڵ بە مانای خەبەر کەوتبێ یانی مزگێنی هەواڵ پێدان و خەبەر کردن بەڵام پێمـوایە ئەم دابە کۆنتر لەوە بێ کە لە هەواڵ کەوتبێ کە تازە لە نێو کورد دا پەرەی گرتوە و لە ئەحوالی عەرەبی کەوتوە. بۆی زۆرە کە هەر لە ئاواڵ یا ئاوەڵ کەوتبێ بەڵام چۆناییەکەی نازانم.

**ئاوەڵ دامان** (نا. ل)[ئاوەڵ + دامان] بڕ: ئاواڵ کراس

**ئاوەڵ زاوا** (نا. ل، ئان. ل)[ئاوەڵ + زاوا] بڕ: ئاواڵ زاوا

**ئاوەڵکار** (نا. ل)[ئاوەڵ + کار] زارێکی ڕێزمانە کە حاڵەت و چۆنیەتی و جێگە و زەمانی کار (فعل) نیشان دەدا وەک: دوێنێ، بە پەلە، ... || **ئاوەڵکاری حاڵەت:** شێوەی ئەنجام دانی کارێک نیشان دەدا. :: بە کاوەخۆ، بە نهێنی. **ئاوەڵکاری زەمان:** زەمانی ئەنجام دانی کار نیشان دەدا. :: ساڵێکی دیکە، ئەوشۆ، سبەی. **ئاوەڵکاری مەکان:** شوێنی ئەنجام درانی کار نیشان دەدا. :: ماڵ، دوکان، سنە، باغ.

**تێبینی:** ئاوەڵکار لە جیات (قید) هەڵبژێردراوە.

**ئاوەڵ کراس** (نا. ل)[ئاوەڵ + کراس] بڕ: ئاواڵ کراس

**ئاوەڵناو** (نا. ل)[ئاوەڵ + ناو] زارێکی ڕێزمانە کە حاڵەت و چلۆنایەتی (ناو) کەسێک یا شتێک نیشان دەدا وەک: سوور، کز، ژیر، سارد، چووک.



**تێبینی:** ئاوەڵناو لە جیات سفەتی عەرەبی هەڵبژاردراوە.

**ئاوەڵە** (ئان.) بڕ: ئاوەڵا

**ئاوەنگ** (نا.)[قوچ] بڕ: ئاونگ1

**ئاوەنیا** (نا. ل، ئان. ل)[ئاو1 + ئە + نیا (نیان، نانەوە)] ١ـ شێوەیەکە لە کشت و کاڵی. بەم جۆرە کە لە دوای چلەی هاوین زەوی شێو دەکەن و ئاوی لێدەنێن و تۆمەکەی دادەچێنن. ئەو ساڵە شین دەبێتەوە و هەندێک سەر هەڵدەدا کە دەکەوێتە ژێر بەفرەوە و ساڵی دیکە زووتر لە دەغڵی دیکە پێدەگا. ٢ـ ئەو دەغڵەی کە بەم جۆرە شین بۆوە و سەری هەڵداوە، رەپستە، کوڵەپەست، کۆڵەبەست، کۆڵەبەس، کۆڵەوەس. ٣ـ لە هەندێک شوێن کە گیا کەمە لە بەهار دا ئاو لە زەوی دەگرن هەتا ماوەیەک گیایەکی باشی لێ شین دەبێ و لە دوایی دەیدروونەوە و دەیکەنە گزرە.

**ئاوەوەرە** (نا. ل)[ئاو1 + ئە + وەر (خۆر) + ئە][هەو] ١ـ بڕ: ئاوەخۆرە/٣. ٢ـ بڕ: ئاوخۆری/٢.

**ئاوەها** (ئاک. ل)[ئا + وەها] بڕ: ئاوا2

**ئاوی** (نا.) ١ـ [هەو] بڕ: ئاو1 ٢ـ [زا] تۆوی پیاو و نێرینە. بڕ: ئاو1 /٧

**ئاویار** (نا. فا، ئان. فا)[ئاو1 + یار] [هەو ـ ئەر] بڕ: ئاودێر. ⁘ ئاویارەکەی سەوزەی ئارەزووم / دانا بە گردین راز کۆنە و نۆم (مەولەوی ل ٢٦٥).

**ئاویاریی** (حم.)[ئاویار + ئیی] بڕ: ئاودێری

**ئاویتن** (چا. م) بڕ: ئاویشتن

**ئاویتە** (ئان. مف.) بڕ: ئامیتە

**ئاویر** (نا.)[هەو] بڕ: ئاگر

**ئاویژتن** (چا. م) بڕ: ئاویشتن

**ئاویژە** (ئان. ل)[ئاو1 + ئی + ژە] زەراعەتێک کە دەبێ ئاو بدرێ، ئاویی، بەراو.

**ئاویشتن** (چا. م)[پەه: هەنداختەن ـ باک: ئاڤێتن، هاڤێتن ـ ناو: هاویشتن، ئاویشتن، ئاویتن، ئاویژتن، هاویژتن، هاویتن] ١ـ فڕێدان و تووڕدانی شتێک لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی دیکە بە حەوا دا. ⁘ تۆپەکە باوێ دەیگرمەوە. بەردێکی ئاویشتێ لە تەپڵە سەری دا. ٢ـ کۆ کردنەوەی حیساب بە چۆرت. ⁘ حیسابەکەمان باوێ بزانە دەکاتە چەند. هەرچی دەیهاوێم حسێبەکەم دروست دەر نایە. ٣ـ تەقاندن، گوللە تەقاندن.

**تێبینی:** هەنداختەن لە پەهلەویی دا بە هەردوو مانای توورِ دان و حیساب کردن هاتوە.

**ئـــاویـــلـــکـــە** (نــا. ل)[؟] دوایــن هـەناســـەکـــانـی ژیان، گـــیـــانەڵڵا، گیانکەنشت، سـەرەمـەرگ، گیانـەسـەر، ئـاوزەنـگـی، ئـاوزیـنـگ، ئـاوەزیـنـگ، هەوزینگ. **~ دان:** گـــەیشـــتنە دەمی مردن و گیان دان، ئاوزەنگی دان، گیان کەنین.

**ئاویە** 1 (نا.)[؟] ئامـرازێکە بۆ پێـوە لکاندنی دوو پارچە کانی لە یەکتر. ئاویە دەسکێکی چێـوی هەیە بۆ ئەوەی کـە دەست نەسـووتێ و مـیلەیەکی سـەر خواری ئاسنی پێوەیە کە لە کوورە دا یا بە ئـاور داغی دەکـەن و قـەلایی لە سـەر ئەو پارچە مـەعـدەنانەی کـە پێکەوەی دەنووسێنن رادەگرن، قـەلایی دەتوێتوە و دوو پارچـەکـە بـە یەکـەوە دەنووسـێن، هاویە. **~ دان:** جـۆش دان، لەحـیم کردن.

**ئـاویـە** 2 (نـا. ل)[ئـاو1 + یـە][ئـەر] زەراعـەتێک کـە دەبێ ئاو بدرێ، بەراو، ئاویی1.

**ئاویە** 3 (نا.)[؟][ئەر] کا و گڵی ئامادە بۆ سـواغ و بانـەناو، کـاگڵ. **~ دان:** لە دیوار هـەڵسـوونی ئاویە و لێک و لووس کردنی، سواغ دان.

**ئـاویـی** 1 (ئان. ل)[ئـاو1 + ئـیـی] ١ـ هەرچی کـە پەیوەندی بە ئاو هـەبێ. ؛؛ سـاعـەتی ئاویی. ٢ـ زەراعـەتێک کە دەبێ ئـاو بدرێ، بـەراو، ئـاویـە2. // دێم. ٣ـ ئەو گـیـا و گـیـاندارانـەی کـە لـە ئاو دا دەژین یا ئـەوەکـە ژیانیـان تا رادەیـەکی زۆر پـەیوەنـدی بـە ئـاو هـەیـە، ئـاوژی. ؛؛ ماری ئاویی، گیای ئـاویی. ٤ـ یەکێک لە سێ رەنگی ســەرەکی (زەرد، ســوور، ئاویی)، عابی، ئابی، ئاورەنگ.

**ئاویی** 2 (پاشـ.)[لە: ئـامـــیـتن] لە چاوگی ئامیتن و ئاوێتە کردن دەکەوێ و بـە ناو دەلـکێ و ئاوەڵناو ســاز دەکـــا، ئاڵوو. ؛؛ ئارداویی، قوراویی، ئارەقاویی، تۆزاویی.

**ئاوێ** (پاشـ.) بڕ: ئاوا1. ؛؛ میـراوێ، خدراوێ، داوداوێ، مامکاوێ، ...

**ئاوێتە** (ئان. مف.) بڕ: ئامیتە

**ئاوێر** (نا. فـــا، ئان. فـــا)[هەو] بڕ: ئاودێر

**ئاوێز** (نا.) ١ـ بڕ: ئاوێزە/١. ٢ـ بە هـەندێک وشـــەوە دەلـکێ و مـــانـای

هەڵاوەسراو دەدا. :: دڵاوێز، پەراوێز. رووی وەدەرنا تا بە تا زولفی دڵاوێزی بزووت/ ئاه و ناڵەی ئاشقان هات بوو بە رۆژی مەحشەرێ (وەفایی ل ١٩٠).

**تێبینی:** ئاوێز لە چاوگێکی لە بیر کراوی کوردیی (ئاوەسین) کەوتوە کە ئیمرۆکە شێوەی هەڵاوەسین (هەڵ + ئاوەسین) یا هەڵواسین - ی بە خۆوە گرتوە.

**ئاوێزان** (ئان. فا)[لە: هەڵاوەسین] هەر شتێک یا کەسێک کە بە کەس یا شتێکی دیکەوە هەڵاوەسرابێ، داڵۆسکە.

**ئاوێزە** (نا. ل)[ئاوێز + ئە] ١- هەر شتێکی وردە کە بە شتێکی گەورەتەوە هەڵاوەسرابێ و بلەرێتەوە. :: ئاوێزەی گوارە. ٢- جۆرێک شەمدان بوو کە چەندین پەلی هەبوو و لە میچ هەڵداوەسرا، چلچرا. (ئیمرۆکە لۆستر و لامپ جێی ئاوێزەیان گرتۆتەوە.)

**ئاوێژ** (ر.) رەگی رابوردووی ئاویژتن یا ئاویشتن کە بە ناوەوە دەلکێ و ناوی فاعلی ساز دەکا، هاوێژ. :: تیراوێژ، بەرداوێژ، ئارداوێژ.

**ئاوێنە** (نا.)[پار: ئادینگ - پەه: ئادێنەک، ئەدڤێنەک. لۆر: ئایێنە - فار: آینە - بیر: ئێینە. باک: نەینک، نەیک - ناو: ئاوێنە، هاوێنە، نەینۆک - باش: ئاینە] پارچە شووشەیەکە کە پشتەوەیان مشت و ماڵ داوە و هەرچی لە بەرامبەری دانێن نیشانی دەداتەوە و مرۆڤ بۆ خۆ تێدا دیتن و خۆ رازاندنەوە و هەندێک کاری زانستی کەلکی لێوەردەگرێ. زەمانی زوو بەشەر بە تیف تیفە دانی زێو، زێڕ، زەرد ئاوێنەیان ساز دەکرد بەڵام لە دەورووبەری ساڵی ١٣٠٠ زایینی ئاوێنەی شووشەیی جێی ئەو ئاوێنانەی گرتەوە. ئاوێنە گەلێک چەشنی هەیە و هەر کام بۆ مەبەستی تایبەتی خۆیان ساز دەکرێن، جام، جامەک، هێلی، هیلی، مرێک. || **ئاوێنەی باڵابەژن:** ئاوێنەیەکی چوارگۆشەی درێژووکە کە تەواوی باڵای تێدا ببیندرێ، ئاوێنەی باڵاروان، ئاوێنەی باڵانوان، ئاوێنەی باڵانوێن. **ئاوێنەی باڵاروان:** بڕ: ئاوێنەی باڵابەژن. **ئاوێنەی باڵانوان:** بڕ: ئاوێنەی باڵابەژن. **ئاوێنەی باڵانوێن:** بڕ: ئاوێنەی باڵابەژن. **ئاوێنەی بەخت:** ئاوێنەیەک کە لە شایی و زەماوەند دا لە بەرابەر بووکی دادەنێن. **ئاوێنەی دووروو:** ئاوێنەیەک کە پشتەکەشی ئاوێنە بێ.

**تێبینی:** هەندێک رایان وایە ریشەی

ئاوێنە دەچێـــتـــەوە ســـەر ئاو و وێنە بەڵگەشیـان ئەوەیە کە کۆنترین شێوەی ئاوێنە کە بەشەر خۆی تێدا دیوە ئاو بوە و دوایی کـــە ئامـــرازێکی وەهای ســـاز کردوە و ناوی ناوە ئاوێنە (بڕ: قامووس ب ١ ل ١٠١). ئاشکرایە ئەو مـــانایە لە رواڵەتی ئاوێنەوە کـەوتوە و ناچێـتـەوە سەر ریشـەکەی. ئاوێنە لە [ئا13 + وێن + ئە] پێک هاتوە. ئا پێـــشگرە و وێن دەچێتەوە سەر ریشەی ئەوێستایی ڤین vin و هیندیی کۆن ڤێن ven بە مانای بینین. رەگی بین لە ناوەندیی و وین لە هەورامی و ڤین لە زازایی دا هێـشـتـا ماوە و ئاڵوگۆڕیان بە سەر دا نەهاتوە.

**ئاوێنەبەند** (ئان. ل)[ئاوێنە + بەند] دیوێکی گـــەورە کـــە دیوارەکـــانی بە ئاوێنەیەکی زۆر رازابیــتـــەوە و ئەوەش تایبــەتی کۆشک و تەلاری سامـــاندار و دەوڵەمەندی گەورە بوە. :: کۆشکی ئاغا گەچ کارییە، ئاوێنەبەندە/ کەس نازانێ بە ژمـارە، پەنجـەرەی چەندە (گـۆران ل ٥٧).

**ئاوێنەدار** (نا. فـا، ئان. ل)[ئاوێنە + دار2] کـەسـێک کـە ئاوێنە لەبەر بووک رادەگرێ، ئاوێنە بە دەستی بەر بووک.

**ئاوێنەداریی** (حم.)[ئاوێنەدار + ئیی] کـاری ئاوێنە راگـرتن، کـار و پیشـەی کەسی ئاوێنەدار.

**ئاه** (نا. د) ١ـ بڕ: ئاخ. ٢ـ دوعـا، نزا، تووک، هـەناسـەی سـارد. :: ئەوە ئاهی ئەو خـەڵکە زۆڵم لێکراوەیە کـە ئاوری دە ماڵ و حاڵی بەربوە. ٣ـ هەناسە، نەفەس. ٤ـ (مـجـ.) نەخـتـێک، بە ئاسـتـەم و دوو بەلا، کـەمـێک، مـاوە و مـەودایەکی زۆر کـەم. **~ گـرتن:** تووشـی کـارەسـات و نارەحـەتی و ناخـۆشی بوون بـە دوعـا کەسی مـەزلووم . :: جەماڵت ئاهی من گرتی خەتی سەبزت بە سەر دا کەوت / چەمەن رابورد و سـەرما هات و تێکچوو نەوبەهاری تۆ (وەفـایی ل ١١١). **~ مان:** دواین پشوو دان، هەندێک مان. :: هەر ئاهێکی مابوو کابرا وەبەر ماشێن بدەم. ئاهێکی مـابوو بی ئەنگێوم. چۆن بە سـەری پیـری کـاری وا دەکـەم هەر ئاهێکمان ماوە بمرم. **~ پێوە مان:** بە حـاڵ بـەند بوون، دواین پشـوو و دواین ئاه بۆ گیاندار و کەل و پەل، نزیک تەواو بوون و دوایی هـاتن، ئاه تێدا مـان، ئاه دە بەر دا مـان. :: رانک و چۆغـەکـەی ئاهێکی پێوە نەمابوو کەچی هەر دەبەری دەکـرد. **~ تێـدا مـان:** بڕ: ئاه پێـوە

مان. **~ دە بەر مان:** بڕ: ئاه پێوە مان. || **ئاهی دەروون:** ئاخ و داخ و خەفەتێک کە دە دڵ دا کۆ بۆتەوە. ؛؛ بەو گەردەنە هەرتا شکەنی زولفی دوو تات بێ / دەگریم و لەگەڵ ئاهی دەروون سۆزی دڵم دێ (وەفایی ل ١٧٧). **ئاهی سارد:** داخ و نارەحەتییەک کە مرۆڤی غەمبار و داخدار بە هەناسە هەڵیدەکێشێ. **ئاهی سەرد:** بڕ: ئاهی سارد. ؛؛ لە ناڵەی گەرمی دڵ باکت نەبوو تۆ / بە ئاهی سەردی مەحوی من دڵم سووت (مەحوی ل ٨٢). **ئاهی نەگرفتە:** جار و بار، بەهەڵکەوت. ؛؛ ئاهی نەگرفتە دەچمە راوێ ...(میرزا ل ٣٢)

**ئاها** (ئام.) ١ـ وشەی سەرسورمان، ئەها. ؛؛ ئاها کە وابوو کوتی نایەم! ئاها تازە تێگەیشتم دەڵێی چی! ٢ـ وشەی دەربڕینی تووڕەیی، ئەها. ؛؛ ئاها دە لە کۆڵم بەوە! ئاها خۆ ئەو منداڵە دیسان هاتەوە. ٣ـ وشەی وریا کردنەوە. ؛؛ ئاها کاکە سەرت وە دیوار نەکەوێ! ئاها نەکەوی! ٤ـ وشەی دەنگ دان و لێخورینی کەڵ و گامێش.

**ئاهار** (نا.)[؟] شلەیەکی سازکراوە لە نیشاستە یا کەتیرە کە لە پارچەی هەڵدەسوون هەتا رەق و شەق بێ، ئاش، دەق، شوو.

**ئاهر** (نا.)[هەو] بڕ: ئاگر. ؛؛ ئاهر جەستەم هەر نەبی خامۆش / تا قرچەی جەرگم شنەفتم بە گۆش (وەلی دێوانە)

**ئاهرناک** (ئان. ل)[ئاهر + ناک][هەو] خاوەن ئاگر، ئاگرین، تێکەل بە ئاگر. ؛؛ چەندێوەن چە دین شای شەم دوور کەفتم / سفتە و ئاهرناک، ساتێ نەسرەفتم (وەلی دێوانە ل ٥٧)

**ئاه و ناڵە** (نا. چا)[ئاه + و + ناڵە] کرووزانەوە، ناڵەناڵ، گازندە بە دەم ناڵەوە، ئاه و ناڵین. ؛؛ سەدای یاهووی دەروێشان هات، ئاه و ناڵەی دڵڕێشان هات/ رەگ و رووحم وەئێشان هات، یا غەوسی سانی هیممەتێ (وەفایی ل ١٨٠).

**ئاه و ناڵین** (نا. چا)[ئاه + و + ناڵین] بڕ: ئاه و ناڵە. ؛؛ لە باغان ئاه و ناڵین دێ، دەڵێن شای نێو گوڵان ڕۆیی/ لە مەیخانان سەدای شین دێ، مەگەر پیری موغان ڕۆیی (وەفایی ل ٢٠٥).

**ئاه و نزا** (نا. چا)[ئاه + و + نزا] تووک و دوعا، داوای داد کردن لە خودا بۆ ستاندنەوەی حەق، ئاه و نزولە.

**ئاه و نزولە** (نا. چا)[ئاه + و +

نزووله] بڕ: ئاه و نزا

**ئاهۆ** (نا.)[ئەو: ئەهو ـ پەه: ئاهۆک، ئاهووک] ١ـ هەر نەخۆشییەکی کە خەڵکێکی زۆر تووش بکا. میکرۆبی ئەم نەخۆشیە یا لە هەوا دا بڵاو دەبێتەوە یا ئەوە کە خەڵک لە یەکتری دەگرنەوە، پەتا، درم. ٢ـ عەیب، کەمایەسی، کەم و کووڕی، ئاهوو. ٣ـ [ئەر] فێ، شێتی

**تێبینی:** ئەوێستایی و پەهلەویی ئەم وشەیە بە مانای دوهەم هاتوە و وێدەچێ ماناکانی دیکە دوایی لە عەیبەوە کەوتبێن.

**ئاهوو**[1] (نا.)[بڕ: ئاهۆ] عەیب، کەمایەسی، ئاهۆ :: حافز بۆ وە عەشق مەستان یا هوو / بپێچەش نە دەور باهووی بێ **ئاهوو** (مەولەوی ل ٢٣٢).

**ئاهوو**[2] (نا.)[فار: آهو][کلاسیک] بڕ: ئاسک. :: ئازیز شۆخ شەنگ شیرین تارەنی / **ئاهووی** بێ ئاهووی وەش ڕەفتارەنی (مەولەوی ل ١٦٥). لە عیشقی تۆ هیلاکی ئەو دڵەی دێوانە دوو چت بوون/ وەک ئاهوو چاوڕەش و وەک غونچە زاری پڕ شەکەرخەندە (وەفایی ل ١٢٠).

**ئاهەڕا** (نا. ل)[هەو] بڕ: ئاهەڕێ.

**ئاهەڕێ** (نا. ل)[ئاه +ئە +ڕێ] ڕێگایەکی باریک کە بە حاڵەحاڵ شوێنی دیار بێ، ئاهەڕا، تووڵەڕێ، کوێرەڕێ، ڕێچکە.

**ئاهەک** (نا.)[؟] بڕ: قسڵ

**ئاهەنگ** (نا.)[پەه: ئاهەنگ] ١ـ کۆڕی بەزم و شادی و خۆشی. ٢ـ هەوای گۆرانی، مێلۆدی. ٣ـ دەنگ، سەوت. **~ گرتن:** بڕ: ئاهەنگ گێڕان. **~ گێڕان:** ساز کردن و بەڕێوە بردنی کۆڕی شادی و خۆشی بە هەر بۆنەیەک، ئاهەنگ گرتن.

**تێبینی:** ئاهەنگ [ئا 13+ هەنگ] لە ڕیشەی ئەنگ thang ـ ی ئەوێستایی بە مانای سەنگان و هەڵسەنگاندن کەوتوە.

**ئاهەنگساز** (ئان. فا)[ئاهەنگ + ساز] کەسێکی شارەزای مووسیقا کە ئاهەنگ و مێلۆدی ساز دەکا.

**ئاهەنگسازی** (حم.)[ئاهەنگساز + ئیی] ئاهەنگ ساز کردن، کار و پیشەی کەسی ئاهەنگساز.

**ئاهی** (پاشـ.)[باک] بڕ: ئایی. :: بیناهی، ڕۆناهی.

**ئاهیر** (نا.)[هەو] بڕ: ئاگر

**ئاهیرین** (ئان. ل)[ئاهیر + ئین][هەو] بڕ: ئاگرین. ﷼ نامەکەت یاوا کۆسم کەفتەوە / دڵەی ئاهیرین دا وە نەفتەوە (مەولەوی ل ٤٣٦).

**ئاهین** (نا.)[هەو] بڕ: ئاسن. ﷼ جەزبەی ئاهینم دەماخ دان پەرداخ / میقناتیز تۆی جام کەردەن وە یاتاخ (مەولەوی ل ٤٥٢)

**ئاهینگەر** (نا. ل)[ئاهین + گەر][هەو] بڕ: ئاسنگەر. ﷼ نە ئاهینگەریێ، نە ئاهینگەریێ / ئارۆ راگەم کەفت نە ئاهینگەریێ (مەولەوی ل ٤٤٤).

**ئای**[1] (نا. د) بۆ ئەم مەبەستانە دەکار دەکرێ ١ـ لە کاتی هاوار کردن و دەربڕینی ئێش و ئازار، ئاخ، ئۆف، ئایش. ٢ـ بۆ دەربڕینی خەم و خەفەت، ئاخ، ئۆف. ٣ـ لە کاتی سەرسوڕمان و واق وڕمان، ئەی، های. ﷼ ئای لەو دنیا سەیرەی چۆنی هێنایەنە خوارێ. ٤ـ بۆ گاڵتە و فشە کردن بە کەسێ، های، هەی.

ـ **ئای**[2] (ئام.) یەکێک لە دوو نیشانەکانی چاوگ لە زاراوەی هەورامی دا. ﷼ مەڕیای، پڕیای، ئامای، لوای.

**ئای ئای** (نا. د)[ئای1 + ئای1] ١ـ لە کاتی واق وڕمان و سەرسوڕمانی زۆر دەکوترێ، ئاییەی. ﷼ ئای ئای خۆ لێم دەگەڕێتەوە! ئای ئای خۆ حەیاشی نیە! ٢ـ هەوایەکی کوردییە کە سەربەندەکانی بە ئای ئای دەست پێدەکا و بەندەکانیشی کرووزانە و لاڵانەوەیان تێدایە.

**ئایا** (ئام.) ئامرازی پرسیار کردن، ئاخۆ، ئاخوا، ئایاکوو، ئایەکوو، ئایە.

**ئایات** (نا.)[عەر: آيات] کۆی ئایەتە بە مانای رستەکانی قورئان.

**ئایاکو** (ئام.) بڕ: ئایا

**ئایدیا** (نا.)[یون: idea] بڕ: ئیدە

**ئایدیال** (نا.)[فەر: ideal] بڕ: ئیدەئال

**ئایدیالیست** (نا.)[فەر: idealiste] بڕ: ئیدەئالیست

**ئایدیالیسم** (نا.)[فەر: idealisme] بڕ: ئیدەئالیسم

**ئایدیۆلۆژی** (نا.)[فەر: ideo-logique] بڕ: ئیدەئۆلۆژی

**ئایر** (نا.)[هەو] بڕ: ئاگر

**ئایرە** (نا. ل)[ئایر + ئە][هەو] بڕ:

**ئايرين** (ئان. ل)[ئاير + ئين][هەو] بڕ: ئاگرين

**ئايســـان** (چا. ل) ١ـ ســـووتانی هەر شتێک کە گەرما و بە تايبەت رووناکی هەبێ. ٢ـ (کنـ.) جوانی لە رادە بەدەری مێينەی مرۆڤ. ؛؛ مريەم هێند جوانە دەڵێی چرايە دايسێ.

**تێبينی:** ليسا lysa لە سويدی دا، lichten لە ئاڵمـــــــانی دا هەر بەم مانايەن.

**ئايســـاندن** (چا. م)[لە: ئايســـان] هەڵکردنی هەر شتێک کە گەرما و بە تايبـــەت رووناکی هەبێ. ١ـ هەڵکردنی ئاگر و ســـووتەمـــەنی ٢ـ هەڵکردنی ئەو کەرەسانەوی بە نەوت و گاز کار دەکەن. ٣ـ پێکردنی چرا و لامپی بەرق.

**ئايش** (نا. د) وشەی دەربڕينی ئێش و ئازاری مادی، ئاخ، ئای/١.

**ئايشە گوێدرێژ** (نا. ل)[ئايشە (ناوی ژن) + گوێدرێژ] ١ـ گياندارێکی خەياڵی چيرۆکە کە دايکان منداڵەکانيانی پێ دەترسێنن. ٢ـ (کنـ.) کەر، گوێدرێژ.

**ئايلەمەن** (گيانـ.)[ئايل (عەر: عين = کـانی) + ئە + مـەن (مـەل)][ئەر] بڕ: خەزايی

**ئاينده** (نا.، ئان.)[فـــار: آينده] بڕ: داهاتوو

**ئاينە** (نا.)[باش] بڕ: ئاوێنە

**ئاين و ئۆين** (نا. ل)[ئاين (ئايين) + و + ئۆين] ١ـ مـەکـر، فـرِوفـێڵ. ٢ـ ناز و نووزی ژنان.

**ئايە** (نا.) بڕ: ئاييا

**ئايە** (ئام.) بڕ: ئايا

**ئايە** (نا.) بڕ: ئايەت. || **ئايەی قورئان:** ١ـ هەر کام لە رستەکانی قورئان، ئايە، ئايەت. ٢ـ (کنـ.) هەر قسـە و کردەوە و کارێکی کە شياوی گۆڕان و ئاڵوگۆڕ نەبێ. :: چۆن دەڵێی کـه دەبێ هەمـوو رۆژێ نانی ســاز کـەم، بۆ دەنا ئايەی قورئانێيە؟

**ئايەت** (نا.)[عـــــەر: آية] ١ـ هەر رستەيەک لە رستەکانی قورئان يا کتێبە پيرۆزەکانی ديکە، ئايە. ٢ـ نيشانە.

**ئايەتی** (پاشـ.)[باک: تی، يەتی ـ ناو: ئايەتی، ئەتی، ئێتی، يەتی ـ هەو: ئايەتی ـ زا: ئـەی، يـەی] ١ـ بـە دوای نـاووەوە دەلکێ و ناوێکی تازە ســاز دەکــا. ؛؛

دۆســـــتـــــایەتی، کـــوردایەتی، ژن و مـێـردایەتی. ٢ـ بە نـاوی عـەشـیـرەت و عێلانەوە دەلکێ و ناوی زێدەکەیان دیاری دەکـا. :: باڵەکـایەتی، سـۆسـنایـەتی، مەنگوڕایەتی.

**تێبینی:** ١ـ ئەگـەر دواین پـیـتـی وشـە پیـتـی بزوێنی بڵندی وەک **ئا** و **ئوو** یا **ئۆ** بێ ئای پاشگر دەسوێ و یەتی بە خۆوە دەگرێ. :: برا + ئایەتی = برایەتی، ئاغا + ئایەتی= ئاغـایـەتی. ٢ـ ئـەگـەر دواین پیتی وشە بزوێنی کورتی وەک ئی بێ یا بزوێنەکـە دەبێـتـە **ی** و دەگـەڵ پاشـگر پێکەوە دەلکێن یا ئەوە کـە بـزوێنـەکــە دەســـوێ و ئـای پاشـگریش دەســـوێ و دەبێـــتـــە ئێــتی. :: برسـی + ئایەتی = برسیایەتی، برسێتی

**ئایەر** (نا.)[هەو] بڕ: ئاگر

**ئایەکو** (ئام.) بڕ: ئایا

**ئایی** (پاشـ.)[باک: ئاهی ـ ناو: ئایی ـ هـەو: ئـایـی] ١ـ بـە دوای ئـاوەڵـنـاوەوە دەلکێ و دەیکا بـە حـاسلی مـەسـدەر. :: درێژایی، رووناکـایی، پانـایی ٢ـ بە دوای ناوەوە دەلکێ و نـاوێکی تازە سـاز دەکـا. :: گۆڕایی، دەشتایی.

**ئاییـا** (نا.)[؟][ئەر] خـوشـکی باوک، پوور، میمک، میمی، ئاییە، ئایە، ئامە.

**ئایین** (نـا.)[هیـک: ئـەدهـڤـــەن ـ ئـەو: ئـەدڤـــەن، ئـەذوەن ـ پەه: ئـەدڤـــێن. نـاو: ئایین ـ هـەو: ئایین] ١ـ دین، مەزهـەب، ڕێ و شـــوێنی دینی. :: ئایینی ئیـســـلام، ئـاییـنی مـــووســـا. ٢ـ ڕێ و شــــوێنی کۆمـەڵایەتی، داب و دەستـوور، نەریت. ٣ـ بیر و را، بیر و بڕوا. ٤ـ شێوە، شێواز.

**ئایینە** (نا.)[فار: آینە][کلاسیک] بڕ: ئاوێنە. :: ئایینە بـەمـاییـنە دەبـێ ڕەنگ نوما بێ / مـەسـتـوورە بەمەسـتـوورە دەبێ موهرەگوشا بێ (نالی ل ٦٠٦).

**ئایینی** (ئـان. ل)[ئـایـین + ئـی] هـەر شتێک کە پەیوەندی بە مەزهەب و دینەوە هەبێ. :: مـــەلای ئایینی، برای ئایینی، کتێبی ئایینی.

**ئاییە** (نا.) بڕ: ئاییا

**ئاییەی** (نا. د) بڕ: ئای ئای.

# ب

**ب**[1] دووهەم پیتی زمانی کوردیی کە بە بێ دەخوێندرێتەوە ، پیتێکی بێدەنگە و دە وشە دا بە چوار جوور خۆ دەنوێنێ (بـ ، ـبـ ، ـب، ب)(بار ـ سـبـەی ـ رمب ـ باب). پیتی **ب** دەگەڵ هەندێک پیتی دیکە ئاڵوگۆڕی هەیە: دەگەڵ پیتی **ڤ**: بیست، ڤـیـست ـ باب، باڤ. دەگـەڵ پـیـتی **و**: بیست، ویس ـ باران، واران. دەگەڵ پیتی **پ**: باڵتۆ، پاڵتۆ ـ بەڵگ، پەلک، بەرسیلە، پەسـیـرە. دەگـەڵ پـیـتی **م**: بزۆڵ، مـزۆڵ ـ بێشە، مێشە ـ بڕبەند، مڕمەند.

**ب**[2] (پێـشـ.) ١ـ دەچێـتـە سـەر رەگی کـردار و ئەمـری لێ سـاز دەکـا. ⁘ بڕۆ، بیـدەوە، بکە، بڵـێن. ٢ـ ناو یا ئاوەڵناوی فاعلی سـاز دەکا. ⁘ بگیر (گرتن)، بژیو (ژین)، بوێر (وێران)، بخۆر (خواردن).

**ب**[3] (پێـشـــ.)[باک] ١ـ بڕ: بە. ⁘ ب دل، ب جـــەرگ، ب دەست. ٢ـ بە، ئاوی. ⁘ ب کەف (کەفاوی).

**با**[1] (نا.)[ئێک: ڤاتە ـ ئەو: ڤاتە ـ پاز: وات ـ پار: وەد ـ سوغ: وەت ـ خوار: واد ـ

پەھ: ڤات. تات: ڤا ـ فار: باد ـ بیر: باد ـ لۆر: بای. باک: با، بای ـ ناو: باـ باش: وا، با، باد، باگ ـ هەو: وا ـ زا: ڤـا] ١ـ بزووتنەوەی هەوا، جـوولانەوەی نەرم یا توندی هەوا کــە لە بەر تێک چوونی بەرابەری هەوای گەرم و سارد پێک دێ. زۆربەی بایەکـــان لە بەر هـوروژمی ئاتمۆسفێرە لە لایەکی کە زۆرترە بەرەو لایەکی کە کەمـترە. با بە پێی وەرز و کـات و توندی و نەرمی لە کـوردیی دا ناوی تایبـەتی خـۆیان هەیە. ፡፡ شنەبا (شنە)، گـژەبا، زریان، شـەمـاڵ، بای قــۆرغێ، ... ٢ـ جــوولانەوەی هەوای دەسکرد. ፡፡ بای کولێر سارد و خۆشە. ٣ـ تس، فس، گـازێکی بێـدەنگ کـە لە پاشـەوەی لەش بەردەدرێ. ٤ـ مـاسین و پەنەمینی شوێنێک بە ئاو و باران ... یان لەش بە هۆی وێکەوتنی شتێکی قورس. ٥ـ هەڵماسینی لەش بە هۆی خواردن. ፡፡ زگ بە نۆک بای دەکـا . ٦ـ هەوای نێـو تیوب و چەرخ. ፡፡ ماشێنەکە بای نیە، ئەو دووچەرخـەیە بایەکـەی بەتاڵ بوە. ٧ـ (کنـ.) توند، خێرا. ፡፡ هەر ئێستا برایمم دیت نازانم چ کارێکی هەبوو، سـلاویشی نەکرد و وەک بای تێپەری. ئەسـپێکم هەیە وەک با دەفڕێ. ٨ـ (مجـ.) بە هێند نەگرتنی قسە، هیچ نەبوون و بێ کەلک بوونی کارێک. ፡፡ گوێ بگرە لە من هەر چی مـەلا و شـێخ گـوتیـان / دە گـوێی مەگرە لات وەکو با بێ مەیگێڕ (خەییام ل ١١). ٩ـ یەکـێک لە چوار عـونســوری (خـاک، ئاو، ئاگر، با). ١٠ـ رۆماتیزم. (بـــڕ: بـــادار). ١١ـ ژان، بـــرک. ژان و برکـێکە لە نێـو لەشی مـرۆڤ کـە هۆی عـەسـەبی هەیە و بە لەش دا دەگـەڕێ و هەر جـار لە جـێگەیەک سـەرهەڵدەدا. ፡፡ دوو سێ رۆژە پشتم زۆر دێشێ نازانم چ بکەم؟ ـ چ نیـە چاک دەبی ئەوە بایە بۆ خـــۆی تەواو دەبێ. ~ **تێـــدان:** ١ـ تووشی ئازاری باداری هاتن. ٢ـ بڕ: با تێکردن. ~ **تێکردن:** ١ـ هەڵمساندن، فوو تێکردن. ٢ـ هاندانی کەسێک بە پێ هەڵکوتن و لە خۆ دەربردنی. شوتی دەبن هەنگڵ نان. ፡፡ کەریم هێندە بە غـیرەت نیـە شـەڕ بکا وادیارە بایان تێکردوە. ٣ـ پڕ کــردنی تێــوبی چەرخ لە هەوا بە ئامـرازی باداری وەک ناسووس دەسـتی یا بەرقی. & با کــردن. ~ **خــستن:** وەستانی با، تەواو بوونی با. ፡፡ بایەکەی خستوە و پێت خۆش بێ دەتوانین بچینە مـاسـیـان. ~ **دەر کـردن:** چارەسـەر کـردنی باداری بە چوونە سـەر چاک و



پیران. ~ **دەرک لێ نەکردنەوە:** (کن.) ئاسوودە و بێ مزاحم بوون، کەس کار پێنەبوون و خۆ تێنەگەیاندن. ~ **کردن:** ١ـ هەڵمسانی زگ، ماسین. ∷ ئەو مەڕە ئەوەندەی وێنجەی خواردوە بای کردوە. ٢ـ بڕ: با تێکردن. ~ **کەوتن:** راوستانی با، تەواو بوونی با. ∷ پێم وا نیە بەم زوانە بایەکە بکەوێ. ~ **لێبەربوون:** بەر دانی تس، با لێبوونەوە. ~ **لێبوونەوە:** بڕ: با لێبەربوون. ~ **لێدەر چوون:** با لێبەربوونی لە نەکاو. ∷ ئاسۆ بایەکی لێدەر چوو و وە رووی خۆشی نەهێنا. ~ **هەڵکردن:** با هاتن. **بە ~ چوون:** بە فیرۆ چوون، لە دەست دەرچوونی شتێک بە هاسانی. ∷ نیوەی تەمەنمان لە خۆڕا بە با چوو. **بە ~ دان:** بە فیرۆ دان، فەوتاندن. ∷ هەموو میراتی بابی لە ماوەیەکی کەم دا بە با دا. **بە ~ کردن:** لە بەر با شەن کردنی خەرمان بۆ جیا کردنەوەی دان و کا لەیەک، شەن کردن. || **بای داراوس:** بایەک کە لە دوا رۆژەکانی زستان هەڵیدەکاتێ و دار چەکەرەی پێدەردەکەن. **بای خەزان:** بای پایزی کە گەڵای دار و درەخت دەوەرێنێ. **بای دەبوور:** بایەک کە لە لای رۆژاواوە بێ، دەبوور، بای ماشەڵان. // بای سەبا. **بای پێچەوانە:** بایەک کە بە پێچەوانەی ویست و نیاز بێ بە تایبەت بۆ کەشتیەوان. ∷ لەبەر بای پێچەوانەی غەم لە هیچ لا ناگرم وەقرە/ لە عەردی وشکی دووری جاویدانا مەوجی دەریا خۆم (بێخود ل ٥٣). **بای زریان:** بایەکی ساردە کە لە لای باشوورە هەڵدەکاتێ، بای قوبڵە. ∷ هەناسەی عاشقان با نەتگرێ، بێ مروەتی تاکەی / بترسێ ئەی گوڵی نازک بەدەن لەو بایی زەریانە (وەفایی ل ١٤٢). **بای سوور:** نەخۆشییەکی پێستە کە بە هۆی باکتری [فەر: streptocoque] پێک دێ و لە دەم و چاو دەدا ، شوێنەکە هەڵدەمسێ و رەنگی سوور دەبێ، سوورەبا، بای مەبارەک، بنەوشی، وەنەوشی (ئین: erysipelas ـ عەر: داءالحمراء). **بای سەبا:** بایەکی فێنک و خۆش کە لە لای باکووری رۆژهەڵاتەوە دێ. // بای دەبوور. ∷ بۆی وەنەوشە و سونبولە سەحرا سەراسەر تۆ دەڵێی/ بای سەبا عەنبەر دەبارێنێ لە دەشت و کۆهسار (وەفایی ل ٤٠). **بای سەرسەر:** ١ـ بای سەخت و سارد. ٢ـ بای بە وژە و

دەنگدار. :: ئەگریجە لە سەر گۆنا دەکا شەڕ / هارەی گوارەی دێ وەکوو بای سەرسەر (سەعید و میرسیوەدین ل ٣٧). منیش کاتێ دەزانی پێم هەڵەنگووت / ئەجەل بای سەرسەرە ئێمەش پەڕوپووت (حاجی قادر ل ٢٤٤). **بای سەبوون:** بڕ: بای سەمووم. **بای سەمووم:** بای گەرمی بەزەر و ژاردای هاوینی ناوچە گەرمەکانە، بای سەموون، بای سەبوون، شەڕا. **بای سەموون:** بڕ: بای سەمووم. **بای شەماڵ:** بایەکی باکوورییە، لە سەرەتای بەهار دا هەڵدەکا و بەفری دەتوێنێتەوە، شەماڵ. **بای قوبلە:** بڕ: بای زریان. **بای قورغی:** بایەکی ناوچەیی سارد و توند و بە تەپ و تۆزە (قۆرغ قۆپییەکە لە مەهاباد). **بای ماشەلان:** بایەکە لە لای ڕۆژاواوە دێ، بای دەبوور، ماشەلان. **بای نێو زگ:** گازی نێو گەدە و ریخۆڵەکان کە دەبێتە هۆی قوورەی زگ. **بای مەبارەک:** بڕ: بای سوور. **بای وادە:** بڕ: بای وەعدە. **بای وەشت:** بایەکی سووکە کە بارانی بە دوا دا دەبارێ. **بای وەعدە:** بای شەماڵە کە هەژدە ڕۆژی مابێ بۆ نەورۆز هەڵدەکا و بەفر دەتوێنێتەوە. :: کوتی: رووم وا دەکەم تێرم ببینی، چاوەڕێم داخۆ / لە لای قیبلەم کە کەی بای وەعدە بێنی نەستەرەن بێنێ (وەفایی ل ٢٠٤).

**تێبینی:** ڤاتە vāta لە ئەوێستا دا بە ناوی فریشتەی با هاتوە.

**با [2]** (نا.)[باک] سواوی وشەی بانگ. (بڕ: بانگ)

**با [3]** (نا.)[ناو: با ـ زا: با] باب، باوک.

**تێبینی:** لە زاراوەی ناوەندیی دا وشەی با سەربەخۆ نیە و وەک سواوی باب لە ناوی دیکە دا خۆ دەنوێنێ. :: باپیر، باپیرە (بڕ: باب)

**با [4]** (ئاک.) وڵامی ئیختیار یا توانین لە کارێکە کە زۆر و جەبر یا نەتوانینی تێدا بێ، بەدی. :: ـ نابێ بچی. ـ با هەر دەچم. ـ ناتوانێ هەڵیگرێ. ـ با دەتوانێ. **|| بابا:** داگرتنێکی پتر نیشان دەدا کە دڵنیای تێدایە. :: بابا چوە. بابا دەیخوێنم.

**با [5]** (ئام.) ١ـ ئەمری سواو لە چاوگەی هێشتن یا هێلان، بلا، بلا، بەلا، بەرا، بێلە، بهێلە، ئیزن بدە، لێگەرێ، دەبا. :: با بێ بزانین دەڵێ چی. با بخوا قەیدی نیە. رەوتی سوانی ئەم وشەیە بەمجۆرەیە (بهێلە ـ بێلە ـ بلا ـ با) و هەندێک جار بۆ داگرتنی پتر دەگەڵ

ئەمری بنەڕەتی خۆ دێ. :: بێڵە با بێ. بیهێڵە با ئەو منداڵە بنوا. ٢ـ ئامرازی شەرتە. :: با ببینم دەزانم چی لێدەکەم.

**با**[6] (نا.)[عەر: باه] مەیل و هەوەسی جووت بوونی نێر و مێ بە تایبەت بۆ سەگ، هۆک. (بڕ: بەبا). **وە ~ هاتن:** ١ـ پەیدا بوونی مەیلی جووت بوونی دێڵ و مێیەی هەندێک گیانلەبەر دەگەڵ نێرینەکەیان. ٢ـ (مجـ.) ژن یا کچێک کە مەیلی لە پیاو بێ.

**تێبینی:** زەبیحی نوسیویەتی: لە زمانی فارسی و عەرەبی دا (باه) بە مانای (هێزی جنسی) بۆ ئینسان بەکار دێت. (قامووس ب ٢ ل ٩). هەروەها هەژار باه ـ ی عەرەبی بە مانای وزەی گان کردن هێناوەتەوە سەر ئەم بایە (هەنبانە بۆرینە ب ١ ل ٣٧).

**با**[7] (نا.)[باک: با ـ ناو: با، باد ـ باش: وا ـ هەو: باد] پێچ، خول، سوڕ. **~ پێدان:** بڕ: با دان. **~ خواردن:** خول خواردن، پێچ خواردن. **~ خواردنە سەر یەک:** لێک هاڵان و کەوتنە سەر یەکی دوو شت یا چەند شت لە یەکتر. :: ماسوولکەکانی باسکی پاڵەوان کەریم وەک گرێی قەیسی بە سەر یەک دا بایان خواردبوو. **~ دان:** ١ـ لوول دان، سووڕاندن و پێچ دانی (بەن و دزوو و تەناف ...) بۆ گشت بوون و قایمتر بوونیان، با پێدان. :: ئەو بەنانە بێنە بایان دەین. ٢ـ سووڕاندن بۆ قایم کردن یا کردنەوەی هەر شتێک کە پێچی هەبێ. :: ئەو پێچە بادە با چاک بچێتە ژوور. کە دەستی ڕۆژگار بای دا سەری من / سەری شووشەی شەراب وا چاکە بادەم (تاریک و روون ل ١٣٠). ٣ـ سووڕاندن و پێچ دانی بەشێک لە ئەندام بۆ ناز و پۆز و لەنجە. :: چاو ئەو بەر و سمتەی چۆن با دەدا. & با پێدان. **~ دانەوە:** ١ـ لادان لە سەر بیر و بڕوا و چوونەوە سەر باوەڕی پێشوو. ٢ـ گەڕانەوە، پاشگەز بوونەوە. :: لە نێو مەنگوڕان دا بادانەوە عەیب نیە ٣ـ سووڕاندنەوە، وەرگەڕاندنەوە. :: ئەو گوڵدانە هەندێک بادەوە با ببینم بزانم ئەو بەری چۆنە. ٣ـ کەوانە کردن، کل کردن. :: گوللە وە دیوار کەوت و بای داوە. سووارە بە ڕێگای خۆی دا دەڕۆیشت هەر چاوی بە مرۆت کەوت بۆ لای بایداوە. فەرمانی ماشێنەکە بۆ لای راست بادەوە. **~ دانەوە سەر:** واز هێنان لە کار و مەسەلەیەک و چوونەوە

سـەر باری پێشوو. ⁂ کەریم لە نـەجارێ بایداوەتـەوە سـەر ئاسنگەری. **خـۆ ~ دان:** ١ـ سـەمـا کردن. ٢ـ بە لـەنجـە و لار ڕۆیشتن. **لێ ~ دان:** هەڵقورینجاندن.

**با**[8] (نا.)[باک] بڕ: باڵ2. ⁂ ل با وان (لە باڵ ئەوان دا)

**با**[9] (نا.)[پەھ: پاک] چێـشت، ئاش، خۆراک، وا. ⁂ شۆربا، ماستبا، ئاردەبا.

**با**[10](نا.) سـواوی وشـەی بان ـ ە هەر بەو مانایە لە هەندێک وشەی لێکدراو دا. ⁂ باگردان، باگردێن.

**باب**[1] (نا.)[پەھ: پاپەک. پەش: بابا ـ فـار: بابا ـ بیـر: بابا. باک: باڤ ـ ناو: باب، باوک، باو ـ باش: باوگ، باوە ـ زا: با، بابی، باک، باکل، باوک، باوچ] ١ـ پیـاوی خـاوەن منداڵ، پیـەر، تاتە. ٢ـ پێوەندی نێوان منداڵ و پیاوێک کە لێی بوە. ⁂ من بابی ئەو کـوڕەم. ئەو پیـاوە بابی منە! ٣ـ (مـجـ.) نێـرینەی خـاوەن بێـچـووی هەندێک گـیـاندار. ⁂ لە ئێسـتریان پرسی بابت کێیە، کوتی خاڵم ئەسپـە (پەند). ٤ـ (مـجـ.) پێک هـێنەر و بـەرهـەم هـێنـەر. ⁂ بابی پۆڵایە دایکی سـەنگی خـار/ عـەولادیـان دەبێ وەک دەنکی هـەنار/ فـەقیـر و هـەژار پێیدەکەن ڕەفتـار (مـەتەڵ). **~ دەرهێنان:** (کنـ.) زۆر توند ئازار دان و تـەنبێ کـردنی کـەسـێک. ⁂ کـوتی: کـوڕە حـوکـمی خـاتوون پەریخـانێـیە؛ هەرچی نەیداتەوە بـابی دەردێنـین (مـان ل ١٩٥). **بە ~ شیان:** (کنـ.) پیر بوون، بە تەمـەن بوون. ⁂ ئەو کـابرایە کـوا بۆ ئاواڵ دەبێ بە بابت دەشێ. **بە بابی کوڕان بوون:** (دوعا) خـاوەن کـوڕ بوون. **بوونە ~:** خـاوەن منداڵ بوون. ‖ **بابی باب:** ١ـ باپیـر، بابەگـەورە. ٢ـ (مـجـ.) کـەسـی خـۆشـەویست. ⁂ دا وەرە بابی بـابەکـەم مـاچێکم دەیە! حـاجی کـەریم پارەی لە بـابی بابی خـۆشـتـر دەوێ. **بابی منداڵەکان:** (کنـ.) مـێرد، شـوو لە زمـان ژنـەوە، بـاوکی منـاڵەکـان. ⁂ بـابی منداڵەکان سەر لە بەیانی وەدەر دەکەوێ و تاریکایی ئێوارێ دێتەوە!

**باب**[2] (ئان.)[فار: باب] بڕ: باو2

**باب**[3] (نـا.)[عـەر: باب] ١ـ دەرکـە، دەرگا. ٢ـ بەشێک لە کتێب.

**بابا** (نـا.)[بڕ: باب1] ١ـ باپیـر، بابەگـەورە. ٢ـ نازنـاوی پیـاوچاکـان و شـێخ و دەروێـش، بـابـە/٣. ⁂ باباگوڕگوڕ. ٣ـ کەسێکی کەم دەسـتەڵات

و فەقیرۆکە. ⁂ بابایەکی وەکو من کێ کاری دەداتێ.

**باباغــا** (نا. ل)[بابە + ئاغــا] بڕ: بابەگەورە

**بابان** (نا. ل)[باب1 + ئان] ماڵە بابی ئافرەت، باوان. **~ خرا(پ):** بڕ: بابان وێران. **~ خـشـتـوور:** بڕ: بابان وێران. **~ شـێـوان:** بڕ: بابان وێران. **~ وێران:** جنێوێکی سەر زاری ژنانە کە زۆر لە دڵان گران نایە بە مانای ماڵە باب وێران بوونە، بابان شـێوان، بابان خرا(پ)، بابان خشتوور.

**بابانە** (ئاک. ل)[باب1 + ئانە] وەکوو باب، چەشنی باوک، باوکانە. ⁂ بابانە رووی تێکردم و نەسیحەتی کردم.

**بابردۆڵە** (ئان. مـف.)[با1 + بردوو + ڵە] بڕ: بابردوو

**بابردوو** (ئان. مف.)[با1 + بردوو][لە: با بردن] ١ـ پوش و قانگەلاشکی گیای ویشک کە با لە جێی خۆیان هەڵیان دەقەنی و دەگەڵ خۆی دەیانبا. ٢ـ (کنـ.) مـرۆڤی بێ دەســتــەڵات و بێ ئەنوا و رەقــەڵە کـە زەمــان بە سـانایی بێـرە و بەوێی دادەدا. ٣ـ (کنـ.) لـە دەست چوونە دەری شتێک کە دەست پێی رانەگاتەوە.

⁂ وەدوای کـڵاوی بابردوو مـەکـەوە! & بـابـردۆڵە، بـابـردە، بـابـردەڵـە، بـابـردی، وابەردەڵە.

**بابردە** (ئان. مــف.)[با1 + بردە] بڕ: بابردوو

**بابردەڵە** (ئان. مف.)[بابردە + ڵە] بڕ: بـابـردوو. ⁂ مـنـیـش بـابـردەڵـەی بـەر گێژەڵووکەم/ دەمێک لەو قوڵکە، تاوێک لەو چڵووکەم (تاریک و روون ل ١١٣).

**بابردی** (ئان. مــف.)[با1 + بردی][سۆر] بڕ: بابردوو

**بابڕ** (ئان. فـا)[با1 + بڕ (بڕین)] ١ـ دیوارێک کە باش سـواغ دراوە و کەلێنی لێبڕاوە و با نابوێرێ. ٢ـ (کنـ.) سمێڵی ئەستوور و زەلام.

**باب کــوژراو** (ئان. مــف.)[باب1 + کوژراو] کەسێک کە باوکی کوژرابێ، باب کـوشـتـە. ⁂ باب کـوژراو دەست هەڵدەگرێ، پلاوخـۆر دەست هەڵناگرێ (پەند).

**باب کـوشـتـە** (ئان. مـف.)[باب1 + کوشتە] بڕ: باب کوژراو. ⁂ باب کوشتە خەوی لێ ئەکەوێ، داک مردە خەوی لێ ئەکەوێ، لە برسا مردە خەوی لێناکەوێ (پەند ل ٧٤).

**بابلیــچک** (ئا.)[بابەلیچ + ک][باک] چوارەمین ئەنگوست لە قامکی گەورەوە، قامکی پەنا تووتە، براتووتە، بابەلیچ.

**بابمردوو** (نا. مفـ.)[باب1 + مردوو] ١ـ منداڵی بێــباوک، باوکــمردگ، هەتیم، هەتیوو. ٢ـ بەدبەخت، چارەڕەش.

**بابن** (گیا.)[باک] بڕ: بەیبوون

**باب نۆکەر** (نا. ل)[مەغ: باب نۆکەر] ١ـ کەسێک کە لە چینی نۆکەران بێ. ٢ـ گەورەی نۆکەران. & نۆکەرباب.

**بابنەپێچ** (گیا.)[بابن + ئە + پێچ] بڕ: بەیبوون

**باب و باپیــــر** (نا. ل)[باب1 + و + باپیر] چەند پشتی مرۆڤ، ئەژداد، جەد، باب و کاڵ، باوکال، باو و باپیر.

**باب و کاڵ** (نا. ل)[باب1 + و + کاڵ] بڕ: باب و باپیر.

**بابوێر** (نا. فا)[با1 + بوێر2] شوێنێک یا دیوارێک کــە بە کــەلێنەکــانی دا با دەڕواتــە ژوور و وژەی دێ، بــادەڵێــن. // بابڕ.

**بابۆ**[1] (نا. ل)[باب1 + ئۆ][باک ـ زا ـ سۆر] وشەی بانگ کردنی باوک، باوکە، باوە، بابە.

**بابۆ**[2] (ئان. ل)[با6 + بۆ1] گــۆڵە سەگێک کە مەیلی جووت بوونی دەگەڵ دێڵــە ســەگی بەبا هەیە. گــۆڵە ســەگ شوێنی بۆنی سەگی بەبا هەڵدەگرێتەوە و وەدوای دەکەوێ هەتا دەیبینێتەوە. **~ گێــران:** بۆنــی کــردنی ســەگ بە زەوی و شــوێن پــێ بۆ دیتنەوەی دێڵــەســەگ یا نێچیر.

**بابۆرە** (نا.)[سۆر] بڕ: بابۆڵە

**بابۆلە** (نا.)[باک] بڕ: بابۆڵە

**بابۆڵە** (نا. ل)[؟][باک: بابۆلە، بالۆلک ـ ناو: بابۆڵە، بابۆرە] ١ـ نانێک کــە نێــوەکــەی چێشــتی تێدەکــەن یا ڕۆن و ماســتی تێهەڵدەســوون و دەیپــێچنەوە و لــوولی دەدەن و دوایــی بــە قــــــەپاڵان دەیخــۆن. بابۆڵە پتــر وەک بەرکــوت لە نێوان دووجەمان دەیخۆن هەتا بەرداڵیان بگرێ، ساندویــچ ( لە شــاری ســەردەشت بابۆڵە جــێگای ســاندویچی گــرتۆتەوە)، تیکە، قــەباڵێ. ٢ـ [ئەر] منداڵی ســاوای مەلۆتکە کراو، مەلۆتکە، قۆنداغە. **کردنە ~:** ١ـ پێــخــۆر لە نێــو نان کــردن و پێچــانەوەی. ٢ـ (مجـ.) قەوە پێشکان و تێکەوە پێچانی بە سانایی کەسێک. ؛؛ زۆر قــســان بکەی هەڵدەســتم دەتکەمــە

بابۆڵەیەک. **|| بابۆڵەی باسک:** قــەف و ئەستوورایی ماسوولکەی باسک، بازۆڵە. :: بابۆڵەی باسکی شێرکۆ بە قەرا رانی من دەبوو. ماشەڵڵا هێندە بە قەوەتە ئەوە بابۆڵەی باسکییەتی (بە دوو قامکی شادە و گەورەی هەردووک دەست ئەندازەیەک نیشان دەدرێ).

**بابۆڵەپێچ** (نا. ل)[بابۆڵە/٢ + پێچ] ١ـ پەڕۆیەکی باریک و درێژی درواوە کە دوای مەلۆتکە کردنی منداڵ بۆ ئەوەی هەڵنەوەشێتەوە، پێی دەپێچنەوە، قارنج. ٢ـ منداڵی ساوای مەلۆتکە کراو. **~ کـردن:** پێچانەوەی منداڵی ساوا لە مەلۆتکە دا.

**بابوون** (گیان.)[فەر: babouin] جۆرێک مەیموونی لمبۆز درێژە، کەڵپی تیژە و ڕەنگی خورمایییە، باڵای ٧٥ سانت و کلکی نزیک ٦٠ سانت دەبێ و لە ئافریقا دەبێ و پتر بە ڕەوە دەژین.

**بابوونە** (گیا.) بڕ: بەیبون

**بابە** (نا. ل)[باب1 + ئە] ١ـ وشەی بانگ کردنی باوک، باوکە، باوە، بابۆ. ٢ـ وشەیەکە لە وتووێژ دا بێ هێنانی ناوی ئەو کەسەی قسەی دەگەڵ دەکەی و مانایەکی ئەوتۆی نیە. :: بابە ئەمن ئەو کارەی ناکەم. کوڕە بابە ئەوە تۆ دەڵێی چی. ٣ـ نازناوی پێش ناوی پیاوچاکان، بابە، باوە. :: بابە قەتار، بابە خەڵیفە. ٤ـ چۆلەکەی نێر، باوکە. // دایکە.

**بابەپیارە** (نا. ل)[باب1 + ئە + پیار + ئە][هەو] بڕ: باوەپیارە

**بابەت** (نا.)[عەر: البابة] ١ـ کەل و پەلی دووکانداران بۆ فرۆش، شمەک. :: ئەو دووکانە بابەتی چاکی نیە. بابەتی تازە چت هێناوە. ٢ـ شایان، لایق، بە کەلک. :: ئەو کەوایە هێند ئەستوورە بابەتی پیاوی سەرمابردوویە. **لە بابەت:** لەمەڕ، لە بارەی، سەبارەت، لە باوەت :: لە بابەت عەشیرەتی مەنگوڕ چ دەزانی؟ ٢ـ لە جیات، لە بری، لە بەرابەر، لە جێگەی، لە بات، لەباتی. :: لە بابەت ئەو کەوایە چت بدەمێ.

**بـابـەدەسـت** (ئان. ل)[با1 + بە + دەست](کنـ.) حاڵی کەسێکی ڕووت و نەدار کە چی بە دەستەوە نیە، دەستبەتاڵ.

**بابەڕۆ** (شـر.)[بابە + ڕۆ] شێوە ڕستەیەکە بۆ شین و شەپۆڕ کە کەسی باب مردوو دەیڵێ، باوکەڕۆ. هێشتاش لە زۆر ناوچەی کوردستان شینگێڕی بۆ

مـردوو مـاوه و بە تایبـەت ژنان پتـر شـین دەگێـڕن و یەکتـر دەلاوێننـەوە و هـاوکـات بۆ دەربـڕینی هـەسـتی هـاوبەشی دەگـەڵ خـاوەن مــردوو ســەر و پرچ دەڕنـنـەوە و ڕۆڕۆیە دەکەن. ٢ـ بەبێ مـانای سـەرەکی لە کـاتی ســەرســوڕمـان دەکـوترێ. ؛؛ بابەڕۆ لەو کارە سەیرە. ~ **کردن:** ڕۆڕۆ کردن بۆ باوک، شین گێڕان بۆ باوک.

**بابەژەنی** (نا. ل)[باب1 + ئە + ژەنی] [هەو] بڕ: باوەژن

**بابەعەمرە** (نا. ل)[باب1 + ئە + عەمر + ئە] مرۆڤی بەژن کورت و کۆسە کە بە ڕواڵەت منداڵ دەنوێنێ بەڵام تەمـــەنی زۆرە، شەمووله، باوەعەمرە، باوەقۆرەت.

**بابەگـــــەورە** (نا. ل)[باب1 + ئە + گـــــەورە] ١ـ باپیـــــر، باباغـــا، باوا، باواگــەورە، بابی باب، باوکی باوک. ٢ـ وشـــەی بانگ کــردنی باپیــر لە لایەن نەوەوە، باباغا، باپیرە.

**تێبینی:** چونکە وشـەی بابە گـەورە و باباغـا هـەردووک بە پیـتی بزوێن دوایی دێن لە بەر ئەوە ئامرازی بانگ کردن بە خـــۆوە ناگـــرن و هـەر وەک خـــۆیان بۆ مـــەبەســـتی بانگ کــردنیش دەکـــار دەکردرێن.

**بابەلیچ** (ئا.)[؟][باک] بڕ: بابلیچک

**بابەلێ** (شـــر.) ١ـ بانگ کـــردنی خۆشەویستانەی باوک لە لایەن منداڵەوە، باوالێ. ٢ـ بانگ کردنی خۆشـەویستانەی منداڵ لە لایەن باوکـــــەوە. & باوەلێ، باوکەلێ.

**بابی** (نا.)[زا] بڕ: باب1

**بابی بابی** (نا. ل) یاری و کـایـیـەکی منداڵانە، کەری سووری پشت درێژ.

**تێبینی:** منداڵەکان دەبنە دوو دەستە و هەر دەسـتـە یەکـیـان (تێکەوت) ســەر بە دیوارەوە دەنێن و دەســـتـــەیەکی تر بە پڕتـاو دێن خـۆ داوێنە ســەر شـانـیـان، ئەوجـــار هەریەکـــەیان چەند پەنجــەی دەستی جیا دەکاتەوە و لەوەی تێکەوتوە دەپرسێ: بابی بابی، چەند بابی. ئەگـەر هەڵیهێنا چەند پەنجەیە هەڵدەستێتەوە و بەو جـــۆرە یاری درێژەی پێـــدەدرێ. (قامووس ب ٢ ل ١٢).

**بابیـــلان** (شــر.)[باب1 + ئی + لان] وشــــەی لاواندنـەوە و دواندنـی منداڵـی چووک کـە هێـشـتـا بە تەواوی زمـانی نەکردۆتەوە، بەبەلە.

**بابینی** (نا. ل)[با1 + بینی (کـەپۆ)] [ئەر] هەڵامەت، پەسیو، پەتا.

**بابێــتی** (حم.)[باب1 + ئێــتی] ئەو ئەرک و کــارانەی کــە باب بۆ منداڵ لە سەر ئەستۆیەتی. :: بابم چ بابێتییەکی لە حەقی مە دا نەکردوە.

**بابێنی** (نا. ل)[باب1 + ئێن + ئی] ئەو کەلەپوور و میراتەی کە لە باوکەوە بۆ منداڵەکانی دەمێنێتەوە.

**باپشکێــو** (نا. ل)[با1 + پشکێــو (پشکووتن)] زیپکەیەکی سووری چووکی نێــرتک دارە لە ســووچی چاو لە ســەر پێــڵوو پەیدا دەبێ و هۆیەکــەی دەســتی پیس یا دەســرەی پیس لە چاو دانە. لە کــــوردەواری دا بۆ چاک کــــردنەوەی باپشکێو ئەو چاوەی کە ساغــە بە کل دەیرێژن هــەتا چاوەکــەی دیکە لە داخــان کــە بە کل نەیانرشــتــوە چاک بێــتــەوە، قینچکە سلاوە، قنچکە سەلام، چینچکە سلاو، سیتکەسلاو، سیتکەسلام، ســیــسکەســراوە، قلینچکەســلام، سلەزوەردە، بیتک، بووک.

**باپەرست** (نا. فــا، ئان. فــا)[با6 + پەرست] کەسێک کە مەیلی جنسی زۆرە، کــەســی هــەوەســبــاز، هــەوەســپــەرست، هەوەسخواز.

**باپەرستیی** (حم.)[باپەرست + ئیی] هــەوەسبازیی، هــەوەسخوازیی.

**باپەرک** (نا. ل)[با + پەر + ک][باک] بڕ: پەپوولە

**باپەڕ** (نا. ل)[با1 + پەڕ] نەخــۆشی و چەقوچۆیەکە لە دوای ئارەقە کردن با لە مــــرۆڤ دەدا و لەشــی رەق دەبێ. ~ **بوون:** با وە لەشــی ئــارەقــاوی کــەوتن و نەخۆش کەوتن، تووشی باپەڕ بوون.

**باپەســیــو** (نا. ل)[با1 + پەســیــو] شوێنێک یا دیوار و کەلەبەرێک کە رووی دە لای با نیە و با نایگرێتەوە، باپەنا.

**بــاپــەنــا** (نــا. ل)[بــا1 + پــەنــا] بڕ: باپەسیو

**باپیر** (نا. ل)[با3+ پیر][باک: باپیر - ناو: باپیر - باش: باپیر - زا: باپیر] بابی دایک یا بابی باب، بابەگــەورە، باباغــا، باپیــرە، باوا، بابا، پیــرباب، پیــرباڤ، پیرک.

**تێبینی:** زەبیحی بەشی دووهەمی ئەم وشە یانی پیر - ی بردۆتەوە سەر پیەر بە مــانای باوک لە زاراوەی باشــووریی دا. (بڕ: قــامــووس ب ٢ ل ١٢) من پێــمــوایە پیر لە پیل (بڕ: پیل3) بە مانــای گەورە و مــــەزن کــــەوتوە و وشــــەی پیلەبابا لە هەندێک زاراوەکانی ئێرانیی دا بە مانای

باپیر ئەم بۆچوونە بەقەوەتتر دەکا.

**باپیرە** (نا. ل)[باپیر + ئە] ١ـ بڕوانە: باپیر. ٢ـ بڕ: بابەگەورە/٢.

**باپیرەگەورە** (نا. ل)[باپیر + ئە + گەورە] باپیری دایک یا باپیری باوک بۆ منداڵەکانی ئەو کەسانە، پشتی چوارەم.

**باپیریی** (گیا.)[باپیر + ئیی] ١ـ جۆرێک هەناری ترش و شیرین. ٢ـ جۆرێک هەنجیر.

**باپێچ** (نا. ل)[با1 + پێچ] شوێنێکی باگر کە با تێیدەکا و لە بەر هەبوونی بەرهەڵستی وەک کێو و ڕەوەز دەگەڕێتەوە و دەبێتە گێژەڵووکە. ٢ـ دەرد و ژانێکی نێو زگ کە دەسووڕێتەوە و مرۆڤ ئازار دەدا، پێچ. ٣ـ ژانە زگێکی لەم پێچ دانە پەیدا دەبێ. ٤ـ [باک] کرێوە.

**باپێو** (نا. ل)[با1 + پێو] ئامرازێکە بۆ ئەندازەگرتنی تەوژم و توندی با.

**تێبینی:** ئەم وشە لە جیات میزان الریاح ـ ی عەرەبی و بادسنج ـ ی فارسی و anemometre ی فەرانسی بە کار دەبردرێ.

**بات** (نا.)[؟] ئەم وشە بە تەنیا نایە و هەمیشە دەگەڵ " لە " دێ و مانای لە جیات، لەبری دەدا، باتی، لەبری ،لە جیات، لەجیاتی. ⁘ لە بات ئەوە کە چاو لە تەلەویزێون کەی هەستە بڕۆ دەرسەکانت بخوێنە. من لە بات تۆ بام ئەو کارەم نەدەکرد.

**باتان** (نا.)[؟][باک] ڕێگای ڕوو لە سەرێ، هەوراز. // لێژ

**باتری** (نا.)[فەر: batterie] دەزگای ساز کردنی بەرق و کارەبای مەکینە. باتری لە دوو پەڕی کاتۆد و ئانۆد (+ و -) پێک هاتوە کە لە نێو ئاویتەیەکی ئەسید سوڵفۆریک دایە. کاری باتری گۆڕانی ئێنێرژی شیمیایی بە ئێنێرژی ئەلکتریکییە. کاتۆد کە فلزێکە لە نێو ئاوێتەکە دا وردەوردە دەتوێتەوە و ئەلکترۆن ئازاد دەکا و ئانۆد کە ڕەژی یە ئەو ئەلکترۆنانە بۆ لای خۆی دەکێشێ و بەم جۆرە بەرقی پێویست ساز دەبێ. باتری لە قەدەر کارەکەی گەورە و چووکی هەیە و شۆقی کەم و زۆریشی دەگەڕێتەوە سەر ئەندازەی باتری، قوە، پیل.

**باتسکە** (گیا.)[با1 + تس + کە] جۆرێک هەنجیرە کە زووتر لە هەنجیرەکانی دیکە پێدەگا و بێتام و



ناخۆشه، باهه‌نجیر، باتسه.

**باتسه** (گیا.)[با1 + تس + ئه] بڕ: باتسکه

**باتلاخ** (نا.)[تور: batak] بڕ: زه‌لکاو

**باتلاغ** (نا.)[تور: batak] بڕ: زه‌لکاو

**باتمان** (نا.)[په‌ه: په‌تمان] ١ـ سه‌نگێکه به‌رامبه‌ر ده‌گه‌ڵ شازده کیلۆ. ٢ـ [باک] سه‌نگێک به‌رابه‌ر ده‌گه‌ڵ هه‌شت کیلۆ. ٣ـ پێوانه.

**تێبینی:** زه‌بیحی باتمانی به ناوی لێکدراو داناوه (بات + مان) بات ـ ی مانا نه‌کردوه و مان ـ یشی بردۆته‌وه سه‌ر مه‌ن که ئه‌ویش سه‌نگێکه،...(بڕ: قامووس ب ٢ ل ١٤). باتمان هه‌روه‌کی دیاری کراوه له په‌تمانی په‌هله‌ویی به مانای پێوانه و ئه‌ندازه له چاوگی په‌تمووته‌نی په‌هله‌ویی و په‌ئیتیمای ئه‌وێستایی و پێوانی کوردیی که‌وتۆته‌وه.

**باتوو** (ئا.)[؟][باک: باتوو ـ ناو: باتوو، وه‌ته] گوون. :: ئه‌و منداڵه شه‌پێکی وای له باتووم داوه دوو ڕۆژه هه‌ر باتووم دێشێ.

**باتووبه‌ند** (نا. ل)[باتوو + به‌ند] ئامرازێکه وه‌ک قایش بۆ به‌ستنی گونی قۆڕ.

**باتووم** (نا.)[فه‌ر: baton] داردەستێکی قوڵه‌یه که پاسه‌وان له قه‌دیان ده‌یبه‌ستن و له کاتی پێویست دا ده‌یوه‌شێنن.

**باتی** (نا.)[بڕ: بات] له بڕی، له جیاتی. بڕ: بات. :: له ئاب و تاب و ئه‌شک و ئاهی خۆم دا بوومه بریانی / له باتی پوخته‌گی سووتام و هێشتا پێم ده‌ڵێن خامه (نالی ل ٤٧٣).

**باتینۆک** (گیا.)[باک] بڕ: خاشخاشک

**باج** (نا.)[هه‌خ: باجه‌ی ـ په‌ه: باژ. باک: باج ـ ناو: باج ـ باش: باج ـ هه‌و: باج ـ زا: باج، بێژ] ١ـ پاره و ماڵێک که زوو پادشای سه‌رکه‌وتووی شه‌ڕ له پادشای تێشکاوی ده‌ستاند و هه‌تا له ژێر ده‌ستی ئه‌و پادشایه دابا ده‌با باجی دابا و راده‌ی باجه‌که‌ش پادشای سه‌رکه‌وتوو دیاری ده‌کرد. ٢ـ ئه‌و پاره و ماڵه‌ی که پادشا یا میر یا ده‌ره‌به‌گ له خه‌ڵک و ژێرده‌ستی خۆیان ده‌ستاند. ٣ـ پاره یا ماڵێک که زوو له به‌ر ده‌روازه‌ی شار له خه‌ڵک یا له بار که ده‌هاتنه شار وه‌رده‌گیرا، بارانه، سه‌رانه، ... ٤ـ

پارەیەک کە ئێستا دەوڵەت بە پێی داهات لە خەڵکی کاردار دەستێنێ، ماڵیات ٥- پارە یا ماڵێک کە بە زۆر لە کەسێک دەستێندرێ، خاوە، سەرانە. **~ دان:** دانی ئەو پارە و ماڵەی کە وەک باج لە سەری کەس یا کەسانێک دیاری کراوە. **~ سەندن:** بڕ: باج ئەستاندن. **~ گرتن:** بڕ: باج ئەستاندن. **~ لێگرتن:** وەرگرتنی باج لە شەمەک. **~ لێوەرگرتن:** بڕ: باج ئەستاندن. **~ وەرگرتن:** باج لە کەسێک ستاندن، باج ئەستاندن. **~ ئەستاندن:** ١- وەرگرتنی باج بە زۆریی و مڵهوڕیی لە کەسی بێدەستەلات. ٢- ماڵیات وەرگرتن، باج سەندن، باج وەرگرتن، باج گرتن. ‖ **باجی سمێڵ:** پارە و باجی زۆریی و ملهوڕی. ***باجی سمێڵ دان:** دانی پارە بە کەسی زۆردار و ملهوڕ. ***باجی سمێڵ وەرگرتن:** پارە وەرگرتن لە خەڵک بە زۆریی و ملهوڕی، باجی سمێڵ ئەستاندن. ***باجی سمێڵ ئەستاندن:** بڕ: باجی سمێڵ وەرگرتن.

**تێبینی:** باج لە چاوگی بەج baj ـ ی ئەوێستایی بە مانای بەش کردن و دابەش کردن کەوتۆتەوە و لە کوردیی دا بەش، باج، پاژ، باقە و گەلێک وشەی دیکە هەر لەم چاوگەن.

**باجان** (گیا.)[باک ـ زا] بڕ: باینجان

**باجەدەر** (ئان. فا)[لە: باج دان] کەسێک کە باج دەدا. ፡፡ باجدەر بار لە سەر لێون/ هی زۆر زل قوڕ دەپێون (بۆ کوردستان ل ٢٢٩).

**باج سێن** (نا. فا، ئان. ل)[باج + سێن] بڕ: باج ئەستێن

**باجک** (گیا.)[باک: باجک ـ زا: باژک] بڕ: بیبار

**باجگر** (ئان. ل)[باج + گر] بڕ: باج ئەستێن

**باجگە** (نا. ل)[باج + گە] شوێن و بنکەیەک کە لە سەر سنوور باج و حەقی بار و ... وەردەگرێ.

**باجە** (نا.)[تور: bacı] ١- نازناوی خوشکی گەورە. ٢- نازناوی بانگ کردنی ژنی دیکە کە هەم بە تەنیا دێ و هەمیش بە ناوەکەیەوە دەلکێ. ፡፡ باجە پەریزاد، باجە فاتم. & باجی، دێد، داد.

**باج ئەستێن** (نا. فا، ئان. ل)[باج + ئەستێن] ١- کەسێک کە باج بۆ دەوڵەت کۆ دەکاتەوە. ٢- کەسێک کە بە زۆر پارە لە خەڵک دەستێنێ. & باجگر، باجەوان.

**باجەوان** (ئان. ل، نا. ل)[باج + ئە + وان] ١ـ بڕ: باج ئەستێن. ٢ـ کەسێک کە لە سەر باجگە باج و گومرگ لە خەڵک وەردەگرێ.

**باجی** (نا.) بڕ: باجە

**باجیج** (نا.)[ئیتا: bacelli][زا] بڕ: باقلە

**باچرمۆکە** (گیانـ.)[با (باڵ) + چرم (چەرم) + ئۆک + ئە][زا] بڕ: چەکچەکی

**باچەرمۆک** (گیانـ.)[با (باڵ) + چەرم + ئۆک][باک] بڕ: چەکچەکی

**باخ** (نا.) بڕ: باغ

**باخچە** (نا. ل)[باخ + چە1] بڕ: باغچە

**باخڵە**[1] (نا. ل)[باخ + ڵە] ١ـ پارچە زەوییەکی خۆشکراو و پەیین تێکراوە کە تۆوی پێدادەکەن هەتا دەبێتە شەتڵ و لە دوایی بۆ سەر بێستانی رادەگوێزن. ٢ـ قوڵکەی هەڵقەندراوی دەورووبەری نەمام بۆ چاک ئاو خواردنەوەی.

**باخڵە**[2] (نا. ل) تووڕەکەیەک کە جووتێر تۆمی تێدەکا و دەیپرژێنێ، توربێن، تۆمەدان.

**تێبینی:** وا وێدەچێ ئەم وشە لە باخەڵ یا باغەڵ کەوتبێ چونکە توربێن بە لا تەنیشتەوە هەڵداوەسرێ و لەوانەیە لە پێشدا باخەڵە بووبێ و لە دوایی سوابێ و بووبێتە باخڵە.

**باخە** (گیانـ.)[؟] کیسەڵ. :: بەو دەننی فوراتە کە دەکا پەششە بە عەنقا/ نەک لەو خومی نیلە کە دەکا باخە بە تیمساح (نالی ل ١٦٦).

**تێبینی:** لە فەرهەنگەکانی فارسیش دا باخە بە مانای کیسەڵ هاتوە.

**باخەل** (نا.)[باک] بڕ: باغەڵ

**باخەڵ** (نا.) بڕ: باغەڵ

**باخەوان** (نا. ل، ئان. ل)[باخ + ئە + وان] بڕ: باغەوان

**باخەوانیی** (حم.)[باخەوان + ئیی] بڕ: باغەوانیی

**باد**[1] (نا.)[بڕ: با7] لۆ، پێچ، با. :: دەسمالەکەی دوو بادە/ مالە بابم سەیزادە (فۆلکلۆر). دام دوو بادەی سەیاد قاتڵ/ نەپێچیان نە دەور پای شکستەی دڵ (مەولەوی ل ١٢٦)

**باد**[2] (نا.)[باش][کلاسیک] با1. ‖ **بادی سەبا:** بڕ: بای سەبا :: ئەی بادی سەبا من ببە، سوودی نیە نامە/

تەشریحی زەعیفیی من و غەم نایەتە تەحریر (حاجی قادر ل ٦٢)

**بادار** (ئان. ل)[با1 + دار2] کەسێک کە نەخۆشی باداریی هەیە، باوی.

**باداریی** (نا. ل)[بادار + ئیی] ئێش و دەردێکە کە لە بەند و جومگە و ماسولکەکانی لاق و دەست دا پەیدا دەبێ و پتر رایان لە سەر ئەوەیە کە بە هۆی شێ و نم و جێی تەڕ ئەم ئازارە سەر هەڵدەدا، رۆماتیزم.

**بادام** (گیا.)[پەھ: ڤاتام ، ڤادام. تات: ڤێیمە ـ فار: بادام ـ بیر: بادۆم. باک: بعیڤ، بهیڤ، بایەف، بەهیڤ، بەیڤ، باهیڤ ـ ناو: بادام، باوی ـ باش: بادەم ـ هەو: بازەمی، واهام، واهامی، وامی ـ زا: ڤامە] ١ـ درەختێکە دەسنێژ و کێویی هەیە. گەڵاکانی پان و درێژن و هەتا پێنج گەز بەرز دەبێتەوە و گوڵەکانی زووتر لە گەڵاکانی دەپشکوێن. بە فەریکی دەنک و توێکڵەکەی دەخورێ بەڵام کە پیر بوو قاپوولکەکەی فرێ دەدا و توێکڵێکی سەخت وە خۆوە دەگرێ کە بە سانایی ناشکێ. دانکەکەی بە کاڵی یا بە بۆدراوی دەیخۆن و لە شیرینی و مەشکەفی دا دەکاری دەکەن. ناوکی بادام ٥٠٪ رۆنی هەیە و رۆنەکەی بۆ دەوا و دەرمان و سابوون ساز کردن بە کەلک دێ. دارە بادامی کێویی زۆر بەرز نابێتەوە و بەرەکەشی چووکترە و زۆرتر تاڵە و لە هەندێک ناوچەی کوردستان ئەو دەنکە تاڵانە خۆش دەکەن و دەیخۆن، Amygdalus amara ناوی لاتینی ئەم دارەیە. ٢ـ بەری ئەم دارە.

**بادامچە** (گیا.)[بادام + چە1] فەریکە بادام، چەقالە بادام.

**بادامە تاڵە** (گیا.)[بادام + ئە + تاڵ + ئە] ١ـ درەختی خۆڕسکی بادام، هەرجن. ٢ـ بەری ئەم درەختە کە چووک و تاڵە و ژارێکی بەقەوەتی هەیە و هەندێک جار هەر بەتاڵی بۆ کوشتنی کرمی نێو ریخۆڵە دەیخۆن. ئەم بادامە لە کوردستان دەیکوڵێنن هەتا تاڵایی بڕوا و لە دوایی دەیخۆن.

**بادامیی** (ئان. ل)[بادام + ئیی] ١ـ ئەو شتەی کە بادامی تێکەڵ کراوە یا نێوئاخنەکەی لە بادامە. ⁝⁝ شیرینی بادامی، باقلاوەی بادامی. ٢ـ هەرچی لە شکڵ و حاڵەت دا شێوەی بادام بدا. ⁝⁝ بە حیرەت لەو گوڵ ئەندامە کەوا بادامییە چاوی/ دڵی نازک وەکوو گوڵ، هەم رەقە



وەک توێکڵی بادام (مەحوی ل ٢١٦).

**بادڕەنگ** (گیا.) بڕ: باروونە

**بادە** (نا.)[پەھ: باتەک] ئاوەکی مەستی هێنەر، شەراب، مەی. ‖ **بادەی ئەلەست:** بادەی خودایی. ⁂ چاوبازەی چاومەستە، لەو بادەی ئەلەستە/ دەستم بگرە هەستە، تۆ و دین و ئایینت (وەفایی ل ٣١)

**بادەپەرست** (نا. فا، ئان. فا)[بادە + پەرست] کەسێک کە خواردنەوەی بادە و مەی پێخۆشە، ئارەقخۆر.

**بادەپەرستیی** (حم.)[بادەپەرست + ئیی] کاری بادەپەرەست، ئارەقخۆریی.

**بادەخۆر** (نا. فا)[بادە + خۆر] کەسێک کە بادە دەخواتەوە، مەیخۆر، بادەنۆش، ئارەقخۆر.

**بادەخۆریی** (حم.)[بادەخۆر + ئیی] کاری بادەخۆر، مەیخۆریی، بادەنۆشیی.

**بادەڤ** (نا. ل)[با1 + دەڤ][باک] بڕ: بادەوە2

**بادەقوش** (گیانـ.)[باش] بڕ: بایەقوش

**بادەگێڕ** (نا. فا)[بادە + گێڕ] کەسێک کە بادە دەداتە دەست بادەخۆرەکان، مەیگێڕ، ساقی. ⁂ لە کونجێ بێوەژن دەگری و دەناڵێ/ لە کۆشکێ بادەگێڕە چاو کەژاڵێ (ناڵەی جودایی ل ٨٢)

**بادەگێڕیی** (حم.)[بادەگێڕ + ئیی] کارو پیشەی ساقی و مەیگێڕ، مەیگێڕیی.

**بادەڵێن** (نا. ل)[با1 + دەڵێن] کەلێن و دەرک و دیوارێک کە با دەبوێرێ، بابوێر. // بابڕ.

**بادەم** (نا.)[باش] بڕ: بادام

**بادەنۆش** (نا. فا، ئان. فا)[بادە + نۆش] بڕ: بادەخۆر.

**بادەنۆشیی** (حم.)[بادەنۆش + ئیی] کاری بادەنۆش، ئارەقخۆریی، بادەخۆریی

**بادەوە**1 (نا.) پەڕە کاغەزێکی چوارگۆشەیە کە قامیشی بە تەنکی بۆ دەبڕن و بە چەسپ یا چرێش لێی قایم دەکەن. سووچێکی ئەم چوار گۆشەیە بەنی لێدەبەستن و سێ سووچەکەی دیکە بە کاغەز وەک زنجیر کلکی بۆ ساز دەکەن و لە کاتی با هاتن دا لە حەوای دەکەن، کۆلارە، بەرزە هەوایلە، بەرزە حەوایلە، بازی هەوایی، پەڕەچیغ، تەیرۆک.

**تێبینی:** زەبیحی ریشەی ئەم وشەی بۆ روون نەبۆتەوە و بردوویەتیەوە سەر [با + دەو؟] (بڕ: قاموس ب ٢ ل ١٧). ریشەی ئەم وشەیە هیچ گرێ و گۆڵێکی تێدا نیە، بادەوە هەمان وشەی بازی هەوایی ـ یە کە هەندێک سواوە و لە زاران خۆش بوە و بەم شێوەیەی لێهاتوە.

**بادەوە** 2 (نا. ل)[با 1 + دەوە][باک: بادەڤ ـ ناو: بادەوە، بەیەوە ـ هەو: باوە] بارینی بەفر و با پێکەوە، کرێوە، تۆف، بادەڤ، بەیەوە.

**تێبینی:** لە زمانی پەهلەویی دا دەمەک damak بە کرێوە دەکوترێ و بە لەبەر چاو گرتنی ئاڵوگۆڕی دوو پیتی « م » و « و » کە وێنەی یەکجار زۆرە، دەوە و دەڤ دەگەڵ دەمەک لە یەک سەرچاوە گووراون.

**بادی** (نا.) بڕ: بادیە

**بادیە** 1 (نا.)[عەر: باطیة] قاپێکی قوڵی چێو، گڵێنە یا مسییە لە کوردستان دۆ یا شەربەتی تێدەکەن و لە سەر سفرەی دادەنێن، تاس. لە ئەدەبیات و شێعر دا وەک مانا عەرەبێکەی دەفری گڵێنەی بادە تێکردنە، بادی.

**بادیە** 2 (نا.)[عەر: بادیة] بیروون، سارا، سەحرا. ⁜ دەزانم بادیەی عیشقە خەتەرناک/ کەچی هەر چووم، ئەگەر مام و ئەگەر چووم (مەحوی ل ٢٢٥).

**بار** 1 (نا.)[پەه: بار. بیر: بار ـ فار: بار. باک: بار ـ ناو: بار ـ باش: بار ـ هەو: بار ـ زا: بار] ١ـ ئەندازەیە لە هەر شتێک کە هەڵدەگرترێ و بۆ شوێنێکی دیکە دەبردرێ، ئەم هەڵگرتنە دەتوانێ بە دەست، بە کۆڵ یا بە ئامرازی راگوێزتنی وەک ماشێن یا ئەوە کە بە ئەسپ و بارگین و حەیوانی بارەبەر بێ. ٢ـ فەردە، تا، ... ئەندازە بارێکی دیاری کراو کە ولاغ دەتوانێ هەڵیگرێ. ⁜ ئەورۆ دوو بارم توونتن فرۆشتوە. بارە کەرێکم گەنم ناردەوە ماڵێ. ٣ـ مزاحم، شتێک یا کەسێک کە بەری هەڵسووڕانی کار یا ئازادی مرۆڤ بگرێ. ⁜ ئەو کتێبانەم لێبوونەتە بار نازانم چیان لێبکەم. ٤ـ هاوتای کار لە وشەی کار و بار. ٥ـ ئازار، ئەزیەت، دەرد. ⁜ لەش بە بار، بارگران. دڵی بێ بارە، مایەی کارە، هەرکەس کاروباری خۆی/ لە دنیا دا، موەففەق بوو بە دڵ تەفویزی باریی کرد (مەحوی ل ١١١). ٦ـ زانا، تێگەیشتوو، ئاگادار. ⁜ حەمە چی دەباران دا نیە لە

خۆیەوە قسان دەکا. ٧ـ توێژێکی زەرد یا سپی کە دوای هەندێک نەخۆشی یا چەق و چۆڵ لە سەر زمان دەنیشێ و تامی زار تاڵ دەکا. ٨ـ توێژ لێو کە لە بەر نەخۆشی یا ویشک بوونی لێو لە سەری پەیدا دەبێ و لە دوایی خۆی هەڵدەوەرێ. ٩ـ (پاشـ.) پاشگرە کە لە رەگی بردن دەکەوێ و مانای کەسێک کە شتێک دەبا دەدا. :: تاوانبار، غەمبار، هەوێبار. ~ **بردن:** ١ـ راگوێزتنی بار لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی دیکە. ٢ـ تاقەت و توانایی هەڵگرتنی بار. :: ئەو جوانوویە هێشتا بار نابا. ~ **بەستن:** ئامادە کردن و پێچانەوەی کەل و پەلی داندراو بۆ بار. :: بارەکان ببەستن با برۆین. ~ **خستن:** داگرتنی باری بارەبەر لە کاتی گەیشتنی بار. ٢ـ وچان دانی کاروان و داگرتنی بار بۆ حەسانەوە یا مەزڵ کردن. // بار کردن. ~ **دابەستن:** پێچانەوە و بەستنەوەی بار بە توندیی و قایمیی. ~ **داگرتن:** ١ـ هێنانە خواری بار لە سەر مەکینە یا حەیوانی بارەبەر. ٢ـ پڕ کردن و ئامادە کردنی فەردە و تای بار. :: بارەکان داگرە هەتا سەعاتێکی دیکە وەرێ دەکەوین. ~ **راست کردنەوە:** ١ـ یارمەتی دان بە کەسێک کە باری ولاغەکەی لاسەنگ بوە. ٢ـ (کنـ.) یارمەتی دان بە کەسێک کە چەتێکی کەوتۆتە سەر رێ، دەست گرتن بە تایبەت لە باری مادییەوە هەتا کارەکەی جێبەجێ بێ. ~ **کردن:** ١ـ بار لە بارەبەر نان، بار لێدان، بار لێنان. ٢ـ کۆچ کردن و رۆیشتن لە شوێنەکەوە بۆ شوێنێکی دیکە. :: لە دەست خاوەنماڵ بارمان کرد و رۆیشتین. ~ **سووک کردن:** ١ـ لابردن و کەم کردنەوە قورسایی هەندێک باری بارەبەر یا کەسی دیکە. ٢ـ یارمەتی دان بە کەسێک کە گیر و گرفتی کەوتۆتە سەر، ئەرک کەم کردنەوە. ~ **کەوتن:** (مجـ.) تووشی بەڵا و کوێرەوەری بوون، نەهاتی. ~ **کێشان:** ١ـ بار بردن، بار راگوێزتن. ٢ـ (کنـ.) ئەرکی خەڵک وە ئەستۆ گرتن. ~ **گرتن:** ١ـ توێژ لە سەر زمان نیشتن. ٢ـ توێژتوێژ بوونی پێستی سەر لێو. :: لەعلی شەککەرباری تۆ تێراوە، شەککەر بارییە/ لێوی میحنەتباری من بێ ئاوە، باری گرتوە (نالی ل ٥٤١). ~ **لێدان:** بڕ: بار کردن/١. ~ **لێنان:** بڕ: بار کردن/١. ~ **نەبردن:** (کنـ.) هەڵنەکردن

دەگەڵ یەکتر، نەحاوانەوە، تاقەت نەهێنان. **دە ~ (باران) دا بوون:** (کنـ.) زانین، تێگەیشتن. چی دە باران دا نیە.

**تێبینی:** بار لە چاوگی بەر bar ـ ی ئەوێستایی و بردن ـ ی کوردیی کەوتوە.

**بار**[2] (نا.)[بڕ: بەر1] ١ـ منداڵی مرۆڤ و گواندار کە هێشتا لە زگی دایکیان دان، بەر. ٢ـ تەربیەت، پەروەردە. **~ خستن:** بێچوو لەبەر چوون. ⁚⁚ ئەوساڵ مەڕەکانمان چ باریان نەخست. **~ هاتن:** پەروەردە بوون، فێر بوون و پێگەیشتن. ⁚⁚ منداڵەکەتان باش بار نەهاتوە. **~ هێنان:** بە بەر گەیاندن، پەروەردە کردن، راهێنان، فێر کردن. ⁚⁚ دایکم منداڵەکانی وا بار هێنابوو هەموو سەر لە ئێوارێ دەهاتنەوە. **لە ~ بوونەوە:** تەواو بوون و خلاس بوون لە زان، زان. ⁚⁚ دوێنێ شەوێ دێڵە کەرەکەمان لە بار بۆوە و خلاسی هات. **لە ~ چوون:** لەبەر چوون. ⁚⁚ پوورم هەتا ئێستا دوو منداڵی لە بار چوە. **لە ~ چوونەوە:** چی دیکە نەزانی مێینە، نەزۆک بوون، لە بەر چوونەوە.

**بار**[3] (نا.)[سۆر] بڕ: باڵ

**بار**[4] (ر.) ١ـ رەگی چاوگی بارین. ٢ـ بە ناوەوە دەلکێ و مانای بارێنەر دەدا. ⁚⁚ بەفرانبار.

**بار**[5] (پاشـ.) بە دوای هەندێک ناو کە پەیوەندیان بە ئاوەوە هەبێ دێ. ⁚⁚ جۆبار، رووبار، زرێبار.

**تێبینی:** بار بۆ ماناکەی چەندین رێی تێدەچێ کە هەموو بە لەونێک لێی نزیکن بە لە بەر چاو گرتنی ئەوە کە شکڵێکی دیکەی بار، ڤار یا وار بوە و هێشتا لە زرێوار دا ماوە: ١ـ لە بار bār ـ ی پەهلەویی بە مانای لێوار و بەستێن کەوتبێ. ٢ـ لە ڤار vār ـ ی سانسکریت بە مانای ئاو کەوتبێ. ٣ـ لە ڤارە vāra ـ ی سانسکریت بە مانای زۆر، گەلێک کەوتبێ ٤ـ لە ڤەری vari ئەوێستایی و ڤەر var ـ ی پەهلەویی بە مانای ئاوێکی زۆر (دەریا، دەریاچە، ئەستێر) کەوتبێ. ٥ـ لە وار و هەوار کەوتبێ بە مانای شوێن و جێگا.

**بار**[6] (نا.)[بڕ: بەر3] لایەن، لا، سوێ. ⁚⁚ ئەو فەرشە بە باری خۆی دا رانەخراوە. عەلی باری چاکەی زۆرە و باری خراپەی کەمە. **~ خستن:**



کەوتنە سەر تەنیشت، ⁙ ئەگەر مریشک باری خست نیشانەی ئەوەیە کە میوان دێ. **بە ~یک دا خستن:** جێبەجێ کردن و لابەلا کردنی کار و مەسەلەیەک بۆ تەواو کردنی، بە لایەک دا خستن. ⁙ هیندە فکر کردنەوەی ناوێ قۆڵ هەڵکەن و کارەکە بە بارێک دا بخەن و خلاسی کەن. **چوونە سەر ~ی خۆ:** دروست بوون و کەوتنە سەر گەڕی کار و مەسەلەیەک. ⁙ هەرچی دەکەم کارەکەم ناچێتەوە سەر باری خۆی.

**بار**[7] (نا.)[پەھ: بار] جار، دەفعە، کەڕەت، بارە2. ⁙ جار و بار

**بارا** (ئان.، نا.)[سۆر] بڕ: بالا

**باراش** (نا. ل)[بار1 + ئاش1] دەغڵ و دانی لە بار دراو کە دەیبەنە ئاش هەتا بیهاڕن و بیکەنە ئارد. ⁙ سبەی باراشەکان دێنمەوە. ~ **لێکردن:** بردنی باراش بۆ ئاش بۆ هاڕینی، باراش هاڕین. ~ **هاڕین:** بڕ: باراش لێکردن.

**باران** (نا.)[ئەو: ڤارە ـ هیک: ڤار(ئاو) ـ پەھ: ڤاران. تات: ڤاران ـ فار: باران ـ پەش: باران. باک: باران، بارش ـ ناو: باران، بارانە ـ باش: واران، باران ـ هەو: واران ـ زا: ڤاران، ڤارۆ، ڤاروو] ١ـ هەڵمی ئاو کە لە هەوران دا کۆ بۆتەوە و بە دڵۆپ لە ئاسمانەوە دێتەوە خوارێ و بە پێی توندیی و نەرمیی و کەمیی و زۆریی ناوی جۆربەجۆری هەیە، وەشت. ٢ ـ پێدادانی بە تێگرایی شتێک بۆ سەر کەس یان کەسانێک، کە لەم حاڵە دابە ناوەوە دەلکێ و ناوێکی تازە ساز دەکا. ⁙ گوڵباران، بەردەباران، تیرەباران. ~ **بارین:** دەست پێکردنی باران، باران دادان، باران داکردن. ⁙ باران ببارێ ئاشم دەگەڕێ باران نەبارێ جووتم دەگەڕێ (پەند). ~ **دادان:** بڕ: باران بارین. ⁙ بەر لەوەی باران دایداتێ گەیشتینەوە ماڵێ. ~ **داکردن:** بڕ: باران بارین. ⁙ بەو مندالانە بڵێ بێنەوە باران دایکردۆتێ و تەڕ دەبن. ~ **لێبوونەوە:** تەواو بوونی باران، باران لێکردنەوە، باران وەستان. ⁙ باران لێبۆتەوە ئێستا دەتوانین بڕۆین. ~ **لێکردنەوە:** بڕ: باران لێبوونەوە. ⁙ پێم وانیە ئەم بارانە وا زوو لێی کاتەوە. || **بارانی پەڵە:** بارانی کەم و کورتی گەواڵە هەوری بەهاری کە دەغڵ و دان و گیا تێراو دەکا، ڕێژنەبارانی بەهاری. **بارانی ڕەحمەت:** بارانێک کە زەرەر و

زیانی نەبێ و نەبێتــە ســێــلاو و بەلا. **بارانی کلاو بە سەرە:** بارانی دەنک گەورە و توند. **بارانی گورگەزێ:** بارینی باران لە کاتێک دا کە هەتاو بە دەرەوەیە و بە پێی باوەڕی خــەڵک لەم کاتــە دا گورگ دەزێ، داوەتی ڕێوییان، تاڤی.

**باراناو** (نا. ل)[باران + ئاو1] ئاوی بارانە کـە دوای بارین لـە قوڵکە و چاڵان دا دەمێنێتەوە.

**بـاران بـڕان** (نـا. ل)[بـاران + بـڕان] سـێـهـەم مـانگی بەهـار کـە ئیـتـر باران دەبڕێتـەوە، یا ئەوە کـە کـەم دەبارێ و بە بەختە، بارانە و بڕان، جۆزەردان

**باران پێــو** (نا. ل، نـا. فـا) [باران + پێـو] ئامـرازی پێـوان و ئەندازە گـرتنی ئاوی باران.

**باراندن** (چا. م)[پەه: ڤارێنییتـەن] ١ـ کـەسـێک یا هۆیەک کـە باران دەبـارێنێ، داباراندن. :: خودا بارانی دەبارێنێ. ٢ـ هـاتنە خوارەوەی هـەر شتێک کە سەرەوە بـۆ خـــوارەوە بـە هـەر هـۆیـەکـــەوە. :: ئەوسـاڵ تەرزە و نەگبەتی و نەهاتیمان بۆ دەبارێنێ. ٣ـ فـرمـێسـک هەڵوەراندن. :: دەگریا و دەیباراند.

**بارانە**[1] (نا.)[موک] بڕ: باران

**بـارانــە**[2] (نـا. ل)[بـار1 + ئـانـە2] بـاجــێکە کـــە لـە ســــەر سنوور یا لـەو ناوچەیانـە کـە دەسـتـەڵاتدار یا دەرەبەگی لێـیــە لـە قــاچاغــچی یا خـــاوەن باری دەستێنن ٢ـ پارەیەکە کە خاوەن ئەنبار و کـــاروانســــەرا دار بـۆ ڕاگــرتنـی بار لـە خاوەن باری دەستێنن.

**بارانە و بڕان** (نا. ل)[بارانە1 + و + بڕان] بڕ: باران بڕان

**بـارانـی** (ئـان. ل)[بـاران + ئـی][پـەه: ڤـارانیـیک] هەوایەک کـە وێدەچێ باران ببـارێ، بەر گـیـرانی ئاسـمـان بە هەوری ڕەش. :: لــە هـــەوای بـــارانـــی دا دڵــم دەگـیـرێ. ٢ـ (نـا. ل) جلێکە وەک باڵتـۆ، درێژە و لە ســـەرەوەی جلـەکـــانی دیکە دەبـەری دەکــــــەن، تـان و پـۆیـەکـــــەی پلاسـتـیکی تێدایە و باران و بەفر دانادا و جلەکانی بنەوە تەڕ نابن.

**باربوو** (نـا. ل)[؟][باک: باربوو ـ نـاو: بـاربوو، بـاروبـوو] پێـــوە چوون و دیاری بردنـی کـەل و پـەل ، شــمــەک و پارە بۆ کـەسـێک کـە تازە ژنی هێناوە یا مــاڵی سـاز کردوە یا ماڵی سـووتاوە و شـتێکی لەم بـابەتـە بۆ مـــەبەســـتی هـاوکـاری و دەست گـرتنی ئەو کەســە، دەسـتـەوایی.



**~ کــردن:** دانـی دیاری و باربوو بۆ مەبەستی دەست گرتن و یارمەتی دان.

**باربەر** (نا. فـا، نا. ل)[بار1 + بەر7] کەسێک کە بار دەبا، حەمباڵ، بارکێش. :: زاوا باربەری خەسوانن. (پەند)

**باربەری** (حم.)[باربەر + ئیی] کار و پیشەی باربەر، بارکێشیی، حەمباڵیی.

**باربەست** (نا. ل)[بار1 + بەست] باری بەستـــراو و تەیار بۆ ســـەفـــەر، باربەستە. **~ کردن:** ١ـ بڕ: بار بەستن. ٢ـ خۆ ساز کردن، خۆ ئامادە کردن

**باربەستە** (نا. ل)[بار1 + بەستە] بڕ: باربەست

**باربەند** (نا. ل)[بار1 + بەند] ١ـ گـــوریس یا هـەرشــــتـــێکی باری پێ ببـەســتنەوە. ٢ـ شـوێنی بار لێدان لە سەرەوەی ماشێنی باری یا ترۆمبێل.

**باربەندیی** (حم.)[باربەند + ئیی] بەستنەوە و پێچانەوەی بار و بارگە.

**باربەها** (نا. ل)[بار + بەها] شتێک یا کـەسـێک لە بری بەهای کـەسـێک یا شــــتـــێکی دیکە دەدرێ. **~ دان:** گـۆڕینەوە و دانی شـتێک یا کـەسێک لەجیات شـتێک یا کەسێکی دیکە. :: یەکسەر ئەو مەجلیسە سەری سوڕما! خودایە جا چۆن گوڵخاتر و خونچەی باربەها دەدا؟ (سەعید و میرسێوەدین ل ١٦٣)

**بارتەقا** (نا. ل)[؟] ١ـ هاوتا، بەرابەر، هاوسەنگ. ٢ـ لە جیات، لەبری، لەبات.

**بارچەوت** (ئان. ل)[بار1 + چەوت] کـەسـێکی کـردەوە و ئاکـاری لە باری ئاسـایی دەرچـووبێ و دژی داب و نەرێتی کۆمەڵ بجووڵێتەوە، پیاوی ناڕاست.

**بارچەوتیی** (حم.)[بارچەوت + ئی] کاری مرۆی بارچەوت.

**بارخـانە** (نا. ل)[بار1 + خـانە] ١ـ کاری و ئاکامی لە سەر یەک هەڵچنینی بار. ٢ـ کاتی پێگەیشتنی هەندێک حاسڵ و بەرهەمی لادێ. :: بارخـانەی خـوری، بارخـانەی تووتن. **~ کــردن:** لە بارخانە دان، لە ســەر یەک هەڵچنینی بار. **لە ~ دان:** هەڵچنینی بار لە سەر یەک، بارخانە کردن. :: بارەکـان بەرنە ژووری و لە بارخانەی بدەن.

**تێـبـینی:** بارخـانە هەرچەند دەبا بە مـانای شـوێنی بار با بەڵام وانیە و خـانە بە مـانای هەڵچنین و لە سـەر یەک دانان هاتوە، یانی بارەکان وەک خانوو لە سەر

یەک دانان.

**باردار** (نا. فا)[بار1 + دار] ژنێک کە باری (منداڵ) دە زگ دایە، ژنی زگپڕ.

**بارز** (ئان.)[زا] بڕ: بەرز

**بارست** (نا.) ئەندازە و بەرزی و حەجمی هەر شتێک، ئەستوورایی هەر شتێک لە سەر یەک. ∷ تو خوداکەی ئەی گەلی دە برادەران ئەوڕۆکانە بۆم بچنەوە کن/ هەڵاڵان، سوورەگوڵان، گیا بەند و خاوان/ ... / بە گرمەی هەوری بەهارێ سەریان لە من دەردێنن لە بن بارستی/ خۆ رادەوەشێننەوە لە خۆڵێ (پایزە ل ٤٣). || **بارستی گڵ:** ژێر گڵ، بن زەوی. ٢- (مج.) گۆڕ، قەبر. ∷ دەترسم خاترخۆیەکە و جوانچاکێکەم بەرمەوە بن بارستی گڵییە (شۆڕمەحموود ل ٤٨). ***سەر بردنە بن بارستی گڵ:** چوونە ژێر گڵ، مردن. ∷ لە فەرخی مامان زیاتر ئەمن هیچ کەسم قەبووڵ نیە/ هەتا ئەوڕۆژەی سەر دەبەمەوە بن بارستی گڵییە (شێخ فەرخ ل ٤٣).

**تێبینی:** لە زمانی پەهلەویی دا بالیست bālist بە مانای بەرزیی، درێژایی (ارتفاع) و هەروەها باریست bārist بە مانای قایم و چەقیو هاتوە. بارست لە دوو وشەی بەرز + ستا بە مانای وەستان و راوستان کەوتوە [ئەو: ستا بە مانای وەستان] کە بە گشتی یانی بەرز وەستاو یا بەرزایی.

**بارستایی** (حم.)[بارست + ئایی] [پەه: بالیستییە] بەرزایی وئەستوورایی شتێک. ∷ بارستایی ئەو نوابەفرە نیوگەز دەبێ.

**بارسووک** (ئان. ل)[بار1 + سووک] ١- کەسی کەم خەرج و کەم ئەرک. ٢- کەسی هەژار و نەدار، کەسێک کە چی وای نیە باری قورس بێ.

**بارسووکیی** (حم.)[بارسووک + ئیی] ١- بێ ئەرکیی، بێ تەکلیفیی ٢- کەم زەحمەتیی، کەم بوونەوەی زەحمەت. ∷ پوورم لە کاری نێو ماڵ دا جار و بار یارمەتییم دەدا و بۆتە هۆی بارسووکیی من.

**بارش 1** (نا. چا)[لە: بارین] ١- باران بارین، داباریین، بارشت. ∷ بە گریانم وەکوو گوڵ، پێکەنی یار/ لە باغی من بە بارش غونچە پشکووت (مەحوی ل ٨٠). ٢- (نا.)[قوچ] بڕ: باران

**بارش 2** (نا.)[پەه: بار] بڕ: وارش

**بارشت** (نا. چا)[لە: بارین] باران

بارین، هاتنە خواری باران، دابارین، بارش، بارژن.

**بارفرۆش** (نا. فا)[بار1 + فرۆش] کەسێک کە کاری کرین و فرۆشتنی بە تێگرایی میوە و تەرەبارە، کەسێک کە بە بار دەکرێ و بە بار دەفرۆشێتەوە و دوکاندار ماڵی خۆیان لەم کەسانە دەکرنەوە.

**بارفرۆشیی** (حم.)[بارفرۆش + ئیی] ١ـ کار و پیشەی کەسی بارفرۆش. ٢ـ (نا. ل) شوێن و دوکانی کەسی بارفرۆش.

**بارفیسک** (نا.)[باک] قووڵایی پشت چۆک و ئەژنۆ. بڕ: رەفیسک

**بارفیکس** (نا.)[فەر: barrefixe] میلەیەکی کانزای درێژ کە لە سەر دوو پایەی دیکە لە بان زەوی دامەزراوە و بۆ هەندێک وەرزش کەڵکی لێوەردەگرن.

**بارکەوتوو** (نا. مف.، ئان. ل)[بار١ + کەوتوو][لە: بار کەوتن] ١ـ خاوەن بارێک کە بارەکەی لە پشت بارەبەر کەوتبێ. ٢ـ (مجـ.) داماو، خراپ لێقەوماو، کەسێک کە خراپی بۆ هاتوە، بارکەوتە.

**بارکەوتە** (نا. مف.، ئان. ل)[بار1 + کەوتە] بڕ: بارکەوتوو

**بارکێش** (نا. فا)[بار1 + کێش] ١ـ کەسێک کە بار لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی دیکە دەبا، کەسێک کە کاری داگرتنی بارە، حەمباڵ، باربەر. ٢ـ حەیوان یا ماشێنێک کە بار رادەگوێزێ، بارەبەر.

**بارکێشی** (حم.)[بارکێش + ئی] ئیشی کەسی باربەر، حەمباڵیی، باربەریی.

**بارگا** (نا. ل) بڕ: بارەگا

**بارگر** (نا. ل)[بار1 + گر] ١ـ دارێک کە لە نێوان بارەکانی بارخانەی دەنێن هەتا نەڕمێن. ٢ـ [زا] بڕ: بارگین

**بارگران** (ئان. ل)[بار1 + گران] ١ـ بارەبەری بار قورس. ٢ـ پیاوی تەوەزەل و ئەرک قورس. ٣ـ ژنی زگپڕ. ~ **بوون:** بە ئەرک بوون، بە زەحمەت بوونی ئەرکی کەسێک.

**بارگرانایی** (حم.)[بارگران + ئایی] ئەو ئەنجامەی کە بارێکی گران بەدی دێنێ.

**بارگرانیی** (حم.)[بارگران + ئی] ١ـ قورسایی باری زۆر. ٢ـ ئەرکی قورس و زۆر. ~ **خستنە سەر کەسێک:** ئەرک و کاری خۆ بە کەسێکی دیکە کردن،

کەسێک تووشی ئەرک کردن. ∷ بۆ خۆی لە هەمووومان ساغ و سەلیمترە بەڵام بارگرانییەکەی خستۆتە سەر ئێمە.

**بارگە** (نا. ل)[بار1 + گە] کەرەسە و کەل و پەلی پێویستی سەفەر و کۆچ و هەر شتێکی لەم بابەتە. **〜 بار کردن:** بڕ: بارگە تێکنان. **〜 تێکنان:** بەستن و تێکەوە پێچانی بار و بنەی سەفەر یا کۆچ، بارگە تێکەوە پێچان، بارگە بار کردن. ∷ کە بارگەت بۆ هەوار تێکنا عەزیزم / شکا ئەستووندەکی تاوڵی مرادم (تاریک و روون ل ١٢٩). **〜 تێکەوە پێچان:** بڕ: بارگە تێکنان. ∷ بارگەیان تێکەوەپێچا و بەڕێ بوون یاران / لە دنێ وا بە تەنێ پاشی ئەوان من چ بکەم (هێمن)

**بارگەچی** (نا. ل)[بارگە + چی] کەسێک کە لە دیوەخانی میر و بەگان کاری دەکرد و ئەرکی بارگە ساز کردن و تێکەوەپێچان بوو و لە رێگا کەرەسەی پێویستیان لەو داوا دەکرد.

**بارگە و بنە** (نا. ل)[بارگە + و + بنە] هەموو کەل و پەل و کەرەسەی سەفەری دوور و درێژ.

**بار گیر** (نا. ل)[بار1 + گیر] بڕ: بارگین.

**بارگین** (نا. ل)[بار1 + گین ][پەه: بارەک، بارەگ. باک: بەرگیر، بەرگیل ـ ناو: بارگین، بارگیر ـ باش: بارگیر ـ زا: بارگیر، بەرگیر، بارگر] ١ـ ئەسپی یەختە کراو و بە تاقەت بۆ بار بردن. ٢ـ ئەسپی نارەسەن ٣ـ (مجـ.) بۆ جوێن بە مانای بێ ئەقڵ، بێ ئەدەب و کۆمەڵایەتی نەبوونی کەسێک بەکار دەبردرێ. ∷ وەک بارگین سەری خۆی داخست و رۆیشت.

**تێبینی:** گین شکڵێکی دیکەی گیرە لە ریشەی گرتن. جێگۆڕکێی دوو پیتی « ن» و « ر » کەمە و بەڵام لە ئەوێستاییەوە بۆ کوردیی وێنەی هەیە: ئەوێستایی مان بە کوردیی مار یا ماڵ. ئەوێستایی خڤەن (هڤەر) بە خۆر ـ ی کوردیی.

**بارماخ** (نا. )[تور: بارماغ (قامک)] ١ـ کاغەزی لوولەکراو و ئامادە بە ئاغزەوە کە توتنی تێدەکەن و دەیکێشن، بەرماخ، بەرماغ، قامیشەجگەرە. ٢ـ هەر کام لە پەرەکانی نێوەوەی چەرخ و تەگەری ئەرابە و داشقە کە کەللەی تەگەرەکە بە ناوەندیەوە (گەردڵ، گردیل) دەلکێنن، قامکە.

**بارمــتــه** (نا. ل)[بار + مت + ئه] ١ـ شـتـێک که له لای کهسـێک دادهندرێ بۆ ئهوه که پاره یا شتێکی پێداویستی دیکه بۆ ماوهیهک وهرگرترێ و داوی که پاره یا شـتــهکــهی داوه ئـهمــانـهتهکــهی خـۆی وهردهگـرێـتـهوه. ئهو شـتـهی به بارمـتـه دادهندرێ نـرخـی پتــر یا دهبێ به قــهرا ئهو شته بێ که وهردهگرترێ. ٢ـ کهسێک کــه هێــزێکی ســیــاسی یا دهوڵهتێک دهیگرێ و بۆ ســهودا دهگــهڵ دهوڵـهت یا هێـزێکی دیکه کـهلکی لێـوهردهگـرن. **به ~ دانان:** ده گـرهو نانی شـتـێک بۆ وهرگـرتنی قـهرز. ؛؛ سـهعـاتهکــهم به بارمـتـه دادهنێم هـهتا سبـهی سـهد تمهنم بدهیه. **به ~ گرتن:** کهس یا کهسانێک به زهبر لای خـۆ راگـرتن بۆ مـهسـهله و ســهودایهکی ســیــاسی یا مــاڵی. ؛؛ کـابرایهکی چهکـدار هێـرشی کـردهوه بانکێک و سێ کارمهندی ئهم بانکهی به بارمـتـه گـرت. **به ~ وهرگرتن:** کاڵا یا شتێک لهبری قهرز له کهسێک وهرگرتن.

**تێـبـینی:** مت له مــوکـریان پـاره یا مـهڕمــهڕ و هـهر شـتـێکی دیکهیه کــه له مـێـشـێن (مـووشـێن) دادهکـردرێ و له وانهیه پێـشــتــر مـانایهکی دیکهی وهک کـاڵای بـووبێ کـه ئێـسـتـاکه فـهوتاوه، به گـشـتی دهبێـتـه شـتـێک کـه له بری مت (کاڵا) وهردهگرترێ.

**بارنامــــه** (نا. ل)[بار1 + نامــــه] کاغهزێک که کاتی له بارداني جنسێک له شارێکهوه بۆ شـارێک دهنوسرێ و جۆری کـاڵا و ئـهندازهی تێـدا دیـاری دهکـرێ و دوایی خاوهن بار یا کهسێک که بارهکهی به نـاو کـراوه بهم کـاغـهزه لـه کـاراژ یا ئهنبارێک بارهکه وهردهگرێ.

**بارنهبهر** (ئان. ل)[بار1 + نه + بهر] ١ـ وڵاغێک که بار قهبووڵ ناکا یا ناتوانێ بیـبـا، بارنـهوهر ٢ـ کـهسـێکی تهنبـهڵ و تهوهزهل که ناچێته ژێر باری کار.

**بارنهوهر** (ئان. ل)[بار1 + نه + وهر] [ئهر] بڕ: بانهبهر

**بار و بارخـــانه** (نا. ل)[بار1 + و + بارخــانه] ١ـ ئـهو بار و کــاڵایهی کــه له شـــوێنێکهوه بۆ کـــهســـێکی دیکه له شوێنێکی دی دهچێ. ؛؛ بار و بارخانهی بابم دوێنی له شنۆوه هات. ٢ـ (کنـ.) بهر و سمتی گهورهی ژن.

**باروبنه** (نا. ل)[بار1 + و + بنه] بار و بارخـانـه و هـهمـوو کـهل و پـهلی ســهفـهری بــازرگـــــــــــــان بــه چــوارویٚ و کاراونچیهکانیهوه، بنهوبارخانه.

**باروبوو** (نا. ل)[بار + و + بوو] بڕ: باربوو

**بارودۆخ** (نا. ل)[بار + و + دۆخ] لایەن و چلۆنایەتی بار و هەڵکەوتنی شتێک، هەلومەرج. (شرایط). ⁝⁝ ژن لە بارودۆخی ئیستاکەی دنیا دا بەرەو ئازادی پتر دەڕوا.

**بارۆشە** (نا. ل)[با1 + رۆش (رووشاندن) + ئە][ئەر] بڕ: باوەشێن

**باروونە** (گیا.)[؟] گیایەکە لە رەگەزی نەعنا، گەڵاکانی درێژ و باریکە، گوڵەکانی سپی یا بەنەوش و شین، بۆنی خۆشە و کوردەواری لە پەنیری دەکەن و دەیخۆن، Dracocephalum royleani ناوی لاتینی ئەم گیایەیە، باڵنگ/٢، باڵنگوو، بادرەنگ.

**بارهەڵگر** (ئان. ل)[بار1 + هەڵگر] ١- حاڵی ولاغێک کە وەختی بار لێنانی هاتوە و توانای بار هەڵگرتنی هەیە. ٢- (مجـ.) کەسێک کە زەحمەت و نارەحەتی دەتوانێ قەبووڵ بکا.

**بارهەنگ** (گیا.)[بار + هەنگ] تۆوی گیا رکێشە.

**بارە**[1] (نا.)[؟] ئەم وشە بە تەنیا دە کار ناکردرێ و دەگەڵ (لە یا دە) دێ و مانای لەمەڕ، سەبارەت دەدا. ⁝⁝ لە بارەی وەفایی دا چتان پێخۆشە بینووسن.

**بارە**[2] (نا.)[پەھ: بار] جار، کەڕەت، بار7. ⁝⁝ جاروبارە، دووبارە

**بارە**[3] (نا.)[ئەو: بەخێذرە ـ هەخ: بەختره ـ پەھ: بەهر، بەهرەک. ناو: بارە ـ باش: بەهرە ـ زا: بارە] ١ـ ١ـ بەهرە، سوود، قازانج. ٢ـ بەش، پاژ. ٣ـ بەشێک لە شەو و رۆژ. ⁝⁝ سێبارەی شەوێ.

**بارەبرا** (نا. ل)[بارە3 + برا][زا] شەریکایەتی لە شتێک دا بە نیوەیی، بەشدار، برابەش.

**بارەبەر** (نا. فا، نا. ل)[بار1 + ئە + بەر] هەر ولاغێک کە باری لێبنێن. ⁝⁝ من خۆم تەنیا ماڵ واماندەی دڵ تەنگ / بێ کەس بار سەنگی، پای بارەبەر لەنگ (مەولەوی ل ٢٢٥). ٢ـ هەر چی کە باری لێبنێن و بۆ بار بردن کەلکی لێوەرگرن.

**بارەشایی** (نا. ل)[بار1 + ئە + شایی] ئەوەندە شتەی کە ماڵە زاوا دەینێرنە ماڵە بووکێ بۆ ساز کردنی چێشتی شایی.

**بارەقەڵلا** (شر.) بڕ: بارەکەڵلا.



**بارەکەڵڵا** (شر.)[عەر: بارک الله] ١ـ رستەیەکە بۆ هاندان و بە مانای ئافەرینی خودات لێبێ، بارەقەڵڵا، ئافەرین. ٢ـ بۆ تەوس و لاتاو پێدادان بە کەسێک کەلکی لێوەردەگرن کە کار ە ئەرکی پێویست نەکردبێ. :: بارەکەڵڵا! ئەوە بوو دەرس خوێندنەکەت. هەی بارەکەڵڵا ئاوات ئاگا لەو منداڵەی بوە؟ & بارەقەڵڵا

**بارەکی** (ئان. ل)[بار1 + ئەک + ئی] ولاغی باری کە گەیشتۆتە ئەوە بار هەڵگرێ، گەیشتنە تەمەنی بار هەڵگرتنی بارەبەر.

**بارەگا** (نا. ل)[بار + ئە + گا] ١ـ دەربار و کۆشکی شا و میران ٢ـ شوێنێک کە شا و پادشا ئیزنی چوونی خەڵک و دیتنیان دەدا. ٣ـ دەربار و سەرای لێ پرسینەوە لە لای خودا. ٤ـ جێگای سەرۆکایەتی پارت و حیزبەکانی سیاسی. & بارگا.

**تێبینی:** بار بە مانای ئیزن و رێ دانە و بارەگا دەبێتە جێی ئیزن دان یا جێیەکی کە ئازادە، بار لەم وشەیە دا هاوتایە دەگەڵ بەر بە مانای ئازاد (بەر دان) بەڵام لە کوردیی دا شێوەی بەرگا یا بەرەگا ساز نەبوە.

**بارەنگێو** (نا. ل)[بار1 + ئەنگێو] بەرهەڵست و دار و بەردی سەر رێ کە باری سەر بارەبەری وێکەوێ.

**باری**[1] (ئان. ل)[بار1 + ئی] هەرچێک کە بۆ بار بردن و بار کردن دەست بدا. :: ماشێنی باری، ئەسپی باری.

**باری**[2] (ئان.)[زا] بڕ: باریک

**باری**[3] (نا.)[عەر: باریء] خودا. :: شوکرانەی باری قەت نابێ تەواو / شەواوێ بگرە بە فرمێسکی چاو (حەقیقی ل ٤٣). مەعلوومە بۆچی حاجی مەدحت دەکا بە کوردی/ تاکەس نەڵێ بە کوردی نەکراوە مەدحی باری (حاجی قادر ل ١٤٤).

**باری**[4] (نا.) بڕ: باریە

**باریک** (ئان.)[پەه: باریک. ناو: باریک ـ باش: باریک ـ هەو: باریک ـ زا: باری] ١ـ کەم بەر، ئەو شتەی بەر و پانایی کەمە.// پان. :: رێگایەکی باریک بە نێو لێرەوار دا کێشرابوو. ٢ـ هەر شتێکی ئەستوورایی کەم بێ.// ئەستوور. :: شووڵی باریک، لوولەی باریک. ٣ـ لاواز، لەڕ، کز. ٤ـ تەنگ. ::

کەمەر باریک. ٥ـ ئەندامی شووش. ⁂ بەژن باریک. & زراڤ

**باریکان** (نا. ل)[باریک + ئان] بەنی باریک، بەنێک کە بە دانستە باریک ڕێسرابێ. ~ **ڕیستن:** ١ـ بە تەشی بەنی باریک ڕێستن. ٢ـ (کن.) قسە زۆر درێژ کردنەوە و لێ نەبڕینەوە.

**باریکایی** (نا. ل)[باریک + ئایی] شوێنی هەرە باریک لە چاو شوێنەکانی دیکە کە هەندێک ئەستوورتر بن. ⁂ دارەکە لە باریکاییەکەیەوە ببڕنەوە.

**باریک و بنیسی** (نا. ل)[باریک + و + بنیسی] ١ـ لاوازی و لەڕی لە رادە بە دەر لە بەر نەخۆشی پێوە نووسان. ٢ـ بڕ: ئازارەباریکە. & سەبنێسی، بنێسی

**باریکە** (نا. ل)[باریک + ئە] ١ـ درووم‍انی پەڕاوێزی جل و بەرگ. ٢ـ تیزماڵکێکی باریک لە چەرم، پارچە یا هەر شتێکی دیکە. ٣ـ (گیان.) ١٦ سانتیمێترە... پشتی بۆرە و بەرزگی کاڵ. ئەستوورایی باڵی خەتی ئاماڵ ڕەشی تێدایە. بڕۆی مەیلەوسپی هەیە. لاقی درێژ و زەردن. سەری خاڵی وردوردی تێدایە. بە باڕی سەر و پشت و سینگی ڕێ ڕێیە. لە ناو پنچکی بەیار و خیزەڵانان دەژی و زستانان دێتە ناو زەوی و زاران. لە ژێر پنچکان لە شوێنی نەدیو هێلانەی ساز دەکا (فەرهەنگی باڵندە ل ٩)، Anthus campestris ناوی لاتینی ئەم مەلەیە.

**باریکەڕێ** (نا. ل)[باریک + ئە + ڕێ] ڕێگای باریک، ڕێچکە، کوێرەڕێ.

**باریکەلانە** (ئان. ل)[باریک + ئە + لانە] بڕ: باریکەڵە

**باریکەلە** (ئان. ل)[باریک + ئە + لە] بڕ: باریکەڵە

**باریکەڵانە** (ئان. ل)[باریک + ئە + ڵانە] بڕ: باریکەڵە

**باریکەڵە** (ئان. ل)[باریک + ئە + ڵە] ١ـ حاڵی کەسێکی لاواز و کز. ٢ـ بەژنی شووش و باریک. & باریکەڵانە، باریکەلانە، باریکەلە.

**باریکیی** (حم.)[باریک + ئیی] باریک بوون. // ئەستووریی.

**بارین** (چا. ل)[ئەو: ڤار ـ پەه: ڤارییتەن. تات: ڤارەستەن ـ فار: باریدەن. باک: بارین ـ ناو: بارین ـ باش: وارین ـ هەو: وارای ـ زا: ڤارنایش] ١ـ هاتنە خواری دڵۆپی باران، دەنکی تەرزە

و گللێره یا کلوو بەفر لە هەورەکانەوە بۆ سەر زەوی. ٢ـ هاتنە خواری هەر شتێکی دیکە لە بەرزاییەوە بۆ زەوی. ∷ بەشکەم خودا پووڵێکمان بۆ ببارێنێ و ئێمەش دەوڵەمەند بین.

**باریۆم** (نا.)[فەر: baryum] کانزایەکە کە لە سروشت دا بە شێوەی سۆلفات و کەربۆنات دەست دەکەوێ، رەنگی سپی مەیلەو زەردە، هیچ گرینگایەتییەکی سەنعەتی نیە و تەنیا لە بزیشکی دا بۆ وێنە هەڵگرتنەوە لە ریخۆڵە و بۆ دروست کردنی شووشە و فیشەکەشێتە کەلکی لێوەردەگرن. کێشی ئەتۆمییەکەی ١٣٧ و ژمارەی ئەتۆمییەکەی ٥٦ ـ ە و Ba نیشانەی تایبەتی ئەم کانزایەیە.

**باریە** (نا.)[؟] ئامرازێکی درێژی قایمی کانزا یا هەر شتێکی دیکە کە بۆ هەڵکەندنی بەردی زل یا بۆ جووڵاندنەوە و بەرز کردنەوەی شتی قورس کەلکی لێوەردەگرن. باریە لە بن شتی قورسی دیاری کراو دەدەن و بەردێک یا شتێکی دیکەی چووکتر لە بن باریە دادەنێن و بە تەکانێک شتە قورسەکەی پێدەجووڵێننەوە، چلمێردە، لۆسە، نوێڵ، مەڵغە، باری، بەیرەم، بەرازە، گراستە، قەراسە، قراسە.

**بارێن** (نا. فا)[لە: بارین] ئەوەی کە دەبارێ، ئەوەی کە وەک باران داکەوێ.

**بارِ**[1] (ئان.)[ناو: بارِ ـ باش: وارِ ـ هەو: وار ـ زا: ڤار] جووجکەیەک کە تەمەنی زەرِنەقووتی تەواو کردوە بەڵام هێشتا بە تەواوی پێ نەگەیشتوە. ئەم وشە تەنیا بۆ بێچووی هەندێک مەل دە کار دەکردرێ. ∷ بارِۆکە، کەوبارِ، بارِەهەوێردە.

**تێبینی:** بارِ دەچێتەوە سەر خزمایەتی پێرێنایو ـ pərənāyu ی ئەوێستایی بە مانای باڵغ و پێگەیشتوو و پورنای pur-nāy پەهلەویی بە مانای باڵغ و لاو کە لە ریشەی پێرێنە pərəna ی ئەوێستایی بە مانای پرِ کەوتوون. کە بە گشتی دەبێتە کەسێک کە گەیشتۆتە تەمەنی بلووغ و سەردەمی چووکی تەواو یا پرِ کردوە. هەروەها لە زمانی سانسکریت دا بالە bāla بە مانای منداڵ و مێرمنداڵ هاتوە.

**بارِ**[2] (نا.)[ئین: bar] شوێنێک کە لەوێ بە پێوە یا لە سەر کورسی بڵیند دادەنیشن و مەی دەخۆنەوە. پێشخوانی مەیخانە.

**بارِاندن** (چا. ل)[لە: بارِە] دەنگ

هەڵبڕینی ئاژاڵ، باعاندن، باقانن.

**باڕژن** (نا.) بڕ: بارشت

**بـــاڕن** (نـــا. ل)[بـــا 1 + رن (رنـــین)] بەفـــرێکی ویشکە با لە شـــوێنی خـــۆی هەڵیدەگرێ و لە شـوێنی دیکە دەیبارێنێ و وەک ئەوە دەچێ کە بەفر ببارێ.

**باڕۆکــە** (نا. ل)[بار 1 + ئۆکــە][ناو: باڕۆکـە، بـاڕەکـە، واڕۆک ـ باش: واڕگ ـ هەو: واڕۆکـــە ـ زا: ڤـــارکـــە، ڤـــاڕکـــە] جـــووجکەی مـــریشـک کـە تازە وە هێلکە کەوتبێ.

**بـــاڕۆگ** (نـــا. ل)[بـــا 1 + رۆ + گ] شـوێنێک کە لە چاو شـوێنی دیکە زۆرتر بای بگرێتەوە.

**باڕوو** (نا.)[ئەو: ڤـــــارە ـ پەهـ: بـار] وارش و دیواری قەڵا. ⁘ نامەوێ بورج و باڕوو و تـالار / حـــوکـــمـــاتی شـــایی، دوازدەهـەزار سـوار (بارام و گـوڵندام ل ٤٣).

**باڕووت** (نا.)[تور: barut] تۆزێکی ڕەشـە کـە لە شـووره و گـۆگرد و ڕەژی سـازی دەکەن و لە نێو فیشـەک و گوللەی دەکـەن بۆ تەقـانـدن، باڕووتی ڕەشـۆکی، دەرمــــان. || **باڕووتی بێ دووکـــەڵ:** بڕ: باڕووتی سـپی. **باڕووتی ڕەشـۆکی:** بڕ: باڕووت. **باڕووتی سپی:** جـۆرێک باڕووتە کە لە سـەدەی نۆزدەهەم لە ئورووپا سـاز کرا و لە جیات باڕووتی ڕەشۆکی دەکار هێندرا، باڕووتی بێ دووکەڵ.

**تێبینی:** باڕووت لە زمـانی تورکییـەوە چۆتە نێـو زمـانی کوردیی و زمـانەکـانی دراوســـێ و ئـــەویـــش لـــە poudre ی فەرانسـەوی وەریگرتوە بە مانای پوودر و تۆزی تایبەتی کە گڕ دەگرێ.

**باڕووتخانە** (نا. ل)[باڕووت + خـانە] ئەو شوێنەی کە باڕووت و چەکی لێ ساز دەکەن، کارخانەی چەک و باڕووتسازی.

**بـاڕووتـدان** (نـا. ل)[بـاڕووت + دان] دەفـر یا کـیـسـەیەکـە کـە زوو پیـاوی شـــەڕکـــەر یا ڕاوچی لە بەرقـــەدیان دەبەست و باڕووتیـان تێـدەکـرد بۆ ئەو تفەنگانەی کە پڕ دەکرانەوە.

**باڕووتساز** (نا. فا، ئان. ل)[باڕووت + سـاز] کـەسـێک کـە کـار و ئیـشی سـاز کردنی باڕووتە.

**باڕووتسـازیی** (حم.)[باڕووت ساز + ئیی] کار و پیشەی باڕووتساز.

**باڕووتیی** (ئان. ل)[باڕووت + ئیی] لە چـەشـنـی بـاڕووت، ورد وەک بـاڕووت. ⁘ چای باڕووتیی.

**باڕە** (نا. د) دەنگی ئاژەڵ، دەنگی بزن و مەڕ، باعە، بالە، بێلە.

**باڕەباڕ** (نا. د)[باڕە + باڕ] ١ـ دەنگی پەیتاپەیتای ئاژەڵ. ٢ـ (مجـ.) قیـژە و هەرای زۆری مرۆڤ & باعـەباع، بالەبال، بێلەبێل.

**بـاڕەش** (نـا. ل)[بـا1 + رەش] بـڕ: رەشەبا

**باڕەکـە** (گـیـانـ.)[باڕ1 + ئەکـە] بڕ: باڕۆکە

**باڕەکەو** (گیانـ.)[باڕ1 + ئە + کـەو] جوجکەی کەو، بێچووکەو، کەوباڕ.

**باڕەهەوێردە** (گـیـانـ.)[باڕ1 + ئە + هەوێردە] بێـچـووی هـەوێردە، جـوجکەی هەوێردە.

**باڕێزە** (نا. ل)[با1 + ڕێز (ڕێژ) + ئە] ١ـ بارانی بە دەم باوە، باڕێژە. ٢ـ (گیا.) گیایەکە لاسکی درێژ و رەش باوە، گەڵای ورد و سێ گۆشەیە، وە کەرەوز دەچێ، لە شـاخـان لەو شـوێنانەی کـەمێ ئاویان هەیە شین دەبێ. لە کوردستان ئەم گیایە بۆ نەخـۆشی مـیـزگـیـران کـەلکی لێـوەردەگـیـرێ (قـامـووس ل ٣٠)، خـاڵەڕەش، خـاڵەڕەشـە. ٣ـ [ئەر] بەر و میوەی کاڵ و کرمێ و خراپی دارەبەر کە با وەراندبێی، باوەرێن.

**بـاڕێـژە** (نـا. ل)[بـا1 + ڕێـژ + ئـە] بـارانی بـە دەم بـاوە، باڕێزە/١. ⁘ ئەوە لە لەشکری دەهاتە خـوارێ / لەشکری مـــیــــرە کــــوێرەی رەواندزێ / ئەوە هەروەکوو باڕێژەی دە بارانە (سـروە ٧٥ ل ٣١).

**باڕێســـە** (نا. ل)[با1 + ڕێس + ئە] [ئەر] تەختـەیەکی چووک و تەنک کـە بەنێکی تێـــدەکـــەن و بـە دەست هەڵیدەسـووڕێنن و لەبەر تەوژمـێک کـە ساز دەبێ دەنگی لێدێ، **گڤگڤە**، **فڕفڕە**.

**باز**[1] (گـیـانـ.)[پەهـ: باز. باکـ: باز ـ ناو: باز ـ باش: باز ـ هەو: باز ـ زا: باز] مـەلێکی کـێـوی، دندوک خـوار، چنگی بەقەو، پەڕ و پۆی مۆر و خاڵی رەشی لە سەرە، گۆشتخۆرە و باڵندە و گیانداری چووک راو دەکا و دەیخوا. لە سەردەمی کۆن پاشـا و مـیـر بۆ راوی مـەلی دیکە بازیان رادەگـرت و بازەوانی تـایبـەتـیـان هـەبـوو. Falco gyrofalco نـاوی لاتینی ئەم مـەلەیە. ⁘ دار پیـر دەبێ و جـارێک باز لە سـەری دەنیـشێ. || **بازی بەخت:** بڕ: بازی دەوڵەت. ⁘ نیـشـتـنی بازی بەخت هەڵکەوتە/ رێی وەها بۆ من

و هێمن چەوتە (حەقیقی ل ١٨٣). **بازی دەوڵەت:** بازێک بوە لە کاتێک پاشای وڵاتێک مردوە و کەس جێگری نەبوە، ئەو بازەیان هەڵفڕاندوە و لە سەر شانی هەر کەس نیشتبا ئەویان دەکردە پاشا، بازی یەقین، بازی بەخت، شابازی دەوڵەت.

***بازی دەوڵەت لە سەر نیشتن:** (کنـ.) بەخت روو تێکردن، چاک بۆ هاتن، بەختەوەر بوون. **بازی راو:** بازێک کە بۆ راو راگرترێ. **بازی سپی:** (کنـ.) هەتاو. ⁂ سایەیی پایە وەکوو باڵی هوما و بازی سپیم/ نە وەکوو بوومی قەدەم شووم و نە هەمرەنگی قەلم (نالی ل ٢٨٩). بناگۆشی لە چینی زولفیا دەرکەوتبوو، دەتوت/ ئەمە بازی سپی سوبحە، چوە بن باڵی زاغی شام (مەحوی ل ٢١٧). **بازی یەقین:** بڕ: بازی دەوڵەت. ⁂ بازی یەقینیان هێناوە/ هەردووک چاوی وی بەستراوە/ هەڵیان ئاویت راوەستاوە (مان ل ١٨٤).

**تێبینی:** باز لە ڤەزە vaza ـی ئەوێستایی بە مانای مەل کەوتوە و چاوگی ڤەز vaz لە ئەوێستا دا بە مانای فڕینیش هاتوە و لە پەڕەوازە، باڵەوازە، لانەواز دا هێشتا ئەو مانایە ماوە.

**باز**[2] (نا.)[ئەو: ڤەزەهـ ـ پەهـ: ڤاز. باک: باز ـ ناو: باز، بازد ـ باش: واز، باز ـ هەو: باز ـ زا: ڤاز] ١ـ پەڕین بە سەر شتێک دا، خۆ هەڵاویشتن لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێک، بازد. ٢ـ بڕ: سێ باز. ⁂ ئێستەش کەناری حەوشەکە جێی باز و کەوشەکە / یاریی تیایە یا بووەتە مەعرەزی نوفوور (نالی ل ١٩٢). ٣ـ [باک] را. ~ **بردن:** پەڕینەوە یا خۆ هاویشتن لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی دوورتر، باز دان، بازد بردن. ~ **دان:** ١ـ پەڕینەوە بە سەر شتێک دا بە هەنگاوێکی بەرز، باز بردن. ٢ـ لە بەرزاییەوە خۆ هاویشتن بۆ شوێنێکی نزمتر. & بازد دان. ٣ـ [باک] هەڵاتن، راکردن.

**تێبینی:** باز و هاوڕیشەکانی لە ریشەی ڤەز vaz ـ ی ئەوێستایی بە مانای رویشتن، بەزین و را کردن کەوتوە. بە گشتی ڤەز لە ئەوێستا دا جوڵانەوە و بزووتن نیشان دەدا و گەلێک وشەی کوردیی لەم چاوگەن.

**باز**[3] (نا.) ١ـ رێگا، رێ، رێباز. ٢ـ رێگای تایبەتی و ناسراو و دیاریکراو. ⁂ بازی بێریان، بازی پاڵان. ~ **ی رێ گرتن:** رێگا گرتن، سەر رێ گرتن.

:: ئەتۆ زۆرت دنیا قوونەکەو کردووە، زۆر دانیشتووی لە بازی ڕێ گرتن و لە جەنگ و لە شەڕ و لە ڕۆژی دڵ هێشانە (لاس و خەزاڵ ل ١٥٢).

**تێبینی:** باز بەم مانایەش لە هەمان چاوگی باز2 کەوتوە و جگە لەوە لە ئەوێستا دا پەث path بە مانای ڕێگایە و دەگەڵ باز بە لە بەر چاو گرتنی ئاڵ و گۆڕی پیتەکان هەر یەک وشەن.

**باز**[4] (پاشـ.) ١ـ لە چاوگی باختن (باختەن) ـ ی فارسی بە مانای دۆڕاندن و بەخت کردن دەکەوێ و بە دوای ناوەوە دەلکێ و مانای فەدا کردن و بەخت کردن دەدا. :: گیانباز، سەرباز. ٢ـ لە بازیدن (بازیدەن) ـ ی فارسی هەم بە مانای سەرەوە و هەم بە مانای کایە کردن و یاری کردن کەوتوە و بە دوای ناوەوە دەلکێ و (ئاوەڵناوی فاعلی یا ناوی فاعلی) ساز دەکا و مانای خەریک بوون و شارەزا بوون و یا ئۆگر بوون بەم ئیشە نیشان دەدا. :: کۆترباز، ژنباز،، کەوباز، قومارباز.

**باز**[5] (ئان.)[ئەو: پیس] ڕەنگی ڕەش و سپی پێکەوە، بەڵەک، بازوو، بازگ، بازە.

**تێبینی:** پیس بە مانای ڕازاوە و نەخش لە پەئیسە ـ ی ئەوێستایی کەوتوە. پەئیسە لە ئەوێستا دا بە دوو مانا هاتوە. یەک بە مانای پیسی و گولی و دووهەم بە مانای ڕازاوە، ڕەنگاو، جوان. ئەوەش لەبەر ئەمەیە کە لە نەخۆشی پیسی دا پێستی لەش دوو ڕەنگ دەبێ. باز و هاوتاکانی بە مانای بەڵەک لە مانای دووهەمی پیس کەوتوون و ئاڵوگۆڕی پیتەکانیان بە سەر داهاتوە. هەروەتر باز دەگەڵ بۆز یەک ریشە و سەرچاوەیان هەیە و هەر یەکن و ماناکان هەندێک لێک ترازاون. (هس: بۆز)

**باز**[6] (ئاک.)[پەه: ئەپاچ] دیسان، هەر، دووبارە.

**باز**[7] (نا.)[فەر: base لە یون: -Ba sis] لە شیمی دا شتێکە کە لە تێکەڵاو بوونی ئۆکسیدەکان دەگەڵ ئاو پێک دێ و ئەو تایبەتمەندییانەی هەیە ١ـ دەگەڵ ئەسیدەکان تێکەڵ بێ و خوێ (ملح) پێک بێنێ. ٢ـ ئەو ئاوەکییانەی کە بە هۆی ئەسید سوور بوون، شینیان بکا. ٣ـ ئاوێتەکەی ئەو ئەلکتریسیتە لە خۆی تێپەڕێنێ و تەجزیە بێ.

**بازار** (نا.)[باک ـ زا] ١ـ بازاڕ ٢ـ

شار. ٣ـ ڕۆژی یەکشەنبە.

**بازاڕ** (نا.)[هەخ: ئەباچەری ـ پەھ: ڤاچار. باک: باژێر، بازار ـ ناو: بازاڕ، باژێڕ ـ باش: بازاڕ ـ هەو: بازاڕ ـ زا: بازار] ١ـ شوێنی سەودا و کڕین و فرشتنی کەڵ و پەل وپێداویستی ژیان. بازار هەم دەتوانی ریزە دوکان و جێگایەکی داپۆشراو بێ و هەمیش شوێنێکی سەر ئاوەلا و مەیدان بێ و کۆمەڵە خەڵکێک بۆ کڕین و فرۆش لە یەک کۆ بنەوە. بازاری مەیدانی پتر لە گوندەکان برەوی هەیە و لەرۆژێکی دیاری کراو بە تایبەت مەڕدار و چێودار پێکی دێن و مالات دەفرۆشن یا دەکرن. ٢ـ مەعامله، سەودا. ٣ـ (کنـ.) درۆ و چیرۆکی ڕێکخستە. ∷ ئەو دوکان و بازاڕە چیە بۆ خۆت داناوە؟ ٤ـ (کنـ.) سینگ و بەرۆکی یار. ∷ نیشانیان داوم خاتوون ئەستی، سینگی دەڵێی بازاڕ و دوکانە/ محەللی تاجران لەوێ دەگرنەوە سەودا و معامەلە و سانە (شێخ فەرخ ل ٢٥). ~ **خۆش بوون:** لە رمێن دا بوونی پیشە و کار و مەسەلەیەک، برەو خۆش بوون، بازاڕ گەرم بوون. ∷ ئەورۆژانە شایی زۆرە و بازاڕی چاوەشان زۆر خۆشە. ~ **شکان:** هاتنە خوارێ نرخ، هەرزان بوون و رمێن نەمان کالا، لە برەو کەوتن. ∷ شەهد و شەکەر ئەی قوربان بازاڕی شکا یەکجار / لەو وەقتەوە وا دەرکەوت لەعلی لەبی شیرینت (ئەحمەد موختار ل ٦٦). کاکۆڵی بە دەم باوە کە بادا بە بەدەن دا / بازاڕی شکا نافە بە سەر چین و خوتەن دا (وەفایی ل ١٠). ~ **کردن:** سەودا کردن، کڕینی کەل و پەل لە بازار. ∷ پیاوەکە بۆ سبەی شتمان زۆر دەوێ بزانە دەتوانی بازاڕێ بکەی. ~ **کەساد بوون:** برەو نەبوونی پیشە و کار و مەسەلەیەک. ∷ بازاڕی شێعر و شاعیری کەسادە. ~ **گەرم بوون:** بڕ: بازاڕ خۆش بوون. ~ **هەبوون:** رمێن هەبوون، فرۆشتنی کەل و پەل بە خەڵک، بە بازاڕ بوون. // بێ بازاڕ بوون. ∷ ئەورۆ بازاڕم نەبوو هەر کەس بە لای دوکانەکەم دا نەهات. **بە ~ بوون:** ١ـ بازاڕ هەبوون. ٢ـ رستەیەک کە کەسێک بە دوکانداری دەڵێ بە مانای رمێن و فرۆش هەبوون. ‖ **بازاڕی خۆش:** ١ـ بازاڕێک کە کڕین و فرۆشی زۆری تێدا بکرێ و رمێنی هەبێ. ٢ـ کەسێک کە دەسکەوتی لە هەر بارێکەوە زۆر بێ. & بازاڕی گەرم. **بازاڕی رەش:** بازاڕێک کە جنسەکانی



گرانتر لە بازاڕ دەکڕن و دەفرۆشن و ئەم جنسانەش لە بازاڕ بە سانایی دەست ناکەون. **بازاڕی کەساد:** ١ـ بازاڕێک کە رەمێنی زۆر نەبێ. ٢ـ کەسێک کە دەسکەوتی کەم بێ. **بازاڕی گەرم:** بڕ: بازاڕی خۆش. **بازاڕی مردوو:** بازاڕێک کە رەمێنی زۆرزۆر کەم بێ وەک وەی هەر نەبێ.

**بازاڕباشی** (نا. ل)[بازاڕ + باش + ئی] کەسێک کە زوو لە لایەن دەوڵەت یا میرەوە بە کار و باری نێو بازار و باژێڕ رادەگەیشت.

**بازاڕتیژیی** (حم.)[بازاڕتیژ + ئیی] پێهەڵکوتن بە شمەک و کالا بۆ وەگیر خستنی کڕیار و پێ فرۆشتنی، بازاڕگەرمیی، بازاڕخۆشیی.

**بازاڕچی** (ئان. ل)[بازاڕ + چی] بڕ: بازاڕی

**بازاڕخۆش** (ئان. ل)[بازاڕ + خۆش] کەسێک کە بە ئینساف شمەکەکانی دەفرۆشێ و کڕیار لێی رازییە، خۆش سەودا.

**بازاڕخۆشیی** (حم.)[بازاڕخۆش + ئیی] بڕ: بازاڕتیژیی.

**بازیبەند** (نا. ل)[بازی2 + بەند/١٣] بڕ: بازووبەند

**بازاڕگەرمیی** (حم.)[بازاڕگەرم + ئی] بڕ: بازاڕتیژیی

**بازاڕیی** (ئان. ل)[بازاڕ + ئیی] ١ـ (حم.) سەر بە بازاڕ، هەرچی پەیوەندیی بە بازاڕەوە هەبێ. ٢ـ کەسێک کە لە بازاڕ خەریکی فرۆشی کالایە، دوکاندار، بازاڕچی، ئەهلی بازاڕ. ٣ـ (مجـ.) کەمبایخ، سووک، کالایەکی بە دانستە و خۆماڵیی ساز نەکرابێ، شتی بێنرخ و نارەسەن کە بە پارە دەست دەکەوێ، شتی دونیایی. ⁘ بەرگی دنیا هێندە کورت و کۆنە و بازاڕییە/ چونکە ناگاتە گونی دێوانەکەی لێی عارییە (نالی ل ٥٧٨). ٤ـ (مجـ.) کەسێک کە دوور لە مەعنەویاتە و پارە و بازاڕ و دونیای ماددیی لا گرینگە. ٥ـ (مجـ.) ئافرەتی سووک و هەرزە و حەکەدار کە خۆ بە خەڵک نیشان دەدا.

**بازالت** (نا.)[فەر: basalte] بەردێکی رەشی گڕکانیی سەخت و رەقە، مەرمەڕی رەش، بەردی مەحەک.

**بازازان** (نا. ل)[باز2 + باز2 + ئان][ئەر] بڕ: بازبازدێن

**بازبازانێ** (نا. ل)[باز2 + باز2 + ئان

+ ئێ][سۆر] بڕ: بازبازدێن

**بازبازدێن** (نا. ل)[باز2 + بازد + ئێن] ١ـ یار و کێ بەر کێیەکە منداڵان دەیکەن و لە شوێنێکی دیاری کراو بازد دەدەن بزانن کامەیان پتر دەپەڕێ، بازبازانێ، بازبازۆکێ، بازدبازدێن، بازدبازدۆکێ، بازبازان، پڕای. ٢ـ هەڵبەز و دابەزی و هەڵات هەڵاتی منداڵان.

**بازبازۆکێ** (نا. ل)[باز2 + باز2 + ئۆک + ئێ] بڕ: بازبازدێن

**بازبازێن** (نا. ل)[باز2 + باز2 + ئێن] بڕ: بازبازدێن

**بازبەند** (نا. ل)[باز (بازوو) + بەند] [باک ـ زا] بڕ: بازووبەند.

**بازپەڕێن** (ئان. ل)[باز1 + پەڕێن] کەسێک کە لە راو دا بازی پێیە و باز لە نێچیر بەردەدا، بازەوان، قوشچی.

**بازخانە** (نا. ل)[باز1 + خانە] شوێنێک کە باز و مەلی راوکەری لێرادەگرن، قۆشخانە.

**بازد** (نا.)[موک] بڕ: باز2. **~ بردن:** بڕ: باز دان. **~ دان:** بڕ: باز دان.

**بازدبازدۆکێ** (نا. ل)[بازد + بازد + ئۆک + ئێ][موک] بڕ: بازبازدێن.

**بازدبازدێن** (نا. ل)[بازد + بازد + ئێن][موک] بڕ: بازبازدێن

**بازدەبەران** (نا. ل)[بازد + ئە + بەران][موک] دواین حەوتەی وەرزی زستان کە هەتاو هەموو رۆژێ جێگای ئاوابوونی دەگۆڕێ، بازەبەران.

**بازدەڵبازد** (نا. ل)[بازد + ئەل + بازد][موک] بڕ: بازبازدێن

**بازر** (گیانـ.)[باک] بڕ: بازڕ

**بازرگان** (نا. ل، ئان. ل)[پەھ: ڤازارەکان] ١ـ کەسێک کە کاری کڕین و فرۆشتنی کەرەسە و کاڵای زۆرە و بە تێگراییە، تاجر. ٢ـ کوتاڵ فرۆش، بەزاز.

**تێبینی:** دوکتور موعین ریشەی بازرگانی بردۆتەوە سەر بازار + گان (بڕ: برهان ب ١ ل ٢١٩)

**بازرگانباشی** (نا. ل)[بازرگان + باش2 + ئی] گەورەی کاروان کە سەرۆکایەتی قەتار و بارەکانی بە دەستەوەیە و هەموو هی خۆیەتی، سەر بازرگان، باش بازرگان. ⁘ وا پێ دەچوو بازرگانباشی زمانی کوردی نەدەزانی، وەرگێڕی هەبوو ... (دمدم ل ٣٩)

**بازرگانی** (نا. چا)[بازرگان + ئی] ١ـ

کاری کڕین و فرۆشتنی شمەکی زۆر، کار و پیشەی بازرگان. ٢ـ کوتاڵ فرۆشی، بەزازی.

**بازرە** (نا.)[ناو: بازرە ـ هەو: بازرە] ئەم وشە لە زاراوەی ناوەندیی دا بە تەنیا نایە و دەگەڵ چاوگی بوون و کردن دێ و بە گشتی مانای حاڵەتی کەوانەیی لە جووڵانەوە دا دەدا، لە دیوانی مەولەوی دا بە تەنیا بە مانای حەیوان و نێچیرێک کە لە شوێن خۆی بگەڕێتەوە هاتوە. ⁘ بازرە پڕتاو، کۆ چون تل مەوەرد / هەر بەرد بی نەو هەرد مەهەرد وێنەی گەرد (مەولەوی ل ٤٩١). ~ **بوون:** لە نەکاو هەستان و دەرپەڕینی نێچیر و گیاندار، دەرپەڕین. ⁘ ئەوە مامزی من بازرە دەبوو / هەر خۆی داویشتەوە سپیلکی دە سەر خانێ / ... (پایزە ل ٥٢). ~ **کردن:** ١ـ خۆ دزینەوەی نێچیر بێ ئەوەی راوکەر هەست پێ بکا، دەرپەڕین و راکردنی نێچیر و خۆ ون کردن. ٢ـ کەوانە کردنی هەر شتێکی باویشترێ، کەوانە کردن، بازرەقە بەستن. ٣ـ دەرپەڕاندنی نێچیر. ⁘ ئەوە مامزم بازرە دەکرد لە شیرین خەو دا، لە گەرمەلانێ (پایزە ل ٥٣).

**تێبینی:** هەردووک وشەی بازرە و بازرەقە لە vaza ی ئەوێستایی بە مانای راکردن، بەزین و هەڵاتن و بە گشتی جووڵانەوە کەوتوون.

**بازرەقە** (نا.)[بڕ: بازرە] ئەم وشەیە بە تەنیا دەکار ناکردرێ و دەگەڵ چاوگی بەستن دێ و ئەم مانایانە دەدا. ~ **بەستان:** ١ـ دەرپەڕین لە نەکاو. ⁘ کەروێشکێک لە بەر پێم بازرەقەی بەست و هەڵات. ٢ـ فیچقە کردنی خوێن یا هەر شتێکی ئاوەکی دیکە. ٣ـ کەوانە کردنی شتی هاویشتراوی وەک تیر و گوللە، بازرە کردن.

**بازڕ** (گیانـ.)[باک: بازر ـ ناو: بازڕ، بازۆڕ، بازۆڕی ـ هەو: باڵزەر] مەلێکی چووکی راوکەرە، وەک بازە بەڵام چووکتر، رەنگی بۆرەڵووکەیە و بن سینگی سپییە، پاساری و مشک و گیانلەبەری چووکی دیکە راو دەکا، مشک گرە.

تێبینی: وێدەچی کە ئەم وشەیە لە پێشدا باڵ + زەڕ بوە و لە دوایی هەندێک سوابێ و ئەم شێوانەی دیکەی لێ پەیدا بووبێ.

**بازقەپان** (گیانـ.) بڕ: باشقەپان

**بازک** (نا.)[زا] بڕ: بازنە

**بـــازگ** (ئـــان. ل)[بـــاز5 + گـ] بـــڕ: بازوو2

**بازگـه**[1] (نا. ل)[باز3 + گـه] ڕێگای هات و چۆی مامز و بزنە کێوی. ڕاوچی ئەم ئاهـەرێیـانە دەبیننەوە و لـە شـوێنێک دەچنە ســـیـــپـــەوە و کـــاتێک بۆ ئـاو خـواردنەوە بەوێدا تێـدەپەڕێن تەقــەیان لێدەکەن و ڕاویان دەکەن.

**بازگە**[2] (نا. ل)[باز2 + گە] ئەو شوێن و جێگایەی کە لەوێوە باز بدەن، شـوێنی باز دان.

**بازگەشت** (نا. چا)[فار: بازگشت] ١ـ گـەڕانەوە. ٢ـ پاشگەز. ٣ـ پەشـیـمـان. ~ **بوونـەوە:** ١ـ پاشـگـەز بوونـەوە. ٢ـ پەشـیـمـان بوونەوە. ؛؛ خـەجێ دەیکوت ئامۆزا سیامەند لە قەولان بازگەشت نیم ئەمما گـەلێکت لێـدەترسـێم (گـەنج ل ٣٦٤).

**بازن** (نا.) بڕ: بازنە

**بـازنـد** (نـا.) ١ـ (ئـا.) بڕ: بـاسـک. ٢ـ (ئا.) ئـەو شـــوێنـەی دەست کـــە بـازنەی تێدەکردرێ، مەچەک. ٣ـ بازنە/١.

**بازنگ** (نا.) بڕ: بازنە

**بـازنـە** (نـا.)[بـاک: بـازن ـ نـاو: بـازن، بازنگ، بـازنـە ـ باش: بازنـە ـ هەو: بازن ـ زا: بازن، بـازک] ١ـ ئاڵقـەیەکـە لـە زێڕ و زێو یا لـە شــــتـی ئـاســــای دیکە وەک شـووشـە کە ژن بۆ جوانی لە دەسـتیان دەکـەن، بازند، دەســـبـــێنک، دەســـینە، دەســـبـــەنی. ٢ـ ئاڵقـەیەکی ئاسنە وەک ئەنگوسـتـیلە و حـەڵقـە بـۆ بەرگـری لە شکانی پتـــری دار و گـــۆچان تێی هەڵدەکێشن. ٣ـ چەغز، دایرە. ‖ **بازنەی کـوردیی:** جـۆرێک بازنـەی زێڕی دەسـتی ژنانە کـە دراوێکی زێڕی بە زنجـیـرێکی کورتەوە پێوەیە.

**تێبینی:** ڕێی تێدەچێ کە ئەم وشەیە لە پێـــشـــدا بازوونە یا بازینە (هـەروەک دەســـینە) لە بازوو یا بازی + ئینە پێک هاتبێ و لـە دوایی ســـوابێ و بووبێـتــە بازنە.

**بازنیـــشـــەســـتـــە** (نا. مـفـ.)[فـــار: بازنشـسـتـە] ١ـ کەسـێک کە لە پیـریی، نەخـۆشـیـی یا هـۆی دیکە لە کـار کـردن ئازاد دەکرێ و پارەیەکی دیارییکراوی بۆ دەبڕنەوە، تەقاعود ٢ـ (مجـ.) خـلاسی لە کار و بێگارێک. ~ **بوون:** لە کار ئازاد بوون و پارەی تەقاعود وەرگرتن.

**بازۆڕ** (گیانـ.) بڕ: بازڕ



**بازۆڕی** (گیانـ.) بڕ: بازڕ

**بـازۆڵـە** (نـا. ل)[بـازوو1 + ئـۆڵـە] ئەستوورایی باسک، بابۆڵەی باسک.

**بازوو 1** (ئا.)[ئەو: بازو] بڕ: باسک

**بـازوو 2** (ئـان. ل)[بـاز5 + ئـوو] ١ـ گـایەکی کلک و لاقی سـپی بێ. ٢ـ هەر شـتێکی دوو ڕەنگ یا ئەبڵـەق بێ، بەڵەک، بازگ، بازە، باز.

**بازووبەن** (نا. ل)[بازوو1 + بەن][ئەر] بڕ: بازووبەند

**بـازووبەنـد** (نـا. ل)[بـازوو1 + بـەنـد] [پـەهـ: بازێپـانەک. بـاک: بازبـەند ـ نـاو: بازووبەند، بازووبەن، بـازیبـەند، بازیوەن، بازیبەن ـ هەو: بازووبەن ـ زا: بازووبەند، بازبەند] ١ـ کـوتە چەرمێکی سـاز کراوە کـە پاڵەوان لە باسکیـان دەبەست. ٢ـ نوشـتـە و دوعـایەک کـە لـە باسک دەبەسترێ. ٣ـ خشڵێکە وەک بازنە بەڵام پانتر کە پتر لە زێڕ یا زێو ساز دەکرێ و ژنان دە بـاسکیـان دەکـەن، قـۆڵ بـەند، قۆڵەوان.

**بازووکـــا** (نز.)[ئین: bazooka] چەکێکی شەڕە، سووکە و هەڵدەسووڕێ، بۆ ئامانجی گەورە کەلکی لێ وەردەگرن و لـە سـەر شـان دادەنـدرێ و دەهاویشـترێ. بۆ یەکەم جار ئامریکا لە شـەڕی دووهەمی جـەهـانی دەکـاری کردوە.

**بـازە 1** (ئـان. ل)[بـاز5 + ئـە] بـڕ: بازوو2

**بـازە 2** (نـا.)[؟] ١ـ پـارچـەیـەکـی ئەسـتـوور و گـەرمـە، لایەکی هەندێک تیسکنە و پتر دەیکەنە دەرپێ و لە کاتی سـەرما دەبـەری دەکـەن، بـەمـبـازی. ٢ـ [باک] جاو

**بازەبەران** (نا. ل)[باز2 + ئە + بەران] بڕ: بازدەبەران

**بازەرە** (گیانـ.)[بازە1 + رە (لە)][هەو] بڕ: جاڵجاڵۆکە

**بازەڵە** (ئان. ل)[بازە1 + لە] ١ـ هەر شـتـێک کـە هـەندێک بەڵەک بێ. ٢ـ (گـیـانـ.) بێـچـووی بەراز، کـوودەڵە، کـوودەرە، بزەڵە. ٣ـ منداڵێک کـە گـەورە بووبێ. ٤ـ منداڵی قۆشمە و فێڵەزان کە دەیـەوێ بە قـسـە گـەورەتر لـە خـۆی هەڵخـەڵەتێنێ و لە زیتـەی چاوەکـانی را دیارە فـریوت دەدا. ٥ـ کـەسـێک کـە شـەرمی شکاوە و بە راشکاوی هـات و چۆ دەکا یان قسان دەکا. ~ **خوێندن:** زۆرزان و فێڵەزان بوونی منداڵ.

**بـازەڵـێـن** (نـا. ل)[بـازەڵـە + ئـێـن] کایەیەکە لە نێو کچۆڵانی موکریان دا. کایەکە بەمجۆرەیە پێنج بەردی چووکی یان لە ســــەر لـەپـی دەست دادەنێن و هەڵیداوێن و دەیخەنە سەر پشتی دەست و حەول دەدەن هەمووی بگرنەوە ئەگەر هەموو بکەونە زەوی و چ نەکەوێتە سەر پشتی دەستی ئەو کچە دەخیچێ بەڵام ئەگـەر چەند دانەیەک بکەون ئەوا دەبێ هەر ئەو جۆرەی کە بەردەکانی لە سـەر پشـتی دەسـتـە بەردەکانی زەوی بە دوو قامکی شادە و گەورە هەڵیان گرێتەوە و دوایی بەردەکـانی پشت دەسـتـیـشی هەڵاوێ و لە سەر لەپ خڕیان کاتەوە، کە لەووە تەواوی هات ئەودەم بەردێک وەلا دەنێ و بە چواران درێژە بە کـایە دەدا هەتا هەموویان تەواو دەکا. کچێک کە ئەو کـایە بباتەوە لایەکەی دیکە سـزا دەدا، قەمچان، ڕێخان، پێنج بەردە، پێنج بەرک، پێنجۆک.

**بازەوان** (نا. ل، ئان. ل)[باز1 + ئە + وان] کەسێک کە لە بارەگای میـر یا دیوەخانی ئەرباب ئەرکی ئاگاداری و بار هێنانی باز و مەلی ڕاوکەری دیکەی بۆ ڕاو بە ئەسـتۆوە بوو و لە کاتی ڕاوێش دا، بازی لە نێچیر بەردەدا، قووشچی.

**بازی**[1] (نا.)[تات: ڤازی ـ فار: بازی. ناو: بازی، وازی ـ هەو: بازی] ١ـ گاڵتە. ∷ بازیت پێ وەردەن هەر یەک وە لایێ/ سەدای دایەنان وە لایەلایێ (مەولەوی ل ٤٢٩). ٢ـ [قـــوچ] وەردێنە. ٣ـ یاری، کایە، وازی.

**بازی**[2] (نا.)[بڕ: باسک] بە مـــانای بازوو و باسکە کە لە هەندێک وشـەی لێکدراو دا دەبینـدرێ. ∷ بازیوەن، بازیبەند.

**بازیبـــەن** (نا. ل)[بازی2 + بەن1][ئەر] بڕ: بازووبەند

**بازیبـەند** (نا. ل)[بازی2 + بەند] بڕ: بازووبەند

**بازیهەوایی** (نا. ل)[بازی1 + هەوا + ئی][ئەر] بڕ: بادەوە1

**بازیوەن** (نا. ل)[بازی2 + وەن1][ئەر] بڕ: بازووبەند

**باژاڵە** (نا.)[باک] بڕ: باژیلە

**باژک** (نا.)[بڕ: باجک][زا] بڕ: بیبار

**باژەڵە** (نا.) بڕ: باژیلە

**باژۆر** (نا. ل)[؟] دەگەڵ چاوگی کەوتن دێ و مـانای هەوا و کەڵکەڵە دەدا. **وە ~ کەوتن:** هەوا و کەڵکەڵەی کارێک لە



سەر دان، لە کەللە دان. ᠄᠄ کاکم وەباژۆر کەوتوە ببێتە دوکتور. ئەو کچە وەباژۆر کەوتوە بۆ مێرد کردن.

**باژەن** (نا. ل)[با 1 + ژەن][باک] بڕ: باوەشێن

**باژیلە** (نا. ل)[؟] ١ـ نەخۆشییەکە لە بەر موسڵدانی منداڵی نێرینە دەدا و میزی پێناکرێ. (کشت و کاڵ ب ١ ل ٢٨). ٢ـ نەخۆشییەکی پێستی منداڵانەیە. (وەهبی ل ٦). زیپکەیەکە کە لە لەش و پێی منداڵ دێتە دەر (مەردووخ ب ١ ل ١٠١) & باژەڵە، باژالە.

**باژێر** (نا.)[بڕ: بازاڕ] ١ـ بازاڕ ٢ـ شار

**باژێری** (ئان. ل)[باژێر + ئی] کەسێک کە لە شار بژی، شاری، شارستانی.

**باس**[1] (نا.)[عەر: بحث] ١ـ هەواڵ، خەبەر. ᠄᠄ خەبەر و باسی کاک کەریمت نیيە؟ ئەوە چ باسە ئەو منداڵانە بۆ دەگرین. ٢ـ لێدوان و لێکۆڵینەوە لە سەر مەسەلەیەک. ᠄᠄ ڕۆژنامەکان باسێکی دوور و درێژیان لە سەر کوردستان نوسیوە. ٣ـ ڕووداو و مەسەلەی شیاوی سەرنجی خەڵک. **~ داکەوتن:** بڵاو بوونەوەی قسە و باسی کەسێک بە بەربڵاوی وەها کە هەموو کەس پێیبزانێ. **~ کردن:** ١ـ وتووێژ کردن. ٢ـ گێڕانەوەی قسە بە درێژی. ٣ـ قسە کردن، مەسەلەیەک هێنانە گۆڕ. ᠄᠄ باسی پارە مەکە هیچت نادەمێ. هەر باسی ژن بکەی نارەحەت دەبێ. **~ هەبوون:** هەواڵ و خەبەرێک هەبوون. || **باسی سەر:** خەتەر، مەترسی. * **باسی سەر بوون:** جێی مەترسی بوون، گیان و سەر لە خەتەر دابوون. ᠄᠄ بە شەو منداڵی چووکە بەتەنێ ناردنە دەر باسی سەرە.

**باس**[2] (نا.)[بڕ: باسک] بڕ: باسکێش

**باستان** (نا.)[پەه: باستان] کۆن، قەدیم.

**باستانی** (ئان. ل)[باستان + ئی] هەرچی کە پێوەندی بە کۆنەوە هەبێ، قەدیمی، کۆنینە، کەونارا.

**باسترمە** (نا.)[تور: باسترمە] گۆشتی ئامادەی گا یا خووک کە ئێستاکە لە کارخانە ساز دەکرێ و دەنێو ریخۆڵەی دەکەن و بە رووتی و بە سوورکراوەیی دەیخۆن، باستورمە، باسورمە، کاڵباس.

**تێبینی:** باسترمە لە چاوگی باسترماخ بە مانای تێنان و تێخستن کەوتۆتەوە و دەبێتە تێ ئاخنراو.

**باستورمە** (نا.) بڕ: باسترمە.

**باستیک** (نا.) بڕ: باسلق

**باسریشک** (نا. ل)[با1 + سریشک] کرێوە یا بارانی دەگەڵ باوە.

**باسقەپان** (گیانـ.) بڕ: باشقەپان

**باسقەندە** (نا. ل)[باس2 + قەندە] بڕ: باسقەننە.

**باسقەننە** (نا. ل)[باس2 + قەننە] پارچە دارێکی باریکی بەلاڵووکە ناوەکەی دەردەدەن و پتر لە سەری سەبیلەی دەنێن، باسقەندە.

**باسک**[1] (نا.)[هیک: باهو - ئێک: بازو - ئەو: بازو - پەھ: بازاک، بازای، بازێ، بازەئی، ڤاز، باژاک - خوت: بایسو. باک: باسک، بازوو - ناو: باسک، باهۆ، باهوو، بازوو - باش: بازوو - هەو: بازوو، باسک، باهۆ - زا: باسک، بازوو، بۆژی] ١- (ئا.) بەشی سەرەوەی دەستی مرۆڤ لە شانەوە هەتا ئانیشک. ٢- بەشێک لە کێو کە وەک باسکی مرۆڤ لێژایی کەوتۆتێ و بەرەو نزمایی دادەکشێ، بستوو، ملە، باهوو، یاڵ، کلکە. ٣ - بەشێک لە ئاموور، (بڕ: باسکێش). ٤- دارجگەرەی درێژ، دەمنە، مۆدنە. ٥- [باک] باڵی ماڵ و پەلەوەر. ٦- (نز.) بەشێک لە سپا و لەشکر کە لە یەکێک لە لایەکان (راست یا چەپ) هەڵکەوتبێ. :: سەربازەکان لە نێوان دوو باسکی دوژمنەوە گەمارۆ درابوون.

**باسک**[2] (ئان. ل)[باس (باز5) + ک] ١- هەر شتێکی دوو رەنگ یا ئەبڵەق بێ، بەڵەک، بازگ، بازە، باز، بازوو. :: قەلەباسکە. ٢- دورە، دوورەگ. :: باسکەسەگ

**باسکلاو** (نا. ل)[باس2 + کلاو] گەڵای پان و گەورەی رێواس.

**باسکووڵ** (نا.)[فەر: bascule] جۆرێک قەپانی گەورەیە بۆ کێشانی باری زۆر قورس.

**باسکەسەگ** (نا. ل)[باسک2 + ئە + سەگ] سەگێکی دورەی نێو قەد تەنگە لە دایک تاژی و باوک سەگ بوە.

**باسکەملە** (نا. ل)[باسک1 + ئە + مل + ئە] داری گەورە و کۆلکە داری وشک بۆ سووتاندن، پیلەوار.

**باسکەمەلە** (نا. ل)[باسک1 + ئە + مەلە] جۆرێک مەلەیە کە دەستەکان بە تەواوی رادەوەشێندرێن و بە قەوەی باسک مەلەی دەکەن، مەلەباسکە.



**باسکەوجاڕ** (نا. ل)[باسک1 + ئە + هەوجاڕ] بڕ: باسکێش

**باسکیتبال** (نا. ل)[ئین: bas-ketball] جۆرێک یاری تۆپێنە کە دوو دەستەی پێنج کەسی لە مەیدانێکی تایبەتی دەیکەن و تۆپەکە لە شتێکی وەک سەوەتە تۆڕی کە لە بەرزایی هەڵاوەسراوە داوێن و هەر لایەک پتری تێ باوێ دەیباتەوە.

**باسکێش** (نا. ل)[باسک1 + هێش1] پارچەیەک لە دوو پارچەی هەرەگەورەی ئامووره. دارێکی درێژی راستە کە سەرێکی بە نیر بەستراوە (بۆسە نیر و ئاموور پێک دەلکێنێ) و سەرەکەی دیکە دەکەوێتە سەر دووهەم پارچەی ئاموور یانی دەندە (شەمشیرە باسکێش و دەندە پێک دەلکێنێ)، مژان، مژانە، باس، باسک، باسکەوجاڕ.

**باسلق** (نا.)[تور: باسدق] خواردەمەنییەکی شیرینە لە نیشاستە و شیرەی ترێ. نیشاستە و شیرە پێکەوە دەکوڵێنن هەتا پەیت دەبێ لە دوایی کاکڵە گوێزی دەنێو دەنێن و بەنی تێهەڵدەکێشن و لوولەی دەکەن و هەڵیدەگرن بۆ زستان، باسوخ، باسوز، باستیک، باسووق.

**باسوخ** (نا.) بڕ: باسلق

**باس وخواس** (نا. ل)[باس1 + و + خواس] دەنگوباس، هەواڵ، خەبەر. :: باس و خواسی کاک هەباس چیە لێر و لەوێ باسی دەکەن.

**باسورمە** (نا.) بڕ: باسترمە.

**باسوز** (نا.)[ئەر] بڕ: باسلق

**باسووق** (نا.) بڕ: باسلق

**باسیل** (نا.)[لات: bacillum] جۆرێک باکتری باریکی وەک میلەیە، بە چاو نابیندرێ و ئازار و نەخۆشی دێنێ وەک ئازارەسی.

**باش**[1] (ئان.)[باک: باش ـ ناو: باش ـ هەو: باش ـ زا: باش] ١ـ کردار و خوو و خدەی پەسەند لە مرۆڤ دا، چاک، خاس، قنج، خوو. :: کوڕی باش، ژنی باش. ٢ـ بە کەلک، رێک و پێک و دروست ساز کراوی هەر شتێکی دەسکردی مرۆڤ. :: دیواری باش، داشقەی باش. ٣ـ زانا، تێگەیشتوو. :: مامۆستای باش، مەلای باش. ٤ـ گیانداری قەڵەو و پەروەردە. :: مەڕی باش، گای باش. ٥ـ ساغ، سلامەت. // نەخۆش، نەباش. :: حەمە

دوو رۆژە حاڵی باش نیە. ٦ـ (مجـ.) زۆر، رادەی پێویست. ‌‌:: خەڵکێکی باش هاتبوونە تەماشا. **~ بوون:** ١ـ نەخۆش نەبوون، ساغ بوون. ٢ـ چاک بوون، بەرەو چاکی رۆیشتن. :: کورەکەمان ئێستا زۆر باش بوە و دەستی لە شەوگەری هەڵگرتوە. **~ بوونەوە:** ١ـ لە نەخۆشی هەستانەوە. ٢ـ چاک بوونەوە و وەک خۆ لێهاتنەوەی شتی خراپ و برینی لەش. باش کردن: ١ـ گۆرینی حاڵەت لە ئاساییەوە یان خراپییەوە بەرەو چاکی. :: داهاتنی کومباین داهاتی جوتێران زیاد و ژیانیان باش دەکا. ٢ـ کاری چاک و رێک و پێک کردن. :: باشت کرد نەهاتی! **~ کردنەوە:** ١ـ چاک کردنەوەی نەخۆش. ٢ـ چاک کردنەوەی شتی خراپ و لە کار کەوتوو.

**باش**[2] (نا.)[تور: باش (سەر)] لە پاش و پێش بە وشەوە دەلکێ و مانای سەر، سەرۆک، گەورە و مەزن دەدا. :: سوورباش. باشچاوەش، باش وەستا.

**تێبینی:** ئەم وشەیە لە سەردەمی دەستەڵاتی عوسمانیەکان چۆتە نێو زمانەکانی دەورەبەرەوە.

**باشار** (نا.)[تور: başarı] دەرەقەت، دەرۆست. **~ بوون:** بەربەرەکانی کردن، لە ئاست کەسێک راوەستان، پێوێران. **~ کردن:** توانایی ئەنجام دانی کارێک هەبوون، پێوێران، دەرەقەت هاتن. :: ژن ئەگەر لە لانی خراپەی دا کەس باشاری ناکا.

**باشبازرگان** (نا. ل، ئان. ل)[باش2 + بازرگان] بڕ: بازرگانباشی

**باشچاوەش** (نا. ل، ئان. ل)[باش2 + چاوەش] سەرۆک و هەمەکارەی دەستەی چاوەشان، گەورەی چاوەشان.

**باشق** (نا.)[باک] بڕ: باشوو

**تێبینی:** باشق عەرەبیکراوی باشۆک ـ ی کوردییە کە لە عەرەبییەوە چۆتەوە نێو زاراوەی باکووریی.

**باشقەپان** (گیانـ.)[؟] جۆرە مارێکی ئەستووری درێژی زەردە سەر کلکی خرە (خاڵ ب ١ ل ١٠١)، بازقەپان، باسقەپان.

**باشنا** (نا.)[زا] بڕ: باڵنج

**باشگا** (نا. ل)[باش2 + گا] شوێنێک کە کۆمەڵێک بۆ وەرزش و یاری و کایە لێی کۆ دەبنەوە.

**باشوەستا** (نا. ل، ئان. ل)[باش2 +



وەستا] گەورەی کرێکار و بەردەستان، سەروەستا. ٪ ئەو چەنەی رەنگ شاخی زێرین بۆ تۆم پەروەردە کرد، دڵم نایێ، دە مست وەستای ناشی نێم، وەستایێکی باشوەستا ببێ، سەبرسەبر نەرم نەرم زەحمەتی نەدا لە مەسقەڵ کێشانێ (مان ل ٨٥).

**باشۆ** (گیانـ.)[باک] بڕ: باشوو

**باشۆک** (گیانـ.)[باشۆ + ک][باک] بڕ: باشوو

**باشۆکە** (گیانـ.)[باشۆ + کە] بڕ: باشوو

**باشوو** (گیانـ.)[باک: باشۆک، باشۆکە، باشۆ، باشق ـ ناو: باشە، باشوو، باشووکە، باشۆکە، واشە ـ باش: واشە، باشە ـ هەو: واشە] باڵندەیەکی گۆشتخۆری راوکەری چووکە لە رەگەزی باز و بچووکتر لەو، رەنگی چاوی زەردە، سەر پشتی بۆر و بەر زگی سپییە و لە ئاسمان لە مەلی دیکە دەدا و راویان دەکا، Falko nisus ناوی لاتینی ئەم مەلەیە.

**تێبینی:** باشوو و هاوتاکانی لە بنەڕەت دا دەگەڵ باز یەکن و یەک ریشەیان هەیە و لە دوایی بۆتە ناوی دوو باڵندەی جیا. باشە هەر وەک باز لە ریشەی ڤەزە vaz ی ئەوێستایی بە مانای مەل کەوتۆتەوە. (بڕ: باز 1)

**باشوور** (نا.) یەکێک لە چوار لای جوغرافیایی کە بەرابەری باکوورە، لای قبلە.

**تێبینی:** نازانم ئەو وشەیە کەی و چلۆن ساز بوە، بەڵام پێموایە ئەم وشەیە (بۆ ژوور) یان (بەرەوژوور) بوە و لە بەرابەر باکوور دا شێوەی باشوور ـ ی بەخۆوە گرتوە.

**باشووریی** (ئان. ل)[باشوور + ئیی] ١ـ هەرچی کە پێوەندی بە باشوورەوە هەبێ. ٢ـ هەرچی لە لای باشوور هەڵکەوتبێ. ٣ـ یەکێک لە زاراوەکانی زمانی کوردیی کە لە باشووری کوردستان هەڵکەوتوون و بریتین لە بن زاراوەکانی لەکی، فەیلی و ...

**باشووکە** (گیانـ.)[باشوو + کە] بڕ: باشوو

**باشە** (گیانـ.) بڕ: باشوو

**باشەڵ** (نا.) بڕ: باشێڵ

**باشێڵ** (نا.)[؟] چارۆکەیەکە کە ژنان بە کۆڵی دادەن و دوو سەرەکەی لە

پشـــتـــيـــان دەبەسـتن بۆ ئەوەی شـــتـی تێبکەن، باشەڵ، کۆڵوانە.

**باشی** (پاشـ.)[تور: باشی] بە دوای ناوەوە دەلکێ و مـــــانای ســـــەرۆک، ســـــەردەســـــتـــــە، گـــــەورە دەدا. ⁙ بازرگانباشی، وەستاباشی.

**باع** (نا. د) دەنگی بزن و مەڕ.

**باعاندن** (چا. م)[لە باع] بڕ: باڕاندن.

**باعە** (نا. د) بڕ: باڕە

**باعــەباع** (نا. د)[بـاعــە + باع] بڕ: باڕەباڕ

**باعـــــيس** (نـا.)[عـــەر: باعث] هـۆ، سـەبەب، هانە، باعـيـسکار. ~ **بوون:** بوونە هۆی مەسـەلە و کارێک، باعیسکار بوون. ~ **ی کەسێک بوون:** بوونە هۆی پێشهات و کارەساتی خراپ و نالەبار بۆ کەسـێک. ⁙ کێ باعـیـسی ئێمـە بوو یا خـودا بەردی لێـبـارێ (کـانی مـرادان ل ١٥٣).

**باعیسکار** (ئان. فا)[باعیس + کار] کـەسـێک کـە دەبێـتـە هـۆ و باعـیـسی مەسەلە و کارێک. ~ **بوون:** بڕ: باعیس بوون. ⁙ هەرچەند خـراپە پیـاو ببێ بە باعــیس و باعــیــسکاری دڵان (لاس و خەزاڵ ل ٥١).

**باغ[1]** (نا.)[سـوغ: باغ ـ پەهـ: باغ. بیر: باق ـ فـار: باغ. باک: باغ ـ نـاو: باغ، باخ ـ باش: بـاخ ـ هـەو: بـاخ، بـاغ ـ زا: بـاخ] ١ـ پارچە زەوییـــەکی دیاری کـراوە کـە دارەبەری تێــدا دەچەقــێنن، مــڵک. ٢ـ پارچە زەوییـــەکی تایبـــەتی بۆ رەز. ٣ـ (مـجـ.) سـینگ و بەرۆکی یار و گـراوی. ⁙ لە کـۆسـرەتی شاڵەبەگییـان هەڵاڵ و بەیبوون و گیاخاو تێکچڕژاوە / لە باغی مەرزینگان هەنار و هەنجیر گوڵیان داوە (شۆڕمەحموود ل ٦٩). ~ **بڕین:** ١ـ بە تاڵان بردن و دزینی بەر و میوەی باغ. ٢ـ بڕینەوەی دارەکانی باغ لە لایەن کەس یا کـەسـانێکەوە کـە دوژمنایـەتیـان دەگـەڵ خــاوەن باغ هـەیە بۆ وەشـــاندنی زەبر و زەخـــتـی خـــۆیان. ٣ـ هـەڵپـــەرتاوتن و هەرەس کـردنی مێـو و رەز لە سـەرەتای بەهار بۆ بەردانی پتـــر، باغ بڕینـەوە. ~ **بڕینـەوە:** بـڕ: باغ بـڕیـن/٣. ~ **نانەوە:** چەقــاندنی شـــەتڵ و نەمـــام بۆ گەورە بوون و پێگەیشتن و بوونە باغ. ⁙ باغ نانـەوە هاســـانە / بەرهـەم هێنانی گـرانە (پەند). || **باغی بە بەر:** ١ـ باغـێک کە دارەکانی بەریان دابێ و گەیشتبێتە بـەر. ٢ـ (کـنـ.) کـــــــەسی بە ئـاوات

گەیشتوو. **باغی بەهەشت:** ئەو باغەی کە لە بەهەشت ساز کراوە، باغی جەننەت، باغی قودس. :: ناوی زەنەخدانت لە ناو باغی بەهەشتا بێتە نێو/ سەر وەردەگێڕێ باخەوان هەر جێبەجێ بۆ تف لە سێو (مەحوی ل ٣٦٣). **باغی ترێ:** زەوییەک کە تایبەت دراوە بە دارەمێو و ترێ، باغی مێو، باغەمێو، رەز. **باغی جەننەت:** بڕ: باغی بەهەشت. :: دەمێکی هەستە پێ قوربان جەماڵت عالەم ئارا کە / بزانن نەخلی تووبا، باغی جەننەت، خار و خاشاکە (وەفایی ل ١٢٨). **باغی ساوا:** ١ـ باغێک کە تازە نابیانەتەوە. ٢ـ (کنـ.) بەر و سینگ و مەمکی تازە پێگەیشتووی کچ. **باغی سێوان:** ١ـ باغێک کە هەموو دارەکانی دارە سێو بێ. ٢ـ (کنـ.) سینگ و بەرۆکی یار. :: لە دوگمەی سوخمە دوێنێ نوێژی شێوان/ بەیانی دا سفیدەی باغی سێوان (نالی ل ٣٢٠). **باغی شەدداد:** بڕ: باغی ئیرەم. :: جا دەبێ سینگتم بۆ پکەی بە باغی شەدداد و بۆم هەڵبێبی دوو گۆشەی چاوە/ هێندێک بڵێن: حۆری عاسمانە و هێندێکیش بڵێن: خێر، کۆترە و سەری لێشێواوە (شۆڕمەحموود ل ٤٥). **باغی قودس:** بڕ: باغی بەهەشت. :: کێ لە باغی قودسی هەڵکەندم، هەر ئەو/ ناشتی لەم شۆرەزارەم ناشتیم (مەحوی ل ٣٤٥). **باغی گوڵان:** ١ـ زەوی و باغێک کە بۆ گوڵ تەرخان کرابێ، گوڵستان. **باغی مێو:** بڕ: باغی ترێ. **باغی وەحش:** شوێنێک کە کۆمەڵە گیاندارێکی بۆ تەماشای خەڵک تێدا رادەگرن. **باغی ئیرەم:** باغی شەدداد، باغێکە کە شەدداد بە لاسایی لە بەهەشت سازی کرد و ئەمری کرد بە زێڕ و بەردی بە بایخ بیرازێننەوە. ئەو رۆژەی کە شارەکە تەواو بوو و وەنێوی کەوت گیانی دەرچوو و شارەکەش وەبن لم کەوت، شەدداد هاوچەرخی هوود بوە. :: عاشقی قامەتی تۆم کوشتەیی خەندەی دەمی تۆ / بەر و باغی ئیرەمی یا گوڵی نەخلی شەجەری (وەفایی ل ١٩١).

**باغ**[2] (نا.)[ئەو: بەغە][قوچ] باقەبێن.

**تێبینی:** لە زاراوەی ناوەندیی دا باغە یا باقە بە مانای بەستەیەک گیایە بەڵام لە بن زاراوەی قووچانی باغ بە مانای باقەبێن هاتوە و هەردووک لە چاوگی ئەوێستایی بەگ bag کەوتوون هەرچەند ماناکان هەندێک گۆڕاون (بڕ: باقە1)

**باغـچـه** (نا. ل)[باغ1 + چه1] پارچه زەوییەکی چووکتر لە هی باغ لە حەوشی ماڵ یا لە شوێنێکی دیکە بۆ ڕەعەمەل هێنانی گوڵ و هەروەها بۆ داچاندنی سەوزی خواردنی بەشە ماڵێک، باخچە.

**باغچەوان** (نا. ل، ئان. ل) [باغچە + وان] کەسێک کە بژار و ئاودان و و پێڕاگەیشتن و ئاگاداری لە باغچەی بە دەستەوەیە.

**باغچەوانی** (حم.)[باغچەوان + ئیی] کار و پیشەی کەسی باغچەوان.

**باغـــر** (ئان.)[؟] بەفیـز، غەڕڕە، لەخۆگۆڕاو، لەخۆبایی، بوغرا. **~ بوون:** لەخۆ بایی بوون، خۆ لێگۆڕان، بەفیز بوون، بوغرا بوون.

**باغە**[1] (نا.)[ئەو: بەغە] بڕ: باقە1

**باغـە**[2] (نا.)[؟] نەخۆشییە تووشی سمی ولاغی یەکسم دێت و کاسەی سمی درێژ دەکا و کەلکی سواری پێوە نامێنێ (قامووس ب ١ ل ٤١).

**باغـە**[3] (نا.)[عەر: باغة] مادەیەکی پلاستیکی بێرەنگە کە لە ئاوێتە کردنی نیترۆ سێلولۆز و کافوور دە نێو ئەلکۆڵ و ئێتێر دا دروست دەبێ و زوو گڕ دەگرێ. لە هەویرەکەی ئەم مادەیە بۆ ساز کردنی گەلێک شت کەلک وەردەگرن وەک دوگمە، شانە، دەسکی چەقۆ، مسواک، بازنە، تەسبێح. (فەر: celluloid)

**باغەر** (نا.)[سۆر] بڕ: باغەڵ

**باغـەڵ** (نا.)[پەش: بەغەل ـ فار: بەغەل. باک: باخەل ـ ناو: باغەڵ، باخەڵ، بەخەڵ، باغەر ـ باش: بەخەڵ ـ هەو: باخەڵ، بەخەڵە] ١ـ بەتاڵایی نێوان جلی سەرەوە و کراس کە دەکەوێتە بن هەنگڵ و لە جیات گیرفان شتی تێدەنێن لە بنەوە پشتێند بەری کەوتنی دەگرێ. ٢ـ گیرفانی کەوا و کۆت لە نێوەوە. ٣ـ باوەش، باڵ. **دە ~ دا بوون:** ١ـ دەباڵ دابوون، ژنی کەسێک بوون. ⁑ کچی کاک کەریم دە باغەڵ کوڕی مامم دایە. ٢ـ دە گیرفان دا بوونی شتێک. ⁑ پارەکانم دە باغەڵ دایە. **دە ~ نان:** ١ـ شتێک دە گیرفانی ژوورەوەی کەوا و کۆت نان. ٢ـ وە بن هەنگڵ دان. ٣ـ (کنـ.) زۆر زیرەک بوون، دە گیرفان نان. ⁑ بەو منداڵییەی هێند زیرەکە سەدی وەکوو من و تۆ دە باغەڵی دەنێ!

**باغەمێو** (نا. ل)[باغ1 + ئە + مێو] زەوییەک کە تەرخان کراوە بۆ ترێ، باغی مێو، باغی ترێ، ڕەز.



**باغەوان** (نا. ل، ئان. ل)[باغ1 + ئە + وان] کەسێک کە ئاگاداری لە دارەبەرەکان دەکا، چاوەدێری باغ، باخەوان.

**باغەوانیی** (حم.)[باغەوان + ئیی] کار و پیشەی کەسی باغەوان، باخەوانیی.

**بافتە** (نا. مفـ.)[لە: بافین] ١ـ چنراو، تەنراو. ٢ـ رایەخ. :: ئەوە سەر دەبێتەوە بافتەی ئەوان شەنگە جحێلان، شۆرەجحێلان / ئەگەر بەرماڵێکی عیبادەتی بە سەر شانی خۆیان دادەن (پایزە ل ٦٦). ٣ـ تیزماڵکێکی هۆندراوە لە ئاوریشم یا دەزوو، پانایی سانتیمیترێک دەبێ و لە پەراوێزی هەندێک جل و بەرگی وەک عەبا و کەوا و سوخمە، دەیدروونەوە هەتا پارچەکەی هەڵنەوەشێتەوە یا ریشاڵی لێنەبێتەوە.

**بافرە** (نا.)[؟] کەتیرەی سپی (خاڵ ب ١ ل ١٠٢).

**بافڕە** (نا. ل)[با1 + فڕ + ئە][ئەر] بڕ: فڕفڕە

**بافک** (نا.)[باک] بڕ: بیانوو

**بافڵ** (نا.)[؟] ئاوهەڵدێر، تاڤگە

**بافن** (نا.)[زا] بڕ: فافۆن

**بافۆن** (نا.)[باک] بڕ: فافۆن

**بافیش** (نا. ل)[با1 + فیش] تڕ و تۆپ، فیز. **~ کردن:** خۆ هەڵکێشانی بە درۆ، خۆڕانانی بێجێ، تڕ و تۆپ لێدان.

**بافین** (چا. م)[ئەو: ئوبدەئێنە. فار: بافتن ـ تات: ڤێتەن][ئەر] چنین، هۆنینەوە.

**باڤ** (نا.)[باک] بڕ: باب

**باڤبرا** (نا. ل)[باڤ + برا][باک] برای باوک، مام.

**تێبینی:** هەژار بە هەڵە لە جیات براباڤ مانای کردۆتەوە. (هەنبانە بۆرینە، ب ١ ل ٤٤).

**باڤماری** (نا. ل)[باڤ + مار3 + ئی][باک] زڕباب

**باڤەندە** (نا. ل)[باڤ + ئەندە][قوچ] زڕباب

**تێبینی:** ئەندە سواوی ئەندەر ـ ە بە مانای هندوور، ئەندەروون کە لێرە بە شێوەی پاشگر دێ و مانای زڕ دەدا.

**باق** (نا.)[باک] بڕ: باقە1

**باقاندن** (چا. م)[لە: باقە2] ١ـ خۆ

دەرخستنی هەندێک گیانداری وەک ڕێوی و کەمتیار، واقاندن. ٢ـ خۆ دەرخستنی گیسک و کاریلە، باڕاندن.

**باقر** (ئان.)[تور: bakır (مس)] ئەو دەفر و قاپ و قاچاغانەی مسی کە قەلاییەکەیان لێبۆتەوە و ڕەنگی مسەکەیان دەرکەوتوە. **~ بوون:** ١ـ لێبوونەوەی قەلایی قاپ و قاچاغی مسی و دەرکەوتنی ڕەنگی مس. ٢ـ چێشتی ڕەنگ گۆڕاو و تام ناخۆش کە لە دەفری باقربوو دا ساز کرابێ. ٣ـ (کنـ.) عەیب دەرکەوتن و ڕووڕەش بوون. **~ دەرهاتن:** (کنـ.) عەیب دەرکەوتن. ⁂ ئەو کارە هەروا نامێنێتەوە ئاخری باقری دەردێ و ئابڕووی دەچێ.

**باقلا** (گیا.)[باک] بڕ: باقلە

**باقـــــلاو** (نا. ل)[باقلە + ئاو1] چێشتێکە لە باقلە، ئاو و ڕۆن و هەندێک ئاڵەت.

**باقلاوە** (نا.)[؟] جۆرێک شیرنی ساز کراو لە شەکر، هێل، بادام، ئارد، شیر و ڕۆن کە زۆر شیرینە، پاقلاوە.

**باقلە** (گیا.)[عەر: باقلا لە: یون: ba-kelos] ١ـ گیایەکی کەوییە و دەچێندرێ، گوڵی سپییە و خاڵی ڕەشی لەسەرە، بەرەکەی چوار هەتا حەوت دەنکە لە هەر کەلوو دا، Faba vulgaris ناوی لاتینی ئەم گیایەیە. ٢ـ بەری ئەم گیایە کە ئێستاکە بە فەریکی دەیکوڵێن و دە پلاوی دەکەن و دەیخۆن، بە گەیشتوویش دەباڵ خۆرشت و ئاشی دەکەن. & پاقلە، باقلا، باجیج. || **باقلەی میسریی:** بڕ: ترمس

**باقۆ**[1] (گیانـ.) ماسییەکی گەورەی بێ پووڵەکەیە، لە بن و مەنداوی ئاوی چۆمی قووڵ دەژی، سەری گەورەتر لە لەشییەتی، ددانی ورد و سمێڵێکی یەک داوی ئەستووری هەیە، ئێسکی وردەی نیە و ماسی چووکی نێو ئاو دەخوا، درێژایی هەتا چوار میتر و قوورسایی هەتا ٢٠٠ کیلۆ دەگا. شیعە پێیان حەرامە و نایخۆن بەڵام لە کوردەوای بە تایبەت بۆی دەچنە ڕاو، گۆشتەکەی لە ترش و خوێ دەنێن و بە سوورکراوی دەیخۆن، Silurus glanis ناوی لاتینی ئەم ماسییەیە، نەققە، سمێڵە.

**تێبینی:** من پێموایە ڕیشەی ئەم وشەیە دەچێتەوە سەر وشەی بهێکە bheka ـی سانسکریت و ڤەک vak ـی پەهلەویی بە مانای بۆق [بڕ: بۆق]



**باقۆ**[2] (گیا.)[؟] ١ـ هەنجیری کاڵی وەریو، هەنجیرێک کە هێشتا نەگەیوە. ٢ـ قەزوانی فەریک.

**باقـە**[1] (نا.)[ئەو: بەغـە، باگـە. باک: باق ـ ناو: باقە، باغە ـ باش: باقە ـ هەو: باقە] ١ـ چەند مـەڵۆی پێک بەسـتراوی گەنم و جۆ. ٢ـ باوەشێک گژ و گیای بە باقـەبێن بەسـتـراو. ٣ـ چەپکێکی بەستراوی گەورەی سەوزی خواردن.

**تێبینی:** باقە، باغە، باج، بەش و بەخت و دەیان وشەی دیکەی کوردیی هەموویان لە ریشـەی ئەوێسـتـایی بەگ bag بە مـانای بەخـشین و بەشـینەوە و دابەش کردن کەوتوون کە هەرکامیان لە شوێنی خۆیان باسی لێدەکرێ.

**باقـــە**[2] (نا. د) ١ـ دەنگی رێوی و کـەمـتـیـار، واقـە. ٢ـ دەنگی گـیـسک و کـاریلە، قـالە، بارە. ٣ـ (مـجـ.) دەنگی گریانی منداڵی ساوا

**باقـەباق** (نا. د)[باقـە + باق] ١ـ دەنگی پەیتـاپەیتـا و یەک لەدوای یەکی رێوی و کـەمـتـیـار، واقـەواق. ٢ـ دەنگی پەتاپەیتای گیسک و کاریلە، قالەقال، بارەبار. ٣ـ دەنگی پەیتاپەیتای گریانی منداڵ.

**باقـەبەس** (نا. ل)[باقـە1 + بەس2 [ئەر] بڕ: باقەبێن

**باقەبەست** (نا. ل)[باقە1 + بەست1] بڕ: باقەبێن

**باقـەبێن** (نا. ل)[باقـە1 + بێن1] گیایەکی باریک و درێژ کە لە باقە گیای دەهاڵێن و دەیبەسـتن، باقـەبەس، باقەبەست.

**باقی** (ئان.)[عـەر: باقی] ١ـ هەرمـاو، نەمر، راوەسـتاو. ٢ـ درێژە و پاشـماوەی کار. ‡‡ ئەوەندەم مـاڵیـوە باقی تۆ بیکە. ٣ـ پاشـماوە لە ریازی و حیسـاب دا. ‡‡ دە تمـەنم دەیـە سـێ تمـەنـت بـاقـی دەدەمەوە.

**باقـیـە** (نا.)[؟] درووممـانی بە دەست، تەقەڵ. **جووت باقـیـە:** دوو ریز دروون بە دەست بۆ قـایمتـر بوون، جـووت تەقـەڵ. دایکم کراسێکی جووت باقیـەی بۆ دروو بووم.

**تێبینی:** هـاوریشـە و هـاومـانای ئەم وشـەیە لە زمـانی فـارسی دا بخـیـە (بەخیە) یە.

**باک**[1] (نا.)[پەش: باک ـ فـار: باک ـ لۆر: باک. ناو: بـاک ـ هەو: باک] ترس، خـۆف، ئەندێش. ~ **هەبوون:** ترسـان،

خـۆف کـردن، ترس هـەبوون. ⁂ دوو برا ڕۆژی هەرا دەس بخـەنە دەسـتی یەک / کـێـهـەیان باکی لە هێـزی نەتەویی نارەسەنە (هێدی ل ٣١٠). نازانێ ئەمن لە خولا زیاتر باکم لە کەس نیە (امثال و حکم ل ٥٣٥).

**باک**[2] (نا.)[زا] باب، باوک

**باک**[3] (نا.)[فـەر:bac] خـەزنێکە لە پاش یا لە پەنای ماشێن و ترۆمبێل بۆ تێکردنی بنزین کـە لەوێوە بە لوولـەیەکی مسی دا دەچێتە کاربراتۆر.

**باکـتـری** (نا.)[یون: bakterion] گیاندارێکی یەک خانەیی زۆر وردە کە بە چاو نابیندرێ و بە شکڵی خڕ و بەیزی و لوول دەدیتـرێ. لە ناوک و سـیتـۆپلاسم پێک هـاتوە و هەندێکیـان بۆ گـیانداران زەرەریان هەیە و نەخۆشی وەک مێکوتە، ئازارەسی، ... ساز دەکەن.

**باکـوت** (نا. ل)[با1 + کوت1] بەفـر دەگەڵ بای توند وەها کە بەفرەکە لە دار و دیوار بکوتێ، کڕێوە.

**باکـوور** (نا.)[ئەو: ئـەپاخـتـەرە، ئەپاختەرە ـ پەه: ئەپاختەر. باک: باکور ـ ناو: باکوور ـ زا: ڤاکور] یەکێک لە چوار لای جوغرافیایی کە ئەگەر وا ڕاوەستین دەستی ڕاستمان لە لای ڕۆژهەڵات بێ و دەسـتی چەپمـان لـە لای ڕۆژ ئاوا بێ باکـوور دەکـەوێتـە ڕووبەڕوومـان.// باشوور.

**باکووریی** (ئان. ل)[باکوور + ئیی] ١ـ هەر شوێنێک کە لە باری جوغرافیایی لە لای باکـوور هەڵکەوتبێ. ٢ـ گـەورەترین زاراوەی زمانی کوردیی، کرمانجی.

**تێـبـینی:** زمـانی کـوردیی بە پێی هەڵکەوتنی دانیشتوانی ئەو ناوچانە لە باری جـوغـرافـیـایی دابەش کـراون و چونکە ئەو زاراوەیە کـەوتۆتە باکـووری کوردستان بەم ناوە کراوە.

**باکـەش** (نا. ل)[با1 + کـەش] بڕ: باکێش

**باکـێش** (نا. ل)[با1 + کـێش] ١ـ دەفری وەک کـووپە و ئیستکان کـە بای لەشی پێدەردێنن. کـەسێکی شـارەزا لە پێشدا بە شـەمچـە یا ئاگرێکی چووکە هەوای نێـو دەفـرەکـە تەواو دەکـا و بە پشت یا بـەو شـوێنەیەوە دەنێ کـە بای هەیە، دەفـرەکـە پێست و گـۆشـتی ئەو شـوێنە هەڵدەمژێ و هەواکەی دەکێشێ. ٢ـ کون و کـولانەیەک کـە بای پێدا دێتە ژوور و ماڵ فێنک دەکاتەوە. & باکەش.

**باگ** (نا.)[باش] بڕ: با1

**باگـا** (نا. ل)[با1 + گـا3][ئەر] بڕ: باگر

**باگر** (نا. ل)[با1 + گر] شـوێنێک کە بـای تێـبکا، شــوێنێک کـە بـا لە هـەر لایەکەوە بێ بیگرێتەوە، باگیر، باگا.

**باگــردان** (نا. ل)[با10 + گــردان] [مــوک] ئـامــرازی بان کــوتـانەوە. ئـەم ئامـرازە پتر لە شـتی قـورسی وەک بەرد ســازی دەکـەن. بەردێکی یەکـدەسـت بە شـکڵـی ئـوســـتـــوانـە دادەتاشـن و دوو ســەرەکــەی کـونـاودیو دەکـرێ یا داری تێدەخەن و قـوڵفەی ئاسنی لێدەدەن و بە تەنافێک بە سـەر بانی دا دەیگێـڕن هـەتا بیکوتێـتــەوە و درز و کـونی بـان بگرێ و دڵۆپەی نـەکـــا، باگـــردێن، بـانگردێن، بـانگلێن، بـانگلێـر، بانتلێن، بـانتلێــر، بانگوێر، باگوردان، باگوردێن، باگەردان، بانکوت، باندێر، گندۆر، تەبانە.

**تێـبینی:** با سـواوی وشــەی بان ـ ە و گـردان و هـاوتاکـانی بە گـشـتی لە دوو بەشـی [گەرد + ئان] پێک هاتوە. گەرد لە چاوگی ئـەوێسـتـایی ڤـەرێت و پەهـلەویی گەرتییتـەن بە مـانـای گەڕان و سووڕانەوە کەوتوە و ئان پاشگری فاعلییە.

**باگردێن** (نا. ل)[با10 + گردێن] بڕ: باگردان

**باگــژە** (نا. ل)[با1 + گـژ + ئە][ئەر] بڕ: گژەبا

**باگــوردان** (نا. ل)[با10 + گــوردان] [باک] بڕ: باگردان

**باگــوردێن** (نا. ل)[با10 + گــوردێن] بڕ: باگردان

**باگـــونە** (نا. ل)[با1 + گــون + ئە] هەڵمـسـانی گـونی مـرۆڤ یا حـەیوان لە سەردەمی پێگەیشتن و باڵغ بوونی دا.

**باگــەردان** (نا. ل)[با10 + گـەردان] [باش] بڕ: باگردان

**باگەڕ** (نا. ل)[با1 + گەڕ] بڕ: باگێژە

**باگــیــر** (نا. ل)[با1 + گـیــر] ١ـ بڕ: بـاگـــر. ٢ـ [ئەر] ئـامـــراز و دەفـــرێکی کانـزای کون کونە کە لە سەرەوەی قەننە یا پۆلوو ئاوری دادەنێن هـەتا با ژیلەمۆ و خۆڵەمێشەکەی بڵاو نەکاتەوە.

**باگــێــژە** (نا. ل)[با1 + گـێـژ + ئە] بـایەکی توندە کـــە بە دەوری خـــۆی دا دەخـولێـتــەوە و لە قــەدەر توانا هـەرچی وەگیر کەوێ وە حـەوای دەدا، گێژەڵووکە، گــردەلوول، گــەردولـوول، گــەردەلوول،



گەردەبا، گێجەبا، باهۆز، باگەڕ.

**باڵ** (نا.)[باک] بڕ: باڵ

**بالا** (نا.)[باک] بڕ: باڵا

**بالابان** (نا.)[باک] بڕ: باڵەوان2

**بالافر** (نا. ل)[بالا + فر(فرین)][باک] فڕۆکە، تەیارە. **تێبینی:** ئەم وشەیە لە جەنگەی شەڕی دووهەم دا، کە رادیۆی بێرۆت دەنگ و باسی بە زمانی کوردیی بڵاو دەکردەوە، داتاشراوە. (قامووس ب ٢ ل ٤٨).

**بالبالۆک** (گیانـ.)[بال + بال + ئۆک][باک] بڕ: تاژیلۆکە

**بالتە** (نا.)[؟][باک] بڕ: تەور

**بالجانە** (گیا.)[زا] بڕ: باینجان

**بالدرجانە** (گیا.)[زا] بڕ: باینجان

**بالشنا** (نا.)[زا] بڕ: باڵنج

**بالگۆگ** (نا.)[باک] بڕ: باڵنج

**بالگیف** (نا.)[باک] بڕ: باڵنج

**بالگە** (نا.)[باک] بڕ: باڵنج

**بالگەهـ** (نا.)[باک] بڕ: باڵنج

**باللۆرە** (نا. ل) بڕ: بالۆرە

**بالماسکە** (نا. ل)[فەر: bal masque] کۆڕێکی خۆشی و سەما، کە بەشدارەکانی پێویستە بە دەمامک و کەرەسەی دیکە بیچم و سەر و سەکوتیان وەها بگۆڕن کە کەس یەکتر نەناسێتەوە.

**بالنگ** (نا.)[باک] بڕ: باڵنج

**بالوەر** (نا.)[زا] بڕ: باڵەوان 2

**بالۆرە** (نا. ل)[با + لۆرە][باک: بالۆرە ـ ناو: بالۆرە، باللۆرە، بەللۆرە] جۆرێک گۆرانی کوردییە. **~ لێدان:** پەنجە لە گەروو کوتان و بالۆرە کوتن. **لە ~ دان:** دەست بە بالۆرە کردن، بالۆرە کوتن.

**تێبینی:** ژنانی کورد کاتێک لە چیا و شاخ و داخان بە دەم ئیش، رۆیشتن یا دانیشتن و ماندوو حەسانەوە دا، گۆرانی دەڵێن گەردنی خۆیان دەکەنە ئامرازی مۆسیقا و پەنجەکانی دەستیان گرد دەکەنەوە و بە هەوای گۆرانیەکەی دەیلێن لە دەمارەکانی ملیان دەدەن و لە گەرووشیان هەر عەینی هەوا دەنگی (ئەوەوەوە، ...، ...) دەردەخەن و لە نێوان پەنجە لە گەردەن دا و (ئەوەوەوە) دا وشەکانی گۆرانیەکەیان درێژ دەبێتەوە و پیاو کەمتر تێیدەگا. جار و بارەش کە

دوو دەستـە کچ یا ژن لەو شـانەوشـانی شـاخێ یا ئەو بەرەوبەری دۆڵ و دەرەیەک تێک هەڵدەنگوون، دەستـەیەکیـان دەست دەکا بە بالۆرە لێدان و ئەوی دیکەشیـان بۆی دەگێرێتـەوە و لە ناویانا دەبێتـە بین برکێ و هەر دەسـتـەیەک تێـدەکـۆشـێ بـالۆرەکـەی درێژتر و خـۆشـتـر بێ. (قـامـووس ب ٢ ل ٤٥). بالۆرە هـەر شـەرت نیـە کـە ژنان بیـڵێن و گـۆرانیش بێ. زۆر جـار کـاتێک دەسـتـە کـچـێک تووشی کـورێک یا چەند کـوڕ دەبن هەر دووک لا لە بالۆرەی دەدەن و جنێوی زۆر پیس بە یەکتر دەدەن.

**بالۆکـاویی** (ئان. مـف.)[بالۆکـە + ئاویی2] حـاڵی کەسـێک کـە دەم و چاو، دەست یا شوێنێکی دیکەی لەشی بالۆکە زۆر لە سەر بێ.

**بالۆکـە** (نا.)[باک: بالووگ، بالوور، بالووکە، بەهلوولک، بالیکە ـ ناو: بالۆکە، بالووکـە، بالووک ـ باش: باڵووکـە ـ هەو: بالووکـە] نەخۆشـییـەکی پێسـتـە کـە بە هۆی ویرووسـێکی تایبـەتی پـەیدا دەبێ، گـۆشـتـێکی زێدەی رەقـە کـە لـە هەر شـوێنێکی لەش دەتوانـی سـەر هەڵبـدا بەڵام پتر لە دەست و پەلی ئینسـان پەیدا دەبێ و ئێشـی نیـە و دوای چەند سـاڵان هەڵدەوەرێ. (زوو پێیان وا بـوو کە بالۆکە بە هۆی وە دەست کـەوتنی مـیـزی بۆق و پشیلە پەیدا دەبێ و بۆ چارەسـەر کردنی چەند شێوەیان بەکار دەبرد: چەند دەنکە جـۆیان دەگـەڵ هـەندێک خـوێ لـە کـوتە پەڕۆیەک دەپێـچـاوە و دوعـایان لە سـەر دەخـوێند و لە چاڵێکیـان دەنا و پێیـان وا بـوو هەرکـات جـۆیەکـان رزیبـان بالۆکەکانیش هەڵدەوەرین)، گەنمە.

**تێبینی:** لە فەرهەنگەکانی فارسیش دا ئەم وشـەیە بە شـێوەی بالو (بالوو) و پالو (پالوو) هـەر بەم مانایە هـاتوە.

**بالۆلک** (نا.)[باک] بڕ: بابۆڵە

**بالوور** (نا.)[باک] بڕ: بالۆکە

**بالووعە** (نا.)[عەر: بالوعة] ١ـ چاڵێک کـە ئـاوی ئـاوەڕۆ یـا ئـاوی بـارانـی دەچێتەوە سـەر، ئاوەڕۆ. ٢ـ گونجەی ئاو. & بەلۆعە.

**بالـووک** (نـا.) ١ـ بڕ: بـالـۆکـە. ٢ـ (گیانـ.) بڕ: تاژیلۆکە

**بالووکـە** (نـا.) ١ـ بڕ: بـالـۆکـە. ٢ـ بـالـۆکـەیەک کـە لـە شـوێنی بێ تووکی یەکسم دێ.

**بالووگ** (نا.)[باک] بڕ: بالۆکە

**باله** (نا. د) دەنگی ئاژەڵ، دەنگی بزن و مەڕ، باعە، باڕە.

**بالەبال** (نا. د)[بالە + بال] ١ـ دەنگی پەیتاپەیتای ئاژەڵ، باڕەباڕ

**بالەبان** (نا.)[باک] بڕ: باڵەوان2

**بالیف** (نا.)[باک ـ سۆر] بڕ: باڵنج

**بالیـفـە** (نا. ل)[بالیف + ئە][مـوک] دۆشـەگـەڵەیەک کـە لە نێـو لانکە دا بۆ منداڵی ساوای رادەخەن.

**بالیش** (نا.)[باک] بڕ: باڵنج

**بالیکە** (نا.)[باک] بڕ: بالۆکە

**باڵ**[1] (نـا.)[ئەو: وارە ـ پـەهـ: بالـەک. بـاک: بـال ـ نـاو: بـاڵ، بـار ـ باش: بـاڵ ـ هەو: باڵ] ١ـ (ئا.) بەشـێک لە ئەندامی ئەو گیـاندار و مـەل و جروجـانەوەرانەی کـە دەفـڕن. ٢ـ دوو پارچەی درێژ کـە بە پەنا فڕۆکەوەیە بۆ لەنگەر گرتن و باشتر فڕین. ٣ـ (ئا.) بەشێک لە ئەندامی مرۆڤ لە سـەری شـانەوە هەتا قـامکەکـانی دەست. ٤ـ ئەندازە و پێـوانەیەکـە بۆ لە گـەز دانی پارچە کـە سـەری قـامکەوە هەتا تیژایی لووت یا سەر چەنەکە نزیک گەزێک دەبێ بێ لە بەر چاو گرتنی کورت و درێژی دەست. ٥ـ (مـجـ.) پشـت، پەنا، ئـاگـاداری. ٦ـ (مـجـ.) هـاودەست، شـەریک، یارمـەتیدەر. ۞ تەنیاباڵ. **~ بەستن:** ١ـ بەسـتنی باڵی مـەل بۆ ئەوەی هـەڵنـەفـڕێ. ٢ـ بەسـتنەوەی دەسـتی کەسێک لە پشتەوە را، قۆڵ بەست کردن، باڵ بەست کردن. **~ بە سەر دا کێشان:** ١ـ (کنـ.) پشـتـیـوانی لێکردن و ئاگـا لێبوونی کـەسی بێکەس و بێ پەنا و بێ ئەنوا. ۞ کـە براکەی مـرد باڵی بە سـەر ژن و منداڵەکـانی براکـەی دا کـێـشـا و بەخـێـوی کـردن. ٢ـ (مـجـ.) داپۆشین، داگـرتن. ۞ شـەو باڵی بـە سـەر دنیـا دا کێشا. **~ فش کردن:** ١ـ باڵ کردنەوەی مـەل کـاتێک بە سـەر زەوی دا دەڕوا. ٢ـ دەست لێکردنەوە و سـینگ دانە پێـشی مـرۆڤ. **~ شکان:** ١ـ باڵندەیەک کـە باڵی شکابێ و توانای فـڕینی نـەبێ. ٢ـ (کنـ.) تووشـی بـەدبـەخـتـی بوون، سـەرنەکـەوتن. **~ شکاندن:** ١ـ باڵی پەلەوەر شـکـانـدن. ٢ـ (کـنـ.) بەدبەخت کـردن و بێ دەسـتـەڵات کـردنی کەسێک. **~ شۆڕ بوونەوە:** ١ـ داکەوتنی باڵەکـانی مـەل لەبـەر نەخـۆشـی. ٢ـ داکـەوتنی شـان و پیلی مـرۆڤ لـەبەر بێوازی. **~ گرتن:** ١ـ مـەلێک کە تازە فـێـرە فـڕین بووبێ. ٢ـ وە حـەوا کـەوتن،

هەڵفڕین. & باڵ گرتنەوە. **~ گرتنەوە:** ١ـ هەڵفڕینی کەمی مەلێک کە تازە باڵی گرتوە. ٢ـ بڕ: باڵ گرتن. **چوونە بن (ژێر) باڵی کەسێک:** (کنـ.) خۆ دانە بەر پەنا و پشتیوانی کەسێک. **خستنە ژێر (بن) ~:** پەنا دانی کەسێک، پاراستن و ئاگاداری لە کەسێک، باڵ بە سەر دا کێشان، گرتنە ژێر باڵ، گرتنە بن باڵ. **دەست بە باڵەوە گرتن:** (کنـ.) یارمەتی دان، یاریدە دان، دەست دانە باڵ. **دەست دانە ~:** (کنـ.) یارمەتی دان، یاریدە دان. **گرتنە بن (ژێر) ~:** بڕ: خستنە ژێر باڵ. **لە ~ دان:** پێوان بە باڵ. ‹‹ ئەو پارچەیەم لە باڵ دا بە باڵی من شەش گەز بوو تۆ لە باڵتی دە بزانە وایە یا نا. || **باڵی هوما:** باڵی مەلی خەیاڵی هوما کە گۆیا سێبەرەکەی بکەوێتە سەر هەرکەس بەختەوەر دەبێ. ‹‹ لە بن باڵی هوما جێی باز و شاهێن قەسری شاهان بوو / درێغا ئێستە وێرانەی سیسار و جوغدە جێگاکەم (وەفایی ل ٧٥). بڕۆت باڵی هوما سایەی سەری سوڵتانی حوسنت بوو / خەتت هات و وتی من ناسیحی توغرایی خونکارم (نالی ل ٢٧٤).

**باڵ²** (نا.) بە تەنیا کەم دەکار دەکرێ و پتر دەگەڵ ئامرازی « دە » دێ و ئەم مانایانە دەدا، با10. ١ـ هاوسەر، ژن. ٢ـ پێکەوە، بە یەکەوە. ٣ـ تێکەڵ. ٤ـ پاڵ، گەڵ. ٥ـ باوەش، هەمێز. **خۆ دە ~ هاویشتن:** دەباڵ کەسێک خزان، تێخزان دەگەڵ کەسێکی دیکە. ‹‹ لای بەیانی برازاکەم خۆی دەباڵ هاویشتم و لە سەر جێگاکەم خەوی لێکەوت. **دە ~ دابوون:** ١ـ هاوسەری پیاوێک بوون، لە باوەش دا بوون بە ژن و مێردایەتی و ئاشکرا. ‹‹ ئەرێ مامت کچی کێی دە باڵ دایە؟ دوو ساڵ کچی مام فەقێی دەباڵ دابوو. ٢ـ ژوان و دەباوەش دا بوونی بە نهێنی. ‹‹ کە بە سەریان داچوون دیتیان فاتێی دە باڵ دابوو. ٣ـ لە یەک حەوش دا بە یەکەوە ژیان. ‹‹ هەتا ماوەیەک دە باڵ یەک دا بووین دوایی ماڵیان گوێزتەوە. ئەو ماڵانە دەباڵ یەک دان. ٤ـ تێکەڵ بوون، لێکدران. ‹‹ کۆتەکەی دەباڵ نوێنەکان دابوو بۆیە هەر نەمدەدیتەوە. **دە ~ خزان:** چوونە سەر جێگای کەسێک و بە یەکەوە خەوتن. ‹‹ بڕۆ دەباڵ ئەحمەدی بخزە و بنوو! بە سەبرایەکی چوو دەباڵی خزا. **دە ~ خزاندن:** کەسێک دەگەڵ کەسێکی دیکە لە سەر یەک جێگا خەواندن. ‹‹ ئەوشۆ

کەسم دەباڵ مەخزێنە با بە راحەتی بۆی بنووم! **دە ~ کردن:** ١ـ تێکەڵ کردن و لێکدانی کەس یا شت. ؛؛ ئەو مریشکانە دەباڵ قازەکان کە! دوو کلاسیان دەباڵ یەک کردبوو هات و هاوارێکیان بوو نەبێتەوە. **دە ~ نان:** دە نێو یەک نان، ؛؛ نامەکەی منیشی دەباڵ نامەکانی خۆی نا و بردی.

**تێبینی:** ئەم وشەیە دەگەڵ وشەی باغەڵ یەک ریشە و سەرچاوەیان هەیە و لە دوایی ماناکانیان هەندێک لێک ترازاوە. بەغەل لە زمانی پەشتوو دا بە مانای ١ـ بن هەنگڵ ٢ـ باڵ، پەنا، تەنیشت و لە زمانی فارسی دا بە مانای باوەش و ئامێز هاتوە.

**باڵ**[3] (گیان.)[لات: balaena] گیاندارێکی گوانداری دەریاییە، سەری گەورە و پانە، درێژایی دەگاتە سی میتر و قورسایی هەتا سەدوپەنجا تۆن دەگا، واڵ.

**بالا** (ئان.، نا.)[پەه: بالاد، بالای، بالە. باک: بالا ـ ناو: بالا، بارا ـ باش: بالا ـ هەو: بالا] ١ـ ئەندازە و درێژایی بەژنی مرۆڤ، قەد، قامەت. ٢ـ بەرز، بلیند، سەر. ؛؛ دەستی بالا. ٣ـ سەروو، لای سەرەوە. ٤ـ لای سەرەوەی کراسی ژنان. **~ کردن:** ١ـ گەورە بوون، هەڵدانی بەژنی مرۆڤ. ؛؛ کوڕەکەمان ماشەڵڵا بالای کردوە. ٢ـ بەرز بوونەوە و هەڵدانی گیا و گوڵ. ٣ـ (کن.) هەڵدان لە باری رووحی و مەعنەوی، هەست بە خۆشییەکی زۆر کردن. ؛؛ لە خۆشی دەرچوونی کوڕەکەم لە زانکۆ گەزگەز بالام کرد. **~ گرتن:** ١ـ ئەندازە گرتنی قامەت دەگەڵ کەسێک یا شتێک. ؛؛ بالای بە بالای گرتوە، سێ پەنجە کورتی دێنێ. (فۆلکلۆر) ٢ـ هەڵدان، بالا کردن/١و٢. **بە ~ بران:** ١ـ جل و بەرگی درواوی پڕ بە قالب و ئەندازە و بێ کەم و کووڕی. ٢ـ (مجـ.) لێهاتن، بۆ داندران. ؛؛ ئەو کارە هەر لە تۆ جوانە دەڵێی بە بالات براوە. چ شیرینە خودایا ئەو نیگارەم / بە بالای ئەو براوە ناز و تەمکین (ئەحمەد موختار ل ١٠٨).& بە بەژن بران. **بە ~ برین:** برینی پارچە و دورانی بە قالب و ئەندازەی بەژنی کەسێک بە بێ کەم و کووڕی. **بە ~ گرتن:** جل و بەرگی دوراو لە بەر بەژنی کەسێک راگرتن بۆ ئەندازە گرتن و قالب بوونی. **بە ~ هەڵکوتن:** باسی رێک و پێکی و چاکەی کەسێک کردن، بە بەژن

و بالا هەڵکوتن.

**بالا بستە** (نا. ل، ئان. ل)[بالا + بست + ئە] مرۆڤی قامەت کورت، کورتە بالا، بستەبالا، باوەعەمرە.

**بالابڵند** (ئان. ل)[بالا + بڵند] بڕ: بالابەرز. ⁘ کیژێکیان لەگەڵ بوو، شل و مل، نێوی مەرزینگانە / بالابڵند بوو، گەردن کەشانە (شۆڕمەحموود ل ٨٦)

**بالابڵیند** (ئان. ل)[بالا + بڵیند] [موک] بڕ: بالابەرز

**بالابەرز** (ئان. ل)[بالا + بەرز] ١ـ کەسێک کە بەژنی درێژە، کەڵەگەت. ٢ـ شووش و باریک و درێژ و ئەندام ڕێک و پێک. & بالابڵند، بالابڵیند

**بالابەرزە** (ئا.)[بالا + بەرز + ئە] سێهەمین ئەنگوستی پەنجەی دەست، قامکی قوونێ، قامکە قووچە، تلیا درێژ، ناڤ تلی، تلیا ناڤین، تپلی درێژ، بەرزەلووتە.

**بالابەژن** (نا. ل)[بالا + بەژن] بڕ: ئاوێنەی بالابەژن

**بالاپۆش** (نا. ل)[بالا + پۆش] ١ـ هەر جلوبەرگێک کە سەرتاپێی لەش داپۆشێ. ٢ـ باڵتۆ، پاڵتاو.

**بالاخانە** (نا. ل)[بالا + خانە] بڕ: باڵەخانە

**بالادار** (نا. ل)[بالا + دار1] داری سەرەوەی داربەستی تەون. // ژێردار

**بالادەس** (ئان. ل)[بالا + دەس] بڕ: بالادەست

**بالادەست** (ئان. ل)[بالا + دەست] ١ـ دەست ڕۆیو، خاوەن دەستەڵات. ٢ـ سەر، سەرۆک، کاربەدەست. ⁘ کاک کەریم لە یانە دا بالادەستی هەموانە.

**بالادەستە** (ئان. ل)[بالا + دەستە] منداڵێک کە بەژن وبالای لە حاڵی هەڵدان دایە و بەرەو لاوی دەچێ. بەژن و بالای سەردەمی مێرمنداڵی. ⁘ کوڕەکەمان شوکور بالادەستە بوە و چەند ساڵی دیکە دەبێتە پیاو.

**بالادەستیی** (حم.)[بالادەست + ئیی] بە دەستەڵاتیی، دەستەڵاتداریی، دەستڕۆیشتوویی.

**بالار** (نا.)[ئەر] داری ئەستوور و گەورە کە لە سەرەوەی دیواری دادەنێن، حەماڵ، کاریتە. (هس: بالادار)

**تێبینی:** ئەم وشەیە مەردووخ نووسیویەتی و لە فەرهەنگەکانی فارسی

دا بالار، بالال و پالار هەر بەم مانایە هاتوون. هەروەها کاک ناسری ڕەزازی لە کاتی پێداچوونەوە لە پەراوێز دا نووسیویەتی کە ئەم وشەیە بالادار بوە و لە بن زاراوەی ئەردەلانی دا دالْ ـ ەکەی سواوە و بۆتە بالار.

**بالاڕوان** (نا. ل)[بالا + ڕوان] ١ـ بڕ: ئاوێنەی بالاڕوان. ٢ـ پەنجەرە و کلاوڕۆچنەی بان کە بۆ ڕووناکی و چوونە دەری دووکەڵ سازی دەکەن.

**بالاشمە** (نا.)[ئەر] بڕ: باڵشمە

**بالافڕ** (نا. ل)[بالا + فڕ] بڕ: بالافڕ

**بالان** (نا.)[؟] داو، تەڵە

**بالانس** (نا.)[فەر: balance] ١ـ هاوسەنگی. ٢ـ ڕاگرتنی هاوسەنگی لەش لە سەر دەستان یا لە شوێنی بەرز و باریک. ٣ـ سەربەقولات. ~ **لێدان:** سەربەقولات لێدان.

**بالانشین** (ئان. فا)[بالا + نشین] کەسێک کە لە سەرەوەی خەڵک دادەنیشێ، دەوڵەمەند، دەستەلاتدار، ماقووڵ، گەورە. :: زولف و خاڵی تۆ کە وا شاد بوون بە تۆ عەیبی نیە / ئەمڕۆ هەرچی ڕووڕەشە بالانشین و مەحرەمە (وەفایی ل ١٣٨).

**بالانشینیی** (حم.)[بالانشین + ئیی] لە لای سەرووی کۆڕ دانیشتن، گەورەیی، ماقووڵیی.

**بالانوێن** (نا. ل)[بالا + نوێن] بڕ: ئاوێنەی بالانوێن

**بالاوان** (گیان.)[هەو] بڕ: باڵەوان2

**باڵباز**[1] (گیان.)[باڵ1 + باز5] جۆرێک مراوی کە ڕەنگی سەر باڵیان ڕەش و سپی و بەڵەکە و پەڕەکانی لەشی قاوەیی تێکەڵ بە قاوەییەکی ڕوونە. (فرهنگ پرندگان ل ٢٦).

**باڵباز**[2] (نا.)[؟] سەرباز، عەسکەر.

**باڵبەست** (ئان. مف.)[باڵ1 + بەست] دەست بەستراو لە پشتەوە ڕا، باڵبەستە، قۆڵبەست. ~ **کردن:** بڕ: باڵ بەستن.

**باڵبەستە** (ئان. مف.)[باڵ1 + بەستە] بڕ: باڵبەست

**باڵبەڵەکە** (گیان.)[باڵ1 + بەڵەک + ئە] بڕ: پەڕبەڵەکە

**باڵتۆ** (نا.)[فەر: paletot] بالاپۆشێکی ئەستوور و درێژە کە زستانان لە سەرەوەی هەموو جلەکان دە بەری دەکەن و سەرما دەگێڕێتەوە. باڵتە، پاڵتۆ، پاڵتاو، پاڵتە.



**باڵتە** (نا.) بڕ: باڵتۆ

**باڵچـــۆغــە** (نا.)[؟] ئەو شــوێنەی شـەمـشـیـر کـە دەسـتـی پێـوە دەگـرن، دەسکی شەمشیر، باڵچە. :: دەستت بۆ باوێمە سەر باڵچۆغەی شیران، کێلانانت بۆ بە جێ بێڵم، لە بنەبنەی دمدمییە. (مان ل ١٣).

**باڵچە** (نا.) بڕ: باڵچۆغە. :: ئەوە لە قەدی خۆی شەت دەداوە شیرێکی باڵچە زێڕی تەنکە لە زێوی (گەنج ل ٣٠٥).

**باڵخەنجەرە** (گیانـ.)[باڵ1 + خەنجەر + ئە] مـــــەلێکی چووکی بـاریکەڵەی ڕەنگاوڕەنگە، باڵی درێژ و نووک تیـژە ـ وەک خـەنجـەر (هۆی ناو نان) دندووکی باریک و هـەندێک خــوارە، لە کــون و کاژێران دا هێلانەی ساز دەکا و مێش و مــەگــەز و زەرگــەتە و مــێش هـەنگوین دەخـــوا، Merops apiaster ناوی لاتینی ئەم مــەلەیە، خــەنجــەرباڵە، کـەندسـمـە، کـەندەسـمـە، کـەنەسـمـە، هەنگخۆرکە، هـەنگخۆرە، مێشخۆرکە، مێشخۆرە، هەنگەژاڵەخۆرە، هەنگەچینە، هەنگووچنە، ڕەنگرێژە، ڕەنگاڵە.

**بـــاڵـــدار** (نــا. ل)[بــاڵ1 + دار2] گـیـانداری خـاوەن باڵ، مـەل، پەلەوەر، باڵندە.

**باڵزەر** (گیانـ.)[هەو] بڕ: بازڕ

**باڵشت** (نا.)[باش] بڕ: باڵنج

**باڵشکاو** (ئان. مفـ.)[لە: باڵ شکان] ١ـ مـەل و باڵندەیەک کـە باڵی شکابێ و توانای هـەڵفـــڕینی نەبێ. ٢ـ (کنـ.) بێچارە، تێشکاو، سەرنەکەوتوو.

**باڵشمە** (نا.)[هس: باڵنج] دارەکانی سـەر قـاپی و تاقـچـە و پەنجـەرە کـە دارەڕاکـان دەکـەونە سـەری، باڵاشـمـە، باڵیشمە.

**باڵغ** (ئان. )[عـەر: بالغ] گـەیشـتنی کوڕ یا کچ بە تەمەنی جنسی، کە کوڕ شەیتان پێی پێدەکەنێ و کچ دە حەیزەوە دەچێ، باڵق. ~ **بوون:** پێگەیشـتنی کـــوڕ یا کچ و پەیدا بوونی هـەوەسی جنسی، خۆ ناسین، باڵق بوون.

**باڵق** (ئان.) بڕ: باڵغ. ~ **بوون:** بڕ: باڵغ بوون.

**باڵنج** (نا.)[هـیک: بـەرهـیش ـ ئەو: بەرێزیش ـ هەخ: بەرزەنیە ـ پاز: بالین ـ پەه: بالین، بالیشن. تات: بالێشمە ـ لۆر: بالێشت ـ فـار: بالش. باک: بالگە، بالگەه، بالیش، بالگیف، بالگۆگ، بالنگ،

بالیف ـ ناو: باڵنج، باڵینج، بالیف ـ باش: باڵشت ـ هەو: باڵین ـ زا: باشنا، بالشنا] پارچەیەکی دوراوی چوارگۆشی نێو بۆشە کە نێوەکەی بە پەڕ، لۆکە، هەوری یا کوتە پارچە داخنەوە و بۆ پاڵ وێدان یا سەر لە سەر دانان، لە کاتی خەو و حەسانەوە کەلکی لێوەردەگرن، بەرسەری.

**باڵنجەک** (نا. ل)[باڵنج + ئەک] باڵنجی چووک، نازباڵنج.

**باڵندە** (نا. ل)[باڵ1 + ندە] مەل، باڵدار، پەلەوەر.

**باڵنگ** (گیا.)[پەه: ڤاترەنگ] ١ـ دارێک و بەری دارێکە هەر بەم ناوە، دارەکەی وەک دارلیمۆ دەچێ بەڵام گەڵاکانی گەورەترە، بەرەکەی لە جسنی نارنجە، دریشت و قورس و توێکڵ ئەستوورە، بۆنی خۆشە و رەنگی زەردە و مرەبای لێ ساز دەکەن، Citrus medica cedrata ناوی عیلمی ئەم دارەیە، تورنج، ترنج، کەبات. ٢ـ بڕ: باروونە.

**باڵنگوو** (گیا.) بڕ: باروونە

**باڵوێز** (نا.) بڕ: باڵیۆز

**باڵوێزخانە** (نا. ل)[باڵوێز + خانە] بڕ: باڵیوزخانە

**باڵۆن** (نا.)[فەر: ballon لە ئیتا: pallone] کیسەیەکی گەورەی خڕە کە پڕ دەکرێ لە گازی سووکی وەک ئیدرۆژێن و هلیۆم. ئەم کیسەیە بە شتێکی وەک تۆڕ داپێچراوە و سەوەتەیەک لە بنەکەی بە تەناف پێی لکێندراوە و زوو بۆ راگوێزتنەوەی بار و خەڵک کەلکی لێوەردەگیرترا. باڵۆن لە ساڵی ١٧٨٣ زایینی بە دەست برایانی مۆنگۆلۆفیە ساز کرا.

**باڵووکە** (نا.)[باش] بڕ: بالۆکە

**باڵە** (نا.)[باک: بەلە ـ ناو: باڵە] دەستەوانەیەکی تایبەتی کە بازەوان لە کاتی راو یا عامالاندنی باز بۆ بریندار نەبوونی دەستی دە دەستی دەکا.

**تێبینی:** ژابا ئەم وشەی بە شێوەی بەلە نووسیوە و بەراوردی کردوە دەگەڵ بهلە (بەهلە)ی فارسی هەر بەم مانایە (بڕ: ژابا ل ٥٦).

**باڵەبان**[1] (نا.)[رووس: baraban] ١ـ دەهۆڵ، تەپڵی گەورە، باڵەوان ٢ـ (مجـ.) ئێستری زەلام. ٣ـ (مجـ.) پیاوی زەلام و ناقۆڵا. ٤ـ ئامێرێکی مۆسیقای کوردییە، نەرمەنا، نەرمەنەی، نایە.

**باڵەبان**[2] (نا.) بڕ: باڵەوان2



**باڵەبانچی** (نا. ل)[باڵەبان1 + چی] کەسێک کە دەهۆڵی دەکوتێ، دەهۆڵ ژەن.

**باڵەتەپە** (نا. ل)[باڵ1 + ئە + تەپە] ١ـ بێچوومەلێک کە توانایی هەڵفڕینی نیە و تەنیا باڵەکانی لێک دەدا و بە سەر زەوی دا دەخشێ. ٢ـ مەلی باڵ شکاو یا بریندار کە ناتوانێ هەڵفڕێ و حەولی هەڵفڕین دەدا و باڵەکانی لێک دەدا و تەنیا مەودایەکی کەم ئەویش بە سەر زەوی دا دەتوانێ خۆ بکێشێ. ٣ـ مەل و مریشکی سەر بڕاو لە کاتی پەلەقاژە کە باڵەکانی لە زەوی دەدا. & باڵەتەپێ، باڵەفڕێ، باڵەفڕکە، باڵەفڕکێ، باڵەفڕە.

**تێبینی:** تەپە دەبێتە دەنگێک کە بە باڵ کوتان لە زەوی ساز دەبێ و پێچەوانەی شەقەیە کە دەنگی باڵ و هەوا سازی دەکا.

**باڵەتەپێ** (نا. ل)[باڵ1 + ئە + تەپ + ئێ] بڕ: باڵەتەپە

**باڵەخانە** (نا. ل)[باڵا + خانە] ١ـ قاتی سەرەوە یا ژووری هەرە سەرەوەی ماڵ، باڵاخانە، سەرخان.// ژێرخان. ٢ـ کۆشک، تەلار. :: تەدارەکم بۆ گرتووی، رۆڵە، رۆژی جومەی دەبێ وارید ببی بە کۆشک و باڵەخانەی خۆت (مان ل ٢٦).

**باڵەشۆڕە** (نا. ل)[باڵ1 + ئە + شۆڕ + ئە] ئازارێکە تووشی جووجکە و مریشک دێ و باڵیان شۆڕ دەبێتەوە، باڵەشۆڕێ.

**باڵەشۆڕێ** (نا. ل)[باڵ1 + ئە + شۆڕ + ئێ] بڕ: باڵەشۆڕە

**باڵەفڕکە** (نا. ل)[باڵ1 + ئە + فڕ + کە] بڕ: باڵەتەپە

**باڵەفڕکێ** (نا. ل)[باڵ1 + ئە + فڕ + کێ] بڕ: باڵەتەپە

**باڵەفڕە** (نا. ل)[باڵ1 + ئە + فڕ + ئە] بڕ: باڵەتەپە

**باڵەفڕێ** (نا. ل)[باڵ 1+ ئە + فڕ + ئێ] بڕ: باڵەتەپە

**باڵەکەو** (نا. ل)[باڵ + ئە + کەو2] کاری لە بێژینگ دانی گەنمی سوور بۆ جیا کردنەوەی چەت و وردە بەرد لە گەنم. بۆ ئەو کارە بە پێوە رادەوەستن و کەو یا داشگیر بە قەد باڵا بەرز دەکەنەوە گەنم دەڕژێتە سەر زەوی و چەت لە کەو دا دەمێنێتەوە و وردە کا و تۆز و خۆڵیش دەکەونە لایەک. **لە ~ دان:** بێژینگ کردنی گەنم بۆ جیا

کردنەوەی چەت و خۆڵ و ورکەبەرد.

**باڵەوازە** (نا. ل)[باڵ1 + ئە + واز + ئە][ئەر] بڕ: پەڕەوازە

**باڵەوان**[1] (نا.) بڕ: باڵەبان1

**باڵەوان**[2] (گیـانـ.)[ئەو: ڤـارێغـەن. باک: بـالابـان، بـالـەبـان ـ نـاو: بـاڵـەبـان، بـاڵەوان ـ بـاش: باڵـەوان ـ هـەو: بـالاوان ـ زا: بالوەر] مـەلێکی راوکـەرە لە رەگـەزی باز و لە باز چووکترە، لە کێو و دەشت و لێـڕ دەژی، رەنگی بۆرە بـە پەڵەی رەش و سـپی، سـەقـر، چەرخ. || **باڵەوانی چیل:** چەشنێک باڵەوان کـــە چیل رەنگە. **باڵەوانی غـازەلاغی:** جۆرێک بـاڵەوان کە رەنگـی وەک رەنگـی قـازەلاخـە. **باڵەوانی هور:** جـۆرێک باڵـەوانی سـپی. (فـرهـنگ پرندگان ل ٢٩)

**تێبینی:** وان یا بان لە وشـەی باڵەوان و باڵەبان دا چ پـەیوەنـدی بە پـاشگری وان بە مـانـای ئاگادار و چاوەدێر نیە بەڵکەم گـــۆڕاوی راســـتـــەوخـــۆی غـــەن ـ ی ئەوێستاییە بـە مانای لێدان و وەشاندن. ڤار بە مـانـای باڵە و بە گشـتی یانی باڵ ژەن یـا باڵ لێـدەر کـــە دەگـــەڵ بالوەر هـاوتای زازاییەکەی یەک دەگرنەوە.

**باڵیشمە** (نا.) بڕ: باڵشمە

**باڵین** (نا.)[هـەو] ١ـ بڕ: باڵـنج ¤ با وەس باڵینم سـێـلاو هوون بۆ / ئامێـتـەی زووخـاو دیگ دەروون بۆ (مـەولەوی ل ٤). ٢ـ بان سـەر، ژوور سـەر. ¤ وەسـیـەتم ئێدەن شـای شـەم روخسـاران / بەی وە باڵینم چون بەینەتداران (وەلی دێوانە ل ٦٢).

**باڵینج** (نا.) بڕ: باڵنج

**باڵیۆز** (نا.)[تور: balyos لە ئیتا: ؟] نوێنەری دەوڵەتێک کـە بـۆ وڵاتێکی دیکە ناردراوە و ئەرکی پاراستنی بەرژەوەندی و هەڵسـووڕاندنـی کـار و باری دەوڵـەتی خۆی هەیە لەم وڵاتە، باڵوێز، سەفیر.

**باڵیـۆزخـانە** (نا. ل)[باڵیـۆز + خـانە] یانە و شـوێنی نوێنەر و باڵیـۆزی وڵاتێک لە وڵاتێکی دیکە، باڵوێزخـانە، سەفارەت، سەفارەتخانە.

**بام** (پاشـ.)[ئەر] بڕ: باو4

**بامـبوو** (گیا.)[فـەر: bambou] بڕ: حەیزەران

**بامجان** (گیا.) بڕ: باینجان/٢.

**بامجان فەرەنگی** (گیا.)[بامـجان + فەرەنگ + ئی] بڕ: باینجان/١.

**بامـشت** (نا. ل)[بـا + مـشـت][باک]



باکوت، کرێوە.

**بامیە** (گیا.)[باک: بامیێ، بامیە ـ ناو: بامیێ، بامیە ـ هەو: بامیە] ١ـ گیایەکی یەک ساڵەی دەسچێنە، ساقەت هەتا گەزێک هەڵدەدا، گەڵای پان و گرنی گرنییە، گوڵێکی زەردە و نێوەڕاستەکەی قاوەیی مەیلەو سوورە، Moringa ناوی لاتینی ئەم گیایەیە. ٢ـ بەری ئەم گیایە کە درێژ و شین و بە کورکە، ناوکەکەی چەند ریز دەنکی تێدایە، بە شینی دە شۆربا و چێشتی دەکەن، بۆ ئیشک کردن دەبێ و بۆ زستان هەڵدەگرترێ. ٣ـ جۆرێک شیرینی بە شکڵی بامیەیە لە ئارد و ماست و نیشاستە ساز دەکردرێ و دە نێو شیلە داوێن و دەیخۆن. || **بامیەی ئیشک:** بامیە کە بۆ زستان ئیشک کرابێ.

**بامێ** (گیا.) بڕ: بامیە

**بان**[1] (نا.)[پەه: بان. باک: بان ـ ناو: بان ـ باش: بان ـ هەو: بان] ١ـ تەختایی سەرەوەی ماڵ و خانوو، دیوی سەرووی میچ، سەربان، پشت بان، بانخانگ. ٢ـ دەشتایی بەرز، بانوو، بانی. :: بانی هۆبەتوو. ٣ـ تەختایی سێ سووچی عارەبەی کەڵ کە باری لە سەر دادەنێن. ٤ـ (ئاک.) لای سەر، ژوور. :: بان کێو زۆر ساردە. چەتری لە بان سەری هەڵدابوو. ٥ـ [زا] ماڵ، خانوو. **~ کوتان:** بڕ: بان کوتانەوە. **~ کوتانەوە:** شێلانی بانی خانوو بە پێ لە کاتی دڵۆپە کردن دا، بان کوتان. **~ گێڕان:** گێڕانی باگردان لە سەر بان بۆ پەستاوتنی درز و قەڵش و بەری دڵۆپە گرتن. **~ هەڵگێڕانەوە:** لا بردنی گڵی سەربانێک کە ئاو دادەدا یا کەلکی نەماوە و لە سەرڕا بە گڵەبان داپۆشینەوە. **وە ~ کەوتن:** چوونە سەر بان. || **بان بان:** لای هەرە سەرەوە، سەرسەر، سەروو. **بانی سەر:** [هەو] ١ـ تەپڵەسەر ٢ـ بڕ: بانسەرە. :: سەدای لاو هەی لاو، زرەی زەرزنجیر / سڵسڵە و بانی سەر، بەند زرێ و لاگیر (مەولەوی ل ٤١١)

**بان**[2] (ر.)[لە: بانین] کاری وەخۆ گرتنی کاریلە و بەرخ و گوێلک لە لایەن دایکیانەوە. // نەبان

**بان**[3] (نا.) سواوی وشەی بانگ. (بڕ: بانگ)

**بان**[4] (گیا.)[هیند: behan] دارێکی بەرز و جوانە کە لە باشوور و باشووری

ڕۆژهەڵاتی ئاسیا و ئافریقا شین دەبێ، گەڵاکانی وەک گەڵای ئەقاقیایە و گوڵەکانی هێشوویی سوور یا سپین، چێوەکەی نەرمە و بەرەکەی وەک کەلووی باقلەیە کە لە دەنکەکەی ڕۆنێکی بۆنخۆش دەگرترێ Moringa ناوی لاتینی ئەم دارەیە. ؛؛ هات زەمزەمەیی بولبول و ئاوازەیی قومری / هات بادی سەبا، دێن و دەچن عەرعەر و بانات (نالی ل ١٤٣).

**بان**5 (ئان.)[موک] بە تەنیا نایە و دەگەڵ وشەی تاو دێ و لە موکریان باوە. بە گشتی مانای هەتاویی و ڕووناک دەدا. ؛؛ تاو و بانێکی خۆشە.

**تێبینی:** بان هاوڕیشەیە دەگەڵ [هیک: بهانەڤ ـ ئەو: بانەڤ ـ سان: بهانو ـ پەه: بانووی] بە مانای شەوق. هس: بەیان1 و باو4.

**بانا** (ئان.)[؟][زا] بێ جل، ڕووت.

**باناندن** (چا. م)[لە: بانین] کاریلە و بەرخی ساوا وە بەر مەڕ یا بزنێک خستن کە دایکیان نەبێ، یا دایکیان لێیان نەبان بێ.

**بانبارگە** (نا. ل)[بان1/٤ + بارگە] بەربووک یا ژنێک کە دەگەڵ گیازی بووک دەچێتە ماڵی زاوا.

**بانبانک** (گیانـ.)[بان1/٤ + بان1/٤ + ک] گیاندارێکە لە ڕەگەزی سمۆرە، دەستەکانی لە قاچی کورترە، ڕەنگی کەوڵی بە زستان و بەهار دەگۆڕدرێ، کەوڵەکەی بە کەلک دێ و هەر لە بەر ئەوە راوی دەکەن، میوە و بەر دەخوا و لە کوردەواری دا پێیان وایە لە سەر زێڕ و خەزێنە دەخەوێ و هەر لە بەر ئەوە ئەگەر دەستیان بە لانەی ڕابگا دەیدەنەوە، بانبانکە.

**بانبانکە** (گیانـ.)[بانبانک + ئە][باک] بڕ: بانبانک

**بان پووشین** (نا. ل)[بان1 + پووشین] خشڵێکی ژنانەیە لە زێڕ و زیو کە لە پووشینی سەریان دەدەن، لاگیرە.

**بانتلێر** (نا. ل)[بان1/١ + تلێر (تلاندن)][هەو] بڕ: باگردان

**بانتلێن** (نا. ل)[بان1/١ + تلێن (تلاندن)] بڕ: باگردان

**بانجیلە** (نا. ل)[بان1/١ + جی + لە][ئەر] بڕ: بانیژەی/١و٢

**بانجێلە** (نا. ل)[بان1/١ + جێ + لە][هەو] بڕ: بانیژە/١ و ٢



**بانخانگ** (نا. ل)[بان1/١ + خانگ] [باش] بڕ: بان1

**بانژۆڕ** (نا.)[؟][موک] قومارێکی منداڵانە و تەنانەت گەورەساڵانیش لە سەر پووڵ دەیکەن.

ئەو کەسانەی کە دەیانەوێ لەم قومارە دا بەشداری بکەن، هەر کەس پووڵێکی کانزای دیاری کراوە (تمەنی، دووتمەنی، ...) لە سەر یەک بە لای خەت یا شێر دا دادەنێن. لە دوایی هەموویان لێی دەکشینەوە و لە شوێنێکی دووری دیاریکراو بە پووڵێکی کانزای گەورەتر بۆ لای پووڵی لە سەریەک هەڵنچراو دەیهاوێن. هەر کەس کە پووڵەکەی نزیکتر لەوانی دیکە بێ دەبێتە یەکەم کەس و هەروا دووهەم و سێهەم هەتا ئاخر. یەکەم کەس بە قەو لە پووڵە لە سەر یەک داندراوەکان دەدا، ئەوەندی کە وەرگرێتەوە هەڵیدەگرێ و درێژە بە کارەکەی دەدا هەتا هیچی دیکەی بۆ وەرنەگرێتەوە، بەمجۆرە کەس دووهەم و ئەوانی دیکە درێژە بەم کارە دەدەن هەتا هیچ پووڵێک لە سەر زەوی نەمێنێتەوە.

لە کاتی هاویشتنی پووڵ لە دوورەوە بۆ دیاری کردنی نۆبەی کایە هەر کەس پووڵەکەی لە کۆمای پووڵەکان بدا پێی دەڵێن بانژۆڕ و ئەو کەسە یەکەم کەس دەبێ.

**باند** (نا.)[ئیتا: banda] تاقم، دەستە.

**بانداژ** (نا.)[فەر: bandage] تیزماڵکە پارچەیەکی درێژ و خاوێنە کە برینی پێدەبەستن.

**تێبینی:** باندی فەرانسی و هاوتاکانی لە زمانەکانی دیکەی ئورووپایی دەگەڵ بەن و بەندی کوردیی یەک ریشە و سەرچاوەیان هەیە.

**باندرۆڵ** (نا.)[فەر: banderole] کوتە کاغەزێکی باریکە، نەقش و نووسراوەی لە سەرە کە لە سەر هەندێک کاڵا دەدرێ و نیشان دەدا کە ژێر دەستی دەوڵەت ڕەد بوە، بەرچەسپ، مەکس، مەکووس.

**باندێر** (نا. ل)[بان1/١ + دێر (گێڕ)][باک] بڕ: باگردان

**بانسەر** (نا. ل)[بان1/٤ + سەر] بڕ: بانسەرە

**بانسەرە** (نا. ل)[بان/٤ + سەر+ ئە] خشڵێکی ژنانەیە و بریتییە لە دراوێکی

زێڕ یا زێو کە کون دەکرێ و ژن لە تەپڵەی تاسکڵاوەکەی دەدا، بانی سەر، بانسەر.

**بانق** (نا.) بڕ: بانک

**تێبینی:** بانق لە رێگەی عوسمانییەکانەوە چۆتە نێو زمانی کوردەکانی عێراق و ئاڵ و گۆڕی دوو پیتی ک و ق پێک هاتوە.

**بانقۆ** (نا.) بڕ: بانک/٢

**بانک** (نا.)[ئیتا: banco] ١- شوێنێکی دەوڵەتی یا تایبەتی کە خەڵک بە ئەمانەت پووڵ و پارەی زیادی یا شتی بە بایخ لەوێ دادەنێن یا ئەوە کە لە کاتی تەنگانە دا پارەی لێ قەرز دەکەن. ئیمرۆکە حەق و دەسمز و مانگانە لە بانک وەردەگرن و هەر کەسە بۆ کار و باری خۆی ژمارەیەک وەردەگرێ و حیسێب و کتێبەکەی بەم ژمارەیە وەگەڕ دەخا. ئیمرۆکە بانک گەلێک گەورە بوون و دەیان لقی لێ بۆتەوە و دەورێکی بەرچاویان لە ئابووری وڵاتان دا هەیە، بانق. ٢- کایە و قومارێکە کە بە پەڕی قومار دەیکەن. کەسێک هەندێک پارە بە ناوی بانک دادەنێ و هەتا تەواو بوون یا پڕ بوونی ئەو بانکە (سێ بەرابەری پارەی داندراو) کایەکەی درێژەی دەبێ، بانقۆ. ~ **برین:** ١- دزینی پارەکانی بانکی/١. ٢- لێدان و بردنەوەی تەواوی پارەکانی بانکی قومار. & بانک لێدان. ~ **دەرچوون:** ١- پڕ بوونی بانک (سێ بەرابەر بوونی پارەی داندراو) لەو قومارانەی دا کە بانک دادەنێن. ٢- (کن.) زۆر دەوڵەمەند بوون، ئەنگران. ~ **دانان:** پارە دانان بۆ بانک لە قومار دا. ~ **لێدان:** بڕ: بانک برین. ‖ **بانکی خوێن:** ساردخانەیەکی تایبەتە کە بۆ راگرتنی خوێن کەلکی لێوەردەگرن. ئەو کەسانەی کە خوێن دەدەن لەم ساردخانانە دا خوێنەکەیان هەڵدەگرترێ و دوایی بۆ کەسێک کە پێویستی بە خوێن بێ لەو خوێنانەی دەدەنێ.

**بانکدار** (ئان. فا)[بانک + دار2] ١- خاوەن بانک، کەسێک کە بانکەکە هی ئەوە. ٢- کەسێک کە لە بانک کار دەکا. ٣- کەسێک کە پووڵی قومار (بانک) لە لای ئەو دادەندرێ. ٤- کەسێک کە پووڵی تاقمێک کە بە یەکەوە دەژین لە لایە و خەرجی گشتی لە ئەستۆی ئەوە.

**بانکداریی** (حم.)[بانکدار + ئیی] ١- کاری و پیشەی کەسی بانکدار. ٢- زانستی بەڕێوە بردنی بانک.



**بانکوت** (نا. ل)[بان1 + کـــوت1] [باک] بڕ: باگردان

**بـــانـــکـــه** (نـــا.)[ڕوس: banka] شـــووشـــەیەکی ئوســـتـــوانەیی و خـــڕە لە ئەندازەی جـــۆربەجـــۆر دا بۆ مـــرەبا و ترشیات و شت تێداهەڵگرتن.

**بانگ** (نا.)[خوار: وەنک ـ پەهـ: ڤانگ. باک: با، بان، بانگ ـ ناو: بانگ، بان ـ باش: بانگ ـ هەو: بانگ ـ زا: ڤـەنگ] ١ـ هەرا، دەنگ، جاڕ. ٢ـ ناوبانگ، شۆرەت. :: بانگ رسـوایيم جـە عـالەم بەرزەن / زیندەگـــیم زیاد، مـــەردەنم فـــەرزەن (مـــــەولەوی ل ٢٤٤). ٣ـ گـــــریان بـه هاوارەوە. ٤ـ قـاو، گـاز. ٥ـ ڕاگـەیاندن کـــاتی نوێژ بە دەنگێکی بەرز یا لە بلیندگۆوە بۆ ئەوەی موسڵمانەکان بچنە نـوێژ، ئـازان، ئـەزان. بە پـێی ئـایـینـی ئیـسـلام ڕۆژێ پێنج جـار بـانگ دەدرێ (بانگی بەیانان، بانگی نیوەڕۆیە، بانگی ئێوارێ، بانگی شێوان، بانگی خەوتنان) کە لە کوردەواری دا وەک کاتیش کەلکی لێـوەردەگـرن. :: بانگی شـێـوان لە ئاسـمـانی خـۆرنشـین / ئەسـتـێـرەیەک ئەجـریوێنێ گـەش، شـیـرین (گـۆران ل ١٧٤). کوڕەکـەمـان هێند تەنبەڵە بانگی نیوەڕۆیە لە خەو هەڵدەستێ. ~ **بەگوێ دادان:** دوای ئەوە کـــە منداڵ حـــەوتووی تەواو کـــرد و مـــەترسی ئـاڵ بردنـەوە و مردنی نەما شـەوێک میوانی بۆ دەدرێ و مـەلا بانگ دەکـەن هەتا لە سـەر منداڵ بـانگ بدا و دوایی ئەو نـاوەی کـــە بۆی دیاری کـراوە سێ جـار بـە دەنگی بەرز ڕایدەگـەیەنێ. ~ **دان:** ڕاگـەیاندنی و جـاڕ دانی کـاتی نوێژ بە خـەڵک. چونکە کـاتی بانگ دان لە ئیـسـلام دا دیاری کراوە لـە کوردستـان وەک کاتیش بۆ کار و بەڵێنی کـەلکی لێـوەردەگـرن. :: مـەلا بـانـگ دانـێ وەدەر دەکـــــــەین. ~ **ڕاهێـشتن:** ١ـ جـاڕ دان، بە دەنگی بەرز خەبەر بە خەڵک ڕاگەیاندن، جاڕ کێشان. :: ئەوڕۆ لە شـار بانگیان ڕاهێشت کـە سبەی کەس نابێ دوکانەکان بکاتەوە. ٢ـ بڕ: بانگ دان/٢. ~ **کـردن:** ١ـ هەرا لە کەسێک کردن، قاو کردن، گاز کردن. :: ڕۆڵە هـەرچی بانگت دەکـەم بۆ نـایەی خۆ کەڕ نی؟ دا بڕۆ دایکت بانگ کە! ٢ـ لە کەسێک گێرانەوە بۆ میوانی و شایی، بانگەواز کـردن، بانگێشتن. :: بانگتـان نەکردبووین بۆیە نەهاتین. سـەد کـەس بۆ زەمـاوەند بانگ کراون. ~ **کردنەوە:** ١ـ یەکـەم میـوانی دوای گوێزتنەوەی کچ لە لایەن دایک و باوکییەوە، باوە خوون. ٢ـ

گەڕاندنەوەی کەسێک کە دوور کەوتۆتەوە یا لەو شوێنە نەماوە، خەبەر دان بۆ هاتنەوە. :: برۆ منداڵەکان بانگ کەوە بێنەوە شەو درەنگە. پوور ئامان چەرچی بانگ کردەوە و کیسەیەکی خەنە لێکڕی. **~ لە سەر ~ لێدان:** پەیتا پەیتا لە گابۆڕە دان، یەک لە سەر یەک هاوار کردن و گریان. :: چوونە ماڵە هەیدەر گۆرانی جەنازەی برایانیان هەڵدەگرت و دەیانهێناوە / بانگ لە سەر بانگیان لێداوە. (مان ل ٢٥٤). **~ لێدان:** بڕ: لە بانگ دان. **~ هەڵدان:** بڕ: لە بانگ دان. **~ هێشتن (بانگێشتن):** ١ـ بانگ کردن ٢ـ لە بانگ دان. **لە ~ دان:** لە گابۆڕە دان، لە پڕ گریان بە هاوارەوە، بانگ لێدان، بانگ راهێشتن، بانگ هەڵدان. :: بە خۆی و بە ژنی لە بانگێیان دەدا و دەستیان دەکردەوە بە گریانە (شۆڕمەحموود ل ٨٧). || **بانگی بێ وادە:** بانگێک کە لە کاتی خۆی دا نەبێ، ئەویش لەبەر هۆگەلی وەک مانگ گیران یا بەڵایەک دەدرێ و خەڵک بە ناوەختییەکەی ئەو بانگە دەزانن کە شتێک قەوماوە، بانگی ناوەخت، بانگی بێ وەخت. **بانگی بێ وەخت:** بڕ: بانگی بێ وادە. **بانگی محەممەدی:** ئەو بانگەی کە لە مزگەوتان دەدرێ، ئەو بانگەی کە ئیسلام بۆ نوێژ دیار کردوە. :: بانگی محەممەدی بە ئاشکرا خۆشە. **بانگی ناوەخت:** بڕ: بانگی بێ وادە.

**بانگاواز** (نا. ل)[بانگ + ئاواز] بڕ: بانگەواز

**بانگبێژ** (نا. فا)[بانگ/٤ + بێژ] بڕ: بانگدەر

**بانگدەر** (نا. فا)[بانگ/٤ + دەر] کەسێک کە وە سەر بانی مزگەوت دەکەوێ یا ئەوە کە بە بڵندگۆ بانگ دەدا و کاتی نوێژی رادەگەیەنێ، بانگوێژ، بانگبێژ. ئەم کەسە پتر مەلا یا مجێورە و لە پەناشەوە جارو بار خەڵکیش بانگ دەدەن. || **بانگدەری گاران:** (کن.) کەر، گوێدرێژ.

**بانگردێن** (نا. ل)[بان1/١ + گرد + ئێن] بڕ: باگردان

**بانگلێر** (نا. ل)[بان1/١ + گلێر (گلاندن)][ئەر] بڕ: باگردان

**بانگلێن** (نا. ل)[بان1/١ + گلێن (گلاندن)][ئەر] بڕ: باگردان

**بانگوش** (نا. فا)[بان1/١ + گوش (گوشین)] کەسێک کە بە پارە دەچێتە

سەر بان و باگردان دەگێڕێ، بانگێڕ.

**بانگوێژ** (نا. فا)[بانگ + وێژ] بڕ: بانگدەر

**بانگەشە** (نا. ل)[بانگ + ئەشە] ١ـ بانگ راهێشتنی چرچی و دوکاندار لە ئاوایی دا کاتێک کالاّ و شمەکی تازەیان بۆ دێ بۆ ئەوە کە خەڵک بزانن. ٢ـ تەبلیغات، پڕۆپاگەندە.

**تێبینی:** زەبیحی ئەم وشەی بردۆتەوە سەر بانگ و ئاش (قامووس ب ٢ ل ٥٧). بەلاّم من پێمـوایە ئەم وشـە لە بانگ و ئەشیا کەوتوە. چونکە بانگەکە بۆ کالاّیە و پڕۆپاگەندەش هەر بانگ و ناساندنی کالاّیە و چ پەیوەندی بە سەر ئاشەوە نیە.

**بانگەواز** (نا. ل)[بانگ + ئاواز] ١ـ جاڕ، بانگ، قاو. ٢ـ لێگێڕانەوە، دەعوەت. & بانگاواز. ~ **کردن:** ١ـ بانگ کردن، هەرا لێکردن، قاو کردن. ‹‹ دا بانگەوازی برایم بکە بەری ئاوەکەی بەردا. ٢ـ لێگێڕانەوە بۆ کۆڕێک، بانگێشتن. ‹‹ ئەرێ بۆ شایی بانگەوازیان کردووی؟ ٣ـ جاڕ کێشان، جاڕ دان. ‹‹ بانگەوازیان کردوە کەس سبەی دوکان نەکاتەوە.

**بانگێڕ** (نا. فا)[بان1/١ + گێڕ] بڕ: بانگوش

**بانماڵ** (نا. ل)[بان1 + ماڵ3] بڕ: بەفرماڵ

**بانۆک** (ئان. فا)[بان2 + ئۆک] کەسێک کە بێچووی نەبان دەخاتەوە بەر دایکی خۆی یا دەیخاتە بەر مەڕ و بزنێکی دیکە.

**بانوو** 1 (نا. ل)[بان1 + ئوو] بڕ: بان1 /٢

**بانوو** 2 (نا.)[پەھ: بانووک، بانۆک] ژنی پیاوی گەورە، ژنی خاوەن دەستەلاّت، خانم، خاتوون، یای. ‹‹ گا نە سەرپەنجەی بانووی بێ نیقاب / چون سوەیل رەونەق پەنجەی ئافتاب (مەولەوی ل ٤٢١). خەرامان حەیران حوسن زێباتەن / بانوان تەمام گشت جانفداتەن (وەلی دێوانە ل ٧٤).

**بانە** (نا. ل)[بان1 + ئە] ١ـ پارچە زەوییەکی کە جووتێر بەر لە کێلاّن یا تۆو پرژاندن دیاری دەکا هەتا سنووری کاری ئەو رۆژەی بزانێ، لات، گاوەخان. ٢ـ بەرزایی نێوان دوو دێراوی بێستان بۆ لێک جیا کردنەوە و هات و چۆ بە سەری دا، بەستە، پشت دێراو. ٣ـ [باک]

لەوەرگەی بەهاران بەر لە چوونە هەوار و کوێستان. ٤ـ مووی بەرگەدە، بانەگا.

**بانەگا** (نا. ل)[بان1/٣ + ئە + گا] [هەو ـ ئەر] ئەو شوێنەی کە تووکەبەری ژن یا پیاوی لێ دێتە دەر، بەرگەدە.

**بانەمەڕ** (نا. ل)[بانە + مەڕ1] ١ـ دووهەمین مانگی بەهار کە ٣١ ڕۆژە و بەرابەرە دەگەڵ ٢١ نیسان هەتا ٢١ مای، گولان. ٢ـ کاتێک کە مەڕداران بەرەو کوێستان وەڕێ دەکەون. ٣ـ هاوینەهەوار. ‌:: سەیدەوان لە سەر بانەمەڕی بوو، ئاگای لە هۆبە و هەواری بوو، بە سەر عێلی رادەگەیشت (گەنج ل ٢٧٢).

**بانەناو** (نا. ل)[بان1 + ئەناو][هەو ـ ئەر] ئاویە و کا و گەڵێک کە بۆ بان دەگیرێتەوە ، هەرەبان، گڵەبان، بان ئەنوو، بانەناوە. :: باڵاخانەی چەم دیوانەکەی تۆ / بانەناو وە گڵ ئاسانەکەی تۆ (مەولەوی ل ٥٣٩).

**تێبینی:** ئەناو (لە بانەناو) و ئەنوو (لە بان ئەنوو) لە چاوگی هەندو handu ـ ی ئەوێستایی و هەندووتەن handūtan ـ ی پەهلەویی و هەنوون ـ ی کوردیی بە مانای تێهەڵسوون و سواغ دان کەوتوە.

**بانەناوە** (نا. ل)[بان1 + ئەناوە] [هەو] بڕ: بانەناو

**بان ئەنوو** (نا. ل)[بان1 + ئەنوو] [هەو] بڕ: بانەناو

**بانی** (نا. ل)[بان1 + ئی] بڕ: بان1/٢

**بانیان** (گیا.)[؟] جۆرە دارێکی هەنجیرە کە لە لای هیندووکانە پیرۆزە، کاتێک لقە شۆڕەکانی بگەنە زەوی ڕەگ دادەکوتن و دەبنە دارێکی سەربەخۆی دیکە. لە شیلە و توێکڵی ئەم دارە بۆ دەرمان کەلک وەردەگرن، هەنجیری بەنگاڵی.

**بانیژە** (نا. ل)[بان1 + ئی + ژە (چە1)] ١ـ سەربانی چووکی پەنا بانێکی گەورە، بانجیلە، بانجێلە. ٢ـ سەربانی ماڵێکی نەوی کە بۆ ماڵێکی سەرخۆی بووبێتە هەیوان و حەوش، بانجیلە، بانجێلە. ٣ـ شوێنێکی تەختە لە نێو ژووری ئاش کە باراشی لە سەر ڕۆ دەکەن و دانەوێڵە بە وێدا دەچێتە نێو کونی بەرداشەکانەوە.

**بانین** (چا. م)[؟] وەبەر خستنەوەی بیچووی مەڕ و بزن لە دایکیان کە لێیان نەبان بوە یا ئەوە کە دایکیان نەماوە و دەیخەنە بەر یەکی دی، بانینەوە. :: بە

سەر دەبانێ، بە قوون نابانێ (مەتەڵ)

**بانینەوە** (چا. م)[بانین + ئەوە] بڕ: بانین

**باو**[1] (نا.) بڕ: باب1

**باو**[2] (ئان.)[؟] ڕێ و ڕەسم، داب و نەریت، جل و بەرگ و هەر شتێکی لە کۆمەڵ و ژیانی خەڵک توانیبێتی شوێن دابخا و ڕمێنی هەبێ یا بووبێ، باب2. ~ **بوون:** وە برەو کەوتن، ڕەسم بوون، باو سەندن. ؛؛ ئێستا چاویلکە لێدان بۆتە باو. ~ **سەندن:** بڕ: باو بوون. ~ **مان:** لە برەو نەکەوتنی ئەو شتانەی باون. ؛؛ لە کوردەواری دا پشتێند بەستن هێشتا هەر باوی ماوە. ~ **نەمان:** لە برەو کەوتنی ئەو شتانەی کە سەردەمێک باو بوون. ؛؛ کراسی کوودەری باوی نەماوە و ئێستا ئیدی ژنان دەبەری ناکەن. کۆیلەتی باوی نەماوە. || **باوی ڕۆژ:** هەر شتێکی ئیمرۆیی و مۆد و پەسندی بەرەی ئێستایی. ؛؛ عارەبی شامۆ چیرۆکێکی درێژی بە ناوی قەڵای دمدم بە ئوسلووبێکی نوێ و باوی ڕۆژ نووسیوە (دمدم ل ٧).

**باو**[3] (نا.)[؟] پاڵێک کە کەسێک بە جۆلانەیەوە دەنێ هەتا وە هات وچۆ بکەوێ، پاڵ. ~ **پێوەنان:** پاڵ پێوە نان بە جۆلانەوە یا کەسێک کە سواری جۆلانە بوە. ؛؛ دا وەرە باوێکم پێوە نێ!

**باو**[4] (پاشـ.)[هیک: بهامە ـ ئەو: بامە، بامیە ـ پەه: بام، بامییک. ناو: باو، بام] ١ـ بە دوای ڕەنگەوە دێ و مانای نزیک بوونی ئەو ڕەنگە دەدا لە ڕەنگی ئەسڵی، ئاماڵ ؛؛ شینباو، سووورباو، ڕەشباو. ٢ـ بە دوای ناوەوە دێ و مانای شێوە، وەک، ڕەنگ و ئاسا دەدا. ؛؛ گوڵباوە. ٣ـ (ئان.) گەورەتر لە چاو هاوچەشنی خۆی (دەگەڵ وشەی خۆش دێ). ؛؛ ئاسۆ و حەسۆ ئاواڵ دوانەن بەڵام باڵای ئاسۆ لە حەسۆ هەندێک باو خۆشترە. ئەو کراسە ئەگەر هەندێ باو خۆشتر با بۆ بەرم دەبوو.

**تێبینی:** وشەکانی هاوڕیشەی باو لە هیندی کۆن و ئەوێستا و پەهلەویی دا بە مانای ڕووناک و درەوشاوە بۆ ڕەنگ هاتوون. باو بە گشتی بە مانای ڕەنگێکی ڕوون و کراوەترە لە ڕەنگێکی تۆختر.

**باو**[5] (نا.) وشەیەکە لە باوباوێن دا دەکوترێ، دوای ئەوە کە سەری بە

منداڵەکە نیشان دا. (بڕ: باوباوێن)

**باوا** (نا.) بڕ: بابەگەورە.

**باواگەورە** (نا. ل)[باوا + گەورە] بڕ: بابەگەورە.

**باوان** (نا.) بڕ: بابان

**باوانی** (نا. ل)[باوان + ئی] بەر و گیازێک کە بووک لە ماڵە باوکیەوە دەیباتە ماڵی مێرد، گیاز.

**باوالێ** (شر.) بڕ: بابەلێ

**باوباوێن** (نا. ل)[باو5 +باو5 + ئێن] ١ـ جۆرێک کایە و خافڵاندنی منداڵی ساوایە. کەسی گەورە خۆ ی یا سەری لە پشت شتێک دەشارێتەوە و دوایی سەری دەر دەخا و دەڵێ باو! منداڵ بەم کارە پێکەنینی دێ و کابرا درێژە بەم کارەی دەدا. ٢ـ (کنـ.) حەز لێکردووی و چاو لێکردنی کچ لە کوڕان لە کەلێنی دەرگاوە، کاتێک کە کوڕە دەیبینێ سەری دەدزێتەوە.

**باوبژ** (نا. ل)[با1 + و + بژ] ١ـ بای بە تۆز و خۆڵەوە. ٢ـ (کنـ.) بای نێو زگ، تڕ. ～ **دەرکردن:** ١ـ (کنـ.) تڕ کەندن. ٢ـ (کنـ.) هەڵڕشتنی کوڵ و کۆ و گریمانەی دڵ. ⁂ هێندەم جنێو پێدا هەرچی باوبژ بوو لە دڵم دەرکرد.

**تێبینی:** تەنیا وشەیەک کە هاوڕیشە دەگەڵ بژ لەم وشەیە دا توانیم بیبینمەوە وشەی بژ (بەژ) لە فەرهەنگەکانی فارسی دایە کە بە مانای کڕیوە و زوقم هاتوە.

**باوچ** (نا.)[زا] بڕ: باب1

**باوڕ** (نا.)[باش] بڕ: باوەڕ

**باوش** (نا.)[باش] بڕ: باوەش

**باوشک** (نا.) بڕ: باوێشک

**باوک** (نا.) بڕ: باب1

**باوکانە** (ئاک. ل)[باوک + ئانە] بڕ: بابانە

**باوک برا** (ئان. ل)[باوک + برا] بڕ: براباب

**باوک مردگ** (نا. مف.)[باوک + مردگ][ئەر] بڕ: بابمردوو

**باوکە** (نا. ل)[باوک + ئە] بڕ: بابە

**باوکەڕۆ** (شر.)[باوکە + ڕۆ] بڕ: بابەڕۆ

**باوکەلێ** (شر.) بڕ: بابەلێ

**باوگ** (نا.)[باش] بڕ: باب

**باول** (نا.)[باک] بڕ: باهۆل

**باوە**[1] (نا. ل)[باو1 + ئە] بڕ: بابە/١ و ٢ و٣

**باوە**[2] (نا. ل)[با1 + وە (دەوە)][هەو] بڕ: بادەوە2

**باوەپیارە** (نا. ل)[باوە1 + پیار + ئە] [هەو ـ ئەر] شـــــووی دایک، زرباب، باوەپیاری، باڤەندە.

**تێبینی:** پیار لە [ئەو: پیتەر ـ هەخ: پیتەر] بە مانای باوک کەوتوە و لە زاراوەی زازایش دا (پی، پێر، پێرد) هەر بەم مانایە هاتوە.

**باوەت** (نا.) بڕ: بابەت

**باوەخولە** (نا. ل)[باو1 + ئە + خول + ئە] بڕ: باوەگێژە

**باوەخولێ** (نا. ل)[باو1 + ئە + خول + ئێ] بڕ: باوەگێژە

**باوەخوون** (نا. ل)[باو1 + ئە + خوون (خوان2)][ئەر] یەکەم بانگ کردنەوەی کچی شووکراو بۆ ماڵە باوکی بە میوانی.

**باوەر**[1] (نا.)[؟][ئەر] بەرزایی یا قووڵایی نێوان دوو کوتە زەوی کە ئەوان لێک جوێ دەکاتەوە، سنووری دوو کوتە زەوی، باهوو، بانە.

**باوەر**[2] (نا.)[باک ـ زا] بڕ: باوەڕ

**باوەرێن** (ئان. ل)[با 1+ وەرێن] هەر میوەیەکی کە با وەراندبێی.

**تێبینی:** میوەی باوەرێن پتر کرمێ و سستن بۆیە بە هێزی با دەکەون. ئەو میوانە خڕ دەکرێنەوە و بە جیا دەیفرۆشن و کەسی دەستکورت دەیکڕێ.

**باوەڕ** (نا.)[ئەو: ڤەر، ڤەرێە ـ پەهـ: ڤاڤەر. باک: باوەر ـ ناو: باوەڕ، بڕوا ـ باش: باوڕ ـ هەو: باوەڕ ـ زا: باوەر] ١ـ قەبووڵی قسە و مەسەلە و بەڵێنی کەسێک. ٢ـ ئیمان، بڕوا، ئاقیدە، یەقین. ~ **پێبوون:** ئیمان پێهەبوون، بە ڕاست زانین، باوەڕ پێهەبوون. ~ **پێکردن:** بە ڕاست زانینی قسە و کردەوەی کەسێک. :: مەلا هەرچی بڵێ باوەڕی پێدەکا. زەمانە وای لێهاتوە پیاو باوەڕ بە کوڕی خۆی ناکا. ~ **پێهەبوون:** بڕ: باوەڕ پێبوون. ~ **پێهێنان:** ئیمان بە کەسێک هێنان، بە ڕاست زانینی لەوەدوای قسە و کردەوەی کەسێک. :: دوای موعجزە خەڵک باوەڕیان پێهێنا. ~ **کردن:** ١ـ قەبووڵ کردن و ئیمان هەبوون بە قسە و



مەسەلەیەک. ⁂ باوەڕ دەکەم مرۆڤ لە ڕەگەزی مەیموون بێ!. ٢- پێ وابوون. ⁂ باوەڕ ناکەم ئەوشەو باران ببارێ. ~ **هەبوون:** ئیمان هەبوون، خاوەن بڕوا بوون، بڕوا بە کەسێک یا شتێک هەبوون.

**تێبینی:** ڤەر var لە ئەوێستا دا بە ڤەرەنە varanh هاتوە بە مانای باوەڕ پێکردن و ئیمان هێنان. وشەکانی باوەڕ و بڕوا هەر لەم ڕیشەن و ئەوانەش ئاقی کردنەوەیەکی ئیزەدی بوە بۆ ناسینەوە ڕاست لە درۆ. ڤەر دوو جۆر بوە ڤەری سار و ڤەری گەرم. لە ڤەری گەرم دا بۆ سەلماندنی بێتاوانی لە ئاگر و ڕۆنی داغ کەلکیان وەرگرتوە و لە ڤەری سارد دا لە ژار و سەم و شتی لەم بابەتە.

**باوەڕپێکراو** (نا. فـا)[لە: باوەڕ پێکردن] کەسێک کە لە هەموو بارێکەوە جێگای باوەڕە، جێ باوەڕ، ئەمین.

**باوەڕگومان** (نا. ل)[باوەڕ + گومان] کەسێک کە لە کارێک دا لە شک و یەقین دایە، دوودڵ.

**باوەڕگومانی** (نا. چا)[باوەڕ + گومان + ئی] لە نێوان شک و یەقین دا، دوودڵیی.

**باوەڕنامە** (نا. ل)[باوەڕ + نامە] کاغەزێک کە دوای تەواو کردنی فێرگە دەدرێ بەو کەسەی دەرسی تەواو کردوە، کارنامە.

**باوەڕیی** (حم.)[باوەڕ + ئیی] ئەنجامی باوەڕ کردن، متمانە، دڵنیایی. ~ **پێهەبوون:** باوەڕ پێکردن، لێ دڵنیا بوون، متمانە پێکردن. ⁂ زۆرم باوەڕیی بەو کابرایە نیە.

**باوەژن** (نا. ل)[باو1 + ئە + ژن][ئەر] ژنی دیکەی باوک کە دایکی ڕاستی منداڵەکان نەبێ، هەوێی دایک، زڕدایک، بابەژنی، باوەژەنی. // باوەپیارە، زڕباب.

**باوەژەنی** (نا. ل)[باو1 + ئە + ژەنی] [هەو] بڕ: باوەژن

**باوەش** (نا.)[پەه: بەڤیشن. لۆر: بالووش. ناو: باوەش ـ باش: باوش ـ هەو: باوەشی، واوەشی] ١- شوێنێکە دەکەوێتە نێوان سینگ و هەر دوو دەست کە بەرەو سینگ داکێشراوە. ٢- ڕادەیەک لە دەست کە دەکرێتەوە و شتێک بە خۆیەوە دەگرێ، بۆ هەڵگرتن. ⁂ باوەشێک پووڵی لە قومار بردەوە. باوشێک گەڵا و داری بۆ سووتاندن



هێنا. & ئامێز، هەمیز. ~ **پێدا کردن:** شتێک یا کەسێک دە باوەش گرتن. ؛؛ باوەشی بە منداڵەکە داگرت و ڕۆیشت. ~ **تێــوەراندن:** بە توندی دە باوەش گرتن، دە ئامێز گرتن. **دە ~ گرتن:** کەسێک لە روو بە روو بە خۆوە گرتن، دە هەمێز گرتن، دە ئامێز گرتن. ؛؛ یەکتریان دە باوەش گرت و تێر گریان. **لە ~ کردن:** شتێک هەڵگرتن و بە خۆوە نان، لە هەمێز گرتن. ؛؛ ئەو منداڵە لە باوەش کە با بڕۆین.

**تێبینی:** باوەش لە bavišn بەڤیشن ـ ی پەهلەویی بە مانای بوون، هەبوونە و هەم بەڤیشنییە بە مانای پێکەوە بوونی ژن و پیاوێک بە بێ زەماوەند یا نزیکی و دە باوەش یەک دا نوستنە.

**باوەشان** (نا. ل)[با1 + وەشان][باش] بڕ: باوەشێن

**باوەشک** (نا.)[سۆر] بڕ: باوێشک

**باوەشی** (نا.)[هەو] بڕ: باوەش

**باوەشین** (نا. ل)[با1 + وەشین][سۆر] بڕ: باوەشێن

**باوەشــینک** (نا. ل)[باوەشین + ک][باک] بڕ: باوەشێن

**باوەشــێن** (نا. ل)[با1 + وەشــێن (وەشاندن)][لۆر: باشۆ. باک: باوەشین، باوەشــینک ـ ناو: باوەشــێن، باوەشین ـ باش: باوەشــان ـ هەو: باوەشــێن] ئامرازێکە بە هێزی دەست کار دەکا و لە جــووڵانەوەی با پێک دێ. ئەو ئامــرازە دەتوانێ کوتە مقەوایەک بێ یا ئەوە کە تایبــەتی لە حــەســیــر و شــتی دیکە چندرابێ. بۆ خــۆ فــێنک کــردنەوە و گەشاندنەوەی ئاگر کەلکی لێوەردەگرن، بارۆشە، باژەن.

**باوەعەمرە** (نا. ل)[باو1 + ئە + عەمر + ئە] بڕ: بابەعەمرە

**باوەقوش** (گیانـ.)[باش] بڕ: بایەقوش

**باوەقــــۆرەت** (نا. ل)[باو1 + ئە + قۆرەت (عەر: قدرت)] بڕ: بابەعەمرە

**باوەگــۆ** (ئاک. ل)[باو + ئە + گــۆ] چوونە نێو قسەی یەکێکەوە بۆ بە ڕاست زانینی قســەکــەی یا ڕوون کــردنەوەی پتری.

**باوەگێــژە** (نا. ل)[باوە + گێــژ + ئە] یاری و کــایەی منداڵانە. دوو یا چەند کــەس دەســتیــان دەکــەنەوە و بە دەوری خۆیان دا دەخولێنەوە و دەڵێن: باوەگێژە گێــژم مەکــە، گێــژت ناکــەم. هەر کــەس

درەنگتر سەری دەکێژەوە هات و کەوت ئەو کەسە دەیباتەوە، باوەخولە، باوەخولێ، مامەگێژە، مامانەگێجی.

**باوەلێ** (نا. ل)[با 1 + وەل + ئێ] ١ـ (گیا.) بڕ: باویلکە. ٢ـ (کنـ.) سست، بێ بناغە. ٣ـ (کنـ.) پیری پەک کەوتوو کە هەر ئان لەوانەیە بمرێ. :: باوەلێ بایەکی بەسە. (**تێبینی:** ئەم کنایە لەوە کەوتوە کە باوەلێ لە سەر جێی خۆی هێند سستە بە پشوویەکی سووک، با دەیبا.)

**باوەڵ** 1 (ئان.)[؟] بزن و مەڕێک کە تووشی باوەڵی بوون. ~ **بوون:** گۆڕ بوونی کار و بەرخ بە هۆی نەخۆشی باوەڵییەوە.

**باوەل** 2 (نا.)[؟] جێگەی جل و جۆری سەفەر کە ئێستاکە پتر لە چەرم ساز دەکردرێ، چەمەدان، جانتا، باهۆڵ، باول.

**باوەڵی** (نا.)[باوەڵ 1 + ئی] نەخۆشییەکە لە ئاژەڵ دەدا گۆدیان دەکا و پەکی رۆیشتنیان دەخا.

**باوی** 1 (نا.)[سۆر] بڕ: بادام

**باوی** 2 (؟)[باک] کەسێک کە نەخۆشی باداری هەیە، بادار.

**باویشک** (نا.)[باک] بڕ: باوێشک

**باویلکە** (گیا.)[با 1 + ویل + کە] بەری دوایی گیایەکی خۆڕسکە و لە دەشت و نێو شیناوەرد شین دەبێ، گوڵەکەی زەردە و لە دوایی هەر ئەو گوڵە وەک تۆپێکی تووکنی لێدێ و پایزان لە گیایەکە دەبێتەوە و با دەیبا، باوەلێ، باویلێ، بایلکە، پشیلەپایزە، پەپوولەپایزە، پشیلۆکە، گەورەگلە، شەلەمینکەرە.

**باویلێ** (گیا.)[با 1 + ویل + ئێ] بڕ: باویلکە

**باوێشک** (نا.)[باک: باویشک، بیهنشک ـ ناو: باوێشک، باوشک، باوەشک ـ هەو: بایشکی] حاڵەتێکە کە لە بەر ماندووی و بێ خەوی خۆ بە خۆ زار دەکرێتەوە و هەوای هەڵدەمژێ، دەبانک، دەبەنک، وێژێ. ~ **دان:** زار کردنەوە بۆ باوێشک، دم داچەقاندن، باوێشک هاتن. ~ **هاتن:** بڕ: باوێشک دان.

**تێبینی:** لە فەرهەنگەکانی فارسی دا باسک (باسۆک)، پاسک (پاسۆک یا پاسەک)، پاشک (پاشەک) هەر بەم مانایە هاتوون.



**باهار** (نا.)[باک] بڕ: بەهار

**باهۆ** (نا.)[هیک: باهو ـ لار: باهێ ـ بیر: باهوو] بڕ: باسک/١. ⁂ لە شان و باهۆی خۆم رادی/ هەڵگرم ئالای ئازادی (تاریک و روون ل ١٩٠).

**باهۆدار** (ئان. فـا)[باهۆ + دار2] کەسی کەڵەگەتی بە شان و پیل، کەڵەگەتی بە تاقەت و بەهێز.

**باهۆز** (نا. ل)[با + هۆز (هێز)][باک] بایەکی بە هێز کە شت دەرفێنێ، گردەلوول، گێژەڵووکە.

**باهۆل** (نا.)[؟][باک] بڕ: باوەڵ2

**باهوو** (نا.)[بڕ: باسک] ١ـ شەهێنی تەرازوو. ٢ـ دوو دار کە لەولا و لەم لای دەرگا دەچەقێندرا، لاشیپانەی دەرگا، لاشیپان. ٣ـ بەرزایی نێوان دوو دیراوی بێستان، بانە، بەستە، پژدێراو. ٤ـ بستوو، ملە، یاڵ، کلکە. ٥ـ باسک، باهۆ. ⁂ حافز بۆ وە عەشق مەستان یا هوو / بپێچەش نە دەور باهووی بێ ئاهوو (مەولەوی ل ٢٣٢). ئەلا ئەی نازەنین ئاهوو، بە باهوو / دڵی سەییادی خۆت هێنایە لەرزە (نالی ل ٤٤٩). ساتۆر دەبان رەنگ شمشێری / دەست و باهوو حەملەی شێری (مان ل ٢٩٥).

**باهەنجیر** (گیا.)[با1 + هەنجیر] بڕ: باتسکە

**باهیڤ** (گیا.)[باک] بڕ: بادام

**باهێر** (نا. ئان.)[هەو ـ ئەر] بڕ: بەیار

**بایتار** (نا.)[زا] بڕ: بەیتار

**بایجان** (گیا.) بڕ: باینجان || **بایجانی رەش:** بڕ: باینجان/٢. **بایجانی سوور:** بڕ: باینجان/١.

**بایر** (نا.، ئان.) بڕ: بەیار

**بایسکڵ** (نا.)[ئین: bicycle] بڕ: دووچەرخە

**بایشکی** (نا.)[هەو] بڕ: باوێشک

**باینجان** (گیا.)[باک: باجان ـ ناو: باینجان، بایجان، بامجان ـ هەو: باینجانی ـ زا: باجان، بالجانە، بالدرجانە] ١ـ بەری گیایەکی یەکساڵەی دەسچێنە، وەک هارۆ درێژە، رەنگی بنەوش یا رەشە، نێوەکەی سپی و گۆشتنە و تۆمی وردی تێدایە، بە سوورکراوی دەیخۆن و دەچێشتیشی دەکە، بۆ ترشیات و مرەباش کەلکی لێوەردەگرن، Solanum esculent-um ناوی لاتینی ئەم گیایەیە، باینجانی رەش، بایجانی رەش. ٢ـ بەری گیایەکی

دەسچێنی یەکساڵەیە، ڕەنگی سوورە و ئاودارە، شکڵی پتر خڕە و هەرمێیشی هەیە، توێکڵی ناسکە و تومی وردی لە نێو دایە، تامی مزرە، بە رووتی دەخورێ، روبی لێدەگرترێ، ویشک دەکردرێ و دەچێشتی دەکەن، بە برژاویش دەگەڵ کەباب دەیخۆن. بە کاڵی و بە سووری لە ترشیات دەکردرێ، Solanum ly-copersicum ناوی لاتینی ئەم گیایەیە، تەماتە، تۆماتێز، باینجانی سوور، باجان سۆر، شامک، بامجان فەرەنگی، بایجانی سوور. || **باینجانی رەش:** بڕ: باینجان/١. **باینجانی سوور:** بڕ: باینجان/٢.

**باینجانە مارانە** (گیا.)[باینجان + ە + مار + ئانە] بەری گیایەکی خۆرسکە، وەک باینجانی سوور دەچێ بەڵام زۆر وردە، بە قەرا دەنکە نۆکێک دەبێ و ناخورێ.

**باینجانی** (ئان. ل)[باینجان + ی] ١- ڕەنگی وەک ڕەنگی باینجانی رەش، بنەوشی تۆخ. ٢- (گیا.)[هەو] بڕ: باینجان

**بایە** (نا.)[بڕ: بایەخ] بە قەرا، بە ئەندازەی نرخێک، بایی. ∷ بایە دوو تمەنم ماست دەیە. پێت وایە ئەو کراسە بایە چەندییە؟

**بایەخ** (نا.)[پەه: ڤەهاک. باک: بها، بوها ـ ناو: بایەخ، بایی، بایە، بەها ـ زا: ڤەیە] ١ـ نرخ و مەزندەی کاڵایەک بۆ فرۆش، بایی1، بەها، نرخ. ٢ـ ڕێز، قەدر، گرینگی. ~ **پێدان:** گرینگایەتی پێدان بە کەسێک یا شتێک. ∷ بایەخ بە قسەی ئەو گەوجە مەدە وەرە برۆین.

**بایەخدار** (ئان. ل)[بایەخ + دار2] هەر شتێکی بە نرخ، بە قیمەت.

**بایەف** (گیا.)[باک] بڕ: بادام

**بایەقوش** (گیان.)[تور: baykuş] جۆرێک کوندێکی بچووکە کە لە دەشت و لێرەوار دەژی و گیانلەبەر و مەلی بچووک راو دەکا، بەژنی نزیک ٣٥ سانت دەبێ و لە دوو سووچی سەری تاجی پەڕیی هەیە کە وەک گوێی پشیلە دەچێ. لە ڕوانگەی خورافاتەوە ئەم کوندە لە هەر کوێ بنیشێ دەبێتەوە وێرانە و بە گشتی بە مەلێکی شووم ناودێر کراوە، کوندەبوو، بادەقوش، باوەقوش.

**بایی**[1] (نا.)[پەه: بایەخ] ١ـ بەها، نرخ. ٢ـ ئەندازە، بەقەرا، رادە، بایە ∷ بایی توورێک تێناگا.



**بایی**[2] (ئان. ل)[با + یی] خۆ پێ زۆر، فیز، مەغروور. ~ **بوون:** بە هۆیەکەوە خۆ پێ زۆر بوون، لە خۆ دەرچوون. ⁂ لەوەتی بۆتە دوکتور بایی بوە لە بیری چۆتەوە کێ بوە. **لە خۆ ~ بوون:** لە خۆ دەرچوون، بایی بوون.

**باییلکە** (گیا.)[با + ئیلکە] بڕ: باویلکە

**ببڕ** (نا. فا، ئان. فا)[ب2 + بڕ] ١- ئامرازێک کە توانای برینی هەیە. ٢- کەسێکی بە بڕشت کە قسە یا کارەکەی بڕ دەکا. & بڕندە.

**ببڕای ببڕای** (ئاک. ل)[ببڕ + ئای + ببڕ + ئای] بە هیچ لەونێک، قەت قەت، هێچکات. ⁂ ببڕای ببڕای تازە پێ دەو ماڵەی نانێمەوە.

**بت** (نا.) بڕ: بوت

**بتپەرس** (نا. فا)[بت + پەرس] بڕ: بوتپەرەست

**بتپەرست** (نا. فا، ئان. فا)[بت + پەرست] بڕ: بوتپەرست

**بتپەرەستیی** (حم.)[بتپەرست + ئیی] بڕ: بوتپەرستیی

**بتخانە** (نا. ل)[بت + خانە] بڕ: بوتخانە

**بتر** (ئان.)[باک] بڕ: پتر

**بترپێر** (نا. ل، ئاک. ل)[بتر + پێر] [باک] بڕ: بەسرپێرێ

**بترپێرار** (نا. ل، ئاک. ل)[بتر + پێرار] [باک] بڕ: بەسرپێرار

**بتری** (نا.) بڕ: بوتری

**بتە** (نا.)[هەو] بڕ: بوت

**بتەرپەرەی** (نا. ل، ئاک. ل)[بتەر + پەرەی][زا] بڕ: بەسرپێرێ

**بتەرپێرار** (نا. ل، ئاک. ل)[بتەر + پێرار][زا] بڕ: بەسرپێرار

**بتەو** (ئان.)[باک] بڕ: پتەو

**بجگوڕ** (نا.)[سۆر] بڕ: بزگوڕ

**بچکۆل** (ئان. ل)[بچک + ئۆل] بڕ: بچووک

**بچکۆلانە** (ئان. ل)[بچکۆل + ئان + ئە] بڕ: بچووک

**بچکۆلە** (ئان. ل)[بچکۆل + ئە] بڕ: بچووک

**بچکۆڵ** (ئان. ل)[بچک + ئۆڵ] بڕ: بچووک

**بچکۆڵانە** (ئان . ل)[بچکۆڵ + ئان + ئە1] بڕ: بچووک

**بچکۆڵە** (ئان . ل)[بچکۆڵ + ئە] بڕ: بچووک

**بچکە** (ئان . ل)[بچک + ئە] بڕ: بچووک

**بچکەلانە** (ئان . ل)[بچکە + لان + ئە1] بڕ: بچووک

**بچکەڵە** (ئان . ل)[بچک + ئەڵە] بڕ: بچووک

**بچووک** (ئان . ل)[بچ + ئووک] ١ـ هەر چێک لە باری رادە و ئەندازە گەورە نەبێ. ٢ـ (مجـ.) سووک، بێقەدر، بێبایەخ. ٣ـ (مجـ.) نۆکەر، غولام. ⁂ بچووکتم! ٤ـ منداڵ. ⁂ بچووک و گەورە دەبێ دەرس بخوێن. & بچکۆل، بچکۆلانە، بچکۆلە، بچکۆڵ، بچکۆڵانە، بچکۆڵە، بچکە، بچکەلانە، بچکەڵە، چووک، بووچک، گچکە، گچکەڵانە، چکۆڵە، چکۆڵانە، چووکەڵە، چکۆلووکە، چکۆڵووکە، پچووک، پچکۆڵە، پچکۆلە، پچکۆڵانە، پچکۆلانە.

**بچووکیی** (حم.)[بچووک + ئی] ١ـ چووک بوون. ٢ـ منداڵەتی، کۆرپەیی، ساوایی. ٣ـ نۆکەریی، خزمەتکاریی.

**بخواز** (ئان. فا)[ب ؟ + خواز] کەسێکی داوای شت لە خەڵک دەکا، داواکار، خوازەڵۆک.

**بخورد** (نا.) بڕ: بخوور

**بخۆر** (ئان. فا)[ب2 + خۆر] ١ـ کەسێکی زۆر بخوا، زۆرخۆر، خۆرا. ٢ـ کەسێک کە مەیلی بۆ خواردن زۆرە، نەوسن، چڵێس.

**بخوور** (نا.)[عەر: بخور] ١ـ هەر شتێک کە بۆ بۆن خۆش کردنی ولات بە سەر پۆلوو ئاوری داکەن وەک ئەسپەندەر و عوود و عەنبەر و کوندر... ⁂ بۆنت بۆنی بخووریٚ مەمکت سێوی بەهەشتیٚ / نەخۆشەکی گرانم، کەوتووم لە سەر تەنیشتیٚ (سێسەد هۆنراوە ل ١٤). ٢ـ هەڵمی ئاوی گەرم یا دەرمانی کولاو کە کەسی نەخۆش لە بن پارچەیەک هەڵمەکەی هەڵدەمژێ. & بوخور، بخورد، بغورد، بوغرد. ~ **کردن:** ١ـ سووتاندنی مادەیەک بۆ بۆن خۆش کردن. ٢ـ هەڵمژینی دەرمانی کولاو لە بن پارچەیەک.

**بخووردان** (نا. ل)[بخوور + دان] دەفری تایبەتی بخوور تێ دا سووتاندن.

**بخووز** (ئان. فا)[ب2 + خووز

(خستن)] گایەک کە لە کاتی جووت کردن دا مان دەگرێ، خۆ بە زەوی دادەدا و بە هیچ کلۆجێک هەڵناستێتەوە، خەفۆک، بغووز.

**بدبەدە** (گیانـ.)[؟] مەلێکی کێویی چووکە، قەڵەو و کلک قوڵەیە، دان و جڕ و جانەوەری چووکە دەخوا، لە دەشت و مووچە و لێڕەوار دەژی و بۆ گۆشتەکەی و بۆ جوانی راوی دەکەن، Tetrao co-turnix ناوی لاتینی ئەم مەلەیە، کەرەواڵە، هەوێردە.

**بدە** (ئان. فا)[ب2 + دە] بڕ: بدەر. :: نان بدە

**بدەو** (ئان. فا)[ب2 + دەو] ئەسپی خۆشبەز ، بۆر و بدەو. :: دەڵێن: پیاو زۆر سوارچاک نەبێ، خۆی لە سەر پشتی راناگرێ؛ هێندە گورج و توند و تۆڵ و بدەوە (سەعید و میرسێوەدین ل ٢٤٨).

**بدەر** (ئان. فا)[ب2 + دەر] ١ـ کەسێک کە شتێک دەبەخشێ، بەخشێنەر. ٢ـ کەسێک کە گان دەدا، گاندەر. & بدە

**بدەو** (ئان. فا)[ب2 + دەو] ئەسپی خۆشبەز، برەو:: تەمەشای ئێختەرخانەی کاکان بکە، دەبەر بۆر و بدەوانم کەوتوە جل و هەوسار و توورە (مان ل ٢٥٤).

**برا**[1] (نا.)[هیک: بهراتەر ـ ئەو: براتەر ـ هەخ: براتەر ـ پەهـ: براتەر، برات، براد. لۆر: بێرار ـ فار: برادر ـ تات: بێرا. سوید: bror ـ ئین: brother ـ روس: brat. باک: برا ـ ناو: برا ـ باش: برا ـ هەو: برا، براڵە ـ زا: برا، برار، بەرا، بەرار] ١ـ پەیوەندی نێوان کوڕ دەگەڵ کوڕ و کچەکانی دایک و باب. ٢ـ (مجـ.) نیشانەی خۆشەویستی و رێز و نزیکایەتی دەگەڵ ئاواڵ یا کەسی دیکە. :: برای شیرینم ئەوە بۆ سەرێکمان لێنادەی؟ || **برای باب:** مام. **برای بابی:** پەیوەندی نێوان دوو یا چەند برا کە باوکیان یەکە بەڵام دائکیان جیایە، برای باوکی. **برای باوکی:** بڕ: برای بابی. **برای توونە:** بڕ: براتووتە. **برای حەق:** برا لە یەک دایک و یەک باب. // زڕبرا. **برای خوێنی:** دوو کوڕ کە بە برینی شوێنێکی دەست کەمێک خوێنیان ئاوێتەی یەک دەکەن و پەیوەندی برایەتی دەبەستن. **برای دایک (ی) و بابی (باوکی):** برا لە یەک دایک و باب. :: وەرە پێکەوە ببینە برای دایک و بابی هەتتا لێمان خەرا دەبێ ئەو دنیایە (مان ل ٤٨). **برای**

**دایکی:** پەیوەندی نێوان دوو یا چەند برا کە لە دایکێکن بەڵام باوکیان جیایە، دایک برا. براماک. **برای دینی:** پەیوەندی نێوان لاگرانی دین و ئاینێک دەگەڵ یەکتر، هاوئایین، هاودین. **برای شیری:** کوڕێک کە دەگەڵ کەسێکی دیکە شیری مەمکی دایکی یەکتریان خواردبێ، شیربرا.

**برا**$^{2}$ (ئام.) بڕ: بریا

**برا**$^{3}$(ئام.) بلا، با، دەبا، بهێڵە

**براباب** (نا. ل)[برا1 + باب1] پەیوەندی نێوان دوو کوڕ کە باوکیان یەکە بەڵام دایکیان جیایە، برای بابی، براباڤ، باوک برا.

**براباڤ** (نا. ل)[برا1 + باڤ][باک] بڕ: براباب

**برابەش** (نا. ل)[برا1 + بەش1] ١ـ شەریکایەتی لە شتێک دا بە نیوەیی، بارەبرا. ٢ـ دۆستایەتی زۆر نزیک کە وەک دوو برا بەشیان بە ماڵی یەکەوە بێ.

**براتووتە** (نا. ل)[برا1 + تووتە] چوارەمین ئەنگوستی دەست لە قامکە گەورەوە، ئەنگوستی پەنا پەنجە تووتە، ئەو قامکەی ئەنگوستیلەی تێدەکەن، برای تووتە.

**براتی** (حم.)[برا1 + تی][باک] بڕ: برایەتی

**برادەر** (نا.)[فار: برادر] دۆستی زۆر نزیک، ئاواڵ، براک.

**تێبینی:** برادەر لە زمانی فارسی دا دەقاودەق بە مانای برایە و کوردەکانی ئێران بە مانای دۆستی کوڕ بە کاری دەبەن. ئەم وشەیە لە ئێرانەوە پەڕیوەتە نێو کوردەکانی عێراق و ئامرازی نێرینەی لە دەست داوە و بۆتە دۆستی کچ!!

**برادەرایەتی** (حم.)[برادەر + ئایەتی] ئاواڵەتی، دۆستایەتی، براکەی، برادەریی.

**برادەریی** (حم.)[برادەر + ئیی] بڕ: برادەرایەتی

**برار** (نا.)[زا] بڕ: برا1

**برارزا** (نا. ل)[برار + زا][باش ـ هەو ـ زا] بڕ: برازا

**برارەی** (حم.)[برا1 + ئەی][زا] بڕ: برایەتی

**برازا** (نا. ل)[برا + زا][پەه: براتەرزات. باک: برازی ـ ناو: برازا،

بـرازاگ ـ بـاش: بـرارزا ـ هـەو: بـرازا، بـرارزا ـ زا: بـرازا، بـرارزا، بـەرازا] پەیوەندی نێـوان منداڵەکـانی برایـەک دەگەڵ خوشک و براکانی ئەو کەسە. ⁂ برا بوو بە برازا / کـار لە کـار ترازا (پەند ل ٨٢).

**برازازا** (نـا. ل)[برازا + زا] پەیوەندی نێوان نەوەکانی برایەک دەگەڵ خوشک و براکانی ئەو کەسە.

**برازاڤا** (نا. ل)[برا + زاڤـا][باک] بڕ: برازاوا

**برازاگ** (نا. ل)[برا1 + زاگ][ئەر] بڕ: برازا

**بـرازاوا** (نـا. ل)[بـرا1 + زاوا] بـرای زاوا یا ئـاوالّی نـزیکی زاوا کـە لە ڕۆژی گـواسـتنەوەی بووک پشـتـێندی بووک دەبەستێ و بووک دەگەیەنێتە مـاڵە زاوا، برازاڤا.

**برازی** (نـا. ل)[برا1 + زی][بـاک] بڕ: برازا

**بـــراژن** (نـــا. ل)[بـــرا1 + ژن] ١ـ پـەیوەندی نێـوان ژنی برایـەک دەگــەڵ خـــوشک وبراکـــانی دیکە، ژنی برا، براژەنی. ٢ـ (مجـ.) بۆ بـانگ کردنی ژنی ئاوالّ و دۆست و ناسیـاو تەنانەت بۆ ژنی بێگانەش.

**براژەنی** (نا. ل)[برا1 + ژەنی][هـەو] بڕ: براژن

**براشتن** (چا. م)[باک] بڕ: برژاندن

**براشـتی** (نا. مـفـ)[لە: براشـتن][باک] بڕ: برژاو. ⁂ گۆشتێ براشتی

**بـراک** (نـا. ل)[بـرا1 + ک][زا][پـەهـ: براتەک] ئاوالّ، دۆست، برادەر.

**براکـە** (نا. ل)[برا1 + کـە][قـوچ] بڕ: ئاوالّ زاوا

**براکـەی** (حم.)[براک + ئـەی][زا] بڕ: برادەرایەتی

**براله** (نا. ل)[برا + له] وشـەی دواندن و بانگ کردنی برا یا کەسێکی بێگانەی هاوتەمـەن یا چووکتـر بۆ ڕێز لێنان. ⁂ براله! ماڵە کاک هومێد لە کۆێیە؟

**براڵە** (نا. ل)[برا + ڵە][هەو] بڕ: برا.

**برامازگ** (گیا.)[برا1 + مـازگ][ئەر] پستـەی بێ کاکڵ و پووچی داری پسـتـە کـە لەبەر جـەوتێکی زۆر کـە هەیەتـی بۆ دەباغی کەلکی لێوەردەگرن.

**تێبینی:** فـەرهەنگی خـاڵ و هـەنبـانە بۆرینـە ئەم وشـــەیان لـە مــــەردووخ



وەرگــرتوە و بە بەرێکی دارمــازوویان داناوە لە حــاڵێک دا مــەردووخ هیچ ئیشارەیەکی بە دارمازوو نەکردوە و لە ئاستی مانای فارسییەکەی پزغند و پزغنج نووســـیـــوە و ئەوانەش بەری داریستەن و وشەکەش برای مازوویە یانی هاوتای مازوو لە کاری دەباغی دا.

**برامــاک** (نا. ل)[برا1 + ماک][باک] پەیوەندی نێوان دوو یا چەند برا کە لە دایکێکن بەڵام باوکیان جیایە، برای دایکی، دایک برا.

**براندی** (نا.)[ئین: brandy] جۆرێک ئارەقی ئینگلیسی.

**برانکارد** (نا.)[فــەر: brancard] تەختێکی پێچکەدارە کە نەخۆش و بریندار لە سەر درێژ دەکەن و بۆ نەخۆشخانە یا شوێنی دیکە رایدەگوێزن.

**براو** (ئان.)[سۆر] بڕ: بڵاو

**براوە**[1] (نا. ل)[براو + ئە][سۆر] بڕ: بڵاوە

**براوە**[2] (نا. فا)[لە: بردنەوە] کەسێک کە لە قومار،کێبەرکێ، یاری و کایە سەرکەوتبێ. // دۆڕاو.

**برایانە** (ئاک. ل)[برا1 + ئانە] وەکو برا، بە شێوەی برا. ⁘ پێکەوە دانیشتین و برایانە نێـــوان ناخـــۆشی و مەسەلەکانمان حەل کرد.

**برایەتی** (حم.)[برا1 + یەتی][پەه: براتییـــه. باک: برایەتی، براتی ـ ناو: برایەتی، برایی ـ زا: برارەی، برایەی] پەیوەندی نێـــوان دوو برا، برایی. ٢ـ پەیوەندی و بەین خۆشی نێوان ئاواڵ و دۆست یا پەیوەندی گەل و نەتەوەی جیا. ⁘ برایەتی کورد و هەرمەنی زۆر کۆنە.

**برایەی** (حم.)[برا1 + یەی][زا] بڕ: برایەتی

**برایی** (حم.)[برا1 + ئی] بڕ: برایەتی

**برج** (نا.) بڕ: بورج

**برچی** (ئان.)[باک] بڕ: برسی

**برچیتی** (حم.)[برچی + تی][باک] بڕ: برسیایەتی.

**برح** (ئان.)[سۆر] بڕ: بڵح

**بردن** (چا. م)[هیک: بهەر ـ ئەو: بەر ـ هەخ: بەر ـ پەه: بورتەن. تات: بەردەن، بێبەردەن ـ فار: بردن. باک: برن ـ ناو: بردن ـ باش: بردن ـ هەو: بەردەی ـ زا: باردش، بەردش] راگوێزتنەوەی شتێک یا



کەسێک دەگەڵ خۆ لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی دیکە. ؛؛ دز هات و ماڵەکەی برد. **بردنە رێ:** وەڕێ خستن، بەڕێوە بردن، ئەنجام دان. ؛؛ شاگردەکانم زۆر جوان کارکان دەبەنە رێ. **بردنە سەر:** ١ـ بە ئەنجام گەیاندنی کار یا مەسەلەیەک، تەواو کردن. ٢ـ داسەپاندنی قسە. ؛؛ ئاخری هەر قسەی خۆی بردە سەر. ٣ـ تێپەڕ کردن، گوزەراندن. ؛؛ هەتا مردن ژیانێکی ئارامیان پێکەوە بردە سەر.

**بردنەوە** (چا. م)[بردن + ئەوە] ١ـ گەڕاندنەوەی شتێکی کە وەرگیراوە بۆ شوێنی خۆی، برنەوە. ؛؛ ئەو کراسە بەرەوە و بیدەوە. ٢ـ سەرکەوتن لە یاری و کایە ، قومار و گرێو. ؛؛ تیمی فتباڵی ئاڵمان دوو بە یەک لە ئینگلستانی بردەوە. دوێ شەو دوو سەد تمەنم بردەوە. ٣ـ بردن. ؛؛ گۆشتێکی جوانی کڕی و بردیەوە ماڵێ.

**بردوو** (نا. مف.)[لە: بردن] ١ـ بردە، بردراو. ٢ـ بە ناوەوە دەلکێ و ئاوەڵناوی مەفعوولی ساز دەکا. ؛؛ ناوبردوو، سەرمابردوو، بابردوو

**بردە** (نا. مف.)[لە: بردن] ١ـ بردراو، بردوو. ٢ـ بە ناوەوە دەلکێ و ئاوەڵناوی مەفعوولی ساز دەکا. ؛؛ سەربردە، بابردەڵە.

**برژ** (ر.) رەگی برژان و برژاندن.

**برژان** (چا. ل)[بڕ: برژاندن] ١ـ ساز بوون و پێگەیشتنی گۆشت و خواردەمەنی لە سەر ئاگر یا پۆلووی گەشاوە، برژیان، برژین. ؛؛ رۆڵە بزانە فرووجەکان برژاون نەکا بسووتێن. ٢ـ (مج.) هەست بە گەرمایەکی زۆر کردن، پیشان. ؛؛ لەبەر ئەو خۆرەتاوە پیاو دەبرژێ.

**برژاندن** (چا. م)[ئێک: برەئیگ ـ پەه: بریشتەن. باک: براشتن ـ ناو: برژانن، برژاندن ـ باش: برژانن ـ هەو: برێژیای] ١ـ لە سەر ئاگر راگرتنی گۆشت و ئەو خواردەمەنییەی کە راستەوخۆ لە سەر ئاگر یا پۆلووی گەشاوە ساز دەکردرێ، کەباب کردن. ؛؛ ئەو گارگ و تەماتانە ببرژێنە.

**برژاندنەوە** (چا. م)[برژاندن + ئەوە] ١ـ راگرتنی خوێنی برینی قورس بە سووتووی پەڕوو یا دەرمانی سوور. ٢ـ لە سەرڕا لە سەر ئاگر راگرتنی شتێک کە باش نەبرژابێ. ؛؛ ئەو مریشکە خۆ هێشتا نەبرژاوە برۆ بیبرژێنەوە!

**برژانگ** (ئا.)[هیک: نیمیش ـ سان: نیمیشە ـ پەھ: مێژوک، مێچوک، مێچ، میچەک، مەزەگ، موزەک. باک: بژانگ، مژانگ، مژوولانک، مووژانک، مژگول، مشکولی ـ ناو: برژانگ، بژانگ، مژانگ، مژۆڵ، بژۆڵ، برژۆڵ ـ باش: برژانگ ـ هەو: برژانگ، بژانگ ـ زا: مجەو، مژا، مژە، موژە، بۆژە، بژە] ١ـ دوو ریزە مووی ورد کە لە سەر و بنی پێڵووی چاو روان. ٢ـ هەر کام لە موویەکانی سەر پێڵوو

**برژانن** (چا. م)[باش ـ ئەر] بڕ: برژاندن

**برژانەوە** (چا. ل)[برژان + ئەوە] ١ـ کزانەوەی برین و جێی سووتاو، برژیانەوە، برژینەوە. ٢ـ بڕ: برژاندنەوە

**برژاو** (نا. مفـ.)[لە: برژان] هەر شتێکی کە راستەوخۆ لە سەر ئاگر ساز بوە، برژیاگ، براشتی، برشتوو، برژیو، برژیاو. :: گۆشتی برژاو، کارگی برژاو، فرووجی برژاو.

**برژۆڵ** (ئا.) بڕ: برژانگ

**برژیاگ** (نا. مفـ)[لە: برژیان][ئەر] بڕ: برژاو

**برژیان** (چا. ل)[ئەر] بڕ: برژان

**برژیانەوە** (چا. ل)[برژیان + ئەوە] بڕ: برژانەوە

**برژیاو** (نا. مفـ.)[لە: برژیان] بڕ: برژاو

**برژین** (چا. ل) بڕ: برژان

**برژینەوە** (چا. ل)[لە: برژین] بڕ: برژانەوە

**برژیو** (نا. مفـ.)[لە: برژین] بڕ: برژاو

**برسی** (ئان.)[هەخ: ڤرسە، ڤرسنە ـ پەھ: گورسەک، گورسەگ، گوشنەک. باک: برچی ـ ناو: برسی ـ باش: برسی ـ زا: ڤێشان، ڤەیسان، ڤەیشان] ١ـ گیاندارێک کە گەدەی بەتاڵە و پێویستی بە خواردن هەیە، ئاورا.// تێر. ٢ـ کەسێک کە بە ماڵی دنیا تێر نەبێ، چاوبرسی. ٣ـ رەش و رووت، هەمیشە برسی. ~ **بوون:** ١ـ هەست بە برسیایەتی کردن و مەیلی خواردن هەبوون. ٢ـ چاوتێر نەبوون، مەیل بۆ پتر هەبوون. ~ **بوونەوە:** هەست بە برسیاەتی کردن دوای ماوەیەک تێپەڕین لە خواردن. ~ **راگرتن:** درەنگ خواردن دان بە کەسی برسی. **لە برسان مردن:** مردن لەبەر نەخواردن و خواردن پێنەگەیشتن.

**برسیـــایەتی** (حم.)[برسی + ئایەتی] حـاڵەتی برسی بوون، برسـێتی، برچیتی، برسـیـــەتی، ئـاورایی. ~ **چێــژتن:** ١ـ تاقــەتی برسـیــایەتی هێنان. ٢ـ پەی بە چلۆنـایـەتی کـــەسـی برسـی بـردن، بـە برسیایەتی زانین.

**برسیــەتی** (حم.)[برسی + ئەتی] بڕ: برسیایەتی

**برســێــتی** (حم.)[برسی + ئەتی] بڕ: برسیایەتی

**برش** (نا.)[؟] ١ـ کـۆمـەڵێک قـارچکی وردن، لە سەر نان و میوە و خواردەمەنی دیکە لـە بـەر مــــانـەوەیان پـەیدا دەبن، ڕەنگی ئـەو کـۆمـایە پـتـرشـینـە و ڕەنگی دیکەش بەخـۆوە دەگـرن. پێنێسلین لەم قــارچکانـە پێکدێ، کـــەڕوو، کـــەڕێ، گەڕگ، کەڕەکیفە، برشـوو، پرگ، پیرک. ٢ـ (مـجـ.) نارەحـەتی و پشـوو سـواری لەبەر تەنگی جێ و گەرما. ~ **هەڵاتن:** پشــوو ســوار بـوون و نـارەحــەت بـوون لە بەر کەمی جێگا و گەرما. ~ **هەڵێنان:** پـەیدا بـوونی برش و کـــەڕوو ، کـــەڕوو هەڵێنان. ⁘ ئەو نانانەت بۆ فـڕێ نەداون هەموو برشیان هەڵێناوە.

**برشــاویی** (ئان. ل)[برش + ئاویی2] حـاڵی هـەر شـتێکی کە برشی هەڵێنابێ، کەڕوویی.

**برشـــتـــوو** (نا. مـفـ.)[لە: برژان] بڕ: برژاو. ⁘ ... بە کـێردەکـەی دەیبـڕێ، لە ســـەر ئاوری دادەنـێ نیـــوەبرشـــتـــوو دەیخوارد. (مان ل ٣)

**برشــتـە** (نا. مـفـ.)[ لە: برژان][پەهـ: بریشـتـەک] نانێکی باش برژابێ، نانێکی فـەتیـر نەبێ و نێـوەڕاسـتـەکـەی گـوڵی کردبێ، بریشتە.

**برشوو** (نا. ل)[برش + ئوو] بڕ: برش

**برغوو** (نا.)[تور: burgu] ئامرازێکە وەک بزمار بەڵام پێچدار کە بۆ لێک توند کــردنی دو پارچە شت لە یەک کــەلکی لێـوەردەگـرن، بورغـوو، برغـوو، بورغی، برغی، جەڕ، ڤیدە، پێچ/٣.

**برغی** (نا.) بڕ: برغوو.

**برق**¹ (نا.)[عـەر: برق][باک] ١ـ بەرق، بەرەق، بریقـــە، شـــۆق ٢ـ برووسک. ٣ـ بەرق، کارەبا.

**برق**² (نا.)[؟][زا] بڕ: قەتران

**بـرق بـرووسـک** (نـا. ل)[بـرق1 + برووسک][باک] هـەورەتریشـــــقـــــە، برووسک.

**برقــە** (نا. ل)[برق1 + ئە] بریقــە، درەوشانەوە.

**بـرقـین** (چـا. ل)[لـە: بـرق1][بـاک] بریقانەوە، بریسکانەوە

**برک**[1] (نا.) ١ـ (ئا.) خـاڵیگە، کەلەکە. ⁂ خـۆ لە بیـریـان نەچوە خـالیـداغـا و سـابیـرخـان/ زێندین بریندار دەبوو، برینی بوو لە برکـان (سـەعـیـد و مـیرسـێوەدین ل ٨٤). ٢ـ ژان و ئێشی پشت و خـاڵیگە و نێوقـەدی مرۆڤ، ژان و برک. **~ پێـدا هاتن:** دەست پێکردنی ژان و برک وەک برووسکە بـە تیـغـەرەی پشـت دا. **~ کــردن:** تـووشـی ژان و ئازاری برک بوون. ⁂ برکم کـــردوە تیغەرەی پشتم زۆر دێشێ.

**تێبینی:** ریشـەی برک دەچێتەوە سـەر ڤێرێدکە vərədka ـ ی ئەوێستایی بە مانای وڵک و گورچیلە. (بڕ: گورچیلە)

**برک**[2] (نا.)[؟] قوڵەدار یا داردەستێک کـە بۆ بەر وەرانـدن یا بە شـتـێک دادان کـەلکی لێـوەردەگـرن، برکـە، کـوڵەبرک، پـلار، پـلـلار. **~ تێـگـرتـن:** بڕ: پـلار تێگرتن. **~ دان:** فڕێ دان، تووڕ دان.

**برکـاوێژ** (ئان. فا)[برک2 + ئاوێژ] ١ـ کـەسـێک کـە برک داوێ. ٢ـ (نا. ل) مـەودایەک کـە برک و پللاری هـاویشـتراو دیاری دەکـا. ⁂ برکـاوێژێک دوورتر مراوی بە سـەر سـەرمان دا دەفڕین.

**برکە** (نا. ل)[برک2 + ئە] بڕ: برک2

**برمووت** (نا. ل)[باک] بڕ: برنووتی

**برنج**[1] (گـیـا.)[ئەو: ئورڤـینج ـ پەھ: برینج، ڤرینج، ڤیرینج ـ سان: ڤرییهی. باک: برنج ـ ناو: برینـج، برنج ـ باش: بــرنج ـ هـــەو: بــرنج ـ زا: بــرنج] دانەوێڵەیەکی رەنگ سپییـە، لە زەوییەکی ئاوی زۆر بێ دەچێندرێ، لـە کـــۆنـەوە ناسـراوە و بۆ خواردن دەبێ (پلاو، کەتە، قـبـووڵی و...) و چەندین جـۆری هـەیە. (سـەدری، گردە، عەمبـەربۆ و ...). زێدی ئەم دانەوێڵە چین و ژاپۆن و هیندوستـان بوە و دوایی بە دونیـا دا بلاو بۆتـەوە، لە کــوردســتــان دەچێندرێ. بە شـــێـنی مەرەزەی پێدەڵێن، کە لە توێکڵ دایە پێی دەڵێن چەڵتووک. Oryza sativa ناوی لاتینی ئەم گـیـایەیە. ‖ **برنجی بەردەشۆر:** (کنـ.) خـــووســـان لە بـەر باران. ⁂ بارانێکی خـۆش دەباری حـەسـۆ کـە گـەیشـتـەوە وەک برنجی بـەردەشـۆری لێهاتبوو. **برنجی سەدری:** جۆرە برنجێکی باشە کە لە گیلان و مازندەران رەعەمەڵ

دێ. (ئەم برینجە یەکەم جار میرزائاغاخانی سەدری ئەعزەم لە هیندوستانەوە دەگەڵ خۆی هێناویەتی و لە مازندەران چاندوویەتی و بە ناوی خۆی ناوبانگی دەرکردوە.) **برنجی عەمبەربۆ:** جۆرە برنجێکی بۆنخۆش و باشە. **برنجی گردە:** جۆرێک برنجە کە لە برنجی ئاسایی چوکترە بەڵام قەڵەوترە و پتر بۆ ئاش و چێشتی شلە کەلکی لێوەردەگرن، گردە.

**برنج**[2] (نا.)[فەر: bronze] ئالیاژێکی ساز کراوە لە هەندێک کانی وەک: مس، قەڵایی و فافۆن، کە هەندێک دەفری نێو ماڵێی لێ ساز دەکردرێ وەک ئاونگ، کەشەف، سەماوەر و...، زەرد، زەردە، برنجە، تونج، پرینگۆک، برۆنز.

**برنجار** (نا. ل)[برنج1 + جار1] زەوییەک کە بۆ داچاندنی برنج تەخان کراوە، مەزرای برنج، برنجەجار، چەڵتووکجار، مەرەزە.

**برنجداس** (گیا.)[برنج1 + داس] [باش] بڕ: بۆمارانە

**برنجکوت** (نا. ل)[برنج1 + کوت (کوتان)] ١ـ ئامرازێکە بۆ کوتانەوەی برنج و لێکردنەوەی توێکڵی چەڵتووک، دنگ، دینگ. ٢ـ (ئان. فا.) کەسێک کە بە دینگ مەرەزە دەکوتێتەوە، دینگچی.

**برنجمشک** (گیا.)[پەه: فەرەنگموشک] گیایەکی خۆڕسکی بەلک و پۆیە لە تیرەی نەعنا، هەتا هەشتا سانت بەرز دەبێتەوە، گەڵاکانی بە شکڵی بەیزیی و گرنی گرنی و تاڵە، گوڵەکانی سپی و مەیلەوسوور و بۆنخۆشە، لەم گیایە بۆ دەرمان و چارەی گەلێک نەخۆشی کەلک وەردەگرن، Calament acinos و Melissa officinalis ناوی لاتینی ئەم گیایەن، ڕێحانەکێویلکە، چەدەنە.

**برنجۆک** (نا. ل)[برنج1 + ئۆک] ١ـ کوان و چڵکێکە کە لە سەر پەنجە و ژێر نینۆک پەیدا دەبێ و زۆر بە ژانە، موو. ٢ـ پارچە و قوماشێکی سپی و ناسک و کون کون کە ژنان بۆ دەسماڵ کەلکی لێوەردەگرن، تەنزیل، تۆڕ. ٣ـ (ئان.)[باک] شەفاف.

**برنجە** (نا.)[ئەر] بڕ: برنج2

**برنجەجار** (نا. ل)[برنج1 + ئە + جار1] بڕ: برنجار

**برنجی**[1] (ئان. ل)[برنج1 + ئی] ١ـ لە ڕەنگی برنج. پتر بۆ ڕەنگی ددان

دەکـــوترێ. ⁘ ددانەکـــانی برنجی و جوانن. ٢ـ هەر شتێک کە لە برنج ساز کرابێ. ⁘ نانی برنجی.

**برنجی**[2] (ئان. ل)[برنج2 + ئی] ١ـ هەر دەفر و ئامانێکی لە برنجە ساز کرابێ. ٢ـ رەنگی مەیلەو قاوەیی.

**برند** (ئان.)[سۆر] بڕ: بڵند

**برنگ** (نا.) بڕ: برینگ

**برنەوە** (چا. م)[برن + ئەوە] بڕ: بردنەوە

**بروە** (نا.)[باش ـ زا] بڕ: برۆ

**برویسکە** (نا.)[باش] بڕ: برووسک

**بروێ** (ئا.)[هەو] بڕ: برۆ

**برۆ** (ئا.)[ئەو: برڤـــەت ـ هـەخ: بروو ـ ســـــان: بروو. پەهـ: برووک، برووی، برەڤـــەد. لۆڕ: بێـرم ـ فـــار: ابرو. روس: برۆڤ. باک: بروو، برە، بری، برۆ ـ ناو: برۆ ـ باش: ئەوروو، بروە ـ هەو: برۆ، برۆی، بروێ، بروو ـ زا: بەرەو، برەو، برەوی، بروە، بوری، بورو] ریزە موویەکی کەم و کەوانی کە لە سەرەوەی چاو و لە بنەوەی نێوچاوان رواوە. ~ **تێکنان:** گنج بە نێو چاوان دان و هێنانە خواری برۆ لە بەر توورەیی و قـــەڵس بوون، برۆ وێکنان، نێـــوچاوان تێک نان. ~ **وێـکـنـان:** بڕ: برۆ تێکنان. ~ **هەڵتەکاندن:** تەکان دانی برۆکان بۆ لای سەرەوە لە کاتی وڵام دانەوە بە کەسێک کـــــە مـــــانـای نا ـ ی هەیە. ~ **لێهەڵتەکاندن:** ئیشارەیەکەی نهێنییە بە کەسێک کە سەبارەت بە مەبەستێک پرسیاری لێدەکرێ و کەسی سێهەم یا هاودەستەکەی برۆکانی بۆ لای سەرەوە تەکان دەدا و ماناکەی ئەوەیە کە بە نا یا بۆ ئەنجام نەدانی کارێک وڵام داتەوە. ~ **هەڵگرتن:** هەڵقەندنی هەندێک لە تووکی برۆ بۆ رێک و پێکی و جوانی کە ژنان دەیکەن. || **برۆی سێبەنگ:** برۆی تێکەڵاو، برۆی سێ تاق، برۆی سێوەنگ. **برۆی سێ تاق:** برۆیەکی پڕ کـــــە لە نێـــوانیـــان دا بۆشـــایی نەبێ، برۆی تێکەڵاو، برۆی سێبەنگ. **برۆی سێوەنگ:** بڕ: برۆی سێبەنگ. **برۆی قەڵەمی:** برۆی باریک.

**برۆنز** (نا.) بڕ: برنج2

**برۆی** (ئا.)[هەو] بڕ: برۆ

**بروو** (ئا.)[باک ـ هەو] بڕ: برۆ

**برووسک** (نا.)[ئەو: برازە ـ پەهـ: ڤیـر، ڤیـرۆزاک. سوید: blixt ـ باک:

برووسک، بریسک، بلێچ ـ ناو: برووسک، برووسکە، بریسک، بریسکە ـ باش: برویسکە، بڵاچە ـ هەو: برووسکە ـ زا: بلسک، ڤلسک، ڤرسک، ڤرسۆ] ١ـ رووناکییەک کە لە وێکەوتنی دوو هەور پەیدا دەبێ، رووناکی دوای گرمانی هەور لە ئاسمان، برق، چەغماغە، برق برووسک. ٢ـ ئێش و ئازارێک کە لە پڕ شوێنێکی لەش دادەگرێ و زوو دەبڕێتەوە. ~ **لێدان:** بڕ: برووسکاندن.

**برووسکاندن** (چا. ل)[لە: برووسک] ١ـ لێدانی بەرق و برووسک لە هەور، برووسکە دان، برووسک لێدان. ٢ـ برووسکە لێدان لە لەش.

**برووسکانەوە** (چا. ل)[برووسکان + ئەوە] بڕ: بریسکانەوە

**برووسکە** (نا. ل)[برووسک + ئە] ١ـ بڕ: برووسک. ٢ـ نامە یا هەواڵێک کە بە تەلەگراف بەڕێ دەکردرێ، تەلەگرام. ~ **دان:** بڕ: برووسکاندن.

**برووسکیان** (چا. ل)[ئەر] بڕ: بریسکانەوە

**برووسکین** (چا. ل) بڕ: بریسکانەوە

**برووسین** (چا. ل)[ باک] بڕ: بریسکانەوە.

**برووکە** (ئاک. ل)[بر (بڕین) + ئووکە] بڕێک، هێندێک، بەشێکی زۆر کەم لە شتێک. ⁂ دا برووکەیەکم تۆو دەیە!

**برووقە** (نا. ل)[برووق (عەر: بریق) + ئە] بڕ: بریسکە/٢.

**برووقەبرووق** (نا. ل)[برووقە + برووق] بڕ: بریسکەبریسک

**برە** (ئا.)[باک] بڕ: برۆ

**برەو** [1] (نا. فا)[ب2 + رەو] ١ـ رمێنی بازاڕ. ٢ـ باو، گەشە و نەشە. ٣ـ رێز، حورمەت. ٤ـ (ئان. فا) ئەسپی خۆشبەز، بدەو. ~ **پێدان:** ١ـ وە رمێن خستنی بازاڕ. ٢ـ باو کردنی شتێک، رەواج دان. ٣ـ رێز و حورمەت بە کەسێک دان. & وە برەو خستن. ~**سەندن:** ١ـ بازاڕ گەرم بوون، وەرمێن کەوتن. ٢ـ باو بوونی شتێک، وە رەواج کەوتن. ٣ـ بە قەدر و رێز بوونی کەسێک. & وە برەو کەوتن. **وە ~ خستن:** بڕ: برەو پێدان. **وە ~ کەوتن:** بڕ: برەو سەندن.

**برەو** [2] (ئا.)[زا] بڕ: برۆ

**برەوی** (ئا.)[زا] بڕ: برۆ

**بری** [1] (نا.) ئەم وشە بە تەنیا نایە و

هەمیشە دەگەڵ ـ لە ـ دێ (لە بری) بە مانی، لەجیات، بات. ‌:: لەبری کایە کردن برۆ خەریکی دەرس و دەورەکانت بە!

**تێبینی:** بری هاوریشەیە دەگەڵ برای brāy ئەوێستایی و برێه breh ـ ی پازەند بە مانای بەش.

**بری**[2](ئا.)[باک] بڕ: برۆ

**بری**[3] (ئام.) بڕ: بریا

**بریا** (ئام.)[ناو: بریا، بری، برا] وشەیەکە لە کاتی داوا کردن وەک ئاوات و ئارەزووی بۆ گەیشتنی دەکوترێ، خۆزگە، خۆزی، خۆزیا، کاش، کاشکە، کاشکی، وەشڵە، وەشڵێ. :: بریا نەمردبام و جارێکی دیکە دایکم دیبا.

**بریان** (ئان.) بڕ: برژاو

**بریانی** (نا. ل)[بریان + ئی] ١ـ بەرخ یا کاوڕی سەربڕاو و کوت کوت کراو کە دە گیپەکەی خۆی دەنێن و لە تەندووری دەخەن هەتا بپیشێ. ٢ـ قەل، مریشک، یا مەڕ و بەرخ کە نێو زگیان پڕ دەکەن لە برینج و بادام و کشمیش و بەهارات و لە تەندووری دەخەن. ٣ـ شۆربای نێو تەندوور. ٤ـ چەوەندەری پیشاوی نێو تەندوور.

**بریتی** (نا. ل)[بری1 + ئیتی] ١ـ پێکهاتوو. :: ئاوایی خۆشەکانی ناوچە بریتین لە ... ٢ـ لە بری، لە جیاتی، لە باتی.

**بریسک** (نا.) بڕ: برووسک

**بریسکانەوە** (چا. ل)[بریسکان + ئەوە] درەوەشانەوەی هەر شتێک کە نوور بداتەوە، برقین، برووسکانەوە، برووسین، بریسکین، بریسکیان، برووسکیان، برووسکین، بریقانەوە، بریقە دانەوە، بریقە دان، بریقە هاتن، بریسکە دان، بریسکە دانەوە

**بریسکە** (نا. ل)[بریسک + ئە] ١ـ بڕ: برووسک ٢ـ درەوشانەوەی خێراخێرای ئەو شتانەی نوور و شۆق دەدەنەوە، برووقە، بریقە. **~ دان:** بڕ: بریسکانەوە. **~ دانەوە:** بڕ: بریسکانەوە

**بریسکەبریسک** (نا. ل)[بریسکە + بریسک] درەوشانەوەی پەیتاپەیتا، برووقەبرووق، بریقەبریق

**بریسکین** (چا. ل)[لە: بریسک][باک] بڕ: بریسکانەوە

**بریشتە** (نا. مف.)[لە: برژان] بڕ: برشتە

**بریقـانەوە** (چا. ل)[لە: بریقـە] بڕ: بریسکانەوە. ⁛ سەر تا پا خشڵی زیوی وای پێـــوە / ئەڕوا و هـاڕەی دێ و ئەبریقێتەوە (گۆران ل ١٣٨).

**بریقــە** (نا. ل)[عــەر: بریق + ئە] بڕ: بـریسکە. **~ دان:** بڕ: بـریسـکانـەوە، **~ دانـەوە:** بـڕ: بـریسـکانـەوە. **~ هاتن:** بڕ: بریسکانەوە

**بریقەبریق** (نا. ل)[بریقە + بریق] بڕ: برووسکەبرووسک

**بریقـەدار** (ئان. فـا)[بریقـە + دار2] هـەر شـــتـــێکی بـریسکـەی هـەبێ و بدرەوشێتەوە.

**بریلیـــان** (نا.)[فـــەر: brillant] ئەڵماسی داتاشراو و ڕێک و پێک کراو.

**برین** (نا.)[لە: بڕین][باک: برین ـ ناو: برین ـ هەو: بـرین ـ زا: برین] ١ـ شـوێنی بڕاوی لەش بـە هەر شـتـێکی بڕنـدە یا بە هۆی کەوتن خوێنی لێهاتبێتـە دەر، زام، ریش، زەخـم، زیـەم. ٢ـ بڕ: کـــوان. ٣ـ (مـجـ.) ئازاری دەروون، خـەم، خـەفـەت. **~ خۆش بوونەوە:** چاک بوونەوە برین، ســارێژ بـوونـەوەی بـرین، بـرین ســارێژ بـوونـەوە. **~ ســـارێژ بـوونـەوە:** چاک بـوونـەوەی بـرین. **~ ســارێژ کـــردن:** دەرمـان کـردن و چاک کـردنـەوەی برین. **~ کزانەوە:** بڕ: برین کـولانەوە. **~ کـزاندنەوە:** بڕ: بـرین کـولاندنەوە. **~ کــولانـەوە:** ١ـ ئازار بـە برین گـەیشتن و ژان کـردنـی برین. ٢ـ وە بـیـر هـاتـنەوەی دەرد و خـەفـەت. & برین کزانەوە. **~ کــولاندنەوە:** ئازار بـە برینی کـەسـێک گـەیاندن. ٢ـ خـەم و خـەفـەتێکی کۆن وە بیـــر کـــەســـێک هـێنـانەوە. & بـرین کـــزاندنـەوە. **~ لێکردن:** بڕ: برینـدار کـــردن. ⁛ بـە چەقـــۆ دوو سێ برینی قـــورسـم لێکرد. **~ وەبن دان:** چاک بوونـەوەی رواڵـەتـی برین بـەڵام لـە بـنـەوە چڵک کردن و سـەر هەڵدانەوەی، تەشـەنا بوونەوە.

**برین پێچ** (نـا. فـــا)[بـرین + پێچ (پێچانەوە)] کەسێک کە لە بەر دەستی دوکتور کار دەکا و برینی کەسی بریندار خاوێن دەکاتەوە و دەیبەستێ.

**برینج** (گیا.)[موک] بڕ: برنج

**برینج پاڵێـو** (نا. ل)[برینـج + پاڵێـو] [موک] سەلە یا سـوزمەی پاڵاوتنی برینج لە کاری ساز کردنـی پڵاو دا، نانەشـان، پڵاوپالا، پڵاوپاڵێو.

**بـریـنـدار** (ئان. ل)[بـرین + دار2] ١ـ

کەسێک کە لەشی بە ئامرازێک یا بە هۆیەک خوێنی لێهاتوە و برینی وێ کەوتوە، زامدار، زامار. ٣ـ شوێنی داڕووشان و خەت لە سەر کەرەسە و ئامرازی بێ گیان وەک میز، تلویزیون و ... وەها کە شوێنەکەی بمێنێتەوە. **~ بوون:** ١ـ پەیدا بوونی برین لە لەش. ٢ـ داڕووشان و خەت وێکەوتنی سەر ئامراز و کەرەسە. ٣ـ ئازاری مەعنەوی پێگەیشتن، دڵبریندار بوون. **~ کردن:** ١ـ برین لەکەسێک دان بە هەر کار و ئامرازێک، برین لێکردن. ٢ـ شوێن وێ خستن لە کەرەسەی بێ گیان. :: منداڵ بەو چەقۆیە هەموو ئەو میزەیان بریندار کردوە. ٣ـ ئازاری مەعنەوی لە کەسێک دان، دڵبریندار کردن، ئازاراندن. :: قسەکانت زۆریان بریندار کردم.

**برینداریی** (حم.)[بریندار + ئیی] ئاکامی بریندار بوون.

**برینگ**[1] (نا. ل)[بر (بر لە: بڕین) + ئینگ][باک: بڕنگ، هەڤرنگ ـ ناو: برینگ، برنگ، هەورینگ، هەورنگ ـ هەو: هەورێنگی ـ زا: ئاڤرینگ، ئاڤرنگ] ئامرازی بڕینەوەی موو و خووری بزن و مەڕ، جۆرێک مقەستی گەورەیە کە دمەکانی پانتر و گەورەترە و دەسکەکەی وەک مقەست ڕاست نیە و لە دمەکەی بڵندترە، دوێرد، دووکارد، جەو، جەور، جەهرێ. **بە ~ ئەنگووتن:** باش دە بڕینەوە نەهاتنی خووری و ئەویش لە بەر نەخۆشییەکە کە لە کاتی بڕینەوەی خووری دا تووشی مەڕ دێ، بە برینگ کەوتن، بە برینگ هەڵگەڕان. **بە ~ کەوتن:** بڕ: بە برینگ ئەنگووتن. **بە ~ هەڵگەڕان:** بڕ: بە برینگ ئەنگووتن.

**برینگ**[2] (ئان.)[؟] دەگەڵ وشەی ئیشک (ویشک، وشک) دێ و داگرتنێکی پتر لە سەر ئیشک دەکا، زۆر ئیشک. :: بە سارایەکی ئیشک و برینگ دا دەڕۆیشتین. چێشتەکەت زۆر ئیشک و برینگە هەر زەڕڕەیەک چەورایی نیە.

**برینگچی** (ئان. فا)[برینگ1 + چی] بڕ: برینگەوان

**برینگەوان** (ئان. فا)[برینگ1 + ئە + وان] کەسێک کە بە برینگ خوری مەڕ و بزن دەبڕێتەوە، برینگچی.

**بریوبریو** (نا. د)[بریو + بریو] هات و هەرا، هەرا، قاوەقاوەی بەرز. :: ئەوە لە کاروانیەکان دوو پیاوی گورج و گۆڵ ڕۆیین تا خەبەر بدەن بە وڵاتی مەرگەوەڕ. بریوبریو پەیدا بوو! پێشیان پێگرت



(سەعید و میرسێوەدین ل ٧٢).

**برێسە** (نا.)[سۆر] بڕ: بڵێسە

**برێشکە** (نا. ل)[برێش (برێژ = برژاندن) + کە] ١ـ دەنکە گەنمی لە سەر سێڵ بۆ دراو. ٢ـ هەر دانێکی دیکەی بۆدراو. :: برێشکەی جۆ ئەخوا، بە سابوون دەست ئەشوا (پەند ل ٨٣). & برێشگە.

**تێبینی:** بریشتەک brištak لە پەهلەویی دا بە مانای برژاو لە چاوگی بریشتەن brištan هەر یەک سەرچاوەیان هەیە.

**برێشگە** (نا. ل)[برێش (برێژ = برژاندن) + گە] بڕ: برێشکە

**بڕ** (نا.)[لە: بڕین] رەگی بڕین ـ ە و ئەو مانایانە دەدا. ١ـ کەمێک، ئەندازەیەکی کەم. :: برێکم نان خوارد. ٢ـ مەودایەکی کەم. :: برێکمان ماوە دەگەینێ. ٣ـ زەمانێکی کەم، تاوێک. :: برێک درێژ بە و سەرخەوێکی بشکێنە. ٤ـ ئەو مەودایەی چاو دەتوانێ ببینێ، هەتەر. ٥ـ ساڵ و تەمەن بۆ کەر و ئەسپ و یەستر هەتا سێ ساڵان و لە دوایی ساڵ بە کار دێن :: یەکبڕ، دوو بڕ، سێ بڕ. ٦ـ مەودا، ئیزن، ماوە. ٧ـ پاشگرە بە ناوەوە دەلکێ و مانای بڕێنەر دەدا. :: دەسبڕ، سەربڕ. **~ بوون:** ١ـ هەڵبران، جیا بوونەوە.٢ـ ئاوەکی بوون، هەڵبڕان لە ران و مێگەل. **~ پێدان:** ١ـ هەڵبڕین، لەت کردن. ٢ـ چوونە نێو قسەی یەکی دیکەوە. **~ دان:** ١ـ جوێ کردنەوە، دابڕین. :: ئالێرەوە دیوارەکە بڕ دەدەین. ٢ـ ماوە دان، ئیزن دان. :: خۆ بڕ نادا ئێمەش دوو قسان بکەین! ٣ـ بوار دان. :: ئەو چۆمە بڕ نادا. **~ شکاندن:** تینوایەتی شکان، تێراو بوون. :: هەندێکی دیکەم ئاو دەیە بەوەندە ئاوە برم ناشکێ! **~ کردن:** ١ـ تاقەت و توانایی بڕینی رێگا لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی دیکە. :: ئەو منداڵە بڕ ناکا هەم هەموو رێگایە بە پێیان بێ. ٢ـ مەودای بینینی چاو، هەتەر کردن. :: جۆبارە، لالەزارە، هەتا چاوی بڕ دەکا / مەحوی بەهەشتی بۆ چیە، چ بکا لە ئاو و باغ (مەحوی ل ١٧٣). ٣ـ توانایی پەڕینەوە لە چۆم و ئاوی خوڕ. :: ئەو چۆمە هەستایە و کەس ناتوانێ لێی بڕ کا! ٤ـ بە برشت بوون، بە حوکم بوون. :: قسەکانم چ بڕ ناکەن و منداڵەنم هەر گوێم نادەنێ. **~ هەبوون:** بەبڕ بوون، برشت هەبوون، بەحوکم بوون.

**براده** (نا. ل)[عەر: برادة] وردەی دوای بڕبەند لێدان و کوتان و بڕینەوەی ئاسن و مەعدەنی دیکە، بڕە/٥.

**براڵوێ** (گیا.)[هەو] بڕ: بەلاڵووک

**براڵوو** (گیا.)[هەو] بڕ: بەلاڵووک

**بڕان** (چا. ل)[لە: بڕین] ١ـ تەواو بوون، لێبڕان. ៖ هەتیوی برسی چڵمی هەڵدەلووشێ / کوڕی شێخ ئارەقی نابڕێ لە شووشێ (ناڵەی جودایی ل ٨٢). ٢ـ هەڵبڕان، هەڵپچڕان.

**بڕانەوە** (چا. ل)[بڕان + ئەوە] ١ـ دوایی هاتن، تەواو بوون، کۆتایی پێ هاتن. ៖ شەڕی ژن و مێرد زوو دەبڕێتەوە. ٢ـ ساغ بوونەوە لە سەر مەسەلە یا قسەیەک. ٣ـ دیاری کردنی مووچە و حەقدەست.

**بڕاو** (نا. مف.)[لە: بڕان] ١ـ لەتکراو، کوتکراو. ٢ـ برین لێکراو بە ئامرازی تیژ.

**بڕبڕ** (نا. ل)[بڕ + بڕ] ١ـ لەت و پەت کراو، زۆر بڕاو. ٢ـ کەم کەم، نەختەنەختە

**بڕبڕاگە** (ئا.)[بڕبڕە + یاگە (جێگە)] بڕ: بڕبڕە

**بڕبڕە** (نا. ل)[بڕ + بڕ + ئە] ١ـ (ئا.) ریزی ئێسکێک کە کەوتوونە سەر یەک و پشتی هەموو گوانداران قایم راگرتوە و نوخاعی لە نێو خۆی دا پاراستوە. لە مرۆڤ دا بڕبڕە لە ٣٣ ئێسک پێک هاتوە کە لە ملەوە دەست پێدەکا و بە کلێنچکە دوای دێ. بڕبڕاگە، تێغەرە، تیغەرەی پشت، تیرەغە، مۆغەرە. بڕبڕەی پشت ٢ـ (کنـ.) خزمی زۆر نزیک، پشت و پەنا. ‖ **بڕبڕەی پشت:** ١ـ بڕبڕە. ٢ـ (کنـ.) خزمی زۆر نزیک.

**بڕبەن** (نا. ل)[بڕ + بەن][هەو ـ ئەر] بڕ: بڕبەند

**بڕبەند** (نا. ل)[بڕ + بەند] ئامرازێکی پۆڵای کونجرکونجرە، بۆ لێک و لووس کردنی لێواری شوێنی بردراو کەلکی لێوەردەگرن، چەند جۆری هەیە (چوارپاڵوو، سێ سوو، گردەبڕ، پشتەماسی، کارتیخ، چێوەسان) و هەر کام بۆ کاری تایبەتی دە کار دەکردرێن، بڕبەن، مووڕەد، سوان، مەبرەد، مڤرەد، کارتیخ، بڕبەنگ.

**بڕبەنگ** (نا. ل)[بڕ + بەنگ] بڕ: بڕبەند

**بڕەک** (نا.)[بڕ + ئەک] بەرازی نێر،

گۆڵە بەراز، یەکانە، برەک. // مالۆس

**برس** (نا. چا)[ئەر] بڕ: بڕست

**بڕست** (نا. چا)[لە: بڕین] رادە و ئەندازەی هێزی کەسێک،تاقەت، هێز و توانا، وزە، بڕس. ~ **لێبڕین:** لە توانایی خستن، هێز لە لەش بڕین. ⁂ لە لایەک نەخۆشی و لە لایەک بێ پارەیی بڕستیان لێبڕیوم.

**بڕشت** (نا. چا)[بڕ + شت2][لە: بڕین] ١ـ کوتە پارچە و سەر مقەستی جلدروو کە لە پاش بڕینی پارچە دەمێنێتەوە و فڕێ دەدرێ. ٢ـ تیزماڵک و کوتە کاغەز کە دوای جزووبەند کردن و لێک و لووس کردنی کتێب و دەفتەر دەمێنێتەوە و فڕێ دەدرێ. ٣ـ رادە و ئەندازە و توانایی بەر هێنانی دان و دانەوێڵە. ⁂ گەنمی چاک یەک و دە بڕشتی دەبێ (یانی دە بەرابەر بەرهەم دێنێ). پێشتر لەبەر کەلک وەرنەگرتن لە کوود گەنم وەک ئێستا بڕشتی نەبوو. ٤ـ توانایی و بڕی کەسێک بۆ ئەنجام دانی کارێک. ⁂ پیاوێکی یەکجار بە بڕشتە. ~ **لێدان:** بڕینی پارچە و کاغەز و شتی لەم بابەتە. **بە ~ بوون:** ١ـ دەغڵ و دانێکی کە حاسڵیان زۆر بێ. ٢ـ توانا بوون بۆ راپەڕاندنی کارێک.

**برکە** (نا. ل)[بر + ک + ئە] ١ـ ساقەت و بنجی هەندێک گیا کە ناتوانن بەرز بنەوە و لە دەوری خۆیان بڵاو دەبنەوە وەک: هاروی، ترێزوو، کوولەکە، شووتی، گرکە، کاڵەک و ... ٢ـ بەشێک لە ئاژەڵ، کەرک، کەرت.

**برکێنە** (نا. ل)[برکە + ئێنە][موک] یاریی و گرێوێکە کە دوو یا چەند کەس دەیکەن بە بەری برکەیی وەک کاڵەک یا شووتی کە کامەیان وەهای دەبڕێ کە دوو لەتەکە بەرابەر و هاوسەنگ بن.

**برگە** (نا. ل)[بر + گە] ١ـ هەر یەک لە سی و سێ ئێسکی تیغەرەی پشت، مۆرتخە، موورگە، ترمختە، مرۆخە. ٢ـ پارچەیەکی سەربەخۆ لە قانوون، مەقالە و هەر شتێکی نووسراوەی دیکە، فەقەرە، مادده. ٣ـ بەشێک لە وشە، ئەوەندە کە بە جارێک بە ئاهەنگ دەکوترێ، هیجا.

**بڕندە** (نا. فا، ئان. فا)[لە: بڕین] بڕ: ببڕ

**بڕنگ** (نا. ل)[بڕ + نگ][باک] بڕ: برینگ1

**برنۆ** (نا.)[؟] جۆرێک تفەنگی شەڕ

کــــردنه، کــــورت و درێژی هـەیە، پێنج فــیــشـــەک دەخــوا و هەر جــارەی کـــە تەقـێندرا دەبێ گەلەنگەدەن بکێـشرێ و فیشەکی دەبەر نێنەوە.

**برنـووتی** (نا. ل)[تور: burun otu (گـیـای لووت)] تۆزێکی رەنگ مـۆرە لە تەماکوو و داو و دەرمـانـی بۆنخۆش، کە وەبەر لـووت دەدرێ و مـرۆڤ وە پشـــمین دەخـا و هـەندێکیش سـەرخـۆشـی دێنێ، برمووت، بورونتی. (عەر: انفیة)

**بـروا** (نـا.)[بـر: بـاوەڕ] ١ـ بـاوەڕ. ٢ـ ڕەوا، بـەرایـی. **〜 پـێـکـردن:** بـاوەڕ پـێـکـردن، بـڕوا پـێ هـەبـوون. **〜 پێـهـەبوون:** بڕ: بڕوا پێکردن. **〜 دان:** ڕەوا بیـنـین، بەرایی دان. ∷ هـەر چـەند دەکەم دڵم بڕوا نادا لە دایک و باوکم جیا بمەوە. **〜 کردن:** باوەڕ کردن.

**بروانامــە** (نا. ل)[بـڕوا + نامـــە] بڕ: باوەڕنامە

**بروایی** (حم.)[بڕوا + یی] باوەڕیی

**بروێش** (نا.)[پەه: فـرووشـــەک. ناو: برۆش، بروێش، برووش، پەڕش، پەڕشت، پەڕشـە ـ هـەو: وڵۆشـە] ١ـ دانەوێڵـەیەکی ئـامــــاڵ ســــــوورە، لـە برنج دەچێ، لە کوردسـتـان دادەچێندرێ، وەک برنج پڵاو و قـەبـووڵی پێ ســاز دەکـەن و جگە لەوە خواردنی دیکەشی لێ ساز دەکەن و مرۆ تێر دەکا. ٢ـ گەنمی کوتراو یا لە دەستار دراو بەڵام نەک بـبـێـتـە ئارد، کـە هـەندێک خـواردنی کـوردیـی لێ سـاز دەکـەن. ٣ـ وردە ســــاوار. ٤ـ بڕ: بروێشـــــێن. ٥ـ جۆرێک بەفری وردی ڕەقە، بەفری نێوان تەرزە و بەفـر، تـەرزەڵووکـە، گـژنیـژە. ٦ـ (مــجـ.) قـســـەی بـێ سـەر و بەرە. **〜 کردن:** ١ـ ئاشێکی کە بەرداشەکانی گەنم باش نـاهـاڕن و لـە جـیـات کـردنـە ئارد دانـەوێڵـــە قــــڵـت و بـڕ دەکـــەن و وەک بروێشی لێدەکەن. ٢ـ قسـەی بێ سـەر و بەرە کـردن، قسـەی بێ ڕێ و جێ کـردن. ∷ کوڕە دە بیبـڕەوە ئەو بروێش کردنەت لە چیە خۆ پیاو تێناگە تۆ دەڵێی چی.

**بروێش کــولێک** (نا. ل)[بروێش + کـوڵ + ئێک] زەمـانێک بە قـەرا کـوڵینی بروێش کە نزیک دوو ساعەت دەگرێتەوە. ∷ بروێش کوڵێکە دە حەمام دایە و نایەتە دەرێ.

**بروێشـــە** (نـا. ل)[بروێش + ئە] بڕ: پرووشە.

**بروێشێن** (نا. ل)[بروێش + ئێن] ئاش و شلەیەک کە بە بروێش، وردە ساوار یا



گەنمی کوتراو ساز دەکردرێ، بروێش، برۆش، شلەبروێش، وڵۆشینە.

**برۆس** (نا.)[فەر: brosse] ١- ئامرازێکی سەر داهێنانە، دەسکێکی هەیە و پانە، سەرەکەی دەنکی زۆری وەک بزماری لە سەرە و سەری پێدادێنن. ٢- ماهووت ماڵ. ~ **کردن:** داهێنانی سەر بە برۆس.

**برۆش** (نا.) بڕ: بروێش

**برۆشە** (نا. ل)[برۆش + ئە] بڕ: پرووشە

**برووش** (نا.)[سۆر] بڕ: بروێش

**برووکە** (ئاک. ل)[بڕ + ئووک + ئە] کەمێک، هەندێک، بڕێک.

**بڕە** (نا. ل)[بڕ + ئە] ١- شفرەی بەراز، شفرە. ٢- خەتێک خۆڵی هەڵدراوەی نێوان دوو هێڵی جووت بە گاسن کە کەوتوتە سەر یەک، ناوگرە. ٣- بڕ: بڕیە. ٤- ئاردەمشار. ٥- برادە.

**بڕەک** (نا. ل)[بڕ + ئەک] ١- (گیان.) بەرازی نێر،بڕڕەک. ٢- مشاری دوو کەسی، شەقە، شەقەمشار. ٣- (ئاک.) ئەندازەیەکی کەم، بڕێک.

**بڕیار** (نا. ل)[بڕ + ئار] ١- پەیمان. ٢- قەرار. ٣- شێوەی بڕینی جلوبەرگی. ~ **بوون:** کارێک یا شەرتێک کە لەوانەیە ئەنجام بدرێ، قەرار بوون. ⁘ بڕیارە بەم زوانە ئاشتی پێک بێ. بڕیارە قەتار بۆ شارەکەمان بکێشن. ~ **دان:** پەیمان بەستن بۆ هەر کارێک. ⁘ منداڵەکان بڕیاریان داوە ئیدی بەدفەڕێ نەکەن. ~ **لە سەر دان:** را دەربڕینی بە تەواوەتی بۆ بەڕێوە بردن و ئەنجام دانی کارێک لە سەر کەسێک یا مەسەلەیەک. ⁘ کۆنگرە بڕیاری لە سەر زۆر شتی تازە داوە.

**بڕیە** (نا. ل)[بڕ + یە] ١- هەڵسەنگاندنی کار یا کالایەک بە بێ کێشان و حیساب کردن، هەروا نرخ دانان، گۆترە، بڕە/٣. ⁘ لە بڕیە ئەو دەستە کەوا و پاتۆڵەت بە چەندی؟ ٢- نرخی کارێک لە سەر تەواو بوون بە بێ حیساب کردنی وەخت و شتی وەردە. ⁘ لە بڕیە خانووبەرەیەکی باشم بە چەند بۆ تەواو دەبێ؟

**بڕین** (چا. م)[هیک: بهریی - ئەو: بریی، برای - پەهـ: برین، برییتەن، برینییتەن. باک: بڕین - ناو: بڕین - باش: بڕین - هەو: بڕیەی، بڕیای - زا: برنایش] ١- لەت کردن و جیا کردنەوەی

شتێک بە ئامرازی تیژی وەک چەقۆ و مشار. ٢ـ بریندار کردنی بەشێک لە لەش. ∷ قامکم بڕی. ٣ـ کڵاو لە سەر کەسێک نان، فێڵ لە کەسێک کردن، گران پێ فرۆشتن. ∷ حاجی هەر بەناو حاجییە چوومە دوکانەکەی دەستی لێرەڕا بڕیم. ٤ـ پێوانی مەودا و ڕێگا، ڕویشتن و وە پشت سەر نانی ڕێگا. ∷ کە ئاوڕم داوە دیتم مەودایەکی زۆرمان بڕیوە. ٥ـ هەڵپاچین و جیا کردنەوە بە مەقەست. ٥ـ گۆڕینی حاڵەتی هەندێک شتی ئاوەکی و مەیوو و لندوو لندوو بوونی. ∷ چەلێ ماستی دە ئاشەکەت مەکە لێی گەڕێ با هەندێک سارد بێتەوە دەنا دەیبڕێ. ٦ـ تێکەڵ کردنی پەڕی قومار، بۆر لێدان. ٧ـ لێدانی تێگرایی بانکی قومار. ∷ بانکەکەی بڕیم. ٨ـ دزین و بردنی تەواوی پوول و کەل و پەلی شوێنی دزراو. ∷ دز هات و ماڵەکەی بڕیم. دوێنێ شەوێ دوو دوکانیان بڕیوە. ٩ـ بڕشت و قەوە پێ شکان. ∷ جا خۆ قسەم قسەت نابڕێ هەرچی بفەرمووی وا دەکەین. **بە ~ چوون:** گەیشتنە رادەی بڕین، تووشی بڕین بوون، بڕان. ∷ دەک زمانت بە بڕین چێ بۆ ئەو قسە ناخۆشەت. کابرا لە خۆڕا سەری بە بڕین چوو. **بە ~ دان:** سەر یا بەشێک لە ئەندامی کەسێک تووشی بڕین کردن. ∷ دووزمان و شۆفار سەری دوو کەسیان بە بڕین دا.

**بڕینەوە** (چا. م)[بڕین + ئەوە] ١ـ لەت کردن و جیا کردنەوە بە ئامرازی بڕین وەک مشار، بیور، ... ∷ دارەکانمان بڕیوە. ٢ـ هەڵپاچینی مووی مەڕ و بزن. ٣ـ کورت کردنەوەی تووکی سەر. ٤ـ دەرهێنانی هەنگوین لە کەندوو. ٥ـ تەواو کردن، دوایی پێهێنان بە کارێک. ∷ ئەو قاوەقاوەتان لە چییە بیبڕنەوە! دەستبەجێ شەڕەکەیان بڕیوە. ٦ـ ساغ بوونەوە لە سەر مووچە و مز یا مەسەلەیەک. ∷ وامان بڕیوە پایزی بووکت بۆ لە بەر دەکەی دابەزێنین. ٧ـ لە شیرگرتنەوەی بیچوو.

**بڕێ** (ئاک. ل)[بڕ + ئێ] بڕ: بڕێک

**بڕێک** (ئاک. ل)[بڕ + ئێک] رادە و ئەندازەیەکی کەم لە شتێک، بڕێ، بڕەک، نەختێک، هەندێک، نیسکێک، تۆزێک، ...

**بز**[1] (ئان.)[؟] چاو دەرپەڕیو، چاوزەق. **~ چوونەوە:** زیتەی چاو هاتن، زەق بوونەوە. ∷ ئەوە بۆ لە بن لێفە سەرت دەرێناوە، چاوەکانی چۆن بز

دەچنەوە. ~ **دان:** چاو زەق کردن.

**بز** 2 (نا.)[؟] ١ـ قامک، پەنجە، جوز، بووز. ٢ـ ئەنجامی بز پێوە کردن. ~ **پێوە کردن:** دەست بۆ قوونی کەسێک بردن، جوز پێوە کردن.

**بز** 3 (گیانـ.)[هەو ـ زا] بڕ: بزن

**تێبینی:** وشەی بز بە مانای بزن لە هەندێک چیرۆک و پەندی زاراوەی ناوەندییش دا دەبیندری. ⁚⁚ بز دا بۆ دا پیر دا.

**بزافتن** (چا. م)[سۆر] بڕ: بزاوتن

**بزاڤ** (نا.)[لە: بزاڤتن][باک] بڕ: بزاو

**بزاڤتن** (چا. م)[باک] بڕ: بزاوتن

**بزاو** (نا.)[لە: بزاوتن] ١ـ لە جێگەی خۆی تەکان دراو، دەست لێدراو، جووڵاو. ٢ـ جووڵە، جەرەکەت، حەول، بزاڤ.

**بزاوتن** (چا. م)[باک: بزاڤتن، بزڤاندن ـ ناو: بزاوتن، بزواندن، بزافتن] ١ـ جوولاندنی شتێک هەر لە سەر جێی خۆی، لەقاندن. ٢ـ جووڵاندنەوە و تەکانێکی کەم. ⁚⁚ ئەو سمێڵێکە خورمایی لە سەر کۆڵمێکە ناسک و شلک دانا / وردەوردە لێوی دەبزاوت لەو مەست و خەرامانە (شۆڕمەحموود ل ٦٤). ٣ـ (مجـ.) بە قسە یا کارێک یەکێک هاندان بۆ دەرچوون لە حاڵی ئاسایی خۆی. ⁚⁚ ئەو دەم هەراشەی هەندە مەبزوێنن با ئارام دانیشێ.

**تێبینی:** بزاوتن و گەلێک وشەی دیکە وەک بزۆز، بزێو، بەزین، بەزان، بزووتن، ... لە ریشەی ڤەز vazی ئەوێستایی بە مانای جووڵە کردن، راکردن، بەزین کەوتوون.

**بزبز** (نا. ل)[بز1 + بز1] چاو زەق بوونەوە بۆ ماوەیەکی درێژخایەن، زەق زەق. ⁚⁚ بزبز چاوی تێبڕیبووم.

**بزداندن** 1 (چا. م)[باک] پساندن

**بزداندن** 2 (چا. م)[پەه: پەزدێنییتەن][باک] ترساندن

**تێبینی:** پەزد بە تەنیا لە پەهلەویی دا بە مانای ئەزیەت و ئازار هاتوە و لە چاوگ دا بە مانای ترساندن.

**بزدۆک** (ئان. ل)[بزد + ئۆک][باک] ترسەنۆک

**بزدۆنک** (ئان. ل)[باک] ترسەنۆک

**بزدهان** (چا. ل)[باک] ترسان

**بزدەک** (ئان. ل)[بزد + ئەک][باک]

ترسەنۆک

**بزدیان** (چا. ل)[باک] ترسان

**بزدیای** (نا. مف.)[باک] ترساو

**بزدین** (چا. ل)[باک] ترسان

**بزدینۆک** (نا. ل)[بزد + ئینۆک][باک] مەترسی، خەتەر.

**بزر** (ئان.)[باک: بەرزە، بزر ـ ناو: بزر] ١ـ کەسێک یا شتێک کە لە بەر چاو نەمابێ. // دیار. ⁝⁝ دوو سێ رۆژان بە دیارەوە نەبووی دیسان خۆت بزر کردبۆوە. ٢ـ نەدۆزینەوەی رێگا و بان و شوێنێک. ⁝⁝ منداڵەکەمان رێی ماڵی لێ بزر ببوو. ٣ـ لێکەوتنی شتێک. & ون، گوم، گم، وندا. ~ **بوون:** ١ـ لە بەر چاو ون بوون. ⁝⁝ تاو لە پشت کێوان بزر بوو. ٢ـ نەدیتنەوەی رێ و شوێن. ⁝⁝ شارەکە هێند گەورە بوو تێی دا بزر بووم. ٣ـ جێ مان و کەوتنی شتێک. ⁝⁝ کتێبەکەم بزر بوە. & ون بوون، گوم بوون. ~ **کردن:** ١ـ ون کردنی شتێک یا کەسێک. ٢ـ لە بیر کردنی جێ و شوێن و نەدیتنەوەی. رێگام بزر کردبوو هەرچیم دەکرد بۆم نەدەدیتراوە. & ون کردن، گوم کردن. **لێ** ~ **بوون:** ١ـ ون بوونی شتێک لە کەسێک. ⁝⁝ سەعاتەکەم لێ بزر بوو. ٢ـ شوێن و جێگەیەک لە کەسێک ون بوون. **لێ** ~ **کردن:** شتێک لە کەسێک ون کردن. ⁝⁝ حەسۆ سەعاتەکەی لێ بزر کردم.

**بزرک** (نا.)[؟][باک: بزرک، پزرک، پزک، پرزک، پزرووک] ١ـ کوانی چووکی سەر پێستی لەش بە تایبەت روخسار، زیپکە. ٢ـ کوان.

**بزربزر** (ئان. ل)[بزر + بزر] شیر یا ماستێک کە تێک چووبن، لندوولندوو، لیندوولیندوو. (هس: بزرک) ~ **بوون:** تێک چوونی شیر و ماست، بزرکان.

**بزرکان** (چا. ل)[؟] ١ـ تێک چوونی شیر یا ماست بە هۆی خراپ بوون یا گەرم کردنەوەی و لێک جیا بوونەوەی ئاو لە مادەکانی دیکە و لندوو لندوو بوونی، هەڵگەران، بزربزر بوون. ٢ـ تێکچوونی باری ئاسایی مرۆڤ و پەرینی رەنگی رووی لە ترسان، پەشۆکان، پرووکان، هەڵپرووکان.

**بزرکاندن** (چا. م)[بزرکان + دن] هەڵگەراندنی بە قەستی شیر یا ماست. ٢ـ ترساندنی یەکێک وەها کە رەنگی رووی بپەرێ. ٣ـ قسە پەراندن لە خەو دا یا لە حاڵی نەخۆشی و چەق و چۆ دا،

قسـه پەراندن، ورێنه کردن، راواندن. ٤ـ قسـەی حـەلەق مـەلەق و بێ سـەر و بن کردن.

**بزرکـاو** (نا. مـفـ.)[لە: بزرکـان] ١ـ ماست یا شیری هەڵگەڕاو. ٢ـ ترساو و رەنگ پەڕاو، پرووکاو.

**بزڤاندن** (چا. م)[باک] بڕ: بزاوتن

**بزکـە** (گـیانـ.)[بز3 + ک + ئە][زا] گیسک، گیسکەنێر.

**بزگ** (نا.)[پەه: ڤەسـسـەت][ئەر] بنی مەرجانی سوور کە بۆ خشڵ و مووروو و گەوهەرسازی دا کەلکی لێوەردەگرن، شیلان، مەرجان.

**بزگـوڕ** (نا.)[؟] ١ـ کوتە پارچەیەکی کـۆن و بێکەلک، دادڕاوێکی پارچەی بێکەلک. ٢ـ کـوت و دادڕاوێکی هەر پارچەیەک. & بجگوڕ، تیتـۆڵ. ~ **لە کـەسـێک دادڕین:** (کنـ.) فـێـر بوون و رەچاو کردنی کردەوە و ئاکاری کەسێک وەک سـەرمـەشق. :: رۆڵە بزگـوڕێک لە ئامۆزاکەت دادڕە ئەویش هەر هاوتەمەنی تۆیە کەچی ئەو بۆتە دوکتور و تۆ هەر لە جێی خۆتی.

**بزڵە** (گـیـانـ.)[بز3 + ڵە][هەو] بڕ: گیسک

**بزڵەڕ** (گیانـ.)[بز3 + ڵەڕ] بڕ: بزنڵەڕ

**بزماتە** (نا.)[؟][سۆر] توێژێکی رەق و قاوەیی تۆخ کە لە سەر برین دەیبەستێ و نیـشـانـەی خـۆش بوونەوەی برینە، بزمەتە، قرتماغە، قرتماخە، قەتماخە، قەتماغ.

**بزمـار** (نا.)[عـەر: مـسـمـار] ١ـ شیشێکی باریک و درێژە کە لە پەیوەندی دەگـەڵ کـار چووک و گـەورەی هەیە، لە ئاسن یا پۆڵا ساز دەکردرێ، دوو شتی وەک تەختـە لە یەک قـایم دەکـا یا بۆ شـتـێک لە دیوار داکـوتان کـەلکی لێوەردەگرن، بسمار، پسمار، میخ، مێخ. ٢ـ ئامـرازێکە لە جـۆڵایی داهەر وەک بزمـار کـە شـوێنەکـەی لە سـەر دارێ کـۆڵدراوە و کـە بە پاش و پێش کـردنی دەفە بەرز و نەوی دەبێتەوە. ~ **لێدان:** ١ـ داکوتانی بزمار لە شتێک. ٢ـ (کنـ.) فێڵ لە کەسێک کردن، فریو دان.

**بزمارڕێژ** (ئان. فا)[بزمار + ڕێژ] هەر شـتێکی کـە بزمـارێکی زۆری لە سـەر کوترابێ، بزمارکوت، مێخکوت.

**بزمـارکوت** (ئان. فـا)[بزمـار + کوت] ١ـ بزمـارڕێژ، مـێـخکوت.. ٢ـ (نا. ل) جـۆرێک ترێی پڕە کە دەنک و بۆڵەکانی

زۆر لە یەک نزیکن و پاڵیـان لێک داوە و مەودایان دەنێوان دا نیە.

**بزمـارۆک** (نا. ل)[بزمـار + ئۆک] بڕ: بزمارە/١.

**بزمـــــارە** (نـا. ل)[بـزمـــــار + ئـە] ١ـ توێـژێکی رەقــە، وەک بلـۆقی رەق هـەڵاتوو کـــە لە ســـەر دەست و پێ پـەیدا دەبێ، بزمـارۆک، بسمـارە، پسمـارێ، مێـخەکە، مـــێخ. ٢ـ وردە داری چووک و تـاشـــراو وەک بزمـار کـە لە پـلووسکی شـل بۆوەی ئاشـی دەدەن هـەتا قایم بێ و نەمیزێ.

**بزمـک** (نا. ل)[بـز (پۆز) + مـک][باک: بـزمـک، بزمـــۆک، پـۆزمـک ـ ناو: بـزمـک، بزمـــۆک، بـزمـــەک، پزینک] دم بێنێکی بچووکە لە کـوتە دارێک سـازی دەکەن و دوو سـەرەکەی بە بەنێک دەبەستن و وەک لغـاو دارەکـەی دە زاری کـاریلـە دەنێن و بـەنەکـــەش دەبـەنـە دواوە و لە شــــاخی دەبـەستن بـۆ ئەوە کـــە نـەتـوانێ گـــوانی دایکی بمژێ، دەمـبـەس، بلامـک، بڵامک، بەڵامک، بلۆمە.

**تێبینی:** من پێموایـە کە بز لەم وشـە دا هـەمـان پۆزە کە لە پۆزمـک ـ ی باکووریی دا خـــۆ نیـــشــــان دەدا و پێـــوەندی بـە بزەکـانی دیکـەی ئەم فـەرهـەنگەوە نیـە.

دەلیلەکـەش ئەوەیە کـە مک یا مـامک کـە وەک پـاشـــگـری پـۆش دێ لــە تـەواوی وشـەکانی دیکە دا دەگەڵ وشـەگـەلی وەک بەر، دەم (بـەرمـــامک، بلامـک، دەمـــامک) هاتوە و بز ـ یش ناتوانی وشەیەکی دیکە جگە لە پۆز بـێ کە لە زەمـان دا پیـتی بێ زاڵ بوە و وای لێـهاتوە و مـاناکـەشی بە گـشـتی دەبێـتـە پـۆزپۆش یا دەمـبـەس و دمـبێن. هەروەتر بـۆ ریشـەی مک، مـەک، مۆک بڕ: تێبینی بەرمامک.

**بزمۆک** (نا. ل)[بز + مۆک] بڕ: بزمک

**بزمەتە** (نا.) بڕ: بزماتە

**بزمەک** (نا. ل)[بز + مەک] بڕ: بزمک

**بزن** (گـیـانـ.)[ئەو: بووزە ـ پەهـ: بوز، بوچ ، [پـاچەن، پـازەن( بزنەکـێـویی)] ـ خـوار: ئەبز. فـار: بز ـ تـات: بێـزە. باک: بـزن ـ نـاو: بـزن ـ بـاش: بـزن ـ هـەو: بـز، بزە ـ زا: بز، بـزە، بـژە] گـــیـــاندارێکی کـەویی، گـیـاخـۆر و شـاخ و سـمـدارە، ردێـنێکی درێژ و کلکێکی کـورتی هـەیە، بەدفـــەڕە و زۆر ســـانـا دەچێـــتـــە جـێی ئەستەم و لە کۆنەوە کەویی کراوە. جۆری کێویشـی هـەیە کـە پێی دەڵێن بزنەکێویی و ڕاو دەکـرێ. بزن بۆ شـیـر، گـۆشت و مـوویەکـەی رادەگـرترێ و چەند جـۆری

هەیە. **چوونە بەر بزنان:** بزن بردنە دەر بۆ لەوەڕ. ؛؛ کـــــەریم چۆتە بەر بزنان و ئێواریٚ دێتەوە.

**بزنانە** (نا. ل)[بزن + ئانە2] باجێکە کــە ئاغــا لە خــاوەنی بزن بە پێی سەرەبزنەکانی لێی دەستێنیٚ.

**بزن ترێنە** (گـیا.)[بزن + ترِ + ئێنە] گـیـایەکی بەهارییـە، ســەلکی بە قـەد پیازێکی بچووک دەبیٚ، بزن دەیخوا و لە بەر تیـژی دەترِیٚ. (کشت و کاڵ ب ١ ل ٣٥). گـیـایەکی بەهارییـە، گـەڵای وەک کــەوەر وایە، بنکێکی خــرِی هـەیە وەک پیازی پچووک (خاڵ ب ١ ل ١١٩).

**بزنڵـەرِ** (گیانـ.)[بزن + ڵەرِ] مـەلێکی مــاسـیگرە، وەک لەگلەگ درێژە، رەنگی پەرِەکـانی رەشـە و ژێر سنگی سـپییـە، دندووک و لاقـەکـانی سـوورن و مـاسی و بۆق و کـرم دەخـوا (فـرهنگ پرندگـان ل ٣٤). پەلەوەرێکە زل، بۆرکــار بە قــەد قـازیٚ ئەبیٚ، گۆشـتی ئەخورێت (کشت و کاڵ ب ١ ل ٣٥)، بزەڵەرە، بزلەرِ.

**بزمژ** (گــیــانــ.)[بزن + مــژ][لۆر: بۆزمێژنەک ـ فار: بزمچە. باک: بزنمێژ ـ ناو: بزنمژ، بزنمژە، بزنمژۆک، بزنمژەک، بزنمشک] جۆرێک سووسـەمـارە بە قـەرا پشیلەیەک دەبیٚ، کلکی درێژە و لە سـارا گـوانی بزن دەمـژیٚ (هۆی ناو نـرانی) و برینداری دەکا، پێسـتـەکەی جوانە و بۆ کـالانی خـەنجـەر کـەلکی لێوەردەگرتریٚ، تێـرِتێـرە، تێـرِتێـرِەملە، قـومـقـومـە، پەزمژۆک، مانگەمژۆک.

**بزمژە** (گـیـانـ.)[بزن + مـژ + ئە] برِ: بزنمژ

**بزمژۆک** (گـیـانـ.)[بزن + مـژ + ئۆک] برِ: بزنمژ

**بزمژەک** (گـیـانـ.)[بزن + مـژ + ئەک] برِ: بزنمژ

**بزمشک** (گیانـ.)[بزن + مش (مژ) + ک][سۆر] برِ: بزنمژ

**بزمێژ** (گیانـ.)[بزن + مێژ][باک] برِ: بزنمژ

**بزنۆکـە** (نا. ل)[بزن + ئۆکـە] چووک کراوەی بزنە هـەر بەم مـانایە. ؛؛ بزنۆکە و مەرِۆکە.

**بزنەدۆخـە** (نا. ل)[بزن + ئە + دۆخ + ئە] ئەو بزنەی کە خـاوەن بزن بۆ ئەربابی دەنێریٚ هەتا شیر و ماستەکەی بخوا و دوای ویشک کـردنی شـیـرەکــەی بۆی دەگەرِێتەوە.

**تێـبـینی:** دۆخ لە ڕەگی دەئۆک ـ ی ئێرانی کۆن و دۆختەن ـ ی پەهلەویی و دۆتن و دۆشین ـ ی کوردیی کەوتوە. (بڕ: دۆشین و دۆ2)

**بزنەریشە** (گیا.)[بزن + ئە + ریش + ئە] گیایەکە بەهاری لە سەر ڕێگا و ڕەقەن دا سەوز ئەبێ، گەڵای وەکوو کەوەر باریک و درێژ و گوڵێکی شین و کاری هەیە (کشت و کاڵ ب ١ ل ٣٥). گیایەکی بەهارییە، گەڵای وەکوو شویت وایە، بنجێکی بچووکی هەیە (خاڵ ب ١ ل ١٢٠).

**بـزنـەڕێ** (نا. ل)[بزن + ئە + ڕێ] ڕێگایەکی باریک، ڕێچکە، کوێرەڕێ، ئاهەڕێ.

**بزنە قسر** (گیانـ.)[بزن + ئە + قسر] بزنێکی کە ساڵێک نەزابێ.

**بزنەکوڕانە** (نا. ل)[بزن + ئە + کوڕ + ئانە] بزنێکە کە ڕەعیەت و مەڕدار پێشکێشی ئاغایان دەکرد کاتێک کە کوڕی دەبوو.

**بزنەکێفی** (گیانـ.)[بزن + ئە + کێف + ئی][ئەر] بڕ: بزنە کێوی

**بزنەکێویی** (گیانـ.)[بزن + ئە + کێو + یی] ١ـ گیاندارێکی گیاخۆرە وەک ئاسک دەچێ، شاخی بەرەو دواوە گەڕاوەتەوە، مووی کورتە، لە کوێستان دەژی و ڕاوچی بۆ گۆشتەکەی ڕاوی دەکەن، Cervus capreolus ناوی لاتینی ئەم گیانلەبەرەیە. ٢ـ (مجـ.) شاخەوان و بەردەوانی لێهاتوو. ٣ـ (مجـ.) منداڵ یا کەسێک کە زۆر بە سەر دیوار و شوێنی بەرزەوەیە. & بزنە کێفی.

**بزنەگەل** (نا. ل)[بزن + ئە + گەل] کۆمەڵێک بزن بە یەکەوە، ڕانی بزن.

**بزنەمەرەز** (گیانـ.)[بزن + ئە + مەرەز] بزنێکە کە لە جیات موو مەرەز لەشی داپۆشیوە کە جۆرێک مووی نەرم و جوانە و پتر بۆ جل و بەرگ کەلکی لێوەردەگرن. (بڕ: مەرەز)

**بزنەوەس** (نا. ل)[بزن + ئە + وەس] مەشکەیەک کە لە پێستی بزن کرابێ.

**بزنێری** (نا. ل)[بز3 + نێری] گیایەکی کوێستانی بەهارییە، گوڵێکی سپی واشی هەیە (کشت و کاڵ ب ١ ل ٣٥).

**بزواندن** (چا. م) بڕ: بزاوتن

**بزوت** (نا.)[باک] بڕ: بزووت

**بزوێن** (نا.)[لە: بزووتن] ١ـ پیتی دەنگداری ئەلفوبێ وەک (ئا، ئۆ، ئێ، ئوو



و ...). ٢ـ مـــانـای بزوێنـەر دەدا. :: بن بزوێن.

**بزوێنەر** (؟)[لە: بزووتن] هـۆیەک یا کەسـێک کـە هـاندەری بزاوتن و جـووڵە کردنە.

**بزۆت** (نا.) بڕ: بزووت

**بزۆز** (ئان. فا)[لە: بزووتن] ١ـ کەسێک کـە لە سـەر جـێی خـۆی ناتوانی ئارام بگرێ و هەر دەجـووڵێتـەوە. ٢ـ منداڵی هار و هاج کە حەجمینی نیە و دەست لە کەل و پەلی ماڵ وەردەدا، دەست بزێو. & بزووک، بزێو.

**بزۆک**[1] (ئان. فـا)[ب2 + ز (زان) + ئۆک] ١ـ ژنێک کە زۆر زگ و زا دەکا. ٢ـ گیاندارێک کە هەموو ساڵێ زاوزێ دەکا. // نەزۆک، قسر.

**بزۆک**[2] (ئان. فـــا)[بز (بزووتن) + ئۆک] بڕ: بزووک/١.

**بزوو** (گیا.)[باک] بڕ: بووز1

**بزووت** (نا.)[باک: بزۆت، بزوت ـ ناو: بزووت، بزۆت، بزووتک] دارێک کـــە بە تەواوی نەسووتاوە و سەرەکەی هێشتا ئاگـری پێـوە مـاوە، سـەرکـەبزۆت، سەلکەبزووت، سەرەبزووت.

**تێبـینی:** بزووت و بزۆت لە چاوگی سـۆچەت sočat ـ ی هیندی باسـتـان و سەئۆک saok ـ ی ئەویستایی بە مانای سـووتان کـەوتوە و دوو پیـتی س و ز ئاڵوگـۆڕیان بە سـەر داهاتوە کـە لە کوردیی دا وێنەی زۆرە.

**بزووتک** (نـا. ل)[بزووت + ک] بڕ: بزووت

**بزووتن** (چا. ل)[باک: بزووتن ـ ناو: بزووتن، بزوون] ١ـ جووڵانێکی کەم هەر لە سـەر جێگەی خۆ، جووڵان، بزوون. ٢ـ سـەرەتای دەست پێکردن. :: سـەرمـا بزووت و لەوە بە داو دەبێ جلی گـەرم دەبەر کەین.

**تێبینی:** بزووتن لە چاوگی ڤەز vazی ئەوێستـایی و ڤـەزییتـەنی پەهلەویی بە مـانای راکـردن، بەزین و جـووڵانەوە کەوتوە.

**بزووتنەوە** (چا. ل)[بزووتن + ئەوە] ١ـ جووڵانەوە لە سـەر جێی خۆ. ٢ـ خەبات و جووڵانەوەی سیاسی.

**بزووز** (گیانـ.)[؟][باک] بڕ: مۆرکە

**بزووزک** (گـیـانـ.)[بزووز + ک][باک] بڕ: مۆرکە

**بزووک** (ئان. فـــــا)[بـز (بزووتـن) + ئووک] ١ـ کـەسـێک کـە لە کـاران دا بە دەست و بـردە و خـــۆ هەڵدەســـوورێنێ، زیرەک، بزۆک2. ٢ـ بڕ: بزۆز

**بزوون**[1] (چا. ل) بڕ: بزووتن

**بزوون**[2] (نا.)[باک] بڕ: بووزوو

**بزە**[1] (نا.)[ناو: بزە ـ باش: بزە ـ هەو: بـزە] جـــۆرێک کـــەنینی بێـــدەنگە، زار ناکـــرێتـــەوە و تەنیـــا لێـــوەکـــان لێک دەکشێنەوە و حاڵەتەکەی لە روخسار دا خــــۆ دەنوێنێ، زەردە، زەردەخــــــەنە، بـزەخـــــەنگ. **~ کـــردن:** پێکـەنین بـە بێـدەنگی. **~ گـرتن:** بزە هاتـنە سـەر لێـوان، پێکەنین بە سـووکی. **~ هاتن:** بـزە گـــرتـن، پێکـەنین بـە بێـــدەنگی بـۆ خـۆشـی یا بۆ تەوس. **~ نیشـتنە سەر لێـوان:** بزە کـردن، پێکەنین بـە سـووکی، بزە هاتـنە سـەر لێـوان. **~ هاتنە سەر لێوان:** بزە کردن، پێکەنین بە سووکی.

**تێبـــینی:** بزە دەگـەڵ وشـەی بسکە هەریەک وشـەیە و جێگۆڕکە و ئاڵوگۆڕی دوو پیـــــتی « ز » و « س » ی بە ســـــەر داهاتوە. و ماناکەشی لە جووڵەی سمێڵ یا بلـێن بسکەی سـمـێڵ کـەوتوە و لە دوایی مـانای سەربـەخۆی پەیدا کردوە و هەر دووکیشیان لە ڤەز ـ ی ئەوێستایی کەوتوون. هس: بسکە1

**بزە**[2] (گیانـ.)[هەو ـ زا] بڕ: بزن

**بزەخـــەنگ** (نا. ل)[بزە1 + خـــەنگ] [باش] بڕ: بزە1

**بزەڵە**[1] (گـیانـ.)[بزە (بازە1) + ڵە] ١ـ بێـچـووی بەراز، کـوودەڵە، چۆخـەبازەڵە، بازەڵە، خـڕنە. ٢ـ بێـچـووی گـیـاندار کـە گەورە بووبێ و پێگەیشتبێ. **~ بوون:** پێگەیشتن و گـــەورە بـوونی بێـــچـــووی گیاندار.

**بزەڵە**[2] (گـیـانـ.)[بز3 + ئەڵە][هەو] بێچووی بزن، گیسک.

**بزەڵەڕە** (گـیـانـ.)[بز3 + ئە + ڵەڕ + ئە][باش] بڕ: بزنڵەڕ

**بزی** (گیا.)[باک] بڕ: بووز1

**بزیا** (گـــیـــانـ.)[بـز3 + ی + ئا][زا] گیسک، گیسکەمێ.

**بزیە** (گـــیـــانـ.)[بـز3 + ی + ئە][زا] گیسک، گیسکەنێر

**بزێ** (گیانـ.)[ب2 + زێ2] گوێلکەمێی سێ ســـاڵە، ســـاڵی دوای بـەرکـەڵ. // بەرنیر.

**بزێک** (گـــیـــانـ.)[بز3 + ئێک][زا] گیسک، گیسکەنێر.

**بزێکە** (گیانـ.)[بز3 + ئێک + ئە][زا] گیسکەمێ.

**بزێو** (ئان. فـــا)[لە: بزووتن] ١ـ بە ناوەوە دەلکێ و مـانای بزوێنەر دەدا. ⁂ سەربزێو، دەست بزێو. ٢ـ بڕ: بزۆز

**بژ**[1] (نا.)[ئەو: بەرێشـــە ـ پەه: بۆش، بوش. باک: بژی، بوژی، بێژک ـ ناو: بژ ـ زا: بەش] ١ـ ریزەی مـــووی ســـەر ملی ئەسپ و شێر، یاڵ، یاڵ و بژ. ٢ـ کاکۆڵ. ٣ـ تیژایی گوڵە گەنم و جۆ، داسوو. ٤ـ مـووی راست وەســـتـاو، زیک، گـرژ. ٥ـ (ئان.) پرژ، بڵاو. ~ **بوونەوە:** ١ـ مووی سەر کە درێژ و بڵاو بوویێتەوە. ٢ـ بڵاو بوونەوەی گـیـا و گـوڵ لە ســەر بنجی خۆی. ~ **وەستان:** زیک بوونەوەی موو لە ترسان.

**بژ**[2] (نا.)[؟][باک] ١ـ مەیل، ئیشتیا. ⁂ بژا خوە ناچە نان. ٢ـ ویست، نەفس.

**بژار** (نا.)[لە: بژاردن] ١ـ گیای زێدەی نێـو شـیناوەرد و باخـچـە کـە دەبێ هەڵقـەندرێ، گـیـابژار، بژارە، کـاخ. ٢ـ کاری هەڵکەندن و خاوێن کردنەوەی گیاو گـوڵی زێدە. ⁂ سـبـەی باخـچـەکـە بژار دەکـەم. ٣ـ کـاری خـۆ دۆزینی مـرۆڤ و باڵندە. ٤ـ ژمـار، ئەژمـار، حـسـێب. ⁂ گـــوێز بە بژار بکڕە! ~ **کـــردن:** ١ـ هەڵقـەندنی گیا بژار. ٢ـ ژماردن. ٣ـ خۆ دۆزین، پشکنین.

**بژارتن** (چا. م) بڕ: ژماردن

**بژارچن** (نا. ل)[بژار + چن] ئامـرازی گیابژار هەڵکەندن، پیشک، گیاکەن.

**بژاردن** (چا. م)[بـڕ: ژمـــــاردن] ١ـ حـسـێب کـردن، ژمـارە کـردنی شت. ⁂ بزانم دەتوانی هـەتـا دە ببـــــژێری. ٢ـ قـەبووڵ کـردنی تاوان و سـزا دانـەوەکـەی بـە پـارە یـا کـــــڕینـەوە. ⁂ هـەر چـی شـــووشـــەی شکاندبوو بۆم بژارد. ٣ـ خـاوێن کردنەوە و جیا کردنەوەی بەرد و چەت لە دانەوێلە، بژارتن. ⁂ ئەو برنجـە ببژێرە با سازی کەم.

**بژاردنەوە** (چا. ل)[بژاردن + ئەوە] ١ـ ســـــەر لە نوێ بژاردن. ٢ـ قـــــەرەبوو کردنەوە، تێهەڵێنانەوە، تۆڵە بۆ کردنەوە. ٣ـ [ئەر] خـەون گـێـڕانەوە، گـێـڕانەوەی خەون.

**بژاردە** (نا. مـــــفـ.)[لە: بژاردن] ١ـ بژێردراو، ژمـاردراو، بژارە. ٢ـ کـەس و شـتی کـەم وێنە و دەست نیشـان کـراو،

هەڵبژاردە.

**بژارکەر** (نا. فا)[بژار + کەر3] کەسێک کە گیابژار و گیای زێدەی باخچە و مەزرا هەڵدەقەنێ.

**بژارە** (نا. چا)[بژار + ئە] ١- بژاری گیای زێدە، گیابژار. ٢- خۆ دۆزین و رێک و پێک کردنی پەڕ و باڵ بە دندووک. ٣- راست و ریس کردنی رایەڵ لە لایەن جۆلاوە. ٤- بژێردراو، بژاردە. ٥- [ئەر] وەرگێڕان لە زمانێکەوە بۆ سەر زمانێکی دیکە. ٦- خەیالاتی شەوانە کە دەبێتە هۆی خەو لێنەکەوتن. **~ کردن:** (کن.) خەو لێنەکەوتن لەبەر خەیاڵێک کە دە مێشک دایە. :: ئەوشۆ تا بەیانی هەر بژارەم کرد و نەمتوانی تاوێک بخەوم.

**بژاڵ** (نا. ل)[بژ1 + ئاڵ4][ئەر] ١- ئیشکەڵی دار و درەخت. ٢- پووش و پەلاشێک کە دوای دارەڕا دەخرێتە سەربان و لە پاشان گڵەبان دەکرێ. & هەژگ، هەژگەڵ، پژاڵ.

**بژاندن** (چا. م)[لە: بژ2][باک] ئیشتیا چوون، دڵ بردن، مەیل لێبوون، مرخ چوونە سەر، ئەڵها کردن.

**بژانگ** (ئا.) بڕ: برژانگ

**بژبژە** (گیان.)[بژ1 + بژ1 + ئە] ١- جۆرێک جاڵجاڵۆکەی نێو ماڵانە، لەشی بە قەرا جاڵجاڵۆکەیە بەڵام پێیەکانی چووکترن. ژاری نیە و بێ ئازارە و گیانداری چووکەی وەک مێش و مێشوولە دەخوا، Hyptiotes paradoxus ناوی لاتینی ئەم جانەوەرەیە، مێشەگرە، مێشەگیرە، پەسپەسەکۆڵە، پەسپەسکەرە، پەسپەسەکەرە. ٢- بڕ: هەڵەپەزە

**بژکۆژ** (نا.)[باک] بڕ: بشکۆژ

**بژوێن** (ئان.)[؟] حاڵی دەشت و لەوەڕگەیەک گیاوگۆڵی زۆر بێ، زەمەند. **جێ ~ بوون:** (کن.) جێگە خۆش بوون، جێ زەمەند بوون.

**بژۆڵ** (ئا.) بڕ: برژانگ

**بژە**[1] (ئا.)[زا] بڕ: برژانگ

**بژە**[2] (گیان.)[زا] بڕ: بزن

**بژی** (ئا.)[باک] بڕ: بژ1

**بژیشک** (نا. ل)[ب2 + ژی + شک] کەسێک کە بە نەخۆش را دەگا و شارەزای نەخۆشییە و دەوا و دەرمان دەنووسێ، حەکیم، دوکتور.

**بژیو** (نا. ل)[ب2 + ژی + و] ئەوەندە داهات و خواردەمەنییەک کە مرۆڤ یا



گــيـــاندار بـۆ زيندوو مـــانەوە و ژيان پێويستی پێيەتی، مايەی ژيان.

**بژيـوە** (نـا. ل)[ب2 + ژی + وە] بـڕ: بژيويی. ‌:: بە يەکجاريو بە جێ نايەڵم، لەوڕۆوە زەخـيـرە و بژيوەی حـەو سـاڵو مـاوە (سـەعـيـد و مـيرسـيـوەدين ل ٨٧) ئارامـی دڵەکـەم چەپکێکم لەو گـوڵانـە بۆ پکە حـەواڵە/ تا بۆنی ئەو گـوڵە ببێ بە بژيوەی دڵم (لاس و خەزاڵ ل ٦٤).

**بژيويی** (نا. ل)[بژيو + ئی] کەرەسەی پێداويسـتی زيندوو مـانەوە و پێ ژيانی مـــــرۆڤ وەک ئـارد و ئـازووقـــــە و خـواردەمـەنی، بژيوە. ‌:: پياوکە دەبێ بۆ ئەو مـانگە بيرێک بکەيەوە بژيوييمـان دە ماڵ دا نەماوە.

**بژێر** (ئان. فـا)[لە: بژاردن] بـە ناوەوە دەلکێ و مانای بژێردراو دەدا، ژمێر. ‌:: دانبژێر، شوکرانەبژێر.

**بژێک** (گيـانـ.)[بژ (بز3) + ئێک][زا] گيسک، گيسکەنێر

**بـس** (نـا.) ١ـ بـڕ: بـسـت. ٢ـ بـڕ: بستە1/١.

**بست** (نا.)[ئەو: ڤيی تەسـتەی ـ پەه: ڤيـتيـست، ڤيـديست، ڤيـتـەست. لۆر: بێگێس ـ فـــار: بدست. باک: بست، بۆست، بـهـۆست، بـوهست ـ ناو: بس، بست، بنگس، بنگووس، بۆست ـ باش: بگس ـ هەو: بنگۆس، بونگەسـە، ويەسـە] ١ـ ئەندازەيەکـە بـۆ پێـوان، پەنجـەکـانی دەست لێک دەکـــرێنـەوە و لـە ســـەری قامکی گەورە هەتا ئاخری قامکی تووتە دەگرێ و رادەکـەی بە دەسـتی گـەورە و چووک دەگـۆڕدرێ، ڤينجـە، ڤينجـەو. ٢ـ بڕ: بستە1/١.

**بســــتک** (نا. ل)[بست + ک] بڕ: بستە1/١ و ٢.

**بســـتــوو** (نا. ل)[بست + ئوو] ١ـ کلکەی کـێـو کـە چەمـاوەوتەوە سـەر دەشـتـايی و چی وای نەمـاوە تێکەڵ بە دەشت بێ، ملـە، ياڵ، گــردەشـــان. ٢ـ تەپۆڵکەيەکی بەرزايی و درێژايی کەم بێ. ٣ـ بڕ: بستە1/١.

**بســتــە**[1] (نا. ل)[بست + ئە] ١ـ شـــيـــشـــيکی ئاسنی درێژ و پان و ئەسـتـوورە، سـەرێکی لە تۆپی پەڕەداری ئاش هەڵدەکێشرێ و سەرەکەی ديکە لە کـــونی تـەورە دەخـــرێ و بە هـێـــزی ئاو کـاتێک تۆپەکـە وەگـەر دەکـەوێ، بسـتـە دەسـووڕێنی و ئەويش بەرداشی سـەرەوە وەگەڕ دەخا، بڵۆسک، بڵسک، بلووسک،

بست/٢، بس/٢، بستوو/٣، بستک. ٢ـ پارچە ئاسنێکی پانە، بە سەر تەندوور یا ئاورگ دا رایەڵی دەکەن و مەنجەڵ و دیزەی لە سەر دادەنێن، بستک، بلووسک. ٣ـ تەقەی قامک، چەقەنە، پل.

~ **لێدان:** چەقەنە لێدان، پل تەقاندن.

**بستە** 2 (گیا.) بڕ: پستە

**بستەباڵا** (ئان. ل)[بست + ئە + باڵا] کەسێک کە باڵای کورتە، قوڵە، چڵەنۆک، باوەعومرە، باوەقۆرەت.

**بسک** (نا.)[باک: بسک ـ ناو: بسک ـ هەو: بسک ـ زا: بسک، بسکە] ١ـ مووی سەر لاجانگی ژنان، ئەگریجە. ٢ـ پرزە و کاکۆڵی سەر گەنمەشامی. ٣ـ کاکۆڵ، پەرچەم. ٤ـ (مجـ.) کاکۆڵ و زولفی گیاوگۆڵ. ؛؛ پێش ئەوەی شنەی بەیانی / بسکی بەرەزا ببزێوێ (تاریک و روون ل ١٨٥).

**بسکە** 1 (نا.) نیشانەی بە دەماغی و دڵخۆشی لە روخسار دا، بزە. || **بسکەی سمێڵ:** دڵخۆشی و کەیفخۆشی وەها کە سمێڵەکان جووڵەیەکی کەمیان بێ، تووکەی سمێڵ. ***بسکەی سمێڵ هاتن:** دڵخۆش بوون و کەیف ساز بوون لە بەر هەر هۆیەک، تووکەی سمێڵ هاتن. ؛؛ ئەوە چ باسە کاکە هەر بسکەی سمێڵانت دێ!

**تێبینی:** بسکە چ پەیوەندی بە سەر بسک ـ ەوە نیە. بسکە دەگەڵ وشەی بزە هەر یەک وشەن و دوو پیتی « س » و «ز» جێگۆڕکەیان کردوە. بسکە و بزە هەردووکیان لە ڤەز vaz ی ئەوێستایی بە مانای جووڵە کردن و بزووتن کەوتوون و لە بسکە دا ئەو جووڵە ناسکەیە کە بە لێوەکان دەدرێ یا بە گشتی سمێڵ جوولەیەکی کەم دەکا. (هس: بزە)

**بسکە** 2 (نا.)[زا] بڕ: بسک

**بسکەبسک** (نا. ل)[بسکە1 + بسک] بسکەی پەیتاپەیتا، زۆر دڵخۆش.

**بسمار** (نا.) بڕ: بزمار

**بسمارە** (نا. ل)[بسمار + ئە] بڕ: بزمارە/١

**بشاڤتن** (چا. م)[باک] بڕ: پشاوتن

**بشقول** (نا.)[باک] بڕ: پشکەڵ

**بشکاڤتن** (چا. ل)[باک] ١ـ بڕ: پشکووتن. ٢ـ پشکنین، هەڵوەشاندنەوە، لە باڵ یەک دەرهێنان، لێک کردنەوە.

**تێبینی:** بشکاڤتن کە لە زاراوەی باکووریی دا بە هەر دوو مانای



پشکووتن و پشکنین دێ و لە راستیش دا هەر یەک سەرچاوەیان هەیە و لە دوایی مانای جیایان پەیدا کردوە.

**بشکول** (نا.)[باک] بڕ: پشکەڵ

**بشکۆژ** (نا.)[باک] ١ـ غونچە. ٢ـ دوگمە، قۆپچە، پژکۆژ، بژکۆژ.

**تێبینی:** بشکۆژ، بژکۆژ و پژکۆژ لە رەگی بشکافتن و پشکووتن دەکەون.

**بعیڤ** (نا.)[باک] بڕ: بادام

**بغورد** (نا.) بڕ: بخوور

**بڤ** (نا. د) وشەیەکە بۆ ترساندنی منداڵی ساوا لە شتێک کە جێی مەترسی هەیە، بڤە.

**بڤر** (نا.)[باک] بڕ: تەور

**بڤـە** (نا. د) ١ـ بەرگری و مەنع لە منداڵ بۆ دەست لە شتێک نەدان. ٢ـ (مجـ.) مەترسی، خەتەر. ∷ ئەمن خۆ لەو کارە بڤەیەی نادەم، دەترسێم تووشی گرتن بێم.

**بکوژ** (ئان. فا)[ب2 + کوژ] ١ـ کەسێک کە خەڵک بکووژێ، قاتڵ، پیاوکوژ. ٢ـ تاجییەکی کە باش راو بکا. ٣ـ (مجـ.) بە دەستەڵات و بە برشت.

**بگار** (نا.)[ئەر] بڕ: بوار

**بگاردن** (چا. م)[بڕ: بواردن][ئەر] ١ـ بواردن، هەڵبواردن. ٢ـ تێپەڕاندن، تێپەڕین.

**بگارە** (نا. ل)[بگار + ئە][ئەر] بڕ: بوارە. ~ **دان:** بڕ: بوارە دان

**بگربگر** (نا. ل)[ب + گر (گرتن) + ب + گر(گرتن)] بڕ: بگرەوبەردە. ∷ پاشی بیست و پێنج شەوەی لە شارەکەی کۆنە موسڵێ دەبۆوە بە بگربگر و جاڕ کێشانە (سەعید و میرسێوەدین ل ٩١).

**بگردگ** (نا. مفـ.)[لە: بگاردن] [ئەر] بڕ: رابوردوو

**بگردن** (چا. م)[ئەر] بڕ: بووردن

**بگرەبگرە** (نا. ل)[ب + گر (گرتن) + ئە + ب + گر(گرتن) + ئە] بڕ: بگرەوبەردە. ∷ لەو بگرەبگرە، داد و بستێنە / دایکی بە گریان شامی بۆ هێنا (بارام و گوڵندام ل ٥٦).

**بگرەوبەردە** (نا. ل)[ب + گر (گرتن) + ئە + و + بەر + دە (دان)] شێواوی و ئاڵۆزی و هات و هاواری کۆمەڵێک بە یەکەوە، هەنگامە، هەراوبگر، هەراوهوریا، بگربگر، بگرەبگرە،

بگرەوبێنە.

**بگرەوبێنە** (نا. ل)[ب + گر (گرتن) + ئە + ب + ئێن (هێنان) + ئە] بڕ: بگرەوبەردە. :: کوا قاوە و قلیان، پیاڵەی فەغفووری / کوا بگرە و بێنەی حاکم دەستووری (بارام و گوڵندام ل ١٠٨).

**بگێڕ** (نا. فا، ئان. فا)[ب2 + گێڕ1] کەسێک کە لوا دەپەستێوێ و لباد ساز دەکا، کارگەچی، نمەدماڵ، نەووگماڵ.

**بگێڕیی** (حم.)[بگێڕ + ئیی] کارێک کە نمەدماڵ دەیکا، کارگەچێتی.

**بلا** (ئام.)[باک ـ ئەر] بڕ: بڵا

**بلالووک** (گیا.)[باک] بڕ: بەلاڵووک

**بلام** (نا. ل)[بل (بەر) + ئام] قایشێکە لە تەنگەی ئەسپی سەرکێشەوە لە لغاو قایم دەکرێ بۆ ئەوە کە ئەسپ سەری هەڵناوێ یا سوار هەڵنەگرێ، بلاو. :: هیوای بەختەوەری ئەهات زیاد بێ بەلام دێوەزمەی شەڕ / بە چوارناڵ ئەوە وەک ئەسپی سەرکێشی بێ بلام دێ (هێدی ل ٣٨١). (بڕ: تێبینی: بەرمامک)

**بلامک** (نا. ل)[بڵ (بەر) + مامک][باک] بڕ: بزمک.

**بلانە** (ئام.)[ئەر] بڕ: بڵا

**بلاو**[1] (نا.)[ئەر] بڕ: بلام

**بلاو**[2] (ئان. فا)[ب2 + لاو (لاواندنەوە)][ئەر] کەسێک کە بە مردوو هەڵدەڵێ، لاوێنەری مردوو.

**بلبل** (نا.) بڕ: بولبول

**بلچ** (گیا.)[؟][ئەر] ١ـ دارێکی خۆڕسک و لک دڕکاوییە، هەندە بەرز نابێتەوە، گوڵی سپی و بۆنخۆشن، لە کوردستان زۆرە، بەرەکەی دەمەوە پاییز دەگا و دوو ڕەنگی سوور و زەردی هەیە، Crataegus melanocarpa و crataegus oxyacantha ناوی لاتینی ئەم دارەن. ٢ـ بەری ئەم دارە کە بە قەرا فندقێک دەبێ و بە رووتی دەخورێ. & گێوژ، گۆێژ، بلچی.

**بلچەزەردە** (گیا.)[بلچ + ئە + زەرد + ئە] گێوژی زەرد.

**بلچەسوورە** (گیا.)[بلچ + ئە + سوور + ئە] گێوژی سوور.

**بلچی** (گیا.)[هەو] بڕ: بلچ

**بلسک** (نا.)[زا] بڕ: برووسک

**بلق** (نا.)[باک] بڕ: بڵق

**بللوور** (نا.) بڕ: بلوور

**بلند** (ئان.)[باک] بڕ: بڵند

**بلوار** (نا.)[فەر: boulevard]
شەقامی گەورە کە نێوەڕاستەکەی بە شیناوەرد و دار و چیمەن خۆش کراوە.

**بلوین** (نا.) بڕ: بلوێر/٢.

**بلوێر** (نا.) ١ـ ئامرازێکی مۆسیقای کوردییە لە قامیش ساز دەکردرێ، حەوت کونی هەیە، بلوور2، لوولە، لوولک، لولی، پلوور. ٢ـ لوولەیەکی چێوی داتاشراو و تایبەت ساز کراوە، لە بن بێشکەی منداڵ دەیبەستن، کاتێک منداڵی نێو لانکە میز دەکا پێی دا دەچێتە نێو تەنەکەیەک (ئاوخانە) و خۆی پیس ناکا، لوولک، بلوین، بلوور. ~ **بۆ گا لێدان:** (کنـ.) قسە کردن بۆ کەسێک کە چ تێنەگا. ~ **بەزاندن:** خۆ رزگار کردنی منداڵ لە بلوێری نێو لانکە و میز دەبنە خۆ کردن. :: ئەوە چەند شەوە ئەو منداڵە بلوێری دەبەزێنێ و میز دە بنە خۆی دەکا. ~ **ژەنین:** دەنگ دەرهێنان لە بلوێر بە رێک و پێکی، بلوێر لێدان. ~ **لێدان:** بڕ: بلوێر ژەنین. **بە بلوێری کەسێک هەڵپەڕین:** (کنـ.) بە قسە و مەیل و هەوای کەسێک جووڵانەوە. ‖ **بلوێری شەیتانی:** (کنـ.) زمانی لووس و هەڵخەڵەتێنەر. :: جا چاو بەو منداڵییەوە چلۆنمان کڵاو لە سەر دەنێ زمانی دەڵێی بلوێری شەیتانییە!

**تێبینی:** زەبیحی ریشەی ئەم وشەیەی برۆتەوە سەر لووراندن.[ب + لوێر (لووراندن)] (بڕ: قامووس ب ٢ ل ٩٤). بە بڕوای من بلوێر و هاوتاکانی گشتیان لە وشەی لوولە کەوتوون بە لەبەر چاو گرتنی ئاڵوگۆڕی پیتی « ل » و « ر » دەگەڵ یەکتر.

**بلوێربەزێن** (ئان. فا)[بلوێر/٢ + بەزێن] ١ـ منداڵێک کە لە نێو لانکە دا خۆی دەجووڵێنێتەوە و خۆ لە بلوێر رزگار دەکا و میز دە بنە خۆی دەکا. ٢ـ (کنـ.) هار و هاژ ، دانەسەکناو و بزۆز. & بلەربەزێن.

**بلوێرپێچ** (نا. ل)[بلوێر/٢ + پێچ] پارچە پەڕۆیەک کە لە لێواری بلوێری لانکەی دەپێچنەوە هەتا نێوگەڵی منداڵی ئازار نەدا، بلوێرپێچک.

**بلوێرپێچک** (نا. ل)[بلوێر/٢ + پێچ + ک] بڕ: بلوێرپێچ

**بلوێرژەن** (ئان. فا)[بلوێر/١ + ژەن] کەسێک کە شارەزای بلوێر لێدانە، بلوێرئەنگێو، لوولەژەن، لوولکژەن،

پلوورژەن.

**بلوێرئەنگێو** (ئان. فا)[بلوێر/١ + ئەنگێو] بڕ: بلوێرژەن

**بلۆق** (نا.)[پەهـ: ئاپیلەک] ١ـ پۆرگێکی ئاوداره کە لە بەر سوانی پێستی دەست و پەل بە ئامرازێکی وەک پێمەرە سەر هەڵدەدا، یا ئەوە کە بە سووتان و ئاوی کوڵیو وە لەش کەوتن ئەم پۆرگە پەیدا دەبێ، ئاوڵە/٢، تلۆق، گۆزاوڵە، پفکە. ٢ـ [باک] پۆرگ. ٣ـ [باک] بلّق. **~ کردن:** پەیدا بوونی بلۆق لە سەر پێستی لەش لەبەر هەر هۆیەک.

**بلۆک** (نا.)[فەر: bloc] کۆمەڵە وڵات و دەوڵەتێک کە یەکیەتییەک بۆ مەبەست و ڕێبازێک پێک بێنن. ◊ بلۆکی ڕۆژاوا، بلۆکی کۆمۆنیزم.

**بلۆمە** (نا. ل)[بل (بەر) + ئۆمە][باش] بڕ: بزمک. هس: بەرمامک

**بلوور¹** (نا.)[پەهـ: بێلوور لە یون: be-ryllos] ١ـ کانییەکە وەک شووشە ڕوونە لە کان دەریدێنن و دەیتاشن. ٢ـ مادەی دەسکردە کە وەک بلوور سازی دەکەن، کریستاڵ، بللوور. ٣ـ شووشەی سەر لامپا، شووشەچرا، شووشەلامپا. ٤ـ (مجـ.) ئەندامی ساف و بێگەرد و جوان. ◊ گەردن بلوور.

**بلوور²** (نا.) بڕ: بلوێر/١ و ٢.

**بلووریی** (ئان. ل)[بلوور + ئیی] ١ـ هەر شتێکی لە بلوور ساز کرابێ. ٢ـ هەر چی کە لە باری ڕەنگ و ورشەوە وەک بلوور وابێ. ٣ـ (نا.) پارچەی سپی لە لۆکە ساز کراو کە بۆ کراس و دەرپێ و کفن کەلکی لێوەردەگرن، مەڕمەڕشا، هومابیل.

**بلوورین** (ئان. ل)[بلوور1 + ئین] هەر چێک کە پێوەندی بە بلوورەوە هەبێ، سازکراو لە بلوور.

**بلووسک** (نا.) بڕ: بستە1/١ و ٢

**بلووک** (نا.)[؟] ١ـ بەش، دەستە، کۆمەڵ. ٢ـ کۆمەڵێک گوند و دێی ناوچەیەک. ٣ـ بەشێک لە سپای عوسمانییەکان.

**بلوول** (نا.)[باک] لوولەی ئافتاوە و مسینە.

**بلەربەزێن** (ئان. فا)[بلەر (بلوێر) + بەزێن][ئەر] بڕ: بلوێربەزێن

**بلەوەز** (نا.)[عەر: بوالهوس] ١ـ کەسێک کە گوێ ناداتە قسەی کەس و هەر بە قسەی خۆی دەکا، لاسار. ٢ـ

مــرۆی مــلــهــوڕ و زاڵم، دیکتــاتۆر. ٣ـ هەوەسباز.

**بلیـارد** (نا.)[فەر: billard] جۆرێک یاری گــەورەســالانە، مــیــزێکی پانە بە ئەندازەی تایبەتی کە شەش کونی تێدایە و بە گۆیەکی چووکی خڕ کۆمەڵە گۆیەکی دیکەی بە دارێکی درێژ تێداوێن.

**بلیت** (نا.) بڕ: بلّیت

**بلیمەت** (نا.ـ ئان.)[عەر: بوالهمة] ١ـ مـرۆڤی زۆرزان و هەڵکەوتوو، نابغـە. ٢ـ منداڵی زۆر زان، منداڵێک کــە پتــر لە تەمەنی دەزانێ، سۆدرە.

**بلیــۆن** (ژ.)[فــەر: billion] هەزار ملیۆن، ملیارد.

**بلێچ** (نا.)[باک] بڕ: برووسک

**بــڵ** (ئـان.)[؟] ١ـ زۆر نــەرم، شـل. ٢ـ میوەیەکی شەق کە پتر لە رادە گەیشتبێ و نـەرم بـووبێ و تـامـی گــــۆڕابێ. ⁂ شـووتی بڵ، هەناری بڵ. ٣ـ مەمکێک کە وەک پێـشـوو تورت و شــەق نەمـابێ و بە تەواوی نەرم بـووبێ. **~ بوون:** پتــر لە رادە نـەرم بـوون و لە کــــەلک کــــەوتن، نەمانی تورتی و شەقی.

**بلا** (ئام.) ١ـ ئەمری چاوگی هێشتن یا هێلان، بێڵە، بهێڵە، ئیزن بدە، لێگەرێ، دەبا. ٢ـ ئامـرازی شـەرتە. ⁂ بلا بیبـینم دەزانم چی لێـدەکـەم. & بلا، بـەلا، بەرا، با5، بلانە، بلانە.

**بلاچە** (نا.)[باش] بڕ: برووسک

**بلاڵووک** (گیا.)[ئەر] بڕ: بەلاڵووک

**بلاڵووکە کێفیلە** (گیا.)[بلاڵووک + ئە + کێف + ئیلە][ئەر] بڕ: بەلاڵووک

**بلامک** (نا. ل.)[بڵ (بـەر) + مـــامک] [باک: بلامک ـ ناو: بلامک ـ باش: بلۆمە] بڕ: بزمک. هس: بەرمامک

**تێبینی:** بلامک و هاوتاکانی هاوماناى بزمک ـ ن بەلام لە باری ریشــەوە دەچنە سـەر بەرمامک هەرچەند ماناکان بۆ دوو شتی جیاواز دەکوترێن.

**بلانە** (ئام.)[ئەر] بڕ: بلا

**بلاو** (ئـان.)[باک: بـەلاڤ ـ نـاو: بـلاو، بـراو ـ باش: بـلاو ـ هـەو: ولاو، وەلاو ـ زا: ڤـلا] ١ـ شــتـی بە کــۆمــەڵی لێک پرژاو، پەخش. ٢ـ رۆیشــتنـی دەنگ و قــســە و بـاس بـۆ دوور و دەورووبـەر. **~ بـوون:** لێک پـرژان، لێک دوور بوونەوە، پـەخش بوون، بـلاو بـوونـەوەی/١. **~ بوونـەوە:** ١ـ بــڕ: بــلاو بــوون. ٢ـ دەنــگـدانــەوەی

دەنگۆ، شــایع بوون. ⁂ وا بڵاو بۆتەوە گــۆیا ژنەکـــەت تەڵاق داوە. ٣ـ دابەش بوونی نووسـراوە و هەر شـتێکی دیکەی لـەم بابـەتە لە نێـــو خــــەڵک دا، پەخش بوونەوە. ⁂ حـەسـەن زیرەک نزیک سـەد شـریتی بڵاو بووتەوە. ٤ـ پێ گـەیشـتنی دەنگ و ڕەنگی کـەرەسـەی ڕاگـەیاندنی وەک ڕادیۆ و تلویزیۆن. ~ **کـردن:** پرژ کـــردن و لێک دوور کـــردنەوە، پەخش کردن، بڵاو کردنەوە/١. ~ **کردنەوە:** ١ـ بڕ: بڵاو کـردن. ٢ـ ڕاگـەیاندنی دەنگۆ و شایعە بە خەڵک. ٣ـ دابەش کردنی شتی دەرکـــراوە لە نێـــو خـــەڵک دا، پەخش کـردنەوە. ⁂ ئەو ڕاگـەیەندراوە بەرە نێـو خۆ پیشـان دان و بڵاو کەوە! ٤ـ نیشـان دان و بە گـــــوێ گـــــەیاندن بە هـۆی کـــەرەســـەی ڕاگـــەیاندنی وەک ڕادیۆ، تلویزیۆن.

**بڵاوکراوە** (نا. مفـ.)[لە: بڵاو کردنەوە] نووسـراوەیەک کـە بۆ ئاگاداری خـەڵک بڵاو دەبێتەوە.

**بڵاوە** (نا. ل)[بڵاو + ئە] لە یەک دوور، پەراکـەندە، براوە. ~ **پێکردن:** لە یەک دوور خــستنەوەی ئاپوورەی خــەڵک. ⁂ خۆپێشـاندانی خەڵک کە گەیشـتە مەیدان پۆلیس بـڵاوەی پێ کـــردن. ~ **کــردن:** لێک جیا بوونەوە و دوور کەوتنی کۆمەڵ و ئاپوورە لە یـەکـتـر، بڵاوە لێکردن. ⁂ کـاتێک گـەیشـتـمـە مزگـەوت جـەمـاعـەت بڵاوەیان کردبوو. ~ **لێکردن:** بڕ: بڵاوە کردن.

**بڵح** (ئان.)[؟] ١ـ کـەسێک کە کـار و کـردەوەی پەسـەند نیـە، هەرزە، جـڵف، حـەکـەدار، برح. ٢ـ [ئەر] کـەسێک کـە درەنگ تێبگا، گێژ، حۆل.

**بڵحانە** (ئاک. ل)[بڵح + ئانە] کار و کردەوەی وەک کەسی بڵح، حەکەدارانە، جلڤانە.

**بڵحایەتی** (حم.)[بڵح + ئایەتی] کـاری ناپەسـەند و بڵحـانە کـردن، بڵحێتی، بڵحی.

**بڵحێتی** (حم.)[بڵح + ئێتی] بڕ: بڵحایەتی.

**بڵحی** (حم.)[بڵح + ئی] بڕ: بڵحایەتی.

**بڵسک** (نا.) بڕ: بستە1/١.

**بڵق** (نا.) ١ـ پۆرگێکی بچووکی نێو بۆشـە کـە هۆی زەبری دڵۆپی باران لە سـەر ئاو پەیدا دەبێ. ٢ـ پۆرگێک کـە لە سەر ئاوەکی کوڵیو پەیدا دەبێ. & بڵقاو،

برق، بلق، بلۆق. ~ **دان:** وەكوڵ هاتنی ئاوەكی و بڵق لێ پەیدا بوونی. :: ئەو قابڵەمە هەر بڵقان دەدا و كەس نیە دایگرێ. . || **بڵقی سەر ئاو:** (كنـ.) كار و مەسەلەیەكی بە سانایی تێك بچێ. ***بوونە بڵقی سەر ئاو:** (كنـ.) هەڵوەشانەوە، تێكچوون، پووچەڵ بوونەوە و بە ئاكام نەگەیشتنی كار و مەسەلەیەك. ***لێكردنە بڵقی سەر ئاو:** (كنـ.) تێكدان و هەڵوەشاندنەوەی كار و مەسەلەیەك، پووچەڵ كردنەوە.

**تێبینی:** بڵق دەگەڵ بلۆق هەر یەك ریشە و سەرچاوەیان هەیە.

**بڵقاو** (نا. ل)[بڵق + ئاو] بڕ: بڵق

**بڵقن** (ئان. ل)[بڵق + ن2] كەسێك كە هەمیشە چڵمی لە سەر كونی كەپۆیەتی و بڵقان دەدا، چڵمن.

**بڵقە** (نا. ل)[بڵق + ئە4] دەنگێكە كە لە توقینی بڵق و پۆرگ بەرز دەبێتەوە.

**بڵقەبڵق** (نا. ل)[بڵقە + بڵق] ١ـ دەنگی پەتاپەیتای بڵق. ٢ـ دەنگێكە كە لە وەسەر كەوتنی هەوا لە نێو ئاو دا بەرز دەبێتەوە. **وە ~ كەوتن:** كوڵانی ئاوەكی و بڵقە لێ پەیدا بوون.

**بڵم** (نا. د) دەنگی وشتر، لرفە، بڵمە

**بڵماندن** (چا. م)[لە: بڵمە] ١ـ دەنگ بەرز كردنەوەی وشتر، لرفاندن. ٢ـ (كنـ.) قسە كردنی نائاشكرا.

**بڵمە** (نا. د) دەنگی وشتر، لرفە.

**بڵمەبڵم** (نا. د)[بڵمە + بڵم] ١ـ دەنگی پەتاپەتای بڵمەی وشتر، لرفەلرف. ٢ـ قسەی نائاشكرا كە باش تێی نەگەن. :: ئەرێ ئەو بڵمەبڵمەت لە چیە دەنگ بەرز كەوە خۆ كەس نازانێ دەڵێی چی!

**بڵن** (ئان.)[ئەر] بڕ: بڵند

**بڵنایی** (نا. ل)[بڵن + ئایی][ئەر] بڕ: بڵندایی

**بڵند** (ئان.)[ئەو: بێرێزەنت ـ پەه: بولەند. باك: بلند ـ ناو: بڵند، بڵن، برند، بڵیند ـ باش: بڵێن] ١ـ هەرچی كە لە شوێنی خۆیەوە قیت بووبێتەوە و سەرێكی بە زەوییەوە بێ. :: لاولاو پێنج گەز بڵیند دەبێ. ٢ـ هەرچی كە لە زەوی جیا بۆتەوە و وەحەوا كەوتوە. :: بادەوەكەی من زۆر بڵند بوە. & بەرز. ~ **بوون:** ١ـ چوونە حەوا، بەرز بوونەوە. ٢ـ لە بەر كەسێك هەستان. ~ **بوونەوە:** هەستانەوە، بەرز بوونەوە، چوونەوە سەر. ~ **كردن:**

هەڵێنان، بەرز کردنەوە. **لێ ~ بوون:** بە تووڕەیی هەستان و ڕاپەڕین لە ئاست کەسێک بۆ شەڕ و لێدان و هەڕەشە، لێهەستان، لێڕاپەڕین، لێ ڕاست بوونەوە.

**بڵندایی** (نا. ل)[پەه: بولەندییه][بڵند + ئایی] ١ـ ڕادەی بەرزایی هەر شتێک بە باری قیتی دا. ٢ـ جێگا و شوێنی بەرز & بەرزایی، بڵندیی، بڵێندایی.

**بڵندگۆ** (نا. ل)[بڵند + گۆ] ئامرازێکە بە هێزی کارەبا یا باتری ئیش دەکا و دەنگی وێژەر زۆر دەکـــــا و هەتا مەودایەکی دووری دەبا، بڵێندگۆ

**بڵندیی** (نا. ل، حم.)[بڵند + ئیی] بڕ: بڵندایی

**بڵۆسک** (نا.) بڕ: بستە1/١.

**بڵووچە** (نا.)[؟] بریتییە لە دەفرێکی بچووک لە ئاش دا باراشهاڕ بەو دەفرە پێوانەیەک ئارد ئەدات بە ئاشەوان بە ناوی (ئاردەبارەوە) پاش ئەوەی کە مزەشی لێ ئەستێنرێت (کشت و کاڵ ب ا ل ٣٧). کۆجەڵەیەکی بچکۆڵەیە مزەی ئاشی پێ ئەگیرێ (خاڵ ب ١ ل ١٢٥). کەپووڵە، کۆجیلە.

**بڵووز** (نا.)[فەر: blouse] جلێکی پەشمی یا لۆکەیی بێ دوگمەی ژنانە و پیاوانەیە، پتر لە کاتی سەرما دا لە سەر کراس دەیکەنە بەر، کێش.

**بڵێت** (نا.)[فەر: billet] کاغەزێکی چاپ کراوە، نرخی دیاری کراوی هەیە و دەکڕدرێ بۆ کەرەسەی هاتوچۆ یا ئەو شوێنانەی کە خەڵک زۆر دەچن وەک سینەما، قەتار، پاس، ...، بیتاقە، بلیت.

**بڵێتفرۆش** (ئا. فا)[بڵێت + فرۆش] کەسێک کە لە شوێنی تایبەتی دەدەنیشێ و خەڵک بڵێتی پێویستی لێدەکڕن.

**بڵێتفرۆشیی** (حم.)[بڵێتفرۆش + ئیی] کار و پیشەی کەسی بڵێتفرۆش.

**بڵێمانە** (نا.)[؟] پیسایییەکی خڕ و گرمۆڵەگرمۆڵەی ڕەقە کە لە بەر هەندێک نەخۆشی ڕیخۆڵە لە پاشەوە دێتە دەر.

**بڵێند** (ئان.)[موک] بڕ: بڵند

**بڵێندایی** (نا. ل)[بڵێند + ئایی] [موک] بڕ: بڵندایی

**بڵێندگۆ** (نا. ل)[بڵێند + گۆ][موک] بڕ: بڵندگۆ

**بڵێزە** (نا.) بڕ: بڵێسە

**بڵێسە** (نا.)[لۆر: بلیز. ناو: بڵێسە،



بڵێـزه، برێسـه ـ باش: بڵێسـه ـ هەو: بڵێسه] ١ـ گڕی ئاگر که بەرز دەبێتەوه، گڕ، کڵپە. ٢ـ شۆقی تەقەی گولله که له سەر لوولەی چەک دیاری دەدا.

**تێبینی:** بڵێسە له ریشەی برێز و برێژ ـ ی پەهلەویی به مانای تەندوور که خۆی له ریشـەی برژان ـ ە کـەوتۆتەوە. لە زمـانی فـەرانسـەویی دا braiser و له زمـانی سـویدیی دا brasa به مـانای بڵێسـه و گڕی وەجـاغ و ئاورگ هەر لەو ریشەیەن.

**بڵێن** (ئان.)[باش] بڕ: بڵند

**بن**[1] (نـا.)[ئەو: بـونە، بـوونـه ـ پـەه: بون، بوون. باک: بن ـ ناو: بن ـ باش: بن ـ هـەو: بـن ـ زا: بـن، بـنـه.] ١ـ لای خـوارەوەی شـتـێک کـه دەکـەوێتـه سـەر زەوی، بنـک. ⁙ بـنی کـەوش، بنـی گۆرەوی. ٢ـ لای خوارەوەی ئەو شتانەی کـه دوو سـەریا هـەبێ، بنک. ⁙ بنـی جگەره، بنی گـۆچان. ٣ـ لای خـوارەوەی شـتی قـیت و بەرز. ⁙ بن دار، بن دیوار، بن دەرک. ٤ـ ژێرەوەی شـتـی سـەر داپۆشـراو. ⁙ بن پرد، بن مـیچ. ٥ـ ئاخری شـتێکی قوڵ و سەر داپۆشراو. ⁙ بن گـیـرفـان، بن ئەشکەوت، بن توورەکـه. ٦ـ پەردەیەکه له نێـو شـەرمی کچان دا که نیشانه کچێتی کچه و شکڵ و شـێـوەی جـۆربەجـۆری هـەیە، لە هەندێکان دا وەک خـاچه و له هەندێکان دا سـەفحـەیەکی کونداره وەک بێژینگ یا تەنیا کونێکی له نێوەڕاست دا هەیە. ئەم پەردەیه لـه یەکـەم نزیکی دەگـەڵ پیـاو دا دەدڕێ و خـوێنی لێـدێ. هەروەتر شل و قـایمـی ئەم پەردەش جـیـاوازیان هـەیە و هی وا هـەیە زۆری پێـوه ئەزیەت دەبێ و هی وا هەیە هەسـتی پێناکا و هی واش هـەیە کـه ئەو پەردەیەی نیـیـه کـه له کـوردەواری دا پێـیـان دەڵێن بن سـپی. کچێنی، کچانی، کەنیشکی. ٧ـ دەگەڵ ناوی دار دێ و مـانـای نەمـام یا ریشـه دەدا که دەینێژن. ⁙ بنه سێـو، بنەتوو. ٨ـ ریشەی هەندێک گیا که ئەستوورن یا دەبنه سـەلک، لێرەش دا بن به تەنیا نایە و دەبێ ناوی گـیـایەکه بکوترێ. ⁙ بنه توور، بنه چەوەندەر. ٩ـ بنەبان، ئاخـر. ⁙ له بنی دنیـایەش بێ دەسـتی هـەر دەخەم. ١٠ـ پاش، دواوه. ⁙ له بن پەچە، بن چارشێـو. ~ **پژان:** بڕ: بن رژان. ~ **پژاندن:** هەڵگرتنی کـچێنی و بنی کچێک بەر له زەماوەندی، بێ بن کردن، بن پژانن. ~ **پژانن:** بڕ: بن پژاندن.

~ **دانەوە:** ١ـ هەڵکوڵین و هەڵکەندنی دەوروویەری دار بۆ باشتر ئاو خواردنەوە یا بۆ دەرکێشانی. ٢ـ هەلکەندنی زەوی بۆ گەیشتن بە خار و بناغە. ~ **دە ئاو دا نەبوون:** (کنـ.) شیاوی تەواو بوون، کۆتایی پێهاتنی شتێک. :: ئەو میراتەی پێی براوە خۆ بنی دە ئاوێ دانیە، رۆژێک هەر تەواو دەبێ. ~ **رژان:** نەمانی کچێنی بەر لە مێرد کردن بە هۆی کارەسات و رووداوێک، بن پژان. :: ئەو کچە وا کەوت دەترسم بنی رژابێ. ~ **رشتن:** هەڵگرتنی کچێنی کیژێک بەر لە مێرد کردنی، بن پژاندن، بێ بن کردن. ~ **کردن:** خڕۆکە بوونی بنی ئەو گیایانەی بەرەکەیان دە بن خاک دایە یا دەبنە سەلک. :: گیزەرەکان هێشتا بنیان نەکردوە بەڵام توورەکان بنیان کردوە و بۆ خواردن دەبن. ~ **هەبوون:** کچێک کە کچێنی و بنی هەڵنەگیراوە، کچێنی هەبوون، کەنیشکی هەبوون. :: ئەو کچە زۆر حەکەدارە نازانم بنی هەیە یا نا؟ **چوونە ~ کەسێکەوە:** (کنـ.) دە گوێ خوێندن و هەڵخەڵەتاندنی کەسێک، کەسێک بەرەو کارێکی خراپ هان دان، لە بن دانیشتن. :: حەمە چوە بن ئەو کورە بەستەزمانە و هەتا فێرە هێرۆیینی نەکرد لە کۆڵی نەبوە. **دە ~ چۆکی خۆ نان:** (کنـ.) دەست بە سەر داگرتنی شتێک و کردنە هی خۆ. **لە ~ دان:** وە ئەستۆ نەگرتن، وە خۆ نەگرتنی قسە و کار و مەسەلەیەک، لە بن دەرچوون. **لە ~ دانیشتن:** (کنـ.) لە رێ لادان و فریو دانی کەسێک بە دە گوێ خوێندن و هان دان، چوونە بن. **لە ~ دەرچوون:** وە ئەستۆ نەگرتنی ئەرک و کار و مەسەلەیەک و خۆ لێدزینەوە. **لە ~ هاتن:** تەواو بوون، دوایی هاتن، بنە لێهاتن، بنە لێبران. :: هەمیشە دیدە بەحری گەوهەرە و دڵ پڕ لە نەقدی داغ/ لە بن نایێ بە مەسرەف چونکە خەزنەی من خودادادە (مەحوی ل ٢٦٩). **لە ~ هاتنە دەر:** (کنـ.) لە توانا دا هەبوون، دەرۆست هاتن، تاقەت پێشکان. :: کرێی ئەم ماڵە زۆرە لە بنی نایمە دەر. **لە ~ هێنان:** تەواو کردن، دوایی پێهاتن، بنە لێبرین، بنە لێهێنان. **لە بنی کوولەکە دان:** (کنـ.) هەموو شتێک دەربڕین و ئاشکرا کردن. **وە ~ خۆ دان:** کەسێک خستنە ژێر خۆ. :: حەمەی وە بن خۆی دا و تێر و پڕی تێهەڵدا. **وە ~ دان:** خستنە ژێر، وە بنەوە دان. **وە**

~ **کەوتن:** کەوتنە ژێر، وە بنەوە کەوتن. **وە بنەوە دان:** بڕ: وە بن دان. **وە بنەوە کەوتن:** بڕ: وە بن کەوتن. || **بنی ددان:** پووک، پدوو، بن ددان. ⁘ ئەو گۆشت کەوەیان هێند خۆش ساز کردبوو تامەکەی هێشتا لە بنی ددانم دایە. **بنی دنیا:** ١ـ ئەو شوێن و جێگایەی کە زەوی تەواو دەبێ (بە پێی بڕوای کۆن گۆی زەوی تەخت بوە و دیارە لە شوێنێکی زۆر دوور کۆتایی پێ هاتوە)، ئاخری دنیا. ٢ـ (کنـ.) زۆر دوور. ⁘ ماڵتان لە بنی دنیایەیە بەو منداڵانەوە کوا دەتوانم سەرت لێبدەم.

**بن**$^{2}$ (نا.) شێوەیەکی دیکەی بەن2 یە بە مانای دار یا گیا لە هەندێک وشەی تێکەڵاو دا و سەربەخۆ نابیندرێ. ⁘ بناو، بنێشت.

**بناچە** (نا. ل)[بن + ئاچە؟] بڕ: بنەچەک

**بناخە** (نا. ل)[بن1 + ئاخ1 + ئە] ١ـ بن و ژێری خانوو کە لە نێو زەوی دایە و خانوو لە سەر ئەو ساز کراوە و قورسایی لە سەرە. ٢ـ پایە و ئەساسی هەرشتێک. & بناغە، بنەڕەت، بنچینە، بنگە، پایە. ~ **دانان:** ١ـ دانان و دارشتنی بناخەی. ٢ـ بنیات نان و دامەزراندنی کارێک یا شتێک. ~ **دانەوە:** هەڵکەندنی زەوی بۆ گەیشتن بە خار و ئامادە کردن بۆ بناخە دانان.

**بنار** (نا. ل)[بن1 + ئار4] لای هەرە خوارەوەی کێو کە دەگاتە پێدەشت، داوێن.

**بناغە** (نا. ل)[بن1 + ئاغ (ئاخ1) + ئە] بڕ: بناخە

**بناگوە** (ئا.)[بن1 + ئا + گوە][باک] بڕ: بناگوێ

**بناگوێ** (ئا.)[بن1 + ئا + گوێ] ١ـ نەرمایی گوێ. ٢ـ نێوان ڕوومەت و گوێ. ٣ـ نزیک گوێ، پەنا گوێ. ٤ـ(مجـ.) زۆر نزیک. ⁘ مردن بە بناگوێم دا تێپەڕی.& بنانگوێ، بنانگوێچکە، بناگوێچکە، بنگوێ، بنگوێچکە، بناگوە، بناگێ.

**بناگوێچکە** (ئا.)[بن1 + ئا + گوێچکە] بڕ: بناگوێ

**بنانگوێ** (ئا.)[بن1 + ئان + گوێ] بڕ: بناگوێ

**بنانگوێچکە** (ئا.)[بن1 + ئان + گوێچکە] بڕ: بناگوێ

**بناگێ** (ئا.)[بن1 + ئا + گێ][سۆر]

بڕ: بناگوێ

**بناو**[1] (گـــیـــا.)[بن (بەن2) + ئاو] دارێکی گەورەی بە لک و پۆیە، گەڵاکانی وەک گـــەڵای بادامـــە هـەندێک پانتـــر و لێوارەکەی گڕنی گڕنییە، هەتا ٢٥ میتر هەڵدەدا و ٢٠٠ ساڵ دەژی، لە توێکڵەکەی بۆ دەرمـــــان کـــەلک وەردەگـــرن و لـە شـــەقـامـــانیش بۆ جـوانی دەیچـەقـێنن، ناوی لاتینی Fraxinus excelsior ئـەم دارەیـە. بـنـــاوی، بـنـــاوەچ، ونـاوچ، بەناف، داربەناف، دارەڕەش، قەرەقاج.

**بنـاو**[2] (ئـان. ل)[بـن1 + ئـاو] ژێـراو، قوم، نـقوم. ~ **بوون:** وە بن ئاو کەوتن، قـــوم بـوون، نـقـــوم بـوون، خنکـان. ⁘ بەرخـــەکـــە بناو بوو و لە بـەر چاوان ون بوو. ~ **کـردن:** وە بن ئـاو دان، نقـــوم کردن، قوم کردن، خنکاندن.

**بـنـاوان**[1] (نـا. ل)[بـنـە + وان] بـڕ: بنەوان.

**بناوان**[2] (نـا. ل)[بن + ئـاو + ئـان] ١ـ ئـاوێک کـە لە ســـەرچـاوەوە بە هۆی بـەند کـۆ کـراوەتەوە. ٢ـ سـەرچاوە و بنـەمـای هـەر کـار و بیـرێک. ⁘ ئەو قسـەی تۆ لە بـنـاوانـەوە هـەڵـەیـە. ~ **هەڵبـــەستن:** هـەڵبـەسـتنی بەنـد و بەست لە بـەر ئـاوی سـەرچاوەیەک بۆ پەنگاو خـواردنی کە بۆ ئاودێران کەلکی لێوەردەگرن.

**بـنـاوبـوێـر** (ئـان. ل)[بـنـاو2 + بـوێـر (رابوردن)] حـاڵی کەسـێک کە لە دەروون دا نـاساز و نەخۆشـە، نەخۆشی ڕەوانی و ڕووحی. ~ **بوون:** نـاســـاز و نەخـــۆش بـوون لـە دەروون دا، تـووشی نـاســـــازی ڕووحی بوون. ⁘ ... پاشـان عـەمـەلیـان کـردم و مـــاوەیەکی دووروودرێژ بناوبوێر بووم. (تاریک و ڕوون ل ٩).

**بـنـاورە** (نـا. ل)[بـن1 + ئـاور + ئـە] چیلکە و چاڵ و پـووش و پەڵاش کـــە بـۆ ئاور کـــردنەوە کـــەلکی لێـــوەردەگـــرن، دەستەچیلە، چاوگە، دەساگر، ئاگرگیرە.

**بناوەچ** (گـیـــا.)[بنـاو1 + وەچ؟] بڕ: بناو1

**بناوی** (گیا.)[بناو1 + ئی] بڕ: بناو1

**بنباخەڵ** (ئا.)[بن1 + باخەڵ] بڕ: بن هەنگڵ

**بن بار** (نا. ل)[بن1 + بار] لبـــاد یا قوماشێکی نەرم کە دەیخەنە سەر پشتی بارەبەر هـەتا بار برینداری نـەکـــــا و ئازاری پێنەگا. // سەربار.

**بنباغەڵ** (ئا.)[بن1 + هەنگڵ] بڕ: بن



**بن باڵ** (ئا.)[بن1 + باڵ] بڕ: بن هەنگڵ. :: بن باڵی بگرە با بڕۆین.

**بن بان** (نا. ل)[بن1 + بان] بڕ: میچ

**بنبڕ** (نا. فا)[بن1 + بڕ] بڕ: بنەبڕ. **~ کردن:** بڕ: بنەبڕ کردن

**بنبزێو** (ئان. فا)[بن1 + بزێو] گۆرانی و هەوایەک کە مرۆ وەقوونەجووڵە دەخا و مەیلی سەما کردنی تێدا دەبزێوێ، بنبزێوکە.

**بنبزێوکە** (ئان. فا)[بنبزێو + کە] بڕ: بنبزێو

**بنبەست** (ئان. ل)[بن1 + بەست] ١ـ کووچە یا کۆڵانێک ئاخرەکەی بەسترابێ و ڕێی بۆ هیچ کوێیەک نەبێ. ٢ـ (مجـ.) گیر و گرفتێک ڕێی چارەی نەبێ. **بە ~ گەیشتن:** ڕێگای چارە نەدیتنەوە، بە ئاکام نەگەیشتن، گەیشتنە بنبەست. **گەیشتنە ~:** بڕ: بە بنبەست گەیشتن.

**بنبێژنگ** (نا. ل)[بن1 + بێژنگ] وردە و خشت و خاڵی دەغڵی دابێژراو، بنژیل، بنبێژینگ.

**بنبێژینگ** (نا. ل)[بن1 + بێژنگ] بڕ:

**بنپاڵ** (نا. ل)[بن1 + پاڵ] تەنیشت، پەنا، پاڵ، بنچغ.

**بنپانک** (نا. ل)[بن1 + پانک] ئەو بەشەی زێدەی ڕەشماڵ و خێوەت لە لای دەرەوە کە وەک گوێسوانە داهاتۆتەوە بۆ ئەوەی کە باران بن ڕەشماڵ نەگرێتەوە.

**بن پڕاو** (ئان. مـفـ.)[بن + پڕاو] کچێک کە بنی هەڵگیرابێ، بێ بن.

**بن پشک** (ئان. ل)[بن1 + پشک] کچێک کە هەر بە منداڵی دەست نیشان کراوە بۆ ژن بە ژنەی براکەی یا کوڕێکی دیکەی خزمیان.

**بن پەرگ** (نا. ل)[بن1 + پەرگ] ڕیزێک چنینە لە بنی کەڵاش کە دوایی لە سەر ئەو بن پەرگە کەڵاشەکە دەچنن، پەرگەما.

**بن پەل** (نا. ل)[بن1 + پەل] گەڵای تووتن کە لە بن گەڵای گەورەی دێتە دەر و بەر لە هەڵگرتنەوەی تووتن لێدەکرێتەوە.

**بن پیاڵە** (نا. ل)[بن1 + پیاڵە] بڕ: ژێرپیاڵە

**بن پیل** (نا. ل)[بن1 + پیل] بڕ: بن

هەنگڵ

**بن تیک** (نا. ل)[بن1 + تیک] بڕ: بندروو

**بنج** (نا. ل)[بن1 + ج] ڕەگ و ڕیشەی گژ و گیا، پنج. ~ **داکوتان:** ١ـ خۆ گرتن و ڕیشە داکوتانی گژ و گیا. ٢ـ (کن.) خۆ گرتن و سەر گرتنی کارێک، جێگیر بوون. & بنەگر بوون، بنەگرتوو بوون. ٣ـ (کن.) زۆر دانیشتن و نەبزووتن. ⁙ ئەرێ ئەو میوانانە بۆ هەڵناستن بڕۆن خۆ بنجیان دانەکوتاوە.

**بنجبەست** (ئان. مف.)[بنج + بەست] ١ـ پەل و ڕیشەگیایەک کە بنجی داکوتابێ و ڕوابێ. ٢ـ (کن.) دامەزراو، خۆگرتوو. . ~ **بوون:** ١ـ بنج داکوتان. ٢ـ (کن.) دامەزران، جێبەجێ بوونی کارێک، خۆ گرتن. . ~ **کردن:** (کن.) دامەزراندن، جێبەجێ کردنی کاری کەسێک.

**بنجوو** (نا. ل)[بن1 + جوو] کەسێکی تازە موسڵمان کە بنەچەکەی جوولەکە بن، بنەجوو.

**بنجوول** (ئان. ل)[بن1 + جوول؟] بڕ: بنژیل

**بنچاخ** (نا.)[تور: بنجاق] هەر چەشنە بەڵگە و سەنەدی مڵک، قەباڵەی مڵک، قەواڵە.

**بنچاڵ** (نا. ل)[بن1 + چاڵ] دەغڵ و دانی بنەوەی چاڵ کە دوای دەرهێنانی کاو کۆتی تێکەڵ بوە و پێویستی بە خاوێن کردنەوە هەیە.

**بنچغ** (نا. ل)[بن1 + چغ؟] تەنیشت، پەنا، بنپاڵ.

**بنچک** (نا. ل)[بن (بەن2 + چک (چووک)] دار و درەختی چووکە کە زۆر لە زەوی بەرز نابنەوە، پنچک، دەوەن.

**بنچینە** (نا. ل)[بن1 + چین (چنین) + ئە] بڕ: بناخە

**بن خرمان** (نا. ل)[بن1 + خرمان] بڕ: بن خەرمان

**بن خەرمان** (نا. ل)[بن1 + خەرمان] دەغڵ و دانێک کە دوای خەرمان هەڵگرتنەوە دەمێنێتەوە و بۆ کۆ کردنەوەی جێ خەرمان دەماڵن و تێکەڵ بە خاک و خۆڵ دەبێ و لە دوایی خاوێنی دەکەنەوە، بن خرمان، بنەپیت.

**بن ددان** (نا. ل)[بن1 + ددان] ژێر ددان، بنەوەی ددان، بن ديان، پووک. ⁙ تامی ئەو سەنگەسیرەی دایکم هێشتا لە

بن ددانم دایە!

**بندرخە** (نا. ل)[؟] شەشەمین حەوتەی زستـان بە حیسـابی کـوردەواری لە مەڵبەندی هەولێر، کە دەکەوێتە نێوان بەند و مەیرەم.

**بندروو** (نا. ل)[بن1 + دروو (دروون)] ١ـ دروونەوەی زارکی جەواڵ و تەلیس و هەر شتێکی لەو چەشنە لە شوێنێکەوە کە بەتاڵایی دەست پێدەکا بۆ نەبزوونی بار و قـایم بوونی، بن تیک. ٢ـ درووماندێک کە بەنەکەی لە دەرەوە دیاری نەدا. ٣ـ دروونەوەی دەغڵ و دان لە بنەوە را بۆ زیاد بوونی کـایەکـەی. // سەردروو، سەرپاچ.

**بندڕاو** (ئان. ؟)[بن1 + دڕاو] کـار و کـردەوە و قـسـەی بێ بنەڕەت و قـۆڕ و بێجێ. :: ئەو کارە قۆڕ و بندڕاوانە چیە بە منی دەسپێری.

**بندەست** (ئان. ل)[بن1 + دەست] ١ـ حـاڵی کـەسـێک کـە لە ژێر چاوەدێری کەسێکی دیکە کار دەکا. ٢ـ حاڵی گەل یا کـەسـێکی ژێر دەست کـە بە سـووک چاوی لێ دەکرێ و لە بەش بێ بەرییە. & ژێر دەست. ~ **بوون:** ١ـ لە ژێر دەستی کەسێکی دیکە دا کار کردن. ٢ـ بێبەش و بێبەری لە چارەنووسی خۆ.

**بندەستـیی** (حم.)[بندەست + ئیی] ئاکامی بندەست بوون، ژێردەستیی.

**بن دیان** (نا. ل ـ ئان. ل)[بن (عـەر: ابن) + دیان] کـەسـێک کـە بنەچەکـەی عـیـسـایی بوون و خـۆی بووبێـتـە موسڵمان، تازە موسڵمانی مەسیحی.

**بـن دیـوار** (ئـان. ل)[بـن1 + دیـوار] حاڵی کەسی هیوا لێبڕوا کە لە بن دیوار هـەڵدەتـرووشـکـێ، بـێ هـیـوا. :: سـەرگـەردان و بن دیواری دەوان خـەزێم شـۆڕ و گـەردن زەرد و شـەدە شـلانم / هەی ئامانەتت بێ، پایز بە تەنێ (پایزە ل ٣٦).

**بـن ردێـن** (نـا. ل)[بـن1 + ردێـن] ئەوەندە مـوویەی ردێن کـە دەکـەوێتـە ژێر چەنـەگـەی پـیـاو، بن ریش. ~ **هەڵدانەوە:** تاشینی مووی ژێر چەنەگە و رێک و پێک کردنی ردێن.

**بن ریش** (نا. ل)[بن1 + ریش] بڕ: بن ردێن.

**بن رێسـمـە** (نا. ل)[بن1 + رێسـمـە] کـوتە دارێکی کـونکراو کـە زمـانەی خـوارەوەی لاشـیـپـانەی دەرگـا دەچێـتـە نێـوی و دەرگـا لە سـەری دەگـەڕێ.//

سەر ڕێسمە.

**بــن زاراوە** (نــا. ل)[بــن1 + زاراوە] ڕاوێژ و زمـانی نـاوچەیی هەر زاراوەیەک. :: بن زاراوەکانی موکریانی و ئەردەڵانی سەر بە زاراوەی ناوەندیین.

**بنژیل** (نا. ل)[بن1 + ژیل] ١ـ خشت و خــاڵی وردەی دەغــڵی دابێــژراو کــە لە بێـژینگ دەکـەوێتـە خوارەوە، بنبێـژنگ، بنبـێـژینگ. ٢ـ شـتـی زێدەی خـراپ کـە نـافــرۆشــــتــــرێ و لە ســــەر دەست دەمێنێتەوە. & بنجوول

**بن ســپی** (ئان. ل)[بن1 + ســپی] کـیـژێک کـە لە بەر چلۆنایەتی لـەشی بێ ئەوەی بێ بن کرابێ بنی نەبێ.

**بن سەر** (نا. ل)[بن1 + سـەر] ١ـ بڕ: ســەرین. ٢ـ پشـت سـەر، ژێر سـەر. ٣ـ (کنـ.) مـێـشک، نێـومـێـشک. **دە ~ دابوون:** (کنـ.) داڕشـتنی نەقشـە و پیلان لە نێـو مـێـشک دا. :: ئەو کـابرایە دوو ڕۆژە لەو دەوروبەرانە دەخـولێتـەوە دیارە شتێکی دە بن سەر دایە.

**بنشت** (نا.)[باش] بڕ: بنێشت

**بــنــک** (نــا. ل)[بــن1 + ک] ١ـ وتـە کـاغـەزێکی چووکـە لوولەی دەکـەن و لە بنی جگەرەی هەڵپێچراوی دەنێن بۆ ئەوە تووتنەکەی نەڕژێتە نێو زار یا دەرەوە، ئاغــزە، بنکە جــغــارە، دەمــە. ٢ـ بڕ: بن1/١و ٢.

**بنکڕ** (نا. ل)[بن1 + کڕ2] ١ـ بنەوەی ئەو چێشتانەی کە بە برنج ساز دەکرێ و دەیخۆن. ٢ـ بنی هەندێک چێشتی شلە کـە بە بنی قـابلـەمـەوە و مـەنجـەڵەوە دەنووسێ. :: بنکڕی فڕنی.

**تێبینی:** لە کوردەواری دا بۆ هەندێک چێشت بە تایبەت ئەوانەی بە برینج ساز دەکـرێن نان یا سـێـوکی لە بن دەنێن و دەیکەنە بنکڕ و لایەنگری زۆرە.

**بـن کـلـک** (نـا. ل)[بـن1 + کـلـک] ١ـ شــوێـنـی نێــوان کلک و پزووی قــوونی حـەیوان. ٢ـ قـوون. **~ خوراندن:** (کنـ.) فـریـو دان و هەڵخـەڵەتاندن بـە دەست بە سەر داهێنان و قسەی خۆش.

**بن کڵێشە** (نا. ل)[بن1 + کڵێشە] ١ـ ئەندەروونی لەشـی مرۆڤ. ٢ـ (مجـ.) نێو مێشک و بیر. **چوونە ~ ی کەسێکەوە:** هـاندانی کـەسێک بۆ کـردەوەی نالەبار و خراپ. :: شـەیتـان چوو بن کڵـێشـەی حەسۆ و دایکی پێ بە کوشتن دا.

**بنکۆڵ** (نا. ل)[بن1 + کۆڵ2] بنکەن، بنکەند. دەگـەڵ چاوگی کـردن دێ و ئەو

مانایانە دەدا. ~ **کردن:** ١ـ هەڵکۆڵینی بنی دیوار بۆ رووخاندنی. ٢ـ هەڵکەندنی دەورووبەری رەز و دار و تووتن بۆ باشتر ئاو خـواردنەوەی. ‹‹ شـۆرەژن بنکۆڵ نەکا برکەی بە قرچەی نیوەڕۆ / چۆن لە کاڵەک تێر دەبێ ئەو زگ زلە بێستان رنە (تاریک و روون ل ٧١). ٣ـ (کنـ.) پیـلان گـێران و ژێر کـەسێک بەتاڵ کـردن لە بنـەوە بێ ئـەوەی پێ بزانـێ. & بنـکەن کردن، بنکەند کردن.

**بنکە** (نا. ل)[بن + کە][پەھ: بونەک] ١ـ شوێنی کۆ بوونەوە و بە کۆمەڵ ژیان، مەکۆ. ٢ـ شوێنی ژیانی پێشمەرگە.

**بنکەجـغـارە** (نا. ل)[بنک + ئە + جغارە] بڕ: ئاغزە

**بنکەن** (نا. ل)[بن + کەن] بڕ: بنکۆڵ. ~ **کردن:** بڕ: بنکۆڵ کردن.

**بنکەند** (نا. ل)[بن + کـەند] بڕ: بنکۆڵ. ~ **کردن:** بڕ: بنکۆڵ کردن.

**بن کـەوش** (ئا.)[بن1 + کـەوش (کۆش)][سۆر] بڕ: بن هەنگڵ

**بنگرە** (نا. ل)[بن1 + گـرە (گـرتن)][سۆر] بڕ: بەفرەژیلکە

**بنگس** (نا.)[ئەر] بڕ: بست

**بن گڵ** (نا. ل)[بن1 + گڵ] ١ـ ژێر گڵ، بن زەوی. ٢ـ (مـجـ.) ئەو شـوێنەی مرۆڤی لێدەنێژن، گـۆڕ، قـەبر. ‹‹ رەببی بمری بچیە بن گڵی!

**بنگۆس** (نا.)[هەو] بڕ: بست

**بنگووس** (نا.) بڕ: بست

**بن میچ** (نا. ل)[بن1 + میچ][هەو] بڕ: میچ

**بن وشکە** (نا. ل)[بن1 + وشک + ئە] نەخـۆشـیـیـەکـە ئەدات لە برکی کـاڵەک، شـووتـی، ترۆزی، خـەیار بێـخـی وشک ئەکات و گەڵای زەرد ئەبێت (کشت و کاڵ ب ١ ل ٣٨).

**بنۆک**[1] (نا. ل)[بن1 + ئـۆک] خـورییـەک کـە دوای شـانە کـردن دەمێنێتەوە و جنسی باش نیە و پتر بۆ گوریس و کەژوو کەلکی لێوەردەگرن.

**بنۆک**[2] (گیا.)[؟] گیایەکی دەشتییە وەک توێسی وایە، بە وردی ئەکـرێتـە برینی ئاژاڵەوە چاکی ئەکاتەوە (خاڵ ب ١ ل ١٢٩) بنکی گـیـایەکـە بە وشکی ئەهارێتەوە ئەکرێت بە برینی ئاژاڵەوە (کشت و کاڵ ب ١ ل ٣٧)

**بنووس** (ئان. فـا)[ب + نووس1] ١ـ

کەسێک کە توانای نووسینی هەیە، نووسەر. ٢ـ (نا.) ئامرازی نووسین، پێنووس، قەڵەم. :: بێ ناوی تۆ نامە هیچ و پووچە/ نەتنووسێ بنووس کەچ و کورووچە (مەم و زین ل ٢٣٩).

**بن هەنگڵ** (ئا.)[بن1 + هەنگڵ] ١ـ بەشێکە لە ئەندامی مرۆڤ، بن ئەو شوێنەی باسک و لەش تێکەڵ بوون و هەندێک تووکی لێهاتوە و پتر لە شوێنی دیکە ئارەقەی دەکا. ٢ـ شوێنی ئەم ئەندامە. & بنەنگڵ، بن پیل، بن باڵ، بن باخەڵ، بن کەوش. **وە ~ دان:** شتێک هەڵگرتن بە هەنگڵ. :: مریشکەکەی وەبن هەنگڵی دا و ڕۆیشت.

**بنە** (نا. ل)[بن1 + ئە][پەھ: بونەک] ١ـ شوێنی نێوەڕاستی خەرمان کە بە گا (گای بنە) گێرە دەکرێ. ٢ـ بار و بارگەی سەفەر و کۆچ. ٣ـ بنکە و بنەڕەتی ژیان بۆ کەسێک کە هات و چۆی شوێنی دیکە دەکا. :: ساڵی دووجار بە ماڵەوە دەچینە شار بەڵام بنەمان هەر دێیە . ٤ـ شوێن و حەشارگەی راوچی بۆ راو، سیپە. ٥ـ بن، ژێر. **~ لێبڕین:** تەواو کردن، خەڵاس کردن، بنە لێ هێنان. **~ لێهاتن:** تەواو کردن، بنە لێ برین. **~ لێهێنان:** تەواو کردن و دوایی پێهێنان بە تایبەت بۆ خواردن. :: لە سەر مەنجەڵ دانیشت و هەتا بنەی لێ نەهێنا هەڵنەستا. **~ نانەوە:** ١ـ ساز کردن و پێکەوە نانی شوێنی بنەی راو. ٢ـ لە ژێر چاوەدێری نان و هەڵنانی شوێنێک بۆ دزی. ٣ـ کەسێک لە نەزەر گرتن. :: حەسەن زیرەک هەتا بنەی نەناباوە گۆرانی بۆ نەدەهات. (یانی لە نێو ژنان دا ژنێکی لە نەزەر دەگرت و بە خەیاڵ بەوی هەڵدەکوت). **~ هاتن:** تەواو بوون، دوایی پێهاتن. :: بابی هێندە دەوڵەمەندە هەر چی دەیخوا بنەی نایە.

**بنەباب** (نا. ل)[بن1 + ئە + باب] ئەو پشت و بەرەیەی کە مرۆڤێک دەیگاتەوە سەری ، باب و باپیر، پشت. :: مادەکان بنەبابی کوردەکان بوون.

**بنەبان** (نا. ل)[بن1 + ئە + بان] دوایین و ئاخرین جێگای شوێنێک کە لەوێ دەبڕێتەوە. :: بنەبانی ئەشکەوت، بنەبانی ئاسمان.

**بنەبڕ** (نا. فا)[بن1 + ئە + بڕ] لە بنەوە ڕا بڕین، بنبڕ. **~ بوون:** ئاسەوار بڕان، قڕ بوون و فەوتان بە تێگڕایی. :: شوکور ئەسپێ لەم وڵاتە بنەبڕ بوە. **~ کردن:** ١ـ بڕینەوەی دار و



درەخت لە ریشەوە بۆ هەڵتەدانەوە. ٢ـ قڕ کردن و ئاسەوار برینەوە. ٣ـ دوایی پێ هێنان بە کار و کارەساتێک بە یەکجاری. :: کێشەی نێوان کەریم و ئەحمەدم بنەبڕ کرد.

**بنەپیت** (نا. ل)[بنە + پیت] ١ـ بڕ: بن خەرمان. ٢ـ دەسمایەی کار دەست پێکردن.

**بنەتۆ** (نا. ل)[بنە + تۆ] بڕ: بنەتۆو

**بنەتۆم** (نا. ل)[بنە + تۆم] بڕ: بنەتۆو

**بنەتۆمە** (نا. ل)[بنە + تۆم + ئە] بڕ: بنەتۆو

**بنەتۆو** (نا. ل)[بنە + تۆو] ئەو ئەندازەیە گەنم و جۆ یا دانەوێڵەی دیکە کە بۆ داچاندن هەڵدەگیرێ، بنەتۆ، بنەتۆم، بنەتوو، بنەتۆوە، بنەتۆمە.

**بنەتۆوە** (نا. ل)[بنە + تۆو + ئە] بڕ: بنەتۆو

**بنەتوو** (نا. ل)[بنە + توو] بڕ: بنەتۆو

**بنەجوو** (نا. ل)[بنە + جوو] بڕ: بنجوو

**بنەجێ** (نا. ل)[بنە + جێ] جێگر، نیشتەجێ. ~ **بوون:** نیشتەجێ بوون، جێگر بوون. ~ **کردن:** نیشتەجێ کردن، جێگر کردن.

**بنەچە** (نا. ل)[بن + ئە + چە؟] بڕ: بنەچەک

**بنەچەک** (نا. ل)[بنەچە + ک] پشت و بەرەی کەسێک کە بنەماڵە و خێزانی دەچێتەوە سەری، بنەچە، بنەچەکە، بناچە، بنیچە، بنچینە، رەچەڵەک، بنەڕەت.

**بنەچەکە** (نا. ل)[بنەچەک + ئە] بڕ: بنەچەک

**بنەدار** (نا. ل)[بن + ئە + دار] بەشی هەرە ژێرەوەی دار کە ئەستوورتر لە بەشەکانی دیکەیە، کۆڵکەدار.

**بنەدیزە** (نا. ل)[بن + ئە + دیزە] شتێک بووە لە تەلاشی دروست کراوە، بنی دیزەیان تێناوە هەتاوەکوو خللۆر نەبێتەوە.

**بنەڕەت** (نا. ل)[بن + ئە + رەت؟] ١ـ بناغە. ٢ـ بڕ: بنەچەک. ٣ـ رەگ و ریشەی دار. ٤ـ ئەساس و ریشەی هەر شتێکی دیکە.

**بنەفش** (ئان.)[باک] بڕ: بنەوش ٢ـ (گیا.) بڕ: وەنەوشە

**بنەکدار** (نا. فا)[بنەک + دار] کەسێک کە بەر لە هەوارچیان دەچێتە هەوار،

بارگــە و بنەی دەخــا و جـێی ئامــادە و خۆش دەکا. ﷼ قافڵەچی ئامان، دادەن دەخـیلـم / بنەکدار خـەم خـەیلێ زەلیلم (مەولەوی ل ٥٠٠)

**بنەگا** (نا. ل)[بنە + گا] شوێنی بارگە و بنە خستن و دامەزرانی هەوارچی.

**بنەگر** (ئان. مف.)[بنە + گر (گرتن)] نەمام یا شەتڵێک بنی داکوتابێ و خۆی گرتبێ. ٢ـ هەر چێک بنجی داکوتابێ. & بنەگرتوو. ~ **بوون:** بڕ: بنج داکوتان.

**بنەگرتوو** (ئان. مف.) بڕ: بنەگر

**بنەگۆگەم** (گیا.)[بن + ئە + گۆگەم] ریشـــەی گـۆگـەم کــە بۆ دەرمـــان، بۆ سـووتان و بۆ کـوشـتنی ماسـی نێـو ئاو کـەلکی لێـوەردەگـرن. ٢ـ (کنـ.) پیــاوی قوڵەخرە.

**بنەما** (نا. ل)[بنە + ما(مان؟)] رەگەز و رەچەڵەکی هەر شتێک، بنەڕەت، ماکە.

**بنەماڵ** (نا. ل)[بنە + ماڵ] خـێزانی نەجیب و گەورە، گەورەماڵ، خانەدان.

**بنەمــاڵە** (نا. ل)[بنەمــاڵ + ئە] ١ـ کۆمەڵێک خزم و کەس کە یەک بنەچەکە و تایفـەن. ٢ـ ژن و مـێـرد و منداڵەکانی یەک ماڵ، خاو و خێزان.

**بنەمـێـو** (گیا.)[بنە + مـێـو] دارێکی مـێـو. ریشـەیەک ترێ بە هەمـــوو لک و پۆپەکانیەوە. ﷼ رەزەکەی مامم دووسەد بنەمێو دەبێ.

**بنەنگڵ** (ئا.)[بن + هـەنگڵ] بڕ: بن هەنگڵ

**بنەوان** (نا. ل)[بنە + وان] ئافرەتێک کە کـار و باری مــاڵ هەڵدەســوورێنێ و مـاڵ و حــاڵێک بۆ پیــاوەکـانی مــاڵ پێک دێنێ، ئاگاداری بنە و کەرەسەی ناوماڵ. ئەو ئـافـــــرەتـە دەتـوانـی ژن، دایـک یـا خــوشکی ئەو پیــاوە بـێ گـرینگ ئـەویە کەسـێک بێ و بە ماڵ رابگا و لە خۆیان بێ، بناوان1، بەرماڵە، بەرماڵی، بنەوانە. ﷼ لەوەتی دایکم عـەمری خودای کـردوە خوشکم بۆتە بنەوانی بابم.

**بنەوانە** (نا. ل)[بنە + وان + ئە][هەو] بڕ: بنەوان

**بنەوش** (ئان.)[تات: بەنۆوش ـ فــار: بـنـفـش. بـاک: بـنـەفـش ـ نـاو: بـنـەوش، بـەنـەوش، وەنـەوش ـ هـەو: وەنـەوش] ١ـ رەنگێکە لە تێکەڵ کـــردنی دوو رەنگی ســوور و شین پەیدا دەبێ، رەنگی گـوڵی وەنەوشـە، مۆر. ٢ـ (گیا.) بڕ: وەنەوشـە. ﷼ مــاچی گـەردنی خـۆشـە بۆنـی وەکی

بنەوشێ / دنیاداریم حەرام کرد لە پاش دوو چاوی عەیشێ (سێسەد هۆنراوە ل ٦١).

**تێبینی:** ناوی ئەم رەنگە لە گوڵی وەنەوشە کەوتوە.

**بنەوشان** (گیا.)[بنەوش + ئان] قەزوانێک کە دەوری فەریکی تەواو کردوە بەڵام هێشتا بە تەواوی رەق نەبوە و رەنگی شینی گۆڕیوە و بۆتە بنەوشی مەیلەوشین.

**بنەوشە** (گیا.) بڕ: وەنەوشە

**بنەوشی** (نا. ل)[بنەوش + ئی] بڕ: بای سوور

**بنیات** (نا. ل)[بن1 + یات][پەه: بۆندات] ١ـ بناغە، بنەڕەت، پایە. ٢ـ ساز، دروست، ئیجاد. & بنیاد، بینا. ~ **نان:** ساز کردن، دامەزراندنی هەر شتێک لە بنەڕەتەوە، بینا نان. ⁂ بە دوو کەسان حیزبێکیان بنیات نا.

**بنیاد** (نا. ل) بڕ: بنیات

**بنیچە** (نا. ل)[بن1 + ئیچە] بڕ: بنەچەک

**بنیشت** (نا. ل)[بن2 + ئیشت][باک ـ سۆر] بڕ: بنێشت

**بنێسک** (نا. ل)[بن1 + ئێسک] پارچەیەکی چووکی سابوون کە دوای دەکار کردنی دەمێنێتەوە و کەلکی نامێنێ، پاشماوەی سابوون.

**بنێسی** (نا.)[؟] بڕ: باریک و بنێسی

**بنێشت** (نا. ل)[بن2 + ئێشت][باک: بنیشت، بەنیشت، بەنووشت ـ ناو: بنێشت، بنیشت ـ باش: بنشت ـ زا: بەنیشت، بەنشت] مادەیەکە لە دارە بەن دەگرترێ و دەیجوون، جاچک، جاچکە، وێژەن.

دارەبەن لە چەند شوێنەوە بریندار دەکەن و لە بنەکەی کۆچیلەی لە قوڕ بۆ ساز دەکەن و ماوەیەکی زۆر لێی دەگەڕێن هەتا پڕ دەبێ. لە دوایی ئەم مادەیە دەکوڵێنن هەتا تاڵایی و رەشایی بڕوا و رەنگی سپی بێ. ~ **خۆش کردن:** ١ـ کوڵاندن و گرتنی تاڵایی لە بنێشت. ٢ـ جاوینی بنێشت بۆ کەسێک هەتا هەندێک خۆ دەگرێ و نەرم دەبێ بە تایبەت بۆ منداڵ کە فێرە جووتن نەبوە. || **بنێشتی تاڵ:** بنێشتێک کە خۆش نەکراوە و هەروا بە تاڵی دەیجوون و گۆیا بۆ کوشتنی کرمی نێو زگ باشە هەروەها لە سەر کوانیشی دادەنێن،

بنێشتەتاڵ، بنێشتەتاڵە، جاچکەتاڵە، وێژەنەتاڵە. **بنێشتی خۆشکراو:** ١ـ بنێشتی بێ تاڵایی. ٢ـ بنێشتی جووتراو و نەرم کە دەیدەن بە کەسی دیکە، بنێشتەخۆشکە. **بنێشتی کوردیی:** بنێشتی خۆماڵی، ئەو بنێشتەی کە لە فابریک ساز نەکرابێ. **بنێشتی مەلای مەزبوورە:** (کنـ.) دارایی و ماڵی بەر چاو. *** کردن بە بنێشتی مەلای مەزبوورە:** (کنـ.) لەبەر چاو بوونی ماڵ و دارایی و ئاگاداری لەو. [گۆیا مەلای مەزبوورە بنێشتی جاویوە و کاتێ زارای شل بوە دەری هێناوە و بە سەری لووتیەوە نووساندوە، گوتوویانە مەلا! ئەوە بۆ وا دەکەی؟ گوتوویەتی دەمەوێ ماڵی خۆم هەمیشە لەبەر چاوم بێ (قامووس ب ٢ ل ١٠٨).]

**بنێشتەتاڵ** (نا. ل)[بنێشت + ئە + تاڵ] بڕ: بنێشتی تاڵ.

**بنێشتەتاڵە** (نا. ل)[بنێشت + ئە + تاڵ + ئە] بڕ: بنێشتی تاڵ

**بنێشتە خۆشکە** (نا. ل) [بنێشت + ئە + خۆش + کە] ١ـ بنێشتی خۆش کراو، جاچکەخۆشە. ٢ـ (کنـ.) قسەیەک کە زۆر دووپات دەکرێتەوە. ⁂ ئەرێ ئەوە بۆ هێندە باسی دایک و بابی من بۆتە بنێشتە خۆشکەی زارت.

**بوار[1]** (نا.)[ئەو: ڤیتارە ـ پەه: ڤیتار. باک: بهور ـ ناو: بوار، بگار ـ هەو: وێڕی ـ زا: ڤێر] ١ـ بەشێکی تەنکی ئاوی چەم و رووبار کە مرۆڤ دەتوانی بە پێیان یا بە سواریی بێ مەلە کردن لێی بپەڕێتەوە، دەراو. ٢ـ شوێنی پێدا تێپەڕین، گوزەر. ٣ـ ئیزن، ئیجازە. ٤ـ (مجـ.) شوێنی دەرباز بوون و دەرچوون لە دەست دوژمن یا کەسێک. ٥ـ (مجـ.) بەر و بار و لایەنی هەر کارێک. ⁂ لە هەموو بوارێکی ئەدەبی دا خاوەن بیر و رایە. **~ دان:** ١ـ چۆم و رووبارێک کە بواری هەیە و مرۆڤ دەتوانێ لێی بپەڕێتەوە. ⁂ چۆمێکی هێندە گەورە و قووڵ بوو لە هیچ جێگەیەکەوە بواری نەدەدا. ٢ـ ڕێ دان، ئیزن دان. ⁂ کڵفەتان عەجایب مان، کوتیان: خانم و خاتوونی میر سێوەدین بەگ بە کەسیان نەداوە ئیجازە و بوار و گوزەرێ. (سەعید و میرسێوەدین ل ١١٩)

**تێبینی:** بوار لە رەگی بواردن و بووردن بە مانای تێپەڕین دەکەوێ، یانی شوێنێک کە دەتوانی لێی تێپەڕی.



**بوار**2 (نا.) برِ: بەهار ‌:: بوار دادێ وەعــدەی گــورانـە / ســەرم زۆر دێشـێ دەردم گرانە. (سێسەد هۆنراوە ل ٤١).

**بواردن** (چا. م)[هیک: ڤـیـتــەر ـ ئەو: ڤیتەر ـ پەه: ڤیتەرتەن، ڤیتارتەن. باک: بهـــورتن ـ ناو: بواردن، بگاردن ـ هەو: ویاردەی ـ زا: ڤـێـرەتش] ١ـ تێپـەڕین لە شتێک و حیساب نەکردنی، هەڵبواردن. :: ئەگەر یەکمان خەتایەکی بکەین باوکم هیچمان نابوێرێ و لە هەمووماندەدا. ٢ـ تێپـەڕاندن، لێ تێپـەڕین. ٣ـ رەنگ گـرتنی پارچە و شـتێک جیـا لـە رەنگی سـەرەکی خـۆی وەها کە لێی نەبێتەوە و هەروا پێوەی بمێنێتەوە.

**بوارە** (نا. ل)[بوار1 + ئە] دەرفـــەت، ماوە، بگارە. ~ **دان:** ماوە پێدان، ئیزن دان، رێ پێـــــدان، بـگـارە دان. :: ئـەو منداڵە خۆ بوارەی ئێمە نادا دوو قسان پێکەوە بکەین.

**بواندن** (چا. م)[لە: بوون] ١ـ دروست کردن، ساز کردن، گونجاندن. ٢ـ بە زۆر ئەنجام دانی کارێک. :: چۆن بۆی نابێ، دەیبوێنم.

**بوت** (نا.)[پەه: بوت but. باک: پووت ـ ناو: بت، بوت ـ هەو: بتە] ١ـ کۆتەڵێکی سـازکـراو لە ئینسـان یا هـەر شـتـێکی دیکە بۆ پەرسـتن، سـەنەم. ٢ـ (مجـ.) یار و گراوی. ٣ـ کەسێک کە پلەیەکی بەرزی دە نێو دەستە و تاقمێک دا هەیە و هەتا رادەی پەرەستن دەگا.

**تێــــبـــینی:** بە بڕوای هەندێک لە لێکۆڵەران بـوت لـە بوئیـــتی Buiti ئەوێستـایی کـە ناوی دێوێکە کـەوتوە و هـەندێکیش دەیبـــەنەوە ســـەر نـاوی بوودا(برهان ب ١ ل ٢٣٣). هـەروەهـا لـە زمــانی پەهلەویی بوت بە نـاوی بووداش هاتوە.

**بوتپـەرست** (نا. فـا، ئان. فـا)[بوت + پەرست] کەسێک کـە بـوت خـودایەتی و دەیپەرستێ، بتپەرست، سەنەمپەرست.

**بوتپـەرسـتیی** (حم.)[بوتپـەرست + ئیی] کـــاری کـــەسی بوتپــــەرست، بتپەرستیی.

**بوتخـــانە** (نا. ل)[بوت + خـــانە] شـــوێنێک کـــە بـوتی لێـــدادەنێن و بۆ پەرســــتنی دەچنە ئەو شـــــوێنە، سەنەمخانە.

**بـــوتـــری** (نـــا.)[ئـــین: bottle] شـووشـەیەکی ئوسـتـوانەیی زار تەنگە ســـاردی و ئاوەکی دیکەی تێـــدەکـــەن،

بتری، بوتڵ.

**بوتشکێن** (ئان. فـا)[بوت + شکێن] ١ـ مەبەستە لە حەزرەتی ئیبراهیم کە بوتی شکاند و خەڵکی بۆ پەرستنی خودای تاقانە بانگەواز کرد. ٢ـ کەسێک کە کەسایەتی وەک بوت لە نێو خەڵک دا بە لە سەر نووسین یا بە ئاکاری دەشکێنێ.

**بوتشکێنیی** (حم.)[بوت شکێن + ئیی] کار و کردەوەی کەسی بوتشکێن.

**بوتڵ** (نا.) بڕ: بوتری

**بوخ** (نا.)[عەر: بخار][باک ـ زا] هەڵم

**بوخاری** (نا. ل)[بوخار (عەر: بخار) + ئی][ئەر] بڕ: بوغاری. || **بوخاری فەرەنگی:** سۆبەیەک کە بە نەوت بایسێ، کورەی نەوتی.

**بوختان** (نا.)[عەر: بهتان] تۆمەت، هەڵبەستە، بوهتان. **~ بۆ هەڵبەستران:** بوختان و کردەوەی ناڕاست بۆ ساز کران، بوختان پێکران. **~ بۆ هەڵبەستن:** تۆمەت و کردەوەیەکی ناڕاست بۆ کەسێک ساز کردن. **~ پێکران:** کردەوەی ناڕاست بۆ هەڵبەستران. **~ پێکردن:** قسە یا کردەوەیەکی ناراست وەپاڵ کەسێک دان. **~ کردن:** بە درۆ تۆمەت لە کەسێک دان.

**بوختان پێکراو** (نا. مفـ.)[لە: بوختان پێکران] کەسێک کە بوختانی پێکراوە.

**بوختانکەر** (ئان. فـا)[بوختان + کەر3] کەسێک کە بوختان بۆ خەڵکی هەڵدەبەستێ. ؛؛ ئەمن وەک تۆ بوختانکەر و درۆزن نیم (لاس و خەزاڵ ل ١٠٥).

**بوختی** (گیانـ.)[؟] جۆرێک وشتری دوو کۆپارەی ڕەنگ سوور و بە هێز. ؛؛ کەژاوە و دار و بار و تەختەیی لوختی لە سەر بوختی / دەناڵێن لە شەوقی تەیبە وەک ئەستوونی حەننانە (نالی ل ٥٠٠).

**بوخچە** (نا.)[تور: bohça] ١ـ پارچەیەکی چوارگۆشەیە کە کەل و پەلی تێوە دەپێچن و بەر لە ساک و جانتا بۆ حەمام و شوێنی دیکە لە بوخچە کەلکیان وەردەگرت. ٢ـ دە بەستە جگەرەی دەباڵ یەک دا، باکسی سیگار. **~ تێکنان:** پێچانەوەی کەل و پەل لە نێو بوخچە دا. || **بوخچەی حەمام:** کەل و پەلی پێویستی هەر کەسێک بۆ حەمام و خۆ شووشتن کە دە بوخچەیەکەوە دەپێچرێتەوە. **بوخچەی نەکراوە:** (کنـ.)

کوڕێک کە هێشتا ژنی نەهێنابێ و هەروا عەزەب مابێتەوە.

**بوخچە بگەردانی** (نا. ل)[بوخچە + ب + گەردان + ئی] یاری و کایەیەکە کە کۆمەڵێک بە پرێسکە یا بوخچەیەک دەیکەن.

کۆمەڵێک دەورانەور رادەوەستن و پرێسکەیەک بۆ یەک داوێن، کەسێک کە تێکەوتوە حەول دەدا بوخچەکە بگرێتەوە، هەرکات لە دەست یەکیانی قوزتەوە ئەو کەسە تێدەکەوی و ئەویتر دەچێتە نێو کۆمەڵەکەوە، بوخچە بەگەردانی، بوخچەگەردان.

**بوخچەبڵاو** (ئان. ل)[بوخچە + بڵاو](کنـ.) کەسێک کە کاری نیوەتەواوی زۆرە. **~بوون:** زۆر کاری نیوەچڵ بە دەستەوە بوون، سەرێک و هەزار سەودا هەبوون.

**بوخچە بەگەردانی** (نا. ل)[بوخچە + بە + گەردان + ئی] بڕ: بوخچە بگەردانی.

**بوخچەگەردان** (نا. ل)[بوخچە + گەردان] بڕ: بوخچە بگەردانی.

**بوخور**[1] (گیانـ.)[؟][باک] وشتری نێر، لۆک.

**بوخور**[2] (نا.)[باک ـ زا] بڕ: بخوور

**بورج** (نا.)[عەر: برج] ژوورێکی خڕ یا چوارگۆش کە لە سەر قەڵا و دیواری شار بۆ چاوەدێری و بەرگری لە هێرشی دوژمن دروست دەکرا، قوللە. ٢ـ قەڵا. ٣ـ هەر کام لە دوازدە بەشی فەلەکی کە بریتین لە: بەرخ (حمل)، گا (ثور)، جمگە (جوزا)، قرژانگ (سرطان)، شێر (اسد)، هۆشە (سنبلە)، تەرازوو (میزان)، دووپشک (عقرب)، کەوان (قەوس)، گیسک (جدی )، دۆڵچە (دلو)، نەهەنگ (حوت ). & برج. هەروەها ئەستێرەناسانی کۆن بۆ هەر کام لە بورجەکان هێزێکی فاعلی و مەفعوولی قایل بوون و ئەوانیان بە گەرم و سارد و ویشک و تەڕ دادەنا و لەبەر ئەوە دوازدە بورجیان بە چوار دەستە دابەش دەکرد، بورجی ئاوی، بورجی ئاگری، بورجی بایی، بورجی خاکی. ٤ـ هەر بەشێک لە بەشەکانی ئاخری زستان بە حیسابی کوردەواری کە بریتیین لە خاتوو زمهەریر یا شینی برایان ـ سێ شەشی هەیاسی ـ گیسکی بەلەمس ـ بورجی پیرێژن. ‖ **بورجی ئاگری:** ئەو بورجانەی کە میزاجیان گەرم و ویشکە کە بریتیین لە بەرخ، شێر و کەوان. **بورجی ئاوی:** ئەو

بورجانەی کە میزاجیان سارد و تەڕن کە بریتیین لە قرژانگ، دووپشک و نەهەنگ. **بورجی بایی:** ئەو بورجانەی کە میزاجیان گەرم و تەڕە کە بریتیین لە جەمگە، تەرازوو و دۆڵچە. **بورجی پیرێژن:** حەوت ڕۆژی ئاخری زستان (عەر: برد العجوز). **بورجی خاکی:** ئەو بورجانەی کە میزاجیان سارد و ویشکە کە بریتیین لە گا، هۆشە و گیسک. **بورجی ژەهری مار:** (کنـ.) زۆر نێوچاوان تاڵ، گرژ و مۆن. **بورجی غەزەب:** (کنـ.) زۆر تووڕە و قەڵس.

**تێبینی:** عەرەب ئەم وشەیان لە py-rogs ی یونانی بە مانای قەڵا وەرگرتوە. زمانی پەهلەوییش بە شێوەی بورج burj ئەم وشەی لە عەرەبی وەرگرتوە.

**بورد** (نا.)[عەر: برد] جۆرێک پارچەی کەتانی جوانی ڕاڕا. ∷ سەرد و گەرمی ئاهەکەم سەوزەی گیای کردم بە پووش / پایزی روو بوو بە بوردی سوور و زەردی موختەلەت (نالی ل ٢٤٤). ‖ **بوردی یەمانی:** پارچەی کەتانی سازکراوی وڵاتی یەمەن. ∷ دڵ سیاسەنگ نەبێ، مائیلی خاکی وەتەنە/ خاڵی لەعلی حەبەشە، ساکینی بوردی یەمەنە (نالی ل ٥٢٤).

**بورغوو** (نا.) بڕ: برغوو

**بورغی** (نا.)[باک] بڕ: برغوو

**بورو** (نا.)[زا] بڕ: برۆ

**بوورنتی** (نا.)[زا] بڕ: بڕنووتی

**بورە** (نا.)[زا] بڕ: بوورە

**بوری** (نا.)[زا] بڕ: برۆ

**بورکان** (نا.)[عەر: بورکان] بڕ: ئاگرپژێن

**بوژی** (نا.)[باک] بڕ: بژ1

**بوعد** (نا.)[عەر: بعد] ١ـ دووری. // قورب، نزیکی. ∷ کەعبە ئیشراقی وەکوو خورشیدە، من چاوم زەعیف / لێم بووە ڕۆشن کە بوعدی قوربە، قوربی بوعدە بۆم (نالی ل ٣٠١). ٢ـ هەرکام لە چلۆنایەتی سێیانەی شتێک یا جسمێک (بەرینایی، درێژایی، بەرزایی یا قووڵایی).

**بوغ** (نا.)[عەر: بخار] ١ـ گازی ئۆکسیدی کەربۆن کە لە دار و ڕەژی چاک نەگەشاوە پەیدا دەبێ و ئەگەر لە ژوورێک زۆر بێ دەبێتە هۆی سەرئێشە و تەنانەت کوشتنیش. ٢ـ هاڵاو و دووکەڵی

سـووتەمـەنی کـە دەبێـتـە هـۆی پشـوو سواری، بۆق.

**بوغاری** (نا. ل)[بوغار (عەر: بخار) + ئی] ئاگردانێک کە لە زوو دە دیواری ماڵ دا دروستـیـان دەکرد بۆ گەرم داهـێنانی ژوور و ئێـسـتـاکـەش بۆ جـوانی و ژوور گـەرم کـردن بۆتەوە باو، بوخـاری، مغەیری.

**بوغرد** (نا.) بڕ: بخوور

**بوغرا** (ئان.) بڕ: باغر. ~ **بوون:** بڕ: باغر بوون

**بوغـز** (نا.)[عـەر: بغض] رق، قین، کینە.

**بوغـزاندن** (چا. م)[لە: بوغـز] رق لێـبـوونەوە، خـۆش نەویستن. ※ بۆ دەبوغزێنی خۆ چمان پێ نەکوتووی؟

**بوغـز لە زگ** (ئان. ل)[بوغـز + لە + زگ] کەسێک کە بوغـز و رقی کەسێکی دە دڵ دا راگـرتبێ و بە تـەمـایە کـە لە کاتـی خـۆی دا دەریبـڕێ، قین لە زگ، رق ئەستوور.

**بوغـە** (گیـانـ.)[تور: boğa] ١ـ گای نێری قەڵەوی نەخەسێندراو، بۆغ، بۆغە. ٢ـ (کنـ.) پیـاوی قـەڵەو زگ زل و مل ئەسـتـوور. ※ هێندەی مـاڵی مـفـتێ خواردوە وەک گای بوغە ئەستوور بوە.

**تێبینی:** زەبیحی بە هەندێک لێکدانەوە ریشەی ئەم وشەیە دەباتەوە سەر بەگە و بەغە ـ ی ئەوێستایی (بڕ: قامووس ب ٢ ل ١١١). من پێـمـوایە ئەم وشـەیە راستەوخۆ لە بۆغا ـ ی تورکی بە مانای گـای نێـری نەخـەسێندراو هاتۆتە نێـو زمانی کوردییەوە.

**بولبـول** (گـیـانـ.)[باک: بلبل ـ ناو: بولبول، بلبل، بوڵبوڵ ـ هەو: بوڵبوڵ ـ زا: بلبل] ١ـ باڵدارێکی چووکـە بە قـەرا چۆلەکـە، تووکی بەر سـینگی زەرد و سەرپشتی بۆرێکی ئاماڵ سوورە، دەنگی خۆشە و لە قەفەس دەکرێ. Luscinia ناوی لاتینی ئەم مـەلەیە. ٢ ـ (کنـ.) رەوانبێژ، بێ گرێ و گۆڵ قسە کردن. ٣ـ (کنـ.) دەنگخۆش

**بوڵبوڵ** (نا.)[هەو ـ ئەر] بڕ: بولبول

**بونگەسە** (نا.)[هەو] بڕ: بست

**بوها** (نا.)[باک] بڕ: بایەخ

**بوهار** (نا.) بڕ: بەهار

**بوهتان** (نا.)[باک] بڕ: بوختان

**بوهست** (نا.)[باک] بڕ: بست

**بوهوشت** (نا.)[باک] بڕ: بەهەشت

**بوهیشت** (نا.)[باک] بڕ: بەهەشت

**بوی** (نا.)[زا] بڕ: بۆن

**بوین** (چا. ل)[باش] بڕ: بوون

**بوێر**[1] (ئان.)[ب2 + وێر (لە: وێران2)] دلێر، نەترس، بەدڵ.

**بوێر**[2] (ر.)[لە: بواردن] بە ناوەوە دەلکێ و مانای بواردن دەدا. ፡፡ بابوێر

**بوێریی** (حم.)[بوێر1 + ئیی] کار و کردەوەی کەسی نەترس، دلێریی، نەترسیی، وێران.

**بۆ**[1] (نا.) بڕ: بۆن. ~ **دان:** ١ـ بڕ: بۆن دان. ٢ـ شێوەیەکی برژاندنی هەندێک دانەوێڵەیە بۆ گۆڕینی تام و بۆنیان لە سەر سێڵ، وەک قاوە، نۆک، گەنم و تۆوی قرتاندن. ~ **کردن:** بڕ: بۆن کردن

**بۆ**[2] (ئام.) ١ـ ئامرازی پرسیار کردنە بە مانای لە بەر چی؟ بە چ خاتر؟، لەبۆ، بۆچی، بۆچە، لۆ، بۆچ. ፡፡ بۆ وا دەکەی؟ بۆ نان ناخۆی؟ ٢ـ ئامرازی خاوەن کردن.؟ ፡፡ کراسێکم بۆ بابم کڕی. ٣ـ پێشگری کارە. ፡፡ بۆچوون، بۆلێدان، بۆهاتن، بۆبوون. ٤ـ بەرەولا، بۆ لای. ፡፡ دەچم بۆ شار. دێم بۆ مالآتان. ٥ـ لە بەر، بۆ خاتری. ፡፡ بۆ قەرزەکەم هاتووم. بۆ تۆ کڕدراوە. ~ **بژاردن:** پارە و بایی تاوان دان. ፡፡ کوڕەکەم هەرچی شکاندوە نەغد بۆت دەبژێرم. ~ **بوون:** ١ـ ئەندازە بوون. ፡፡ ئەو کەوشانە بۆ من نابن. ٢ـ شیاو بوون. ፡፡ مەلایەتی بۆ من نابێ. ~ **چوون:** ١ـ لێکدانەوەی بیر و مەسەلەیەک بە شکێکی نزیک بە راستی، بیر و را. ፡፡ بۆچوونی تۆ لە سەر بارودۆخی تازەی ولآت چیە؟ ٢ـ بۆ لای شتێک چوون. ፡፡ کۆترەکە نیشتبوو و من بە سەبرا بۆی دەچووم لە پڕ هەڵفڕی. ٣ـ بۆ لای کەسێک چوون بە نیازی شەڕ. ፡፡ من و کەریم بۆ کابرای مل ئەستوور چووین و چاکمان لێدا. ~ **دانواندن:** تەسلیم بوون و سەر دانواندن بۆ ویست و مەیلی کەسێک. ~ **کران:** ١ـ توانین، پێ کران. ፡፡ ئەو کارە قورسەم بۆ ناکرێ. ٢ـ گونجان، بۆ لوان. ፡፡ سبەی بۆم ناکرێ بێم. ~ **گونجان:** بڕ: بۆ لوان. ~ **لوان:** توانین، توانای کارێک هەبوون، بۆ گونجان، بۆ کران. ፡፡ بۆم نالوێ هەر ئێستا بێم، ئەگەر بۆم بلوێ سبەی خۆم دێم. ~ **هاتن:** ١ـ بۆ لا هاتن بۆ نیازی شەڕ و خراپە. ፡፡ بە سێ



کــــەوســـــان بـۆم هـاتن بەڵام هـەر پێم نەوێران. سـەگێکی درِم بۆ هات، بە بەرد لە خۆم دوور کردەوە. ٢ـ شانس هەبوون. :: ئەورۆ لە تەختـە نەرد چاکم بۆ دێ. ٣ـ دارِژانی بیر و هەست و شێعر. :: چاکم قسە بۆ دێ. ئەگەر شێعرم بۆ هات دەبێ دەسـتبـەجێ بینووسـمـەوە. ٤ـ شـتێک لە لایـەن کــەســـێکەوە پێگەیشـتن. :: دوو نامــەم لە مــاڵەوە بـۆ هات. ~ **هەبوون:** توانـین، ئـیــــزن هـەبـوون. :: بـۆم هـەیـە ئیمشەو لە ماڵە ئێوە بخەوم؟

**بۆ**[3] (نا.)[بڕ: بووم1] ١ـ زەوی. :: بۆ بەخێر هێنانی میوانی بەرِێزی هەرد و بۆ /چاوەڕێ وێســـتـاوە داوێن پڕ لـە لالەی عـەنبـەرین (هێدی ل ١٧٥). ٢ـ [ســۆر] دێراوی بێستان

**بۆ**[4] (نا.)[بڕ: بان1][زا] ماڵ، خانوو

**بۆبا** (نا. ل)[بۆ1 + با1] بۆنێک کـە لە رۆنی کــەرە پەیدا دەبێ و نیـشــاندەری خـراپ بوونی کەرەکـەیە. رۆنی بۆبا قـاڵ دەکــەن و دۆکــەکــەی فــڕێ دەدەن وەدە چێشتی دەکەن.

**بۆبرە** (نا. ل)[بۆ1 + بڕ + ئە] بۆنبرە.

**بۆبەرامە** (نا. ل)[بۆ1 + بەرامـە][ئەر] بڕ: بۆن و بەرامە

**بـۆپرووز** (نـا. ل)[بـۆ1 + پرووز] بـڕ: بۆکرووز

**بۆترەکێنە** (گیا.)[بۆ3 + ترەکێن + ئە] جۆرێک کارگی باڵابەرزی سەرخرە.

**بۆتکە** (نـا.)[؟] دوکــانێکی چووکی پێـشـسـازە، لـە دار یا مـەعـدەن سـازی دەکەن و لە سـووچێکی شەقام یا شوێنی دیکە دادەندرێ و وردە شتی وەک سیگار و بەستەنی، ... دەفرۆشن.

**بۆتە** (نا.)[؟] دەفرێکی چووکـە کـە لە گـڵێکی تایبـەت بـە ناوی گڵی حـیکمـەت دروست دەکــرێ. زێڕینگەر زێڕ و زێوی تێـدا دەتوێننەوە. :: بڵـێـسـەی کـوورەی دەروون گـرتـەن تاو / نە بۆتـەی خـەم دا دەروون کـەرد وە ئاو (مـەولەوی ل ٢٤٢). خـالیسـە سـیککەیی ئیـخـلاسـی دڵی مـوخلیـسـی من / بیـخـە نێـو بۆتە چ حاجەت بەمـە بیدەی لە مـەحـەک (حـاجی قادر ل ٦٩).

**بۆتەگــە** (نا. ل)[بۆ1 + تـەگــە] ئەو بۆنەی کـە لـە کاتـی تێبـەردان، لە نێـری دێ.

**بۆجەوت** (نا. ل)[بۆ1 + جـەوت] بۆنی جــەوت کــە لـە چەرم و کــوندەی تـازە بە جەوت خۆشکراو دێ.

**بۆچ** (ئـا.)[بـاک: بۆچ، بـۆچـک، دۆچ، دۆچـک ـ زا: بـۆچـک، بـۆچـە، دۆچـک] ئەندامێکی گیانلەبەرانە لە ئاخری لەش و لە سەر قوونیان، کلک. (بڕ: کلک)

**بۆچاڵ** (نـا. ل)[بـۆ1 + چـاڵ] بۆنـی شێ و نمی دەغڵ ودان، یا هەر شـتێکە کـە لە چاڵ دا هـەڵگیـراون و دوای سـاز کـردنیـشـیـان ئەو بۆن و تامـەی هەر دەمێنێ، بۆ نماوی.

**بۆچـرووک** (نـا. ل)[بـۆ1 + چـرووک] بۆنی رۆنـی سـووتاو و هـەر شـتـێکی چەوری سەر ئاگر، بۆچرووک.

**بۆچرووک** (نا. ل)[بۆ1 + چرووک] بڕ: بۆچرووک

**بۆچک** (ئا.)[بۆچ + ک][باک ـ زا] ١ـ (ئا.) کلک. ٢ـ (گیا.) لاسک، ساقەت.

**بۆچنە** (نـا. ل)[بۆ1 + چن + ئە] بڕ: بۆنبرە

**بۆچە** (ئا.)[بۆچ + ئە][زا] بڕ: بۆچ

**بۆچەک** (نا. ل)[بۆ1 + چەک؟] بۆنی دیزەی چێشت لێنان کە دوای مـاوەیەک کـار پێکردن لە بەر چـەوری تێـوە چوون لێی پەیدا دەبێ، بۆچەکەوڕ، بۆچەکەهوڕ.

بۆ لە بەین بردنی ئەو بۆنە دیزەی لە تەندوور دەخـەن هـەتا چەوریـیـەکـەی بسووتێ و بۆنەکەی بڕوا.

**بۆچەکەوڕ** (نا. ل)[بۆچەک + ئە + وڕ] بڕ: بۆچەک

**بۆچەکـەهوڕ** (نا. ل)[بۆچەک + ئە + هوڕ] بڕ: بۆچەک

**بۆخاو** (نا. ل)[بۆ1 + خاو] بۆنی هەر شتێکی ئاوەکی کە هێشتا نەکوڵاوە یا باش نەکـوڵابێ. ፨ بۆ شیـری خـاوت لە زار دێ. ئەو چایە بۆخـاوی لێـدێ. ٢ـ بۆنی گـۆشت و شـتی دیکە کـە باش نەبرژاوە یا نەکـوڵاوە. ፨ ئەو جـەرگـە هێشـتـا بۆخاوی لێدێ برۆ لە سـەر ڕا بیبرژێنەوە.

**بۆخۆشکە** (گیا.)[بۆ1 + خۆش + کە (کردن)] بڕ: کەنێرە

**بۆدار** (ئان. فـا)[بۆ1 + دار2] بڕ: بۆندار

**بۆدراو** (ئان. مف.)[لە: بۆ دان] ١ـ هەر شـتـێکی کـە بۆ درابێ. ٢ـ (نـا. ل) گەنمێکە کە توێکڵی لێدەکەنەوە و لە سەر ساج بۆی دەدەن و لە دەستاری دەکەن و بۆ هەندێک چێشت کەلکی لێوەردەگرن.

**بۆدرە** (نا.)[بۆ + در (دران)+ ئە] ١ـ

بەردێکی کانییە، توێژتوێژی ناسکە و زوو ورد دەبێ و لە سەنعەت دا بۆ ساز کردنی تەڵق و شتی دیکە کەلکی لێوەردەگرن، تەڵق. ٢ـ شتێکی سپی وردی بۆنخۆشە وەک سپیاو ئەکرێ بە جەستەوە (بڕ: خاڵ ب ١ ل ١٤٤).

**بۆدڕ** (نا. ل)[بۆ1 + دڕ؟] بڕ: بۆ دڕن

**بۆدڕن** (نا. ل)[بۆ1+ دڕ ؟ + ن] ١ـ بۆنی توند و ناخۆشی تەگە. ٢ـ بۆنی ماسی. ٣ـ بۆنی لەشی چڵکنی مرۆڤ کە ماوەیەکی زۆر خۆی نەشوشتبێ، بۆ کڵێشە. ٤ـ بۆنی توندی ئارەقەی بن هەنگڵ و پێ. & بۆدڕ، بۆندڕ، بۆندڕن

**بۆدووکەڵ** (نا. ل)[بۆ1 + دووکەڵ] ١ـ بۆنێک کە لە جل یا لە لەشی کەسێکەوە دێ کە لە بەر ئاگر راوەستاوە. ٢ـ بۆنێک کە لە بەر دووکەڵ کردنی ئاگر لە چێشت دەدا و تامی دەگۆڕێ. ٣ـ مەشکەیەک کە زستانان لە میچی ژووری هەڵداوەسن هەتا دووکەڵ لێی دا و بۆن بگرێ و لە دوایی دۆیەکەی هەتا ماوەیەک بۆنی دووکەڵی لێدێ و دۆ خۆش دەکا.

**بۆڕ** 1 (ئان.)[ئەو: بەفرە ـ سان: بەبهرو ـ پەه: بور، بۆر، بوور. باک: بۆر ـ ناو: بۆر ـ باش: بوور ـ هەو: بۆر ـ زا: بۆر، بوەر، بۆڕ] ١ـ رەنگی خۆڵەمێشیی، کەوە، کەوگ، کەوی. ٢ـ یەکسمی رەنگ بۆر :: بۆر و بدەو. ٣ـ رەنگی قاوەیی مەیلەو سوور. ٤ـ بەر لە ناو دێ و مانای نەکەرە و نەناسیاویی دەدا بە ناو. :: بۆرەپیاو، بۆرەسوار. ٥ـ بەر لە ناو دێ و مانای دوور دەدا بە ناو. :: بۆرەخزم. ٦ـ شەرمەزار، تەریق. ~ **بوونەوە:** رەنگ گۆڕین لە شەرمان، سوور هەڵگەڕان، شەرمەزار بوون.

**بۆر** 2 (نا.)[؟] ناوی دەنگی بزوێنێکی عەرەبی بە ناوی ضمە، بەر. (سەر، ژێر، بۆر)

**بۆر** 3 (نا.)[باک ـ زا] بڕ: بوورە

**بۆران** 1 (نا.)[تور: boran] ١ـ با و بارانی پێکەوە، لەنگێزە. ٢ـ ئەو بایەی کە بەفری کێو و شوێنی دیکە هەڵدەکەنی و دەیباتە شوێنی دیکە، باڕن. ٣ـ با و بەفری پێکەوە، کرێوە، تۆف، بادەوە.

**بۆران** 2 (نا.)[باک] ١ـ کۆتر، بەوران. ٢ـ کۆترە باریکە.

**تێبینی:** بۆران لە زاراوەی باکووریی دا و بەوران لە زاراوەی زازایی دا بە مانای کۆتر ریشەکەی دەچێتەوە سەر رەنگی بۆر هەر ئەوجۆرەی کە وشەی

کۆتر دەچێتەوە سەر ڕەنگی کەوە.

**بـــۆرانـــی** (نـــا. ل)[بـــۆران + ئـــی] چێـــشـــتـــێکە بە هێلکە، کـــوولەکـــە یا باینجانی سوورکراوە دەگەڵ ماستی خـــاوکـــراوە و گـــەرم ســـازی دەکـــەن و دەیخۆن، بۆرناش.

**تێـبـینی:** بۆران ناوی ژنێکە کـە بۆ یەکەم جار ئەو چێشتـەی ساز کردوە، هەندێک بردویانەتەوە سـەر بۆران دوخت کچی خوسرەو پەرویز (القاموس ل ٨٦) و هەندێکیش بردوویانەتەوە ســەر بۆران کچی حسن سهل (برهان ب ١ ل ٣١٥). هەروەها بۆران لە زمـــانی پەهلەویی دا وەک ناوی کچ هاتوە و لە وشـــەی بۆر1 کەوتوە.

**بۆراو** (نا. ل)[بۆر1 + ئاو1] شـۆربای بروێش.

**بـۆرایـی** (حـم.)[بـۆر1 + ئـایـی] ١- حـاڵەت و چلۆنایەتییەک کە ڕەنگی بۆر پێکی دێنێ. ٢- شـتـێکی کـە لە دوورەوە بۆر بـچـێـتـەوە و نـەزانرێ کـە چیـە. ٣- (مجـ.) قوون، کونگ.

**بـۆربـاو** (ئـان. ل)[بـۆر1 + بـاو4] ڕەنگێکی بە تەواوەتی بۆر نەبێ، ڕەنگی نزیک لە بۆر، ئامالْ بۆر، بۆرەڵووک.

**بۆرجوازیی** (نا.) بڕ: بۆرژوازیی

**بـۆرچـیـل** (ئان. ل)[بـۆر1 + چـیـل؟] بەڵەک، ئەبڵەق، ڕەش و سپی، بۆرچین.

**بۆرچین** (گـیـانـ.)[بۆر1 + چین؟] ١- مـراوی مێ. // سەرسەوز، سەرکەسک. ٢- (ئان.)[ئەر] ڕەش و ســـپی، بەڵەک، بۆرچیل.

**بـــۆرژان** (چـــا. ل)[بـــۆ1 + ڕژان] خەوتنێکی سووک کە مرۆڤ تەواو ئاگای لە دنیا نابڕێ و مێشک حەسانەوەیەکی کـورت دەکـا، بیـرەخـەو، بیـرو هۆش، بیـــــرەهۆش. :: تاوێک بـۆڕژام بەڵام منداڵەورکە نەیانهێشت بنووم.

**تێبینی:** لە زمـانی پەهلەویی دا بۆی bōy هەم بە مانای بۆنە و هەم بە مانای هـۆش و بیـــر، هـەست و زەین. بۆ لـەم وشـەیەش دا دەچێتـەوە سەر بیر و هۆش و لە هاوماناکانی دیکەشی دا وشەی بیر خۆ دەنوێنێ. ماناکـەی بە گشـتی دەبێ بیر و هۆش ڕژان.

**بـــــــــــــــــــــــۆرژوا** (نا.)[فـەر:bourgeois] شـارنشـینی دەوڵەمەند و بە ئیروو، سەرمایەدار.

**بۆرژوازیی** (نا.)[فـەر: bourgeoisie] چینی ســـەرمـــایەدار، ئەو چینەی کـــە

سەرمایە و کەرەسەی بەرهەمیان بە دەستەوەیە وەک خاوەن مڵک و سەرمایەداری چووکە، بۆرجوازیی.

**بۆردومان** (نا.) بڕ: بۆمباران

**بۆرس** (نا.)[؟][زا] مەنجەڵ، قازان

**بۆرمس** (ئان. ل)[بۆر1 + مس] بزنێکی رەش کە هەندێک مووی بۆری بە لاچاوی دا هاتبێتە خوار.

**بۆرناش** (نا. ل)[بۆرن (بۆران) + ئاش][هەو] بڕ: بۆرانی

**بۆرە**1 (ئان. ل)[بۆر1 + ئە] ١- هەندێک گیانداری وەک ئەسپ و سەگ کە رەنگیان بۆر بێ. ٢- (نا. ل) ناوە بۆ سەگ. ٣- (گیانـ.)[باک] بەراز

**بۆرە**2 (نا.) بڕ: بۆرەک1

**بۆرەبنار** (نا. ل)[؟] دەمەقاڵە، شەڕەجنێو، نیوەشەڕ.

**بۆرەپیا** (نا. ل)[بۆر1 + ئە + پیا] [هەو] بڕ: بۆرەپیاو

**بۆرەپیاگ** (نا. ل)[بۆر1 + ئە + پیاگ] بڕ: بۆرەپیاو

**بۆرەپیاو** (نا. ل)[بۆر1 + ئە + پیاو] پیاوی نەناسراو و ئاسایی، پیاوێک کە لە بنەماڵەی خان و بەگ و ئاغا و سەرناس نەبێ، بۆرەپیاگ، بۆرەپیا، بۆرەکە.

**بۆرەپنە** (گیانـ.)[بۆر1 + ئە + پنە] بڕ: قەلەسابوونە

**بۆرەجرە** (گیانـ.)[بۆر1 + ئە + جرە] بڕ: بۆرەجورە

**بۆرەجورە** (گیانـ.)[بۆر1 + ئە + جورە] جۆرێک جورەی بێ کاکۆڵ، بۆرەجرە، بۆرەک.

**بۆرەخزم** (نا. ل)[بۆر1 + ئە + خزم] خزمی دوور، بۆرەقەوم.

**بۆرەخزمایەتی** (حم.)[بۆرەخزم + ئایەتی] پەیوەندی نێوان دوو خزمی دوور، خزمایەتی دوور. ⁂ دەگەڵ کاک حەمە بۆرەخزمایەتییەکمان هەیە.

**بۆرەزەلام** (نا. ل)[بۆر1 + ئە + زەلام] پیاوی کەتەی گەورە، شینەزەلام.

**بۆرەسوار** (نا. ل)[بۆر1+ ئە + سوار] سواری نەناسراو.

**بۆرەقانی** (نا. ل)[؟] چێشتێکە لە گیاوگۆڵی سوور کراوە کە دەگەڵ ماست و هێلکە دەیخۆن. (هس: بۆرانی)

**بۆرەقنە** (ئان. ل)[بۆر1 + ئە + قن (قوون؟) + ئە] بڕ: بۆرەڵووک

**بۆرەقــەوم** (نا. ل)[بۆر1 + ئە قــەوم] [هەو] بڕ: بۆرەخزم

**بۆرەک**[1] (نا.)[پەه: بۆرەک. ناو: بۆرە، بۆرەک] خوێیەکی شیمیاییە کە ناوی عیلمییەکەی بۆراتی سۆدیۆمە، لە تێکەڵ بوونی ئەسید بۆریک دەگەڵ سۆدیۆم پەیدا دەبێ، لە سروشت دا لە نێو ئاوی دەریا دا هەیە، بۆ دەوا و دەرمان کەلکی لێوەردەگرن و زێڕینگەریش بۆ تواندنەوەی زێڕ و زێو دە کاری دێنن.

**تێبینی:** عەرەب وشەی بۆرەک ـ یان بە شێوەی بورق وەرگرتوە و لە ڕێگای زمانی عەرەبییەوە چۆتە نێو زمانی لاتین و زمانەکانی ئورووپاییەوە. (ئین، فەر: Borax)

**بۆرەک**[2] (گیانـ.)[بۆر1 + ئەک] ١ـ بڕ: بۆرەجووڕە. ٢ـ [باش] جۆرێک مراوی چووکی ڕەنگ بۆر یا بۆرێکی تێکەڵ بە قاوەییە (فرهنگ پرندگان ل ٣٦).

**بـۆرەک**[3] (نـا.)[تـور: börek] خـواردنێکە لە هەویرێکی تایبەتی (ئاردێک کە توێکڵی گەنمەکەی لێکرابێتەوە)، هەویرەکە پان دەکەنەوە و کوت کوتی دەکەن و لە سەر هەر کوتێک هەندێک قیمە، پەنیری ڕەندە کراو و ئەسپەناغی لە سەر دادەنێن، لوولی دەکەن و لە ڕۆن دا سووری دەکەنەوە.

**بۆرەڵووک** (ئان. ل)[بۆر1 + ئاڵوو2 + ک] ڕەنگێکی تەواو بۆر نەبێ، ئامال بۆر، بۆرباو، بۆرەقنە، بۆرەواش.

**بۆرەمـــارەیی** (نا. ل)[بۆر + ئە + مارەیی] مارەیی کەم.

**بـۆرینـە** (ئان. ل)[بـۆر1 + ئینە] بە هەندێک ناوەوە دەلکێ و مانای ناسیاوی و پێشوویان دەداتێ. :: هەنبانەبۆرینە، کڵاوەبۆرینە.

**بۆریە** (گیا.)[ئار: بوریا] ١ـ جۆرێک قامیشی خۆڕسکە، گەڵاکانی درێژ و نووک تیژە و گوڵەکانی هێشووین، لە شوێنی زەلکاو و شێدار دەڕوێ و لە ساقەتی جۆرە حەسیرێک هەر بەم ناوە ساز دەکەن. ٢ـ حەسیری ساز کراو لە ساقەتی ئەم گیایە.

**بۆڕ**[1] (نا.)[بڕ: بۆر1] ١ـ بەزیو لە شێعر و دمەقاڵە. ٢ـ (ئان)[زا] بڕ: بۆر1. **~ خواردن:** تێک شکان و بەزین لە شێعرشێعرێن و دمەقاڵە دا. **~ دان:** بەزاندنی غەنیم لە شێعر و دمەقاڵە دا.

**تێبینی:** بۆڕ دەگەڵ وشەی بۆر



هەریەک ریشــە و ســەرچاوەیان هـەیە و مـاناکـەیان لە دوایی لێک جـیـا بۆتەوە. چوونکە پیـاوی بەزیـو و تێـشکاو رەنگی سـوور هەڵدەگەڕێ ماناکەی لەوە کەوتوە هەروەک بوورانەوە کە لەم سەرچاوەیە.

**بۆڕ** 2 (نا. د) دەنگی گــڕ و گـــەورە. **~ بوون:** گڕ بوونی دەنگی کوڕێک کە تازە پێ دەگا و باڵغ دەبێ.

**بۆڕ** 3 (نا.)[؟] پێگەیشـــتنی زێدە نەمانی شلکی و جەوانی. **~ بوون:** پتر لە رادە گـەیشتن و پیـر بوونی مـرۆڤ یا گـیـاوگـۆڵ. ៖ کـەنگر بۆڕ بوون تازە بۆ خواردن نابن.

**بۆڕ** 4 (گیا.)[؟] گیایەکی دەشتەکییە، گەڵای وردە وەکوو گەسک، لە نیو میـتر زیاتر بەرز دەبێـــتـــەوە، لە پایز دا دەیدروون و لە شـوێنێک کۆی دەکـەنەوە، زسـتـانان دەیدەن بە مـاڵات و گـا و گـۆڵ. (قامووس ب ٢ ل ١١٨)

**بۆڕ** 5 (نا.)[؟] جێگایەکی فێنکە لە ژێر پووش و گەڵا یا زەوی دا دروست دەکرێ بۆ میوە تیاهەڵگرتن (خاڵ ب ١ ل ١٣٢)، تەرە.

**بۆڕان** (چا. ل)[لە: بۆڕ2] ١ـ دەنگی خـۆ دەرخـسـتنی رەشـەوڵاغ و پاتاڵ. ٢ـ دەنگ هەڵبڕینی بە قەوی مرۆڤ.

**بۆڕاندن** (چا. م)[لە: بۆڕ2] ١ـ دەنگ هەڵبـڕینی رەشــەوڵاغ. ٢ـ (مـجـ.) دەنگ هەڵبـڕینی زەلام و بە قــەوی مـرۆڤ. ៖ هەر یەکەم شەقیان تێهەڵدا یەک بە خۆی بۆڕاندی.

**بۆڕە** (نا. د)[بـۆڕ2 + ئـە] ١ـ دەنگـی پـاتـاڵ و رەشـــــەوڵاغ. ٢ـ دەنگی زەلام و ناخۆشی مرۆڤ.

**بـۆڕەبـۆڕ** (نـا. د)[بـۆڕە + بـۆڕ2] ١ـ دەنگی پەیتاپەیتای رەشەوڵاغ. ٢ـ دەنگی پەیتاپەیتای بۆڕەی مرۆڤ.

**بۆڕی** (نا.)[؟] لوولەی ئاو یا لوولەیەک نەوتی پێ رادەگوێزن.

**بۆڕیە** (نا.)[؟] ئامرازێکی مۆسیقای کۆنە کـە لە کەڵەشـاخ سـازیان دەکرد و ئێـسـتـاکـە شـێوەی مـەعـدەنی لێ سـاز کـــراوە، فـــووی تێـــدەکــــەن و دەنگی لێدەردێنن، شەیپوور، بۆق، کەڕەنا.

**بۆڕیەژەن** (نـا. فـــا)[بـۆڕیـە + ژەن] کەسێک کە بۆڕیە دەژەنێ.

**بۆز** (ئان.)[باک: بۆز ـ ناو: بۆز، بەوز ـ زا: بۆز] ١ـ رەنگێکە لـە تێکەڵ بوونی دوو رەنگی رەش و سپی پەیدا دەبێ. ٢ـ سەر

و پرچ یا مووی ردێنێک کە رەش و سپی تێکەڵ بووبێ، مـــاش و برینـجی. :: بە ریشی بۆزەوە ســوجـــدەی دەبەم من بۆ جـەمـاڵی تۆ / ئەدی بۆچی دەیانگوت دار کە پیر بوو تازە دانایە (تاریک و روون ل ١٣٣). ٣ـ وڵاغی بەرزە کە ئەم رەنگە بن. :: کـەرەبۆز، ئەسپـەبۆز. ٤ـ (مـجـ.) هەر رەنگێکی کـە کـاڵ بـووبێـتـەوە و رەنگی دیکەی بە خۆوە گرتبێ.

**بۆژانە** (گیـا.)[؟] گیایەکی گەڵا وردی بۆن تیـژی لاسک درێژە، گـوڵێکی بۆری بچـووک ئەگـرێت، ئەخـرێتـە نـاو جل و بەرگەوە بۆ مـەنعی (مـۆرانە). (کـشت و کاڵ ب ١ ل ٤٠)

**تێـبـینی:** لە هـەنبـانە بـۆرینـە دا ئەم وشـــەیە بـە بوژانـە نووســـراوە و دەگـەڵ بێــژان بـە یەک داندراون. (بـڕ: هەنبـــانە بۆرینە ب ١ ل ٦٣)

**بۆژۆ** [1] (ئان. ل)[بۆ1 + ئاژۆ] ١ـ ئالیک یا گـیـای پاش ئاخـوڕ کە بۆنی تایبـەتی گـرتوە و مـاڵات ئیـدی نایخـۆن، بۆژە، بۆگـە. ٢ـ (مـجـ.) هەر شـتـێک کـە دەسکاریی کـرابێ و لەبەر چاوی خـەڵک کەوتبێ. **~ کردن:** بیز کردنی ماڵات و نەخواردنی گیایەک کە بۆژۆی لێبێ، بۆژە کردن. **~ لێکردن:** لەبەر چاو کەوتن، بیز و قێز لە خواردن کردن. :: مەجـومعە ئەگـەر خـوانی زۆر هـاتە سـەرێ، کـابرا بۆژۆی لێدەکا (لاس و خەزاڵ ل ٦٠).

**تێبینی:** زەبیـحی ئاژۆ ـ ی لەم وشـەیە دا بـردۆتەوە ســـەر چـاوگی ئاژنین (بڕ: قـامـووس ب ٢ ل ١١٩) ئاژۆ لەم وشــە دا بە مـانای خـۆراکـە و چۆتەوە سـەر ئاز و ئاش و ماناکەی دەبێتـە گیایـەک کە بۆنی خواردنی گرتوە. (بڕ: ئاژۆ)

**بۆژۆ** [2] (نا. ل)[بـۆژ (بزن) + ئـە] بڕ: بووزوو

**بۆژە** [1] (ئان. ل)[بۆ1 + ژە (ئاژۆ)] بڕ: بۆژۆ. **~ کردن:** بڕ: بۆژۆ کردن

**بۆژە** [2] (نا.)[زا] بڕ: برژانگ

**بۆژی** (نا.)[زا] بڕ: باسک

**بۆسار** (ئان. ل)[بۆ1 + سـار] بۆنێکی نـاخـــۆش کـــە لە هـەندێک کـەل و پەلی خـــواردن وەک برینـج و ئارد و گـــەنم و شـتی لەم بابەتە لـەبەر مـانەوە لە شـوێنی نمدار لێیان پەیدا دەبێ، بۆ سارد.

**بۆســارد** (ئان. ل)[بۆ1 + ســارد] ١ـ بۆسار. ٢ـ بۆنی گۆشتی کاڵ.

**بۆسان** (نا. ل)[بۆ1 + سـان][ئەر] بڕ:



بێستان

**بۆست** (نا.) بڕ: بست

**بۆستان** (نا. ل)[بۆ1 + ستان][باک - زا] بڕ: بێستان

**بۆستە** (نا.)[بڕ: کۆستەک] بەندی خەنجەر کە لە کالآنەوە دەکەوێتە سەر دەسکی خەنجەر هەتا نەخزێ، کۆسە، کۆستەک، کۆستک. ‌:: پاکی حازرە تیری، لە ماڵی کەوانی راست و چەپ رۆناوە/ پاکی بۆستەی خەنجەری دەمڕەشی قەتڵگەری ترازاوە (سەعید و میرسێوەدین ل ٢٣٣). **~ ترازاندن:** کردنەوەی بەندی کالان و دەرکێشانی خەنجەر. :: رادەسا سەر خوانی زینی، بۆستەی خەنجەی دەترازاند (لاس و خەزاڵ ل ١٢٨).

**بۆسۆ** (نا. ل)[بۆ1 + سۆ2][باک: بۆسی - ناو: بۆسۆ، بۆنسۆ - هەو: بۆسۆ] ١- بۆنی سووتانی لۆکە و پارچەی لۆکەیی، بۆنسۆ، بۆسی، پیسۆ. ٢- تامی ماستێک کە شیرەکەی هەندێک سووتابێ و گەلێکیش خۆشە، بۆسین، بۆسۆدار. ٣- (کنـ.) بەدناو. **~ بوون:** (کنـ.) بەدناو بون. **~ کردن:** (کنـ.) بەدناو کردن. :: ئەو کچە بەستە زمانە چی نەکردوە نازانم بۆئاوا بۆسۆ و بەدناویان کردوە **~ لێنەهاتن:** (کنـ.) زۆر رووت و هەژار بوون، هیچ نەبوون، بێ ماڵ و بێ سامان بوون، بۆسۆ لێهەڵنەستان. :: ئەو پیاوە هێندە فەقیر و هەژارە بیسووتێنی بۆسۆی لێنایە. **~ لێهەڵنەستان:** بڕ: بۆسۆ لێنەهاتن. **~ هاتن:** بوونی سووتانی پارچە و پەڕۆ گەیشتنە لووت.

**بۆسۆدار** (ئان. ل)[بۆسۆ + دار] بڕ: بۆسۆ/٢.

**بۆسە** (نا.)[باک: بۆسە، بووسە- ناو: بۆسە] ١- بەشێکە لە ئامرازی جووت (نیر و ئاموور)، ئاڵقەیەکە لە دارێکی باریک کە نیر و ئاموور لێک دەبەستێتەوە. ئاڵقەکە دەخرێتە نێو نیر و بە هیرتە قایم دەکرێ و ئامووری تێهەڵدەکێشن، بووسە. ٢- سیپەی راو. ٣- (نز.) کەمین. **~ خواردن:** ١- لە سیپە دابوونی راوکەر بۆ نێچیر. ٢- لە کەمینی دوژمن دابوون. & بۆسە گرتن، خۆ لە بۆسە دان. **~ دانانەوە:** خۆ شاردنەوە لە شوێنێک بۆ لە داو خستنی نێچیر یا هێزی دوژمن. **~ گرتن:** بڕ: بۆسە خواردن. **خۆ لە ~ دان:** بڕ: بۆسە خواردن. **دە ~ دابوون:** ١- لە سیپە دابوونی راوکەر، بۆسە خواردن.

٢ـ لە کەمینی دوژمن دا بوون. **دە ~ خستن:** ١ـ تێکەوتنی نێچیر دە بۆسەی راوکەر دا. ٢ـ دوژمن دە کەمین خستن. **دە ~ کەوتن:** ١ـ تێکەوتنی نێچیر دە بۆسەی راوچی. ٢ـ دە کەمینی دوژمن کەوتن.

**بۆسی** (نا. ل)[بۆ1 + سی (سووتان)][باک] بڕ: بۆسۆ/١.

**بۆسین** (نا. ل)[بۆ1 + سی (سووتان) + ن][باک] بڕ: بۆسۆ/٢.

**بۆش** (ئان.)[تور: boş] هەر شتێکی رواڵەتدار کە نێوەکەی بەتاڵ بێ و چی تێدا نەبێ.

**بۆشایی** (نا. ل)[بۆش + ئایی] ١ـ بنەبانی ئاسمان، ئەو شوێنەی ئاسمان کە ئەستێرەکان و تاوەکانی تێدایە، فەزا. ٢ـ هەر شوێنێک کە بۆش بێ یا بۆش کرابێ. ٣ـ لاچوون یا لە کیس چوونی کەسێکی مەزن یا کاربەدەست کە نەبوونی هەست پێ دەکرێ. ⁂ مەرگی هێمن بۆشاییەکی لە ئەدەبیات دا پێک هێنا.

**بۆشکە** (نا.)[روس: bochka] دەفرێکی گەورەی ئوستوانەیی چێوی یا مەعدەنییە بۆ هەڵگرتنی ئاو، شەراب، نەفت و ئاوەکی دیکە کەلکی لێوەردەگرن، بەرمیل.

**بۆشناغ** (نا.)[؟] کەسی کۆک و پۆشتە و حاڵخۆش کە پۆز لە سەر خەڵک لێدەدا.

**تێبینی:** سەر و سەکوتی ئەم وشەیە لە تورکی دەچێ. لە فەرهەنگەکانی تورکی بەر دەستم تەنیا توانیم وشەی boş-nak بدۆزمەوە کە ئەویش بە نەتەوەیەک بە ناوی بۆسنی دەکوترێ کە لە باڵکان دەژین. وێدەچێ کە ئەم نەتەوەیە زوو کۆک و پۆشتە و بە فیز بووبن و ئەم وشەیە لە رێگای تورکەکانی عوسمانییەوە هاتبێتە موکریان.

**بۆغ** (گیان.)[باک] بڕ: بوغە

**بۆغمە** (نا.)[تور: boğma (خەفە)] ١ـ بڕ: دووشاخە. ٢ـ سووکە جنێویکە بە کەس یا منداڵی زۆربڵێ دەکوترێ بە مانای خەفە بە!

**بۆغە** (گیان.)[باک] بڕ: بوغە.

**بۆق** [1] (گیان.)[سان: بهێکە ـ پەه: ڤەک. دەریی: بەقە ـ ماز: وەگ ـ بیر: باک ـ فار: بک. باک: بەق ـ ناو: بۆق ـ زا: بەقە] ١ـ گیاندارێکی پێست لیچقی پنۆک پنۆکی دووژیانەیە، لە دونیا دا جۆری زۆرە و هەتا ئێستا ١١٧ جۆری

ناســراوە، لە ئاو دا گــەرای دادەنێ کــە پێی دەڵێن ســەرمــێکوتە و کــە لە گــەرا هاتنە دەر ناویان دەبێــتــە کلکەتــەشی و ئــەو ناوەش لــە بــەر کلکێکی درێژە کـــە هەیەتی و هەتا ئەم کلکە فــرێ دەدا هەر لە ئاو دا دەمێنتەوە، Rona ناوی لاتینی ئەم گــیــاندارەیە، بۆقی ئــاوێ، قــورواق، قــۆرواق، قــرواقی. ٢ـ گــیــاندارێکە لە رەگـــەزی بۆق کـــە لە ویشکایی دەژی و توانای بازدانــی نیــە، بۆقی گــڵێ، وەزەخ. || **بۆقی ئاوێ:** بۆق. **بۆقی گـــڵێ:** بڕ: بۆق1/٢.

**بۆق 2** (گیانـ.)[جاف] بڕ: قەلەموونە

**بـۆق 3** (نـا.)[ئـەر] چـاوی زەق، چـاوی دەرپەڕیو، بز.

**بۆق 4** (نا.)[؟] تـەکـــــان، پاڵ. **~ پێوەنان:** بڕ: پاڵ پێوەنان. **~ دان:** پاڵ پێوەنان

**بۆق 5** (نـا.)[ئـەر] پشـت مـل، بـۆق مـل، بۆقەتە. || **بۆقی مل:** بڕ: بۆق مل

**بۆق 6** (نا.)[ئەر] بڕ: بوغ

**بۆق 7** (نا.)[عــەر: بـوق لە لات: -buc cina] ١ـ ئامێرێکی مۆسیـقـای قـەدیمە کە لە شـاخ و ئەسـرۆی گیـانداران سـاز دەکـرا، بۆریە، شــەیپــوور، کــەڕەنا. ٢ـ ئامــرازێکە لە مــاشــێن دا کــە بۆ وریا کردنەوەی خـەڵک دەنگی لێوە دێ، بووق. ٣ـ دەنگی ئـەو ئامـرازەی کـە دە مـاشـێن دایە، دیدە. & بووق. **~ لێدان:** وە دەنگ هێنانی دیدەی ماشێن بۆ وریا کردنەوەی خەڵک.

**بـۆقـــــــــــژە** (نـا. ل)[بـۆق1 + ژە] نەخـۆشـیـیـەکی منداڵانـە کـە نێـو دەم و زاریان بـلوق دەکـا و زوو بە مــرەکــەب چاکیان دەکردەوە.

**بۆقلە** (گیانـ.) بڕ: قەلەموونە.

**بۆقلەمووت** (گیانـ.) بڕ: قەلەموونە.

**بۆقلەموون** (گیانـ.) بڕ: قەلەموونە

**بۆقلەمە** (گیانـ.) بڕ: قەلەموونە.

**بـۆق مـل** (نـا. ل)[بـۆق5 + مـل][ئـەر] پژمل، پشتی مل. بۆقی مل، بۆق5.

**بۆقل** (نا.)[باک] مـاســوولکەی پشت پێ، بەلەک، پووز. هس: بۆقە و بۆق مل

**بۆقـــە 1** (نـا. د) ١ـ دەنگی بـەراز. ٢ـ دەنگی گا کە سووکترە لە بۆڕە.

**بۆقە 2** (نا. ل)[بۆق + ئە] حاڵەتێکە بە ســەر دەغڵ دا دێ و ئەو شــوێنانەی کـە پاشان دەبنە گوڵ تۆزێ هەڵدەمسێن.

**بۆقەتە** (نا. ل)[بۆق5 + ئە + تە؟] بڕ: بۆق5.

**بۆقەخۆرە** (گیانـ.)[بۆق1 + ئە + خۆر + ئە] جـۆرێک هەڵۆیە کـە سـەر و مل و سینگ و پشتی ڕەشی مـەیلەو زەردە، لە پەنا زەلکاو و قامیشەڵانان دەبێ، ئەگەر مراوی یا کەلاکی دیتەوە دەیخوا دەنا بە بۆق و مـــاسـی رازی دەبێ. (فـــرهـنـگ پرندگان ل ١٢٨).

**بۆقەمەلە** (نا. ل)[بۆق1 + ئە + مەلە] جۆرێک مەلەیە کە مەلەوان دەست و لاقی وەک بۆق رادەوەشــێنێ و مــەلـەی دەکـا، مەلەبۆقە.

**بۆکرووز** (نا. ل)[بۆ1 + کرووز] بۆنی سـووتانی هەندێک شـتی وەک خـوری، موو، ئێسک، بۆپرووز.

**بۆکــز** (نا. ل)[بۆ1 + کــز] ١ـ بۆنی چێشتێک کە لە بنەوە سووتابێ و دابێتە سـەرەوە و لە کاتی خواردن دا هەسـتی پێ بکردرێ. ٢ـ بۆسۆ.

**بۆکس** (نا.)[ئین: box] جـۆرێک کێ بەر کـێـیە بە مـست کـە دوو کـەسی هاو وەزن بە دەسـتـەوانەی تایبـەتی دەیکەن، هەرکـات یەکـیـان بکەوێ داوەر هـەتا دە دەبژێرێ و ئـەگـــەر لـەم مـــاوەیە دا هـەڵنەسـتـێـتـەوە (ناک ئاوت) دەبێ و دەدۆڕێ.

**بۆکساوات** (نا.)[رووس: buksovat] دە قـوڕ، بەفـر، لم یا هەر شـتێکی دیکە گێرانی تەگەری ماشێن یا مەکینە وەها کـە لە سـەر جـێـی خـۆی بسـووڕێ و نەتوانێ بێـتـە دەر. **~ کـردن:** گـیـر کـردنی مـەکـینە دە قـوڕ، بـەفـر یا هەر شتێکی دیکە. ٢ـ (کنـ.) لە سەر جێی خۆ بوون و پێش نـەکـــەوتن لـە کــــار و مەسەلەیەک.

**بۆکسێر** (نا.)[ئین: boxer] کەسێک کە بۆکس دەکا، مولاکیم.

**بۆکـســێـل** (نا.)[رووس: buksir] کێشانی ماشێنی دە قوڕ گیراو، خراپ و لە کار کەوتوو یا هەر شـتێکی دیکە بە مـاشـێنێکی دیکە یا مـەکـینـەیەک کـە توانـای کـێـشــانی بە دوای خـۆی دا هەبێ. **~ کردن:** ١ـ کێشانی ماشێن و مـەکـینەی خـراپ و لـە کـار کـەوتوو بە مـاشـێنێکی دیکە. ٢ـ دەرکـێـشـانەوەی مـاشـێنی دە قـوڕ و بەفـر و شـتی لەم بابەتە گیراو.

**بۆکڵێشە** (نا. ل)[بۆ1 + کلێشە] ١ـ بۆنی لەشی چڵکن، بۆدڕن، بۆندڕن. ٢ـ

بۆنی ئارەقەی بن هەنگڵ و پێ.

**بۆکەنگە** (گیانـ.)[باک] بڕ: بۆگەنکە

**بۆگنخ** (نا. ل)[بۆ1 + گنخ (گنخان)] بۆنمی ناخۆشی دانەوێڵەی سەرداپۆشراو کە دوای ماوەیەک مانەوە لێی پەیدا دەبێ، بۆگنخاو، بۆنماوی، بۆگەمرخە.

**بۆگنخاو** (نا. ل)[بۆ1 + گنخاو (گنخان)] بڕ: بۆگنخ

**بۆگە** (ئان. ل)[بۆ1 + گە (ژە)] بڕ: بۆژۆ1

**بۆگەمرخە** (نا. ل)[بۆ1 + گە + مرخ + ئە][سۆر] بڕ: بۆگنخ

**بۆگەن** (نا. ل)[بۆ1 + گەن1] بۆنی ناخۆش لە مانەوەی شتێک کە گەنیبێ، بۆگەنتک. ٢ـ بۆنی ناخۆشی هە چێک کە خۆبەخۆ و لە خۆی دا بۆن ناخۆش بێ وەک گوو، تڕ و تس، ... ٣ـ (ئان. ل) (مجـ.) بیر و باوەر و کردەوەی کۆن و خراپ. & بۆگەنیو، بۆگەنی. ~ **بوون:** بۆ گرتن، بۆگەنیو بوون، گەنین. ~ **کردن:** بۆن گرتن و بۆن لێ پەیدا بوونی هەر شتێک کە ماوەیەک مابێتەوە، بۆگەنیو بوون.

**بۆگەنتک** (نا. ل)[بۆ1 + گەنت (گەند) + ک] بۆنی گەنینی میوە و شتی دیکە، بۆگەن/١.

**بۆگەنکە** (نا. ل)[بۆ1 + گەن1 + کە (کردن)] ١ـ (گیانـ.) گیاندارێکی گوانداری گۆشتخۆرە، لە ڕێوی بچووکترە، لە کاتی مەترسی دا تس بەردەدا و بۆگەنیوێکی ناخۆشی لێدێ وەها کە دوژمنەکەی دوور دەخاتەوە. ئەم گیاندارە کەوڵەکەی بە نرخە و ڕاوچی لەبەر ئەو کەوڵە ڕاوی دەکەن، بۆکەنگە، فسۆس (عەر: ابوالعفن). ٢ـ (گیا.) گیایەکی خۆڕسکە، ٣٠ هەتا ٨٠ سانت بەرز دەبێتەوە، گەڵاکانی ئەستوور و ئاودار و سەوزی مەیلەو شینە، گوڵەکانی زەرد و بەرەکەی کەلوویە کە دەنکەکانی دەنێو دایە و قاوەیین، تەواوی ئەم گیایە بۆنێکی ناخۆشی لێدێ، لەم گیایە بۆ هەندێک دەرمان کەلک وەردەگیرێ، Ruta graveolens و Ruta fetide ناوی لاتینی ئەم گیایەن، بۆگەنیوە، گیابۆگەنیوە.

**بۆگەنی** (نا. ل)[بۆ1 + گەنی] بڕ: بۆگەن

**بۆگەنیو** (نا. ل)[بۆ1 + گەنیو] بڕ:

بۆگـەن. ~ **بوون:** بۆن گـرتن و بۆنی ناخـۆش لێ پەیدا بوونی شـتێک کـە ماوەیەک مـابێتـەوە و بـەرەو خـراپ بوون چووبێ، بۆگەن کردن، گەنین.

**بۆگەنیوە** (گیا.)[بۆ1 + گەنیوە] بڕ: بۆگەنکە/٢.

**بۆل**[1] (نا.)[؟][باک] قوون، کونگ

**بۆل**[2] (ئان.)[تور: bol] ١ـ [زا] زۆر، گەلێک. ٣ـ [باک ـ زا] پان، هەراو، فش.

**بۆل**[3] (نا.)[زا] بڕ: بۆڵ3.

**بۆڵ**[1] (نـا.)[نـاو: بۆڵ، بـۆڵـی ـ هـەو: بۆڵی، بۆڵە] دەنکێک ترێ، گلوو، تلیە.

**بۆڵ**[2] (نا. د) دەنگی بۆڵە

**بۆڵ**[3] (نا.)[؟][زا] ران، مێگەل، گەلە، بۆل.

**بۆڵاندن** (چا. م)[لە: بۆڵ2] ١ـ نارازی بوون لـە مـەسـەلەیەک یا کـەسـێک و لە سـەر رۆینی لە بەر خۆوە، بۆڵەبۆڵ کردن، خوتەکردن، بۆڵە کردن. ٢ـ دەنگی هات و هاواری ورچی توورە.

**بـۆڵـدزێـر** (نـا.)[ئـین: bulldozer] جـۆرێک مـەکـینەی گـەورەیە بـۆ خـۆڵ هـەڵگرتن و تێکردن و کـاری قـورسـی دیکەی لەم چەشنە کەلکی لێوەردەگرن.

**بۆڵـژن** (نـا. ل)[بـۆڵ2 + ژن (ژەندن)] بۆڵە. ∷ پیـرێژن یەک دوو بـۆڵژنی لێـوە هات و بە توورەیی دوور کەوتەوە.

**بۆڵـمـازوو** (نا. ل)[بۆڵ1 + مـازوو] جـۆرێک ترێی دەنک گـەورەی سـپی ئاودارە، توێکڵی ناسـک و مـزرە و هـەر بۆڵەی بە قەد مازوویەک گەورەیە.

**بۆڵە**[1] (نا. د) قسـەیەک لە بەرەو خۆوە لـە رووی تـوورەیـی و نـارازی بـوون لـە کـەسـێک یا مـەسـەلـەیەک، پرتە و بۆڵە، خـوتـە و بۆرە. ~ **کـردن:** بڕ: بۆڵاندن. ~ **هاتن:** بۆڵە کـردن، بۆڵاندن. ∷ دەڵێی پیـرێژنی دۆ لێـرژاوی ئەوە بۆ هەر بۆڵەت دێ.

**بۆڵە**[2] (نا.)[هەو] بڕ: بۆڵ1

**بـۆڵـەبـۆڵ** (نـا. ل)[بـۆڵـە1 + بـۆڵ2] بـۆڵـەی یـەک لـە دوای یـەک، بـۆڵـەی پەیتـاپەیتـا، بۆرەبۆر. ~ **کـردن:** بڕ: بۆڵاندن. ~ **هاتن:** زۆر بـۆڵە کـردن، بۆڵاندن.

**بۆڵەتەمە** (ئان. ل)[بۆڵ1 + تەم + ئە] بڕ: بۆڵەتەمێ

**بۆڵـەتەمێ** (ئان. ل)[بۆڵ1 + تەم + ئێ] ترێیـەک کـە هێـشـتـا بە تەواوی نەگـەیوە و تامـەکـەی مـەیلەوترشـە،

بۆڵەتەمـــە، بەرەکـــە. ئاڵ وبۆڵ. **~ تێکەوتن:** ترش و شـــیـــرین بوونی بەرســــیلە، ئاڵ وبۆڵ بوون. :: ترێ بۆڵەتەمێی تێکەوتوە و چی وای نەماوە بگا.

**تێبینی:** تەم دەبێ لە تام کەوتبێ و لە بەر قـــوورسی « ئا » بوویێــتــە تەم. ماناکەی بەم پێیە دەبێتە دەنکە ترێیەک کــە هەندێک شـــیـــرین بوە و تامی تێگەڕاوە.

**بۆڵی** (نا.)[هەو ـ ئەر] بڕ: بۆڵ1

**بۆم** 1 (ئان.)[؟][زا] گێل، گێژ، حۆل، ئاقڵ سووک.

**بۆم** 2 (نا.) بڕ: بۆمب

**بۆمـادەران** (گـیـا.)[بۆ1 + مـادەر + ئان] بڕ: بۆمارانە

**بۆمارانە** (گیا.)[بۆ1 + مار3 + ئانە] گیایەکی خۆڕسکی چەند ساڵەیە، هەتا حەفتا سانت بەرز دەبێتەوە، ساقەتی درێژ و باریکە، گەڵاکانی گرنی گرنی و گوڵی هێشوویی سپی بۆنخۆشە و لە دەشت و مـێـرگـان دەڕوێ. بۆ دەرمـان کەلکی هەیە و بۆ کوشتنی کرمی نێو زگ، بێوەسیری، دڵ ئێشە و هەندێک نەخـۆشی دی دێم کـراوەکـەی دەکـار دەکەن. Achillea pubescens ناوی عـیلمی ئەم گـیـایەیە بۆمـادەران، برنجداس. (عەر: زهرة القندیل)

**بـۆمـب** (نـا.)[فـــــــەر: bombe] گـوللـەیەکی گـەورەیە کـە نێـوەکـەی بە کەرەسـەی تەقینـەوە پڕ کراوە و فڕۆکە لە ئاسـمـانەوە دەهـاوێژێتــە سـەر پێگەی دوژمن و خـەڵک و بە پێی ناوەڕۆکـەکـەی چەشنی زۆرە، بۆم، بۆمـبـا. **وەک ~ تەقـــینەوە:** (کنـ.) دەنگدانەوە و بڵاو بوونـەوە خـێـرای قـســە و خــەبەر و کـردەوەیەک و شـتێک دە نێـو خـەڵک دا، وەک بۆمب دەنگدانەوە. **وەک ~ دەنگ دانەوە:** (کنـ.) بڕ: وەک بۆمب تەقینەوە. ‖ **بۆمبی ئەتۆم:** بۆمبێک کە بە هێزی ئەتۆم دەتەقێتـەوە و ناوچەیەکی گەلێک پتر لە بۆمـبی ئاسـایی وێران و خـاپوور دەکا. **بۆمبی هیدرۆژێنی:** جۆرێک بۆمبی ئەتۆمە کە لە ئەتۆمی هیدرۆژێن کەلک وەردەگرن و لە بۆمبی ئەتۆم بەهێزترە.

**بۆمبا** (نا.) بڕ: بۆمب

**بۆمباباران** (نا. ل)[بۆمبا + باران] بڕ: بۆمباران

**بۆمـــبـــاران** (نا. ل)[بـۆمب + باران] هـاتنە خـــواری کـــۆمـــەڵێک بۆمب لە

ئاسمانەوە بۆ سەر زەوی، بۆمباباران، بۆمباردمان، بۆردومان. ~ **کردن:** خستنە خوارەوەی بۆمب لە فڕۆکەوە بۆ سەر خەڵک یا سەر شوێنێک، بۆمباباران کردن.

**بۆمباردمان** (نا.)[فەر: bombarde-ment] بڕ: بۆمباران.

**تێبینی:** وشەی بۆمباران هەر لەم وشەی فەڕانسی کەوتوە و لە بەر نزیکی باران و باردمان شێوەی کوردیی بارانی بە خۆوە گرتوە.

**بۆمباهاوێژ** (نا. ل ـ ئان. ل)[بۆمبا + هاوێژ] فڕۆکەیەک کە بۆمب هەڵدەگرێ و ئیشی بۆمباران کردنە.

**بۆمچ** (نا. ل)[بۆ1 + مچ] بۆنی هەندێک شتی وەک گوێز و بادام کە خراپ بوون و تامیان گۆڕاوە، بۆمچەو، بۆمچەوە.

**بۆمچەو** (نا. ل)[بۆ1 + مچەو][ئەر] بڕ: بۆمچ

**بۆمچەوە** (نا. ل)[بۆ1 + مچەو + ئە][ئەر] بڕ: بۆمچ

**بۆن**$^{1}$ (نا.)[ئەو: بەئۆذی ـ پەه: بۆی، بۆد. باک: بێهن، بێن، بین، بی، بهن ـ ناو: بۆ، بۆن ـ باش: بوو ـ هەو: بۆ، بووە ـ زا: بوو، بووی، بوی، بۆ، بۆی] ١ـ هەرچی کە لووت هەستی پێبکا چ خۆش بێ چ ناخۆش. ٢ـ هەستێک کە لە کار و کردەوەیەک دەکردرێ. ∷ ئەو قسەی تۆ بۆنی شەڕی لێوە دێ. ٣ـ شێوەیەکی برژاندن لە سەر سێڵ. ٤ـ عەتر. ~ **پێدان:** بڕ: بۆ دان. ~ **پێوەکردن:** ١ـ بردنە پێشی لووت لە شتێک و هەڵمژینی بۆنی ئەو شتە. ٢ـ بردنە پێشی لمبۆز لە لایەن گیانداری نێرەوە و هەڵمژینی پاشەوەی مێیەکەی بەر لە سوار بوونی . ~ **تێدان:** لە خۆ دانی ~ **تێکەوتن:** سەرەتای پێگەیشتنی هەندێک بەر و بۆی بێستان. عەتربۆ بۆن خۆشی. ~ **دان:** هەستانی بۆن لە شتێکەوە و هەست پێ کردنی. ~ **لێهاتن:** ١ـ بۆن دانی شتی بۆن گرتوو. ٢ـ خۆ پیس کردنی منداڵی چووک. ∷ ئافرەت ئەو منداڵە بۆنی دێ پێم وایە گووی بە خۆی داکردوە. ~ **کردن:** ١ـ هەڵمژینی بۆی شتێک، بۆن پێوە کردن. ٢ـ هەست پەڕینە سەر کار و کردەوەیەک، شک پەڕینە سەر. ٣ـ بۆنی ناخۆش لە هەندێک شت پەیدا بوون. ∷ گۆشتەکە بۆنی کردوە زوو سازی نەکەن خراپ دەبێ. ~ **گرتن:** ١ـ خراپ بوونی

شتێک و لێ پەیدا بوونی بۆنی بۆنی ناخۆش، بۆن هەڵگرتن/١. ٢ـ بۆنی خۆش یا ناخۆش وەرگرتنی جل یا شتی دیکەوە لە ڕێگەی ناراستەوخۆ. ؛؛ کراسەکەت بۆنی سابوونی گرتوە. **~ هەڵگرتن:** ١ـ بڕ: بۆن گرتن. ٢ـ شوێن هەڵگرتنی بۆنی دێڵ یا مێیە لە لایەن گیانلەبەری نێرەوە. **بە ~ کەوتن:** ١ـ نەخۆش کەوتنی منداڵی ساوا بە هەندێک بۆنی توندی وەک بۆنی عەتر و سابوون. ؛؛ زۆر خۆ لەو منداڵە نزیک مەکەوە بۆنی عەترت لێدەی و منداڵەکەم بە بۆن دەکەوێ. ٢ـ نەخۆش کەوتنی منداڵ بە بۆنی ئافرەتی تازەزاوی دیکە.

**بۆن** $^2$ (نا.)[بڕ: بان1][زا] ماڵ، خانوو

**بۆنبڕ** (نا. ل)[بۆن1 + بڕ] بڕ: بۆنبڕە

**بۆنبـــــڕە** (نا. ل)[بۆن1 + بڕ + ئە] مادەیەکە کە لە بۆنی ناخۆشی ئاودەست یا شوێنی دیکە دەبڕێ، بۆچنە.

**بۆنخۆش** (ئان. ل)[بۆن + خۆش] هەر شتێک کە بۆنی پەسەند بێ و مرۆ بە دڵی بێ.

**بۆنخـۆشی** (حم.)[بۆنخـۆش + ئی] چلۆنایەتی بۆنخۆش، بۆنخۆش بوون.

**بۆنخۆشکە** (گیا.)[بۆنخۆش + کە] گیایەکی بۆنخۆشە، لە زەوی بوورە دەڕوێ، نیو میترێک بەرز دەبێتەوە، لاسکی درێژە و لق و پۆپی چڕ و پڕە، گوڵی وەکوو ئی بابوونە وایە، شیرەیەکی لێدەگیرێ زۆر تاڵە، ژەهرە و زەمانی پێشوو بۆ چار کردنی نەخۆشی ئیفلیجی، لۆغە، لەرزۆکی، فێداری، نەخۆشی مەعدە و جەرگ و کرمی نێو زگ، کەلکیان لێوەردەگرت. (قامووس ب ٢ ل ١٢٥)

**بۆنخۆشکەرە** (گیا.)[بۆن1 + خۆش + کەر + ئە] گیایەکە وشکی دەکەن بۆ ناو جلکان. (هەنبانە ب ١ ل ٦٥)

**بۆندار** (ئان. فا)[بۆن1 + دار2][پەه: بۆیدار] ١ـ هەر شتێکی بۆنی خۆشی لێبێ. بۆدار، بۆنخۆش، بێندار، بیهندار. ؛؛ سنگ و بەرۆکت بۆندارە، دەڵێی قەتاری خواجە حەسەنی بەغدایەی و بارە عەترت پێیە (سەعید و میرسێوەدین ل ٧). ٢ـ هەر شتێک بۆن بدا، بە بۆن.// بێ بۆن. ٣ـ قسەی بە کینایە و بە تەوسەوە کە مانای جگە لە مانای سەرەکی بێ.

**بۆندڕ** (نا. ل)[بۆن1 + دڕ] بڕ: بۆدڕن

**بۆندڕن** (نا. ل)[بۆن1 + دڕ + ن] بڕ:

**بۆنسـۆ** (نا. ل)[بۆن1 + سـۆ2] بڕ: بۆسۆ

**بۆنگ** (نا. چا)[؟][سۆر] کاری خاوێن کـردنەوە و خـۆش کـردنی پێـست بۆ مـەشکە. **~ کـردن:** خـۆش کـردنی پێستی مەڕ و بزن و گا بۆ مەشکە.

**بۆنگچی** (نـا. فـــا)[بـۆنگ + چـی] کەسێک کە پێسـتـەی بۆ مـەشکە خۆش دەکا.

**بۆنگچێتی** (حم.)[بۆنگچی + ئێتی] کـار و پیـشـەی کـەسـێک کـە پێست بۆ مەشکە خۆش دەکا.

**بـۆن و بـەرام** (نـا. ل)[بـۆن1 + و + بەرام] بڕ: بۆن و بەرامە

**بۆن و بەرامـــە** (نا. ل)[بۆن1 + و + بەرامە] کۆمەڵە بۆنێکی خۆش کە هەموو دەورووبەری خـۆی دادەگـرێ و هـەمـوو هەسـتی پێدەکـەن، بۆن وبەرام، بەرامـە، بۆبەرامە، بۆوبەرامە.

**بۆنە** (نا.)[بڕ: بیـانوو] ١ـ لە بـەر، بۆ خـاتری. ‹‹ بـە بۆنـەی تۆوە ئێـمـــەش پلاوێکمـان لـە مـاڵە خـەزوورت خـوارد. ٢ـ بیانوو.

**بۆ و بـەرامــــە** (نـا. ل)[بۆ1 + و + بەرامە] بڕ: بۆن و بەرامە

**بـۆهـەڕنـەهـووت** (نـا. ل)[بـۆ1 + هەڕنەهووت] کۆمەڵە بۆنێکی ناخـۆش کە مـرۆ گـێـژ دەکـا. ‹‹ ئەو بۆ هەڕنـەهووتە چیـە بە وڵاتەوە وەربوو زوو پەنجـەرەکان بکەنەوە.

**بۆی** (نا.)[زا] بڕ: بۆن

**بـــۆیـــاغ** (نـــا.)[تـــور: boya] ١ـ دەرمـانێک کـە سـەر و سـمێڵی پێ ڕەنگ دەکـەن، بۆیە2/٢. ٢ـ ئەو دەرمـانەی کـە کەوشی پێ ڕەنگ دەکەنەوە، واکس.

**بۆیاغــچی** (نا. فـا)[بۆیاغ + چی] کــەسـێک کــە کــاری ڕەنگ کــردنەوەی کەوشـە، کەسێک کە واکس لە کەوشـان دەدا.

**بۆینبـــاخ** (نا. ل)[تور: boyun (مل) bağı(بـەنـد)] پـارچـەیـەکـی دوراو و ئـامــادەی تـایبــەتی بە ڕەنگ و گــوڵی جــۆراوجــۆر کــە دەچێــتــە بن یەخـــەی کراسـەوە، گرێی تایبـەتی لێدەدەن و پتر دەگـەڵ کـۆت و شـاڵوار دەبەسـتـرێ، کراوات.

**بۆیە** 1 (شر.)[بۆ + یە] ١ـ لە بەر ئەوە،

لە بەر ئەمــە، چونکە. ؛؛ هەوا ســاردە بۆیە ئەو کـراســە ئەســتــوورەم دەبەر کـردوە. ٢ـ وڵامی بۆچی یا بۆ بە مـانای هەروا. ؛؛ بۆ کـار ناکـەی؟ ـ پێم خـۆشـە بۆیـە! & بۆیـەکـە، بۆیەکـا، بۆیەکـانێ، بۆیەکوو.

**بـۆیـە**[2] (نـا.)[تـور: boya] ١ـ ئـەو مــادەیەی کــە دەرک و دیواری پـێ ڕەنگ دەکەن. ٢ـ بڕ: بۆیاغ.

**بـۆیـەچی** (نـا. ل ـ ئـان. ل)[بـۆیـە2 + چی] نەقـقـاشـێک کـە دەرک و پەنجـەرە و دیوار ڕەنگ دەکا.

**بۆیەکا** (شر.) بڕ: بۆیە1

**بۆیەکانێ** (شر.) بڕ: بۆیە1

**بۆیەکوو** (شر.) بڕ: بۆیە1

**بۆیەکە** (شر.) بڕ: بۆیە1

**بوو**[1] (نا.)[بڕ: بووم1] زەوی.

**بوو**[2] (نـا.)[بـڕ: بـووم 2] کـــــــوند، کوندەبوو، بایەقوش.

**بوو**[3] (نا.)[باش ـ زا] بڕ: بۆن1

**بووئا** (گـیـانـ.)[فـەر: Boa] مـارێکی گــەورە و درێژ و بێ ژارە کــە لە هیـند و ئامـریکای بـاشــووریـی دەژی، لە دەوری نێـچـیـری دەهاڵێ و دەیکووژێ و قـووتی دەدا.

**بووجی** (گـیـانـ.)[باک: بـووجی ـ زا: بوویجی] توتکە سەگ، توڵە.

**بوودجە** (نا.)[فـەر: budget] داهات و خـــەرجی گـــشـــتـی وڵاتێک، یانە، کۆمەڵەیەک یا کەسێک.

**بـوودڕ** (نـا. ل)[بـوو1 + دڕ] ١ـ زەوی دادڕاو، کــــەنداڵ، ڕەهـۆڵ. ؛؛ هـێنـدێـک کەس دەیـانگوت: کـەس نەیـدیوە بڕوا ئەو دوژمنە، پێموایە کوژراوە/ بزانن کەلاکی لە چ بوودڕێک، لە چ بن بەردێک بە جێ ماوە (سەعید و میرسێوەدین ل ٢٣٦) ٢ـ زەوی هـەڵکەندراو، زەوی کـــون کـــراو، ڕەهەند، نەغم، لەغــەم. ٣ـ [باک] کـونی گـیـاندار لە زەوی دا، لان. **~ لێدان:** هەڵکۆڵینی زەوی بـۆ ســەر دەرهـێنان لە شـوێنێکی دیکە، ڕێگا لێدان بە بن زەوی دا، ڕەهەند لێدان.

**بوودەڵە** (ئان.)[عەر:] مرۆڤی خوێڕی و هیچ و پووچ، مرۆڤێک کە کەسایەتی لە نێـو خـەڵک دا نەبێ، هـیـچـەکـە، هـیچ و پووچ، خوێڕی.

**بوور**[1] (نا.) بڕ: بوورە

**بوور**[2] (ئان.)[باش] بڕ: بۆڕ1

**بوورا** (نا.)[؟][باک] پەیوەندی نێوان ژن پیاوێک دەگەڵ برای ئەوکەسە، برای مێرد، شووبرا، هێوەر.

**بوورانەوە** (چا. ل)[بووران + ئەوە] دڵ لە خۆ بوونەوە و بێهۆش کەوتن لە برسان یا لە ترسان، لە سەر خۆ چوون، بووردنەوە.

**تێبینی:** بوورانەوە و بووردنەوە لە وشەی بۆر کەوتوە و ئەویش لەبەر رەنگ گۆرینی مرۆڤە. لە کوردەواری دا بۆ وەهۆش هێنانەوەی کەسی بووراو بۆسۆی وەبن لووت دەگرن.

**بووردن** (چا. ل)[هیک: ڤیتەر ـ ئەو: ڤیتەر ـ پەهـ: ڤیتەرتەن، ڤیتارتەن] ١ـ تێپەرین، رابوردن. ٢ـ خۆش بوون، بەخشین، لێبوردن. ٣ـ زۆر گەیشتن و تەپینی تەرەکاری (کاڵەک، شووتی، هاروێ، ...)

**بووردنەوە** (چا. ل)[بووردن + ئەوە] بڕ: بوورانەوە

**بوورس** (نا.)[ئال: börse] بازاڕی مەعامەلە و کڕین و فرۆشی وەرقە باییدارەکان.

**بووڕۆس** (نا.)[زا] بڕ: بۆڕس

**بوورە** (نا.)[باک: بۆر ـ ناو: بوور، بوورە ـ زا: بۆر، بورە] زەوییەک کە قەت نەکێڵدرابێ.

**بوورین** (چا. ل)[بڕ: بووردن] ١ـ بڕ: رابوردن. ٢ـ بڕ: لێبوردن.

**بووز**[1] (گیا.)[باک: بزوو، بزی ـ ناو: بووز، بەوز] دارێکی خۆڕسکە، زۆر بەرز نابێتەوە و لە مێشە و دارستان و لێڕەوار دەڕوێ، گەڵاکانی وەک گەڵای توو وایە، هەندێک لە گەڵاکانی وەک تۆپ خڕ دەبنەوە و کە نێوەکەی پڕ دەبێ لە گەرای مێشوولە. لە کوردستان زۆرە و پتر بۆ سووتاندن کەلکی لێوەردەگرن، Ulmus ناوی لاتینی ئەم دارەیە، نارەوەن، نارەوەند، نارەوەن، دارمێشوولە، دارتۆفانە، دارەوەن.

**بووز**[2] (نا.)[؟] گونجاو. تەنیا دەگەڵ چاوگی خواردن مانا دەدا. **بۆ ~ خواردن:** لوان، گونجان. ∷ بە داخەوە بۆم بووز ناخوا بێم و سەرت بدەم.

**بووز**[3] (نا.)[تور: buz] بڕ: سەهۆڵ

**بووزوو** (نا. ل)[بووز (بزن) + ئوو] [باک: بووزوو، بزوون ـ ناو: بووزوو، بزوو، بۆژۆ] قوماشێکی تۆڕی هەندێک ئەستووری تایبەتی کوردستانە، باریک

و درێژە، کە جۆلا لە مەرەزی بزن سازی دەکەن و رانک و چۆغەی لێ دروست دەکەن و گۆیا مار ناتوانێ لە سەر رانکەوە پێوە دا و لە بەر کون کون بوونی پارچەکە ددانی تێی دا گیر دەخوا و ددانی دەکێشرێ، شاڵ.

**تێبینی:** بووزوو و هاوتاکانی لە وشەی بزن کەوتوون، ئەوەش دیارە لە بەر مەرەزی بزنەکەیە. لە زمانی پەهلەویی دا بوز پەشمێن بە مانای بووزوو هاتوە.

**بووزەڵە** (نا. ل)[بووزوو + ئەڵە] بەرهەڵبێنەیەکە کە لە بووزوو سازی دەکەن و ژن و کابان بۆ کار دەبەری دەکەن و سینگ و باسکیان دادەپۆشێ.

**بووژ** (ر.)[لە: بووژانەوە] لە رەگی بووژانەوە دەکەوێ و بە ناوەوە دەلکێ و مانای بووژێنەر دەدا. ئەوەندی من بیستوومە تەنیا لە وشەی ئاوربووژە دا هەیە.

**بووژاندنەوە** (چا. م)[بووژاندن + ئەوە] ١ـ زیندوو کردنەوە گیانداری لە حاڵی مەرگ دا. ٢ـ زیندوو کردنەوەی دار، گیا و گوڵ کە لە حاڵی سیس بوون و ژاکان دا بن. ٣ـ وەگەڕ خستنەوەی داب و نەریت و هەر شتێکی لە بیر کرابێ. ٤ـ هێنانەوە سەر حاڵی خۆشی کەسێکی نارەحەت و داماو. ٥ـ هەڵایساندنەوەی ئاگری دامرکاو. ٦ـ گەشاندنەوەی رەژی وپۆلووی ئاگر.

**تێبینی:** بووژاندنەوە و بووژانەوە لە چاوگی لە بیر کراوی بووژان کەوتوە کە ئیمرۆکە برەوی نەماوە. بوج buj لە ئەوێستا دا و بۆژییتەن لە زمانی پەهلەویی هاوریشەی بووژانەوەی کوردیین و بە مانای رزگار کردن و نەجات دان هاتوون.

**بووژانەوە** (چا. ل)[بووژان + ئەوە] ١ـ زیندوو بوونەوەی کەسێک یا گیانداری لە حاڵە مەرگ دا. ٢ـ زیندوو بوونەوەی دار، گیا و گوڵی سیس و ژاکاو. ٣ـ وە برەو کەوتنەوەی داب و نەریتی لە بیر کراو. ٤ـ هاتنەوە سەر حاڵی کەسی داماو و پەشێو. ٥ـ گەشانەوەی ئاگر و پۆلووی دامرکاو.

**بووسە** (نا.)[باک] بڕ: بۆسە/١.

**بووفە** (نا.)[فەر: buffet] ١ـ شوێنی فرۆشتنی ساردی و خواردەمەنی لە نێو رستوران و شوێنی دیکە. ٢ـ شوێنی نان خواردن لە جێگاگەلی وەک ئێزگای قەتار و تەماشاخانە. ٣ـ قەفەسەی نێو ماڵ کە

کەرەسەی سەر سفرەی تێدا دەچن.

**بووک** (نا.)[ئـەو: وەذوو ـ ســـــان: ڤـەدهوو ـ پەھ: ڤـەیۆ. بەخ: بیک. باک: بووک ـ ناو: بووک، وەوی ـ باش: وەیوی ـ هــەو: وێــو، وەیــوی، وەوە، وەیــوە ـ زا: ڤەیڤە، ڤێو، ڤێڤ] ١ـ کچێک کە قەرارە شـوو بکا و بۆ ئەم مـەبەسـتـە ئامـادەی دەکــەن، تای زاوا لـە زەمــاوەند دا. ٢ـ کچی شـوو کراو و لە ماڵە زاوا. :: فاتم بووکی ماڵە کاک کەریمە. ٣ـ لەیستووکی بە شکڵی مێینە لە پلاستیک، پارچە یا لە هەرچی بێ و کچۆڵە یاری دەگەڵ دەکەن، بووکەشـووشـە، بووکەچینی، بووکـۆڵە، بووکـەڵە، وەویلە، وێوڵێ، بووکک. ٤ـ ئەو داوەڵەی کــە بۆ بووکــەبارانە ســازی دەکەن. ٥ـ ماکێتی ساز کراو بە شێوەی مـرۆڤ کـە جل فـرۆش و خـەیات جلی دەبەر دەکـــەن. ٦ـ [باک] نێـــو و نێوەڕاستی شـووتی. ٧ـ [باک] باپشکێو. ~ **بردن:** گواسـتنەوەی بووک بۆ مـاڵە زاوا، بووک گواسـتنەوە. ~ **دابەزاندن:** گـەیشـتنی بووک بـۆ مـاڵە زاوا و هێنانە خـــواری لە ئەسپ یا مـــاشـێن. ~ **گــواســتنەوە:** بردنی بووک لـە مـــاڵی باوکـیـیــەوە بۆ مـاڵە زاوا، بووک بردن. ~ **گۆڕینەوە:** گۆڕینـەوەی بووک لە ژن بە ژنە دا لە نیوەی ڕێگا. بەم چەشنە کە کەس و کاری بووکەکان هەتا نیوەی ڕێگا دێن و لـەوێ بووکــەکــان دەگــۆڕنـەوە و هەرکـەس بووکی خـۆی دەباتەوە. **بووکی مــاڵە باب بوون:** (کنـ.) هـەر لە مـاڵ باب دا مانەوەی کچ و مێرد پەیدا نەکردن. **بە ~ بردن:** (کنـ.) حـــەیا بردن، ئابڕوو بردن، لە هەڵلا دانی کار و مەسەلەیەک. :: خـزم و کـەسم هـەر بزاننـەوە کـە من قــومــار دەکــەم دەست بەجێ بە بووکم دەبەن. || **بووکی بەهار:** (کنـ.) گـــوڵ. **بووکی دانەبەزیو:** (کنـ.) کـچـێک کــە لە نێـومـاڵ دا دەست لە هـیچ نەدا و کـاران نەکا. :: کچێ ئەوە بۆ هیچ ناکەی دەڵێی بووکی دانەبەزیوی هەســتــە یارمــەتی دایکت بدە! **بووکی دەریایی:** (گـیــانـ.) گـیـانداریکی دەریاییە وەک قـرژانگێکی درێژ و زۆر جـــوان کـــە ئاخـــری لەشـی دەگـاتە چوار پەڕە کـە بۆ جـووڵە دە نێـو ئاو دا کـــەلکی لێـــوەردەگـــرێ. جـــووتە چنگەکانی ئەم گیاندارە گەورە و زۆر بە هێـزن و بۆ ڕاوی گـیـاندارانی بچـووک کەلکی لێوەردەگرێ، درێژایی دەگاتە نیو میـتر و قورساییشی هـەتا پێنج کیلۆش دیتـراوە. ئەورووپاییـەکـان گۆشـتـەکـەی دەخـۆن و هەر لەبـەر ئەمـە ڕاو دەکردرێ،

homarus ناوی لاتینی ئەم گیاندارەیە، قــرژانگی دەریایی. **بووکی رۆژ:** (کنـ.) هەتاو، خۆرەتاو. **بووکی سوور:** (کنـ.) ١ـ بووکێک کە کچ بێ و بێوەژن نەبێ. ٢ـ جنس و کالای باش. **بووکی سەر تاقەی:** (کنـ.) کیژ و ژنی زۆر جوان. **بووکی عەرەب:** (کنـ.) مەککە. **بووکی مالان:** (کنـ.) کچی کارزان و کارکەر. **بووکی یەکشەوە:** کچێک کە لە شەوی زەماوەند دا مێردەکەی بکوژرێ یان بمرێ.

**بووک بووکێن** (نا. ل)[بووک + بووک + ئێن] ١ـ کایە کردنی منداڵ بە تایبەت کچۆلان دەگەڵ بووکی یاری، بووک بووکێنە. ٢ـ بوون بو بووک و زاوای قەستی لە لای منداڵان بۆ کایە و یاری. (تاقمێک منداڵ کوڕ و کچێک دەکەنە بووک و زاوا و وەک شایی و داوەت بە خەیاڵ زەماوەند دەگێڕن.)

**بووک بووکێنە** (نا. ل)[بووک + بووک + ئێنە] بڕ: بووک بووکێن/١.

**بووک خنکێنە** (نا. ل)[بووک + خنکێنە (خنکاندن)] هەرکام لە ئێسکەکانی ملی مریشک.

**بووکک** (نا. ل)[بووک + ک][باک] بڕ: بووک/٣.

**بووک مار** (گیانـ.)[بووک + مار1] [باک] بڕ: مارمێلکە

**بووکنی** (ئان. ل)[بووک + ن + ئی] ئەو کەسانەی کە لە ماڵە زاواوە دەچنە ماڵە بووک و بووک دەگەڵ خۆیان دێننەوە ماڵە زاوا.

**بووکەبارانە** (نا. ل)[بووک + ئە + بارانە] داوەڵێکە لە کاتی بێ بارانی کە مەترسی ویشکە ساڵی هەیە منداڵ ساز دەکەن. دوو داری راست و چەپ لێک دەبەستن و پەڕۆی بە سەر دادەدەن و تاقمێک منداڵ بە کۆلانانی دا دەگێڕن و هەرا دەکەن: بووکی مە بارانی دەوێ / ئاوی نێو دەغلانی دەوێ / دەرزیلەی کچۆلانی دەوێ. دەگەنە بەر هەر دەرکەیەک خەڵک قاپێک ئاو بۆ بووکۆڵەکە دا دەکەن و بڕوایان وایە بەم چەشنە باران دەبارێ. بووکە بە بارانە، بووکە بە بارانێ، بووکەبارانێ، وێوڵەبارانێ.

**بووکەبارانێ** (نا. ل)[بووک + ئە + باران + ئێ] بڕ: بووکە بارانە.

**بووکە بە بارانە** (نا. ل)[بووک + ئە + بە + بارانە] بڕ: بووکەبارانە

**بووکە بە بارانێ** (نا. ل)[بووک + ئە

+ بە + باران + ئێ] بڕ: بووکە بارانە.

**بووکـەجندە** (گـیـانـ.)[بـووک + ئە + جندە] جـۆرێک مـارمـێلکەی ئاویی پنۆک پنۆکی رەنگاورەنگی جوانە، هەر بە قەرا مـارمـێلکەیە و شکڵی ئەویشی هـەیە، لە کانی و دەراو و گۆل و شوێنی کەم ئاو و تەنک دا دەژی و لە بـەر رەنگەکـانـی ئەو ناوەیان لێناوە.

**بـووکــەچینی** (نـا. ل)[بووک + ئـە + چینی] بڕ: بووک/٣.

**بووکـەسوورە** (گـیانـ.)[بووک + ئە + سـوور + ئـە] مـەلێکی چووکـە بـە قـەرا چۆلەکـەیەک دەبێ، بەر سـینگی سـووری ئامـاڵ زەردە، Erithacus rubecula ناوی لاتینی ئەم مـەلەیە، سـینگ سـوور. (فـار: سـینە سـرخ ـ عـەر: ابوالحناء). ‖ **بووکەسوورەی ئێرانی:** ١٧ سـانتیمێتـرە. نێـرەیان پشـتـی بـۆری ئامـاڵ شـینە. لاجـانگی رەشـە. برۆ و گـەرووی سـپییە. سـینگ و تەنیشـتـی سـووری نارنجـیـیـە، کلکی رەشـە. مێیـەیان رەشایی لاجـانگی نـیـیـە (فـەرهـەنگی باڵندە ل ٥٦) Irania gutturalis ناوی لاتینی ئەم مەلەیە.

**بووکە سەماکەرە** (نا. ل)[بووک + ئە + سـەمـا + کـەر + ئە] بووکـۆڵـەیەکـە لە پارچە ساز دەکردرێ و نێوەکەی بە لۆکە یا شتی دیکە داخننەوە.

**بووکـەسی** (گـیـانـ.)[بـووک + ئە + سی2] لە گـشـت قـازەکـان جـوانـتـر و چووکـتـرە. پەڕ بەڵەکـە، مل، سـینگ و لاجـانگی سـوورە. خـەتێکی پانی سـپی بە تەنیـشـت دا کـشـاوە. لاق و دنـدووکی چـووک و رەشـن. لـە نێــــوانـی چـاو و دندووکی خـاڵێکی سـپی هـەیە، Branta ruficollis ناوی لاتینی ئەم قازەیە.

**بووکـەشـووشـە** (نـا. ل)[بووک + ئە + شووشە] بڕ: بووک/٣.

**بووکـــۆڵە** (نـا. ل)[بووک + ئۆڵە] بڕ: بووک/٣.

**بووکــەڵە** (نـا. ل)[بووک + ئـەڵە] بڕ: بووک/٣.

**بووکینان** (نـا. ل)[بووک + ئین + ئان] [بـاک] دیوی بـووک و زاوا لـە شــــــەوی زەماوەند دا، پەردە، پەردوو، پاشپەردە.

**بووکــێنی** (نا. ل ـ ئـان. ل)[بووک + ئێن + ئی] ١ـ جل و بەرگ یا هەر شـتێک کـە بۆ بـووک کـردراوە. ∷ بیـسـت سـاڵە زەمـاوەنـدمـان کـردوە بەڵام هێشـتـا جلی بووکێنیم هـەر مـاوەتەوە. ٢ـ ئەو مـاوەیەی کە کـچی تازە شـوو کـردوو لە مـاڵێک بە



بووک حیساب دەکردرێ.

**بوول** (ئان.)[؟][باک] پشتکوور، کوور.

**بوولەرزە** (نا. ل)[بوو1 + لەرز + ئە] هەژیان و لەرینەوەی چینی سەرەوەی زەوی کە ئەگەر توند بێ دەبێتە هۆی وێرانی، بوومەلەرزە، بوولەرە، زەلزەلە، ئەردهەژین.

**بوولەرزەپێو** (نا. ل)[بوولەرزە + پێو] ئامراز و دەزگایەک کە چلۆنایەتی و رادە و شوێنی بوولەرزەی پێ ئەندازە دەگرن.

**بوولەرە** (نا. ل)[بوو1 + لەر (لەرینەوە) + ئە] بڕ: بوولەرزە

**بوولێڵ** (نا. ل)[بوو1 + لێڵ] ١ـ تاریک و روونی ئێوارە یا بەیانی، بوومەلێڵ، بوولێڵە. ٢ـ تاریک، تاریک و روون، نیوەتاریکی. ؛؛ بە ئەمری رەحمانی/ تۆز بڵند بوو، بوولێڵی خستە بەری عاسمانی (شۆڕمەحموود ل ٥٤)

**تێبینی:** دە نێوان بوولێڵ و بوومەلێڵ هەندێک کەس جیاوازی دادەنێن و بوومەلێڵ بە تاریک و روونی بەیانی و بوولێڵ بە تاریک و روونی ئێوارێ دادەنێن. لە باری وشەوە هەردووک یەک مانایان هەیە. بوو یا بووم بە مانای زەوین (هەروەک بوولەرزە و بوومەلەرزە) و لێڵش کە ماناکەی دیارە و بە گشتی یانی ئەو دەمەی کە زەوی لێڵ دەبێ یا روونی و تاریکی تێکەڵ دەبن کە ئەویش هەر دوو کاتی تاریک و روونی ئێوار و بەیان دەگرێتەوە.

**بوولێڵە** (نا. ل)[بوو1 + لێڵ + ئە] بڕ: بوولێڵ

**بوولێڵی** (ئان. ل)[بوولێڵ + ئی] رەنگی بوولێڵ کە نە رووناکە و نە تاریک، رەنگی خۆڵەمێشی.

**بووڵ** (نا.)[پەه: ڤەر][هەو ـ ئەر] خۆڵی پاشماوەی سووتەمەنی دوای سووتان، خۆڵەمێش، خۆڵەکەوە، خۆڵی، مشکی. ؛؛ ئازیزم! ئاهیر دووریی باڵای تۆ/ جەستەم کەرد وە بووڵ، شەماڵ بەرد پەی کۆ (مەولەوی ل ٢٥).

**تێبینی:** بووڵ هاومانایە دەگەڵ ڤەر var یا ڤەرر varr ـ ی پەهلەویی بە مانای خۆڵەمێش و هاوریشەیە دەگەڵ رەنگی بۆر بە لە بەر چاو گرتنی ئاڵوگۆڕیی دوو پیتی « ڵ » و « ر » دەگەڵ یەکتر.

**بووڵاو** (نا. ل)[بووڵ + ئاو] خۆڵەمێشێک کە دەگەڵ ئاو تێکەڵاو کراوە، خۆڵاو. بووڵاو بۆ رەنێو هێنانی

کـشــمـیش و سـەبزە هەروەها دروست کـردنی مـرەبا و هەندێک شـتی دیکە کەلکی لێوەردەگرن.

**بووڵەمــڕ** (نا. ل)[بووڵ + ئە + مــڕ] خۆڵەمـێشی داغ، زیلەمۆ، ژیلەمۆ، ژیلە، بیلمر.

**تێبینی:** مڕ لە چاوگی دامرکان کەوتوە و خودی دامرکانیش لە مردن.

**بووڵەوەرە** (نا. ل)[بووڵ + ئە + وەر + ئە] تیـژاوی خـۆڵەمـێش کـە بە بن دار و رەزی دادەکەن بۆ کوشـتنی میمڵ و کرم و گیانداری بە زیان.

**بووم**[1] (نا.)[هیک: بهـوومـیی ـ ئێک: بووما ـ ئەو: بوومی ـ هەخ: بووم، بووما، بوومـیی ـ سـان: بهـوومی، بهـوو ـ پەه: بووم. ناو: بوو، بۆ، بووم ـ هەو: بووم] ١ـ زەوی، سـەرزەوی، عـەرد، هەرد، ولات. ٢ـ پارچەیەکی ئامـادە و خـۆش کـراوە کـە نەققاشی لە سەر دەکەن.

**تێبینی:** بووم و هاوتاکانی لە کوردیی دا بە دەگمـەن مەگەر لە ئەدەبیات دا بە تەنێ بێن، بەڵام لـە وشـەکانی لێکدراو دا هێشـتا مـاون، وەک بوومـەلەرزە، بوودڕ، بوومـەڵێڵ، بووم ریخ، هەرد و بۆ، بـووڵێڵ و...

**بووم**[2] (گـیـانـ.)[عـەر: بووم] کـوند، بوو2، کوندەبوو. ⁘ بە یادی کـونجی تۆ حـاجی وەکـوو بـووم/ لە مــەعـمــوورە دەچێتە ناو کەلاوە (حاجی قادر ل ١١٣).

**بـووم ریـخ** (نـا. ل)[بـووم1 + ریـخ] زەوییەکی سووک کە هەمووی خاک نەبێ و رەڵم و خیزی دەگەڵ بێ.

**بوومـەکـوێرە** (گیانـ.)[بووم2 + ئە + کوێر + ئە] بڕ: کوند

**بـوومــــەلەرزە** (نا. ل)[بووم1 + ئە + لەرز + ئە] بڕ: بووڵەرزە

**بوومەڵێڵ** (نا. ل)[بووم1 + ئە + لێڵ] بڕ: بووڵێڵ

**بوون** (چا. ل)[ئێک: بەڤـە، بەڤ، بوو ـ ئەو: بـوو، بـەڤ ـ هـەخ: بـەڤ ـ ســـــان: بهــەڤـەتی ـ پەه: بووتەن، بـوتەن. روس: بیت ـ ئین: be. باک: بوون ـ نـاو: بوون ـ باش: بوین ـ هەو: بیــەی ـ زا: بیـاییش] ١ـ لە دایک بوون، بـە دونیـــا هـاتن. ⁘ کـــەس بە دوعـــا نـەبوە، بـە تووک بمرێ (پەند). ٢ـ مـەوجـوودیەتی بـوونەوەر. ⁘ ئەو گـوڵدانـە لە کـــوێ بوو هـەر لە وێی دانێوە. ئێرە پێشـتر دێ بوە بەڵام ئێسـتا بۆتـە شـــار. ٣ـ پێگەیشـــتنی دارەبەر و حـاســلات. ⁘ گـەنمەکـان بوونـێ بەڵام

سێوەکان هێشتا نەبوونێ. ٤ـ چاوگی یاریدەدەر بە چاوگی دیکە، بۆ سەرف کردنیان لە رابوردوو دا. ‹‹ نەمابوو، هەڵاوەسرابوو، کاتێک میوانەکان هاتن نانمان خواردبوو. ٥ـ هەبوون. ‹‹ پووڵم نەبوو دەنا ماڵێکم هەر دەکڕی. ٦ ـ ئاو هاتنەوە، راحەت بوونی ژن و پیاو لە کاتی نزیکی. **بوون بە(بونە):** ١ـ پێگەیشتن. ‹‹ کوڕەکانم بوونە دوکتوور. ئەحمەد بۆتە دوو ساڵە. ٢ـ تەبدیل بوون، گۆڕان بە شتێکی دیکە. ‹‹ ئاوەکە بۆتە سەهۆڵ. وڵات هەمووی بۆتە قوڕ.

**بوونەوە** (چا. م)[بوون + ئەوە] ١ـ لە سەررا بوون، ژیانەوە. ‹‹ هەر ددانە رزیوەکەیان کێشام سوکناییم هاتێ دەتکوت تازە لە دایک بوومەوە. ٢ـ دیسان بوون، پەیدا بوون، وەچنگ کەوتن. ‹‹ تازە کوڕی وا چاک نابێتەوە. ٣ـ کرانەوە، وەبوون. ‹‹ دەرکە بۆتەوە فەرمووونە ژوور. ٤ـ کرانەوەی غونچە، پشکووتن. ٥ـ لێبوونەوە، تەواو بوون. ‹‹ ئەو منداڵە هێشتا لە شیر نەبۆتەوە. سەعات چوار لە کار بووینەوە. ٦ـ کەوتن، جیا بوونەوە، لێبوونەوە. ‹‹ سێوێک لە دار بۆوە و بە سەر کابرای رێبوار دا کەوت. ٧ـ چاوگی یاریدەرە بۆ سەرف کردنی کرداری دیکە لە زەمانی رابوردوو دا. ‹‹ چووبوومەوە، نەهاتبوومەوە، منداڵێکیان دیتبۆوە.

**بوونەوەر** (نا. ل، ئان. ل)[بوون + ئە + وەر] هەرچێک کە هەبێ (گیاندار و بێ گیان)، مەوجوود.

**بووی** (نا.)[زا] بڕ: بۆن

**بوویجی** (نا.)[زا] بڕ: بووجی

**بها** (نا.)[باک] بڕ: بایەخ

**بهار** (نا.)[باک] بڕ: بەهار

**بهشت** (نا.)[باک] بڕ: بەهەشت

**بهن** [1] (نا.)[باک] بڕ: بۆ1

**بهن** [2] (نا.)[باک] بڕ: بین1

**بهور** (نا.)[باک] بڕ: بوار1

**بهورتن** (چا. م)[باک] بڕ: بواردن

**بهوشت** (نا.)[باک] بڕ: بەهەشت

**بهۆست** (نا.)[باک] بڕ: بست

**بهۆک** (نا.)[باک] بڕ: بەی

**بهیڤ** (نا.)[باک] بڕ: بادام

**بهیستن** (چا. م)[باک] بڕ: بیستن

**بهێشت** (نا.)[باش] بڕ: بەهەشت

**بە** (ئام.)[ئێک: پەتی ـ ئەو: پەئیتی ـ هەخ: پەتیی ـ پاز: پە ـ پار: پەذ ـ پەھ: پەت. باک: پێ، ب ـ ناو: بە، وە ـ باش: وە ـ هەو: بە ـ زا: ڤە] ئامرازە و بۆ ئەم مەبەستانە بە کار دەبردرێ:

١ـ بۆ سوێند خواردن. :: بە سەری بابم، بە خودای، بە گۆڕی کاکم. ٢ـ بۆ دیاری کردنی چلۆنایەتی کەلک وەرگرتن لە شتێک یا ئامرازێک. :: بە دەست چۆلەکەیەکم گرت. بە مشار دار دەبڕنەوە. ٣ ـ بۆ پرسیار و وڵام دانەوەی. :: بە چەند؟ ـ بە دووسەد تمەن! بەچی؟ ـ بە دووچەرخە! بە کوێ دا؟ ـ بە سەرێ دا! ٤ـ پێش ناوی هەندێک گیانداری نێر دێ و مەیلی مێینە بەوان نیشان دەدا. :: بەکەڵ، بە بەران، بەفاڵ، بەتەگە. ٥ـ دوو ناو یا دوو ئاوەڵناوی دوویات کراوە تێکدەکاتەوە و ئاوەڵناوێکی نوێ ساز دەکا، ئاو2، ئان4، ئام4، ئا14. :: دووربەدوور، شاربەشار، سەربەسەر، دەست بە دەست.

**بە ئاستەم** (ئاک. ل)[بە + ئاستەم] زۆر کەمتر لە حاڵەتی ئاسایی، کەمێک، نەختێک، بە سەبرا، بەحاڵ. :: بە ئاستەم سەری لە دەرگا دەرهێنا. رادیۆکە بە ئاستەم دەنگی دەهات. **بە ئاستەم و دوو بەلا:** زۆرزۆر کەم، کەمووچکێک، ئاهێک. :: بە ئاستەم و دوو بەلا قۆڵم داڕووشاوە.

**بە ئاشکرا** (ئاک. ل)[بە + ئاشکرا] ١ـ بێپەردە، بێ داپۆشین و شاردنەوە، بە عالەمی ئاشکرا. :: مانگا بە دزی کەڵ دەگرێ، بە ئاشکرا دەزێ. (پەند). ٢ـ بێپێچ و پەنا، روون.

**بە ئاشکرایی** (حم.)[بە + ئاشکرایی] بێپەردەیی، بە ئاشکرا. :: بە ئاشکرایی قسەکەت بکە و لە کەس مەترسێ!

**بە ئاگا** (ئان. ل)[بە + ئاگا] ١ـ وەخەبەر، نەخەوتوو، هەستاو لە خەو. ٢ـ هەواڵی مەسەلە یا شتێک زانین، خەبەردار، ئاگادار. **~ بوون:** ١ـ وەخەبەر بوون، هێشتا نەخەوتن. ٢ـ خەبەردار بوون، ئاگادار بوون. **~ بوونەوە:** لە خەو هەستان، وە خەبەر هاتن، بە ئاگا هاتن. **~ کردنەوە:** وەخەبەر هێنانی کەسێک لەخەو، هەستاندن. **~ هاتن:** بڕ: بە ئاگا بوونەوە.

**بەئاڵۆش** (ئان. ل)[بە + ئاڵۆش] حاڵی کەسێک کە ئالۆشی هەیە، ئاڵۆشدار، ئاڵۆشاوی.



**بەبا** (ئان. ل)[بە + با6] حاڵی سەگ، گورگ یا چەقەڵێکی دێڵ کە مەیلی جووت بوونی هەیە. **~ بوون:** هەوا و هەوەسی جووت گرتنی دێڵەی سەگ و گورگ و چەقەڵ. ⁂ ئەگەر دێڵ بەبایە / سەگ دێ لە بەغدایە (پەند).

**بە بازاڕ** (ئان. ل)[بە + بازاڕ] دوکاندارێک کە بازاڕی خۆشە و شمەکەکەی دەفرۆشرێ، بازاڕخۆش. // بێ بازاڕ. **~ بوون:** ١ـ بڕ: بازار هەبوون. ٢ـ شێوە رستەیەکە کڕیار یا ناسیاوی دەکاندار وەک سپاس و ئاواتی فرۆشی زۆر دەریدەبڕێ. ⁂ فەرموو چایەکی بخۆوە! ـ بە بازاڕ بی دەبێ بڕۆم.

**بەبر** (گیانـ.) بڕ: بەور1

**بەبڕ** (ئان. ل)[بە + بڕ] بەحوکم، بەبڕشت. **~ بوون:** بڕشت هەبوون، بەحوکم بوون، بڕ هەبوون.

**بەبڕشت** (ئان. ل)[بە + بڕشت] ١ـ مرۆڤی بەکار و کار لە دەست هاتوو. ٢ـ زەوی بە پیت کە حاسڵی زۆر بدا. & بەبڕ. **~ بوون:** ١ـ حوکم رۆیشتن، بە دەستەڵات بوون، بەبڕ بوون. ٢ـ حاسڵ دانی زۆری زەوی.

**بەبک** (نا. ل)[بەبە + ک][باک] بڕ: بەبە

**بەبلە** (نا. ل)[بەبە + لە][ئەر] بڕ: بەبە

**بەبۆ** (نا.)[؟] گوێزێکە لە یاری سافێن دا دەشکێ و منداڵەکان بۆ چنینەوەی پەلاماری دەدەن و هاوار دەکەن بەبۆیە، بەبۆیە (قامووس ب ٢ ل ١٣٤).

**بەبە** (نا.) منداڵی ساوا، منداڵێک کە هێشتا زمانی نەکردۆتەوە، بەبک، بەبلە، بەبەلە.

**تێبینی:** ئەو وشەیە لە زمانی منداڵانەوە وەرگیراوە. لە زمانی ئینگلیسی دا babe وbaby بەو مانایەیە.

**بە بەخت** (ئان. ل)[بە + بەخت] کەسێک کە شانس و بەختی هەیە. **~ بوون:** شانس هەبوون، بەخت هەبوون، لە سەر بەخت بوون.

**بە بەر** (ئان. ل)[بە + بەر1] دار و درەختی بەردار، داری بە بەر گەیشتوو.

**بە بەران** (ئان. ل)[بە + بەران] حاڵی مەڕێک کە مەیلی جووت بوونی دەگەڵ بەران هەبێ.

**بە بەقا** (ئان. ل)[بە + بەقا] کەسێک

کـە لە سـەر بەڵێنی خـۆیەتی، شـیـاوی باوەڕ و بڕوا، جێ بەقا.

**بەبەڵە**[1] (نا. ل)[بەبە + لە] بڕ: بەبە.

**بەبەڵە**[2] (نا.)[باک] بڕ: بیبیلە

**بە بـەینـەت** (ئـان. ل)[بـە + بـەینـەت] کـەسـێک کـە لە سـەر پـەیمان و بەڵێنی خـۆی بێ، بە بەقـا، بە وەفـا. ∷ ئەمن چ بکەم بۆ قاسیدێکی بە بەینەت و بە بەقا/ بینێرەوە کن چەلەنگێ ئەوێ کاولە دنیایە (پایزە ل ٣٣).

**بەبێ** (پێــشــ.) بڕ: بێ. ∷ بـەبێ تـۆ ناچمە شایی.

**بە بێبـاکی** (ئاک. ل)[بە + بێبـاکی] بێباکانە، بوێرانە. ∷ بە بێباکی دەمێکی هات و داغی کردم و ڕۆیی / دەبێ حاڵی چ بێ بولبـول، بەهـار زۆر پێنەچوو ڕۆیی (وەفایی ل ٢٠٨).

**بەبێزوبۆ** (ئان. ل)[بە + بێز + و + بۆ] حـاڵی کـەسـێک کـە لـە هـەر خـواردنێک بیـانـووبگرێ، کەسێک کە بە قێـز و بێز شت بـخـوا. **~ بوون:** بیــز لە هـەمــوو خـواردنێک کـردن، هـەمـوو شـتـێک بە بێزەوە خواردن.

**بەبێنەبێن** (ئان. ل)[بە + بێن (هێنان) + ئە + بێن (هێنان)] حاڵی شوێنێکی کە هـات و چۆی زۆر لـە ســـەرە و خـــەڵک رووی تێدەکەن، شـوێنی مـیوانگر و هات و چۆ لە سەر، بە بێنەبێنە.

**بەبێنەبێنە** (ئان. ل)[بە + بێن + ئە + بێـن + ئـە] بـڕ: بـەبـێنـەبـێـن. ∷ تـا دێ ئاوەدانتر، تا دیوەخـان بە بێنەبێنەتر، ... بان خــۆشــخــوانیش وەســتــاتر و ... پۆشتەتر دەبوو. (تحفە مظفریە ل ٨)

**بەپانەوە** (ئـاک. ل)[بە + پان + ئـەوە] تێکڕا، هـەمــوو، گـشت. ∷ سـاز بـن بە پانەوە با بڕۆینە دەر. دز مـــاڵەکــەیـان بەپانەوە بردم.

**بـەپشـت** (ئـان. ل)[بـە + پـشـت] ١ـ کـەسـێک کـە لاگـر و پشـتـیـوانـی هـەیە، پشت ئەسـتوور. ٢ـ حـاڵی شـتێکی پاڵ و پشـتی هەبێ و قـایم وەسـتـا بـێ، پتـەو، قــایم. ٣ـ پەڵە دەغـڵــێکی خــۆی لێک دابێتەوە و جێی بەتاڵی تێدا نەبیندرێ.

**بەپشـوو** (ئـان. ل)[بە + پشـوو] کەسی ئارام و لە سـەرەخـۆ کە بە مـەسـەلەیەک زوو دەرهـەڵـنـابێ، پشـوودرێژ. **~ بوون:** لە سەرەخۆ بوون، دەرهەڵنەبوون.

**بەپۆز** (ئان. ل)[بە + پۆز] کەسێک کە پۆز و ئـیـفــادە لـە ســەر خــەڵک لێـدا،



بەدەعـیـە، ترزل، لووت بەرز. ~ **بوون:** ئیفادە لێدان، بە دەعیە بوون.

**بەپەلە** (ئان. ل)[بە + پەلە] کارێک کە پـەلـە و تـونـدی تـێـــــدا هـەبـێ، بـەلـەز، بەتاڵووکـە، بـەپەلـەپەل. ~ **بوون:** پەلە هـەبوون، پەلە کردن، بەتاڵووکە بوون.

**بەپەلەپەل** (ئان. ل)[بە + پەلەپەل] بڕ: بەپەلە. :: بە پـەلەپـەل مــەشــقــەکــانی نووسییەوە و بۆ کایە کردن هەڵاتە دەرێ.

**بەپێ** (ئان. ل)[بە + پێ] کـەسـێک کە لە ڕۆیشـتن و ڕۆیین دا خـێـرایە، قـۆچاغ، بەلەپا، بەلەپێ.

**بەپێچ و پەنا** (ئان. ل)[بە + پێچ و پەنا] حاڵی کـەسـێک کە کار و کردەوە و قسـەی نێو خـۆی بە سانایی نەدرکێنێ و گـرێ و پێـچی تێـبـخـا. :: سـەرڕاست قـسـەی دڵت بڵـێ بۆ هێندە بە پێچ و پەنا قسان دەکەی!

**بەپێچەوانە** (ئان. ل)[بە + پێچەوانە] حاڵی کارێک بە دژی خۆی، چەپەوانە.

**بەپێی فـیلان** (ئاک. ل)[بە + پێ + ی + فیل + ئان] گەلێک زۆر، زۆر و زەوەند. :: خـاتوون ئـەسـتـی مـردووە، پـڵاو گۆشت بە پێی فیلانە (شێخ فەرخ ل ٦٦).

**بەپێـیـەک** (ئاک. ل)[بە + پێ + یەک] زوو، گـورج. :: بە پێـیـەک بچـۆ بازاڕ و کیلۆیەکم گۆشت بۆ بکڕە.

**بەت** (گیانـ.)[عەر: بط] بڕ: مراوی

**بەتارە** (نا.)[؟][ئـەر] فـلـچـەیەک کـە جـۆڵا بۆ ئاهـار و چرێش لێـدان کـەلکی لێوەردەگرێ، فلچە، گزکچە.

**بە تـاق تەنـێ** (ئـان. ل)[بـە + تـاق + تـەنـێ] بێ هاودەم، یـەک تـەنـە، تـەنـیـــا، بەتەنێ.

**بە تاقەت** (ئان. ل)[بە + تاقەت] ١ـ بە هێــز. ٢ـ بـە ســەبـر، بـە حــەوســەلە.// بێتاقەت. ~ **بوون:** ١ـ بە هێز بوون. ٢ـ بە سـەبر و حوسـەلـە بوون. // بێتـاقـەت بوون. ~ **کردن:** بەهێز کردن.

**بەتاڵ** (ئان.)[عــەر: بطـال] ١ـ هـەر شـتێک کە ناوەکەی بۆش بێ و چی تێدا نەبێ. :: تەپڵـی بەتاڵ، گـۆزەی بەتاڵ. ٢ـ چوار دیواری و مـاڵی چـۆڵ کـە کـەسی تێدا نەبێ. :: مـاڵی بەتاڵت پێ شک نایە بەکـــرێی بگرم. ٣ـ هـەر قـــســـە و نوسـراوەیەک ناوەرۆکـی نەبێ. ٤ـ کەسی بێ کــار و بـار. :: بـەتاڵ و بێکار بـۆی دەخولێـتـەوە. ٥ـ کـەسی بێمـێشک و بێ ئـاقڵ، مــێــشـک بەتـاڵ. :: بـەو قــەد و

قەلافەتەی چی دەباران دا نیە و بەتاڵە.
٦ـ هەڵوەشان و باتڵ بوونی نوێژ. & ڤالا.

**~ بوون:** ١ـ بۆش بوون دەفری پڕ، هیچ دە دەفر دا نەمان. ٢ـ چۆڵ بوونی ماڵ و دوکان و شتی لەم بابەتە. ٣ـ بێکار بوون. ٤ـ بێ ئاقڵ بوون، ئاقڵ پێ نەشکان. ٥ـ بێ ناوەڕۆک بوونی قسە و نووسراوە و شتی لەم بابەتە. **~ کردن:** ١ـ رشتنی ئاوەکی دەفر. ٢ـ هەڵرشتن و رۆکردن. ٣ـ چۆڵ کردنی ماڵ و چواردیواری. ٤ـ دەست هەڵگرتن لە کار. :: ئێوارێ کارەکە بەتاڵ دەکەین.

**بەتاڵایی** (حم.)[بەتاڵ + ئایی] چلۆنایەتی هەر شتێکی بەتاڵ، بۆشایی

**بەتاڵ پێ** (نا. ل)[بەتاڵ + پێ1] کەسێک کە لە شوێنێک بێ و بێکار وەستابێ. :: ئەوە بۆ کار بەو کوڕانە ناکەی هەموو بەتاڵ پێ لە سووچی حەسار راوەستاون.

**بەتاڵ و حەتاڵ** (ئان. ل)[عەر: بطال و عطال] ١ـ کەسێک کە هیچ کار و پیشەیەکی نەبێ. ٢ـ حاڵی دەفر هیچی تێدا نەبێ. ٣ـ شوێنی چۆڵ کە کەسی تێدا نەبێ.

**بەتاڵووکە** (ئاک. ل)[بە + تاڵووکە]
بڕ: بەپەلە.

**بەتام** (ئان. ل)[بە + تام] حاڵی هەر خواردەمەنی و چێشتێکی چێژی خۆش بێ. // بێتام.

**بەتانە** (نا.)[عەر: بطانە] ئاردەمشار و چرێشی لێکدراو کە نەجار بۆ گرتنی کەلێن و درزی چێو کەلکی لێوەردەگرێ.

**بەتانی** (نا.)[عەر: بطانیة] بڕ: پەتوو

**بەترپێر** (نا. ل، ئاک. ل)[بەتر + پێر] [باک] بڕ: بەسر پێرێ

**بەترپێرار** (نا. ل، ئاک. ل)[بەتر + پێرار] بڕ: بەسر پێرار

**بەترپێرێ** (نا. ل، ئاک. ل)[بەتر + پێرێ] بڕ: بەسر پێرێ

**بە ترس** (ئان. ل)[بە + ترس] بە سام، سامناک، ترسناک. **~ بوون:** جێی ترس بوون، سامناک بوون. :: ئەو رێگایەی تۆ پێیدا دەڕۆی زۆر بە ترسە.

**بە ترس و لەرز** (ئان. ل)[بە + ترس + و + لەرز] زۆر ترساو، بە ترسەترس. :: بەترس و لەرز دەرگای کردەوە.

**بە ترسەترس** (ئان. ل)[بە + ترس + ئە + ترس] زۆر ترساو، بە ترس و لەرز.

**بەتاڵان** (چا. ل) ١ـ لە کـیس چوونی کـات و وەخت. ٢ـ فـەوتـان و بە فـیـڕۆ چوون.

**تێبینی:** بەتاڵان و بەتاڵاندن لە ـ باطل ـ ی عـەرەبی کـەوتوون، تەحـریف کـراوە و چاوگی لێ ساز کراوە

**بـەتـاڵانـدن** (چـا. م)[لـە: بـەتـاڵان] ١ـ کـوشـتنی کـات و وەخـت، بە فـیـڕۆ دانی کـات. ٢ـ فـەوتـاندن و بە فـێـڕۆ دانی شتێک. ٣ـ کوشتن و فەوتاندنی کەسێک. ∷ ئەمـن و تو مـەسـڵـەحـەتە پـادشـای ببـەتڵێنین، ئەمـەش لێدەین بڕۆین (مـان ل ٩).

**بەتاڵو** (نا. مفـ.)[لە: بـەتاڵان] فـەوتاو، لە کیس چوو، زایە.

**بـەتـوێـکـڵ** (ئـان. ل)[بـە + تـوێـکـڵ] قـسـەیەک کـە جگە لە مـانای رواڵەتی مانای دیکەشی لێ بێتەوە.

**بەتۆیز** (ئان. ل)[بە + تۆیز] بە زۆر،بە زۆری. ∷ فێرگـەی پێخۆش نەبوو بە تۆیز بردیانە دەرس خـوێندن. بـە تۆیز فـێـرم کرد.

**بەتەگە** (ئان. ل)[بە + تەگە] بزنێک کە مەیلی جووت بوونی دەگەڵ نێری هەیە.

**بەتەڵەب** (ئان. ل)[بە + تـەڵەب (عـەر: طلب)] بڕ: بەفاڵ

**بەتەمـــا** (ئـان. ل)[بـە + تەمـــا] ١ـ چاوەنواڕ، بەهـەویا، هـیــــوادار. ∷ بە تەمـای من مـەبن نایـەم. هەتا مـردن هەر بە تەمـاتم. ٢ـ داواکـار، داخـواز، ویسـتن. ∷ بە تـەمـــام دوکـــانێک بـکـڕم. بـەتـەمـــام ئەوساڵ دەرسـەکانم بـاش بخـوێنم. ~ **بوون:** ١ـ چاوەڕوان بوون. ٢ـ ویسـتن، لە فکر دابـوون، پێــوە بـوون. ∷ بـەتـەمـــام ســــەرێکی نـەنکم بـدەم. ~ **کــــردن:** هیوادار کردن، چاوەڕوان هێشتنەوە.

**بەتەمـــاح** (ئـان. ل)[بە + تـەمـــاح] کەسێک کە تەماحی پڕ نابێ، چاونەزێر، تەمـاحکار. ~ **بوون:** تەمـاح هەبوون، تەماحکار بوون، تەماح پڕ نەبوون.

**بەتەمـــەن** (ئـان. ل)[بە + تـەمـــەن] کـەسـێک کە تەمـەنی بەرەو سـەر چووبێ. ~ **بوون:** تەمـەندار بوون، عـومـر زۆر بوون.

**بەتەنێ** (ئان. ل)[بە + تەنێ] ١ـ تەنیا، یەک تـەنـە، بـەتـاق تـەنـێ. ٢ـ ســــەڵەت، رەبەن. ٣ـ بـێ کـەس و کـار. ~ **بوون:** تەنیـا بـوون، کـەس دەگـەڵ نەبوون. ~ **مـانەوە:** تەنیـا مـانەوە، بێکەس بوون، بێ

هاودەم و دۆست بوون.

**بەتیسک** (ئان. ل)[بە + تیسک] بڕ: تیسکن

**بەتین** (ئان. ل)[بە + تین] ١ـ حاڵی هەر شتێک کە گەرمای زۆر بێ. ٢ـ (مجـ.) هەستی زۆر. **~ بوون:** ١ـ گەرم و گوڕی هەبوون. ٢ـ (مجـ.) زۆر بە هەست بوون.

**بە تێڕادیویی** (حم.)[بە + تێڕادیو (تێڕادیتن) + ئیی] تێڕادیتن، ئەنجام دانی کارێک بە دڵنیاییەکی تەواوەوە. :: بە تێڕادیویی هات و داوای پارەی لێکردم.

**بەجا** (ئان. ل)[بە + جا] بڕ: بەجێ

**بەجەرگ** (ئان. ل)[بە + جەرگ] مرۆی ئازا و نەترس، بەدڵ، بە غیرەت، جگەردار. **~ بوون:** بەغیرەت بوون، نەترسان.

**بەجەوهەر** (ئان. ل)[بە + جەوهەر] ١ـ بە غیرەت، نەترس. ٢ـ بە هونەر، هونەرمەند. **~ بوون:** ١ـ بەغیرەت بوون، نەترسان. ٢ـ هونەر و سەنعەتێک زانین.

**بەجاریێ** (ئاک. ل)[بە + جار + ئێ]

بڕ: بەجارێک

**بەجارێک** (ئاک. ل)[بە + جار + ئێک] بە یەکجاریی، بۆ هەمیشە، بە تەواویی، هەتا ئەبەد. :: رادیۆکەمان لەپڕ بێدەنگ بوو و بەجارێک لە کار کەوت.

**بەجێ** (ئان. ل)[بە + جێ] ١ـ کارێکی رێکوپێک و شیاو. ٢ـ (ئاک. ل) لە جێی، لە بری، لەبات. :: ئیمرۆ بە جێی باوکم من ئیش دەکەم. **~ بوون:** جێی خۆ بوون، کار و کردەوەیەکی رێک و پێک بوون. :: کۆششی من زۆر بە جێیە و زۆر رەوا/ چونکە قانوونی تەبیعەت وایە، وا (ناڵەی جودایی ل ٢٢).

**بەچ** (نا.) ١ـ بڕ: بێچوو. ٢ـ بێچووی کەروێشک.

**بەچاوە** (نا. ل)[بە + چاو + ئە] بڕشت و بڕی چاوی پیس، چاڤنی. **~ بوون:** کەسێک کە چاوی پیس کاری لێکردوە و تووشی کەند و کۆسپ، نەخۆشی، بەدشانسی و ئازار هاتوە، بە چاوەوە بوون، چاڤنی بوون. **~وە بوون:** بڕ: بەچاوە بوون. **~ کردن:** بە چاوی پیس روانینە کەسێک و تووشی بەدشانسی و نەخۆشی کردن.

**بەچک** (نا. ل)[بەچ + ک][پەه:

بەچەک] بڕ: بێچوو

**بەچکە** (نا. ل)[بەچ + کە] ١ـ بڕ: بێچوو. :: بەچکەشێر، بەچکەگورگ. ٢ـ بڕ: بەچە/٢

**بەچگە** (نا. ل)[بەچ + گە][باش] بڕ: بێچوو.

**بەچوارچاوان** (ئاک. ل)[بە + چوار + چاو + ئان] بە وردیی، بە هەموو توانای چاوەوە. :: پێشمەرگە لە کاتی ئێشک گرتن دا دەبێ بە چوارچاوانی بڕوانێ.

**بەچوو** (نا. ل)[بەچ + ئوو] بڕ: بێچوو

**بەچووڵە** (نا. ل)[بەچ + ئووڵە] بڕ: بێچووله

**بەچە** (نا. ل)[بەچ + ئە] ١ـ [هەو] بڕ: بێچوو. ٢ـ منداڵی کوڕ کە پیاو بۆ کاری جنسی دۆستـایەتی دەگەڵ پێک دێنێ، لووسکە، بەچکە، بەچچە.

**بەچەباز** (نا. فا، ئان. فا)[بەچە + باز4] پیاوی نێرینەباز و تەبیعەت سارد کە بە منداڵی نێرینە فێرە، مناڵباز، منداڵباز، هەتیوباز، لووسکەباز، هەتیوگێ، کوڕگێ.

**بەچەبازیی** (حم.)[بەچەباز + ئیی] کار و کردەوەی کەسی بەچەباز، هەتیوبازیی.

**بەچەخۆرە** (نا. ل، ئان. فا)[بەچە + خۆر2 + ئە] ١ـ گۆشتی زێدەی نێو پزدان و منداڵدانی ژن کە هەندێک جار دەبێتە هۆی سەرەتانی منداڵدان. ٢ـ کرم یا گیاندارێک کە خەڵک پێیان وایە دە نێو زگی هەندێک کەس دا هەیە کە زۆر دەخۆن و تێر و قەڵەو نابن .

**بەچەدان** (نا. ل)[بەچە + دان4] بڕ: پزدان/١.

**بەچەک** (ئان. ل)[بە + چەک] کەسێک کە چەکی پێبێ، چەکدار.

**بەحاڵ** (ئاک. ل)[بە + حاڵ] ١ـ بە زەحمەت، بەزۆری، سەخت. :: بەحاڵ رازیم کرد بچێتە شایی. ٢ـ زۆر کەمتر لە حاڵەتی ئاسایی، کەمێک، نەختێک، بە ئاستەم.

**بەحاڵەحاڵ** (ئاک. ل)[بە + حاڵ + ئە + حاڵ] زۆر بە زەحمەت، زۆر بە سەختی. :: بەحاڵەحاڵ نانی شەوێم پەیدا دەکەم.

**بەحر** (نا.)[عەر: بحر] دەریا، زەریا. :: لەم بەحری فیتنە بەڵکی نەجاتت بدا خودا / داوێنی باخودا بگرە، بەردە ناخودا (مەحوی ل ٣).

**بەحریلکە** (گیانـ.)[بەحر + ئیلکە] جۆرێک مراوی چووکە.

٣٨ سانتیمێترە. نەختێک لە جورە گەورەترە، هەروەها ملی درێژ و سەریشی گەورەترە. پەروباڵی قاوەیی خاڵخاڵە، سەر برۆی رەشە. سەری باڵی سپییە. نێرە تووکی پاش ملی کەمێک درێژە و شێوەی کاکۆڵ دەدا. ئەودەمەی کە بارە بەرزگی زەردە و دوو خاڵی سپی لە سەر باڵە. زۆرتر بە جووت دەبینرێن. جاری وایە زستانان بە گەل دەگەڕێن. زۆرتر خۆ لەبەر چاو نەدیو دەکا. لە کەنار ئاوی شیرن لە شوێنی پڕ گیاوگۆڵ دەژی و هێلانەی ساز دەکا (فەرهەنگی باڵندە ل ١٦١)، Anas an-gustirotris ناوی لاتینی ئەم مەلەیە، مراوی سپیلکە، مراوی سابوونی.

**بەحوکم** (ئان. ل)[بە + حوکم] ١ـ بە دەستەڵات، بەبڕشت. ٢ـ بە هێز، قەوە. ~ **بوون:** ١ـ بەدەستەڵات بوون، حوکم رۆیشتن، بەبڕ بوون. ٢ـ بەهێز بوونی چاو. ؛؛ ماشەڵڵا چاوێکی زۆر بە حوکمی هەیە.

**بەحەشت** (نا.) بڕ: بەهەشت

**بەحەیا** (ئان. ل)[بە + حەیا] مرۆی بە ئەدەب و شەرمن. // بێحەیا. ~ **بوون:** خاوەن شەرم و حەیا بوون.

**بەحەوسەلە** (ئان. ل)[بە + حەوسەلە] ئارام، لەسەرەخۆ. ~ **بوون:** لەسەرەخۆ بوون، تاقەت هەبوون. ؛؛ سەعید کوتی: ئاغام دەبێ زۆر بەحەوسەلە بێ لەو دونیایە / خودا دونیای وا داناوە، هەزار چاک و خراپی تێدایە (سەعید و میرسێوەدین ل ١٠٩)

**بەخت** (نا.)[ئەو: بەختە ـ پەه: بەخت. باک: بەخت ـ ناو: بەخت ـ باش: بەخت ـ هەو: بەخت ـ زا: بەخت] ١ـ هێزێکی نادیار کە مرۆڤ لە کۆنەوە بڕوای پێی هەبوە و هات و نەهاتی لەوەوە دەزانێ، شانس، چارە، ئیقباڵ. ٢ـ فیدا ٣ـ فێڕۆ. ~ **بە ~ی سوێنە بوون:** (کنـ.) بەختەوەر و سەخی و خۆشەویست بوون. **تێبینی:** سوێنە تەشتی گڵێنەی جل تێدا شوشتنە و بەرەبەرە جلی چڵکنی لە دەورە کۆ دەبێتەوە و هەموو چاو لە دەستی سوێنەن کە تێیدا بشۆرێن و خاوێن بنەوە. ~ **بەتاقی کردنەوە:** بڕ: بەخت گرتنەوە. ~ **بەستران:** کچێک کە خوازبێنی نەبێ. ~ **سووتان:** بەختەوەر نەبوون، بەدبەخت بوون. ~ **کرانەوە:** ١ـ بەخت هەستان، پەیدا بوونی

بەخت. ٢ـ خوازبێنی پەیدا بوون بۆ کچ. ~ **کردن:** ١ـ بەخشینی گیان لە سەر ڕێباز و بیر و بڕوایەک، گیان بەخت کردن، سەر بەخت کردن. ፡፡ لە ڕێی ئەو دا بەخت کەم گەر ژیانم / بە سەربەرزی و بە شانازی دەزانم (نالەی جودایی ل ٦٤). ٢ـ بەخشێن و بڵا کردن و بە فیڕو دانی ماڵ و حاڵ. ፡፡ میراتی بابی بە ساڵێک بەخت کرد. ~ **گرتنەوە:** تاقی کردنەوەی بەخت و چارە بە کەرەسەی جۆربەجۆر (وەک فاڵ، چلدانە، تەسبێح هاویشتن، پەڕی قومار، دەنکەشەمچە و ...) بۆ دەرکەوتنی هات و نەهات، بەخت بەتاقی کردنەوە. ~ **نوستن:** بۆ نەهاتن، شانس نەبوون. ፡፡ زاهیرا بەیتم لە نالی و کوردی زۆر کەمتر نیە/ تالعم بەرگەشتەیە، بەدبەختە بەختم نوستووە (حاجی قادر ل ١٣٠). هەرچی ماڵ دێنم و دەیفرۆشم چ قازانجێ ناکەم وا دیارە بەختم نوستوە. ~ **وەرگەڕان:** گۆڕانی بەخت و شانسی کەسێک، بەرەوە خراپە چوونی بەخت. ~ **وەک سەگ وەڕین:** (کنـ.) زۆر بە شانس و بەخت بوونی غەنیم و لە هەر کارێک دا شانس هێنان و سەرکەوتن. ~ **هەبوون:** بە شانس بوون، خاوەن بەخت بوون. ፡፡ ئەگەر بەختت هەبێ لە هیچ پووڵت بۆ دەبارێ. ~ **هەستان:** ١ـ بە بەخت بوون، شانس پەیدا کردن، بۆ هاتن.// بەخت نوستن. ፡፡ ئەوڕۆ وادیارە بەختم هەستاوە و خۆش خۆش دەیبەمەوە! ٢ـ خوازبێنی پەیدا بوون بۆ کچ.// بەخت بەستران. **خۆ ~ کردن:** مردن لە پێناو مەبەستێک دا. **خۆ خستنە بەر ~ ی کەسێک:** پەنابردن بۆ بەختی کەسێکی دیکە، کەسێک کە خۆی بەختی نیە ፡፡ ئەی لامیسە! ئەگەرچی نەبوو دەنگ و ڕەنگ و بۆ / وەک شێت بە عەقڵی خامەوە خۆم خستە بەختی تۆ (گۆران ل ١٤). خۆم دەخەمە بەر بەختی تۆ بەشکەم ئەوجار شانس بێنم. **لە سەر ~ بوون:** بە بەخت بوون، بەخت هەستان. || **بەختی بێدار:** شانس و بەخت، بەختێک کە دەگەڵ خاوەنەکەی بێ. // بەختی نوستوو. ፡፡ شەوچرایەک بوو لە ڕۆژی ڕەشما/ بەختی بێدار بوو لە ناو باوەشما (بۆ کوردستان ل ١٤٢). **بەختی خەواڵوو:** شانس و بەختێک کە بە ئاگا نەبێ، بەختێک کە دەگەڵ خاوەنەکەی نەبێ، بەختی نوستوو. ፡፡ جەماڵی رابیتەی وا دڵبەرە، بەختی خەواڵووشم/ بە ئوممێدی تەماشایەک

هەمیشە چاوی بێدارە (مەحوی ل ٤٦٧) گوتم بە بەختی خەواڵوو بەسە ئەتوو بی خودا/ لە خەو هەڵستە زەمانێ بچینەوە ئەو لا (حاجی قادر ل ٣١). **بەختی رەش:** شانس و بەختی خراپ، بەختی سیا. ⁝⁝ بەختی رەش حەوجە بە هەش ناکا (پەند ل ١٠٥). گێژی لە خەیالات و گلەی بەختی رەشت/ رابوێرە هەتا بە جارێ نەبڕاوە بەشت (خەییام ل ٦). **بەختی سپی:** شانس و بەختی باش. **بەختی سیا:** بڕ: بەختی رەش. ⁝⁝ گا دەسووتێم گا دەگریەم، غەرقی ئاو و ئاورم / ئاخ لەبەر بەختی سیا، نازانم ئەز بۆچ نامرم (وەفایی ل ٥٩). **بەختی کەچ:** بەختێک کە دەگەڵت نەبێ، بەختی خراپ، بەختی رەش. ⁝⁝ گەلێ قسەم لە دڵا بوو، حیکایەتم مابوو/ کەچی لە بەختی کەچم خامە نووکی لێرە شکا (حاجی قادر ل ٣٧). **بەختی نوستوو:** بڕ. بەختی خەواڵوو.

**تێبینی:** بەخت لە ریشەی بەگ bag ـ ی ئەویستایی و بەخشین و بەشینەوەی کوردیی کەوتوە بە مانای بەش دراو، بەش پێبڕاو ئەوەی کە بەشی تۆیە.

**بەختدار** (ئان. فا)[بەخت + دار] کەسی خاوەن بەخت، بەبەخت، خۆش شانس، بەختیار.

**بەخت رەش** (ئان. ل)[بەخت + رەش] ١ـ کەسێک کە بەختی باش نیە و خراپی بۆ دێ، چارەڕەش. ٢ـ ژنێک کە لای مێردەکەی بەختەوەر نەبێ.

**بەخت و هات** (نا. ل)[بەخت + و + هات] شانس و بەخت، بەخت. ⁝⁝ هەتا کەنگێ دەدەی تۆ بەخت و هاتی/ دەزانی چەند درە نەحلەت لە زاتی (ناڵەی جودایی ل ٨٦).

**بەختە** (نا.)[سان: بەستە ـ تەب: بەختە ـ فار: بەختە] ١ـ بەران. ٢ـ بەرانی خەسێنراو. ٣ـ دابەستە، پەراوز.

**تێبینی:** لە زمانی تەبەری دا بەختە baxta بە مانای خەسێنراو هاتوە و لە فارسی دا بە مانای بەرخەنێری سێ یا چوار ساڵە (بڕ: موعین ب ١ ل ٤٧٦) و لە راوێژی کرمانی دا بە مانای یەختە هاتوە (فرهنگ گویش کرمانی ل ٤٢) وهەروەتر لە سانسکریت دا بەستە basta بە مانای بەران هاتوە.

**بەختەباران** (نا. ل)[بەخت + ئە + باران] سێهەم مانگی بەهارکە بارینی باران بە بەختە. بڕ: جۆزەردان. ⁝⁝ بزەی دەرمانی دەردی دەردەداران/ وشەی

وەک بەختەبارانی بەهاران (ناڵەی جودایی ل ٥٥)

**بەختەبەران** (نا. ل)[بەختە + بەران] بەرخەنێرێک کە خاوەنەکەی بۆ بەران هەڵیدەبژێرێ.

**بەختەڵباران** (نا. ل)[بەخت + ئەڵ + باران] بڕ: بەختەباران

**بەختەوار** (ئان. ل)[بەخت + ئە + وار] ١ـ بەختەوەر، بەختیار، خۆشبەخت. ∷ دەیانگوت: ڕۆڵە قۆچ عوسمانە بەختەوارە / بۆچیت هەیە هێندە گریان و هاوارە (مان ل ٢١٦). ٢ـ [باک] بەڵێن ڕاست، خاوەن ویژدان، بەویژدان.

**بەختەوەر** (ئان. ل)[بەخت + ئە + وەر] خاوەن بەخت، بەبەخت، بەختدار، بەختیار، خۆشبەخت. **~ بوون:** خۆشبەخت بوون، پێگەیشتن بە خۆشییەوە، ڕازی بوون لە ژیان، بەختیار بوون. **~ کردن:** خۆشبەخت کردن، بەختیار کردن. **بەختەوەری دنیا و قیامەت بوون:** (دوعا) هەمیشە بەختەوەر بوون هەم لەم دنیایە و هەمیش لە دنیای دیکە.

**بەختەوەریی** (حم.)[بەختەوەر + ئیی] خۆشبەختیی، بەختیاریی.

**بەختیار** (ئان. ل)[بەخت + یار] ١ـ کەسێک کە بەخت دەگەڵییەتی، خاوەن بەخت، خۆشبەخت، بەختەوەر ٢ـ ناوە بۆ نێرینە. **~ بوون:** بڕ: بەختەوەر بوون. **~ کردن:** بڕ: بەختەوەر کردن.

**بەختیاریی** (حم.)[بەختیار + ئی] بڕ: بەختەوەریی

**بەخشین** (چا. م)[هیک: بهەگ ـ ئەو: بەگ ـ پەه: بەخشیتەن] ١ـ لە گوناه و تاوان خۆش بوون، لێبووردن، غەفوو کردن، بووردن، لێخۆش بوون. ٢ـ ماڵ یا شتێک بە بێ پارە و بە خۆڕایی دان بە کەسێک، پێ بەخشین.

**بەخشینەوە** (چا. م)[بەخشین + ئەوە] بڕ: بەشینەوە

**بەخوڕ** (ئان. ل)[بە + خوڕ] حاڵی ڕووبار و جۆگە و هەر ئاوەکییەکی تەوژمی زۆر بێ، خوڕێن، بە تەوژم. ∷ لە چاوم دێ بەخوڕ فرمێسکی خوێنین / کەچی ئەم گۆمە خوێنە هەڵنەچۆڕا (تاریک و ڕوون ل ١٢١).

**بەخۆوە** (ئان. ل)[بە + خۆ + وە] مرۆڤی کەڵەگەت و پڕ. **~ بوون:** کەڵەگەت و پڕ بوون.

**بە خەبەر** (ئان. ل)[بە + خەبەر] ١ـ کەسێکی کە لە خەو هەستاو یا لە جێی

دایە و هێشتا خەوی لێ نەکەوتوە، وە خەبەر، بەئاگا، خەوەر، بێدار، هشیار، شیار، بیار. ٢ـ ئاگادار. **~ بوون:** ١ـ لە خەو هەستان یا هێشتا نەنوستن، وەخەبەر بوون. ٢ـ بڕ: ئاگادار بوون. **~ بوونەوە:** ١ـ لە خەو هەستان و چاو کردنەوە، خەبەر بوونەوە. ٢ـ وەخۆ هاتنەوە، وریا بوونەوە. **~ هێنان:** کەسێک لە خەو هەستاندن، وەخەبەر هێنان.

**بەخەڵ** (نا.)[ئەر] بڕ: باغەڵ

**بەخەڵە** (نا.)[هەو] بڕ: باغەڵ

**بەد** (ئان.)[پەه: ڤەت] ١ـ هەر شتێک یا کەسێک کە باش نەبێ، خراپ. ٢ـ ناحەز، کرێت. ⁘ بەدزات، بەدخەت. ٣ـ مرۆڤی خراپ و شەڕانی. ٤ـ دەچێتە سەر گەلێک وشە و ئاوەڵناویان لێ ساز دەکا. **~ بوون:** ١ـ باش نەبوون، خراپ بوون. ⁘ بەد نەبێ بەدخانە بە یاد ناکا (پەند). ٢ـ شەڕانی بوون، مەیل لە خراپە هەبوون. **~ هاتنە ڕێ:** تووشی بەدیی بوون، خراپە هاتنە سەر ڕێ، تووشی کێشە و ناخۆشیی بوون. **~ هێنان:** تووشی خراپە و ناخۆشی هاتن، شانسی خراپ هێنان، خراپ بۆ هاتن.

**بەداخەوە** (شر. ئاک)[بە + داخ + ئەوە] کار و مەسەلەیەک کە شیاوی داخ و خەفەت بێ، جێی داخ بوون. ⁘ بەداخەوە ناتوانم کارەکەت جێبەجێ کەم! زۆر بەداخەوەم.

**بەداو و دڵ** (ئان. ل)[بە + داو + و + دڵ] بە مەیل و هۆگرییەکی یەکجار زۆرەوە، بەدڵ و بە گیان. ⁘ بە داو و دڵ بادەوەیەکم ساز کرد کەچی باوکم لێی دڕاندم.

**بەدبەخت** (ئان. ل)[بەد + بەخت] کەسێک کە بەختی باش نیە، چارەڕەش، بەدشانس، بەوبەخت. **~ بوون:** تووشی نەکبەتی و چارەرەشی بوون، بێچارە بوون. **~ کردن:** کەسێک تووشی چارەرەشی و نەگبەتی کردن، چارەڕەش کردن.

**بەدبەختانە** (ئاک. ل)[بەدبەخت + ئانە2] بە بەدبەختییەوە، بە داخێکی زۆرەوە. ⁘ بەدبەختانە منداڵی ئێستاکە باش دەرس ناخوێنن.

**بەدبەختیی** (حم.)[بەدبەخت + ئیی] ١ـ ئاکام و ئەنجامی بەدبەخت، چارەڕەشیی. ٢ـ کوێرەوەریی، چەرمەسەریی، زەحمەت. ⁘ ئەو بێوەژنە

بە بەدبەختیی ئەو منداڵانەی گەورە کرد. بە بەدبەختییەکی زۆر ئەم کتێبانەم دەست کەوت. ~ **روو تێکردن:** تووشی بەدبەختیی و چارەڕەشیی بوون.

**بەدبین** (ئان. ل)[بەد + بین] کەسێک کە هیوای نەماوە و ئاکامی هەموو شتێک بە خراپ دەبینێ، رەشبین. ~ **بوون:** ئاکامی هەموو شتێک بە خراپ دیتن، رەشبین بوون. ~ **کردن:** کەسێک فێرە بەدبینی کردن، رەشبین کردن.

**بەدبینیی** (حم.)[بەدبین + ئیی] ئاکامی بەدبین بوون، رەشبینیی.

**بەدبێژ** (ئان. ل)[بەد + بێژ] بڕ: بەدگۆ

**بەدبێژیی** (حم.)[بەدبێژ + ئیی] بڕ: بەدگۆیی

**بەدپەسند** (ئان. ل)[بەد + پەسند] ١ـ کەسێک کە بە سانایی شتێکی وە بەر دڵ نایە. ٢ـ کەسێک کە پەسەندی باش نییە و شتی خراپ دەکڕێ یا هەڵدەبژێرێ. & بەدپەسەن

**بەدپەسەن** (ئان. ل)[بەد + پەسەن] [ئەر] بڕ: بەدپەسند

**بەدتوخم** (ئان. ل)[بەد + توخم] بڕ: بەدڕەسەن

**بەدجسن** (ئان. ل)[بەد + جسن] [موک] بڕ: بەدجنس.

**بەدجسنیی** (حم.)[بەدجسن + ئیی] بڕ: بەدجسنیی

**بەدجنس** (ئان. ل)[بەد + جنس] کەسێک کە رەسەن و رەگەزی خراپ بێ، بەدجسن، بەدزات، بەدڕەسەن.

**بەدجنسیی** (حم.)[بەدجسن + ئیی] کردەوە و رەفتاری کەسی بەدجنس، بەدزات بوون، بەدجسنیی، بەدڕەسەنیی.

**بەدچارە** (ئان. ل)[بەد + چارە] مرۆی ناحەز و ناشیرین، خوێنتاڵ، بەدچێرە، ناشیرین، بەددیمەن، بەدسەکوت.

**بەدچێرە** (ئان. ل)[بەد + چێرە][ئەر] بڕ: بەدچارە

**بەدحاڵ** (ئان. ل)[بەد + حاڵ] ١ـ کەسێک کە حاڵ و ژیانی باش نەبێ. ٢ـ کەسێک کە کەیفی ساز نەبێ، حاڵ ناخۆش. ~ **بوون:** ١ـ ژیانی خراپ هەبوون، حاڵ شڕ بوون. ٢ـ بێکەیف بوون، کەیف ساز نەبوون.

**بەدحاڵیی** (حم.)[بەدحاڵ + ئیی] ١ـ ژیان ناخۆشیی. ٢ـ کەیف ناسازیی، بێکەیفیی.



**بەدحیساب** (ئان. ل)[بەد + حیساب] ١ـ کەسێک کە لە سەودا و مامڵە دا سەر ڕاست نەبێ . ٢ـ کەسێک کە قەرزی خەڵک درەنگ و بە زۆرە دەداتەوە، قەرزکوێر. ~ **بوون:** ١ـ لە سەودا و مەعاملە دا ڕاست و پاک نەبوون. ٢ـ قەرز بە زۆر دانەوە، قەرزکوێر بوون.

**بەدحیسابیی** (حم.)[بەد حیساب + ئیی] ئاکار و کردەوەی بەدحیساب، قەرزکوێریی.

**بەدخانە** (نا. ل)[بەد + خانە] شوێنی کاری خراپ کردن، قەحپەخانە، جندەخانە. ⁘ بەد نەبێ بەدخانە بە یاد ناکا (پەند).

**بەدخوا** (نا. فا)[بەد + خوا4] بڕ: بەدخواز. ~ **بوون:** بڕ: بەدخواز بوون.

**بەدخوایی** (حم.)[بەدخوا + ئی] بڕ: بەدخوازیی

**بەدخواز** (نا. فا)[بەد + خواز] کەسێک کە خراپەی خەڵکی دەوێ، بەدخوا، بەدواز. ~ **بوون:** داواکار و خوازیاری خراپە بۆ خەڵک بوون، بەدخوا بوون.

**بەدخوازیی** (حم.)[بەدخواز + ئیی] ویستی بەدخواز، بەدخوایی.

**بەدخوو** (ئان. ل)[بەد + خوو] ١ـ کەسی ئاکار خراپ. ٢ـ کەسێک کە فێرە خراپە بوە. ~ **بوون:** ١ـ ئاکار خراپ و بەد ڕەوشت بوون. ٢ـ گۆڕانی خوو و کردار لە چاکەوە بۆ خراپە. ~ **کردن:** خراپ کردنی خوو و ڕەفتاری کەسێک.

**بەدخوویی** (حم.)[بەدخوو + ئیی] ئاکار و کردەوەی کەسی بەدخوو.

**بەدخەت** (ئان. ل)[بەد + خەت] کەسێک کە خەتی نووسینی جوان و ڕێک و پێک نەبێ، خەت ناخۆش.

**بەددڵ** (ئان. ل)[بەد + دڵ] کەسێک کە دەگەڵ خەڵک دڵی باش نەبێ، بەدخواز.

**بەددڵیی** (حم.)[بەددڵ + ئیی] ویستی بەددڵ، بەدخوازیی.

**بەددیمەن** (ئان. ل)[بەد + دیمەن] بڕ: بەدچارە

**بەدر** (نا.)[عەر: بدر] مانگی شەوی چاردە. ⁘ ئەرێ ئەی بەدری ئاسمانی جەمال / هیچ دەزانی چلۆنە حاڵی من (تاریک و ڕوون ل ٢١٩).

**بەدرکێف** (ئان. ل)[بەد + رکێف] حاڵی ئەسپێک کە جوان سواری نەدا.

**بەدرەقە** (نا.)[عەر: بدرقة] ڕوانە،

بەڕێ. **~ کــردن:** بەڕێ کــردن، ڕوانــە کردن.

**تێبینی:** هەژار لە هەنبانە بۆرینە دا نووســیــویەتی: ئەم وشــەیە لە ڕەســەن دا «پادراهـە »یە، واتا پاســــداری ڕێگە، عارەب بەو دەردەی بردوە (بڕ: هەنبانە ب ١ ل ٦٨) ئـەو بـۆچـوونـەیـە نـازانم هـی خـــۆیەتی یا لـە شـــوێـنێکی دیکە خـواســـتـوویەتیـیــەوە. پادراهـە دەبێ وشەیەکی پەهلەویی بێ و وەها وشەیەکم لـە هـیـچ فـــەرهـەنگێکی پـەهـلـەویی دا نەدیتەوە بەڵام وشــەی پەتراه [پەت (پێ، پێکەوە) + راهە(ڕێ)] هـەیە کە مـانای لە ڕێ دا، لە سەفەر دا، دەدا.

**بەدرەمــە** (نا.)[؟] جــۆرێک مــێش هەنگوینی کێوییە، درێژتر و باریکتر لە هەنگی خـۆمـاڵـیـە، لە قـەڵشت و درزی ڕەوەزان دا شـانـەی دەکا، هەنگوینەکەی باشــتـر و خـۆشـتـرە و پێـیـدەکـوترێ شەمەتلێرکە یا شەمەترێلکە.

**بەدڕا** (ئان. ل)[بەد + ڕا] کەسێک کە بیــر و باوەڕی باشـی نەبێ و ڕێگەیەکی خراپی هەڵبژاردبێ.

**بەدڕایی** (حم.)[بەدڕا + ئی] ئاکـار و کردەوەی بەدڕا.

**بەدڕەســەن** (ئان. ل)[بەد + ڕەســەن] مـرۆڤ یا گیـاندارێکی ڕەگەز و ئەسـڵی بـاش نـەبێ، بـەدجــــســن، بەدجـنس، نارەسەن، نانەجیب، بەدتوخم.

**بەدڕەســەنیی** (حم.)[بەدڕەســەن + ئیی] کـار و کردەوەی کـەسی نارەســەن، نانەجیبیی، بەدجسنیی، بەدجنسیی.

**بەدڕەفـتـار** (ئان. ل)[بەد + ڕەفـتـار] کەسـێک کە جـووڵانەوە و هەڵسوکەوتی دەگــەڵ خـــەڵک باش نەبێ. **~ بوون:** باش نەجووڵانەوە دەگەڵ خەڵک.

**بەدڕەفـتـاریی** (حم.)[بەدڕەفـتـار + ئیی] ئاکار و کردەوەی بەدڕەفتار. **~ کردن:** خـراپ دەگـەڵ خـەڵک جـووڵانەوە، بەدڕەفتار بوون دەگەڵ خەڵک.

**بەدڕەنگ** (ئان. ل)[بەد + ڕەنگ] هەر شتێکی لە باری ڕەنگەوە جوان و پەسەند نەبێ.

**بەدزات** (ئان. ل)[بەد + زات] کەسێک کــــە زات و دەروونی خـــــراپ بێ، بەدڕەسەن، بەدجنس.

**بەدزاتی** (حم.)[بەدزات + ئی] بەدزات بوون، کــــردەوەی کــــەسی بەدزات، ناجسنیی، بەدڕەسەنیی.

**بەدزمـــــان** (ئان. ل)[بەد + زمـــان] کـەسـێک کـە قسـەی باشی بە زمـان دا نـایە و جنێـــوان دەدا، زمـــان پیس، بـەدزوان، زوان تـاڵ، جـــوێن فـــرۆش، جنێـوفـرۆش. ~ **بوون:** جنێـو دان، زمانپیس بوون.

**بەدزمـانیی** (حم.)[بەدزمـان + ئیی] زمانپیس بوون، کـار و کردەوەی کـەسی بـەدزمـــان، بـەدزوانیی، زمـــانتـــاڵیی، جنێوفـرۆشـیی. ~ **کـردن:** بەدزمـان بوون، جنێودان.

**بـە دزەدزە** (ئـاک. ل)[بـە + دز + ئـە + دز + ئـە] بـە نـهـــێنی، بە پێـــدزە، بە ئەسپـایی. ■ بە دزەدزە و سـەت واوەیلا / پیـــاو نـازانێ چلۆن پـارێزێک ببـــا (سەعید و میرسێوەدین ل ٦١)

**بـەدزوان** (ئـان. ل)[بـەد + زوان] بـڕ: بەدزمان.

**بـە دزیی** (ئـاک. ل)[بـە + دزیی] بـە نهـێنی، شــاراوە. ■ بەدزی ژنیـان بۆ کـوڕەکـەیان هێنا. بەدزی دایک و بابم سیگار دەکێشم.

**بەدسـەکوت** (ئان. ل)[بەد + سـەکوت] بڕ: بەدچارە

**بـەدشـکـڵ** (ئـان. ل)[بـەد + شـکـڵ] کەسێک کە نموود و بیچمی جوان نەبێ، بەدقـــەوارە. ~ **بوون:** بڕ: بـەدقـــەوارە بوون.

**بەدشوم** (ئان. ل)[بەد + شوم] شـووم، نەکبـەتی و بەدبەخـتـیی، شـووم خـراپ، نەحس. ~ **بوون:** شـووم خـراپ بوون، نـەحس بوون. ■ ئـەوانـە بـەدشـــــومـن سیامەند گیان، ئەتۆ مەچۆوە راوی ئەوان بەدفەڕانە (گەنج ل ٣٤٠).

**بەدعەمەڵ** (ئان. ل)[بەد + عەمەل] ١ـ کـەسـێک کـە لـە باری داب و نەرێتـەوە خراپ دەجووڵێتەوە، کەسێک کە خراپ تەربیەت کراوە و ئاکار و کردەوەی باش نیـە.، بەدکـردار، بەدکـار. ~ **بوون:** ئاکار و کردەوە خراپ بوون، بێتـەربیـەت بوون. ~ **کـردن:** خـراپ بار هـێنان، بێتەربیەت کردن.

**بەدعەمەڵیی** (حم.)[بەدعەمەل + ئیی] کار و کردەوەی کەسی بەدعەمەل.

**بەدفــــەڕ** (ئان. ل)[بەد + فـــەڕ] ١ـ کەسێکی بە قسـە و کردەوە خـەڵک ئازار بدا. ٢ـ منداڵی هار و هـاج و شـــەڕانی. ~ **بوون:** ١ـ خـــــەڵک ئازار دان. ٢ـ هـاروهاجـی کـردن، شلووق بـوون. ~ **کردن:** بەدفەڕ بارهێنانی منداڵ.

**بەدفەڕیی** (حم.)[بەدفەڕ + ئیی] ئاکار و کردەوەی کەسی بەدفەڕ. **~ کردن:** هار و هاجیی کردن، شلووقیی کردن.

**بەدقەدەم** (ئان. ل)[بەد + قەدەم] ١ـ کەسێکی پێ و قەدەمی باش نەبێ و بچێتە هەر شوێنێک کوێرەوەری و ناخۆشی و بەڵا دەگەڵ خۆی دەبا. // خۆش قەدەم. ٢ـ خراپ، نەحس، شووم. **~ بوون:** ١ـ پێ و قەدەم باش نەبوون. ٢ـ نەحس بوون، شووم بوون. :: مەچۆ شاری چزیرێ، شارێکی بەدقەدەمە، ... (مان ل ٤١).

**بەدقەواره** (ئان. ل)[بەد + قەواره] ١ـ کەسێکی کە قەد و باڵای رێک و پێک و جوان نەبێ، بەدشکڵ. ٢ـ جلێک کە لە لەش دا جوان نەبێ. **~ بوون:** ١ـ بەژن و باڵا رێک نەبوون، بەدشکڵ بوون. ٢ـ جوان نەبوونی جل لە لەش دا.

**بەدقەول** (ئان. ل)[بەد + قەول] کەسێک کە لە کاتی بەڵێنی دان قسەی خۆی نەباتە سەر، پەیمان شکێن. **~ بوون:** لە سەر پەیمان و بەڵێنی خۆ نەبوون.

**بەدقەولیی** (حم.)[بەدقەول + ئیی] ئاکار و کردەوەی بەدقەول. **~ کردن:** پەیمان و بەڵێن نەبردنە سەر.

**بەدکار** (ئان. ل)[بەد + کار] ١ـ کەسێک کە کاری خراپ دەکا، کەسێک کە لە باری داب و نەرێتەوە خراپ دەجووڵێتەوە، بەدعەمەل، بەدکردار. ٢ـ سیخوڕ، شۆفار. ٣ـ بەدخواز.

**بەدکاره** (ئان. ل)[بەد + کار + ئە] ژنێک کە بۆ پارە دەگەڵ خەڵک دەخەوێ، خراپە، جندە، قەحبە، خۆفرۆش. **~ بوون:** خراپە بوون، جندە بوون.

**بەدکردار** (ئان. ل)[بەد + کردار] بڕ: بەدکار

**بەدگومان** (ئان. ل)[بەد + گومان] کەسێک کە هەمیشە باری خراپی کار لێک دەداتەوە و شکی لە هەموو شت و هەموو کەس هەیە، دڵ پیس. **~ بوون:** لێکدانەوەی باری خراپی مەسەلە، بەشک بوون، دڵ پیس بوون.

**بەدگومانیی** (حم.)[بەدگومان + ئیی] گومان و بیری خراپ لەمەر کەسێک یا کارێک، دڵ پیسی.

**بەدگۆ** (ئان. ل)[بەد + گۆ1] کەسێک کە بە خراپە باسی خەڵک دەکا، بەدبێژ، بەدوێژ.

**بەدگۆیی** (حم.)[بەدگۆ + ئیی] کاری کەسی بەدگۆ، بەدوێژیی، بەدبێژیی. ~ **کردن:** بە خراپە باسی کەسێک کردن.

**بەدلغاو** (ئان. ل)[بەد + لغاو] ١ـ ئەسپ و بارەبەرێک کە نایەڵی لغاوی دە دەم کەن. ٢ـ (کنـ.) مرۆی بارنەبەر و کەللەرەق.

**بەدڵ** (ئان. ل)[بە + دڵ] ١ـ دەست بڵاو، دڵاوا، دڵ گەورە. ٢ـ بە خۆشی و مەیلەوە، بە ئارەزوویەکی زۆرەوە، لە قووڵایی دڵەوە. ∷ بەدڵ پێم خۆش بوو بێم و سەرتان بدەم. ٣ـ نەترس، بوێر. ٤ـ هەر چێک پەسەند بێ. ~ **بوون:** ١ـ نەترسان، وێران، نەترس بوون. ٢ـ دڵاوا بوون، دڵگەورە بوون. ٣ـ پەسند کردن. ∷ ئەو کراسەم بە دڵ نیە.

**بەدڵ و بەگیان** (ئان. ل)[بە + دڵ + و + بە + گیان] بڕ: بەداو و دڵ.

**بەدمەست** (ئان. ل)[بەد + مەست] کەسێک کە لە کاتی خواردنەوەی ئارەق بیکاتە هات و هاوار و شەڕ، مەستی کەلەلا.

**بەدمەستیی** (حم.)[بەدمەست + ئیی] کار و کردەوەی کەسی بەدمەست. ~ **کردن:** پتر لە رادە خواردنەوەی ئارەق و کردنە شەڕ و هەڵڵا.

**بەدمینتۆن** (نا.)[ئین: badminton] جۆرێک یاری دوو یا چوار کەسیە وەک تێنیسە کە لە زەوییەکی وەک زەوی واڵیباڵ دەکردرێ. راکێتەکانی سووکتر و ناسکتر لە هی تێنیسە و تۆپێکی مەخرووتی سووک و چەند پەڕە .

**بەدناو** (ئان. ل)[بەد + ناو1] کەسێک کە ناوی بە خراپ دەرچوە، ناوخراپ، بەدنێو. ~ **بوون:** بە خراپە دەرچوونی ناو و ناوبانگ لە لای خەڵک. ~ **کردن:** خراپ کردنی ناو و ئاکاری کەسێک لە لای خەڵک.

**بەدناویی** (حم.)[بەدناو + ئیی] ئاکامی بەدناو بوون، بەدنێویی.

**بەدنمەک** (ئان. ل)[بەد + نمەک] پێنەزان، سپڵە. ∷ زۆر بەدنمەکین و رێ نەناسین/ نانی تۆ دەخۆین و بێ سپاسین (مەم و زین ل ٢٤٠)

**بەدنمەکیی** (حم.)[بەدنمەک + ئیی] کاری بەدنمەک، پێنەزانیی، سپڵەیی.

**بەدنێو** (ئان. ل)[بەد + نێو2] بڕ: بەدناو.

**بەدنێویی** (حم.)[بەدنێو + ئیی] بڕ:



**بەدواز** (نا. فـا)[بەد + واز][هـەو] بڕ: بەدخواز

**بەدویژ** (ئان. ل)[بەد + ویژ] بڕ: بەدگۆ

**بەدویژیی** (حم.)[بەدویژ + ئیی] بڕ: بەدگۆیی

**بەدئەدا** (ئان. ل)[بەد + ئەدا] کەسێک کە ئاکار و کرداری باش نەبێ، جینگەنە. ~ **بوون:** ئاکارباش نەبوون، بێتەربیەت بوون، جینگەنە بوون. ~ **کردن:** بەدئەدا بارهێنانی کەسێک، بێتەربیەت کردن.

**بەدئەدایی** (حم.)[بەدئەدا + ئیی] کار و کردەوەی کەسی بەدئەدا. ~ **کردن:** کار و کردەوەی خراپ ئەنجام دان، ئەدای خراپ دەرهێنان.

**بەدەر** (ئاک. ل)[بە + دەر] بێجگە، جگە. :: لە تۆ بەدەر لەم دنیایە کەسم نیە.

**بەدەست** (ئان. ل)[بە + دەست] ١ـ دەست ڕۆییو. ٢ـ ئازا، بوێر. ~ **بوون:** ١ـ دەست ڕۆیشتن. ٢ـ ئازا بوون، بوێر بوون.

**بەدەستەلات** (ئان. ل)[بە + دەستەلات] ١ـ خاوەن دەستەلات و هێز. ٢ـ کەسێک کە لە شوێنی دیکە دەستی بڕوا و قسەی بڕ بکا. ~ **بوون:** ١ـ خاوەن دەستەلات بوون. ٢ـ دەست ڕۆیشتن، قسە بڕ کردن.

**بەدەستەوە** (ئان. ل)[بە + دەست + ئەوە] ١ـ حازر و ئامادە. ٢ـ لە حساب دا رادە و ئەندازەیەک کە دەخرێتە لاوە. :: پێنج و هەشت دەبێتە سێزدە، سێی دەنووسین، یەک بە دەستەوە. ~ **بوون:** پووڵ و پارەی ئامادە و لەبەر دەستان. :: وا بە پەلە چ پووڵم بە دەستەوە نیە بتدەمێ. ٢ـ خەریک بوون، کارێک کە لە بەر دەستان بێ. :: کتێبێکم بەدەستەوەیە بزانم ئەمشۆ تەواوی دەکەم. قورەکاریم بە دەستەوەیە. ~ **دان:** ١ـ تەسلیم کردنی کەسێکی پەنابەر بە دەوڵەت یا قانوون. ٢ـ چوونە ژێر باری کەسێک، تەسلیم بوون بە کەسێک. :: هەرچی دەکەم ئەو ژنە خۆی بە دەستەوە نادا.

**بە دەستوبرد** (ئان. ل)[بە + دەستوبرد] کەسێکی لە کاران دا شارەزایە و جوان و ڕێک و پێک و زوو بەرێوەیان دەبا، کارزان و کارجوان. ~ **بوون:** شارەزا و کارامە

و چوست بوون لە کاران دا. :: ماشەڵڵا فـــاتێ ژنێکی بە دەست و بردە تا وا دەکەی ماڵ گەسک دراوە و چێشت ساز کراوە.

**بەدەگــمـەن** (ئان. ل)[بە + دەگـمـەن] روداو یا شـتـێکی زۆر کـەم پەیدا بێ یا روو بدا، بە هەڵکەوت. :: بە دەگـمـــەن کـۆت و شـاڵواری دەبەر دەکـەم مـەگـەر ئەویش شایی یا جێژنێک بێ.

**بەدەڵ** (نا.)[عـەر: بدل (لە جـیـات، لە بری)] کەرەسـە یا کاڵایەکی نە زۆر باش کـە وەک کـاڵای ئەسلی و بە بایخ سـاز دەکــردرێ و هەرزانتــردەفــرۆشــرێ. :: کریستاڵی بەدەڵ، زێڕی بەدەڵ.

**بەدەم** (ئان. ل)[بە + دەم] ١ـ قسەزان، بەدەم وپەل. ٢ـ قسەی نەنوسراو و سەر زارەکی.

**بەدەمـــار** (ئان. ل)[بە + دەمـــار] ١ـ کـــەسی ئازا و نەترس، بەغـیـــرەت. ٢ـ کەسێک کە خەڵکی دیکە لێی بترسێن. ٣ـ (کنـ.) بە شەرەف، بە ناموس

**بەدەمـــــاغ** (ئان. ل)[بـە + دەمــــاغ] کـــەســـێک کـــە لـە ســــەر کـــەیف بێ، کەیفخۆش، کەیفساز. **~ بوون:** کەیف ساز بوون، لە سەر کەیف بوون.

**بـەدەم و پـەل** (ئـان. ل)[بـە + دەم و پەل] قسەزان، خۆش دەم و راوێژ، بەدەم. **~ بوون:** لە قـسـە زانـین، باش قسـە کردن.

**بەدەم و دۆ** (ئان. ل)[بە + دەم + و + دۆ3] مـرۆی قـسـە زان و خـۆش قـسـە. **~ بوون:** قـسـە زان و خـۆش قـسـە بوون، خۆش دەم و خۆش راوێژ بوون.

**بەدەن** (نا.)[عـــەر: بدن] ١ـ لەشـی مـرۆڤ جگە لە سـەر، بەندەن. ٢ـ [باک] دیـواری قـــــــــەڵا، وارش. :: بـەدەنـا دیاربەکرێ. ٣ـ بەندەن. :: ئەتۆ خـەزاڵت نەدیوە ئەگـەر بە زەردەخـەنە پێـدەکەنێ/ مـەگە قـەتت نەدیـوە ئەگەر دێنە گوڵ دان گـوڵ لە بەدەنێ/ ئەو گـوڵانە لە حـاسـتی پێکەنینی خـەزاڵ... بێ قـابیلەتە دەبێ پیاو هەڵیکەنێ (لاس و خەزاڵ ل ١١١).

**بەدەنە** (نـا.)[عــەر: بدنە] پەیکەری هـەندێک شــتـی بێگیــان. :: بەدەنـەی ماشێن.

**بەدئەمـەگ** (ئان. ل)[بـەد + ئەمـەگ] کـەسـێک کـە وڵامی چاکـە بـە خـراپە دەداتەوە، سـپـڵـە. **~ بوون:** وڵامی چاکە بە خراپە دانەوە، سپڵە بوون.

**بەدئەمەگیی** (حم.)[بەدئەمەگ + ئیی]

کـار و ئاکـاری بەدئەمـەگ، سـپـڵـەیی.
**~ کردن:** سـپـڵـەیی کـردن، بە خـراپە ولامی چاکـەیی دانەوە :: کـابرا بێ ئەمـەگ بوو، وەعـدەی حـەوت ڕۆژ مـاوە/ پێـمـوایە ئێـران جـێگایەکی خـۆشـە، بەدئەمـەگی کـرد و ناگـەڕێتـەوە دواوە (سەعید و میرسێوەدین ل ٢٣٩)

**بەدەو** (ئان. ل)[بە + دەو] ١ـ ئەسـپی باش و خۆشبەز، بدەو؟ ٢ـ [باک] جوان، لەبار، چەلەنگ.

**بەدی**[1] (ئام.)[با + ئیـدی] ولامی پرسیارە بە مانای ئا، بەڵێ لە کاتێک دا کە پرسیارکەر شکی لە راستی هەیە، بەی، ئەدی، ئەیچۆن، ئەدی کوو. :: ئیـمڕۆ نەچوویەوە مـاڵێ؟ ـ بەدی چوومەوە.

**بەدی**[2] (نا. ل)[بە + دی1] ئاسەوار و نیشانەیەکی ماددی کە چاو ببینێ، بەدید. **~ کردن:** دیتن، بینین. :: ئیتر شوێنەواری جوانی / بەدی ناکەم لەم نێوە دا (ناڵەی جودایی ل ٢٩). لە بیابانی عەرەبستان جگە لە لم چی دی بەدی ناکرێ.

**بەدید** (نا. ل)[بە + دید][باک] بڕ: بەدی3

**بەدین** (ئان. ل)[بە + دین] موسڵمان و ئیـمانداری چاک کە لە ڕێی ئایین لا نادا، بەدین و ئیمان.

**بەدیی** (حم.)[بەد + ئیی][پەهـ: ڤەتییە] خراپە، خراپ بوون.

**بەر**[1] (نا.)[پەهـ: بەر. باک: بەر ـ ناو: بەر، بار ـ باش: بەر ـ هەو: بەر ـ زا: ڤەر] ١ـ میوەی دار و درەخت و گیا. ٢ـ منداڵی مرۆڤ و گواندار کە هێشتا لە زگی دایکیان دان. ٣ـ گیا و گوڵ و سەوزی پێگەیشتوو. :: ئەوساڵ سێ بەرمان کەوەر بریوەتەوە. بەری دووهەمی وێنجە کەی دەدروونەوە؟ **~ ئاویتن:** (بۆ ئاژەڵ) زووتر لە وادە و بە مردوویی زانی مەڕ و ماڵات، فڕێ دانی ئاولەمە بە مردوویی، بەر فڕێ دان، بەر خستن. **~ خستن:** بڕ: بەر ئاویتن. **~ دان:** گەیشتن و پێ گەیشتنی میوە و بەری دار و گیا. :: ئەوساڵ سێوەکانمان چاکیان بەر داوە. **~ فڕێ دان:** بڕ: بەر ئاویتن. **~ گرتن:** میوە دانی دار، بەر دان. **~ لێخواردن:** ١ـ گەیشتنە بەری باغ و کەلک لێوەرگرتن لەم بەرە. ٢ـ (کن.) کەلک وەرگرتن لە ژیان و ئاکامی شتێک. :: ئەو منداڵانم پێگەیاند بەڵام بەرم لێنەخواردن و لێیان دا ڕۆیین. **لە ~**

**چوون:** (بۆ ئافرەت) مردنی منداڵی نێو زگی ژن و هاتنە دەری بە مردوویی. :: دایکم هەتا ئێستا دوو منداڵی لە بەر چوە. **لە ~ چوونەوە:** چی دیکە نەزانی مێینە، لە بار چوونەوە. :: مانگاکەمان پیر بوە ئیدی لەبەر چۆتەوە. **وە ~ هاتن:** بەر دان و پێگەیشتنی دارەبەر بۆ یەکەم جار. :: با شەو بڕوا سەحەر بێ، باغی گوڵان وە بەر بێ / گەر تۆ مەیلت لە سەر بێ، کافی ئیسلامی ناوە (وەفایی ل ١٥٢). دارە سێوەکەی حەسارمان ئەوساڵ وەبەر هاتوە.

**بەر** 2 (نا.)[ئەو: ڤەرەنگە، ڤەرەهە - پەهە: ڤەر. باک: بەر - ناو: بەر - باش: وەر] ١- لەشی مرۆڤ، تەن. ٢- سینگ، بەرۆک، بەروو، سینگ و بەر. ٣- (مجـ.) مەمک. **بۆ ~ بوون:** ئەندازە بوونی جل و بەرگ. :: ئەو کراسە هێند تەنگە بۆ بەرم نابێ. **دە ~ کردن:** جل و بەرگ پۆشین، پۆشین. **لە ~ کردن:** ١- پۆشین، دەبەر کردن. ٢- دەرهێنانی جل و بەرگ، داکەندن.

**تێبینی:** ئێستاکە لە بەر کردن و دە بەر کردن ماناکەیان شێواوە و بۆتە یەک و بە مانای پۆشین دێ بەڵام لە راستی دا دوو مانای دژی یەکن و لە هەندێک ناوچەی وەک لێڕەواری سەردەشت بە دروستی دەیانڵێنەوە. دەبەر کردن یانی پۆشین و لەبەر کردن یانی داکەندن.

**بەر** 3 (نا.)[باک: بەر - ناو: بەر، وەر - باش: وەر، بەر - هەو: وەر] ١- لا، سوێ، تەنیشت. :: لەو بەری حەسار ئاودەستیان ساز کردبوو. لەو بەری رووبار دوو ژن شیویان دەکرد. فەرموون بەو بەری دا بچنە ژوورێ. ٢- لای خوار، ژێر. :: لە بەرەوە هات ( لەخوارەوە هات). ٣- پێش، لە پێش (بۆ کات). :: بەر لە زایین، بەر لە سەعات دوو. ٤- پێش، لای پێش (بۆ جێگا). :: بەر دەرک، بەربێلا، بەر هەیوان. ٥- پێش، روو. :: وەک نیسک وایە بەر و پشتی بۆ کەس نیە. ٦- بۆ لای، بەرە و رووی. :: بەرەو ماڵ چوونەوە. بەرەو قوبلە نوێژ بکە. ٧- روو، لا، دیو. :: ئەو پارچەیە دوو بەرە. ئەوە بەری جوانیەتی. ٨- ئاستەر. :: بۆ بەرت لەو کەوایە نەداوە؟ ٩- ئازاد، بەرەڵلا، بەرهەڵدا. **~ بوون:** ١- ئازاد بوون، بەرەڵلا بوون لە بەند :: دوو رۆژە لە زیندان بەر بووم. ٢- بلاوە بوون ، تەواو بوون لە ئیش و کارێک. :: کەی لە کار بەر دەبن. فێرگەکان بەر بوون. ٣- لە نۆرە دا پێش کەسێکی دیکە بوون. ٤-

خـۆڕایی بوون، بەڕەڵڵا بوون. ٥ـ ترازان، ڕەوین. ~ **بوونەوە:** ١ـ کەوتن، کـەوتنە خوار. ‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌‌:: بەر بوومـە و دەسـتم شکا. ئەو وەرکـــە نانـە بـەربۆتـەوە هـەڵیگرەوە. ٢ـ شـــۆڕ بوونـەوە. شـــۆڕەبی لک و پۆی بـەربۆوە. ~ **دان:** ١ـ ئازاد کـــــردن، بەڕەڵڵا کـردن. :: بولبـولـەکـەم بەردا. ٢ـ بڵاوە کردن. :: جەماعەت بەر دراوە تازە تۆ دەچی بۆ نوێژ. ٣ـ بەڕەڵڵاکـردنی بای نێـو زگ. ٤ـ بڕ: تێبـەردان. :: دوو تاژیم لە رسـتـێـدا / هـەر دووکم بـەر دەدانێ (فـۆلکلۆر ل ١٣٢). ٥ ـ لە کـۆڵ بوونەوە. :: ئەو نـەخـۆشـیـیـە بـەرم نادا. یەخـەم بـەردە بـا بڕۆم. ٦ـ پێش و بـەری ڕێگای شـتـێک کـردنەوە. :: ئاوی شـێـرەکـەی بـەردە با هـەندێک سـارد بێ. ٧ـ دەسـت لێـهـەڵگرتن، واز لێـهـێنان. :: مـامم ژنە کـۆنەکـەی بـەردا و ژنێکی دیکەی هێنا. باغ و بیـسـتـانەکـەیان بەرداوە. ~ **دانەوە:** ١ـ خـستن، کـەواندن، فـڕێ دانی شـتـێک لە سـەرەوە بۆ خـوارەوە. :: ئیـسـتکانەکـەی بەرداوە و شکاندی. دەسرەی لە پەنجەرەوە بۆ بەرداو ٢ـ شۆڕ کردنەوە. :: ئەختەر کەزیەکانی بە سـەر شـان دا بـەردابۆوە. ~ **کـەوتن:** ١ـ بڕ: وەبەر کەوتن. ٢ـ گـوللە یا شـتـێکی دیکە وێکەوتن، وێکەوتن. :: چاوی بیـمـاری بە وەعـدەی تیـرەبارانی نیگا / گـفـتی دا جـەهـدێ کـە ئەی دڵ، بـەڵکی تۆشـی بەرکەوی (مەحوی ل ٣١٩). ~ **گرتن:** ١ـ پێش بە کـەسێک گرتن بۆ شـەڕ، بەر پێ گـرتن. ٢ـ پـێـشـی ئازادی و هەڵسووڕانی کەسێک گرتن. :: بەری ئە کـچـە بگرە با هێندە وەدەر نەکـەێ. ٣ـ پێـشی هـەر شـتـێک گـرتن. :: بەر ئەو تەلەویزیۆنەت بـۆ گـرتـوە؟ بـەر چاوت گـرتووم چ نابینم. **لە ~ بوون:** لە پێـشـدا بـوون. :: ڕێگایـەکـی دوور و درێژمـان لەبەرە کـە دەبێ بیـبـڕین. **لە ~ حەسانەوە:** حـەسـانەوە و ئارامی و هێـمنایەتی لـە ژێر چاوەدێری و سـایەی کـەسـێکەوە. :: پیـاو ئەگـەر ژنـی چاکی هەبێ لەبەری دەحـەسـێتـەوە. **لە ~ دانوآندن:** تەسلیم بوون و مل کەچ کـردن بۆ ویست و ئـەمـری کـەسـێک، سـەر دانـوانـدن، تەنـازول کـردن. **لە ~ هەستـان:** هەسـتـانە سـەر پێی کـەسی دانیشتوو لە کاتی پەیدا بوونی کەسێکی بەڕێز و گـەورەتر. بەرزەپێ بوون لـە بەر کەسێک. **وە ~ خستن:** بەشدار کردن، وەبـەر دان. :: ئەو چـاکـەش وە بـەر چاکەکانی دیکەت دەخـەم. **وە ~ دان:**

١ـ بە مەکینە بە سەر کەسێک یا گیاندارێک دا رۆیشتن. :: بە دووچەرخە پشیلەیەکم وەبەر دا و کوشتم. ٢ـ بەشدار کردن، وەبەر خستن. :: کابرای مردوو وەبەر جنێوان مەدە! **وە ~ کەوتن:** ١ـ بەش و پارێک لە شتێک پێگەیشتن، پێبڕان. :: لە گۆشتی قوربانی چمان وە بەر نەکوت. ٢ـ چوونە ژێر مەکینە و ئامرازێکی دیکەوە. :: منداڵێک وە بەر عارەبەی کەلّی کەوت. ٣ـ تووش بوونی مەسەلە و کار و کارەساتێک بە کۆمەڵ، وەبەر هاتن. :: ماڵەکەی ئێمەش وەبەر سێلاو کەوت. & بەر کەوتن. **وە ~ هاتن:** ١ـ وێکەوتن. ٢ـ تووشی مەسەلە و کار و کارەساتێکی تێکڕایی بوون. :: خەڵکیان دەگرت منیش وەبەر هاتم. || **بەری ئاسمان:** پێشەوەی ئاسمان، ئەو بەرزاییەی کە هەورەکان لێی دەبن. ***بەری ئاسمان لێ تاریک بوون:** (کن.) زۆر ناهومێد بوون، هیوا لێبڕان. **بەری پێ:** بەشی بنەوەی پێ، ئەو بەشەی پێ کە تووکی لێنایە. ***بەری پێ چوونە پشتی پێ:** (کن.) بە چەرمەسەری و کوێرەوەری بژیو پەیدا کردن. ***بەری پێ ئاور لێبوونەوە:** (کن.) زۆر ماندوو بوون لەبەر زۆر بە پێوە بوون و رۆیشتن و شتی لەم بابەتە. ***بەری پێ خوران:** (خورافە) چوونە سەفەر، سەفەر بۆ هاتنە پێش. ***زمان لە بەری پێ دان:** (کن.) فریو دان و هەڵخەڵەتاندنی کەسێک بە زمانلووسیی. **بەری دەست:** لای بنەوەی دەست، ئەو بەشەی دەست کە تووکی لێنایە، لەپ. ***بەری دەست خوران:** (خورافە) پووڵ هاتنە نێو دەستەوە، دەوڵەمەند بوون.

**بەر** [4] (نا.)[باک ـ زا] بڕ: بەرد

**بەر** [5] (ئا.)[ناو: بەر ـ باش: وەر ـ هەو: وەر] تووکی سەر مسوڵدانی مرۆڤ، تووکی بەر، تووکەبەر، مووی بەر، بەرگەدە، رۆڤ، رووڤ، رێڤ.

**بەر** [6] (نا.)[ئەو: ڤەر ـ پەه: ڤەرم] شتێک کە لە مێشک دا پاشەکەوت کراوە، لە بەر، هۆش، حافزە. **لە ~ بوون:** شێعر، وتار یا هەر شتێکی دیکە کە پێشتر فێری بوون و ئێستا لە مێشکیان دا ماوە. :: شێعرەکانی هێمنی هەموو لەبەرە. **لە ~ خوێندنەوە:** بڕ: لە بەر کوتن. **لە ~ کردن:** [پەه: ڤەرم کەرتەن] فێر بوونی شتێک وەها کە بە مێشکەوە بنووسێ و لە بیر نەچێتەوە. :: ڕۆڵە دەرسەکانت لە

بەر کردوە؟ بۆ سبەی دەبێ شێعرێک لە بەر کەم. **لە ~ کوتن:** گێڕانەوەی نووســــــراوەیەک بێ ئەوەی چاو لە نووسراوەکە بکردرێ، لە بەر کوتنەوە، لە بەر خوێندنەوە. ⁘ دەرسەکەت دەبێ لە بەر بڵێی حەقت نیە چاو لە کتێب کەی. **لە ~ کوتنەوە:** بڕ: لە بەر کوتن. **هاتنە ~:** فێر بوون، چوونە نێو مێشک. ⁘ حافز هەر چی پێ بڵێی دەستبەجێ دێتە بەری.

**تێبینی:** بەر لە ئەوێستا دا بە ڤەر var و لە پەهلەویی دا بە ڤەرۆم varom یا ڤارۆم vārom هاتوە و بە یەکێک لە هێزەکانی دەروونی ئینسان داندراوە (عەر: شعور) هەروەها ئەم بەر ـ ە دەگەڵ بەر2 بە مانای سینگ و بەر هەر یەکن و بە گشتی یانی ئەوەی کە دە سینگ و بەر دا پاراستراوە یا ڕاگیراوە. هەروەتر بەر هاوریشەیە دەگەڵ بیر (بڕ: بیر1).

**بەر**$^{7}$ (ر.)[لە: بردن] ١ـ ریشــــەی چاوگی بردن. ٢ـ (پاشـ.) پاشگرە و بە ناوەوە دەلکێ و ئاوەڵناو یا ناوی فاعلی ساز دەکا. ⁘ ڕەنجبەر، بارەبەر، دڵبەر، میراتبەر، پەیامبەر.

**بەر**$^{8}$ (نا.)[زا] بڕ: دەرکە

**بەر**$^{9}$ (نا.) بڕ: بۆر2

**بەر**$^{10}$ (نا.) بڕ: بەرگە. **~ گرتن:** بڕ: بەرگە گرتن. ⁘ بەری مەستێک ناگری.

**بەر**$^{11}$ (ئام.) پێشگر یا نێوگری کردارە کە لە بەر3 ـ ی کەوتوە و هەر ئەو مانایەش دەدا بە کردارەکە. ⁘ بەردان، بەر خستن، وەبەردان، بەربوون، دەبەرنان، تێبەربوون، تێبەردان.

**بەر**$^{12}$ (ئاک.، پێشـ.)[هەو ـ زا] بڕ: دەر2

**بەرا**$^{1}$ (نا.)[زا] بڕ: برا

**بەرا**$^{2}$ (نا.)[باک] بڕ: با5

**بەرابەر** (ئان. ل)[بەر3 + ئا14 + بەر3] ١ـ دوو شت یا دوو کەس کەس کە لە ڕووبەڕووی یەک بن، ڕووبەڕوو. ٢ـ دوو ئەندازە لە هەر شتێک کە قورساییان بە قەرا یەک بێ. ٣ـ دوو کەس یا شت کە درێژایی و بالایان بە قەد یەک بێ. ٤ـ دوو کەس لە کۆمەڵ دا کە هێز و ماڵ و حاڵیان وەک یەکە، ئامپا، هاوشان ٥ـ هاوسەنگ، یەکسان. ٦ـ لە ئاستی، لە جێگەی ...⁘ بەرابەر بەم کارەساتە چ هەڵوێستێکتان گرتوە. & بەرانبەر، بەرامبەر. **~ بوون:** ١ـ لە ڕووبەڕووی

یەک بوونی دوو شت یا کەس. ٢ـ هاوسەنگ بوونی دوو شت یا کەس. ٣ـ هاوقەد بوون. ٤ـ یەکسان بوون. ٥ـ یەک بوون و مساوی بوون لە کایە و کێ بەرکێ دا. & بەرانبەر بوون، بەرامبەر بوون. ~ **کردن:** ١ـ پێک گرتن بۆ دەرکەوتنی جیاوازی. ⁖ وەرگێڕاوەکەی دەگەڵ ئەسڵەکە بەرابەر کرد. ٢ـ وەک یەک هاتنەوە لە کایە و کێ بەر کێ دا. ٣ـ وەک یەک کردنی هاوسەنگی و یەکسانی. & بەرانبەر کردن، بەرامبەر کردن. ~ **وەستان:** ١ـ لە رووبەڕووی کەسێک دا وەستان و بەرەنگاری کردن. ٢ـ دژایەتی کردن. ٣ـ جوابەجەنگی کردن. & بەرانبەر وەستان، بەرامبەر وەستان.

**بەرابەریی** (حم.)[بەرابەر + ئیی] ١ـ وەک یەک بوون لە هەموو بارێکەوە، یەکسانیی. ٢ـ دژایەتیی، بەرەنگاریی. & بەرامبەریی، بەرانبەریی. ~ **کردن:** ١ـ هاوتا بوون، هاوسەنگ بوون لە هەموو بارێکەوە. ٢ـ دژایەتیی کردن، بەرەنگاریی کردن. & بەرانبەریی کردن، بەرامبەریی کردن.

**بەرات**[1] (نا.)[عەر: برات] ١ـ ئەو جیرە و پارەیەی کە بۆ مەلا و میرزا و ئەو جۆرە کەسانە دەبڕدرێتەوە. ٢ـ کاغەزێک کە تاجر و بازرگان بەر لە ساز بوونی بانک لە نێو خۆیان دا سەودایان پێ دەکرد و مۆری ئەو کەسەی پێوە بوو. ⁖ کە داغی سینەمی دی دەردی دامێ/ وتی مۆرت هەیە ساحێب بەراتی (مەحوی ل ٢٩٨).

**بەرات**[2] (نا.)[عەر: برات] شەوی پازدەی مانگی شەبان (شەعبان) کە لای موسڵمانان شەوێکی پیرۆزە و گۆیا لەم شەوە دا رزق و رۆزی زۆر دەبێ، شەوی بەرات.

**بەراتخۆر** (ئان. ل)[بەرات1 + خۆر2] کەسێک کە بە بەرات کار دەکا، مووچەخۆر.

**بەراتە** (نا.)[؟][باک] ١ـ کەلاک، لاش. ٢ـ نیشان، ئاسەوار. ٣ـ حەق و پارەی خوێنی رژاو یا کەسی کوژراو لە لایەن کەس و کارییەوە، خوێنبایی.

**بەرار** (نا.)[زا] بڕ: برا

**بەراز** (گیان.)[هیک: ڤەراهە ـ ئەو: ڤەرازە ـ پەه: ڤەرازە، ڤیراز. باک: بەراز ـ ناو: بەراز ـ باش: وراز] ١ـ گیاندارێکی گوانداری کێوییە، بە تاقەت و قورس و پتەو و کورتەڵەیە، پێستێکی ئەستووری



هەیە کە تووکێکی کورتی تەنک و ڕەقی لێ ڕواوە، ســـمی هەیە لمبــۆزی درێژ، نێرەکەی جووتێک شـفرەی لە دوو لای دەمی هـاتۆتە دەر کــە بۆ پارێزگــاری لە خۆی کەلکی لێوەردەگرێ، پتر شـەوانە وەدەردەکەوێ و گیا و میوە دەخوا و زیان دەگەیەنێـتە بێستـان و زەوی هەر لەبەر ئەوە جوتیار خۆشیـان ناوێ، موسڵمـان گۆشـتی ناخـوا، بەڵام لە شـوێنی دیکە کەوی کراوە و گۆشـتی دەخۆن. بەرازی نێر پێی دەڵێن یەکانە یا بڕەک، بەرازی مێ پێی دەڵێـن مـــــالۆس یا دەڕ و بە بەچکەکـانی دەڵێن کـوودەڵە، بازەڵە یا بزەڵە. بەراز هـەتا پازدە ســاڵان دەژی و ســاڵێ دوو جـار دەترەکێ و هـەر جـارەی شـەش هـەتا دوازدە بێـچووی دەبێ، Sus scorpa ناوی لاتینی ئەم گیانلەبەرەیە، خـوو، خـووگ، خنزیر، دۆنخز. ٢ـ بەرازی کەوی کـراو کە بۆ گۆشـتـەکەی بەخـێو دەکردرێ. ٣ـ (کنـ.) پیاوی گیان سەخت. ٤ـ (کنـ.) پیــاوی پتــەو و کـورتەڵە و بە تاقەت. ٥ـ (کنـ.) پیاوی ڕق ئەستوور. || **بەرازی دەریایی:** ماسییەکی گوانداره کە بە کـۆمـــەڵ دە دەریا دا دەژین، ڕەنگی بۆرە و سـەری وەک سـەری بەرازە، زاری ددانـی تێـــدایە و بۆ ڕۆنی لەشـی ڕاوی دەکــەن، درێژایی لەشی هـەتا سێ گــەز دەگا، دۆلفین. **بەرازی دەم بەستراو:** (کنـ.) کەسێک کە ڕۆژووی ڕەمەزان بگرێ بەڵام نوێژ نـەکـا. **بەرازی غــەزریو:** ١ـ بەرازێک کــە ڕقی هەســتــابێ و پەلامـــاری هـەر شــــتـــێک بدا. ٢ـ (کنـ.) مـــرۆڤی ڕق ئـەســـتـــوور. **بەرازی هیندی:** جــۆرە بەورازێکی کێـوییـە کـە مـێـیـەکـەی دوو شفرەی گەورە و خواری هەیە کە لە لێوی سـەرەوەی هاتوونە دەر و نێرەکەی چوار شـفرەی هەیە. (عـەر: البـابیـروسة ـ فـەر: (babiroussa

**بــەرازا** (نـا. ل)[بــەرا + زا][زا] بـڕ: برازا

**بەرازخــۆر** (نا. ل. ئان. ل) [بەراز + خۆر2] ١ـ کەسێکی گۆشتی بەراز بخوا. ٢ـ لەقەبێکە بۆ کوردەکانی ئەهلی حەق و کاکەیی کە گۆیا گۆشتی بەراز دەخۆن و پێیان حەرام نیە.

**بەرازە** (نـا. ل)[بـەراز + ئە] ١ـ ١ـ دوو ددانـی گـــەورەیە کــــە وڵاغی بـەرزە لە تەمــەنی ٤ هـەتا ٦ ســاڵی دەری دەکــا، کــەڵپی یـەکـسم. ٢ـ ئـەو دارانـەی کــە لە ژێــرەوەی بــەرداشــی بــنــەوەی ئــاش دادەمــزرێندرێ. ٣ـ ئـامــرازێکی درێژی

قایمی کانزا یا هەر شتێکی دیکە کە بۆ هەڵکەندنی بەردی زل یا بۆ جووڵاندنەوە و بەرز کردنەوەی شتی قورس کەلکی لێوەردەگرن. بەرازە وە بن شتی قورسی دیاری کراو دەدەن و بەردێک یا شتێکی دیکەی چووکتر لە بنی دادەنێن و بە تەکانێک شتە قورسەکەی پێدەجووڵێننەوە، چلمێردە، لۆسە، نوێڵ، مەڵغە، باری، بەیرەم، گراستە، قەراسە، قراسە، باریە.

**بەرازەوان** (نا. ل، ئان. ل)[بەراز + ئە + وان] کەسێک کە ئاگای لە رەوەبەرازە و دەیانلەوەڕێنێ.

**بەرازەوانیی** (حم.)[بەرازەوان + ئیی] کار و پیشەی بەرازەوان، بەراز لەوەڕاندن.

**بەراش** (نا. ل)[بەر4 + ئاش1 ][باک] بڕ: بەرداش

**بەرام** (نا.)[؟] بڕ: بۆن و بەرامە

**بەرامبەر** (ئان. ل)[بەر3 + ئام4 + بەر3] بڕ: بەرابەر. ~ **بوون:** بڕ: بەرابەربوون. ~ **کردن:** بڕ: بەرابەر کردن. ~ **وەستان:** بڕ: بەرابەر وەستان

**بەرامبەریی** (حم.)[بەرامبەر + ئی] بڕ: بەرابەریی. ~ **کردن:** بڕ: بەرابەریی کردن.

**بەرامپیل** (نا. ل)[بەر3 + ئام4 + پیل] جۆرێک بەروانکەی ژنان کە لکەکانی بە بن هەنگڵەوە تێدەپەڕێ و لە سەر شان گرێ دەدرێ و لە کاتی شیردۆشین و چێشت لێنان و هەڵسووڕاندنی کار و باری نێو ماڵ لە خۆ دەبەسترێ هەتا جلەکانیان پیس نەبێ، بەرهەڵبێنە، بەرانپێچ.

**بەرامە** (نا. ل)[بەرام + ئە] بڕ: بۆن و بەرامە

**بەران** (گیان.)[پەه: ڤەران. روس: barán. باک: بەران ـ ناو: بەران ـ باش: وەران ـ هەو: بەران ـ زا: بەران] شەکەنێرێک کە تەمەنی گەیشتبێتە چوار ساڵ و توانایی ئاوس کردنی مەڕی هەبێ. مەڕدار بەران بە تایبەت رادەگرن و لە کاتی تایبەتی دە مەڕی بەر دەدەن، غورچ، قۆچ. ~ **تێبەردان:** بەران خستنە نێو شەک و مەڕ بۆ جووت بوون. **وە ~ هاتن:** مەیلی مەڕ بۆ جووت بوون دەگەڵ بەران. || **بەرانی سوڵتان مەحموودی:** (کنـ.) کەسێک کە پشتی بە دەستەڵاتدارێکەوە قایم بێ و هەرچی



پێـخـۆش بـێ بیکا و کـەس نەتوانـی چی پێبڵێ، مرۆڤی زیانکار و دەستدرێژکەر.

**بەرانبـــەر** (ئان. ل)[بەر3 + ئان4 + بـەر3] بـڕ: بـەرابـەر. ~ **بـوون:** بـڕ: بەرابەر بوون. ~ **کـردن:** بڕ: بـەرابەر کــردن. ~ **وەســـتـــان:** بـڕ: بەرابـەر وەستان

**بەرانبـەریی** (حم.)[بەرانبـەر + ئیی] بڕ: بەرابەریی. ~ **کردن:** بڕ: بەرابەریی کردن.

**بەرانپــــۆز** (ئان. ل)[بەران + پۆز] کەسێک کە لووتی لـە نێوان برۆکانیـەوە بە زەقی هاتبێتە خوارەوە، قەپۆزبەران.

**بەرانپێچ** (نا. ل)[بەر3 + ئان + پێچ] بڕ: بەرامپیل

**بەرانـەک** (ئا.)[بـەران + ئـەک][بـاک] قــامکی گـەورە و ئـەســـتــووری دەست، پەنجەی گەورە، ئەسپێکوژە.

**بەرانەکێـویی** (گیـانـ.)[بەران + ئە + کێویی] نێری مەڕەکێویی، بەرانەهەردی.

**بەرانەهەردی** (گیـانـ.)[بەران + ئە + هەردی][هەو] بڕ: بەرانەکێویی

**بەرانگە** (نا. ل)[بەران + گە] شـوێنی مۆڵ خواردنی ران لە دەشت.

**بـــەراو** (نــا. ل)[بــەر3 + ئــاو1] زەوراعەتێک کە دەبێ ئاو بدرێ، ئاوی. // دێم. **کـردنە ~:** (کنـ.) وەبەر جنێــو دان. ⁂ باوکی کـردۆتـە بەراوی خـەڵک. (ئەگەر خـەڵک جنێو بە باوکی بدا لەبەری گران نایە).

**بەراوپشـت** (ئـان. ل)[بـەر3 + ئاو + پشت] حاڵی جل و بـەرگ یا هەرشـتێکی دیکە کـــە دیوی ژووریی بە دەرەوە بێ. ئـاوەژوو، بـەراوەژوو، بـەر و پـشــت/٢، بەرەواژ، چەواشە.

**بەراورد** (چـا. م)[فـــــار: براورد] هـاوســـەنگی، تەخـــمین. ~ **دان:** بڕ: بەراورد کــــــردن. ~ **کـــــردن:** ١ـ هەڵسـەنگاندن لە باری نرخ و جنسـەوە، بەراورد دان. ٢ـ دیاری کـــردنـی نرخی شتێک لە گۆترە، نرخاندن.

**بەراوەژوو** (ئان. ل)[بـەر3 + ئاوەژوو] بڕ: بەراوپشت

**بەراوەژی** (ئـان. ل)[بـەر3 + ئـاوەژی] بڕ: بەراوپشت

**بەراویتــە** (ئان. ل)[بەر1 + ئاویتـە (ئاویتن)] حـــاڵی مـــەڕ یا بزنێک بـەری هاویشتبێ.

**بەرایی**[1] (نا. ل)[بـەر3 + ئـایـی] ١ـ

تاقمێک سوارێک کە لە پێش کاروان دەڕۆن. ٢ـ تاقمێک سوار کە لە پێشەوەی لەشکر و قۆشەن دەڕۆن. & پێشایی.

**بەرایی**[2] (نا.)[؟] ١ـ ویست، مەیلی دڵ. ٢ـ ئۆقرە، حەسانەوەی دڵ. **~ دان:** دڵ هاتن، ویستن. ‌:: چاوم بەرایی نەدەدەدا من تێر بخۆم و منداڵ برسی بن. دڵم بەرایی نادا قسەی ناحەزی پێبڵێم. **~ هاتن:** ئۆقرە گرتن، حەسانەوە.

**بەریا** (نا. ل)[بەر3 + با1] وەردە کا و تۆز خۆڵ کە لە کاتی لە کەو دانی گەنم دەکەیتە لایەک.

**بەرباد** (ئان. ل)[فار: برباد] ١ـ فەنا، نابوود، فەوتاو. ٢ـ وێران، رووخاو، نوغرۆ. **~ بوون:** فەوتان، تێداچوون. :: هەتا دوژمن بەرباد نەبێ/ تا کوردستان ئازاد نەبێ/ تفەنگ لە شان ناکەمەوە (بۆ کوردستان ل ١٦١). **~ دان:** فەوتاندن، نابوود کردن. **~ کران:** ١ـ فەوتان، تێداچوون. ٢ـ وێران کران، رووخان. :: دیوەخانم بەرباد کرا/ تەکیەی لە جێ بنیاد نرا (بۆ کوردستان ل ١٧٥). **~ کردن:** ١ـ فەوتاندن، نابوود کردن. ٢ـ وێران کردن، رووخاندن.

**بەربار** (ئان. ل)[بەر3 + بار1] ١ـ یەک سمی سێ ساڵە کە گەیشتۆتە تەمەنی بار لێنان. ٢ـ (مجـ.) کەسی گوێ لە مست و ژێر فەرمان. ٣ـ رام، دەستەمۆ. **هاتنە ~:** ١ـ رام بوونی بارەبەر بۆ چوونە ژێر بار و بار هەڵگرتن. ٢ـ چوونە ژێر باری کەسێک بۆ جێ بە جێ کردنی کارێک. **هێنانە ~:** رام کردنی بارەبەر بۆ بار هەڵگرتن. ٢ـ بردنە ژێر باری کەسێک بۆ راپەڕاندنی کارێک.

**بەربانک** (نا. ل)[بەر2 + بان (وان1) + ک][زا] بڕ: بەرهەڵبێنە

**بەربانگ** (نا. ل)[بەر3 + بانگ] ١ـ کاتی رۆژوو شکاندن، ئیفتار، فتارە. ٢ـ خواردەمەنییەک کە بۆ ئەم کاتە داندراوە. **~ کردنەوە:** شکاندنی رۆژوو بە خواردن لە کاتی بانگی شێوان، ئیفتار کردنەوە.

**بەربڵاو** (ئان. ل)[بەر3 + بڵاو] ١ـ هەر شتێک کە پێش و بەری ئاوەڵە بێ. ٢ـ هەراو. ٣ـ (مجـ.) گشتی، هەمە لایەنە. :: پێویستمان بە هاوکاری بەربڵاوی خەڵک هەیە.

**بەربوارد** (گیان.)[بەر1 + بوارد



(بواردن)][سۆر] بەردیل یا شەکەمێیەکی ئەستێور کە ساڵێکی بواردبێ و نەزابێ، بەربواردوو.

**بەربواردوو** (گیانـ.)[بەر1 + بواردوو] [موک] بڕ: بەربوارد

**بەربۆســـە** (نا. ل)[بەر3 + بۆســـە] ئامـرازێکە کـە بۆسـەی پێ لە نێـر توند دەکرێ و ناهێڵێ بجووڵێتەوە.

**بەربوو** (ئان. ل)[بەر3 + بوو (بوون)] بەردراو، بەرەڵڵا.

**بەربـووره** (نـا. ل)[بـەر3 + بووره] ١ـ تۆوێک کە بەر لـە کێڵانی بە سـەر زەوی دا دەیپرژێنن، بەرچێن. ٢ـ لە خۆوە بە بێ بیـر کـردنـەوە، لە خـۆڕا. ٣ـ بەر لـە هەر شـتێک. ⁂ لە بەربووره با پێت بڵێم لەوە دوا حەقت نیە درەنگ بێیەوە.

**بەربـووک** (نـا. ل)[بـەر3 + بووک] ١ـ ئافـرەتێکە بە پـارە کـار دەکـا، هەمـیشـە دەگـــەڵ بـووکـــە و کـــار و باری بـووک هەڵدەسـوورێنێ و دەگـەڵ بووک دەچێتـە مـــاڵی زاوا و شـــەوی پـەردوو پـەڕۆی خوێناوی دێنێتە دەر و بە خەڵکی نیشان دەدا، پێـخـەسـوو، پاخـەسـوو، پاوەوی، پاوەوە، پاوەیوە. ٢ـ (مـجـ.) کـەسێک کـە بۆ خـۆ شـیـرین کـردن لە نێوان دووکەس یا دوو لایـەن هـاتوچۆ دەکـا و دەیـەوێ بۆ مـەبەسـتـێک ڕێکیـان خـا بـێ ئەوەی کـە پەیوەنـدییـەکی زۆری بەوەوە هـەبێ، وەها کـەسێک لە نێـو خـەڵک دا خـۆشـەویست نیە و بە سووک چاوی لێدەکەن. ⁂ کاک کەریم بۆتە بەربووکی ئاغاواتان.

**بەربووکیی** (حم.)[بەربووک + ئیی] ١ـ کــار و پیــشـــەی کـــەسی بەربووک. ٢ـ (مـــجـ.) ڕێکخـستن و هـەڵسـووڕاندن و جـێـبـەجێ کـردنی کـاری کـەسـێک یا کـــەســانێک بـێ ئەوەی پـەیوەندییـــەکی ئەوتۆی بەو کەسەوە هەبێ.

**بەربەت** (نا.)[پەه: بەربەت، بەربوت لە یون: barbitos] ئامێرێکی مۆسیـقـایە وەک تەنبوور بەڵام دەسکەکەی کورتترە و کاسەکەی گەورەتر، عوود.

**بەربەت ژەن** (ئان. فا)[بەربەت + ژەن] کەسێک کە بەربەت لێدەدا، عوودژەن.

**بـەربـەخـت** (نـا. ل)[بـەر3 + بـەخـت] کچێک کە کاتی مێرد کردنی گەیشتبێ، کچی دەم بەخت.

**بەربەر** (نا.)[ئین: barber] کـەسـێک کــە ســـەر و ریشی پیـــاوان دەتاشـێ یا کـورتـی دەکـاتەوە، ســەلمانی، ســەرتاش، دەللاک، سەرتراش.

**بەربەران** (گیانـ.)[بـەر + بەران] شەکە مێیەک کە گەیشتۆتە ئەو تەمەنەی بەران وەخۆ بگرێ، بەرخە مێی سێ ساڵە.

**بەربەرەکانی** (نا. ل)[بەر3 + بەر3 + ئەک + ئانی] ١ـ لە بەر یەک راوەستانی دوو کەس یا دەوڵەت و چەکدار بۆ تێک شکاندنی یەکتر. ٢ـ خۆڕاگرتن و خەبات کردن لە ئاست گیر و گرفت و چەرمەسەری ژیان یا هەر کارێکی دیکە. ٣ـ حەول دان بۆ پێش کەوتن لە غەنیم، رقەبەری، ئینکەبەری. ~ کردن: ١ـ خۆ راگرتن و خەبات لە شەڕ و لە ئاست چەرمەسەری دا. ٢ـ رقەبەری کردن.

**بەربەرین** (ئان. ل)[بـەر3 + بەرین] زەوی، پارچە و قوماش یا هەرشتێکی دیکە کە بەری زیاد و زۆر بێ، بەرپان، بەرفرەوان، هەراو، بەرین. // بەرتەسک.

**بەربەرۆ** (نا. ل)[بـەر3 + بە + رۆ1] بڕ: گوڵە بەڕۆژە

**بەربەرۆچک** (نا. ل)[بـەر3 + بە + رۆچ + ک] بڕ: بەربەرۆچکە

**بەربەرۆچکە** (نا. ل)[بـەر3 + بە + رۆچ + کە] پەنا دیوار یا شوێنێک کە روو بە تاوە و تاو تێدەکا و لە کاتی شکانی شەقی گەرما بە تایبەت لە پایز دا خەڵک لێی دادەنیشن و خۆ لە بەر تاو هەڵدەخەن، بەربەرۆچک.

**بەربەژن** (نا. ل)[بـەر3 + بەژن] ١ـ نوشتە و دوعایەک کە بەرگی تێدەگرن، بەندێکی وێدەخەن و لە مل و لا قۆڵێکی دەکەن وەها کە بکەوێتە سەر کەلەکە، حەمایاڵ، حەمایەڵ. ٢ـ خشڵێکی ژنانەیە کە وەک حەمایاڵ لە خویانی دەدەن.

**بەربەس** (نا. ل)[بـەر3 + بەس] بڕ: بەربەست

**بەربەست** (نا. ل)[بەر3 + بەست] ١ـ بەر گرتنی ئاو بۆ پاشەکەوت کردن و راگرتنی. ٢ـ بەرهەڵست و بەرگری لە هەر کارێک. ~ کردن: ١ـ بەری ئاوی جۆگە یا ئاوی خوڕی دیکە گرتن. ٢ـ بەر بەستن، بەر گرتن.

**بەربەسێڵ** (نا. ل)[بەر (بەرخ) + بە + سێڵ] چێشتێکی کوردەوارییە، قوڕاو.

گۆشتی بەرخ لە سەر سێڵ سوور دەکەنەوە و ماستی مەڕانی بۆ خاو دەکەنەوە، بە سەری دادەکەن و دەیخۆن. لە هەندێک ناوچەی دیکە گۆشتی بەرخ دەگەڵ ماستی مەڕان و لەپە و کەوەر یا کوڕادە دەکوڵێنن، وەک جۆرێک شۆربای



به ماست دوای پێگەیشتنی تێیدەکوشن و دەیخۆن.

**بەربەگوار** (ئان. ل)[بەر + بە + گوار] ئاژەڵێک کە گۆشتی زێدە وەک گوارە بە ملیەوە بێ.

**بەربەن**[1] (نا. ل)[بەر2 + بەن1] سینەبەند، گەردنبەندی شۆڕ. ჻ بەژنی چەندە برندە لێی دەبەستێ گێلدارێ / تۆق و تەلەسم و بەربەن بە سەر دا هاتنە خوارێ (سێسەد هۆنراوە ل ٧٧).

**بەربەن**[2] (نا. ل)[بەر3 + بەن1] دارێک کە بەری کونی ئەستێر و گۆلی پێدەگرن، چێوەسێڵ.

**بەربین** (نا. ل)[بەر3 + بین1] بڕ: بەربینگ

**بەربینک** (نا. ل)[بەر3 + بین1 + ک] بڕ: بەربینگ

**بەربینگ** (نا. ل)[بەر3 + بین1 + گ] ئەوک، قورقورۆچکە، بەربین، بەربینک. **~ پێگرتن:** ئەوک و یەخەی کەسێک گرتن بە پەلپ و بیانوو هێنانەوە. ჻ خێزانم بەربینگی پێگرتووم دەڵێ دەبێ ماڵمان جوێ کەینەوە.

**بەربێڵ** (نا. ل)[بەر + بێل] بڕ: بەرەجووت

**بەربێنکە** (نا. ل)[بەر2 + بێن1 + کە] بڕ: بەرهەڵبێنە

**بەرپا** (ئان. ل، ئاک. ل)[بەر3 + پا] ١ـ وەستاو، لە سەر پێ. ٢ـ ساز، دامەزراو، رێکخراو. **~ بوون:** ساز بوون، دامەزران و هەڵگیرسانی ئاژاوە و شەڕ و شتی لەم بابەتە. **~ کردن:** هەڵگیرساندن، دامەزراندن، ساز کردن.

**بەرپاڵ** (نا. ل)[بەر3 + پاڵ/٦] قەدپاڵی کێو و شاخ، لاپاڵ. ჻ واتا کە دەبوو بە رۆژی سەرساڵ/ هەرکەس دەرئەچوونە دەشت و بەرپاڵ (مەم و زین ل ٢٦٢).

**بەرپان** (ئان. ل)[بەر3 + پان] بڕ: بەربەرین.

**بەرپرس** (نا. فا)[بەر + پرس] سەرۆک و کاربەدەستی تاقمێک کە وڵامدەری کار و ئەرکی پێ سپێردراوە، لێ پرسراوەی شوێنێک، بەرپرسیار، مەسئوول.

**بەرپرسایەتی** (حم.)[بەرپرس + ئایەتی] بەرپرسی وڵام دانەوە، مەسئوولیەت. ჻ بەرپرسایەتی ئەو ئەرکە گرینگە لە سەر شانی منە.

**بەرپرسیار** (نا. فا)[بەر3 + پرسیار] بڕ: بەرپرس.

**بـەریـەرچ** (نـا. ل)[بـەر3 + پـەرچ] بیـــانوو، پەرچ. ~ **دانەوە:** بیـــانوو هێنانەوە، بیانوو داتاشین.

**بـەرتـاو** (نـا. ل)[بـەر3 + تـاو] ئـەو شـوێنـەی کـە تاو دەیگرێتـەوە، بەرخـۆر، بەرهەتاو، بەر ڕۆژ.

**بـەرتـوورک** (نـا. ل)[بـەر + تـوورک] [باک] بڕ: چیکڵدانە

**بەرتەسک** (ئان. ل)[بەر3 + تەسک] پارچە یا هەر شتێکی لای بەرینایی کەم بێ. // بەربەرین.

**بـەرتـەنـگ** (ئـان. ل)[بـەر3 + تـەنـگ] حـــاڵی زەوی، مـــاڵ یـا هـەر شـــوێنێکی تەنگ، تەنگەبەر. // بەرفرە، فرەوان.

**بەرتیل** (نا.)[عەر: برطیل] ١ـ پارە یا هەر شـتـێک کـە بدرێ بە کـەسـێکی کاربەدەست یا دەست ڕۆییو بۆ جێبەجێ کـردنی کـارێک کـە ئەو کـەســە خـۆی نەتوانی جـێـبـەجـێی بکا، ریشـوەت، بـەرتێڵ، خـــاوە. ⁂ بـەرتیل بەردی نـەرم دەکـا (پەند). ٢ـ [باک] خـوێنبـایی. ~ **خـواردن:** بڕ: بەرتیل وەرگرتن. ~ **دان:** پارە دان بە کـــەسی بەرتیلخـــۆر بۆ ڕاپەڕاندنی کـــارێک. ~ **وەرگـــرتن:** کەسێک کە بۆ جێ بە جێ کردنی کارێک پارە وەردەگرێ، بەرتیل خواردن.

**بەرتیلخۆر** (نا. ل ـ ئان. فا][بەرتیل + خۆر2] کەسێک کە هەتا پارە وەرنەگرێ کـارێک جێ بە جێ ناکـا، کـەسـێک کـە بەرتیل وەردەگرێ.

**بەرتیلخـۆریی** (حم.)[بەرتیلخـۆر + ئیی] ئەنجام و ئاکامی بەرتیل خواردن.

**بەرتێلانە** (نا. ل)[ئەر] دیاری و کەل و پەلێک کـە مـــاڵە زاوا بـۆ مـــاڵی بـووک دەنێرن، دیاری. // ناوتێلانە

**تێبینی:** ئەم وشـە زۆر سـانا دەیتـوانی لە بەرتیل کـەوتبێ [بەرتیل + ئانە] بەڵام وشـــەی ناوتێـــلانـە هـەر لەو زاراوەیـە ئەو باوەڕە دەفـەوتێنی کەوایە وشـەکە (بەر و ناو) ی هـەیە یانی لـە [بەر + تێل + ئانە] پێک هاتوە و دەبێ تێل مانایەکی هەبێ. من پێـمـوایە تێل هـەمـان تـوێڵ بە مـانـای نێوچاوانە و وشەکە دەبێتە دیارییەکە کە مـاڵە زاوا دەیدەن هەتا چاویان بە بووک بکەوێ یا نێـوچاوان و ڕوخسـاری بووک ببینن.

**بەرتێڵ** (نا.)[ئەر] بڕ: بەرتیل

**بـەرجـل** (نـا. ل)[بـەر + جـل] بـڕ:

**بەرجــووت** (نا. ل)[بەر + جــووت] بڕ: جوانەگا

**بەرجەوەن** (نا.)[ئەر] ١ـ بڕ: بەرژەوەند ٢ـ دیمەن، مەنزەرە.

**بەرجەوەند** (نا.)[موک] بڕ: بەرژەوەند

**بەرچا** (نا. ل)[بەر + چا] بڕ: بەرچایی

**بەرچاو** (نا. ل)[بەر3 + چاو] ١ـ هەر شـتێکی لە نزیک مـرۆڤ بێ و بە تەواوی هەسـتی پێـبکا. ٢ـ هەر شـتێکی بەری دیتن بگرێ. ٣ـ (مــجـ.) ئاشکرا، روون. ٤ـ (مـجـ.) کاری گرینگ یا شـتێکی زەق کــە خـــەڵک بیــبـــینێ یا ســـەرنجی بداتێ. **~ بوون:** زەق بوونی کەسێک یا شتێک دە نێو خەڵک دا. :: بەو سمێڵە زلانەت زۆر بـەرچاوی بزانـە هـەندێـکی کــورت ناکـــەیەوە. **~ تاریک بوون:** (کنـ.) زۆر تووڕە بوون و رق هەسـتـان و گـرینگایەتی بە هیـچ نەدان، هیچ نـەدیتن لـەبـەر تـووڕەیی. **لە ~ بوون:** ١ـ زەق بوون دە نێو کۆمەڵ دا، بەرچاو بوون. ٢ـ نزیک بوون و هەست پێکردنی شـتێک یا کــەســێک. ٣ـ ســەرنج دان، لە بـەر چاو گرتن. **لە ~ خستن:** بێزار بوون و پێ سووک بوونی کەسێکل یا شتێک بە هۆی کەسێکی دیکەوە. :: ئەوەندەت دۆڵمە بۆ ســاز کــردم هەتا لەبەر چاوت خــســتم. **لە ~ ســــووک بوون:** بێنرخ بوونی کــەســێک، لەبـەرچاو کــەوتن. **لە ~ کەوتن:** کەسێک یا شـتێک ئیدی خۆش نەویستن، ســووک بوونی کــەســێک یا شتێک لە بەر چاو. :: هەموو کـەست لە بـەرچاو بکەوێ منداڵەکـــەی خـــۆت لە بەرچاو ناکەوێ! **لە ~ گرتن:** سەرنج و گـرینگایەتی دان بە شــتێک، رە پێش گــرتن. :: ئەو قــســـانەی پێــمکوتی لە بەرچاویان بگری زەرەرێ ناکەی.

**بەرچاوتەنگ** (ئان. ل)[بـەر + چاو + تەنگ] ١ـ کـەسێک کـە توند دەسـتی بە ماڵی دنیاوە گرتوە و خەرجی ناکا، رژد، لەچەر. ٢ـ کـەسێک کـە چاوی تێـر نابێ، بە تـەمــاح، چاونـزێر. **~ بوون:** ١ـ رژد بوون، لـەچەر بـوون. ٢ـ بە تەمـــاح بوون، چاوتێر نەبوون.

**بەرچاوتەنگیی** (حم.)[بـەرچاو تـەنگ + ئیی] ئاکـامی کـردەوەی بەرچاوتـەنگ، رژدیی، لەچەریی.

**بەرچاوتێر** (ئان. ل)[بەرچاو + تێر] ١ـ کەسێک کە چاوی بە مـاڵی دنیا تێرە و تەمــاحی نیــە. ٢ـ دڵاوا، ســەخی. **~**

**بوون:** ١ـ بە تەمـــاح نەبوون، چاو تێــر بوون. ٢ـ دڵاوا و سەخی بوون.

**بەرچاوکە** (نا. ل)[بەر + چاو + کە] ١ـ قایشێکی ریشوو دار و هەندێک جار بە مت و مـــووروو رازاوەیە کـــە لە بەر چاوی ئەسپ و گـوێدرێژ و هێـســتـری دەدەن بۆ ئەوەی مـــێش ئازاریان نەدا. بەرچاوە، چاویلکە، پێــشــچـــاوکـــە، بەرچاوگە/٢. ٢ـ کوتە مقەوا یا لاستیکی بڕاو بە شکڵی لەتکە مانگ کە دوو لای کون دەکەن و بە کێش یا بەنێک لە پشت ســـەریان دەیبـــەسـتن و جـــووتێــر و دروێنەوان یا ئەو کـەسـەی لە لادێ لە بەر تاو کار دەکا دەیهێنێتە نێو چاوانی هەتا ئارەقـە نەڕژێتـە نێـو چاوی و هەتاو لە چاوی نەدا، تیلیـــســـــان، بەرچاوە، ئافتاوگەردان.

**بەرچاوگە** (نا. ل)[بەر + چاو + گە] ١ـ خـشـڵـێکی ژنانە پتر لە زێڕ سازی دەکرێ، لە سەری قایم دەکەن و خشڵەکە دەکەوێتە سەر نێوچاوانیان، پێشەسەر. ٢ـ بڕ: بەرچاوکە/١.

**بەرچاوە** (نا. ل)[بەر + چاو + ئە] بڕ: بەرچاوکە/١و٢

**بەرچایی** (نا. ل)[بەر + چایی] نان و چایی بەیانیان کە پتر ماست و پەنیرە یا کـــەرە و مـــرەبایە، بەرقلیـــان، بەرچا، بەرقەننە، قاوڵتوون، خورینی، چێشت، تاشتێ، ناشتا.

**بەرچن** (نا. ل)[بەر1 + چن (چنین)] بڕ: بەرچنە

**بەرچنۆکە** (نا. ل)[بەرچن + ئۆکە] بەرچنی چووکـــە کـــە بۆ مـــیـــوە و بەر چنینەوەی کەمتر کەلکی لێوەردەگرن.

**بەرچنە** (نا. ل)[بەر1 + چن (چنینەوە) + ئە] ســەوەتەیەکی دەسـچنە لە شـوول، شکڵی قووچە کە لە بنەوە بۆ سەرێ کەم کـەمـە زارکی گـەورەتر دەبێ و مـیـوەی چنراوی تێـــدەکـــەن، بەرچن، بەرچینە، تریان.

**بەرچەپ** (نا. ل ـ ئان. ل)[بەر + چەپ] پێچەوانە، دژ.

**بەرچیت** (نا. ل)[بـەر + چیـت] بڕ: بەرچیغ

**بەرچیخ** (نـا. ل)[بـەر + چیـغ] بـڕ: بەرچیغ

**بەرچـیـغ** (نـا. ل)[بـەر + چیـغ] ١ـ دارێکی هەندێک درێژە، چەند دانەی لە زەوی دەچەقـــێنن بۆ راگـــرتـنی چیغ و

چیــغی بـه دەوری دا دەکـێـشـن. ٢ـ ئەو دارانـەی کـــە لـە ســـــەر لاخـــێـــشـک دەچەقێندرێن هـەتا دەغلی دوراو لە سـەر خـێشک نەخزێن و نەکەون، قیـسپ. ٣ـ پەیاغ & بەرچیخ، بەرچیت.

**بەرچینە** (نا. ل)[بەر + چین + ئە] بڕ: بەرچنە

**بەرچێڵە** (ئا.)[بەر + چێڵ (مانگا) + ئە] ١ـ کـوتە چـەرمـێک کـە لە ملی گـا داچۆڕاوەتە خـــــوارەوە. ٢ـ (مــــجـ.) بەرخەبەبە

**بـەرچـێـن** (نـا. ل)[بـەر + چـێـن] بـڕ: بەربوورە

**بەرخ** (گیانـ.)[هەخ: ڤـەرمـەکە ـ سـان: ڤـورەنە، ڤـرنـە ـ پەه: ڤـەرەک، ڤـەررەک. تات: ڤـەرە ـ فـار: برە ـ بیر: بەررە ـ لۆر: بێـرە. باک: بـەرخ، بەرخک ـ نـاو: بەرخ ـ بـاش: وەرک ـ هـەو: وەرە ـ زا: ڤـــــارا، ڤـارەک، ڤەرا، ڤـەرە، ڤـەرەک] ١ـ بێچووی ساوای مەڕ هەتا شـەش مانگان. ـ ئەگەر مێ بوو بـەرخـــەمێ و ئـەگـــەر نێـــر بـوو بەرخـەنێری پێدەڵێن و دوای یەک سـالان دەبێـتـە کـاوڕ (کـاوڕەنێـر ـ کـاوڕە مێ) دوای ساڵێک تێوەڕسووڕان کاوڕ دەبێتە شەک. شەکی نێر پێی دەڵێن شەک بەران و شــەکی مێ پێی دەڵێن شـەک مـەڕ، کـە تەمـــەنی گـەیشــتــە چوار دەبنە مــەڕ و بەران. ٢ـ (مـجـ.) بۆ خـۆشـەویسـتی بە منداڵ دەکوترێ، رۆڵە گیان، بەرخۆڵە. ⁖ بەرخم، وامـەکە. بەرخی بابم دا چایەکی بێنە. ٣ـ یـەکـەم بـورج لە دوازدە بـورجی ئاسـمـــان کـە بەرابـەرە دەگـەڵ مـانـگی خاکەلێوە (عەر: حمل). ~ **فرچک دان:** یـەکـــەم ژەک کـــە دوای بوون دەدرێ بـە بەرخ. || **بەرخی ساوا:** بەرخـێک کـە تازە بوویـێ. **بەرخی مێ:** بـەرخـــەمـێ. **بەرخی نێـر:** ١ـ بەرخـــە نێـر. ٢ـ (کنـ.) منداڵی نێـرینە، کـوڕ. ⁖ بەرخی نێـر بۆ ســەر بڕینە.

**تێـبـینی:** ئەو خـۆشـەویسـتـییـە لەو ســـەردەمـــەوە مـــاوە کـــە کــورد ئاژەڵی راگـرتوە و مـالات ریزێکی تایبـەتیـان هـەبوە. هـەمـــوو دار و نـەداریان مـــەڕ و مـــــــالات بوە و بـە زاو و زوو داهـات و دەوڵەتیــــان زیاد بوە و بەرخ نوێنـەر و نیشـانەی زیاد بوونی ئەو دەوڵەت و مـاڵ بوە.

**بەرخڤـان** (نا. ل)[بەرخ + ڤـان][باک] بڕ: بەرخەلەوان

**بەرخک** (نا. ل)[بەرخ + ک][باک] بڕ:

**بەرخلێنە** (نا. ل)[بەر + خلێنە] هەر کـام لە دوو ددانی پێش خلێنە و دوای کـەڵپ کـە بە گـشـتی لە مـرۆڤ دا لە هەشت ددان پێک هاتوون.

**بەرخـوار** (نـا. ل)[بەر + خـوار] بڕ: بەرخۆر

**بەرخوێن** (نا. ل)[بەر + خـوێن] کچ و ژن و مـاڵێک کـە تاوانبـار بۆ مـەسـڵـەتی قـەتڵ و ژن هەڵگرتن دەبێ بیـدا هەتا مەسەلەکەی کۆتایی پێبێ، خوێنبایی.

**بەرخـۆر** (نـا. ل)[بەر + خـۆر] ئەو ئازووقـەی کـە بەر لە زسـتـان و وادەی دیاری کراوی دە کاری دەکەن و دەیخۆن، بەرخوار، پێشخۆر.

**بەرخـۆڵـە** (نـا. ل)[بەرخ + ئۆڵە] ١- بەرخی سـاوا. ٢- (مـجـ.)منداڵی خۆشەویست.

**بەرخـەبەب** (نـا. ل)[بەر + خـەبەب (غەبغەب) + ئە] پێستی داچۆڕاوی ژێر چەنەی مرۆڤی قەڵەو یا پیر، بەرغەبەبە، غەبغەب، غەبغەبە، بەرچێڵە.

**بەرخەگەل** (نا. ل)[بەرخ + ئە + گەل] رانێک کە هەمووی بەرخ بێ، گەلەبەرخ، بەرغەل، بەرخەل، بەرگەل.

**بـەرخـەل** (نـا. ل)[بەرخ + ئە + ل (گەل)] بڕ: بەرخەگەل

**بەرخـەلەوان** (نا. ل)[بەرخـەل + ئە + وان] کـەسێک کـە بەرخ دەباتە لەوەڕ و ئاگاداریان لێ دەکـا، شـوانی بەرخـان، بەرخـڤـان، بەرغـەلەوان، بەرخـەوان، بەرگەلەوان.

**بەرخـەمێ** (نا. ل)[بەرخ + ئە + مێ] بێچوو مەڕی مێینە. بەرخی مێ.

**بەرخەنێر** (نا. ل)[بەرخ + ئە + نێر] بێچوو مەڕی نێرینە، بەرخی نێر.

**بەرخـەوان** (نا. ل)[بەرخ + ئە + وان] بڕ: بەرخەلەوان

**بەرد** (نـا.)[پەش: دەبەرە. ئال: berg (کێو). لۆڕ: بەرد. باک: بەرد ـ ناو: بەرد ـ باش: بەرد ـ زا: بەر] ١- مادەیەکی رەق و سەختە کە چینی سەرووی زەوی پێک هێناوە و بە شکڵی جـۆراوجـۆر و ورد و دریشت لە خـیـزەوە هەتا رەوەز و چیـا هەیە، کـوچک، سـەنگ، کـەڤـر، تەوەن، کـەرا، کـەڕا. ؛؛ بەرد لە جـێی خـۆی سـەنگینە. ٢- بەرد، خـشـت، یا هـەر شتێکی دیکە کە قورسایی دیاری کراوی هـەیە و لـە تـایـەکی تـەرازووی داوێن بۆ

کێشانی کەل و پەل و کاڵا، سەنگ. ٣ـ مادەیەکی رەق و چووکە کە بە هۆی مادەی زیادی لەش لە سەر گورچیلە و زراو یا لە نێو موسڵدانە دا سازی دەبێ. ٤ـ (مجـ.) ویشک و رەق. :: ئەو چەسپە هێند کۆنە وەک بەردی لێهاتوە تازە بە کەلک نایە فرێی دە! ٥ـ (مجـ.) نەبزوون، بێجووڵە. :: ئەو کابرایە دەڵێی بەردە لەوێ راوستاوە هەر جووڵەی نایە. **بوونە ~ :** زۆر رەق بوون، ویشک بوون. **~ برین:** شکاندن و لەت کردنی بەردی رەوەز و شاخ بۆ کار و باری خانوو ساز کردن. **~ بە گومبەز دادان:** (کنـ.) کوفر کردن، سووکایەتی بە دین و ئیمان کردن. **~ لە سەر دانان:** (کنـ.) لە بیر بردنەوەی کار و مەسەلەیەک و ئیدی باس نەکردنەوەی. :: ئەو نێوان ناخۆشییەی تۆ و بابت هەرچی بوو گوزەرا، بەردێکی سەت پووتی لە سەر دانێ و تازە باسیشی مەکەوە. **~ لە ئەژنۆی خۆ دان:** (کنـ.) کارێک بە زەرەری خۆ کردن، زەرەر لە خۆ دان، خۆ کڵۆڵ کردن، ماڵە خۆ خراپ کردن. :: چەپرەوی وامان هەبوون کە لە عەینی نەخوێندەواری و نەزانی دا گاڵتەیان بەوجۆرە بیروبڕوایە دەکرد و بەردیان لە ئەژنۆی خۆیان دەدا (تاریک و روون ل ٣٩). **~ لێبارین:** (کنـ.) تووشی بەڵا و ناخۆشی بوون. **بەردی پەشیمانی لە چۆکی خۆ دان:** (کنـ.) پەشیمان بوونەوە لە کارێک و خەفەت پێوە خواردن. **لە ~ دان:** (کنـ.) بە فیڕۆ دان و فەوتاندنی شتێک. || **بەردی ئاسمانی:** بەردێک کە لە ئاسمانەوە دادەکەوێتە سەر زەوی. **بەردی بناغە:** ١ـ ئەو بەردانەی کە دوای هەڵکەندنی بناغە، دە بنچینەی داوێن و بناغەی لە سەر ئەو دادەڕێژن، بەردی بنچینە. ٢ـ (مجـ.) بنچینەی کار و مەسەلەیەک. :: بەردی بناغەی شێعری نوێی کوردیی لە سەر بەیتەکان داڕێژراوە. **بەردی بنچینە:** بڕ: بەردی بناغە. :: سەیلی هیجرت بەردی بنچینەی لە رەگ هێنامە دەر/ باری فیکرت قەددی راستی تێشکاندم وەک فەنەر (نالی ل ٢٠١). **بەردی بن گۆم:** (کنـ.) شتی لە دەچوو کە ئیدی نەدۆزرێتەوە. **بەردی جەهەننەم:** بەردێکی بریسکەداری مەیلەوبۆرە کە دوکتوران بۆ چاو و ددان کەلکی لێوەردەگرن، نیتراتی زێو، جەهەننەم داشی. **بەردی سارد و گەرم:** (کنـ.) ناخۆشی و بەڵا. ***بەردی سارد و گەرم وەبەر پێ (رێ، رێگا) هاتن:**

(کنـ.) تووشـی بـەڵا و ناخـــۆشـی ژیان هـاتن. ⁂ هیوادارم بەردی سـارد و گەرم نەیەتە بە پێت! بەردی ســارد و گــەرمت وەبەر ڕێگا نەیە! **بەردی سـەبوور:** ١ـ بەرد و ڕەوەزی سەخت کە هەمیشە لە سـەرما و گـەرمـا و بەفـر و باران دا سـەر جێی خـۆیەتی و نوێنەری سـەنگینی و تاقـەت هێنان لە بەرابـەر سـەختـی و ناخـۆشی دایە. ⁂ بەسـمـە بەش لەم دەهـرە تاهیـر شـێـوەیی بەردی سـەبوور / چونکە هـەر بێقیـمـەتی دێنێتـە بەر، پاڕانەوە (سـەید تـاهیـــری هـاشـــــمـی). ٢ـ بـەردێکـی ئەفسـایەییە کە خـەڵک دەردی دڵی خۆیان لە لای ئـەو دەکـرد. **بەردی ســەرشکێنە:** (کنـ.) شـتـی بێبـایـەخ و بێـمنـەت کـە لە هـەمـوو جێگەیەک هـەبێ. **بەردی سولەیمان:** بەردێکی جـوانـە کــە بۆ ســاز کــردنی هـەندێک کـەرەسـە وەک دەسکی گۆچان و شـتـی دیکە کەلکی لێـوەردەگـرن. **بەردی سەفرا:** بەردێکە کـە لە بەر نیشـتنەوەی مـــەوادی نێـــو زراو پەیدا دەبێ. **بەردی گورچیلە:** بەردێک کە لە بەر ئاوێتە بوونی ئەسیدگەلی میز دەگەڵ ماکەی دیکە پێک دێ و لە سـەر گـورچیلە پەیدا دەبێ و یا عـەمـەل دەکرێ یا ئەوە کە خـۆی بە ڕێی میز دا دێتە دەر. **بەردی محەک:** بەردێکی ڕەشـــــە کـــە زێرینـگەر زێڕ یا زێـوی ڕێدەخـشـێـنـێ و عـەیارەکـەی پـێ دیاری دەکـەن. **بەردی مـوسـڵـدان (مـیـزڵدان):** بەردێکە کـە لە بەر ئـاوێتـە بوونی مـیـز دەگەڵ ماکەکانی دیکە لە نێو موسڵدان دا ســاز دەبـێ. **بەردی مــەڕمـــەڕ:** بڕ: مـەڕمـەڕ. **بەردی ئەلحەد:** ئەو ڕیزە بەردەی کـە ســەری گـۆڕیچـەی پـێ دادەپۆشن. ***سـەر وە بەردی ئەلحەدێ کەوتن:** (کنـ.) درەنگ ئاگادار بوون و تێگەیشتن لە هەڵە و خەتا. **تێبینی:** گۆیا مردوو نازانێ کە مــردوە و کــاتێک لە نێــو گــۆڕ دا چاو دەکـــاتەوە و ســـەر هـەڵدێنـێ ســـەری وە بەردی ئەلحـەدێ دەکـەوێ و تـازە دەزانێ کە مردوە و ئیدی بۆ پەشیمان بوونەوەی کارە خراپەکانی درەنگ بوە.

**بەردار** (ئان. فـا)[بەر1 + دار1] دار و دەرختێک کە بەر بدەن، بەبەر.

**بــەرداش** (نــا. ل)[بــەرد + ئــاش1] بەردێکـی خـڕی گـەورەیە کـە تایبــەت بۆ ئاش دەیتاشن. ئاش لە دوو بەرداش پێک دێ کـە بەرداشـی بنەوە نابزوێ و ئەوەی ســەرەوە دەگـــەڕێ و دانەوێڵـــە دەهاڕێ، کـــەڤـــری ئاشی، بەردەهـاڕ، بەراش، ئارسـی.



**بەردانی** (ئان. ل)[بەرد + ئان + ئی]
بڕ: بەردەڵان

**بەرداوێژ** (ئان. فا)[بەرد + ئاوێژ] ١ـ کەسێک کە بەرد داوێ. ‌⁘ ئەحمەد بەرداوێژیکی چاکە. ٢ـ (نا. ل) مەودایەک کە بەردی هاویشتراو دیاری دەکا. ⁘ کەوەکە هەر بەرداوێژێک لێمان دوور بوو کەچی نەیتوانی بە تفنگەکەی بیەنگێوێ.

**بەرداوی** (ئا. ل)[بەرد + ئاوی] بڕ: بەردەڵان

**بەردباران** (نا. ل)[بەرد + باران] بڕ: بەردەباران. **~ کردن:** بڕ: بەردەباران کردن.

**بەردبڕ** (ئان. فا)[بەرد + بڕ] کەسێک یا کرێکارێک کە لە کێو بەرد دەبڕێتەوە و خۆی یا کەسێکی دیکە دەفرۆشێ و خەڵک بۆ خانوو ساز کردن لێیدەکڕن.

**بەردبڕیی** (حم.)[بەردبڕ + ئیی] کار و پیشەی کەسی بەردبڕ.

**بەردتاش** (ئان. فا)[بەرد + تاش] کەسێک کە بەردی مەڕمەڕ یا بەردی دیکەی پێویستی خانوو یا کێل لێک و لووس و ئامادە دەکا یا لە بەرد مجەسەمە و کەرەسەی دیکە ساز دەکا، بەردتراش، کوچکتاش.

**بەردتاشیی** (حم.)[بەردتاش + ئیی] کار و پیشەی کەسی بەردتاش، بەردتراشیی.

**بەردتراش** (ئان. فا)[بەرد + تراش] بڕ: بەردتاش

**بەردتراشیی** (حم.)[بەردتراش + ئیی] بڕ: بەردتاشیی.

**بەردڕانە** (نا. ل)[بەر + دڕ + ئانە] پارە شیرینی یا جل و بەرگی کۆن یا هەر شتێکی دیکە کە لە کاتی جل و بەرگی تازەدوراو دەیدەن بە دۆست یا بە دەست و پێوەند، بەردڕکانە، بەردڕەکانە.

**بەردڕکانە** (نا. ل)[بەر + دڕ + ک + ئانە] بڕ: بەردڕانە

**بەردڕەکانە** (نا. ل)[بەر + دڕ + ئە + ک + ئانە] بڕ: بەردڕانە

**بەردکاریی** (حم)[بەردکار + ئیی] ئەو کارانەی کە وەستا و بەننا لە کاری خانووبەرە دا بە بەرد دەیکەن. ⁘ ئەو دیوارە هەندێک بەردکاریی ماوە.

**بەردکێش** (نا. فا)[بەرد + کێش] ١ـ کەسێک کە بەردی پێویستی خانوو ساز کردن لە دەشت و چیا کۆ دەکاتەوە و لە ئاوەدانی دەیفرۆشێتەوە. ٢ـ (نا. ل)

جووتێک سەوەتە یا خەرەکەیە لە سەر پشتی گوێدرێژی دادەنێن و بەردی پێ دەکێشنەوە.

**بەردکێشیی** (حم.)[بەردکێش + ئیی] کار و پیشەی بەردکێش.

**بەردڵانە** (نا. ل)[بەر + دڵ + ئانە] پاروو نانێک کە کەسی برسی بەر لە نەهار و شام دەیخوا هەتا بەر دڵی بگرێ و هەتا وەختی خواردن تاقەت بێنێ، بەرکوت، نەوس بڕ.

**بەردناس** (ئان. فـا)[بەرد + ناس] کەسێک کە پسپۆڕی بەردە و لە زانستی بەردناسی دا شارەزایە.

**بەردناسیی** (حم.)[بەردناس + ئیی] زانستی چۆنیەتی و چلۆنایەتی بەرد و کانی جۆراوجۆرەکان.

**بەردە** (ئان.)[ئەو: ڤەرێتە - پەه: ڤەرتەک] ١ـ مرۆڤێک کە زوو بۆ خزمەت دەکڕدرا و دەفرۆشترا، غولام، کۆیلە، بەنی. ٢ـ ئەسیر، دیل.

**بەردە ئازەبە** (نا. ل)[بەرد + ئە + ئازەبە] بڕ: بەردەعازەبە

**بەردەباران** (نا. ل)[بەرد + ئە + باران] سزای کەسێکی تاوانبار بوە کە بە پێی داب یا ئایین بەردیان پێ داداوە، بەردباران، سەنگەسار. **~ کردن:**١ـ بەرد پێدادانی بە کۆمەڵ بە کەسێک کە ئایین یا دابی کۆن بە تاوانباری داناوە، بەردباران کردن. ٢ـ بەرد پێدادانی بە کۆمەڵی منداڵان بە کەسێک یا بە ماڵێک لە بەر رق و تووڕەیی. ꞉꞉ منداڵ لە بەر ئەوە کە کاک حەمە تۆپەکەی دڕاندبوون ماڵەکەیان بەردەباران کرد. ٣ـ پێدادانی بەرد بە شەیتان لە ئاهەنگی حەج، رەجم کردن. & سەنگەسار کردن.

**بەردەباز** (نا. ل)[بەرد + ئە + باز2] بەردێک یا چەند بەردە لە جۆگە و چۆمی کەم ئاو دایدەنێن وەها کە سەریان لە ئاو بە دەرەوەیە و خەڵک بە سەریان دا بازد دەدەن و خۆ دەپەڕێننەوە، پردەباز، بەردەواز، پێباز.

**بەردەبیرۆ** (نا. ل)[بەرد + ئە + بیرۆ] ١ـ جۆرێک بەردی زۆر سەخت، گرانیت. ٢ـ (مجـ.) سەختی و رەقی.

**بەردەبێر** (نا. ل)[بەرد + ئە + بێر] بەردێکە کە شوان لە سەری دادەنیشێ و سەری مەڕ و بزن بۆ بێری دەگرێ هەتا بیدۆشێ.

**بەردەپا** (نا. ل)[بەرد + ئە + پا] بڕ:



**بەردەپێ** (نا. ل)[بەرد + ئە + پێ] خڕکە بەردێکی سووکی رەش و کون کونە، کە پتر لە حەمام پانیەی پێی پێ دەشۆن هەتا تۆخی زێدە لێوە کا یا ئەوە کە بۆ تووک لێ کردنەوەی کەوڵ و لووس کردنی بەردی مەڕمەڕ کەلکی لێوەردەگرن، بەردەپا.

**بەردەتات** (نا. ل)[بەرد + ئە + تات] تەختە بەردێکی پان و گەورە و لێک و لووسە لە سەر کانی و حەوزی مزگەوت دایدەنێن بۆ نوێژ و جارجارە مردووشی لە سەر دەشۆن، تاتەبەرد، بەردەنوێژ، تاتەنوێژ، تات.

**بەردەچەخماغ** (نا. ل)[بەرد + ئە + چەخماغ] بڕ: بەردەچەرخ

**بەردەچەرخ** (نا. ل)[بەرد + ئە + چەرخ] بەردێکی چووکە لە کارخانە ساز دەکرێ و لە نێو چەرخ یا چەخماغی دەنێن بۆ هەڵکردنی، بەردەچەخماغ.

**بەردەخوێ** (نا. ل)[بەرد + ئە + خوێ] جۆرێک خوێی کلۆ گەورەیە کە وەک بەرد وایە وردی دەکەن و بۆ کاگڵ و بۆ دان بە ماڵات و هەندێک شتی دیکە کەلکی لێ وەردەگرن. ∷ مێگەلی تێر و تەسەل لێر و لەوێ / دێن و شاڵاو دەبەنە بەردەخوێ (هێدی ل ٢٢٤).

**بەردەرێژ** (ئان. ل)[بەرد + ئە + رێژ] حەسار، کۆڵان یا رێگایەک کە بەردیان تێ گرتبێ هەتا تۆز و خۆڵ و قوڕ و چڵپاوی نەبێ. ~ **کردن:** چنینی بەرد لە سەر زەوی بە رێک و پێکی بۆ هات و چۆ.

**بەردەزوورە** (نا. ل)[بەرد + ئە + زوور +ئە] بەردێکی سەخت و رەق و زوورە کە داس و چەقۆ و ئامرازی برینی پێ تیژ دەکەنەوە.

**بەردەس** (نا. ل)[بەر + دەس] بڕ: بەردەست

**بەردەسان** (نا. ل)[بەرد + هەسان] بڕ: هەسان

**بەردەساو** (نا. ل)[بەرد + ئە + ساو (سوون)] بڕ: هەسان

**بەردەست** (نا. ل)[بەر + دەست] ١ـ کەسێک کە بۆ هەڵسووڕانی کاروبار لە ژێر دەستی وەستا و کارزان کار دەکا. ٢ـ نۆکەر، خزمەتکار، کاردار. ٣ـ ژووری ماڵی دەوڵەمەند و ماڵدار کە بۆ دانیشتن و کاری نێو ماڵ تەرخان دەکردرێ. ٤ـ هەر شتێکی لە گۆڕێ دادەندرێ بۆ ئەو

که هەمیشە کەلکی لێوەرگری. ⁝⁝ قاپ و قاچاغی بەردەست، کتێبی بەردەست. & بەردەس، بەردەستان

**بەردەستان** (نا. ل)[بەردەست + ئان] بڕ: بەردەست

**بەردەستیی** (حم.)[بەردەست + ئیی] ١ـ کار و ئیشی کەسی بەردەست. ٢ـ خزمەتکاریی، نۆکەریی.

**بەردەستێ** (نا. ل)[بەرد + ئەستێ] بەردێکی سەخت و ساف و سپی و لووسە کە بە ئەستێ لێیدەدەن و پریشکی لێدەبێتەوە و پووشوو ئاگر دەگرێ، هاوتای ئەستێ، بەردەئەستێ.

**بەردەشۆڕ** (ئان. ل)[بەرد + ئە + شۆڕ] کاری جوێ کردنەوەی بەرد لە دانەوێڵە. ~ **کردن:** جوێ کردنەوەی بەرد لە دانەوێڵە. دانەوێلە لە دەفرێک دەکەن و ئاوی تێدەکەن، دوایی ئاو و دانەوێڵەی سەر ئاو لە قاپێکی دیکە دەکەن و بەرد کە قورسترە لە بنەوە دەمێنێتەوە، ئەم کارە چەند جارێک دووپاتی دەکەنەوە هەتا دانەوێڵەکە خاوێن دەبێتەوە.

**بەردەشیر** (نا. ل)[بەرد + ئە + شیر] بەردێکی کانییە، مادەیەکی سپی تێدایە و کاتێک دە نێو ئاو دا بیسوون ئاوەکییەکی وەک شیری لێ ساز دەبێ.

**بەردەعازەبە** (نا. ل)[بەرد + ئە + عازەب (عەزەب) + ئە] گاشە بەردێکی زەلامە گەنج و جحێڵ هێز و قەوی خۆیانی پێ بە تاقی دەکەنەوە، ئەوەی بتوانی هەڵیهێنێ عەزەب بوە و گەیشتۆتە تەمەنی ژن هێنان، بەردەئازەبە.

**بەردەفرۆش** (نا. فا)[بەردە + فرۆش] کەسێک کە بەردە و غولامی لە بازاڕ دەفرۆشت.

**بەردەفرۆشیی** (حم.)[بەردە فرۆش + ئیی] کار و پیشەی کەسی بەردەفرۆش.

**بەردەقانی** (نا. ل)[بەرد + ئە + قانی؟] ئامرازی کۆنی شەڕ و راوە کە لە بەن دەچندرێ، دوو لۆی درێژە کە نێوەڕاستەکەی پانە و بەردی تێدەنێن، دوایی دوو لۆیەکە دەگرن و هەڵیدەسووڕێنن و بەرەو ئامانج لۆیەکی بەر دەدەن و بەرد دەردەپەڕێ. زوو بۆ شەڕ و راو کەلکیان لێوەرگرتوە و ئێستاکە شێوەکەی گۆڕدراوە و جیر و دوولکی لێ زیاد بوە و منداڵ بۆ راوی مەلی چووک دەکار دەکەن، قۆچەقانی، قەڵماسک، قەڵماسەنگ.

**بەردەقسڵ** (نا. ل)[بەرد + ئە + قسڵ] بەردیکە لە کانی دەردەهێندرێ، دە کوورە دەهاویشترێ و قسڵی لێ پەیدا دەبێ و لە کاری خانوو ساز کردنیش دا دە کاری دەهێنن.

**بەردەقەبر** (نا. ل)[بەرد + ئە + قەبر] بڕ: کێل

**بەردەگۆنجە** (نا. ل)[بەرد + ئە + گۆنجە] بەردێک کە بەری کونی گۆل و ئەستێری پێدەگرن.

**بەردەگەچ** (نا. ل)[بەرد + ئە + گەچ] بڕ: بەردەگێچ

**بەردەگێچ** (نا. ل)[بەرد + ئە + گێچ] بەردێکە وەک بەردەقسڵ کە دە کوورە دا دەیپێژن و گێچی لێ پەیدا دەبێ، بەردەگەچ.

**بەردەلینگ** (نا. ل)[بەر + دەلینگ] کوتە پارچەیەکە لە بن دەلینگی پاتۆڵ و رانک دا دویدروون هەتا دەلینگ درەنگتر بدڕێ و بسوێ و شەقیشی راگرێ.

**بەردەڵان** (نا. ل)[بەرد + ئە + ڵان] شوێن و جێگا و رێگایەک کە بەردی زۆر بێ، بەردانی، بەرداوی.

**بەردەم** (نا. ل)[بەر + دەم] ١- پێش و دەمی شوێنێک. ‼ بەردەمی ماڵ، بەردەمی دوکان. ٢- بەرابەر، ئاست، حوزور. ‼ لە بەردەمی من درۆیان دەکەی.

**بەردەمۆر** (نا. ل)[بەرد + ئە + مۆر] بڕ: بەردەمۆرە

**بەردەمۆرە** (نا. ل)[بەرد + ئە + مۆر + ئە] خاک و گڵی دەور و بەری قەبری ئیمامەکان و شوێنی پیرۆز لە لایەن شیعەکانەوە کە لە قالب دەدرێ و دەیپێژن و لە کاتی نوێژ کردن نێوچاوانی لە سەر دادەنێن، بەردەمۆر.

**بەردەمووروو** (نا. ل)[بەرد + ئە + مووروو] بەشێکە لە کەرەسەی ئاش. بەردێکە لە بنەوەی بەرداش و تەوەرەی لە سەر دەسوورێ.

**بەردەمووکانە** (گیا.)[بەر + دەمووکانە] پنجە دارێکی چووکە لە بن و سەرلقی دارمازوو و هەندێک داری دیکە دەردەچێ، بەرێکی وردی وەک ساواری هەیە کە شیرەیەکی چەسپ و لینجی سەوزی لێدەبێتەوە بۆ برین، لا بردنی موو، راو و هەروەتر لە سەنعەت دا کەلکی لێوەردەگرن، دەمکانە، دمکانە، دەنووکە، دەمووکانە، بەردەمووکە،

موخوڕ.

**بەردەمووکە** (گیا.)[بەر + دەمووکە] بڕ: بەردەمووکانە

**بەردەنوێژ** (نا. ل)[بەرد + ئە + نوێژ] بڕ: بەردەتات

**بەردەنووس** (نا. ل)[بەرد + ئە + نووس1] نووسراوەی سەر بەرد، نووسراوەیەک کە لە سەر بەرد هەڵقەنرابێ.

**بەردەواز** (نا. ل)[بەرد + ئە + واز] بڕ: بەردەباز

**بەردەوان** (ئان. ل)[بەرد + ئە + وان] کەسێک کە بە سانایی بە ڕەوەزە بەرد و زەرد و ماهان دا هەڵدەگەڕێ، ڕازەوان، شاخەوان.

**بەردەهاڕ** (نا. ل)[بەر + ئە + هاڕ (هاڕین)] بڕ: بەرداش

**بەردەستێ** (نا. ل)[بەرد + ئە + ئەستێ] بڕ: بەردەستێ

**بەردەیی** (حم.)[بەردە + ئی] بەردە بوون، غوڵامی. ٢ـ ئەسیری، دیلی.

**بەردەی** (گیا.)[عەر: بردی] جۆرێک قامیشە لە تیرەی جەگەن، دوو هەتا چوار گەز بەرز دەبێتەوە، لە سەرەوەی پرزەکانی چەترێکی جوان ساز دەکەن، لە دەم ڕووبار شین دەبێ، لەم گیایە جۆرێک کاغەز بە ناوی پاپیرۆس ساز دەکەن، Cyperus papyrus ناوی لاتینی ئەم گیایەیە، پاپیرۆس.

**بەردیل** (گیانـ.)[باک: بەردیل، بەلندیر ـ ناو: بەردیل ـ زا: بەلەندیرە] بەرخە مێیەکی دوو ساڵی تەواو کردبێ و پێی دە سێ ساڵەی نابێ، شەک مەڕ.

**بەردیلزا** (گیانـ.)[بەردیل + زا] بەرخەنێری سێ ساڵە، شەک بەران.

**بەردین** (ئان. ل)[بەرد + ئین] هەر شتێکی لە بەرد یا بە بەرد ساز کرابێ، بەردینە. ⁂ ئاونگی بەردین، دیواری بەردین.

**بەردینە** (ئان. ل)[بەرد + ئینە] بڕ: بەردین.

**بەرڕاو** (نا. ل)[بەر + ڕاو] لای خوارەوەی ڕاو. // سەرڕاو. ~ **لێگرتن:** لای خوارەوە لە نێچیر گرتن. ⁂ ئەوە ئاغام ئەمن دەڵەم سەرڕاو و بەرڕاوی لێبگرن / ئەوە مامزی من گەلێکە شوومە ...(پایزە ل ٥٣)

**بەرز** (ئان.)[هیک: وەردە ـ ئێک: بەرزیا، بەرێزیەهـ، بێرێزەنت ـ ئەو: ڤەرز،

بێــرێز، بەرێز ـ پەهـ: بورز، بورژ، بۆرز. کرم: بۆرز. باک: بەرز ـ ناو: بەرز ـ باش: بەرز ـ هـەو: بەرز ـ زا: بەرز، بەرژ، بارز] ١ـ درێژ و بڵـیند بە باری قـیـتی دا. ؛؛ بالابەرز، کـێـوی بەرز. ٢ـ شـتـێک کـە وە ئـاســـمـــان کـــەوتـوە و لـە زەوی دوور کـــەتـۆتـەوە، یـا ئـەوەکــــە پـەیوەنـدی بـە زەوییـــەوە نـیـــە، بڵند. ٣ـ تـوند و زیـاد لە باری حاڵەتەوە. ؛؛ دەنگی بەرز. ٤ ـ بڵند و بە نـرخ لە باری کـەسـایەتیـیـەوە. ؛؛ پیاوی بـەرز، شاعیری بەرز، زانای بەرز.

**~ بوون:** بڵند بـوون. **~ بوونەوە:** ١ـ هـەســـتـــان، بڵند بـوون. ؛؛ کـــاتێک مـامـوەسـتـا هاتە ژوور هـەمـوو لە بەری بەرز بوونەوە. ٢ـ وە حـەوا کـەوتن، بڵـیند بوون و لـە زەوی جـــیـــا بـوونـەوە. ؛؛ بادەوەکـە هێندە بەرز ببۆوە بە ئـاسـتـەم دەدیـتـــرا. ٣ـ زیـاد بوونـی پلـە و پایـە. ؛؛ لەوەتی بۆتە دوکتور لە بەر چاوی خـەڵک بەرز بۆتەوە. **~ کردن:** ١ـ زیاد کردن و بڵیند کردنی دەنگ. ؛؛ رادیۆکە بەرز کە بزانـین دەڵـێ چـی. دەنگـت هـێنـدە بـەرز مەکە ئەو منداڵانە نوستوون. ٢ـ برِ: بەرز کردنەوە. **~ کردنەوە:** ١ـ هەستاندن لە خەو. ؛؛ برۆ ئەو منداڵانە بەرز کەوە رۆژ درەنگە. ٢ـ هـەڵێنان، بڵـیند کـردن. ؛؛ بـارەکـــەی بەرز کــــەوە. دەســـــتی بـەرز کـــردەوە. ٣ـ لـە ســــەر یـەک هەڵچـنین و دانان. ؛؛ ئەو فـەردە ئاردانە ئـالێرە بەرز کـەوە. ٤ـ کەسـێک یا شـتـێک هێنانە بە باس و نرخ پێدان. ؛؛ مەسەلەی کوردیان زۆر بـەرز کـــردۆتـەوە. کـــابرایـان بـەرز کردەوە و کردیانە رێبەری خۆیان.

**بەرزاخ** (نـا. ل)[بـەر + زاخ] داوێـنـی چیا، بەرکاو، بەرقەد.

**بەرزایی** (نـا. ل)[بـەرز + ئـایی][ئەو: بـەرێـزیـەهـ] ١ـ بـڵـنـدایـی، بـڵـنـدی. ٢ـ درێژایـی. ٣ـ (نا.)[ئەو: بـەرێزەهـ] کـێـو، ترۆپکی کێو. & بەرزێتی.

**بەرزگ** (نـا. ل)[بـەر1 + زگ] ١ـ بـرِ: بەرمـسـوڵدان ٢ـ شـوێنی لای خـوارەوەی ئـەو گـیـــاندارانـەی لە ســــەر چوار پـێ دەرِۆن. ؛؛ ئەو گوریســەی بە بەرزگی ئەو یەکسمە دا بێنە بیدە بە من. & بەرسک

**بەرزە1** (نا. ل)[بـەرز + ئە] حــەیوانی کـەوی گـەورە، مـاڵات و حـەیوانی لە چاو ئـاژەڵ گــــەورەتر وەک کــــەڵ، ئـەسـپ، گوێدرێژ، گا و مانگا.

**بەرزە2** (ئان.)[باک] برِ: بزر

**بەرزەبڵێس** (نا. ل)[بەرز + ئە + ب + لێس (رێس ـ رێسـتن)] کــەســێک کــە

هەڵدەداتە نێو قسـان و زۆری لە سـەر دەڵێ.

**بەرزەپا** (ئاک. ل)[بەرز + ئە + پا] بڕ: بەرزەپێ

**بەرزەپەڕ** (ئان. ل)[بەرز + ئە + پەڕ] بڕ: بەرزەفڕ

**بەرزەپێ** (ئاک. ل)[بەرز + ئە + پێ] بەرزەپا، یەک پێ. ~ **هەستان:** دەست بەجێ لە سەر جێی خۆی هەستان لە کاتی وەژوور کەوتنی ماموەستای فێرگە یا کەسێکی گەورەتر لە شوێنی دیکە. ∷ هات سڵاوی کرد، خانۆ بەرزەپێ لە بەری هەستا، ...(دمدم ل ١٣٦)

**بەرزەجرە** (گیان.)[بەرز + ئە + جرە] جۆرێک سیسرکی دەشتییە. گیاندارێکی چووکە وەک کوللە بەڵام چووکتر، رەنگی کەسکە، لە دەشت و چۆڵایی و نێو دەغڵان دا دەژی، گیای دەخوا و هەمیشە دەنگی دێ، بەرزەجـوڕە، بەرزەچڕە، جرجرە. (فار: جرواسک. عەر: صرار)

**تێبینی:** جـڕ، جـوڕ و چڕ هەرچەند وشەدەنگن بەڵام لە ریشـەی سـرو sru ـ ی ئەوێسـتایی و چڕین ـ ی کـوردیی بە مانای کوتن و خوێندن کەوتوون. کە بە گشتی مانایان دەبێتە بەرزەبێژ، بەرزخوێن.

**بەرزەجوڕە** (گیان.)[بەرز + ئە + جوڕە] بڕ: بەرزەجرە

**بەرزەچڕە** (گیان.)[بەرز + ئە + چڕە] بڕ: بەرزەجرە

**بەرزەحەوایلە** (نا. ل)[بەرز + ئە + حەوا + ئیلە][ئەر] بڕ: بەرزەهەوایلە

**بەرزەخ** (نا.)[عەر: برزخ] مەودای نێوان دونیا و ئاخـرەت لە سەرەتای مەرگ هەتا قیامەت.

**بەرزەدەماخ** (ئان. ل)[بەرز + ئە + دەماخ] بڕ: بەرزەلووت. ∷ بۆ کەسێکە مەی دڵی پڕ بێ لە داخ / بۆچی لێی بخواتەوە بەرزەدەماخ (ناڵەی جودایی ل ١٢).

**بەرزەدەماغ** (ئان. ل)[بەرز + ئە + دەماغ] بڕ: بەرزەلووت.

**بەرزەفڕ** (ئان. ل)[بەرز + ئە + فڕ] ١ـ باڵندەیەک کە لە بەرزایی دەفـڕێ وەک هەڵۆ و باز و ...٢ـ (کنـ.) کەسێک کە بیر لە خەیاڵ و کاری گەورە دەکاتەوە. & بەرزەپەڕ.

**بەرزەکی بانان** (ئان. ل) [بەرز + ئەک + ئی + بان + ئان] ١ـ گیاندارێکی

خـەیاڵی نێـو چیـرۆکـانە، زۆر درێژ و باڵابەرزە، هەمـیـشـە لە سـەر بانان رادەوەستێ و خۆ نیشانی خەڵک دەدا یا بە پێلاقە لە بان دەکوتێ و خەڵک بانگ دەکا و کاتێک خەڵک چوون لە بەر چاوان ون دەبێ. ٢ـ (مـجـ.) کـەسـێک کـە بێ هەست و خـوست لە گـیـر و گـرفت و گـۆنگەڵێک خـۆی دەرباز دەکـا. ٣ـ (کنـ.) لاوی قـۆز و دڵتـەر کـە لە گـوێسـوانەی بانان رادەوەستێ و حەزلێکردوویی دەکا (لە دێهـات). ٤ـ (کنـ.) کـەسێک کـە هیچ کارێک نەکا و تەنیا خـەریکی دڵتـەڕیی و رابواردن بێ، بێکار. :: نە خـەرج و باج دەدەن، نە بێگار و سوخرەکێشی دەکەن، ئەوە چەند سـاڵە بـۆ خـۆیان، وەک بـەرزەکی بانان، ئاسـوودە و تەرخـان دەژین (دمدم ل ٣٣٩).

**بەرزەگەوە** (گیا.)[بەرز + ئە + گەوە] قـیـسـپـێکی هەڵنەپاچراوە ئەکـرێ بە پەرژین بە بێ تەنین (خاڵ ب ١ ل ١٥٦).

**بەرزەلنگ** (گـیـا.)[بەرز + ئە + لنگ] گـیـایەکی بۆنخـۆشی خـۆڕسکی چەند سـاڵەیە، لە تیـرەی نەعنا، هـەتا نیـوگـەز بەرز دەبێتەوە، گەڵاکانی درێژ و باریکن، گوڵەکانی چووک و هێشوویی شین، مۆر یا سـوورن و بۆ دەرمـان کـەلکی لێـوەردەگـرن، Landula stoechas ناوی لاتینی ئەم گیایەیە، بەرزەلینگ.

**بـەرزەلـووت** (ئـان. ل)[بـەرز + ئـە + لووت] کـەسی بە پۆز و بە دەعـیـە کـە لووتی لە سـەرەوەیە، بە پـۆز، بە دەعێ، بەرزەدەمـاخ، بەرزەدەمـاغ، لەخـۆ رازی. **~ بوون:** بە دەعێ بوون، کـەسێک کە لووتی لە حەوایە.

**بـەرزەلـووتـە** (ئا.)[بـەرزەلووت + ئـە] ئەنگوستی سێهەمی دەست، ئەنگوستی نێوان براتووتە و شادە. (بڕ: باڵابەرزە)

**تێـبـینی:** چونکە ئەم ئەنگوسـتـە لە هەمـوو ئەنگوسـتـە کـانی دیکە بەرزترە، پۆز لە سـەر ئەوانی دیکە لێـدەدا و بۆیە ئەو ناوەی لێنراوە.

**بەرزەلینگ** (گیا.)[بەرز + ئە + لینگ] بڕ: بەرزەلنگ

**بـەرزەولاخ** (نـا. ل)[بـەرزە1 + ولاخ] ولاغی بەرزە، ئەسپ و یەستر.

**بـەرزەهەوایـلـە** (نـا. ل)[بـەرز + ئـە + هـەوا + ئیلە][ئەر] ١ـ بڕ: بادەوە/١. ٢ـ کایە و یارییـەکی منداڵانە کە بەرد داوێنە حـەوا هـەتا بزانن کـامـەیان لە هـەمـوان بەرزتری داوێ. & بەرزەحەوایلە.

**بــەرزی** (ئــان. ل)[بــەرز + ئــی] ١ـ بڵندی، ســـەروو. // نزمی. ٢ـ درێژی، درێژایی. ٢ـ گەورەیی، مەزنی.

**بەرزیلان** (نا. ل)[بەرز + ئیل + ئان] [ئەر] یاری و کـایەی شـێـر و خــەت، پوولێک کـە دەیهاوێنە حـەوا و دوو کەس هـەرکــام لایەکی دەڵێن و بـە باری هـەر کامیان داکەوێ ئەو بردوویەتەوە، شێر یا خەت.

**بەرزین** (ئان. ل)[بەر + زین] حــاڵی جوانوو ئەسپ یا ماینێک کە وەختی زین لێنانی گـەیشـتـبێ و بۆ سـواری دەست بدا.

**بەرزێتی** (نا. ل)[بـەرز + ئێــتی] بڕ: بەرزایی

**بەرژ** (ئان.)[زا] بڕ: بەرز

**بەرژەنە** (نا. ل)[بـەر + ژەن (ژەندن) + ئە] ١ـ بڕ: بەرەمەشکە. ٢ـ بڕ: بەرژەنەک

**بەرژەنەک** (نا. ل)[بەر + ژەن (ژەندن) + ئەک] ئامـرازێکی جـۆڵاییـە کـە پێک هاتوە لە دوو چێـوی پان کـە یەکـیـان پـانتـــرە و دە باڵ یەک بەزێنراون و بـە ئانیـشکە دەنوشـتـێـتـەوە، ئەم دارە لە پانایی تـەنراوەکە قـایم دەکـەن هەتا هەم تەنراوەکـە رێک و راست رابوەســتێ و هەمیش خوار و گێڕ نەبێ، بەرژەنە.

**بـــەرژەوەنـــد** (نـــا. چـــا)[ئـــەو: ڤـەرێچـەهڤـەنت ـ پەه: ڤـەرچاڤـەند، ڤـــەرجـاڤـــەند. باک: بـەرژەوەند ـ نـاو: بەرجـەوەن، بـەرجـەوەند، بـەرژەوەند] ١ـ قـســە و کـردوەیەک خـێـر و قـازانجی تێدابێ، قازانج، خـێر. ٢ـ مـەسڵـەحـەت. **بە ~ بوون:** بە قـازانج بـوون، بە خـێـر بوون. **بە ~ زانین:** بە دروست زانینی کردەوەیەک کە پێت وایە قازانجی هەبێ. ፨ بە بـەرژەوەندی نـازانم بەو زســتــانە سەفەر بکەی.

**تێـبـینی:** ڤـەرێچـەه varečah لە ئەوێستا دا و ڤەرچ varč یا وەرج varj لە پەهلەویی دا و ڤـەرچەس varčas لە سـانسکریت دا بە مـانای هێـز و وزە و وچە و وەج هاتوە و ڤەرێچەهڤەنت -var ečahvant لە ئەوێستـا دا ئاوەڵناوە بە مـــانـای بە وزە و بە وچە و بـەهێـــز. بەرجـەوەند یا بـەرژەوەند بە پێی باوەڕی زەردوشـتــەکــان دوای مــردنی کــەی گوشتەسپ وەرج نەگەیشتە کەسی دیکە و ئەهوورامـەزدا هەتا نزیک قـیامـەت بۆ ئارییایەکانی هەڵدەگرێ و سۆشیانت بەو وزە و وچەیە وە دیار دەکـەوێ و دنیـا پڕ دەکا لە خێر و خۆشی. لە زمانی کوردیی

دا گـەلێک وشـە دوای لە بەین چوونی دینەکەیان و هاتنی ئیسلام نەماوە بەڵام وشـەکان هەر ماون و مانای دیکەیان بەخۆوە گرتوە.

**بەرژەوەندیی** (حم.)[بەرژەوەند + ئیی] بە قـازانج بوون، بە بەرژەوەند بوون، سـەلاح. :: بەرژەوەندیی من و تۆ لەوە دایە کـە چی دیکە شـەریکایەتی نەکەین.

**بەرسڤ** (نا.)[؟][باک] وڵام، جـواب. ~ **دان:** وڵام دانەوە، جواب دانەوە.

**بەرسک** (نا. ل)[بەر + سک] بڕ: بەرزگ

**بەرسمبێل** (نا. ل)[بەر + سمبێل] [باک] بڕ: بەرسمێڵ

**بەرسمێڵ** (نا. ل)[بەر + سمێڵ] تووکی زیادەی سمێڵ کە سەر لێوی داپۆشیوە و موسڵمان پێیان حەرامە و دەیکەن، بەرسوێڵ، بەرسمبێل. :: قـەپۆزت دانەپۆشێ بەر سمێڵت / بە سەر ملتا نەیێ وەک یاڵی کەمتیار (شێخ رەزا). ~ **کردن:** کـردن و قـرتاندنی تووکی زێدەی سمێڵ وەها کە سەر لێو دانەپۆشێ.

**بەرسوورکە** (گیانـ.)[بەر + سوور + کە] حەشـەرەیەکی چووکی ناومالانە، رەنگی ئامـاڵ سـووورە، زۆرتر لە ئاشپەزخانە و ژێرزەوی دەبێ. ئێستاکە جـۆری گـەورەی پەیدا بوە کـە گـۆیا تۆوەکەی لە ئامریکاوە هاتوە، باڵی هەیە و هەڵدەفڕێ.

**بەرسەری** (نا. ل)[بەر + سەر + ئی] [باک] بڕ: باڵنج

**بەرسەم** (نا.)[ئەو: بەرێسمەن ـ پەه: بەرسـەم] شـووڵی باریکی دارهەنار یا سیمی باریکی مسی یا زێو کە لێکی دەبەستن و لاگرانی ئایینی زەردەشتی بۆ دوعـا و ئاهەنگی تایبـەتی کـەلکی لێوەردەگرن.

**بەرسیلە** (گیا.)[بەر + سیلە] ترێیەک کە هێشتا شیرن نەبوە، قۆرە، پەسیرە، پەسیلە، هاڵە، بەسیرە، هارسم، شلوور.

**تێبینی:** سیلە یا سیرە هەمان شیرە یا شـیلە ـ ن بە لە بەرچاو گـرتنی ئاڵوگـۆڕی دوو پیـتی س و ش دەگـەڵ یەکتر کە وێنەی لە کۆنەوە بۆ ئێستا و لە نێـو زاراوەکـانی کـوردییش دا زۆرە (شەوتان، سووتان ـ سووژن، شووژن). سیلە یا شیلە خۆی لە کشـیـیرە ـ ی هیندیی کۆن و خشییرە ـ ی ئەوێستایی

و شیر ـ ی کوردیی کەوتوە.

**بەرغــەبەبە** (نا. ل)[بەر + غــەبەب (غەبغەب) + ئە] بڕ: بەرخەبەبە

**بەرغەڵ** (نا. ل)[بەرخ + ئە + گەڵ] بڕ: بەرخەگەڵ

**بەرغــەڵەوان** (نا. ل)[بەرغــەڵ + ئە + وان] بڕ: بەرخەڵەوان

**بەرف** (نا.)[پاک] بڕ: بەفر

**بەرفـــرە** (ئان. ل)[بەر + فـــرە] بڕ: بەرفرەوان

**بەرفرەوان** (ئان. ل)[بەر + فرە + وان] حاڵی هەر شتێکی پێش و بەری ئاوەڵا و پان و بەرین بێ، بەربەرین، بەرفرە.

**بەرق** (نا.)[عـــەر: برق] ١ـ هێـــزێکی ئەلکتریسیتە کە بە هۆی سووڕانی دینام و توورب‌ین ئینێرژی ئەلکتریسیتە پێک دێ و ئەویش بە سیم دا دەچێتە نێو پریز و کلیلی بەرق و ئینێرژی دیکە وەک گەرما یا رووناکی ساز دەکا، کارەبا، برق. ٢ـ شـۆق، گرشـە، بریقە. ٣ـ برووسک. ∴ لە پاداشـی قـــسـەی سـەردا هەمـــە ئاه و هەناسەی گەرم / کەسێ شێتانە بەردم تێگرێ من بەرقی تێـدەگـرم (مـەحـوی ل ٢١٩). ~ **گـرتن:** دەست وە سـیـــمی رووتی بەرق کەوتن کە دەبێتە هۆی فڕێ دانی ئەو کەسە و تەنانەت کوشتنیشی.

**بەرقلیان** (نا. ل)[بەر3 + قلیان][ئەر] بڕ: بەرچایی

**بەرقلیــانی** (نا. ل)[بەر3 + قلیــان + ئی][ئەر] بڕ: بەرچایی

**بەرقەد** (نا. ل)[بەر3 + قەد] بەشێک لە کێو و چیا کە دەکەوێتە نزیک داوێن و بنار، نێوان بنار و نێوقەدی کێو، بەرکاو.

**بەرقــەرار** (ئان. ل)[بەر + قــەرار] ١ـ هەرکــەس یا هەرچی کــە بمێنێــتــەوە و نەفـــەوتێ. ٢ـ ســـازدراو، پێک هاتوو، قەراردراو.

~ **بوون:** ١ـ مـان، مـانەوە، نەفـەوتان. ∴ بەرقـــەرار بێ عــەداڵەت و ئازادی! ٢ـ ساز دران، قەرار دران

~ **کـــردن:** ١ـ مـــانەوە، نەمـــردن، نەفـــەوتان. ∴ خـــودا بەرقـــەرار و راوەستاوت کا!. ٢ـ ساز دان، قەرا دان

**بەرقــەننە** (نا. ل)[بەر + قــەننە] بڕ: بەرچایی

**بەرک** 1 (نا.)[پاک] بڕ: گوللە

**بەرک** 2 (نا.)[پاک] بڕ: بەریک

**بەرک**$^{3}$ (نا.)[؟] ئەستێرەیەکە بە عەرەبی پێی ئەڵێن: شعرای شامی (خاڵ ب ١ ل ١٥٧). ئەستێرەیەکی گەشە لە کەلووی سەگی چووک (کلب اصغر) دا.

**بەرکـار** (نا. ل)[بەر3 + کـار] هەر شتێکی لە بەرەوە داندرابێ بۆ دە کار کردن یا کار لە سەر کردن.

**بەرکاز** (نا. ل)[بەر8 + کاز][باک] بڕ: پەنجەرە

**بەرکـاو** (نا. ل)[بەر3 + کاو5][ئەر] بڕ: بەرقەد

**بەرکـوت** (نا. ل)[بەر3 + کـوت1] ١ـ هەندێک دەغڵی درواو کە لە بەر پێویستی نێو ماڵ جیا دەکرێتەوە و زووتر لە دەغڵەکانی دیکە سووری دەکەن، تەخترمە، تەختەمە، تەخدەمە. ٢ـ (مجـ.) هەندێک چێشت یا خواردنی دیکە بەر لە نەهار یا شێو بۆ بەردڵ گرتن. **~ کـردن:** خواردنی هەندێک چێشت بەر لە ژەمەکان بۆ بەردڵ گرتن.

**بەرکوڵ** (نا. ل)[بەر3 + کوڵ (کوڵین)] هەندێک چێشت بەر لەوەی بە تەواوی ئامادەی خواردن بووبێ یا کاتی نەهار یا شێو گەیشتبێ، بەرکەل، سەرکوڵ، بەردڵانە، بەرهەڵێنج، نەوسەبرە، وەرکوڵ. **~ کردن:** خواردنی بەرکوڵ بەر لەوەی بە تەواوی کوڵابێ.

**بەرکـۆ** (نا. ل)[بەر3 + کۆ1][ئەر] ١ـ گۆپکەیەکە لە لای پێشەوەی زین کە لە کاتی سوار بوون دەستی پێوە دەگرن یا ئەوە کە دەستەجڵەوی پێدادەکرێ، قەرپووز. ٢ـ هەرچی کە سوار لە پێشەوەی خۆی دابنێ.// پاشکۆ. & پێشکۆ.

**تێبینی:** کۆ بە مانای زین و بە تایبەت بە مانای بەرزایی پاش و پێشی زین ـ ە و لە یەک دوو وشەی دیکەش دا دەبیندرێ وەک پاشکۆ و پێشکۆ. کۆ لە کەڤە kava ـ ی ئەوێستایی بە مانی کۆم، کوور کەوتوە و هاوریشەیە دەگەڵ کێو و کۆ (بڕ: کێو)

**بەرکـۆژە** (نا. ل)[بەر3 + کـۆژ + ئە] دوگمە و قەیتانی سەر کراس کە سینگ و بەرۆکی پێدادەپۆشن. ። نە شەوم شەوە و نە رۆژم رۆژە / داخ لە دڵ بوومە گرێی بەرکۆژە (بۆ کوردستان ل ١١٨). **~ ترازانـدن:** کـردنەوەی بەرکـۆژە. ። ئەگەر بسکانم تاتا بکەم، کولمانم بنەخشێنم، بترازێنم کلیلی سینگ و مەمک و بەرکۆژێ / تینێت بۆ

دەستێنم لە مانگێ، تاریکێ دە دنیایێ دەخەم، شەبەقت بۆ دەستێنم لە رۆژێ. (مان ل ١٥٩). لەودەمەی دا دەس لە بەژنان وەردێن / لەودەمەی دا بەرکۆژە دەترازێن (تاریک و روون ل ٢٠٦).

**تێبینی:** کۆژ دەگەڵ وشەی کۆش هەریەکن. کەشە kaša لە ئەوێستایی و کەش kaš لە پەهلەویی دا جگە لە کۆش بە مانای سینگ و باغەلیش هاتوون.

**بەرکۆش** (نا. ل)[بەر + کۆش] ١ـ بەرهەڵبێنەیەکی چووکە کە لە کاتی کار کردن دا لە نێو قەد دەبەسترێ. ٢ـ [باک] بەرلیک.

**بەرکۆڵ** (نا. ل)[بەر + کۆڵ] هەر شتێکی نەرم کە بەر لە باری سەرکۆڵ بیخەنە سەر پشت بۆ ئەوەی پشت ئەزیەت نەکا. :: کۆڵەداری درکاوی بێ بەرکۆڵ پشت بریندار دەکا.

**بەرکۆڵە** (نا. ل)[بەر + کۆڵ + ئە] دارێکە وەک چەڵەمە (چاکڵە) ئەخرێتە ناوەندی مژان و بەرەقەوە بۆ کار کردن (کشت و کاڵ ب ١ ل ٤٧).

**بەرکەش** (نا. ل)[بەر + کەش][باک] کەشەفی گەورە، مەجۆعمە، سینی.

**بەرکەل** (نا. ل)[بەر + کەل (کەلین)] [باک] بڕ: بەرکوڵ

**بەرکەلە** (گیانـ.)[بەر + کەل + ئە] [باک] بڕ: بەرکەڵ/٢.

**بەرکەڵ** (گیانـ.)[بەر + کەڵ] ١ـ گوێلکە مێی سێ بەهار دیتوو کە کاتی وەخۆ گرتنی گای گەیشتبێ، تەمەنی دوای گوێلپاری و بەر لە بزێ، نێنگوون. ٢ـ پالاغە مێی سێ ساڵە کە دەتوانێ کەڵ بگرێ، تەمەنی دوای قاچاچ و بەر لە بوونە گامێش، بەرکەلە. // هێوەرە، کەڵیچە.

**بەرکەمەر** (گیا.)[بەر + کەمەر] گیایەکی بۆنخۆشی گەرمیانییە (خاڵ ب ١ ل ١٥٨).

**بەرگ** (نا.)[ئەو: ڤەرێکە ـ پەه: بەرگ، ڤەرگ، ڤەرک، ڤەلک، ڤەلگ. تات: ڤەلگە ـ فار: برگ. باک: بەلگ، پەلگ ـ ناو: بەرگ ـ باش: بەڵگ ـ زا: ڤەلک] ١ـ بەشێکە لە دار و گیا کە لە لق دەروێ و بە شکڵی جۆر بە جۆر و چووک و گەورەیە و پتر رەنگی شینە، کاری وەرگرتنی شۆقی خۆرەتاوە. لە پایز دا رەنگ دەگۆڕێ و هەڵدەوەرێ، گەڵا. ٢ـ جل و شمەکی دەبەر کردن لە مرۆڤ بۆ بەرگری لە سەرما و گەرما و هەروەتر بۆ جوانی

خـۆی پـێ دادەپۆشـێ، جل و بـەرگ، جل، لیـبـاس، جلک، سـیـپـاڵ، شـمـەک. ٣ـ کتێبێک لە زنجیرە کتێبێک کە باسێک رەچاو دەکا، جڵد، پاژ. ؞ هەژار هەنبانە بۆرینەی لە دوو بـەرگان دا نووسیوە. ٤ـ پارچەیەکی درواو و ئامادە کە دە پێخەف (دۆشـەگ، باڵینج، سـەنیـر ، لێـفـە، ...) هەڵدەکێشن هەتا پێخەفەکان پیس نەبن، مەلافە. ؞ بەرگە بـاڵینج، بەرگە لێفە. ٥ـ رووپۆشـێکە لە نایلۆن یا کـاغـەز کـە بە سـەر دەفتـەر و کتێب دا دەیکێشن هەتا پیس نەبێ و لـە بەر دەسـتـان زوو نەدڕێ. ~ **تێگرتن:** ١ـ مـەلافـە دە پێـخـەف هەڵکێـشـان ٢ـ رووبـەرگ لە کـتـێب و دەفـتـەر دان. & بـەرگ تێ هەڵکێـشـان. ~ **تێهەڵکێشان:** بڕ: بەرگ تێگرتن. || **بەرگی پیاوان:** ١ـ ئەو جل و بەرگەی کە پیـاو دەبـەری دەکـەن. ٢ـ (کنـ.) بەڵگە و نیشـانەی پیـاوەتـی و جوامێریی، ئەوەی کە لە پیاو دەوەشێتەوە. // بەرگی ژنان. *__بەرگی پیـاوان لێ خـەسـار بوون:__ (کنـ.) پیـاو نەبوون، جوامێر و مـەرد نەبوون. ؞ وەکــوو تۆ دەڵێی بەرگی پیــاوان لـە من خەسـارە/ کراسێکی مەحمەڵ داراییم لە بەر کـە تا بە لاجـانگم دا بێتـە خـوارێ قــــەتارە و گـــوارە (لاس و خــــەزاڵ ل ١٦٤). **بەرگی دەروێشی:** خـرقـە و جل و بـەرگـی دەروێش، ئـەو جـلـەی دەروێش دەبەری دەکـا. ؞ دەبێ بپــۆشـم بـەرگی دەروێشـی/ ئەگـــەر دەروێش بم، بمبێ دڵخـۆشی (بـارام و گـوڵندام ل ٣٦). * **بەرگی ژنان:** ١ـ ئەو جل و بەرگەی کە ژن دەبـەری دەکـــــەن. ٢ـ (کنـ.) بـەڵگە و نیشـانەی ناپیـاوەتی و جوامێر نەبوون، ئەو کار و کردەوە و ئاکارانەی کە لە پیاو ناوەشـــێـنـەوە. ***بەرگی ژنـان پۆشین:** (کنـ.) خوێڕی بوون، نـالایق بوون، پیاو و جـوامــێــر نەمــان، بـەرگی ژنـان دەبەر (لەبـەر) کـــــردن، جلـی ژنـان پـۆشـین. ***بەرگی ژنان دەبەر (لەبەر) کردن:** (کنـ.) بـڕ: بـەرگـی ژنــان پـۆشـین. ؞ دەبـێ لەبـەرکـەم بەرگی ژنانێ/ مـەڕ و مــاڵی مـەلانـەبی... چۆتەوە بـە خـەنیـمـەت و بە تـالانـێ (لاس ە خـــــەزاڵ ل ٥٥). **بەرگی سەفەر:** ئەو جلانەی کـە مرۆڤ بۆ سـەفەر دەبەری دەکـا. **بەرگی شـایی و شین:** دوو جۆر جل کە یەکیان رەنگی گەش و ئاڵ و والایە و مـــرۆڤ بـۆ شــایـی و خــۆشـی دەبەری دەکـا و ئەوی دیکە رەنگی رەش یا تارە و بۆ سـەرەخـۆشی و شین دەبەری دەکـا. ؞ پیـاوی فـەقیـر و نـەدار بەرگی شایی و شینی هەریەکە.

**بەرگا** (نا. ل)[بەر + گا] کەسێک کە وەپێش گاجووتی تازەکار دەکەوێ هەتا فێرە جووت یا گێرەیان بکا.

**بەرگایی** (حم.)[بەرگا + ئی] کاری کەسی بەرگا.

**بەرگاییلکە** (گیانـ.)[بەر + گا + ئیلکە] مەلێکی چووکە بە قەرا چۆلەکە، رەنگی بۆرە و پتـــر لە دەم ئاو دەبێ و مێشوولە و گیانداری چووکە دەخوا، کلکی هەمیشە هەڵدەتەکێنێ، لە کاتی جـــووت کـــردنیش دا وە دوای جـــووت دەکـــەوێ و لە خـــەتی کـــێـــڵاو کـــرم و گیانداری وردی دیکە دەردێنێ و دەیخوا، Motacilla alba ناوی لاتینی ئەم باڵندەیە، وەرگاییلکە، پیزپیزەک، فیسقە، قوون هەڵتەکێنە، کلک هەڵتەکێنە، کلک هەڵســـەنگێنە، کلک تەقـــێنە، قنگ هەڵتەکێنە، دووڤ لەرزینک.

**بەرگدروو** (نا. فا، ئان. فا)[بەرگ/٢ + دروو] کەسێک کە پارچە و قوماش بۆ خـەڵک دەدروا و دەیکاتە جلک، جلدروو، خەیات.

**بـەرگـــــر** (نا. ل)[بـەر + گـــــر] ١ـ بەرهەڵست لە ئاست کەسێک. ٢ـ پێشگر لە بەر ئاو یا شتی دیکە، بەند.

**بەرگـریی** (حم.)[بەرگـر + ئیی] ١ـ بەربەرەکـانی و پێش گـرتنی دوژمن. ٢ـ پێشگیریی بۆ منداڵ نەبون. & بەرگیریی **~ کـــردن:** بەری دوژمن گـــرتن و لە بەرابەری وەسـتـان. ٢ـ پێشگیریی ژن و مێرد لە کاتی نیزیکی بۆ ئەوەی منداڵیان نەبێ.

**بەرگن** (نا.)[پەهـ: ڤــەڕ. لۆر: بەرگێ. باک: بەرگین ـ ناو: بەرگن ـ هەو: بەرگن] یەکـەم خـوری بەرخ کـە دەیبـڕنەوە و لە خوری دیکە باشتر و نەرمترە، لڤا، لوا.

**تێبینی:** ڤەڕ varr لە زمانی پەهەلەوی دا بە مانای خوری و جل هاتوە.

**بەرگە** (نا.)[؟] دەرەقەت، تاقەت، بەر، توان. **~ گـــرتن:** تاقـــەت هێنان لە بەرامـبـەر هـەر هێزێک دا، خۆ راگـرتن، دەرەقـەت هێنان، بەر گـرتن. ⁘ هێندە رزیوی بەرگەی مستێک ناگری. کەوشی ئێسـتـا هێند خـراپن بەرگەی دوو رۆژان ناگرن.

**بەرگە باڵنج** (نا. ل)[بەرگ/٤ + ئە + باڵنج] پارچەیەکی درواو و جـوان کـە دە باڵنجی هەڵدەکێشن هـەتا باڵنجەکە پیس و چڵکن نەبێ.

**بەرگە پشتی** (نا. ل)[بەرگ/٤ + ئە +

پشتی] پارچەیەکی دروا و کە دە پشتی هەڵدەکێشن بۆ بەرگری لە پیس بوونی پشتی.

**بەرگە دۆشەگ** (نا. ل)[بەرگ/٤ + ئە + دۆشەگ] پارچەیەکە درێژتر لە دۆشەگ کە یا تێی دەگرن، یا بە سەر دۆشەگی دادەدەن بۆ پیس نەبوونی دۆشەگ، مەلافە، متیل.

**بەرگەدە** (نا. ل)[بەر + گەدە] تووکی سەر سیرەتی پیاو و شەرمی ژنانە، بەر5، تووکەبەر.

**بەرگە دەمانچە** (نا. ل)[بەرگ/٤ + ئە + دەمانچە] پارچە چەرمێکی دروا و و ساز کراوە کە بە بەندێ لە خۆیانی هەڵداوسن یا لە قەدی دەدەن و دەمانچەی تێدەنێن.

**بەرگە سەرین** (نا. ل)[بەرگ/٤ + ئە + سەرین] پارچەیەکی ئوستوانەییە کە بۆ سەرین دووراوە و دە سەرینی هەڵدەکێشن، بەرگە سەنیر

**بەرگە سەعات** (نا. ل)[بەرگ/٤ + ئە + سەعات] کیسەیەکی بچووک لە قایش یا مەخمەر یا دەزووی چندراو کە ساعەتی باغەڵیان تێدەنا.

**بەرگە سەنیر** (نا. ل)[بەرگ/٤ + ئە + سەنیر][موک] بڕ: بەرگە سەرین.

**بەرگە کتێب** (نا. ل)[بەرگ/٤ + ئە + کتێب] پارچە مقەوای ئەستوور یا چەرم کە پەڕەکانی کتێب دەگرێتە خۆیەوە و لە دڕان و فەوتان دەیپارێزێ.

**بەرگە کەوا** (نا. ل)[بەرگ/٤ + ئە + کەوا] پارچەیەک کە لە بنی کەوای دەدروون، ئاستەڕ، بەرەکەوا.

**بەرگەشت** (نا. چا)[فار: برگشت] پەشیمانی، پەشیمان بوونەوە. ~ **بوونەوە:** پەشیمان بوونەوە. ⁂ پیاو نابێ لە قسەی خۆی بەرگەشت بێتەوە.

**بەرگەل** (نا. ل)[بەر (بەرخ) + گەل] بڕ: بەرخەگەل

**بەرگەلەوان** (نا. ل)[بەرگەل + ئە + وان] بڕ: بەرخەلەوان.

**بەرگە لێفە** (نا. ل)[بەرگ/٤ + ئە + لێفە] پارچەیەکی درێژ و دروا و و هەندێک جار گوڵدۆزی لە سەر کراوە، هەم بۆ جوانی و هەمیش بۆ بەرگری لە پیس بوونی لێفە تێدەگرن.

**بەرگەلا** (نا. ل)[بەرگ + گەلا] بەرێکە سوور و سپی واشە لە گەلای دارمازوو سەوز ئەبێت (کشت و کاڵ ب ١ ل ٤٧).

**بەرگەمێ** (گیا.)[؟][هەو] بڕ: کووزەڵە

**بەرگیر** (گیانـ.)[باک ـ زا] بڕ: بارگین

**بەرگیریی** (حم.)[بەرگیر + ئیی] بڕ: بەرگریی

**بەرگیل** (نا.)[باک] بڕ: بارگین

**بەرگین** (نا.)[باک] بڕ: بەرگن

**بەرگێڕەوە** (نا. ل)[بەر + گێڕەوە (گێڕانەوە)] بەرگر، بەرهەڵست، لەمپەر. ⁝⁝ سەدهەزار بەرگێڕەوەی با بێتە سەر رێ، ئاخری/ هەر دەگاتە مەنزڵی ئاوات و خۆشی باری کورد (تاریک و روون ل ١٢٣). **~ کردن:** بەرگریی کردن، بەر گرتن. ⁝⁝ وەدەرخە ئەشرەفی و ئاڵتوون و ئەوی سکە لە بیست و چوارە/ بەرگێڕەوەی کەس مەکە، بدە بە فەقیر و دەستەنگ و هەژارە (لاس و خەزاڵ ل ٤٨).

**بەرلیک** (نا. ل)[بەر + لیک] پێشبەندێکی درواى هەندێک پانەکە ئەو سەر ئەو سەری دوو لکی هەیە بۆ گرێ دان، لە سەر جلکی منداڵی چووکی دەبەستن هەتا لیک و ئاودەمی منداڵ بگرێ و جلەکەی تەڕ نەبێ و لە کاتی خواردنیش دا خۆی پیس نەکا، بەرلیکە.

**بەرلیکە** (نا. ل)[بەر + لیک + ئە] بڕ: بەرلیک

**بەرما** (ئان. مفـ.)[بەر3 + ما (مان)] بڕ: بەرماو

**بەرماخ** (نا.) بڕ: بارماغ

**بەرماغ** (نا.) بڕ: بارماغ

**بەرماڵ** (نا. ل)[بەر3 + ماڵ] ١ـ دوو تەختە کوێنی گەورەیە کە بە بەر رەشماڵ و تاوڵیوە دەگرن هەتا بەری با و باران بگرێ. ٢ـ جاجمێکی گەورەیە کە پێخەفی تێوە دەپێچن. ٣ـ تەنراوێکی هەندێک چووکە کە پاک و خاوێن رادەگیرێ و نوێژی لە سەر دەکەن، دووگرد، جانماز. **~ لە سەر ئاو گەڕان:** (کنـ.) زۆر نوێژ کردن و موسڵمانی چاک و خاوەن کەرامەت بوون، پیرۆز بوون.

**بەرماڵە** (نا. ل)[بەر + ماڵ + ئە] ١ـ ئافرەتێک کە کار و باری ماڵ هەڵدەسوورێنێ و ماڵ و حاڵێک بۆ پیاوەکانی ماڵ پێک دێنێ، ئاگاداری بنە و کەرەسەی ناوماڵ، بناوان1، بەرماڵە، بەرماڵی، بنەوانە، بنەوان. ٢ـ بنەماڵەیەک کە لە ماڵی دەوڵەمەند دا چاوە خانوویەکی پێدراوە و تێگرا خزمەتی ئەو ماڵە دەکەن، پاشمارە، ژێرماڵە، پاژماڵە،



پاشماڵە.

**بەرماڵی** (نا. ل)[بەر + ماڵ + ئی] بڕ: بەرماڵە

**بەرمامک** (نا. ل)[بەر + مامک] ١ـ پارچە و نەقابێک کە ژن لە چاو بۆ خوارەوەیانی پێدادەپۆشن. ٢ـ هەر شتێک کە رووی بۆ نەناسینەوە پێداپۆشن، نەقاب. ٣ـ دەمپۆش. & دەمامک. :: دولبەرم بەرمامکی دابوو لەبەر ئێشی ددان / وادەزانن روومەتیم ئەمشەو لە خەو دا گەستووە (حاجی قادر ل ١٣٢).

**تێبینی:** وشەی مامک هەر هەمان وشەیە کە لە وشەکانی دەمامک و بزمک و بلامک و بزموک دا دەبیندرێ و لە مەئۆچ - ی ئەوێستایی کە دەگەڵ پێشگری پەئیتی دێ paiti-maoč و مۆچ - ی پەهلەویی کە ئەویش دەگەڵ پێشگری پەت دێ pat-moč بە مانای پۆشین و دەبەر کردن کەوتوە کە بە گشتی لە کوردیی دا دەبێتە پۆش (بەرمامک یانی بەرپۆش، دەمامک یان دەمپۆش).

**بەرماو** (ئان. مف.)[بەر3 + ماو] ئەندازەیەک لە چێشت کە لە پاش کەسێک دوای تێر بوونی دەمێنێتەوە، بەرما، بەرماوە، پاشماو، پاشماوە، پاشمەنە. ~ **خواردن:** خواردنی بەرماو و چێشتی لە پاش بە جێ ماوەی کەسێک.

**بەرماوخۆر** (ئان. فا)[بەرماو . خۆر2][لە: بەرماو خواردن] کەسێک کە پاشماوەی چێشتی کەسی دیکە دەخوا.

**بەرماوخۆریی** (حم.)[بەرماوخۆر + ئیی] بەرماو خواردن، کار و کردەوەی کەسی بەرماوخۆر. :: من بە بەرماوخۆریی رانەهاتووم، بەرماوخۆریی پیشەی تۆیە.

**بەرماوە** (ئان. مف.)[بەر3 + ماو + ئە] بڕ: بەرماو

**بەرموسڵدان** (ئا.)[بەر3 + مسوڵدان] ئەو بەشەی زگی مرۆڤ کە دەکەوێتە نێوان نێوک و بەرگەدە، خوارەوەی نێوک.

**بەرموور** (نا. ل)[بەر2 + موور] [موک] خشڵێکی ژنانەیە لە مت و مووری رەنگین، ژنان لە بەنی هەڵدەکێشن و دە ئەستۆی دەکەن، بەرمۆری، ملوانکە، ملوێنکە، ملەوانکە، ملوەن، ملوێنک، گەردنبەند، گەردانە. || **بەرمووری ئاڵە و شەوە:** بەرمووریکە لە چەندین مووررووی

ڕەنگاوڕەنگ کە هەر کام ناوێکیان هەیە و ژنان دەملیان دەکەن. مووروو‌کانی بریتین لە: ئاڵە کە ڕەنگی سپی شیرییە، شەوە ڕەنگی ڕەشە، شیلان نارنجییە، چەور و شیرن کە قاوەییەکی تۆخە.

**تێبینی:** موور، مۆری و مووروو هاوریشەن دەگەڵ موهرەک ـ ی -muh rak پەهلەویی هەر بەم مانایە.

**بەرمۆری** (نا. ل)[بەر2 + مۆر + ئی] بڕ: بەرموور

**بەرمەمکان** (ئان. ل)[بەر + مەمک + ئان] منداڵێک کە هێشتا شیری دایکی دەخوا و لە شیر نەکراوەتەوە، وەرچیچە، بەرمەمکانە.

**بەرمەمکانە** (ئان. ل)[بەر + مەمک + ئان + ئە] بڕ: بەرمەمکان

**بەرمیل** (نا.)[ئین: barrel] بڕ: بۆشکە

**بەرنامە** (نا. ل)[بەر3 + نامە] ١ـ پێش بینی و پلان داڕشتن بۆ بەڕێوە بردنی کار، ژیان، ئاهەنگ و ... بەر لە دەست پێکردن. ٢ـ لیستەی دەرس و فیلم و هەر شتێکی لەم بابەتە، پرۆگرام. ~ **داڕشتن:** ساز کردن و پێک هێنانی بەرنامەیەک بۆ کار و مەبەستی پێویست، بەرنامە دانان. ~ **دانان:** بڕ: بەرنامە داڕشتن.

**بەرنوێژ** (نا. ل)[بەر3 + نوێژ] مەلا یا کەسێکی دیکە کە لە کاتی نوێژی جەماعەت لە پێشەوەی نوێژکەران ڕادەوەستێ و نوێژ بەڕێوە دەبا، ئیمامی جەماعەت، پێشنوێژ، وەرنما.

**بەرنوێژیی** (حم.)[بەرنوێژ + ئیی] کاری نوێژ بەڕێوە بردن، پێشنوێژیی. ~ **کردن:** بەڕێوە بردنی نوێژ، پێشنوێژیی کردن.

**بەروان** (نا. ل)[بەر2 + وان1] بڕ: بەروانکە

**بەروانک** (نا. ل)[بەر2 + وان1 + ک] بڕ: بەروانکە

**بەروانکە** (نا. ل)[بەر2 + وان1 + کە] پارچەیەکی درواوەی هەندێک درێژە کە لە پێشەوەی منداڵ دەیبەستن هەتا لە کاتی خواردن دا جلەکانی پیس نەکا، بەروانک، بەروانە، بەروان، وەروانە، بەرچل.

**بەروانە** (نا. ل)[بەر2 + وان1 + ئە] بڕ: بەروانکە

**بەروبوخچە** (نا. ل)[بەر + و +

بوخچە] کەل و پەل و کەرەسەی ژن و ئافرەت کە لە بوخچە دەپێچرێ. ⁘ ئەو بەروبوخچەیەت بۆ هەڵرشتوە زووکە خرِی کەوە!

**بەروبۆ** (نا. ل)[بەر1 + و + بۆ3] ١- داهات و حاسڵی زەوی، دەغڵ و دان، بەرهەم، بەروبووم، بەروبوو. ٢- وڵات، بەروبووم (بڕ: بووم). ⁘ بزانن کەلاکی لە چ بوودرێک، لە چ بن بەردێک بە جێ ماوە / ئیدی نەیاندەزانی سەعید لە بەروبۆی دوژمن دا نەماوە. (سەعید و میرسێوەدین ل ٢٣٦)

**بەروبوو** (نا. ل)[بەر1 + و + بوو1] ١- داهات و حاسڵی زەوی، دەغڵ و دان، بەرهەم، بەروبووم، بەروبۆ. ⁘ ئەوساڵ باران کەم باری و بەروبووشمان کەم بوو. ٢- (مج.) ئاکامی حەول و کۆششی هەر کارێک، بەرهەم. ⁘ بەروبووی خەباتی گەلەکان رزگارییە. ٣- (مج.) قازانج، سوود. ⁘ دوکانداری بەروبوویەکی بەرچاوی نیە.

**بەروبوو درێژ** (ئان. ل) [بەروبوو + درێژ] حاڵی کار و مەسەلەیەک کە زۆری بخایەنێ، درێژ خایەن. **~ بوون:** زۆر خایاندن، زۆر کێشان. ⁘ ئەوساڵ زستان بەروبووی درێژ دەبێ. **بەروبووی درێژ ویستن:** تاقەت و لەسەرەخویی بۆ ئەنجام دانی کارێک. ⁘ دەرس خوێندن بەروبوویەکی درێژی دەوێ.

**بەروبووم** (نا. ل)[بەر + و + بووم1] ١- وڵات، زەوی (بڕ: بووم1). ⁘ سەفەر جایز نیە با بۆ حەرەم بێ لەو بەروبوومە / فەقەت مەجزووبی زنجیری نەسیبی ئاو و گڵ چ بکا (مەحوی ل ١٥). بەڵام با وەس بۆ ئەی تاڵەی شوومە / بازەم دڵ وەشم وەی بەروبوومە (مەولەوی ل ٣٤٠). ٢- بڕ: بەروبوو

**بەروبێشکە** (نا. ل)[بەر + و + بێشکە] لانکی منداڵ بە هەموو کەل و پەل و کەرەسەی پێویستی. ⁘ ئەو بەروبێشکەیەتان بۆ لە بەر دەرگا داناوە ڕێی هات و چۆی هەموو لێ گرتووین.

**بەروپشت** (ئان. ل)[بەر3 + و + پشت] ١- هەر شتێک کە دوو رووی هەبێ، پشت و روو. ٢- بەراوەژوو، بەراوپشت. **~ کردن:** ئاوەژوو کردنەوە و هەڵگێرانەوەی جل و هەر شتێکی دیکە. **~ هەبوون:** لە سەر باری راستی بوون، بێ فڕ و فێڵ بوون. ⁘ کاک حەمە بەر و پشتی بۆ کەس نیە.

وەک نیسک وایە بەر و پشتی بۆ کەس نیە.

**بەروپشت ئەتلەس** (ئان. ل) [بەر3 + و + پشت + ئەتلەس] ١ـ کەسێک کە هەم دایک و هەم باوکی سەید بێ. ٢ـ لێفەیەک کە هەر دوو رووی لە ئەتلەس بێ.

**بەروەستا** (نا. ل)[بەر3 + وەستا] کەسێک کە لە بەر دەستی وەستا کار دەکا، شاگرد وەستا.

**بەرۆک** (نا. ل)[بەر + رۆک] ١ـ پێشەوەی کەوا یا جل کە دەکەوێتە سەر مل هەتا دەگاتە سەر سنگ، یەخە، پێسیر. ٢ـ شریتی ملی یەکسم. ٣ـ (مجـ.) سنگ، مەمک، بەروو. ~ **بەردان:** لە کۆڵ کەسێک بوونەوە، یەخەی کەسێک بەردان. ~ **ژاکان:** کچێک کە دەست لە مەمکی وەردراوە. ~ **گرتن:** یەخەی کەسێک گرتن بۆ شەڕ.

**بەروو**[1] (نا. ل)[بەر2 + ئوو] سینگ. بڕ: بەر2/٢. ∷ هەتا کەی داخرێ سینگ و بەرووی من / هەتا کەی نەشکێ تاسە وئارەزووی من (نالەی جودایی ل ٦٣).

**بەروو**[2] (نا.)[باک] بڕ: بەڕوو

**بەرهەتاو** (نا. ل)[بەر3 + هەتاو] بڕ: بەرتاو

**بەرهەڵبێن** (نا. ل)[بەر2 + هەڵ + بێن1] بڕ: بەرهەڵبێنە

**بەرهەڵبێنە** (نا. ل)[بەر2 + هەڵ + بێن1 + ئە] پارچەیەکی چوارگۆشەی درێژە، پتر لە خامی شین یا رەشە کە ژن و ئافرەتی لادێ لە کاتی کار کردن لە پشتێند بەرەو خوارەوە دەیبەستن هەتا پیس نەبن، بەرەڵبێنە، بەرەڵبێن، بەرهەڵبێن، بەربێنکە، بەربانک.

**بەرهەڵدا** (ئان. ل)[بەر + هەڵدا (هەڵدان)] بڕ: بەرەڵڵا

**بەرهەڵست** (نا. ل)[بەر + هەڵست (هەڵستان)] ١ـ کەسێک یا کەسانێک کە بەری چوونە پێش و سەر کەوتنی کەسێک دەگرن. ٢ـ لەمپەر و بەرگری سەر رێگا.

**بەرهەڵێخ** (نا. ل)[بەر + هەڵێخ (هەڵخستن)] دیوارێکە کە لە بەر دیواری شکست هەڵیدەچن بۆ ئەوەی بەری رووخانی بگرێ هەتا چاکی دەکەنەوە، پشتیوانە.

**بەرهەڵێنج** (نا. ل)[بەر + هەڵێنج (هەڵێنجان)] بڕ: بەرکوڵ

**بەرهەم** (نا.)[باک: بەرهەم ـ ناو: بەرهەم ـ هەو: بەرهەم، فەرهەم] ١ـ بەروبوو و حاسڵی زەوی. ٢ـ ساز کراوی کارخانە و ئەو شوێنانەی کاڵا ساز دەکەن. ٣ـ بەروبووی مێشکی هونەرمەند و نووسەر. **بە ~ گەیاندن:** پێگەیاندن، گەیاندنە بەروبوو، گەیاندنە بەرهەم دان. **بەرهەم دان:** بەر دان، پێگەیشتن. **~ هێنان:** ١ـ ساز کردن، دروست کردن. ٢ـ پێک هێنان، رەنێونان. ٣ـ خوڵقاندن، ئافراندن.

**بەرهەنگ** (نا. ل)[؟] نەخۆشی پشوو سوار بوون و تەنگەنەفەسی کە پتر لە تەمەنی پیری و بە ساڵ داچوون دا سەر هەڵدەدا.

**بەرهەنگدار** (ئان. ل)[بەرهەنگ + دار2] کەسێک کە تووشی نەخۆشی بەرهەنگ بوە، کەسێک کە بەرهەنگی هەیە.

**بەرە**[1] (نا. ل)[بەر1 + ئە] ١ـ رەگەز، رەچەڵەک. ⁝⁝ هەموو ئێمە لە بەرەی ئادەمین، بەرەی دێو. ٢ـ تیرە، تایفە. ٣ـ بەر، بەرهەم. **~ دان:** بەر دان، بەرهەم هێنان. ⁝⁝ راستم پێ بڵێ، درۆ بۆ هیچکەس بەرەی نەداوە (سەعید و میرسێوەدین ل ١٠٤).

**بەرە**[2] (نا.)[هەو] برِ: دەرکە

**بەرە**[3] (ئاک. ل)[بەر3 + بە] بەر بە، بەرەو، بۆ لای. ⁝⁝ بەرەژوور، بەرەخوار.

**بەرە**[4] (نا. ل)[بەر2 + ئە] ئامرازێکی سێ لکی چەرمە، بۆ ئەوەی کە زین لە سەر پشتی ولاغ نەخزێ. بەرە لکێکی بە نێو دەستەکانی ولاغ دا تێدەپەڕێ و لە بەر زگی دا بە نێوەڕاستی تەنگەوە دەبەسترێ و دوو لکەکەی دیکەش بە ملی دا لە قەڵتاغی زین گرێ دەدرێ. ⁝⁝ ئەسپی میر زێندینی زینی لێدەکرد، دەیکێشا تەنگ و بەرە/ تاجی و تووڵەیان بانگ دەکرد ئەوبەر ئەوبەرە (مان ل ٦٩).

**بەرە**[5] (نا.)[؟] نەخۆشییەکە کە تووشی مەڕ دێ، گوانی رەق دەبێ و ژانێ دەکا.

**بەرەباب** (نا. ل)[بەرە1 + باب1] ١ـ هەموو ئەو کەسانەی لە عەشیرەتێک دا لە کەسێکی ناسراو کەوتبن. ٢ـ هەموو منداڵەکانی بابێک. ⁝⁝ منداڵەکانی خات مەنیج ئی دوو بەرەبابن. (یانی مەنیج دوو جاری مێرد کردوە و لە هەر مێردەی چەند منداڵی هەیە). // بەرەدایک.

**بەرەبەرە** (ئاک. ل)[بەرە + بەرە] کەم

کەمە، وردەوردە، نەختەنەختە. ⁘ باران بەرەبەرە دایدایە. || **بەرەبەری بەیان:** ئەو کاتەی کە هێشتا شەوە بەڵام لە بەرەبەیان نزیک بۆتەوە، سنووری شەو و بەیانی.

**بەرەبەهار** (نا. ل)[بەرە3 + بەهار] ئاخر و ئۆخری زستان، سەرەبەهار.

**بەرەبەیان** (نا. ل)[بەرە3 + بەیان] ١ـ سەرەتای بەیانی کە ڕووناکی سەر هەڵدەدا، شەبەقی. ٢ـ (مجـ.) سەرەتا. ⁘ لە بەرەبەیانی پەیدا بوونی مرۆڤ لە سەر گۆی زەوی دا...

**بەرەتەشی** (نا. ل)[بەر + ئە + تەشی] کوتە دارێکی چووکی خەڕاتی کراوە کە نێوەکەی بە قەرا کلکە تەشی کون دەکەن و دەیخەنە سەر تەشی بۆ ڕاگرتنی لەنگەر و ڕێک خستن و هەڵکردنی ریس لە سەر کلکەتەشی.

**بەرەجفت** (نا. ل)[بەر1 + ئە + جفت] [ئەر] بڕ: بەرەجووت

**بەرەجۆت** (نا. ل)[بەر1 + ئە + جفت] [سۆر] بڕ: بەرەجووت

**بەرەجووت** (نا. ل)[بەر1 + ئە + جووت] ١ـ ئەندازە زەوییەک (ئاویی یا دێم) کە جوتێر بۆ جووت کردنی دوو وەرز بەشی دەکا. ٢ـ حاسلات و بەرهەمی ساڵەوساڵی جووتێر لە زەوییەکەی. & بەرەجفت، بەرەجۆت.

**بەرەدایک** (نا. ل)[بەرە1 + دایک] هەموو منداڵەکانی پیاوێک لە ژنێک یا چەند ژنەوە. ⁘ من هەشت منداڵم هەیە کە هەمووی لە بەرەدایکێکن، بەڵام چوار منداڵەکانی کاکم لە دوو بەرەدایکن.

**بەرەزا** (ئان. مفـ.)[بەر + ئە + زا] ١ـ یەکەم زان و یەکەم بێچووی حەیوان. ٢ـ یەکەم منداڵی دایک و باوک. // پاشەبەرە.

**بەرەژان** (نا. ل)[بەر + ئە + ژان] ١ـ ژانێک کە تاوێک دێت و تاوێک دەڕوا، ژانی بەرە بە بەرە. ٢ـ وردەژانی ژنی زگپڕ کە چەند ڕۆژێک بەر لە زان تووشی دەبێ، ژانە درۆزنە.

**بەرەژوور** (نا. ل)[بەرە + ژوور] ١ـ لای سەرەوەی کۆڕ و هەر شوێن و جێگایەک. ٢ـ بۆ لای سەرەوە، هەوراز. ⁘ هەندێک بەرەژوور بچن دەگەنە ماڵە کوێخای.

**بەرەژە** (نا.)[؟] جەوی و جیوەی گیایەکە بە ناوی هەنگوان کە بە قەرا نۆکێک هەتا گوێزێک دەبێ، ڕەنگەکەی زەرد، قاوەیی یان بۆرە تامی تاڵە و بۆنی



وەک بۆی سیـر وایە و بۆ چارە کـردنی قۆڵنج و هەندێک نەخۆشی دیکەی مرۆڤ و ئاژەڵ کەلکی لێوەردەگرن، Asa foe-tida ناوی لاتینی ئەم جـیـوەیـەیـە، هەنگوژە. (عەر: صمغ الانجذان)

**بەرەژێر** (نـا. ل)[بـەرە + ژێـر] بـۆلای خوار، لای خوارەوە، بەرەوژێر.

**بەرەڤــان** (نـا. ل)[بەر + ئە + ڤــان] [باک] کەسێک کە نێوبژی لە نێوان دوو کـەسی دژ و نێـوان ناخـۆش دا دەکـا، بەریڤان، نێوبژیکەر، بەریوانکەر.

**بەرەڤــانی** (حم.)[بەرەڤــان + ئی] نێوبژی، بەریڤانی، بەریوانی.

**بەرەک** (ئان.)[سۆر] بڕ: بەڵەک

**بەرەکـە** (نا.)[بـەر + ئە + کـە][سـۆر] هێشـوو ترێیەک کە بەشێکی شـیرین بوە و بەشـێکی هـەر تـرش و قـۆرەیە، هێشـوو ترێی نیوە شیرین، ئاڵ و بۆڵ.

**بەرەکـەت** (نا.)[عـەر: برکة] ١- پیت، رزق، رۆزی. ٢- قازانج، سـوود. ٣- زۆری، زیادی. ٤- وەک سـوێند بـە کـار دێ بە مـانـای ئەو رزق و پیـتـەی کـە خـودا داویەتی. ؛؛ بە بەرەکەتەی ئەگەر درۆیان بکەم!

**بەرەکـەوا** (نا. ل)[بـەر + ئە + کـەوا] بڕ: بەرگەکەوا

**بەرەگـە** (نا. ل)[بـەر + ئە + گـە] لای پێـشـەوە، بـەر. ~ **لێگرتن:** پێش پێگرتن، لای پێـشـەوە لـە کـەسـێک یا گـیـانداریک گـرتن. ~ **گـیـران:** لای پێشەوە لە لای کەسێک یا کەسانێکەوە لێگیران.

**تێبینی:** هەرچەند ئەم وشەیە بەمجۆرە [بـەر + ئە + گـە] دابەش کـراوە بەڵام واشی بـۆ دەچم کـە وشـەکـە بەر رێگە بووبێ و لە دوایی سوابێ.

**بەرەگەڵ** (نا. ل)[بەر + ئە + گەڵ] بڕ: بەرەگەڵا

**بەرەگـەڵا** (نا. ل)[بـەر + ئە + گـەڵا] بـەرێکی دارمـازوویە، وەک پـۆرگـێکە رەنگی سـووری سپی واشە کە لە گەڵای دارمازوو دەردەچێ، بەرەگەڵ.

**بەرەڵا** (ئـان. ل)[بەر + هـەڵ + دا] بڕ: بەرەڵڵا

**بەرەڵبێن** (نا. ل)[بەر + هـەڵ + بێن] بڕ: بەرهـەڵبێنە. ؛؛ دیم کچێکی لەباری لادێیی / بۆ نوێژ رادەخـا بەرەڵبـێنێ (ناڵەی جودایی ل ٣٩).

**بەرهەڵبێنە** (نا. ل)[بەر + هەڵ + بێن + ئە] بڕ: بەرهەڵبێنە

**بەرەڵدا** (ئان. ل)[بەر + هەڵ + دا] بڕ: بەرەڵڵا

**بەرەڵڵا** (ئان. ل)[بەر + هەڵ + دا(دان)] ١ـ ئازاد، رزگار. ٢ـ کەسێکی بێ کار و بار کە لە خۆوە دەخولێتەوە. ٣ـ حەیوانی بێ خاوەن. ٤ـ کەسێک کە گوێ نەداتە داب و نەرێتی کۆمەڵ و سەربەخۆ بجووڵێتەوە. ٥ـ شوێن و جێگەی بێ خاوەن. & بەرەڵا، بەرەڵدا، بەرهەڵدا. ~ **بوون:** ١ـ ئازاد بوون لە بەند، رزگار بوون. ٢ـ حەیوانێک کە خێوەکەی دەری کردوە و خۆی لێ بێ خاوەن کردوە. ٣ـ زەوی، ماڵ یا شوێنێک کە چۆل کراوە و بێ خاوەنە. ~ **کردن:** ١ـ ئازاد کردن لە بەند. ٢ـ واز لە حەیوانێک هێنان و خۆ لێ بێ خاوەن کردن. ٣ـ دەست هەڵگرتن زەوی و شوێنێک و بێ خاوەن مانەوەی. ٤ـ بەری ئاو بەردان

**بەرەڵڵایی** (حم.)[بەرەڵڵا ی + یی] ١ـ ئەوەی لە مروی بەرەڵڵا دەوەشێتەوە. ٢ـ بێ سەر و بەرەیی لە نێو کۆمەڵ دا.

**بەرەماک** (نا. ل)[بەرە + ماک] بێچووی حەیوانێک کە بە ئازادی شیری دایکی دەخوا و شیری ماکەکەی نادۆشن.

**بەرەمۆم** (نا. ل)[بەر + ئە + مۆم] بڕ: بەرەمێو

**بەرەمەشکانە** (نا. ل)[بەر + ئە + مەشک + ئان + ئە] بەخشینی بەرەمەشکەی ماوە بە دەست کورت و بێ ئەنوا. لە کوردەواری دا بەرەمەشکە ئەوەندی کە خورا دەیخۆن و ئەوی دیکە یا قاڵ دەکەن و دەیکەنە رۆن یا ئەوە کە هەندێک جار دەیبەخشن بۆ ئەوەی کە پیت و بەرەکەتی مەشکەکە زۆر بێ.

**بەرەمەشکە** (نا. ل)[بەر + ئە + مەشکە] بەری رۆژێک کەرە کە لە مەشکە ژاندن پەیدا دەبێ، بەرژەنە، ژەمەنە.

**بەرەمێو** (نا. ل)[بەر + ئە + مێو] مێو و خشت و خاڵی زێدەی نێو پلوورەی مێش هەنگوین، بەرەمۆم.

**بەرەنگار** (نا.)[؟] ئانگژا، ئاوقا، گژ. ~ **بوون:** ١ـ بە گژ یەک دا چوون، ئانگژا بوون. ٢ـ لە ئاست کەس و کارێک و کارەساتێک دا وەستان و بەربەرەکانی کردن.

**بەرەنگاریی** (حم.)[بەرەنگار + ئیی] بەربەرەکانیی. ~ **کردن:** ١ـ لە ئاست

کەسێک راوستان و بە گژ دا چوونی. ٢ـ بەربەرەکانیی کردن دەگەڵ هەر شتێکی دیکە.

**بەرەو** [1] (ئاک. ل)[بەر + بە] بۆ لا، روو لە شوێنی دیاری کراو و ئامانج. :: بەرەو ماڵ هەڵکشاین. بەرەو تۆ دێم.

**بەرەو** [2] (نا.)[زا] بڕ: برۆ

**بەرەواژ** (ئان. ل)[باک ـ سۆر] بڕ: بەراوپشت.

**بەرەوان** (نا. ل)[بەرە2 + وان][هەو] بڕ: دەرکەوان

**بەرەورِوو** (نا. ل)[بەرەو + روو] ١ـ ئەو لایەی کە رووی مرۆڤ تێیەتی، بەرانبەر. ٢ـ لە بەرچاو، لە ئاست. :: بەرەووڕووم درۆ دەکەی. & رووبەڕوو. ~ **بوونەوە:** رووبەڕووی بوونی دوولایەن لە کاتێک دا کە دووراودوور هەر کام قسەیەکیان کردبێ بۆ ئاشکرا بوونی راستی. ~ **کردنەوە:** لە بەرانبەر یەک دانانی دوو لایەن کە هەر کام قسەیەکیان کردبێ بۆ روون کردنەوەی راستی.

**بەرەوژوور** (نا. ل)[بەرەو1 + ژوور] بڕ: بەرەژێر

**بەرەوژێر** (نا. ل)[بەرەو1 + ژێر] بڕ: بەرەژێر

**بەرەهما** (نا.)[؟] خودای مەزنی هیندووکان، یەکێک لە سێ خودای ئایینی بەرەهمایی کە خوڵقێنەری گیتییە، پەیکەرەکەی چوار دەست و چوار سەری هەیە کە لە دەستێک دا زنجیر و لە دەستێکی دیکەی دا قەڵەم، دەستی سێهەم یاسا و بە دەستێکی ئاگری پیرۆزی راگرتوە.

**بەرەهمەن** (نا.)[؟] زانا و پێشەوای ئایینی بەرەهمایی

**بەریان** (نا. ل)[؟] نێرینە و نێوەڕاستی جۆبار و چۆم و رووبار کە ئاو لەوێ تەوژمی پترە.

**بەریڤان** (نا. ل)[بەر + ئی + ڤان][باک] بڕ: بەرەڤان

**بەریڤانی** (حم.)[بەریڤان + ئی][باک] بڕ: بەرەڤانی.

**بەریک** (نا.)[باک: بێریک، بێرک، بەرک] گیرفان.

**تێبینی:** بەریک و بەرک، بێریک و بێرک وێدەچێ کە لە باریامەک bāryāmak ـی پەهلەویی بە مانای خورجین کەوتبێ و ئێستا لە زاران خۆش بوە.

**بەریوانکەر** (نا. فا)[بەریوان + کەر] کەسێک کە نێوبژی لە نێوان دوو کەسی دژ و نێوان ناخۆش دا دەکا، بەریڤان، نێوبژیکەر.

**بەرین** (ئان.)[پەھ: بەرێن. ناو: بەرین ـ زا: ڤەرن] حاڵی هەر شتێک کە پان و هەراو بێ، هەراو، بەربەرین.

**بەرینان** (نا. ل)[بەر + ئین + ئان] ئەوکەسانەی کە بەر لە ئێمە ژیاون، پێشینیان، پێشینان. ‫:: کەسێک دنیای زۆر دیبێ، ئەو عاقڵتر و چازانە/ چومکە قسەیە، بیستوومانە لە بەرینان و پێشینانە (لاس و خەزاڵ ل ١٥٢).

**بەرینایی** (حم.)[بەرین + ئایی] نێوانی ئەو سەر ئەوسەری شتێکی پان، بەرینی. ‫:: لە درێژایی دەردێنێ دە بەرینایی دەکاتەوە (پەند).

**بەرینی** (حم.)[بەرین + ئی] بڕ: بەرینایی

**بەریوانی** (حم.)[بەر + ئی + وان + ئی] بڕ: بەرەڤانی.

**تێبینی:** ئەم وشەیە لە زاراوەی ناوەندیی دا لە بەریڤانی زاراوەی باکووریی وەرگیراوە.

**بەڕ** [1] (نا.) بڕ: بەڕە

**بەڕ** [2] (نا.)[عەر: بر] ویشکانی، دەشت، بیابان، بەژ، بەڕیە. ‫:: بەڕ و بیابان.

**بەڕۆژ** (نا. ل)[بەر + رۆژ] شوێنێک کە تاو تێی دەکا، بەرتاو. ٢ـ لایەکی چیا کە هەمیشە تاو تێی دەکا. // نسار.

**تێبینی:** بەڕۆژ لە دوو وشەی بەر و رۆژ پێک هاتوە بەڵام لە بەر باری فۆنۆتیکییەوە « ڕ » بە سەر « ر » دا زاڵ بوە و بۆتە بەڕۆژ.

**بەڕۆژوو** (ئان. ل)[بە + رۆژوو][ناو: بەڕۆژوو، بەڕۆژی، رۆژگ] موسڵمانێکی کە بە پێی ئایینەکەی لە مانگی رەمەزان یا کاتی دیکە بەر لە بانگی بەیانی هەتا بانگی شێوان هیچ نەخوا و رۆژوو بگرێ. ~ **بوون:** رۆژوو گرتن.

**بەڕۆژی** (ئان. ل)[بە + رۆژی][سۆر] بڕ: بەڕۆژوو

**بەڕوو** (گیا.)[پەھ: بەلووت. باک: بەروو، پالیتە، بەڕی ـ ناو: بەڕوو ـ باش: بەڕیوو، بەلوو ـ هەو: بەلوو ـ زا: بەلی، بەڵی، بەڵو] ١ـ دارێکی گەورە و بە لک و پۆیە، گەڵاکانی گرنی گرنین، جووتێک گوڵی نێر و مێی هەیە، بەرێک دەگرێ کە

شـێـوەی فندقی گـەورە و درێژ دەدا، چێوەکەی زۆر سەختە و لە کار و باری نەجاری دا کەلکی لێوەردەگرن، -Cuer cus persica ناوی لاتینی ئەم دارەیە، داربەڕوو. ٢ـ بەری ئەم دارە کە ڕەنگی وە فندق دەچێ بەڵام سێ هێندی فندقە. توێکڵێکی تەنک و سەختی هەیە، سەرەکەی لە قاپووکە دایە و کاتێک بگا لێی دەبێتەوە. بەڕوو بۆ خواردن دەست دەدا و بە برژاوی دەیخۆن و هەندێک جار نانیشی لێدەکەن، خاسەبەڕوو. ٣ـ بەرێکی دار مازوویە لە هەمان ڕەنگ و شکڵ بەڵام چووکترە و ماڵات دەیخۆن.

**بەڕوولە** (نا. ل)[بەڕوو/٢ + لە] ١ـ (گیا.) خەیار و ترێزوو کە لە قیچکەیی دەرچوون و بۆ خواردن دەست دەدەن بەڵام هێشتا چووکن. ٢ـ یەکێک لە ئامرازەکانی نیر و ئامووره کە دارۆکەیەکە بە قەرا بەڕوو کە دەخرێتە کونی شیلەپەی هەوجارەوە هەتا قایم ڕاوەستێ و لە باسکێش نەیەتە دەر، گاینجە. ٣ـ یەکێک لە ئامرازەکانی عارەبەی کەڵ، کە بریتییە لە میلەیەکی ئاسنە کە لە مازە ڕۆ دەکرێ هەتا تۆپ یا چەرخەکەی لە مازە نەیەتە دەر.

**بەڕە** (نا.)[پەه: ڤەڕ. ناو: بەڕ، بەڕە ـ

هەو: لەی] ڕایەخێکی ئەستوور و ڕەنگاوڕەنگە کە بە دەست دەیچنن و لە ماڵان لە بن خۆیان ڕایدەخەن، گلێم. **~ی خۆ پێ لە ئاوێ هاتنە دەر:** (کن.) توانایی بەڕێوە بردن خۆ و پەیدا کردنی بژیو هەبوون **~ی خـۆ لە ئاودەر هێنان:** (کن.) توانایی بەڕێوە بردن خۆ و پەیدا کردنی بژیو هەبوون، بەڕەی خی پێ لە ئاو هاتنە دەر. **پێ لە ~ی خۆ درێژتر کردن:** (کن.) لە حەد و ڕادەی خۆ دەرچوون، پتر لە توانایی و وچەی خۆ ویستن و داوا کردن. **چوونە سەر ~ی:** (کن.) چوونە خوازبێنی. ⁝⁝ سیامەند هەڵیدەگرتەوە پۆلێک کەیخودای شەرمەندە و مەلایەکی شەرح زان/ دەچۆوە سەر بەڕەی دە مامی خۆی (گەنج ل ٣٣٠). **هاتنە سەر ~ی:** (کن.) خوازبێنی کردن، هاتنە خوازبێنی. ⁝⁝ هاتووینە سەر بەڕەی دەمانەوێ کوڕەکەمان بە نۆکەری خۆتان قەبووڵ بکەن. ماڵە حەمی جیرانمان هاتوونە سەر بەڕەی داوای بەسێ دەکەن.

**تێبینی:** ڤەڕ varr لە زمانی پەهلەوی دا بە مانای خوری و جل هاتوە.

**بەڕەزا** (گیا.)[؟] ١ـ گیایەکی

کوێستانی تام و بۆنخۆشە و ناسک. گەلای وەکوو گەلای تەرەتیزەیە لاسک بەرز (کشت و کاڵ ب ١ ل ٤٥). :: چیا لە تەوقە سەری داڕژاوە تا کەمەری/ چوو زولفی سونبولی دەرهەم، چوو پەرچەمی بەرەزا (حاجی قادر ل ٣٢). ٢ـ (مجـ.) پرچی یار و گراوی. :: گێسووت بەرەزای پەخش پای کاوان/ زوڵف و ئەگریجەت باڵ بەت ئاوان (وەلی دێوانە ل ٣٦).

**تێبینی:** بەرەزا لە شێعری شاعیرانی ناوەندیی و هەورامی دا زۆر هاتوە. مامۆستا هێمن بە بەرەزا ـ ی نووسیوە (بڕ: تاریک و روون ل ١٨٥) کە وێدەچێ هەڵەی چاپی بێ. لە دیوانی حاجی قادر دا بەرەزا بە بارێزە مانا لێدراوەتەوە (بڕ: حاجی قادر ل ٣٨)

**بەڕی** (گیا.)[باک] بڕ: بەڕوو

**بەرینگاڵ** (ئان. ل)[بە + رینگاڵ] مەڕێک کە تیسک و خوری درێژ بێ، مەڕی تیسک درێژ، بەرینگۆڵ.

**بەرینگۆڵ** (ئان. ل)[بە + رینگۆڵ] [سۆر] بڕ: بەرینگاڵ

**بەرِیە** (نا.)[عەر: بر] وێشکایی، دەشت، بەر، بیابان. :: نایێلم راوی خۆت باوێیە بەرِیە و بیابانی لە دووی کەرووشی گەرمەلانە (مان ل ٩٢).

**بەڕێ** (نا. ل)[بە + رێ] ئەم وشە بە تەنیا نایە و دەگەڵ ئەم چاوگانە مانا دەدا، بەڕێوە. ~ **بردن:** ١ـ ئیدارە کردن. ٢ـ ژیاندن و دابین کردنی ژیان. & بەڕێوە بردن.. ~ **بوون:** کەوتنە رێگا، وە رێ کەوتن بۆ شوێنێک، رۆیشتن. :: بارگەیان تێکەوە پێچاو و بەڕێ بوون یاران / لە دنێ وا بە تەنێ پاشی ئەوان من چ بکەم (هێمن). ~ **چوون:** گوزەرانی ژیان کردن، ژیان تێپەڕ کردنی بە کەرەسەی پێویستەوە. ~ **کردن:** ١ـ خستنە رێی میوان، مسافر و کەسێک لە کاتی ماڵاوایی دا، روانە کردن. ٢ـ ناردن، شاندن. :: نامەکانم بۆ کاکم بەڕێ کرد. ٣ـ جێ بە جێ کردنی کاری کەسێک. :: دا رۆڵە ئەو مشتەریانە بەڕێ کە بزانە چیان دەوێ بیاندەیە!

**بەڕێوە** (نا. ل)[بە + رێ + وە] بڕ: بەڕێ. ~ **بردن:** بڕ: بەڕێ بردن.

**بەڕێوەبەر** (نا. فا)[لە: بەڕێوە بردن] کەسێک کە کاری شوێنێک هەڵدەسوورێنی، مودیر.

**بەز**[1] (نا.)[ئەو: ئەزوویتی، بێزڤەنت ـ

پەش: وازگـە، وازدە. باک: بـەز ـ ناو: بەز ـ زا: ڤـەزد، ڤـۆزد، ڤـازد] چەورایـی یەکی سپییـە لە نێو لەشـی گیانداران دا پەیدا دەبێ، دۆن، دوون. ~ کـولێن: (کنـ.) سـەرما پێ خۆش بوون. ⁘ بەو زستانەی ئـەو دەرک و پەنجـــەرەت بـۆ کـــردۆتـەوە مەگەر بەزت دەکولێ. **گورچیلە دە ~ی دا ون بوون:** (کنـ.) زۆر قـــەڵەو بـوون. ‖ **بەزی چاو:** گـۆشـتـەزوونێک کـە لە نێـو چاوی مرۆڤ پەیدا دەبێ.

**بـەز**$^{2}$ (ر.)[لـە: بـەزیـن1] ١ـ رەگـی چاوگی بەزین. ٢ـ لە وشـە دا مـانای توند و تیژ دەدا، رەو. ⁘ خـۆشبـەز. ٣ـ مـانای بەزاو دەدا. ⁘ نەبەز

**بەزا** (ئان. ل)[بەز2 + ئا][باک: بـەزا، بـەزۆ، بـەزۆک ـ نـاو: بـەزا] ئـەسـپ یـا گـیـاندارێک کـە تیــژ هەڵدێ، تیـژڕەو، خۆشڕەو، خۆشڕۆ، خۆشبەز.

**بەزات** (ئان. ل][بە + زات] کـەسـێک کـە ترسـی دە دڵ دا نەبێ، بوێر، نەترس، بەدڵ، زاتدار، ئازا، بەجەرگ. **~ بوون:** نەترسان، وێران، بەدڵ بوون.

**بەزاز** (نا.)[عەر: بزاز] دوکاندارێک کە کـاری فـرۆشـتنی پارچە و کـووتاڵە، پارچەفرۆش، کووتاڵ فرۆش.

**بەزان** (چا. ل) بڕ: بەزین

**بـەزانـدن** (چـا. م)[لـە: بـەزیـن] [باک: بـەزانـدن ـ نـاو: بـەزانـدن، بەزانـن ـ هـەو: بەزنـای] ١ـ شکسـت دان لە شــەڕ دا. ٢ـ بـردنـەوە لـە کـێ بـەر کـێ دا. ٣ـ [بـاک] لێـخـورین، تاو دان. ⁘ هەســپـا خــوە بەزاندن.

**بەزانن** (چا. م)[ئەر] بڕ: بەزاندن

**بەزر** (نـا.)[عـــەر: بذر] ئـەو دەنـک و دانەی کە بۆ چاندن کەلکی لێوەردەگرن، بنەتۆو، تۆو، تۆم، بەزرە.

**بەزرە** (نا.)[باک ـ زا] بڕ: بەزر

**بەزرەونج** (گـیـا.)[عـەر: بذرالبنج] گـیـایەکی خـۆڕسکی دوو سـاڵەیـە، هەتا نیوگـەزێک هەڵدەدا، ساقـەت و گـەڵاکانی بە کورک داپۆشـراون، گـوڵەکانی زەرد و بۆن ناخـۆشن، بەرەکـەی چەند دەنکێکی بۆری وەک باقلەیە و خواردنیان مەترسی هەیە. لە تب دا لـە دەنک و گـەڵاکـەی بۆ چارەســەر کــردنی هەندێک نـەخـۆشی کەلک وەردەگرن. Hyoscyamus niger ناوی لاتینی ئەم گیایەیە.

**تێبینی:** لە فـەرهـەنگی کشت و کاڵ دا لە ئاست بـەزرەونج نووسـراوە: گـیـایەکی گـــەڵا وردی بـۆنخـــۆش و لـە هەنبــانـە

بۆرینەش دا نوسراوە: گیایەکی زۆر بۆنخۆشە کە من پێموایە هەردووکیان هەڵەیان کردوە. (بڕ: کشت و کاڵ ب ١ ل ٤٩ و هەنبانە ب ١ ل ٨٠).

**بەزم** (نا.)[پەه: بەزم. باک: بەزم ـ ناو: بەزم ـ هەو: بەزم] ١ـ کۆڕی خۆشی و رابواردن، میوانی. ٢ـ [ئەر] ئاهەنگ، هەوا. :: ئا بەزمێکمان بۆ بێژە! ٣ـ ئەدا، گروو. ٤ـ تەشقەڵە. ~ **پێگرتن:** ١ـ گروو گرتن، ئەدا و ئەتوار دەرهێنان و ئەزیەت کردن. ٢ـ شەڕ پێ فرۆشتن، شڵتاغ پێکردن. ~ **پێگێڕان:** تەشقەڵە پێکردن. ~ **ساز کردن:** ١ـ کۆڕی خۆشی پێک هێنان. ٢ـ تەشقەڵە ساز کردن. ~ **گرتن:** ١ـ ساز کردنی کۆڕی خۆشی و رابواردن. ٢ـ گروو گرتن. :: کوڕەکەم بەزمی گرتوە، دەڵێ هەر دەبێ دووچەرخەم بۆ بکڕی.

**بەزمک** (نا.)[؟][باک] ١ـ (گیاند.) قرنوو، گەنە. ٢ـ جۆرێک ئەستووندی چادر و خێوەت.

**بەزمگا** (نا. ل)[بەزم + گا] جێگەی بەزم و خۆشی، بەزمگە.

**بەزمگە** (نا. ل)[بەزم + گە] بڕ: بەزمگا

**بەزم و رەزم** (نا. ل)[بەزم + و + رەزم] ١ـ کۆڕی بەزم کە هات و هەرای زۆر بێ. ٢ـ (مجـ.) هات و هەرای و بەدفەڕی منداڵان & بەزم و هەرا.

**تێبینی:** رەزم لە ئەوێستایی rasma بە مانای ریزی شەڕ و رەزم razm ی پەهلەویی بە مانای شەڕ کەوتوە.

**بەزم و هەرا** (نا. ل)[بەزم + و + هەرا] بڕ: بەزم و رەزم.

**بەزن**[1] (نا.)[زا] بڕ: بەژن

**بەزن**[2] (نا.)[؟][زا] سیما، روو، روخسار

**بەزنە** (نا.)[زا] بڕ: بەژن

**بەز و بنێشت** (نا. ل)[بەز + و + بنێشت] هەتوانێکە لە بنێشت و بەز کە لە سەر کوانی دەنێن هەتا چڵک و کێمەکەی هەڵمژێ.

**بەزۆ** (ئان. ل)[بەز2 + ئۆ][باک] بڕ: بەزا

**بەزۆک** (ئان. ل)[بەز2 + ئۆک][باک] بڕ: بەزا

**بەزە** (نا.)[پاز: بەژە ـ پەه: بەچەک، بەزەک، بەزەگ. باک: بەزە ـ ناو: بەزە، بەزەیی، بەزەوی ـ باش: بەزەوی، بەزەیی

ـ هەو: بەزەیی] ١ـ دڵ پێ سـووتـان و دڵسۆزی لە ئاست گرفت و لێقەوماونی گیاندار، روحم. ٢ـ [باک] گوناه، تاوان. ~ **پێدا هاتن:** دڵ پێ سووتان، روحم پێ کردن، بەزەیی پێدا هاتن.

**بەزەتاو** (نـا. ل)[بـەز + ئـە + تـاو (تاواندن)] کاری چەور و نەرم کردنەوەی برینی رەق هەڵاتوو یا قەڵشتی ویشکی پاژنە و دەست و پەل بە بەز یا پیوی داغ. بەز لە پەرۆیەک دەپێچنەوە و لە سـەر ئاور رایدەگرن هەتا چەورایی دەداتەوە و دوایی لە شـوێنی قـەڵشـتـەکـەی هەڵدەسوون. ~ **کردن:** چەور کـردنی قەڵشی دەست و پێ بە بەز.

**بەزەرەک** (گـیـا.)[؟] ١ـ تۆم و دەنکی گیا کـەتان کـە رۆنی لێـدەگرن. ٢ـ ئەو رۆنەی کە لە دەنکی کەتان دەیگرن، رۆنی بەزەرەک.

**بەزەوی** (نا.) بڕ: بەزە

**بـەزەیـی** (نـا.) بـڕ: بـەزە. ؛؛ لـە قـامـووسـی ئەوانە دا / بـەزەیی مـانای نەماوە (ناڵەی جودایی ل ٣٥). ~ **پێدا هاتن:** بڕ: بەزە پێدا هاتن. ؛؛ بەزەییت بەیۆ وە جەستە و حاڵم / ریشەم بەراما، هەرەو وە ماڵم (مەولەوی ل ٢٧).

**بە زیپک و زاکـوون** (ئان. ل)[بە + زیپک + و + زاکـوون] حـاڵی کـەسـێکی سـەختگر و بە دیسیپلین کە هەمیشە بە پێی یاسـا و بەرنامـەی تـایبـەتی خـۆی دەجووڵێتەوە.

**بەزیان** (چا. ل)[بڕ: بەزین] ١ـ [ئەر] تێـشـکـان، دۆڕان، بـەزین. ٢ـ [باک] راکردن، غار دان

**بەزین**[1] (چا. ل)[ئەو: ڤـەز ـ پەه: ڤـازییـتـەن. باک: بـەزیان، بەزین ـ ناو: بەزین، بەزان، بەزیان] ١ـ تێـشـکـان، شکست خواردن. ٢ـ دۆڕان لە کایە و کێ بەر کێ. ٣ـ [باک] راکـردن، هەڵاتن، غـاردان. ٤ـ بازد دان. پەڕین. ٥ـ پـەڕینی ئەسپ بۆ سەر ماین.

**بەزین**[2] (ئان. ل)[بە + زین] ئەسپ و مـاینی زین لە پشت و ئامـادەی سـوار بوون. ؛؛ کۆنە حەز ماینی بە زینە (پەند)

**بەزیو** (نا. مـفـ.)[لە: بـەزین] ١ـ کـەسـێک کـە لە شـەڕ دا شکسـتی خـواردبێ. // نەبەز. ٢ـ کـەسێک کـە لە کایە و کێ بەر کێ دا دۆڕابێ، دۆڕاو. ٣ـ کـەسێک کـە لە خـەبات و کـارێک کـۆڵی دابێ، کـۆڵدەر. ٤ـ گـیـاندارێک کـە لە ئاست غەنیمەکەی را بکا.

**بەزێن** (ر.)[لە: بەزاندن] ١ـ ریشەی چاوگی بەزاندن. ٢ـ بە ناوەوە دەلکێ و ناوی فاعیل ساز دەکا. :: شەوبەزێن، شێربەزێن، دوژمن بەزێن.

**بەژ** (نا.)[؟][باک: بەژ، بەژی ـ زا: بەژی] ١ـ وشکایی، بەڕ. ٢ـ زەوی وشک و بێ ئاو.

**بەژن** (نا.)[پەه: بەشن. باک: بەژن ـ ناو: بەژن ـ باش: بەژن ـ زا: بەزنە، بەزن] ١ـ درێژایی لەشی مرۆڤ، قەد، بەژن و بالآ. ٢ـ ئەندامی مرۆڤ، لەش. ٣ـ درێژایی جل و بەرگێک کە سەرتا پێی لەش دادەپۆشێ. :: پێنج سانت لە بەژنی ئەو کراسە دەرێنە. ٤ـ ساقەتی دار. **بە ~ بڕان:** ١ـ جل و بەرگی درواوی پڕ بە قالب و ئەندازە و بێ کەم و کووڕی. ٢ـ (مجـ.) بە ناو کران، بە نەسیب بوون، بە بالآ بڕان. :: کوڵمەت گەش و روناکە دەڵێی تیشکی هەتاوە / جوان چاکی کراسێکە بە بەژنی تۆ بڕاوە (هێدی ل ١٨٠).

**بەژن شۆڕ** (ئان. ل)[بەژن + شۆڕ2] کچ و ژنی بەژن جوان و رێک و پێک. :: بەژن شۆڕ و کەزی شۆڕ و خەزێم شۆڕ /سەرەوشۆڕم دەکەن سەرشۆڕ بەرەو گۆڕ (خەیام ل ٩٥).

**بەژن و بالآ** (نا. ل)[بەژن + و + بالآ] درێژایی لەشی مرۆڤ، بەژن، بالآ، قەد.

**بەژی** (نا.)[باک ـ زا] بڕ: بەژ

**بەس**[1] (نا.)[هەخ: ڤەسیە ـ پەه: ڤەس. تات: ڤەس ـ فار: بس. ناو: بەس ـ باش: بەس ـ هەو: وەس ـ زا: بەس] ١ـ رادە و ئەندازەیەکی کافی لە هەر شتێک و کارێک. نە کەم نە زۆر ٢ـ تەواو، خەلآس. :: لە لایەن منەوە دوو تفی لە روو کە و بەس. ٣ـ تەنیا، فەقەت. :: بەس تۆ وەرە بۆ مالّمان. **~ بوون:** کافی بوون، ئەندازە بوون. :: بەسە یا دیسان بۆت تێکەم؟ **~ کردن:** تەواو کردن، کۆتایی پێ هێنان. :: بەس کەن هێندە قسە مەکەن!

**بەس**[2] (نا.)[ئەر] بڕ: بەست1

**بەسالآچوو** (ئان. ل)[بە + سالّ + ئا + چوو][لە: بە سالّ داچوون] بەتەمەن، تەمەندار، گەڕاوە، پیر.

**بەسام** (ئان. ل)[بە + سام] کەسێک، شتێک یا شوێنێک کە مرۆڤ لێی دەترسێ، سامدار. :: پیاوی بەسام. **~ بوون:** ترسان، سام لێکردن. :: تاریکە شەوێکی بە سامە.



**بەست**[1] (ر.)[لە: بەستن] لە رەگی چاوگی بەستن دەکەوێ، بە ناوەوە دەلکێ و ئەو مانایانە دەدا. ١ـ بەستراو. ## بن بەست. ٢ـ بەستران و پێوە لکان بە شتێکەوە. ## دەربەست، داربەست. ٣ـ ئازاد، نەبەستراو. ## سەربەست. & بەس2. ٤ـ (نا.) بەندێک کە لە بەر ئاو هەڵیدەبەستن، ئاوبەند، بەند. ٥ـ (نا.) شوێنێکی پیرۆز یا ماڵی گەورە و پیاوچاکان کە لە بەر مەترسی خەڵک پەنای بۆ دەبەن و لەوێ دەمێننەوە. ## هاتی وا سەیری نەهاتی کەن کە سەد تیپان سوار / پاسەوانی بوون، لە ناو بەستا پیادێ کردی مات (مەحوی ل ٣٢٩). ٦ـ (نا.) رادەیەک لە تریاک کە چوار یەکی مسقاڵێکە و تریاک کێش بە وافوریەوە دەنێ و دەیکێشێ.

**بەست**[2] (نا.) دەم چۆم، بەستێن، بەستۆرە. ## وەز ماسی بووم لە بەستان / کەس نەیگرتم بە رستان ( فۆلکلۆر ل ٥١).

**تێبینی:** بەست، بەستێن و بەستۆرە دەگەڵ ڤیستەرەک vistarak یا ڤیستەرگ vistarg ی پەهلەویی بە مانای نوێن، جێخەو، جل، رایەخ هاوریشەیە.

**بەستران** (چا. ل)[لە: بەستن] ١ـ بەستن بێ دیار بوونی فاعل. ## دەستم بەسترابوو، کەس نەبوو بۆم بکاتەوە. ٢ـ داخران. ## دوکانەکان بەسترا بوون، کەس بە شارەوە نەبوو. ٣ـ گیران، بەر گیران. ## رێگاکان بەسترا بوون و کەس نەیدەتوانی هاتوچۆیە بکا.

**بەسترانەوە** (چا. ل)[لە: بەستران] ١ـ رێی دەرباز نەبوون، گیر خواردن لە شوێنێک. ٢ـ ئەسیر بوون بە دەست کەسێک یا مەسەلەیەکەوە. ## بەو ماڵ و منداڵەیەوە وەها بەستراومەوە ناتوانم بچمە هیچ کوێ. ٣ـ بۆر خواردن، بەزین لە قسە و هەندێک کایە و یاری. ٤ـ بەستنەوە بێ دیار بوونی فاعل. ## بزانە کەرەکە بەستراوەتەوە یا نا؟

**بەستراو** (نا. مف.)[لە: بەستران] هەر کەس یا هەر شتێک کە بەسترابێ. ## چاوی بەستراو، دەستی بەستراو، رێگای بەستراو.

**بەسترپێرار** (نا. ل، ئاک. ل)[بەستر + پێرار] بڕ: بەسرپێرار

**بەسترپێرێ** (نا. ل، ئاک. ل)[بەستر + پێرێ] بڕ: بەسرپێرێ

**بەستن** (چا. م)[هیک: بەندە ـ ئێک:

بـەنـد ـ ئـەو: بـەنـد ـ هـەخ: بـەنـد ـ پـەه: بەسـتـەن، ڤـەسـتـەن. فـار: بسـتن ـ لۆر: بەسـتێ ـ تات: دێبـەسـتـەن. ناو: بەسـتن، بەسـن ـ باش: وەسـین ـ هەو: بـەسـتـەی ـ زا: بەسـتش] ١ـ قـایم کردن و گرێ دانی بـار یا شـتـێکی دیکە بە ئـامـرازی بەستنەوەی وەک پەت، گوریس، کەلەبچە و ...:: بـارەکـان ببـەسـتن با برۆین. دەسـتی دزەکەیان لە پشـتـەوە بەست. ٢ـ کیپ کردن، پێوە دان، داخستنی دەرگا و هەرچێکی ئاواڵە. :: کتێبەکەت ببەستە، دوکـانـی بەست. ٣ـ لێـهـاڵاندن، لـەخـۆ بەستن. :: لەچکەکەت ببەستە، پشتێندی بەست. برینەکـەیان بە پەڕۆیەک بـەست. ٤ـ توند بوون و رەق بوونی ئاوەکی لە بەر سـەرمـا. :: ئەوسـاڵ هێند سـاردە چۆم بەسـتـوویەتی. ٥ـ سـەرمـا بوون، لە بەر سـەرمـا رەق بـوونی شـتـێک کـە ئاوەکی نەبێ. :: هـێند سـاردە سـمـێـڵـم بەستوویەتی. ئەگەر گون بیبـەستێ پیاو لە سـەرمـایان دەمرێ. ٦ـ مـەیینی مـادەی قـاڵ کـراو یا هەوێن کـراو. ٧ـ گـرتن، بەرگـرتن. :: ئاویان لە سـەر خـەڵک بەستوە. رێگا بەستوە. ٨ ـ بە نوشتـە و جـادوو بەری زاوا گـرتن بۆ ئـەوەی نـەتوانێ بـووکـێنـی کچ هـەڵگرێ. ( لە کـوردەواری ئەگـەر کـورێک دڵی بە کچێکەوە با و ئەم کچەش مێردی کردبا، پەنای دەبردە بەر نوشتـەنووس و ئەویش بە قـفڵ یا نـاڵ وای دەکـرد کـە زاوا ببـەسـتـرێ و نەتوانێ پەردەی کچ هەڵگرێ.)

**بەستنەوە** (چا. م)[لە: بەستن] ١ـ قایم کردنی و توند کردنی گیاندار بە پەت و گـوریس لـە شـتـێک، بۆ ئەوەی نـەڕوا یا دوور نەکەوێتەوە یا لە بەر زیان گەیاندن. :: ئەو سـەگـانە ببـەسـتنەوە دەنا کـەس ناهێڵن. ئەسپەکەم بەستـەوە و بۆ خۆی دەڵەوەڕێ. ٢ـ قـایم کردنی بار و بەسـتـە. ٣ـ سـەر لە نوێ بەستنی شتی کراوە. ٤ـ بەر گـرتن، بـەری ئازادی گـرتن. :: ئەو کـچـە بەسـتـە زمـانەیان بەسـتـۆتەوە و ناهێڵن بێتە دەرێ. ٥ـ بۆڕ دان، کەسێک بە قـسـە و زیرەکی مـەحکووم کـردن. :: ژن بە قـسـە پیـاو دەبەسـتـێـتـەوە. لە شـێـعـرشـێـعـرێن کـەس پێی نـاوەستێ هـەموو کەس دەبەستێتەوە. & بەسنەوە

**بەسـتـۆرە** (نا.)[بڕ: بـەست2] ١ـ ئەو بەشـە لە زەوی کە ئاوی چەم و رووبار بە سـەری دا دەڕوا و لـە ژێر ئـاوە. ٢ـ بەشێک لە زەوی کە دیارە پێشتر چەم یا رووباری بە سـەر دا هـاتوە و ئێـسـتـا

وشک بوه.

**بەستوو** (نا.) کووپەڵەی لە گڵ ساز کراوی ڕەنگ شین، بەستووکە.

**تێبینی:** عەرەب ئەم وشەیان وەرگرتوە و کردوویانەتە بستوق. هەروەها لە زمانی فارسی دا بەستو (بەستوو) هەر بەم مانایە هاتوە و لە زمانی پەشتووش دا بسپە (بەسپە) بە مانای قرۆشکە هاتوە.

**بەستووکە** (نا. ل)[بەستوو + کە] بڕ: بەستوو

**بەستە** (نا. مف.)[لە: بەستن] ١ـ هەر شتێکی پێچراوە و ئامادە. ∷ بەستەیەک کتێب، بەستە جگەرە. بەستەیەکم بە پۆست دا نارد. ٢ـ ئەندازەیەک لە گیا کە کەم و زۆری پەیوەندی بە گیایەکەوە هەیە (باقە، چەپک، دەسک). ∷ بەستەیەک گیا بێنە. ٣ـ بەستراو، پەیوەندی. ∷ هاتنی من بەستە بە باوکمە نازانم ئیزنم دەدا یا نا. ٤ـ بە ناوەوە دەلکێ و مانای بەستراو دەدا. ∷ دڵبەستە، پابەستە، چاوبەستە. ٥ـ داخراو، بەستراو. ∷ بەستەزمان. ٦ـ گۆرانی ساکار کە هەواکەی مایەی فۆلکۆریان هەبێ. ٧ـ شتێکی پێچراوە و بەستەبەندی کراو کە دەدرێ بە کەسێک یا بە پۆست دا بەرێ دەکردرێ. **تێدا ~ بوون:** بە کەلک هاتن، بە قازانج بوون، فایدە هەبوون. ∷ ئەو کارەی تۆ چی تێدا بەستەیە.

**بەستەبەندیی** (حم.)[بەستە/١ + بەند + ئیی] کاری پێچانەوەی شمەک و شت لە نێو قوتوو و کاغەز و شتی لەم بابەتە. **~ کردن:** پێچانەوەی شمەک لە کاغەز و قوتوو و شتی لەم بابەتە.

**بەستەزمان** (ئان. ل)[بەستە + زمان] مرۆی فەقیرۆکە و دەستەوەستان و شیاوی دڵ پێ سووتان، بەسەزمان، بەسەزوان.

**بەستەک** (نا. ل)[بەستە + ئەک] پێخەف و جێگە و بانی لە جاجم یا شتێکی دیکەوە پێچراو، دەستەنوێن.

**بەستەڵۆک** (نا. ل)[بەست1 + ئە + ڵۆک] بڕ: بەستەڵەک

**بەستەڵەک** (نا. ل)[بەست1 + ئە + ڵەک] حاڵی زەوی و زار و وڵات لە سەرمایەکی زۆر دا کە بە تەواوی بەستوویەتی، بەستەڵۆک، سەهۆڵبەندان.

**بەستەنی** (نا. ل)[بەست1 + ئەنی] خواردەمەنییەکی ساردە لە شیر و شەکر دروست دەکردرێ. شیر و شەکر لە

دەفرێکی تایبەتی زۆر سارد دەکەن و ئەوەندەی دەسووڕێنن هەتا توند دەبێ. زوو لە کوردستان هەر یەک جۆرە بەستەنی هەبوو بەڵام ئێستاکە تام و ڕەنگ و جۆری زۆری لێ پەیدا بوە، دۆندرمە، حەلاوێ.

**بەستێن** (نا. ل)[بەست2 + ێن] قەراغ و لێواری ئاوی زۆری وەک چەم، دەریا و دەریاچە.

**بەسرپێرار** (نا. ل، ئاک. ل)[بەسر + پێرار][باک: بترپێرار، بەترپێرار - ناو: بەترپێرار، بەسرپێرار، بەسترپێرار، پەسرپێرار، پەسترپێرار، پەسەر پێرارەکە - باش: پەسر پێرار - زا: بتەرپێرار] سێ ساڵ لەمەوبەر، سێ ساڵ بەر لە ئێستا.

**تێبینی:** وشەکانی بەسر (بتەر، بتر، بەستر، بەتر، پەسر، پەستر، پەسەر) بە گشتی لە دوو بەشی [بەس (پەس) + تر] پێک هاتوون. بەس یا پەس لە: پەسچە pasča ـ ی ئەوێستایی و پەسا pasā ـ ی هەخامەنشی و پەس pas ـ ی پەهلەویی بە مانای پاش و بەرەو دواوە کەوتوە. تر پاشگرە و بە گشتی دەبێتە دواوەتر یا پاشتر. بەسرپێرار یانی ساڵێک بەر لە پێرار و بەسر پێرێ یانی ڕۆژێک بەر لە پێرێ. هەروەتر لە زمانی کوردیی دا بۆ دیاری کردنی ڕۆژێک یا ساڵێک بەر لە بەسر ئەم وشەیە دووپاتە دەکرێتەوە وەک بەسربەسر پێرێ یا بەسربەسر پێرار.

هەروەها لە باری فۆنێتیکەوە لە هەندێک زاراوە و بن زاراوە دا پیتی پ (پەستر، ...) لەبەر قورسی بە هۆی جیرانەتی دوو پیتی بێدەنگ (تر، سر، ستر) بوە بە پیتی ب (بەسر، ...).

**بەسرپێرێ** (نا. ل، ئاک. ل)[بەسر + پێرێ][باک: بترپێر، بەترپێر - ناو: بەسرپێرێ، بەترپێرێ، بەسترپێرێ، پەسرپێرێ، پەسترپێرێ، پەسەرپێرەکە - باش: پەسر پێرەکە - هەو: پەرەوەری - زا: بتەرپەرەی] سێ ڕۆژ لەمەو بەر، ڕۆژی پێش پێرێ. (بڕ: تێبینی بەسر پێرار) **بەسرپێرێ شەوێ:** سێ شەو لەمەوبەر.

**بەسفایە** (گیا.)[ئەر] جۆرێک سەرەخسە کە زۆر بەرز نابێتەوە و لە شوێنی شێدار دەڕوێ بە فارسی بسپایە و بە عەرەبیش بسبایج ـ ی پێدەڵێن، بەلەک2.



**تێبینی:** ئەم وشەیە تەنیا مەردووخ نووسیویەتی.

**بەسن** (چا. م)[ئەر] بڕ: بەستن

**بەسنەوە** (چا. م)[ئەر] بڕ: بەستنەوە

**بەسە** (نا.)[ئەر] بڕ: بەستە

**بەسەزمان** (ئان. ل)[بەسە + زمان] بڕ: بەستەزمان

**بەسەزوان** (ئان. ل)[بەسە + زوان] [هەو] بڕ: بەستەزمان

**بەسیرە** (نا. ل)[بە (بەر) + سیرە (شیرە)][باک] بڕ: بەرسیلە

**بەش**[1] (نا.)[ئەو: برای ـ پاز: برێهـ ـ پەهـ: بەخش. باک: بەش ـ ناو: بەش ـ هەو: بەش] ١ـ کوت و پاژێک لە شتێکی دابەش کراو و لەت. :: دوو بەشی کتێبەکەم خوێندۆتەوە. ٢ـ کوتێک لە شتی دابەش کراو بە سەر چەند کەسێک دا. :: کێلۆیەک گۆشت لەم مەڕە بەشی تۆیە. ٣ـ شەریک بوونی چەند کەس لە شتێک دا وەها کە هەر کەس هەندێکی وە بەر کەوێ. ٤ـ چارە، نەسیب. :: بەشی کەرێ یان ئاو کێشانە یان دار کێشان (امثال و حکم ل ٧٥). ٥ـ میرات. ٦ـ (ئان.) سەر کرانەوەی برین. :: برینەکەم دەمی بەش کردۆتەوە. **~ بڕان:** بێبەش و بێ نەسیب بوونی کەسێک لە شتێک کە دەبا بەشی پێبڕابا، بەش خوران، بەش پێنەبڕان. **~ بە دنیاوە نەمان:** (کنـ.) بێبەش بوون لە ژیان، مردن. **~ پێبڕان:** ١ـ وەبەر کەوتنی شتێکی دابەش کراو. ٢ـ میرات وەبەر کەوتن. **~ تێکەوتن:** بە سەر دا کەوتن و بەشدار بوون لە خواردن و شتێکی دابەش کراو، بە نەسیب بوون. :: ئەمنیش بەشم دەو پڵاوخۆرشتەی کەوت. **~ چوونەوە سەر ~ان:** (تووک) تووک لە کەسێکە بە مانای ئەوە کە ئەو کەسە میراتی پێبگا بەڵام خۆی دەستبەجێ بمرێ و کەس و کەسانی دیکە میراتەکەی دابەش بکەن. :: لە خودام تەڵەب و تەمەننایە خێر و خۆشی لە خۆت نەبینی و بەشت بچێتەوە سەر بەشان. **~ خواردن:** ١ـ خواردنی خۆراک و خواردەمەنی بەشی کەسێک لە لایەن کەسێکی دیکەوە کە وەلا نراوە. ٢ـ دەست بە سەر داگرتنی حەق، ماف، ماڵ و زەوی و زاری کەسێکی دیکە. **~ خوران:** حەق و ماف و میرات کە کەسێک دەستی بە سەر داگرێ و بەش بەشدار نەدا. **~ کردن:** ١ـ دابەش کردن لە

نێوان چەند کەس دا. ٢ـ ئەندازە بوون. :: کیلۆیەک گۆشت کوا بەشی دە کەسان دەکا؟ پووڵی مانگانەم بەشی بیست رۆژ دەکا. ~ **مان:** تەواو نەبوونی بەش و پاژی دابەش کراو. :: چێشت هەر بەشی من ماوە. || **بەشی خودا:** هەرچی کە لە لایەن خوداوە وەک شانس و بەخت و چارەنووس و رزق دەدرێ بە مرۆڤ.

**تێبینی:** بەش و بەخت و بارە و کۆمەڵێک وشەی دیکە لە زمانی کوردیی دا لە چاوگی بەگ bag ی ئەوێستایی بە مانای دیاری کردن، قەبووڵ کردن کەوتوون.

**بەش**[2] (ئان.)[باک: بەش ـ ناو: بەش، قەش، قەشان ـ زا: بەش] ١ـ گا و مانگا یا کەڵ و گامێشی نێوچاوان سپی. ٢ـ بزنی نێوچاوان سپی. & مارۆ

**بەش**[3] (ئان.)[زا] بڕ: بژ1

**بەشبڕاو** (نا. مف.)[لە: بەش بڕان] کەسێک کە بەش و مافی خۆی نادرێتێ و بێبەش دەکردرێ.

**بەشبەر** (نا. فا)[بەش1 + بەر7] کەسێک کە بەشێک لە میراتی پێدەبڕدرێ، میراتبەر.

**بەش بەش** (ئان. ل)[بەش1 + بەش1] هەر شتێک یا شوێنێکی لەت و کوت کراو. ~ **بوون:** لەت و کوت بوون. ~ **کردن:** لەت و کوت کردن.

**بەشخوراو** (نا. مف.)[لە: بەش خوران] کەسێکی ماف و حەقیان خواردبێ. :: کورد گەلێکی بەشخوراوە.

**بەشخوراویی** (حم.)[بەشخوارو + ئیی] بەش لێخوران، بێبەش بوون.

**بەشدار**[1] (ئان. فا)[بەش1 + دار2] ١ـ کەسێک کە بەشی لە شتێک دا هەیە، هاوبەش، شەریک. ٢ـ ئەندامێک لە نێو کۆمەڵە خەڵکێک دا. ~ **بوون:** ١ـ هاوبەش بوون، شەرێک بوون، بەش پێوە هەبوون. ٢ـ هاوبەش بوون لە نێو کۆڕ و کۆمەڵەیەک دا.

**بەشدار**[2] (گیان.)[بەش + دار2] سەگ، سەگی نێوماڵ، چوارپێ.

**تێبینی:** بەش لەم وشەیە دا لە ڤیش viš یا ڤیس vis ـ ی ئەوێستایی بە مانای ماڵ کەوتوە. لە ئەوێستا دا ڤیش هەئورڤە viš haurva بە مانای سەگی ماڵ یا بەشدار هاتوە کە لە دوو بەشی viš بە مانای ماڵ و haurva لە چاوگی هەر har بە مانای ئاگا لێبوون

کەوتوە و بە گشتی یانی سەگێک کە ئاگای لە ماڵە.

**بەشداریی** (حم.)[بەشدار1 + ئیی] هاوبەشیی. **~ کردن:** چوونە نێو کۆمەڵ و کۆڕێک بۆ هەر بەرنامەیەک. ٭ لە بەرنامەی نەورۆزی ئیمساڵ منیش بەشداریم کرد.

**بەشقا** (ئاک.) بڕ: بەشکەم

**بەشقم** (ئاک.) بڕ: بەشکەم

**بەشکا** (ئاک.) بڕ: بەشکەم

**بەشکم** (ئاک.) بڕ: بەشکەم

**بەشکوو** (ئاک.) بڕ: بەشکەم

**بەشکە** (ئاک.) بڕ: بەشکەم

**بەشکەم** (ئاک.)[؟] لەوانەیە، دوور نیە، وێدەچێ، ڕەنگە. بەشقم، بەشکم، بەشکوو، بەشکە، بەشکێکم، بەشکێکوو، بەشکی، بەشقا، بەشکا، دەشقەم، دەشقەمێ.

**بەشکی** (ئاک.) بڕ: بەشکەم

**بەشکێکم** (ئاک) بڕ: بەشکەم

**بەشکێکوو** (ئاک.) بڕ: بەشکەم

**بە شوار** (ئان. فا)[بە + شوار (شۆردن)] سابوون، شامپۆ یا شتێکی لەم بابەتە کە بۆ شۆردن باش کەف بکا، بەشورار. **~ بوون:** باش کەف کردنی سابوون بۆ شۆردن.

**بە شورار** (ئان. فا)[بە + شورار (شۆردن)][موک] بڕ: بەشوار

**بە شوو** (ئان. ل)[بە + شوو] ژنی بە مێرد، ژنی خاوەن شوو.

**بەشەر** (نا.)[عەر: بشر] خەڵک، مەردم، مرۆڤ، ئینسان. **~ بوون:** چەشنی مرۆڤ جووڵانەوە، ئەوجۆرەی کە بەشەر دەبێ بژی. **~ کردن:** (کن.) تەمبێ کردن، ئاقڵ کردن، هێنانەوە سەر ڕێی مرۆڤ. ٭ بە دوو زللان کردمە بەشەر.

**بە شەرت** (ئان. ل)[بە + شەرت] بە پێی قەرار و بەڵێنی، بە مەرج. ٭ ئەو کەوشەت بە شەرتی دووساڵان دەدەمێ شتێکی لێهات بۆم بێنەوە. || **بە شەرتی چەقۆ:** ١- ڕستەی شووتی فرۆشانە کە شووتی دەبڕن و ئەگەر سوور نەبوو دەتوانی نەیکری. ٢- (مج.) زەمانەتی هەر شتێک، بە زەمانەت.

**بەشەردۆست** (ئان. ل) [بەشەر + دۆست] کەسێک کە تەواوی بەشەری بە هەموو ڕەنگ و ڕەگەزەوە خۆش دەوێ،

ئینساندۆست، مرۆڤدۆست.

**بەشەردۆستیی** (حم.)[بەشەر دۆست + ئیی] خۆش ویستنی هەموو مرۆڤ، ئینساندۆستیی، مرۆڤدۆستیی.

**بەشەرم** (ئان. ل)[بە + شەرم] کەسێک کە شەرمی هەیە، شەرمن، شەرمێون، شەرمین. // بێشەرم. ~ **بوون:** خاوەن شەرم بوون، شەرمێەن بوون.

**بەشەرەف** (ئان. ل)[بە + شەرەف] کەسی خاوەن شەرەف و غیرەت، بە ناموس. // بێشەرەف. ~ **بوون:** خاوەن غیرەت و شەرەف بوون، بەناموس بوون.

**بەشیر** (ئان. ل)[بە + شیر] ئاژەڵێک کە شیر زۆر دەدا. ٢ـ ژنێک کە شیری زۆرە.

**بەشیلا** (گیا.)[؟][زا] بڕ: کاڵەک

**بەشین** (چا. م)[بڕ: بەخشین] دابەشین، بەش کردن.

**بەشینەوە** (چا. م)[لە: بەشین] دابەش کردنی شتێک بە سەر کۆمەڵ و خەڵکێک دا بە خۆڕایی، دابەش کردن، بەخشینەوە، وەبەشین. :: ماڵە کاک حەمەدی گۆشتی قوربانی دەبەشنەوە.

**بە عالەمی ئاشکرا** (ئاک. ل)[بە + عالەم + ئی + ئاشکرا] ئەنجامی کار و کردەوەیەک بەبێ پەردە و لە بەر چاوی خەڵک، بێ نهێنی و شاراوەیی، بە ئاشکرا. :: بە عالەمی ئاشکرا ماڵەی لێ داگیر کردم. بە عالەمی ئاشکرا درۆیان دەکەی!

**بەعز** (نا.)[عەر: بعض] بەشێک لە شتێک، هێند، هەند. :: شەهیدی غەمزەیە بەعزێ (مەحوی). بەعزە شتێکمان نەماوە.

**بەعومر** (ئان. ل)[بە + عومر] بە تەمەن، بەساڵاچوو، پیر، بەعەمر. ~ **بوون:** پیر بوون، بەتەمەن بوون.

**بەعەمر** (ئان. ل)[بە + عەمر] بڕ: بەعومر

**بەعی** (نا.)[عەر: بیع] هەندێک پارە کە لە کاتی سەودا دەدرێ بە خاوەن ماڵ هەتا کالا راگرێ یا بیداتێ و لە دوایی پارەی تەواو وەرگرێ، پێشەکی.

**بەعینوان** (ئان. ل)[بە + عینوان] ئافرەت و کیژی بەناز و مەکرزان، زانا لە ناز و دڵداریی. :: باسکم وەبن سەری دە، کەڵەگەتەی بە عینوان/ ئێواران لاجان خۆشە، سبحەینان بەری مێرگان



(کانی مـرادان ل ١٤٤). ~ **بوون:** نازدار و به مەکر بوون.

**به غەرەز** (ئان. ل)[به + غەرەز] کەسێک کە غەرەزی هەیە، کەسێک کە نیازی زەرەر لێدانی هەیە. // بێغەرەز. ~ **بوون:** غەرەز دە دڵ دابوون بۆ زەرەر لێدان.

**به غیرەت** (ئان. ل)[به + غیرەت] ١ـ کەسی نەترس و ئازا، بوێر. ٢ـ کەسێک کە نامووسی پێ گرینگە، بە نامووس. ~ **بوون:** ١ـ ئازا بوون، نەترسان. ٢ـ بە نامووس بوون.

**بەغیل** (ئان.)[عەر: بخل] کەسێک کە خۆشی و بەختەوەری خەڵکی لە لا گرانە، حەسوود. ٢ـ چاوچنووک، ڕژد، لەچەر. ~ **بوون:** ١ـ ئێرەیی هەبوون، حەسوود بوون. ٢ـ لەچەر بوون.

**بەغیلایەتی** (حم.)[بەغیل + ئایەتی] کردەوەی کەسی حەسوود و بەغیل، حەسوودیی، ئێرەیی، بەغیلیی. ~ **پێبردن:** حەسوودی پێکردن، نارەحەتی کەسی بەغیل بە خۆشی یا سەرکەتنی کەسێک، بەغیلی پێبردن، بەغیلی پێکردن، بەغیلایەتی پێکردن، ئێرەیی پێکردن. ⁂ حاجی سەرەڕای ئەو هەموو ماڵ و مڵکە بەغیلایەتی بەو کەچە دوکانەم دەبا. ~ **پێکردن:** بڕ: بەغیلایەتی پێبردن.

**بەغیلیی** (حم.)[بەغیل + ئیی] بڕ: بەغیلایەتی. ~ **پێبردن:** بڕ: بەغیلایەتی پێبردن. ~ **پێکردن:** بڕ: بەغیلایەتی پێبردن.

**بەفاڵ** (ئان. ل)[بە +فاڵ (عەر: فحل)] حاڵی ماکەر یاماینێک کە مەیلی جووت بوونێان دەگەڵ نێرەکەیان هەبێ، بەتەڵەب.

**بەفر** (نا.)[هیک: ڤەپرە ـ ئەو: ڤەفرە ـ پار: وفر ـ سوغ: وفر ـ خوار: وفرک، وفیرک ـ پەه: ڤەفر. تات: فەرفە ـ فار: برف. باک: بەرف ـ ناو: بەفـر، بەور ـ باش: وەفر، بەفر ـ هەو: وەرو، وەروی ـ زا: ڤۆرە، ڤەورە] ١ـ کلوویەکی سپی شەشپەڕ کە زستانان لە هەورەکانەوە دێتە خوارێ. (زستانان چوونکە پلەی گەرما لە ژێر سفرە و ئاو لەم پلە دا دەبیەستێ هەڵمی ئاو کە دێتەوە خوار لەم وەرزە دا دەبێتە شەشپەڕی سپی و جوانی بەفر). ٢ـ پارچە بەفرێک کە زستانان لە چاڵەبەفر دا رایدەگرن و بە هاوین دەیفرۆشنەوە. ٣ـ سەهۆڵی

دەسکرد. ~ **بارین:** هاتنە خواری بەفر لە ئاسمانەوە بۆ سەر زەوی. ~ **توانەوە:** دەست بە ئاو کردنی بەفر لە بەر تین و گەرما، بەفر چوونەوە. ~ **چوونەوە:** بڕ: بەفر توانەوە. ~ **خستن:** کەوتنی بەفر لە سەر زەوی. ∷ بەفرێکی قورسی خستوە. ~ **دادان:** دەست بە بارین کردنی بەفر، بەفر داکردن. ~ **داکردن:** بڕ: بەفر دادان. ~ **مالین:** فڕێ دانی بەفر بە پاروو و وەروەرە لە سەربانەوە. ‖ **بەفری پیرێژن:** بەفرێکە کە لە کاتی سەرمای پیرێژن دا دەبارێ. **بەفری یەکشەوە:** نوا بەفرێک کە شەوێک بە سەر بارینی دا تێپەڕیبێ و چڵکن نەبووبێ. ٢ـ (کنـ.) زۆر سپی و جوان و بێگەرد. ∷ روخساری وەکوو بەفری یەکشەوە پاک و روون بوو. (دمدم ل ٢٤٩).

**بەفرانبار** (نا. ل)[بەفر+ ئان + بار] یەکەم مانگی زستان و دەیەم مانگی ساڵی هەتاوی.

**بەفراو** (نا. ل)[بەفر + ئاو] ١ـ ئاوێک کە سەرەبەهار لە توانەوەی بەفر پەیدا دەبێ و لە شاخان دێتە خوار، وەفراو، شەتاو. ٢ـ ساز کردنی ئاو بە بەفری چاڵ. ٣ـ سەهۆڵاو.

**بەفر بەسەر** (ئان. ل)[بەفر + بە + سەر] بەفرێک کە لە بەر سەرمای زۆر بەستوویەتی مرۆڤ کە بە سەری دا دەڕوا پێی ناچێتە خوار، بەفرەسەر.

**بەفرخۆرکە** (نا. ل)[بەفر + خۆرکە] بەفرێکی وردە کە لە ئاخر و ئۆخری رەشەمە لە هەورێکی ئەستوور دەبارێ و دوای ئەوە بەفر وردەوردە دەتوێنەوە.

**تێبینی:** خۆرکە هەم دەتوانێ لە [خۆر (خواردن) + کە] کەوتبی و هەمیش بە مانای خۆرکە بێ. ماناکەی بە گشتی بەفرخۆرە.

**بەفرفرۆش** (ئان. فا)[بەفر + فرۆش] کەسێک کە زوو هاوینان بەفری لە چاڵ دەردەهێنا و بە خەڵکی دەفرۆشت.

**بەفرفرۆشیی** (حم.)[بەفرفرۆش + ئیی] کار و ئیشی کەسی بەفرفرۆش. ∷ لەوتی یەخچاڵ پەیدا بوە بەفرفرۆشیی باوی نەماوە.

**بەفرماڵ** (نا. ل)[بەفر + ماڵ/٣] ئامرازێکی چێویی گەورەتر لە بێڵ کە بەفری سەربانی پێ دەماڵن، بانماڵ، بەفرماڵک، وەروەرە، بەورانماڵ.

**بەفرماڵک** (نا. ل)[بەفرماڵ + ک] بڕ: بەفرماڵ



**بەفر و دۆشاو** (نا. ل)[بەفر + و + دۆشاو] بەفری داناردانار کە بارانی بە سەر دابارێبێ و بەهاران لە هەندێک شوێنی چیا دەمێنێتەوە کە دەگەڵ دۆشاو تێکەڵ دەکردرێ و دەخورێ.

**بەفرەچاڵ** (نا. ل)[بەفر + چاڵ] بڕ: چاڵەبەفر

**بەفرەژیلکە** (نا. ل)[بەفر + ئە + ژیلکە] بەفرێکی داناردانای ورد و پووک و سووکە کە وەک کلووبەفری دیکە ئاودار نیە، کەرەسیسە، بەفرەڵووکە، بنگرە.

**بەفرەسەر** (ئان. ل)[بەفر + ئە + سەر] بڕ: بەفر بەسەر

**بەفرەڵووکە** (نا. ل)[بەفر + ئە + ڵووکە] بڕ: بەفرەژیلکە.

**بەفرین** (ئان. ل)[پەه: ڤەفرێن][بەفر + ین] ١ـ وەک بەفر، لە ڕەنگی بەفر. ٢ـ بەفراوی، بە بەفر داپۆشراو. :: لووتکەی بەفرین. ٣ـ ناوە بۆ مێینە.

**بەفش** (نا.)[باک] بڕ: بەوش

**بەفیز** (ئان. ل)[بە + فیز] کەسێک کە خۆی پێ زۆرە و پۆز لە سەر خەڵک لێدەدا، بەدەعێ، بەپۆز. **~ بوون:** بەدەعی بوون، پۆز لێدان، بەپۆز بوون.

**بەڤش** (نا.)[باک] ١ـ بڕ: بەوش. ٢ـ (ئا.) جمگەی دەست و پێ.

**بەق**[1] (نا.)[باک] بڕ: بۆق1

**بەق**[2] (نا.)[؟] ١ـ [هەو] کەوی نێر، نێرەکەو. ٢ـ [ئەر] نێرەکەوێک کە ڕاوچی لە ڕکە دا بۆ ڕاوی سیاسووتی دەبەن هەتا بخوێنێ و نێرەکەوی دیکە بە دەنگیەوە بێن و لە داو کەون، پاداو.

**بەقا** (نا.)[عەر: بقاء (مانەوە)] ١ـ مانەوە. ٢ـ باوەڕ، بڕوا. ٣ـ وەفا. **~ پێکردن:** باوەڕ پێکردن. :: هەزار سوێندیشم بۆ بخوی بەقات پێناکەم. **~ پێهەبوون:** باوەڕ پێ هەبوون، دڵنیا بوون. **~ کردن:** باوەر کردن. :: بەقا ناکەم ئەو قسەیە ڕاست بێ. **~ هەبوون:** وەفا هەبوون. :: ئەو دونیایە بەقای بۆ کەس نیە.

**بەقاڵ** (نا.)[عەر: بقال] دوکاندارێکی کە شتی پێویستی خواردن وەک پەنیر، ڕۆن، قەند و چا، ... دەفرۆشێ، بەققاڵ.

**بەقاڵیی** (حم.)[بەقاڵ + ئیی] ١ـ کار و پیشەی کەسی بەقاڵ. ٢ـ (نا.) دوکانێک کە کەرەسەی ناوبراوی سەرەوەی تێدا بفرۆشرێ.

**بەقبەقوو** (نا. د)[بەق + بەق + ئوو] دەنگی کۆتر، گمەگم.

**بەققاڵ** (نا.) بڕ: بەقاڵ

**بەقە** (نا.)[زا] بڕ: بۆق1

**بەقەد** (ئاک. ل)[بە + قەد] بەقەرا، بە ئەندازە، بەقەدەر، بەقەی :: بە قەد ئەو دنیایە خۆشم دەوێی.

**بەقەدەر** (ئاک. ل)[بە + قەدەر] بڕ: بەقەد

**بەقەرا** (ئاک. ل)[بە + قەرا] بڕ: بەقەد

**بەقەم** (نا.)[؟] ١- (گیا.) دارێکی خۆرسکە، هەتا دوازدە گەز بەرز دەبێتەوە، گوڵەکەی سپی مەیلەو زەردە، مادەیەکی رەنگینی تێدایە بە ناوی هێماتین کە رەنگی شین، مۆر، بۆر، رەش و سووری لێدەردەخەن و بۆ رەنگ کردنی پارچەی ئاوریشم و خوری کەلکی لێوەردەگرن، Haematoxylon campechianum ناوی لاتینی ئەم دارەیە. ٢- رەنگی وەرگیراو لە داری بەقەم. ٣- رەنگێک کە کاڵ بێتەوە. :: من مەتاعم جاوە، چاوم باخەبەر بێ موشتەری / تا غەزەل سەودا نەکا لای تاجری چیتی بەقەم (نالی ل ٣١٠).

**بەقەو** (ئان. ل)[بە + قەو] بە دەنگی بەرز.

**بەقەوەت** (ئان. ل)[بە + قەوەت] بڕ: بەهێز

**بەقەی** (ئاک. ل)[بە + قەی (قەد)] بڕ: بەقەد

**بەقین** (ئان. ل)[بە + قین] قین ئەستوور.

**بەکار** (ئان. ل)[بە + کار] ١- مرۆی بەهێز و کارەکەر. ٢- مەکینەی کە باش و زۆر کار دەکا. & کارا، کاری.

**بە کاوە خۆ** (ئاک. ل)[بە + کاو1 + ئە + خۆ] ١ - بەشێنەیی، بەئارامی، ئارام ئارام. ٢- (ئان. ل) کەسێک کە لە کار کردن دا پەلەی نەکا. ~ **بوون:** ١- پەلە نەکردن لە کار و مەسەلەیەک. ٢- ئارام و لە سەرەخۆ بوون.

**تێبینی:** کاو بە مانای مراد و ئاواتە (بڕ: کاو1) و مانای گشتی دەبێتە بە کەیف و مرادی خۆ، بە دڵی خۆ.

**بەکرە** (نا.)[عەر: بکرة] ١- ئامرازێکی ئوستوانەیی نێوقەد باریکە لە چێو یا پلاستیک کە کارخانە سازی دەکا و دەزوو و بەنی دروومانی لە سەر



هەڵدەکەن. ٢ـ ئامرازێکی خڕە لە ئاسن کە دەورادەوری بەتاڵ کراوە و لە بەرزایی قـــایمی دەکـــەن و باری قـــورسی پێـهەڵدەکێشن. & غەرغەرە، قرقرە، مەکارە.

**بەکرێ گیراو** (نا. مف.)[بە + کرێ + گیراو (گیران)] ١ـ هەر کەسێک کە بە پارە لای کەسێک یا کەسانێک کار بکا. ٢ـ کەسێک یا کەسانێک کە نۆکەری کەسێکی هێزدار و دەسەڵاتدار بکەن یا بۆ بەرژەوەندی ئەو هەوڵ بدەن و سیاستی ئەوان رەچاو بکەن. (بۆ ئەم مەبەستە زۆرتر لە باری سیاسەوە دەکوترێ)، خۆفرۆش.

**بەکرێ گیراویی** (حم.)[بەکرێ گیراو + ئیی] ١ـ ئاکامی بە پارە لای کەسێک کـار کـردن. ٢ـ نۆکـەرایەتیی بۆ بەرژەوەندی کەسێک، خۆفرۆشیی.

**بەکەڵ** (ئان. ل)[بە + کەڵ] مانگایەک کە مەیلی جووت بوونی دەگەڵ گا هەبێ.

**بەکەیف** (ئان. ل)[بە + کەیف] شاد، دڵخۆش، کەیفساز. ~ **بوون:** دڵخۆش بوون، لە سەر کەیف بوون، کەیفساز بوون.

**بەگ** (نا.)[تور: beg] ١ـ نازناوی خان و ئەرباب و سەرۆک عەشیرەت کە بە دوای ناویان دا دێ. :: عەلی بەگ، تاهیر بەگی جاف. ٢ـ نازناوێکە بە نیشانەی رێز گرتن بە دوای ناوی ئاساییەوە دەلکێ.

**بەگا** (ئان. ل)[بە + گا] حاڵی زەییەیەکی دێراو کە ئامادەی چاندنی رەپستەیە.

**بەگایەتیی** (حم.)[بەگ + ئایەتیی] حاڵەت و چلۆنایەتی بەگ، بەگ بوون، بەگێتی.

**بەگزادە** (ئان. مف.)[بەگ + زادە] هەموو ئەو کەسانەی لە بنەماڵەی بەگن.

**بەگلەر** (نا. ئان.)[تور: begler] ١ـ میر، خان. ٢ـ گەورەی شار یا تایفە.

**بەگم** (نا.)[تور: begüm] نازناوی ژنە ئەرباب و خان.

**بەگوڕ** (ئان. ل)[بە + گوڕ] ١ـ حاڵی کەسێکی بە هێز و بە تاقەت. ٢ـ (ئاک. ل) بە تەوژم و بە تین. :: بەگوڕ خۆی بە غەنیم دادا و لە عەرزی راکێشا. ~ **بوون:** بەهێز و بەتاقەت بوون. :: عەلی پیاوێکی بەگوڕ و بەهێزە.

**بەگون** (ئان. ل)[بە + گون] ١ـ گا و

نێری نەخەسێنراو. ٢ـ (کنـ.) مرۆی بە جەرگ و بە غیرەت، گوندار. **~ بوون:** (کنـ.) بەجەرگ و بەغیرەت بوون، گوندار بوون.

**بەگێتی** (حم.)[بەگ + ئێتی] بڕ: بەگایەتی

**بەل**[1] (ئان.)[باک: بەل ـ ناو: بەل ـ باش: بەل ـ زا: بەل، بەڵ] ١ـ قوت، قیت، دەرپەڕیو، راست وەستاو. ٢ـ هەڵواسراو، شۆڕ. ٣ـ بزنی گوێ لوول. ٤ـ [باک ـ زا] گوێ قوت. ٥ـ [باک] ئەندامی بڕاو و کورت، پەل.

**تێبینی:** بە چاو لێکردن لە هەندێک وشەی وەک بەلک، بەلۆکە، بەلە، بەلەک، بەلەزمانە، ... بەل بە کوتە گۆشتێکی زێدە خۆ دەنوێنێ و دوور نیە دەگەڵ بەڵ لە بەلاڵووک هەر یەک بن، ئەودەم دەبێتە ئاڵووی شۆڕ و هەڵواسراو. شک نیە ئەم وشەیە بێ ریشە نیە. من پێموایە ئەم وشەیە دەگەڵ پەل و پەلک و بەرگ خزمایەتییەکی نزیکیان هەیە و بۆی هەیە لە یەک سەرچاوە گووڕابن.

**بەل**[2] (ئان.)[؟] رەنگێکە لە رەنگەکانی بزن و حەیوان. ⁝⁝ بەلەمس، بەلەبۆز، بەلەبەش، بەلەکوور، بەلەسوورمس.

**بەلازی** (گیا.)[؟][زا] بڕ: چەوەندەر

**بەلاش** (نا.)[عەر: بلاشیء] ١ـ خۆڕایی، مفت، بێپارە. ٢ـ بێهۆ، بێسەبەب. ٣ـ (مجـ.) زۆر هەرزان. ⁝⁝ ئەو کراسەی بایی سی تمەنە، بەڕاستی بەلاشە. **~ بوون:** ١ـ مفت بوون، بەخۆڕایی بوون. ٢ـ هەرزان بوون. **~ کردن:** ١ـ مفت کردن، خۆڕایی کردن، بەخۆڕایی دان. ٢ـ زۆر هەرزان دان، هەرزان کردن.

**تێبینی:** زەبیحی لە ئاست ئەم وشەیە دا دەڵێ کە بە ناڕەوا ئەم وشەیە بە عەرەبی دەزانن و لە بۆچوونێکی هەندێک درێژ دا دەیەوێ بیسەلمێنێ کە وشەیەکی کوردییە (بڕ: قامووس ب ٢ ل ٢٠٨). ئەم وشەیە لە عەرەبییەوە بە شێوەی beleş چۆتە نێو زمانی تورکییەوە و لە رێگای تورکەکانی عوسمانییشەوە هاتۆتە نێو هەندێک لە زاراوە و بن زاراوەکانی زمانی کوردیی.

**بەلاڤ** (ئان.)[باک] بڕ: بڵاو

**بەلالک** (نا. ل)[بەل1 + ئالک (ئاڵوو)][زا] ترێی دەنک ورد.

**بەلالووک** (گیا.)[باک] بڕ: بەلاڵووک

**بەلک** (نا. ل)[بەل1 + ک] نەرمایی

بەشی هەرە خوارەوەی گوێ کە شۆڕ بۆتەوە؛ ژنان کونی دەکەن و گوارەی تێدەکەن.

**بەللۆرە** (نا.)[سۆر] بڕ: بالۆرە

**بەلندیر** (گیانـ.)[باک] بڕ: بەردیل

**بەلنگاز** (ئان.)[زا] بڕ: بەلەنگاز

**بەلوەشێن** (نا.)[؟][باک] ١ـ گول. ٢ـ گولی.

**بەلۆعە** (نا.) بڕ: بالووعە. ⁛ حەوزێکی تێدایە بەلۆعەیەکی تێگیراوە بە ئەندازەی چوارمیتر. ئەو ئاوەی بڵیند دەبێ لە سەر ئەو بەردە مەڕمەڕە پەخش و پەرێشان دەبێ (بەیتی سەعید ومیر سێوەدین ـ سروە ژ ٧٣ ل ١٩).

**بەلۆکە** (ئا.)[بەل1 + ئۆکە] پارچە گوشتێکی زێدەی چووکە لە سەر زارکی شەرمی ژن، میتک، میتکە، قیتکە، نێوەر، نێوەرووکە، بەلە، بەلۆکە، بەلووکە، بەلوو.

**بەلوو** [1] (نا.)[باش ـ هەو] بڕ: بەڕوو

**بەلوو** [2] (نا. ل)[بەل1 + ئوو] بڕ: بەلۆکە

**بەلووکە** (ئا.)[بەل1 + ئووکە][هەو] بڕ: بەلۆکە

**بەلە** [1] (نا. ل)[بەل1 + ئە] بڕ: میتکە

**بەلە** [2] (نا.)[باک] بڕ: باڵە

**بەلەباریک** (ئان. ل)[بەل1 + ئە + باریک] مرۆڤی درێژ و باریک و رەقەڵە، بەلەباریکە.

**بەلەباریکە** (ئان. ل)[بەل1 + ئە + باریک + ئە] بڕ: بەلەباریک

**بەلەباقە** (نا. ل)[بەل1 + ئە + باقە] نەخۆشییەکە تووشی بزن دەبێ، لە بارەی دەخا و دەیکووژێ.

**بەلەبەل** (نا. ل)[بەل1 + ئە + بەل1] لەرە، لەرەی زۆر و پەیتاپەیتا. ~ **کردن:** لەرینەوە، لەرزانەوە.

**بەلەپا** (ئان. ل)[بەل + ئە + پا][هەو ـ ئەر] بڕ: بەلەپێ.

**بەلەپێ** (ئان. ل)[بەل + ئە + پێ] کەسێک کە لە رۆیشتن و رۆیین دا خێرایە، قۆچاغ، بەلەپا، بەپێ.

**بەلەتووشقە** (نا. ل)[بەل؟ + ئە + تووشقە؟][هەو] بڕ: بەلەفیرە

**بەلەچەک** (نا.)[؟] ١ـ کوولەکە و تەڕەکاری ویشک کراو بۆ زستان، تاسمە. ٢ـ چێشتێک کە بە تاسمە و نیسک و کشمیش ساز کرابێ.

**بەلەدی** (ئان. ل)[بەلەد (عەر: بلد = شار) + ئی] کەسێک کە لە شارەداری (بەلەدیە) کار دەکا و ئیشی گەسک لێدانی کوچە و شەقامەکانی شار و راگوێزتنەوەی زبڵ و زاڵە.

**بەلەدیە** (نا.)[عەر: بلدیە] بڕ: شارەداری

**بە لەز** (ئاک. ل)[بە + لەز] بڕ: بە پەلە

**بەلەزمانە** (نا. ل)[بەل1 + ئە + زمانە] کوتە گۆشتێکی چووکەیە، لە بنەبانی مەلاشوو داچۆڕاوەتە خوار، بەلەزوانە.

**بەلەزوانە** (نا. ل)[بەل1 + ئە + زوانە] [هەو ـ ئەر] بڕ: بەلەزمانە

**بەلەسان** (گیا.)[عەر: بیلسان لە یون: balsamon] دەوەنێکە کە گوڵەکانی سپیە و لە تەواوەتی ئەم دەوەنە بە داڕووشان جیوە دێتە دەر کە لە جیوە و بەرەکەی وەک دەرمان کەلک وەردەگرن. Amyris opobalsamum ناوی لاتینی ئەم دەوەنەیە، بەیلەسان. ‖ **بەلەسانی رەش:** دارێکی خۆڕسکە، گوڵەکانی سپی و بۆنخۆشن، نێوی ساقەتەکەی نەرمە، بۆ هەندێک کاروباری ئازمایشگایی و پزشکی بەکاری دێنن، Sambucus nigra ناوی لاتینی ئەم دارەیە. (عەر: خمان)

**بەلەسوورمس** (ئان. ل)[بەل2 + ئە + سوور + مس] رەنگێکە بۆ بزن و گیسک.

**بەلەسە** (ئان.)[؟] گیانداری یاخی.
**~ بوون:** یاخی بوون.

**بەلەشوانە** (گیا.)[ئەر] بڕ: بەناشوانە

**بەلەفیرە** (نا. ل)[بەل؟ + ئە + فیر (فیراندن) + ئە] ١ـ نەخۆشییەکە وەک زگ چوونێکی زۆر توند، تووشی هەموو مالاتێک دەبێ، بەلەتووشقە. ٢ـ (مجـ.) زگ چوونی زۆر توندی مرۆڤ، تەقەفیرە. & بەلەفیرێ.

**بەلەفیرێ** (نا. ل)[بەل؟ + ئە + فیر (فیراندن) + ئێ] بڕ: بەلەفیرە

**بەلەک**[1] (ئا.)[باک: بەلەک ـ ناو: بەلەک] ماسوولکەی پشت لوولاک، لە رەفیسکەوە هەتا پێچکەی پێ، پووز، چیپ، چاق، لەتەر.

**بەلەک**[2] (گیا.)[؟] ١ـ گیایەکی خۆڕسکە، هەتا گەزێک هەڵدەستێ، رەگ و ریشەی زۆرە، گوڵەکانی هێشووی و شینن. لە کوردەواری دا لە رەگەکەی بۆ رەوانی و کار کردنی زگ و برینی گەدە



کەلکی لێوەردەگرن. Glycyrrhia glabra ناوی لاتینی ئەم گیایەیە، شیرین بەلەک، مێکووک، مێکووکە. ٢ـ گیایەکە گەڵای وەکوو گەڵای هەنارە، باڵا پیاوێ کەمتر بەرز ئەبێت، شیرەدارە بۆ پەردووی خانوو لەگەڵ زەل و پووش دا، بۆ سەری چاڵەگەنم، بۆ داپۆشینی بە کار دێنرێ، ریشەکەشی لە دروست کردنی کۆکاکۆلا و پێپسی کۆلا دا بە کار دێنری (عرق السوس)(بڕ: کشت و کاڵ ب ١ ل ٥٠)، بەسفایە.

**بەڵەک**3 (ئان.)[باک ـ زا] بڕ: بەڵەک

**بەلەک پێچ** (نا. ل)[بەلەک1 + پێچ] پارچەیەکی درێژ و تەنکە، بە قەرا چوار قامک پانە و کە لە کاتی رێ برین بۆ گورج و گۆڵی لە بەلەکی دەهاڵێنن، دۆلاغ، ساق پێچ، پووزپێچ، پووزلغ، پووزەوان، پووزەوانە، پووزەوانێ، پاپێچ.

**بەلەک زەرد** (ئان. ل)[بەلەک1 + زەرد2] بەلەکی شووش و باریک و جوان، ژن و کچێک کە بەلەک و پووزی شووش و باریک بێ. :: دەڵێی خاسەکەوە و لە بەفرێ دا سەری لێشێواوە/ منت بمرم! ئەو کیژی بەلەک زەرد، دایکی خۆی ماوە؟ (سەعید و میرسێوەدین ل ١١). شۆڕەمەحموود لە تاو مەرزینگان ئەوی عەقڵ مەعنا بێ نەیمابوو، دەیگوت: نەمێنم، کیژی بەلەک زەردیان برد! (شۆڕەمەحموود ل ٨٣)

**بەلەم** (نا.)[؟] ١ـ جۆرێک ئامێری چێوییە بۆ پەڕینەوە لە رووباری گەورە کەلکی لێوەردەگرن و بە کوتانی سەوڵ دەچێتە پێش، لۆتکە، قایق، قەیاغ. ٢ـ جۆرێک دەفری درێژۆکەیە، پترلە چینی ساز دەکرێ و لە کوردەواری دا بۆ پلاو تێکردن کەلکی لێوەردەگرن، بلووت، دیس.

**بەلەمرک** (ئا.)[بەل1 + ئە + مرک] [باش] بڕ: ئانیشک

**بەلەمس** (ئان. ل)[بەل2 + ئە + مس] رەنگێکە بۆ بزن و گیسک. :: گیسکی بەلەمس.

**بەلەندیرە** (گیانـ.)[زا] بڕ: بەردیل

**بەلەنگاز** (ئان.)[؟][باک: بەلەنگاز ـ زا: بەلەنگاز، بەلنگاز] هەژار و نەدار، بێچارە، فەقیر، بەستەزمان.

**بەلەنگازی** (حم.)[بەلەنگاز + ئی] هەژاریی، فەقیریی، بێچارەیی.

**بەلەنگووش** (ئا.)[بەل1 + ئەن +

گووش][زا] نەرمایی گوێ

**بەلی** (نا.)[زا] بڕ: بەڕوو

**بەڵ**[1] (ئان.)[بڕ: بەل1][زا] رەپ، رەق.

**بەڵ**[2] (حـر.)[عـەر: بل] بڕ: بەڵکە. ∷ مـژدەم بەڵ بەیۆ ناگـا چـە دەردا/ نیگام وراسـتـەن وە راگـوزەردا (مـەولەوی ل ٥١٨).

**بەڵا**[1] (ئاک.) سـواو و سـووک کراوەی بەڵام

**بەڵا**[2] (ئام.) بڕ: با5

**بەڵا**[3] (نا.)[عەر: بلا] ١ـ نـاڕەحـەتی و چەرمـەسـەری و رووداوێکی خـراپ کـە تووشی کـەسـێک دێ. ٢ـ ئـافـەت. ٣ـ ئـەزیـەت، ئـازار. ٤ـ (کـنـ.) زیـرەک، فـێڵـەزان. **بەر ~ کـردن:** تووشی بەڵا کـردن، بەڵا بە سـەر هێنان، وەبەر بەڵا دان. **~ بە سـەر هاتن:** تووشی بـەڵا بوون، تووشی چەرمـەسـەری و ناخـۆشی بوون. **~ بە سـەر هێنان:** تووشـی ئـەزیەت و ئـازار کـردن، دەرد دان. **~ گێڕانەوە:** بەری بەڵا گرتن. **~ لێبارین:** تووشـی چەرمـەسـەری و ناڕەحـەتی و کـارەسـات و بەڵا بـوون. **~ لێـدان:** تووشی بەڵا و ناڕەحـەتی و چەرمـەسـەری هـاتن، بەڵا لێکەوتن، وەبـەر بەڵا کـەوتن. **~ لێکەوتن:** تـووشی بـەڵا بوون، بـەڵا لێدان، بەڵا وێکەوتن. **~ وێکەوتن:** بەڵا لێدان، تووشی بەڵا بوون. **بێ ~ بوون:** (دوعـا ـ گـازنـدە) لە بەڵا بـە دوور بوون، تووشی نـاخـۆشی و چـەرمـەسـەری نـەهـاتـن. ∷ بـێ بـەڵا ئـەوە بـوا درەنـگ هاتی! **وەبەر ~ دان:** کەسـێک تووشی بەڵا کـردن، بـەر بەڵا کـردن. **وەبەر ~ کـەوتن:** تـووشـی بـەڵا بـوون، تووشـی چەرمـەسـەری و ناخـۆشی بوون. || **بەڵای ئاسـمـانی:** بەڵایەکی کـتـوپڕ کە بە سـەر کـەسـێک دێ. **بەڵای کـتـوپڕ:** بەڵایەکی کتوپڕ و لە نەکاو بە سـەر کـەسێک بێ، بەڵای ناگـەهـان، بەڵای ئاسـمـانی. **بەڵای گیـان:** ١ـ کـەسـێک یا شـتێک کـە هۆی ئەزیەت و ئازارە. ٢ـ (کنـ.) یار، گـراوی. **بەڵای لابەلا:** بەڵا و نارەحـەتی چاوەڕوان نەکـراو کـە لە لاوە تووشـی مـرۆڤ دێ. **بەڵای ناگەهان:** بڕ: بەڵای کتوپڕ.

**بەڵاگەردان** (نا. فا)[بەڵا3 + گەردان] کەسێک یا شتێک کە بەری بەڵا دەگرێ و دەیگێڕێتەوە وەک سـەدەقـە و قـوربانی و نەزر، بەڵاگێڕ، بەڵاگێڕەوە، بەڵاوەگێڕ. ∷ خـۆم بە شـانازی بـەڵاگـەردانی سەربەرزیت دەکەم / تیـخی خۆی دابێنێ دوژمـن بۆ مـەتاڵت حـازرم (هـێـدی ل

١٥٩). بەلاگەردانی بالات بم ئەگەر چووم / فیدای هیندوویی خالت بم ئەگەر مام (نالی ل ٢٦٢).

**بەلاگێڕ** (نا. فا)[بەلا3 + گێڕ] بڕ: بەلاگەردان. :: دلم سەودازەدەی بالاتە خۆم دلدارەیی ئەبرۆت / بە بالا دل بەلاگێرت، بە ئەبرۆ خۆم بە قوربانت (وەفایی ل ٢٨)

**بەلاگێڕەوە** (نا. فا)[بەلا3 + گێڕ + ئەوە] بڕ: بەلاگەردان

**بەلاوەگێڕ** (نا. فا)[بەلا3 + وە + گێڕ] بڕ: بەلاگەردان

**بەلالووک** (گیا.)[بەل1 + ئالوو + ک] [باک: بلالووک، بەلالووک ـ ناو: بەلالووک، بلالووک ـ هەو: برالوو، برالوێ] ١ـ داری خۆرسکی کێوی ئالووبالوو. ٢ـ بەری ئەم دارە کە هەر وەک ئالووبالوویە بەلام چووکتر و کەم گۆشتتر، بلالووکە کێفیلە. ٣ـ بڕ: ئالووبالوو. (هس: بەلالک)

**بلالووکە کێفیلە** (گیا.)[بلالووک + ئە + کێف + ئیلە][ئەر] بڕ: بەلالووک/١ و ٢.

**بەلام** (ئاک.)[؟] ئامرازی شەرت و پێ داگرتن و درێژە پێدان، بەلا1، بەلان، وەلێ، لێ، ئەمما.

**بەلامک** (نا. ل)[بەل (بەر) + ئامک] بڕ: بزمک

**بەلان** (ئاک.) بڕ: بەلام. :: ئەی شەوچرای زیندەدلان! ئەی رەنگ و بۆی باغی گولان / نازیم تۆ خۆش، دەمرم بەلان، هێندەم بەسە تۆم بێیە کەن (وەفایی ل ٩٧).

**بەلخە** (گیان.)[؟][ئەر] بەرازی نێر و گەورە، برەکی پێست ئەستوور، بەلخی، یەکانە.

**بەلخی** (گیان.) بڕ: بەلخە

**بەلغ** (نا.)[؟] ١ـ خرت و خالی نێو ئاو کە دوای ماوەیەک کولاندن، ژووری کەتری یا سەماوەر دادەپۆشێ. ٢ـ رەنگێکی زەرد کە لە بەر جگەرە یا ددان نەشوشێن، سەر ددان دەگرێ. ٣ـ توێژی سەر لێو، بار.

**بەلغەم** (نا.)[عەر: بلغم] چلمێکی زەرد یا سپییە لە بەر هەلامەت، نەخۆشی یا جگەرە کێشان لە سەر گەروو دەنیشێ و بە کۆخە لە زار دێتە دەر، ئاختف. ~ **پێدانەدان:** (کنـ.) کەسێک بە هیچ دانەنان، پێ پیاو

نەبوون. ٪ هێند کـــابرایەکی هیچ و پووچە بیبینی بەڵغەمی پێدانادەی.

**بەڵک** (حر.) بڕ: بەڵکە

**بەڵکا** (حر.) بڕ: بەڵکە

**بەڵکم** (حر.) بڕ: بەڵکە

**بەڵکوو** (حر.) بڕ: بەڵکە

**بەڵکە** (حـــر.)[بەڵ + کـــە] لەوانـەیە، بـەشکـەم، ڕێی تێـــدەچێ. بـەڵک، بـەڵکا، بەڵکم، بەڵکوو، بەڵکەم، بەڵکەت، بـەڵکەن، بەڵکی،بەڵکین، بەڵکینا، بەڵکینێ.

**تێبینی:** ئەم وشـەیە هـاوتای زۆرە و بە گـــشـــــتی لە دوو بـەشـی بەڵ (بـل) - ی عەرەبی و کە - ی کوردیی پێک هـاتوون و وردەوردە بە پـێی خــەڵک و ناوچـەکــان و زاراوەکان هەندێک شێوەی گۆڕاوە.

**بەڵکەت** (حر.) بڕ: بەڵکە

**بەڵکەم** (حر.) بڕ: بەڵکە

**بەڵکەن** (حر.) بڕ: بەڵکە

**بەڵکی** (حر.) بڕ: بەڵکە

**بەڵکین** (حر.) بڕ: بەڵکە

**بەڵکینا** (حر.) بڕ: بەڵکە

**بەڵکینێ** (حر.) بڕ: بەڵکە

**بـەڵـگ** (نـا.) ١ـ [باش] بڕ: بـەرگ. ٢ـ جۆرێک کـەبابە. گۆشـتی نەرمەی بەرخ یا جـــوانـەگـــا بـێ کـــوتانەوە پشـک و پلـی ناسکی لێدەکەنەوە و لە شـیش دەردێ و دەبرژێندرێ، کەبابی بەڵگ.

**بـەڵـگـە** (نـا. ل)[بـەڵـگ/١ + ئـە] ١ـ نیشـانە و مەدرەکێک بۆ ماڵ و کـەرەسـەی ونبوو یا دزراو. ٢ـ قسە یا نوسراوەیەکی جێ بڕوا بۆ وێنە هێنانەوە، سەنەد.

**بەڵم** (نا.)[؟] ١ـ ســـاقـــەت و لاسکی برنجـی بێ چـەڵتـــووک دوای کـــوتـانەوە، پیتـە. ٢ـ (کنـ.) ردێنی چڕ و پڕ و پان. ٪ عـاجـیـزی شـوکـری تەمـامی نیـعـەمم سـەرتاپا/ کە نە ریش بەڵم و، نە کـۆسـە و، نە کەل و گۆج و شـەلم (نالی ل ٢٩٢). ردێنی مـام سـۆفی چاو لێکە دەڵێی باقـە بەڵمە.

**بەڵمـــەریش** (ئـان. ل)[بەڵم + ئـە + ریش] ردێنی چڕ و پڕ و پان.

**بەڵو** (نا.)[زا] بڕ: بەڕوو

**بەڵەد** (ئان.)[عەر: بلد(شار)] کەسێک کـــە ڕێگـا و بان و شـــار چاک دەناسـێ، شـارەزا. ~ **بوون:** ئاشنای ڕێگا و بان بوون، شارەزا بوون.

**بەڵەدیی** (حم.)[بەڵەد + ئیی] ئاشنای



ڕێگا و شوێنێک بوون، شارەزایی.

**بەڵەک** (ئان.)[باک: بەلەک ـ ناو: بەڵەک، بەرەک ـ باش: بەڵەک ـ هەو: بەڵەک ـ زا: بەلەک] ١ـ هەر شتێکی دوو ڕەنگ بە تایبەت ڕەش و سپی. ٢ـ گایەکی ڕەنگی ڕەش و سپی یا سوور و سپی بێ. ٣ـ چاوێکی ڕەشێنەکەی زۆر ڕەش و سپێنەکەی زۆر سپی بێ. ٤ـ کەسێکی تووشی نەخۆشی بەڵەکی بووبێ & ئەبڵەق، سیە و بازگ، بازە، بازوو. ~ **بوون:** تووشی نەخۆشی بەڵەکی هاتن.

**بەڵەکی** (نا. ل)[بەڵەک + ئی] نەخۆشییەکی پێستە، تووشی مرۆڤ دەبێ و هەندێک شوێنی سەر پێست ڕەنگ دەگۆڕن و مرۆڤ بەڵەک دەبێ.

**بەڵی** (نا.)[زا] بڕ: بەڕوو

**بەڵێ** (ئاک.)[عەر: بلی] ١ـ وڵامی پرسیار لە کاتی بە ڕاست زانین.// نا، نەخێر :: ئایا خوراسان کوردی لێیە؟ ـ بەڵێ. ٢ـ وڵامی دەستوور و ئەمرێک لە کات بە قسە کردن. :: هەر ئێستا بڕۆوە ماڵێ! ـ بەڵێ بە چاوان. ٣ـ تەئکید کردنی قسەی کەسێک. :: هیچ دەزانی مام ڕەسوو چەند دەست و دڵ پاکە! ـ بەڵێ وایە. ٤ـ وڵامی بانگ کردن. :: هۆی حەسۆ! ـ بەڵێ بابە! & ئا، ئادی، بەرێ. **بەڵێ بەڵێ:** داگرتنی پتر لە سەر بەڵێ.

**بەڵێن** (نا.)[؟][ناو: بەڵێن، بەڵێنی ـ هەو: بەڵێن] پەیمان و شەرت بۆ ئەنجام دانی کارێک، قەول، شەرت، مەرج. ~ **دان:** وەعدە دان، قەول دان، بەڵێنی دان.

**بەڵێنی** (نا.) بڕ: بەڵێن. ~ **بەجێ گەیاندن:** شەرت و پەیمان بردنە سەر. ~ **پێدان:** قەول دان بە کەسێک بۆ ئەنجام دان و بەڕێوە بردنی کار و قسە و مەسەلەیەک، بەڵێن دان، بەڵێنی دان. ~ **دان:** بڕ: بەڵێن دان.

**بەم** (نا. د) ١ـ دەنگی گڕ و گەورەی مرۆڤ و ساز، دەنگی نەوی و قەبە، دەنگێک کە تیژ نەبێ. ٢ـ ژێ و سیمی ساز کە دەنگی تیژی نەبێ. // زیل.

**بەمبازی** (نا.) بڕ: بازە2

**بە مێرد** (ئان. ل)[بە + مێرد] ژنێکی کە مێردی هەبێ، بە شوو.

**بەن**[1] (نا.)[لە: بەستن][پەه: بەند. باک: بەن، بەند ـ ناو: بەن، بەند ـ هەو: بەن] ١ـ خوری و موو و مەرەزی بادراو کە پتر بۆ سەرکڵاوە و گۆرەوی و

دەســتــەوانـە و شـتـی لەم بابەتە کـەلکی لێـوەردەگـرن. ٢ـ هەودای باریک بۆ شت پـێ بەسـتن، بـەند. ٣ـ بە ناوەوە دەلکێ و مـانای بـەند و بەسـتـراو دەدا، بـەند. ∷ بەربـەن، بازیبــەن. ~ بادان: ڕێسـتن و ســاز کـردنـی بەن لە خــوری و مــوو بە تەشـی. **بەنی ... بادان:** (کنـ.) تێگەیشـتن لە فـروفـێـڵ و کـار و بـاری کــەسـێک، دەرەقــەتی فــێڵ و تـەڵەکــەی کــەســێک نەهاتن. ∷ بەنی تۆ بە من بانادرێ! خـۆ دە کاروباری ئەو چەرچیە هـەڵمـەقـوتێنە بەنی وی بە تۆ بانادرێ.

**بەن** 2 (گــیــا.) دارێکی خــۆڕسکی گەورەی بـە لک و پۆیە، بەرێکی ترشی بە ناوی قـەزوان هەیە، لە سـاقـەتی بنێشت دەگــرن و لە گـــوڵ و گــەڵاکــەشی بۆ ڕەنگرێژی کـەلک وەردەگـرن. لە پاییـز دا گەڵاکانی بە سـەدان ڕەنگ خۆ دەگۆڕن و دیمەنێکی یەکـجـار جـوانـی هـەیە، -pis tacia acuminata نـاوی لاتیـنـی ئـەم دارەیـە، دارەبەن، وەن، دارقـــەزوان، وەن دار، داربنێشت.

**تێـبـینی:** بەن و وەن لـە وشــەکــانی لێکدراوی کوردیی دا بە مـانای دار و گیا زۆر هـاتـوە وەک ( بـنـاو، بـەنـا، بـەنـاف، وەنـەتـەق، وەنـی، مــــەندێ و ...) کــــە هـاوریـشــەن دەگــەڵ: [ئەو: ڤــەنە (دار) vanaـ ســان: ڤــەنە (لێـرەوار) vanaـ پەهـ: ڤـــەن (دار) van. پەش: بـەن (باغ) banـ گـیل: بەنـە (نەمــام) bana] بڕ: دەوەن.

**بەنا** 1 (گـیـا.)[بڕ: بەن2] گـیـایـەکی خۆڕسکی کوێستـانییە، بە زەرد کراوی و سوور کراوی دەگەڵ ماست دەیخۆن.

**بەنا** 2 (نا.) بڕ: بەننا

**بەناز** (ئان. ل)[بە + نـاز] ١ـ ئافـرەتی بە کـەشم و نەشم. ٢ـ کـەسـێک کـە ناز دەکا. ٣ـ ناوە بۆ مێینە.

**بەناشـوانە** (گیـا.)[بەنا1 + شـوان + ئە] گیایەکی بۆنخۆشە کە دە مـاست و تۆراغی دەکـەن، بەلەشـوانە، نانەشـوانە. (عەر: بقلة اللبن)

**بەنـاف** (نـا. ل)[بـەن2 + ئـاف][بـاک] بڕ: بناو1

**بــەنــاو** (ئـان. ل)[بــە + نـاو1] بـڕ: نــاودار. بـەنــاو بــوون: نـاودار بــوون، ناوبانگ دەر کردن.

**بە ناوبانگ** (ئان. ل)[بە + ناوبـانگ] بـڕ: نـاودار. ~ **بـوون:** نـاودار بـوون، ناوبانگ دەر کردن. ~ **کردن:** کەسێک

ناودار کردن.

**بەنایی** (حم.)[بەنا2 + ئی] بڕ: بەننایی

**بەنبڕ** (نا. ل)[بەن1 + بڕ] ئامرازێک کە بەنی پێ ببڕنەوە، تیغ، چەقۆ. ⁝⁝ **بەنبڕم دداته**. (کینایەیە بە مانای: بێ چەک و بێ دەسەڵاتم و چم لە دەست نایە).

**بەن تەرگ** (نا. ل)[بەن1 + تەرگ] بڕ: بەن سامۆرتە

**بەنج** (نا.)[باک] بڕ: بەنگ

**بەند** (نا.)[پەھ: بەند][لە: بەستن] ١ـ بەرهەڵستێکە لە بەرد و دار و شتی دیکە کە لە پێش ئاوی چۆم یا جۆگەی گەورەی هەڵیدەبەستن هەتا ئاو لە پشتی پەنگ بخواتەوە.(بڕ: ئاوبەند1). ٢ـ زیندان، گرتووخانە. ٣ـ بەشێک لە زیندان کە چەند کەسی تێدابێ. ٤ـ گیر، وێستاو. ٥ـ سەرمای ویشک کە وڵات دەیبەستێ، بەستەڵەک، ویشکەبەند. ٦ـ ریس و هەودای شت پێبەستن، بەن. ٧ـ [باک] پەرژین، چەپەر. ٨ـ پارچە ئێسکی چووکی پەنجەی دەست و پێ، گە، بەنگە. ٩ـ گەی قامیش و حەیزەران. ١٠ـ بەشێک لە قانوون یا دەربڕاوەی سیاسی یا هەر شتێکی دیکە، مادە. ١١ـ بەستەیەک کاغەزی سپی کە نزیک ٥٠٠ پەڕ دەبێ. ١٢ـ پارچەیەک لە گۆرانی یا شێعر. ١٣ـ بە ناوەوە دەلکێ و مانای بەستنەوە بەو ناوە دەدا، بەن، بێن، وێن، وەن، وەند. ⁝⁝ دڵبەند، دەستبەند، بازووبەند. **~ بوون:** ١ـ گیر بوون و مانەوە لە شوێنێک، راوەستان. ⁝⁝ رۆڵە بەند مەبە و هەر ئێستا ئەو نامە بگەیەنە دەست خاڵت. دوو رۆژ لە سنە بەند بووین و دوایی هاتینەوە. ٢ـ گیر بوون بە شوێنێکەوە، خۆ گرتن، پێوە بەند بوون. ⁝⁝ بادەوەکەم بە سەر ئەو دارەوە بەند بوە و ناتوانم بیهێنمەوە خوار. ٣ـ سەر بە کەسێک یا مەسەلەیەک بوون، وابەستە بوون، بەستە بوون. ⁝⁝ ئەمن لە سەر روحمی تۆ بەندم / حەیف بێ رۆڵە و فرزەندم (بارام و گوڵندام ل ٢٧). **~ کردن:** ١ـ راگرتنی کەسێک بۆ مانەوە. ⁝⁝ پوورێ گیان بەندم مەکە دەبێ بچمەوە. ٢ـ لە زیندان کردن، حەپس کردن. ٣ـ دوو شت لە یەکتر قایم کردن. **پێوە ~ بوون:** پێوەنووسان و خۆ گرتنی شتێک بە شتێکی دیکەوە، بەند بوون. ⁝⁝ ئەو رەوەزە هێند لووسە دەستم پێوەی بەند نابێ. **لە ~ بردن:** بەستن.

:: برای من بوونە عـینسـانـخـۆر، ئەو ڕێـگـایـەیـان لـە بـەنـد بـردوە (بـارام و گـوڵندام ل ٥٣). **لە ~ خـسـتن:** ١ـ ئەسیر کردن، بە داو گرتن. ٢ـ لە زیندان کـردن، لە بەند کـردن. **لە ~ کـردن:** زیندانی کردن. **لێ ~ بوون:** پێوە گیر بوون، پێـوە بەند بوون. **لێ ~ کـردن:** پێوە گیر کردن، لێ قـایم کردن. || **بەندی جەرگ:** ١ـ ئەو هەودایەی کە پێیان وا بوو جـەرگ پێـوەی بەند بوە. ٢ـ (کنـ.) خـۆشـەویـستی یەکجار زۆر کە ژیان بەو بـەنـدە. :: وەرە ئـەی بـەنـدی جـەرگ و مـاکی ژینم/ وەرە هـەتوانی گـەش دەرد و برینـم (خـەیام ل ٩٨). & بەندی جگـەر، بەندی دڵ، بەندی جەرگ و دڵ. ***بەندی جەرگ پسـان:** مـردن لەبەر بەر پسـانی بەندی جـەرگ و دڵ، مـردن یا گـەیشـتنە حـاڵی مـردن لە ترسـان یـا لەبەر هـەواڵ و ڕووداوێکی ناخـۆش، بـەندی دڵ پسـان، بەندی جـەرگ و دڵ پسـان. :: هـەتا ئەو منداڵـە وەهـۆش هـاتەوە وەختـابـوو بەندی جەرگم بپسێ. ***بەندی جەرگ پساندن:** کـوشـتنی کـەسـێک یا ترسـاندنی لە ڕادەبەدەری کـەسـێک و گـەیاندنە حـاڵی مـردن بە هـەواڵ، ڕووداو یا کـارەسـاتێکی ناخۆش. :: قـەیتـانی دوو لێوانت بەندی جـەرگی پسـاندم/ کوفـرت لـە لام زاهیـرە ڕوحـمت لە لا نـەمـاوە (وەفـایی ل ١٥٣). **بەندی جـەرگ و دڵ:** بڕ: بـەندی جـەرگ. ***بەندی جـەرگ و دڵ پسـان:** بڕ: بەندی جـەرگ پسـان. ***بەندی جـەرگ و دڵ پسـاندن:** بڕ: بـەندی جـەرگ پسـاندن. **بەندی جگـەر:** بڕ: بـەندی جـەرگ. **بەندی دڵ:** ١ـ بەند و هـەودایەک کە پێشتر پێیان وا بـوو دڵـی پـێ بـەنـد بـوە. ٢ـ (کـنـ.) خـۆشـەویـستی یەکجار زۆر کـە ژیان بەو بـەندە.& بـەندی جگـەر، بـەندی جـەرگ. ***بەندی دڵ پسـان:** بڕ: بـەندی جـەرگ پسـان. ***بەندی دڵ پسـاندن:** بڕ: بەندی جـەرگ پسـاندن. ***بەندی دڵ قـایم بوون:** بە ورە بـوون و نـەترسـان لە کـارەسـات. ***بەندی دڵ قـایم کـردن:** بە ورە کـردن، هـان دان بۆ نـەترسـان. :: بـەندی دڵت وەها قـایم کـردووم لە سـەد پیـاوانیش ناترسم.

**بەندروو** (نا. ل)[بەن + دروو (دروون)] هەودا بەنی تایبـەتی کە بۆ دروونی سـەر و زارکی تێـر و جـەواڵ کـەلکی لێوەردەگرن، بەندرووما‌ن.

**بەندرووما‌ن** (نا. ل)[بەن + درووما‌ن] بڕ: بەندروو



**بەندوباو** (نا. ل)[بەند + و + باو] ١ـ نەقڵ، حەکایەت، بەیت. ٢ـ قسەی هەڵبەستراو و ناڕاست. & بەیت و باو. **~ هەڵبەستن:** قسەی ناڕاست و ناڕەوا ساز کردن بۆ بەدناو کردنی کەسێک، بەیت و باو ڕێکخستن، بەیت و بالۆرە بۆ هەڵبەستن.

**بەند و بەست** (نا. ل)[بەند + و + بەست]سازان و ڕێک کەوتنی دوو یا چەندکەس بۆ ئەنجام دانی پیلان و کارێکی ناڕەوا بە دژی کەس یا کەسانێک، تەون و بەست. **~ کردن:** پێکەوە سازان بە دژی کەس و کەسانێک، تەون و بەست کردن.

**بەندۆخێن** (نا. ل)[بەن + دۆخێن] بڕ: دۆخێن

**بەندۆک** (نا. ل)[بەند/٦ + ئۆک] بڕ: بەندۆکە/١.

**بەندۆکە** (نا. ل)[بەند/٦ + ئۆکە] ١ـ قەیتان یا بەنێک کە لە تاس کڵاوی ژنان یا کڵاوی دروێنەوانان قایم دەکرێ و دەچێتە ژێرچەنەوە بۆ ڕاگرتنی کڵاو، بەندۆک. ٢ـ خشڵێکی ژنانە کە لە دوو لای تاسکڵاوەوە بە بن چەنەی دا تێدەپەڕێ. :: بەدەن بە وێنەی تاقی نمروود شا / بەندۆکە و قۆیتاس کەوتنە سەما (سەعید و میرسێوەدین ل ٢٣). ٣ـ (گیا.) گیایەکە بەهاران لە دەم جۆگا و چەمان شین دەبێ. بۆ خواردن دەس دەدا. (قامووس ب ٢ ل ٢١٨)، بەنووکە گیایەکی ئاوییە لەگەڵ کووزەڵە دا لە ئاو دا سەوز ئەبێ (کشت و کاڵ ب ١ ل ٥١) بەنووڵە، بەنووکە.

**بەندە** (نا.)[هەخ: بەندەکە ـ پەه: بەندەک. باک: بەنی ـ ناو: بەندە] ١ـ غولام، بەردە، عەبد ٢ـ (کنـ.) منی چووک، منی بەندەی تۆ.

**تێبینی:** بەندە لە چاوگی بەند band ی ئەوێستایی و بەستنی کوردیی کەوتوە، یانی کەسی بەستراوە. (بڕ: بەستن)

**بەندەخوێن** (نا. ل)[بەن1 + دەخوێن (دۆخێن)] بڕ: دۆخێن

**بەندەر** (نا.)[؟] ١ـ شوێنێک لە نزیکی بەستێنی دەریا کە بۆ لەنگەر گرتنی کەشتی تەرخان کراوە، لەنگەرگا، مینا. ٢ـ شار و ئاوەدانییەک کە لە شوێنێکی وا دروست کرابێ.

**بەندەشیر** (نا. ل)[بەند + ئە + شیر] بەند و قایشێکی چەرم کە لە کالانی

شەمشیری دەبەستن و لە نێوقەد یا لە لا قەدی هەڵداوەسن.

**بەندەک** (نا. ل)[بەند + ئەک] بەند، پەت. ‎:: بەرگی رەش ئیتر لە بەرمان دادڕا / بەندەکی دیلی و ئەسارەت هەڵبڕا (تاریک و روون ل ٦٨).

**بەن دەمبێن** (نا. ل)[بەن1 + دەمبێن] بەنێکە بە سەر دەمبێنەوە و لە شاخی گاگێرە یا گوێلکی دەبەستنەوە.

**بەندەن** (نا.)[بڕ: بەدەن] ١ـ داوێن و بناری چیا. ٢ـ کێوێکی زۆر بەرز نەبێ. ٣ـ لەش، بەدەن.

**بەندەناس** (نا. فا)[بەندە + ناس] کەسێک کە بەندە دەناسێ، خودا. ‎:: بەندەناس خودایە.

**بەندەیەتی** (حم.)[بەندە + یەتی] بڕ: بەندەیی

**بەندەیی** (حم.)[بەندە + ئی] غولامەتی، عەبدایەتی، بەندەیەتی.

**بەندیخانە** (نا. ل)[بەندی + خانە] ١ـ شوێنی راگرتنی بەندی، زیندان، گرتووخانە. ٢ـ (مجـ.) شوێنی ناخۆش و تەنگ و تاریک.

**بەندیوان** (نا. ل)[بەندی + وان] کەسێک کە ئاگای لە زیندانە و چاوەدێری بەندیەکان دەکا، زیندانەوان.

**بەندیی** (ئان. ل)[بەند + ئیی] کەسێک کە لە بەند کراوە، گیراو، زیندانیی. **~ بوون:** زیندانی بوون. **~ کردن:** زیندانی کردن.

**بەندێخوون** (نا. ل)[بەن1 + دێخوون] بڕ: دۆخین

**بەن رستە** (نا. ل)[بەن1 + رستە] بەنێکی رێسراوی باریکە کە دەملی تاژی دەکەن، رستە. ‎:: نایەڵم بەن رستەی ئاوریشمینت بۆ بێنن سەری رستەی داڵقەی قەڵێدەی هەڵێنن لە قۆڵی خۆی ببەستن بیگری بە هەموو پەنجانە (مان ل ٩٢).

**بەن سامۆتە** (نا. ل)[بەن1 + سامۆتە] بڕ: بەن سامۆرتە.

**بەن سامۆرتە** (نا. ل)[بەن1 + سامۆرتە] دوو رێسراوی باریکە لە پشت زین کە خورجین و هەگبە و شتی دیکەی پێ لە پاشکۆی ئەسپ دەبەستنەوە، بەن تەرگ، بەن سامۆتە.

**بەنشت** (نا.)[زا] بڕ: بنێشت

**بەنکاڵە** (نا. ل)[بەن1 + کاڵە] چەند

بەنی لێک بادراوی هەندێک ئەستوورە کە کاڵەی پێ لە قاچ توند دەکەن. **~ دە ~ خستن:** (کنـ.) گێچەڵ بۆ کەسێک ساز کردن، بوون بە بەرهەڵستی کەسێک، بەنکاڵە لە بەنکاڵە گرێدان. **~ لە ~ گرێدان:** بڕ: بەنکاڵە دە بەنکاڵە خستن.

**بەنکەشیی** (حم.)[بەن + کەش + ئیی][ئەر] بڕ: بەنکێشیی

**بەنکەڵەوە** (نا. ل)[بەن1 + کەڵەوە] بەنێکە دوو کەڵەوەی ملی گاجووتی پێ لێک دەبەستن.

**بەنکێشیی** (حم.)[بەن (بەند) + کێش (کێشان) + ئیی] کاری پڕ کردنەوە و درز گرتنی کەلێن و درزی خشت و بەردی نێو دیوار لە لای دەرەوەی ماڵ بە سمیت، بەنکەشیی.

**بەنگ** (نا.)[ئەو: بەنگهە ـ سان: بهەنگا ـ پەه: مەنگ. باک: بەنگ، بەنج ـ ناو: بەنگ ـ زا: بەنگ] ورد کراوی گەڵای شەدانە کە وەک تووتن دەیکێشن و سەر خۆشی دێنێ، حەشیش، حەشیشە. **~ کێشان:** دەکار کردنی بەنگ بۆ سەرخۆشی.

**بەنگکێش** (ئان. فا)[بەنگ + کێش] کەسێک کە بەنگ دەکێشێ، بەنگیی.

**بەن گورد** (نا. ل)[بەن1 + گورد] هەر کام لەو بەن و هەودایانەی کە بە گوردەوەن و بە ئامرازێکی تایبەتی کە چێوێکە وەک گۆنیا بە ناوی ساچین دەڕێسرێ.

**بەنگیی** (ئان. ل)[بەنگ + ئی] کەسێک کە ئالوودەی بەنگە، بەنگ کێش. :: لە بەنگ ئەم بەنگییانە چی دەبینن: خۆ لە خۆ گۆڕان / لە دنیا دا مەداری عەیش و خۆشی: خۆ نەناسینە (مەحوی ل ٢٨٤).

**بەننا** (نا.)[عەر: بناء] وەستای شارەزای ماڵ ساز کردن، وەستایەک کە چەند کرێکار و فەعلەی لە ژێر دەست دایە و خانوو ساز دەکەن، بەنا.

**بەننایی** (حم.)[بەننا + ئی] کار و پیشەی کەسی بەننا.

**بەنوێشک** (گیا.)[بەن2 + وێشک] جۆرە قەزوانێکی وردە بەری دار بەنوێشک کە بنێشتی نابێ.

**بەنووکە** (نا. ل)[بەن + ئووکە] بڕ: بەندۆکە/٣.

**بەنووڵە** (نا. ل)[بەن + ئووڵە] بڕ: بەندۆکە/٣.

**بەنەوش** (نا.) بڕ: بنەوش

**بەنی** (نا.)[باک] بڕ: بەندە

**بەنی ئادەم** (نا. ل)[عـەر: بنى آدم] کوڕی ئادەم، ئادەمیزا، مرۆڤ. ⁂ چۆن نەبەم بۆ مەی و مەیخانە پەنا تێگەیوم/ لەو ولاتە هەمـوو شت زۆرە، بەنی ئادەم کەم (تاریک و روون ل ١٦١).

**بەنیشت** (نا.)[باک ـ زا] بڕ: بنێشت

**بەواسیر** (نا.)[عەر: بواسیر] کوان و پەنەماوێکی بەژانە کە لە سەر پزووی کونگ لە بەر قەبزی یا زۆر دانیشتن پەیدا دەبێ و بە برینەوەی چارەسەر دەکردرێ، بێوەسیری، مایەسیری، بەوەسیری.

**بەور** [1] (نا.)[پەهـ: بەور] ١ـ گیاندارێکی گەورەی درندەی گۆشتخۆرە، پشت و قاچ و تەنیشتەکانی نارنجییە، شوێنەکانی دیکەی سپی و خەتی رەشی تێدایە، لە ئاسیا و ئامریکا و ئافریقا دەژی، دوو سەد کیلۆ قورس دەبێ و بیست و پێنج ساڵ دەژی، بەبر. ٢ـ جۆرێ کوانی زۆر بەژانە (هەنبانە ب ١ ل ٨٦)، بەرەشینکە، بەورەشینە. ‖ **بەوری بەیان:** ١ـ بەوری دڕ و بە هەڵمەت. ⁂ رۆژێک دیم سوارێک دەهات لە سەر دا/ پێستی بەوری بەیانی بوو ئەو لەبەر دا (بارام و گوڵندام ل ١٩). ٢ـ (کنـ.) پیاوی ئازا و شەڕانی. ⁂ لەگەڵ دوژمن ئیمامی هەروەکوو شێری ژیان وابە/ لە پێش پڕدانیان راوەستە وەک بەوری بەیان وابە (ئاوات ل ٢٤). پاڵیان وێگ دا لە زەمانی/ هەروەکوو بەوری بەیانی/ کە عێلات هەمووی پێیزانی (مان ل ٢٧٣).

**تێبینی:** بە پێی شانامە کتێبی فردۆسی بەوری بەیان جلێک بوە کە روستەم لە کاتی شەڕ دا دەبەری کردوە و کەوڵی بەبر یا پڵنگ بوە. لە بورهانی قاتع دا نووسراوە کە بە پێی باوەڕی هەندێک کەس بەوری بەیان کەوڵی دێوێک بە ناوی ئەکوان بوە و هەندێکیش دەڵێن کە لە بەهەشتەوە بۆ رۆستەمیان هێناوە و هەندێکیش دەڵێن گیاندارێکە دوژمنی شێرە و روستەم لە کێوەکانی شام کوشتی و کەوڵی لێ ساز کرد و خاسیەتەکەی ئەوەیە کە نە دە ئاگر دا دەسووتێ و نە دە ئاوە دا نوقم دەبێ.

**بەور** [2] (نا.)[جاف] بڕ: بەفر

**بەوران** (گیانـ.)[بڕ: بۆران2][زا] کۆتر

**بەورانماڵ** (نا. ل)[بەور2 + ئان + ماڵ3] بڕ: بەفرماڵ

**بەوردی** (ئاک. ل)[بە + ورد + ئی] سەرنجی زۆر. ⁂ بەوردی سەیری نووسراوەکانی کرد و هیچ هەڵەیەکی نەدیتەوە. بەوردی لە مەسەلەکە بکۆڵەوە!

**بەورەشینکە** (نا. ل)[بەور1 + ئە + شین + ک + ئە] برینێکە پیس وەکوو (موو) لە دەست و پەنجە دەردێت (کشت و کاڵ ب ١ ل ٥١)، بەور، بەورەشینە.

**بەورەشینە** (نا. ل)[بەور1 + ئە + شین + ئە] بڕ: بەورەشینکە

**بەوز**[1] (نا.) بڕ: بووز1

**بەوز**[2] (ئان.) بڕ: بۆز

**بەوش** (نا.)[باک: بەڤش، بەفش، بەڤشک ـ ناو: بەوش] ١ـ ئامرازێکی جۆلاییە، بریتییە لە تەختەیەکی پانی ددانەدارە کە دەکەوێتە بەینی تان و پۆ و هەر جارەی جۆلا دەیکوتێ هەتا ریزی تەنراو رێک و سفت بکا، شە. ٢ـ (ئا.) نێوان ئانیشک و سەرشان، قۆڵ، باسک.

**بەوەسیری** (نا.) بڕ: بەواسیر

**بەها** (نا.)[بڕ: بایەخ] نرخ، بایی.

**بەهار** (نا.)[هیک: ڤەسەر ـ ئەو: ڤەنگهەر ـ هەخ: ڤەهەر، ڤاهەرە ـ پەه: ڤەهار، بەهار. تات: ڤاهار، ڤێهار ـ فار: بهار. باک: بوهار، بهار، باهار ـ ناو: بەهار، بوهار، بوار ـ باش: وەهار، بەهار ـ هەو: وەهار ـ زا: واسار] ١ـ یەکەمین وەرزی ساڵی هەتاوی، سێ مانگی (خاکەلێوە، بانەمەڕ، جۆزەردان). ٢ـ ساڵ لە نێو خەڵک دا. ⁂ ئەوساڵ دوو بەهارە کوڕەکەم چۆتە سەربازی. ٣ـ شکۆفەی دار. ٤ـ گیایەکە کە گوڵی زەرد و جوانی هەیە و بۆ جوانی رایدەگرن و دەیچێنن. ⁂ ئەو باغ و بەهار و بەرگ و ئەسمار / ئەنوار و شکوفە جەمعی ئەزهار (مەم و زین ل ١٩١). ٥ـ ناوە بۆ مێینە. ٦ـ (مج.) سەردەمی لاوەتی. ~ **نوێ بوونەوە:** بووژانەوەی گژوگیا لە ئاخرەکانی بەهار بە هۆی باران و بارینی. ~ **هێنانە چۆکان:** (کن.) زۆر بە هاسان گرتنی کار و مەسەلەیەک و لەبەر چاو نەگرتنی راستی و سەختی و سەخڵەتی کارەکە. (ئەو کینایەیە دەبێ لەوە کەوتبێ کە لە زستانی سەخت دا کەسێک بڵێ هیچ نیە و سەرما تەواو دەبێ و بەم زوانە هەوا خۆش دەبێ و گیا شین دەبن و دەگەنە سەر چۆکان کەچی لە راستی دا بەفر و کڕیوە و سەرمایە و لە بەهار بەم زوانە خەبەرێک نیە.) ‖ **بەهاری کوردیی:** وەکوو دەزانین بەهار

یەکێکە لە چوار فەسڵەی ساڵ و لە یەکەمین رۆژی نەورۆزەوە (٢١ی مارت) دەس پێدەکا. بەڵام لە ناوچەی (کرند)ی مەڵبەندی کرماشان، پاش ئەوەی بە حیسابی نەورۆز چل و پێنج رۆژ لە زستانی رابرد، دەڵێن بەهارە و ناویشیان ناوە (بەهاری کوردیی) و سێ مانگ سێ مانگ حیسابی دەکەن و هاوین و پاییز و زستان دەبەنە سەر. بەلای منەوە ئەم حاڵە دەگەڕێتەوە بۆ ئەو کاتەی کە نەورۆز وەکوو ئێستا سابیت نەبوە. (بڕ: قاموس ب ٢ ل ٢٢٢).
**بەهاری عومر:** سەردەمی گەنجی و لاوەتی مرۆڤ. ∷ بەهاری عومر ئەوا گەییە حوزەیران / کەچی وەک کۆدەک ئێستە دەچمە سەیران (مەحوی ل ٢٤٠).

**بەهارات** (نا.) ئاڵەت و گیا و گۆڵ کە بۆ بۆنخۆشی دە چێشتی دەکەن، ئەزبێ، هەزبێ، ئەزبۆڵە، هەزبێڵە.

**تێبینی:** بەهارات ناوی کۆنی وڵاتی هیند بوە و لەبەر ئەوەی کە زۆربەی ئاڵەت و گیا لەم وڵاتەوە هاتوون ناوی (وڵاتەکە) بەهاراتیان بە سەر دابڕیون.

**بەهاران** (نا. ل)[بەهار + ئان] سەردەم و چاخی بەهار، وەرزی بەهار.

**بەهاراو** (نا. ل)[بەهار + ئاو] ئاوی شیو و دۆڵ و شوێنێک کە تەنیا بەهاران لە بەر توانەوەی بەفر ئاوی هەبێ و لە دوایی ویشک بێ.

**بەهاربەن** (نا. ل)[بەهار + بەن][ئەر] بڕ: بەهاربەند

**بەهاربەند** (نا. ل)[بەهار + بەند] تەویلەی سەر دانەپۆشراو، یا شوێنێکی وەک بەر هەیوان کە لایەکی ئاوەڵایە و دوای شکانی تەشقی سەرما بەرزەولاغ و کەڵ و چارەوێی لێدەبەستنەوە هەتا گەرمایان نەبێ و نەخۆش نەکەون، بەهاربەن.

**بەهارستان** (نا. ل)[بەهار + ستان] بەهاری خۆش و تەواو کە هەموو دار شکۆفەیان داوە و گوڵ پشکووتوون. ∷ هەموو دنیا بەهارستانە ئیمڕۆ / لە لای من هەر چلەی زستانە بێ تۆ (کوردی)

**بەهارنارنج** (نا. ل)[بەهار + نارنج] گوڵی نارنج کە گوڵێکی بۆنخۆشە و بۆ عەترسازی و دەرمان و مەربا دەکار دەکردرێ.

**بەهاروو** (گیا.)[بەهار + ئوو] جۆرێک گەنمی زۆر باشە کە لە دووهەم مانگی بەهار دا دادەچێندرێ نانەکەی خۆش و



خواردنی سووکە و نشاستەش پتر لەو گەنمە دەگرن، بەهارە. || **بەهارووی سپی:** جـــۆرێکی بەهـارووبە، گـــوڵ رووتـە و ئاردەکـــەی ســپـیــە، بـەهـارەچـەرمگ. **بەهارووی ســوور:** جـۆرێکی بەهـارووبە، گوڵی هەیە و ئاردەکەی سوورە.

**بەهارە** (نا. ل)[بەهار + ئە] ١ـ (گیا.) بڕ: بەهاروو. ٢ـ شـێـعرێک کە بە سـەر بـەهـار دا هـەڵـکـوترابـێ. ‌:: بـەهـارەی مـــامـۆسـتـــا هـێـمن کـە ناوی بـەهاری کوردستانە زۆر شێعرێکی بە هێزە. ٣ـ هـەر بـەر و بـەرهـەمـــــێکی لـە بـەهـار دا بووبێ. :: بەرخی بەهارە، گوڵی بەهارە، تووتنی بەهـارە. ٤ـ هەر شــــتـێک کـــە پـەیوەندی بە بـەهـارەوە هـەبێ، بـەهـاریی. :: بەهارەکێڵ، بەهارەزێ، بەهارەوار.

**بـەهـارەزێ** (ئـان. ل)[بـەهـارە + زێ] بەرخێک کە لە بەهار دا بووبێ.

**بەهارە کانی** (نا. ل)[بەهارە + کانی] هەندێک کانی کە بە بەهار دەتەقێنەوە و زوو وشک دەبن.

**بەهارەکـێڵ** (ئان. ل)[بەهارە + کـێڵ (کـێـڵان)] زەوییـــەکی کـە لە بەهار دا کێڵرابێ.

**بەهارەوار** (نا. ل)[بـەهار + ئە + وار] شـــوێنێکی نزیک دێ کـــە مـــەڕدار لە سـەرەتای بەهار چادری لێـهەڵدەدەن بەر لەوەی کـە بچنە کـوێستـــان و هەواری دوورتر.

**بەهاریی** (ئان. ل)[بەهار + ئیی] هەر شــتـێک کـە پـەیوەندی بە بەهار هـەبێ، بەهارە. :: گـوڵی بەهاریی، جل و بەرگی بەهاریی، بارانی بەهاریی.

**بەهانە** (نا.) بڕ: بیانوو

**بەهبـــەه** (ئان. ل)[بـەه + بەه] ١ـ بـۆ پێـدا هەڵگوتن دەردەبڕدرێ. :: بەهبـەه لەو چایە خۆش رەنگەی. ٢ـ بۆ سەرکۆنە لێدان دەکوترێ. :: بەهبەه ئەوە دەرست بۆ خوێندم. بەهبەه تەواومان کرد.

**بەهر** (نا.)[بڕ: بەهرە][باک] بڕ: بەش

**بەهرە** (نـا.)[ئەو: بـەخـــێــذرە ـ هـەخ: بـەخـــتـــرە ـ پەه: بەهرەک، بـەهر. باک: بـەهر، بەهـرە ـ ناو: بـەهـرە، بارە ـ بـاش: بەهرە ـ هەو: بەهرە ـ زا: بارە] ١ـ قازانج و ســــوودی دەسکەوتوو لـە ســـــەودا و بەرهـەم. ٢ـ بەر و بـەرهـەمـی زەوی و زار، داهات، حـاسڵ، بەروبوو. ٣ـ لێـهاتووی و لێـــوەشـــاوەیی لـە مــرۆڤ دا. ٤ـ [باک] بەهر، کوت، بەش، لەت.

**بەهرەدار** (نا. فـا)[بـەهرە + دار2] ١ـ

هەر شتێکی سوود و قازانجی هەبێ، خاوەن بەهرە، بە قازانج. ٢ـ مرۆڤی لێهاتوو، بلیمەت و لێوەشاوە، خاوەن بەهرە لە هونەر، فەن و زانست دا. ٭ هۆ شوانی بەهرەدار، تێخورە چاوەڕێین / ئارایشت تەواوە، ئامادەی هەڵپەڕکێین (گۆران ل ٥٢).

**بەهرەمە** (نا.) ئامرازێکە بە دەست کار دەکا، بریتییە لە نووکێکی پێچ دار کە گەورە و چووکەی هەیە، دەسکێکی هەندێک درێژ کە لە نێوەڕاست بە قەرا دەست خوار بۆتەوە و دەگەڕێ، نەججار و دارتاش لە سەر تەختەیەک کە بیانەوێ کونی کەن رایدەگرن و بە دەست دەیسووڕێنن و تەختە کون دەبێ، مەتکەب، مەتەی دەستی.

**تێبینی:** هاوڕیشە و هاومانای ئەم وشەیە لە زمانی فارسی دا برماە (بەرماه) و برماهە (بەرماهە) و لە زمانی پەشتوو دا برمە (بەرمە)یە.

**بەهرەمەند** (ئان. ل)[بەهرە + مەند] [پەه: بەهرمەند] ١ـ خاوەن بەهرە، بەهرەدار. ٢ـ خاوەن بەش، بەشدار، شەریک.

**بەهلوولک** (نا.)[باک] بڕ: بالۆکە

**بەهشت** (نا.)[زا] بڕ: بەهەشت

**بەهەشت** (نا.)[ئەو: ڤەهیشتە ـ پەه: ڤەهیشت. پاک: بهشت، بهوشت، بوهوشت، بوهیشت ـ ناو: بەهەشت، بەحەشت ـ باش: بهێشت ـ هەو: بەهەشت ـ زا: بەهشت] ١ـ شوێنێکە کە زۆربەی ئایینەکان باسی لێوە دەکەن و مرۆی راست و باش و بە ئیمان دەچێتە وێ. باغێکی خۆشە هەموو جۆرە خواردن و خواردنەوەیەکی تێدایە و تەنانەت بە قسەی قورئان حۆری و ژنی جوانیش بۆ پیاوان لێیە، جەننەت.// جەهەننەم. ٢ـ (مجـ.) وڵاتی خۆش و خەمڵاو بە گوڵ و شیناوەرد و هەر شوێنێکی خۆش و دڵگر. || **بەهەشتی باقی:** بەهەشتێک کە هەمیشە هەیە، بەهەشت. ٭ وەکوو ئەو حۆریانەی ئەگەر خودا لە بەهەشتی باقی داینا (شۆڕەمەحموود ل ٦٠). **بەهەشتی سەر زەوی:** ١ـ وڵات و شوێنی خەمڵاو و خۆش. ٢ـ بەهەشتی دەسکردی مرۆڤ بۆ بەربەرەکانی دەگەڵ بەهەشتی خودا. **بەهەشتی شەدداد:** ١ـ باغێک کە شەدداد (پادشایەک کە داوای خودایەتی دەکرد) هاوتا و هاوێنەی بەهەشت سازی کرد. ٢ـ (مجـ.) شوێنێکی خۆش و رازاوە و

هـاوتـای بـەهـەشـت لـە ســــەر زەوی. ⁂ مــەجلیــسی مــیــری وەکــوو بەهــەشــتی شــــەددادی دەڕازاوە (ســــەعــــیــــد و مــیــرســیــوەدین ل ١٥٥). **بەهەشــتی نێرەکەر:** دونیا بۆ ئەو کەسانەی کە گوێ نادەنە هیچ شتێک و خەمی هیچ ناخۆن. ⁂ دونیا بەهەشتی نێرەکەرە.

**تێبینی:** بەهەشت لە دوو بەشی بەھ بە مانای باش و ئیشت کە لە ئەوێستا دا نیشانەی (سفەتی تەفزیلیە) پێک هاتوە کە بە گشتی دەبێتە دنیای باشتر و چاکتر.

**بە هەشــتاو** (ئاک. ل)[بە + هەشتاو] بەپەلە، بەلەز، بەتاڵووکە. ⁂ دەهات بە گریان و بە هەشتاوە/ هەتتا دەگەییە میرمەمی، دەیگوت: بە قوربانت بم کوێت ئێشاوە (مان ل ٦٨).

**بەهەشتیی** (ئان. ل)[بەهەشت + ئیی] ١ـ کــەســێک کــە لە بـەهـەشـت دەژی، دانیشتووی بەهەشت. // جەهەننەمیی. ٢ـ پیاوی چاک و بە ئیمان ـ کە دوای مردنی پێیدەکوترێ وەک ئەوە کە دڵنیا بن دەچێتە بەهەشت. ٣ـ کەیبانوو و ژنی ماڵ ـ بە زمانی فەقێیان کە داوی نان و خواردنی لێدەکەن.

**بەهەوا** (ئان. ل)[بە + هەوا] بەفیز، بەدەعێ.

**بەهیف** (گیا.)[باک] بڕ: بادام

**بەهێ** (گیا.) بڕ: بەی

**بەهێز** (ئان. ل)[بە + هێز] ١ـ گیاندار یا مــرۆڤی بەقــەوەت و توانا. ٢ـ حــاڵی قسە، نووسراوە یا شتێکی بەبڕشت. **~ بوون:** ١ـ بەقـــەوەت بوون. ٢ـ بەبڕشت بوون. **~ کــردن:** بەقــەوەت کردن.

**بەئەسپایی** (ئاک. ل)[بە + ئەسپایی] ١ـ ئارام، سەبر، بێ هەست و خوست. ⁂ بەئەسپایی لە ماڵ وەدەرکەوت. بە ئەسپایی دەستی بە سەر یاڵی ئەسپەکە داهێنا. ٢ـ شــاراوە، بە نهێنی. ⁂ کارەکەی بە ئەسپایی دەکا و کەس پێی نازانێ.

**بەی** [1] (گیا.)[پەھ: بێھ. تات: بەهە ـ فار: بە ـ بیر: بێ. باک: بێـھ، بەهێ، بهـۆک، بیـۆک ـ ناو: بێ، بەهێ، بەی ـ باش: بەی ـ هەو: بەی ـ زا: بەی] ١ـ دارێکی دەستنێژە، زۆر بەرز نابێتەوە، لە دارە سێو دەچێ بەڵام گەڵاکانی کورکیان هەیە، بەرێک دەگــرێ کــە زەرد و بۆنخۆشە، Cydonia vulgaris ناوی

لاتینی ئەم دارەیە، دارەبێ، دارەبەی. ٢ـ بەری ئەم دارە، کـە مـیـوەیەکی شـینی بەکورکە، کە بگا زەرد و ئاودار و گۆشتن و بۆنـخـۆش دەبێ، بە کـاڵی (گـرفـتـە و بەری ئەوک دەگرێ) و پێشاوی دەخورێ و بۆ دۆڵمـە و مـرەباش دەست دەدا. هەروەها دەنکەکانی بەی لە ئاو دەکەن یا هەروا دەیخۆن و بۆ نەرم کردنی سینگ و کۆخـە زۆر باشـە. ٣ـ (مـجـ.) لە ئەدەبی کلاسیک و فولکلۆر دا بە مانای مەمکی تورت و خـڕ هاتوە. ៖ دەستـی لەرزۆکم هەتا تێـیـدایە هێـزی بەی گـوشین / لێمگەڕێ تاوێ لە باخی سینە میـوان ببمەوە (ناڵەی جودایی ل ٩٣). خاڵێ دیم جـە بەین دوو بەیانەوە / وە بـانـی بـەینـدا مـەشـیـانەوە (بێسـارانی). ~ **پێشاندن:** چەشنێک کولاندنی بێ بە هەڵمی ئاو.

**بەی**[2] (گـیـانـ.)[باک: بەی ـ زا: بەیە] بڕ: مۆرکە

**تێبینی:** لە زمانی فارسی دا بید هەر بەم مانایە هاتوە.

**بەیابان** (نا.)[باک] بڕ: بیابان

**بەیات**[1] (نـا.)[بڕ: بەیت] هەوایەکی مـۆسـیـقـایە کـە چەند جـۆری هەیە. ៖ بەیاتی کـورد، بەیاتی تورک، بەیاتی ئیسفەهان.

**بەیات**[2] (ئان.)[عەر: بیـات] ١ـ حاڵی نان و کولێرە کە چەند رۆژی بە سـەر دا تێپەڕ بووبێ و کۆن بووبێ. ٢ـ چێشت و هەر خـواردەمـەنیـیـەکی کـە شـەو سـاز کرابێ و بۆ بەیانی مابێتەوە، شەوپاتە، شـەومـەنە، پەزێرە، بەیاتە. ~ **بوون:** کۆن بوونی نان و کولێرە.

**بەیاتە** (ئان.)[عـەر: بیـات] ١ـ [ئەر] چێشتی ماوەی شەو، شەومەنە، بەیات. ٢ـ رۆن دووگ

**بەیاخ** (نا.)[ئەر] بڕ: بەیداغ

**بەیاخدار** (ئان. فا)[بەیاخ + دار] بڕ: ئالادار

**بەیار** (نا. ئان.)[عـەر: بائر][باک: بەیار ـ ناو: بەیار، باهێـر ـ زا: بەیارە] زەوییـەک کـە سـاڵێک یا مـاوەیەک بێ نەکێڵدرابێ.

**تێـبـینی:** لە هەندێک ناوچە بوورە و بەیار یەک مـانایان هەیە و لە هەندێک ناوچەی وەک موکریان بەیار زەوییەکە کە ماوەیەک نەکێڵدرابێ و بوورە زەوییەکە کە قەت نەکێڵدرابێ.



**بەیارە** (نا. ئان.)[زا] بڕ: بەیار

**بەیاز** (نا.)[عەر: بیاض] ١ـ دەفتەرێکی دەسنووس کە بیرەوەری یا شێعری تێدا نووسرابێتەوە. ٢ـ [ئەر] بەیار. ٣ـ (ئان.) سپی. ⁘ زولفەکەت گرتمی، بەیازی گەردنت سووتاندمی/ خوێنی پەروانە بە دەستی شەو لە سەر ئەستۆی شەمە (وەفایی ل ١٣٨). نازک ئەو بەیاز بناگۆش شەم/ نازک ئەگریجان سەر نە دۆش شەم (وەلی دێوانە ل ٧٣).

**بەیان**[1] (نا.)[باک: بەیانی ـ ناو: بەیان، بەیانە، بەیانی] ١ـ کاتی دەست پێکردنی ڕۆژ، سەرەتای ڕۆژ بەر لە هەڵاتنی هەتاو، بەیانە، سبەە. ٢ـ ناوە بۆ مێینە. ~ **بەربوون:** بڕ: بەیان ئەنگووتن. ⁘ وا خستمی چاوی کە بە داو زولفی وەلا دا / شەو ڕۆیی، بەیان بەربوو، ئەمن هەر لە خەوا بووم (وەفایی ل ٧٢). ~ **داهاتن:** بڕ: بەیان ئەنگووتن. ~ **ئەنگووتن:** تەواو بوونی شەو و ڕۆژ بوونەوە، بەیان داهاتن، بەیان بەربوون. ⁘ بەیان ئەنگووت و شەو ڕابورد و من هێشتا خەوم نایە / دەخوێنن بولبول و قومری بەڵام قاسپەی کەوم نایە (ناڵەی جودایی ل ٩٢).

**تێبینی:** زەبیحی بە پێچ و پەناوە وشەی بەیانی بردۆتەوە سەر بامەی ئەوێستایی (قامووس ب ٢ ل ٢٢٧). بەیان هەم دەچێتەوە سەر [هیک: بهامە ـ ئەو: بامە، بامیە ـ پەه: بام، بامییک] بە مانای ڕووناک و هەمیش دەچێتەوە سەر [هیک: بهانەڤ ـ ئەو: بانەڤ ـ سان: بهانو ـ پەه: بانووی] بە مانای شۆق و لە موکریان دا هێشتا لە تاو و بان دا بەم مانایە ماوە.

**بەیان**[2] (نا.)[عەر: بیان] ١ـ ئاشکرا، شی، تەفسیر. ٢ـ بڕ: بەیاننامە. ~ **کردن:** ١ـ شی کردنەوە، لێکدانەوە، تەفسیر کردن. ٢ـ دەربڕین، گێڕانەوەی قسە.

**بەیانان** (ئاک. ل)[بەیان1 + ئان] کاتی بەیان، لە وەختی بەیان دا، بەیانییان، بەیانەکی. ⁘ هەموو ڕۆژێ بەیانان بە ئاوی سارد حەمامێ دەکا.

**بەیاننامە** (نا. ل)[بەیان2 + نامە] نوسراوە و هەڵوێستێکە لە سەر مەسەلەیەک کە ڕێکخراوەکان و دەوڵەتەکان دەری دەبڕن، بەیان.

**بەیانەکی** (ئاک. ل)[بەیان1 + ئەکی] بڕ: بەیانان

**بەیانی** (نا.)[بڕ: بەیان1] ١ـ ڕۆژێک کە بە دوای ئەمڕۆ دا دێ، سبەی، سۆزی، سبەینێ. ٢ـ کاتی دەست پێکردنی ڕۆژ، بەیان، بەیانە. ٣ـ لە وەختی بەیان دا، بەیانییان.

**بەیانییان** (ئاک. ل)[بەیانی + یان] بڕ: بەیانان

**بەیبوون** (گیا.)[باک: بەیبوون، بابوونە، بابن ـ ناو: بەیبوون، بەیبوونە، بابوونە] گوڵێکی بۆنخۆشی سپییە کە نێوەکەی زەردە، لاسکی شین و گەڵای زۆر و وردە، لە نێو مێرگ و لێو جۆگە دەڕوێ، خۆرسکە و هەتا نیوگەز هەڵدەدا. لە کوردەواری دا ئەم گوڵە ئیشک دەکەن و بۆ دەرمان کەلکی لێوەردەگرن. دێم کراوەی بۆ گەدە، قەبزی، تێکچوونی دەحەیزەوە چوونی مانگانەی ژنان و هەروەها بۆ یاو و چەق و چۆ زۆر باشە، بابنەپێچ، گوڵە بەیبوونە، گوڵەفەقێ. Anthemis nobilis ناوی لاتینی ئەو گیایەیە، بە عەرەبی بابونەج و بە فارسیش بابوونەی پێدەڵێن.

**بەیبوونە** (گیا.) بڕ: بەیبون

**بەیت** (نا.) ١ـ چیرۆکە شێعری فۆلکلۆری (ئایینی، دڵداری، مێژوویی و ...) لە سەر هەوای تایبەتی خۆیان کە دانەر و ئاهەنگسازەکەیان دیار نیە و پشتاوپشت گەیشتۆتە دەست ئێمە. ٢ـ هەر چیرۆکە شێعرێک کە لە سەر هەوای بەیت داندراوە و هەمان مەبەستی بە دوایە و دانەرەکەی دیارە کە کێیە، یا کێ بوە. ⁝⁝ بەیتەکانی عەلی بەردەشانی، بەیتی مەم و زینی خانی. ٣ـ قسەی دوور و درێژ و بێ مانا. ⁝⁝ ئەوە تۆ باسی چ دەکەی هەر دەڵێی بەیتان دەڵێی. ٤ـ خەتێک شێعر کە بریتییە لە دوو میسرەع. || **بەیتی بلە:** (کنـ.) قسەی دوور و درێژ و بێ سەر و بەرە.

**تێبینی:** وشەی بەیت قسەی زۆر لە سەرە و هەندێک بردوویانەتەوە سەر بەیتی عەرەبی، تاقمێکیش پێیان وایە لە وشەی بەیات کەوتوە. من پێموایە بەیت دەبێ لە پاد pād ـ ی ئەوێستایی بە مانای شێعر کەوتبێ و لە زمانەکانی ئوروپاییش دا poet بە مانای شاعیر هەر لەو ڕیشەیە. هەروەها دوور نیە بەر لە ئیسلام بەیت وەک هۆرە ئاهەنگ و هەوای مەزهەبیشی هەبووبێ و لە دوای ئەو بەشەی نەمابێ و بە دووریشی نابینم کە بەیات1 و بەیت هەر یەک بووبێن یا

یەک سەرچاوەشیان هەبێ.

**بەیتـــــار** (نا.)[یون: ippiatros] پزیشک و دوکتـوری مـالات، بەیتـاڵ، بایتار، مەیتەر.

**تێبینی:** ئەم وشە لە ippos بە مانای ئەسپ و iatros بە مـانای پزیشک و دوکتور پێک هاتوە کە بە گشتی دەبێتە دوکتوری ئەسپ. ئەم وشەیە بە شێوەی بیطار چۆتە نێو زمـانی عـەرەبی و لە عەرەبی را پەڕیوەتە نێو زمانی کوردیی و مەیتەریشی لێ پەیدا بوە.

**بەیتاریی** (حم.)[بەیتار + ئیی] کار و پیشەی بەیتار، بەیتاڵیی.

**بەیتاڵ** (نا.) بڕ: بەیتار

**بەیتـاڵیی** (حم.)[بەیتاڵ + ئیی] بڕ: بەیتاریی

**بەیت بێژ** (ئان. فا)[بەیت + بێژ] ١ـ کـەسـێک کـە دانـەری بەیتـە و بەیت ڕێکدەخـا. ٢ـ کـەسێک کـە بەیتـەکـان لە کۆڕ و مەجلیسان دەڵێتەوە.

**بەیت بێژیی** (حم.)[بەیت بێژ + ئیی] کار و پیشەی بەیت بێژ.

**بەیتک** (گیانـ.)[بەیت + ک][باک] بڕ: چۆلەکە.

**بەیت و بالـۆرە** (نا. ل)[بەیت + و + بالۆرە] بڕ: بەندوباو. **~ بۆ هەڵبەستن:** بڕ: بەندوباو هەڵبەستن.

**بەیت و باو** (نا. ل)[بەیت + و + باو] بڕ: بەندوباو. **~ بۆ ڕێکخـستن:** بڕ: بەندوباو هەڵبەستن.

**بەیچەڵ** (ئان.)[؟] حاڵەتی ژنێک کە نەتوانێ منداڵی بێ، نەزۆک.

**بەیداخ** (نا.) بڕ: بەیداغ

**بەیداخدار** (نا. فا)[بەیداخ + دار] بڕ: ئاڵادار

**بەیداخـداریی** (حم.)[بەیداخـدار + ئیی] بڕ: ئاڵاداریی

**بەیداغ** (نا.)[تور: bayrak] بەیاخ، بەیداخ (بڕ: ئاڵا). **~ هەڵدان:** بڕ: بەیداغ هەڵکردن. **~ هەڵکردن:** ئاڵا هەڵکردن، ئاڵا هەڵدان، بەیداغ هەڵدان. ⁂ ئەمـــا ئەوە من لە عـــەرزیم و ئەو بەیداغی هەڵکردوە لە مـابەینی عـەرز و عاسـمانێ (سەعید و میرسێوەدین ل ١٠).

**تێبـینی:** ڕەنگە یەکەندەردوو وا بێتە بەرچاو کــە ئەم وشـــەیە لە (بەیرەق، بایراق) وەرگیرابێ کە هێندێ لە زانایان

لایان وایە وشـەیەکی ترکییـە، بەڵام من وای بـۆ دەچـم کـــــە لـە (بـەیـرەق)ی عارەبییەوە هاتوە کە یەکێک لە ماناکانی (ڕێ پێـشـاندەر)ە و خـۆشـی لە وشـەی (پیادەک = پیاوە)وە کراوە بە عـارەبی. (قامووس ب ٢ ل ٢٢٨).

**بەیداغدار** (نا. فا)[بەیداغ + دار] بڕ: ئاڵادار

**بەیداغداریی** (حم.)[بەیداغدار + ئی] بڕ: ئاڵاداریی

**بەیدەس** (ئان. ل)[بەی (بێ) + دەس] ١ـ حـاڵی کـەسـێکی دەسـتـەڵاتی نـەبێ، بێدەستەڵات، تەسیلم. ٢ـ حاڵی ئەسپ و ماینێک کە خۆ وەدەستەوە نەدا و نەکرێ سـواری بی، رام نەکـراو. & بەیدەست. **~ کردن:** ١ـ زاڵ بوون بەسەر کەسێک دا، دەسـتـەڵات بە سـەر کـەسـێک دا پەیدا کـردن. ٢ـ دەسـتـەمـۆ کـردنی ئـەسپ و ماین.

**بـەیـدەسـت** (ئـان. ل)[بـەی (بـێ) + دەست] بڕ: بەیدەس

**بـەیـرەم**[1] (نـا.)[؟] ئـاە و نـاڵـە، کـرووزانەوە. :: ئەگـەر بۆ کـەمی دنیـا دەکـــــەی بەیـرەمـێ/ تـا زێـڕ و زێـو و خەزێنەت دەمێ (بارام و گوڵندام ل ٤٠).

**بەیرەم**[2] (نا.)[؟][ئەر] بڕ: باریە

**بەیزی** (نا.)[عەر: بیضوی] شکڵێکی هەندەسییە وەک هێلکە.

**بەیشلا** (گیا.)[؟][زا] بڕ: کاڵەک

**بەیعەت** (نا.)[عـەر: البیـعة] پەیمان. **~ پێکردن:** رازی بوون و قـــەبووڵ کردنی سەرۆکایەتی کەسێک. هەڵبژاردن بە شێوەی ئیسلام.

**بەیڤ** (گیا.)[باک] بڕ: بادام

**بەیلەسان** (گیا.) بڕ: بەلەسان

**بەین** (نـا.)[عـــەر: بین] ١ـ مـــەودای نێـوان دوو شـوێن، کـەس یـا دوو شت لە یەکـتـر، نێـوان. :: بۆکـان لـە بەینی مـەهاباد و سـەقـز دایە. ناکـۆکـیـان دە بەین دایە. ٢ـ پەیوەنـدی نێـــوان دوو یـا چەند کـەس، دۆسـتـایەتی. :: حـەسـەن و حـوســێن بـەینیـــان خـــۆش نیـــە. ٣ـ ئالوودەیی، پێ خـــۆش بوون :: بـەینم دەگەڵ راو نیـە. ٤ـ وەخت، دەم، کات. :: بەینێکە کاک رەسوو دیار نیە، منیش ئەو بەینانە نەمدیوە. **~ بەین:** جـارجـار، نێوان بە نێوان. :: بەین بەین سەرێکمان لێـبـدە. **~ نەمـان:** ١ـ لێک تۆران، لە یەک گۆڕین، تێک چوونی دۆستایەتی. :: ماوەیەکە دەگەڵ یەک بەینمان نەماوە. ٢ـ

وەلانان و تەرک کردنی شتێک کە ئالوودە بوون. :: بەینم دەگەڵ جگەرە نەماوە.

**بەینەت** (نا.)[؟][ناو: بەینەت ـ هەو: بەینەت] وەفا، پەیمان. :: ئەمن چ بکەم بۆ قاسیدێکی بە بەینەت و بە بەقا/ بینێرەوە کن چەلەنگێ ئەوێ کاولە دنیایە (پایزە ل ٣٣). هەر پاسە شادیش نییەن بەینەتەش/ بەڵ بێ بەقا بۆ سزا و مەینەتەش (مەولەوی ل ١٦٨).

**بەینەتدار** (ئان. فا)[بەینەت + دار] بەوەفا، بەئەمەگ، وەفادار، ئەمەگدار. :: وەسیەتم ئێدەن شای شەم روخساران/ بەی وە باڵینم چون بەینەتداران (وەلی دێوانە ل ٦٢).

**بەینەتداریی** (حم.)[بەینەتدار + ئیی] بە ئەمەگ بوون، وەفادار بوون، ئەمەگداریی.

**بەیە** (گیان.)[زا] مۆرکە. بڕ: بەی2

**بەیەکجاریی** (ئاک. ل)[بە + یەکجاریی] بۆ هەمیشە، هەتا ئەبەد، بە جارێک.

**بەیەوە** (نا. ل) بڕ: بادەوە2

**تێبینی:** بەیەوە سووک کراو و سوای وشەی بادەوە ـ یە.

لایان وایە وشەیەکی ترکییە، بەڵام من وای بۆ دەچم کە لە (بەیرەق)ی عارەبییەوە هاتوە کە یەکێک لە ماناکانی (رێ پێشاندەر)ە و خۆشی لە وشەی (پیادەک = پیاوە)وە کراوە بە عارەبی. (قامووس ب ٢ ل ٢٢٨).

**بەیداغدار** (نا. فا)[بەیداغ + دار] بڕ: ئاڵادار

**بەیداغداریی** (حم.)[بەیداغدار + ئی] بڕ: ئاڵاداریی

**بەیدەس** (ئان. ل)[بەی (بێ) + دەس] ١ـ حاڵی کەسێکی دەستەڵاتی نەبێ، بێدەستەڵات، تەسیلم. ٢ـ حاڵی ئەسپ و ماینێک کە خۆ وەدەستەوە نەدا و نەکرێ سواری بی، رام نەکراو. & بەیدەست. **~ کردن:** ١ـ زاڵ بوون بەسەر کەسێک دا، دەستەڵات بە سەر کەسێک دا پەیدا کردن. ٢ـ دەستەمۆ کردنی ئەسپ و ماین.

**بەیدەست** (ئان. ل)[بەی (بێ) + دەست] بڕ: بەیدەس

**بەیرەم**[1] (نا.)[؟] ئاه و ناڵە، کرووزانەوە. :: ئەگەر بۆ کەمی دنیا دەکەی بەیرەمێ/ تا زێڕ و زێو و خەزێنەت دەمێ (بارام و گوڵندام ل ٤٠).

**بەیرەم**² (نا.)[؟][ئەر] بڕ: باریە

**بەیزی** (نا.)[عەر: بیضوی] شکڵێکی هەندەسییە وەک هێلکە.

**بەیشلا** (گیا.)[؟][زا] بڕ: کاڵەک

**بەیعەت** (نا.)[عەر: البیعة] پەیمان. ~ **پێکردن:** رازی بوون و قەبووڵ کردنی سەرۆکایەتی کەسێک. هەڵبژاردن بە شێوەی ئیسلام.

**بەیڤ** (گیا.)[باک] بڕ: بادام

**بەیلەسان** (گیا.) بڕ: بەلەسان

**بەین** (نا.)[عەر: بین] ١ـ مەودای نێوان دوو شوێن، کەس یا دوو شت لە یەکتر، نێوان. ‡ بۆکان لە بەینی مەهاباد و سەقز دایە. ناکۆکییان دە بەین دایە. ٢ـ پەیوەندی نێوان دوو یا چەند کەس، دۆستایەتی. ‡ حەسەن و حوسێن بەینیان خۆش نیە. ٣ـ ئالوودەیی، پێ خۆش بوون ‡ بەینم دەگەڵ راو نیە. ٤ـ وەخت، دەم، کات. ‡ بەینێکە کاک رەسوو دیار نیە، منیش ئەو بەینانە نەمدیوە. ~ **بەین:** جارجار، نێوان بە نێوان. ‡ بەین بەین سەرێکمان لێبدە. ~ **نەمان:** ١ـ لێک تۆران، لە یەک گۆڕین، تێک چوونی دۆستایەتی. ‡ ماوەیەکە دەگەڵ یەک بەینمان نەماوە. ٢ـ وەلانان و تەرک کردنی شتێک کە ئالوودە بوون. ‡ بەینم دەگەڵ جگەرە نەماوە.

**بەینەت** (نا.)[؟][ناو: بەینەت ـ هەو: بەینەت] وەفا، پەیمان. ‡ ئەمن چ بکەم بۆ قاسیدێکی بە بەینەت و بە بەقا/ بینێرەوە کن چەلەنگێ ئەوێ کاولە دنیایە (پایزە ل ٣٣). هەر پاسە شادیش نییەن بەینەتەش/ بەڵ بێ بەقا بۆ سزا و مەینەتەش (مەولەوی ل ١٦٨).

**بەینەتدار** (ئان. فا)[بەینەت + دار] بەوەفا، بەئەمەگ، وەفادار، ئەمەگدار. ‡ وەسیەتم ئێدەن شای شەم روخساران/ بەی وە باڵینم چون بەینەتداران (وەلی دێوانە ل ٦٢).

**بەینەتداریی** (حم.)[بەینەتدار + ئیی] بە ئەمەگ بوون، وەفادار بوون، ئەمەگداریی.

**بەیە** (گیانـ.)[زا] مۆرکە. بڕ: بەی2

**بەیەکجاریی** (ئاک. ل)[بە + یەکجاریی] بۆ هەمیشە، هەتا ئەبەد، بە جارێک.

**بەیەوە** (نا. ل) بڕ: بادەوە2

**تێبینی:** بەیەوە سووک کراو و سوای وشەی بادەوە ـ یە.

**بی**[1] (گیا.)[ئەو: ڤەئێئیتی، ڤەئێتەی ـ پەھ: ڤیـیت، ڤێت. لۆر: بید ـ فار: بید ـ بیر: بێد. باک: بی ـ ناو: بی ـ باش: بی ـ زا: ڤییا] دارێکی بێبەری بە سێبەرە، پتر لە شوێنی شێدار و پەنا جۆگە و رووباران دەڕوێ، گەڵاکانی درێژ و سادەن، مالات چاکی دەخۆن، لقەکانی ناسکن بۆ شووڵ و سەلە و سەوەتە چنین زۆر باشە، دارەکەی بۆ کەرەسە ساز کردن باش نییە و زوو دەڕزێ. ناوی لاتینی ئەم دارە Salix و توێکڵی ئەم دارە مادەیەکی بە ناوی Salicine هەیە کە بۆ نۆبەتێ و باداری کەلکی لێوەردەگرن، بیکۆڵ، ویکۆڵ.

**بی**[2] (نا.)[باک] بڕ: بێوە

**بی**[3] (نا.)[باک] بڕ: بۆن

**بیابان** (نا. ل)[پەھ: ڤیاپان، ڤیاڤان. باک: بەیابان ـ ناو: بیابان، بیاوان ـ باش: بیاوان، بیابان ـ هەو: بیابان] دەشت و سارای بێ ئاو و گیا، دەشتی چۆڵ و هۆڵ، بێروون. ~ **بوون:** (مـجـ.) بوورانەوە. چۆڵ بوونی دڵ. :: دڵم لە جۆشە، دەروونم گەلێک بیابانە، ... (مان ل ٩١). سەرم دێشێ، ئەوڕۆکە دڵم زۆر لە هێش و بیابانە (لاس و خەزاڵ ل ٥٩).

**بیابانی** (ئان. ل)[بیابان + ئی] ١ـ ئەو کەسەی کە لە بیابان دەژی، سارانشین. ٢ـ کەسێک کە گوێ نەداتە داب و نەریتی کۆمەڵایەتی، بێتەربیەت. ٣ـ هەر گیاندارێک کە لە بیابان بژی.

**بیانک** (نا.) بڕ: بیانوو

**بیانگ** (نا.)[ئەر] بڕ: بیانوو

**بیانوو** (نا.)[پەھ: ڤەهان، ڤیهان، بەهان، ڤیهانەک، بەهانەک، بیهانەک، ڤەهانەگ، ڤەهانەک. باک: بەهانە، بافک ـ ناو: بەهانە، بیانوو، بیانگ، بیانی ـ باش: بیانگ ـ هەو: ویانە، بەهانە] ١ـ شتێک یا کەس و هۆیەک کە دێتە گۆڕێ بۆ ئەنجام نەدانی کارێک، عوزر. :: سەرئێشە بیانووی چاکە نەچییەوە سەرکار. منداڵەکەی دەکاتە بیانوو و ناچێتە ماڵی کەس. ٢ـ کەمایەسی، ئیراد. :: هێندە بیانوو لەو چێشتە مەگرە، دانیشە و بیخۆوە. ٣ـ پەڵپ، ئەنجەت، هەنجەت. ~ **بڕینەوە:** وڵام دانەوەی هەموو عوزر و بیانوویەک بۆ ئەنجام نەدانی کارێک. :: هەرچەند بیانووی هێناوە کە سبەی نایەین، هەموو بیانووم لێ بڕیەوە و کوتم هەر دەبێ



بێن. ~ **پێ نەمان:** بڕینەوەی بیانووی کەسێک بۆ ئەنجام نەدانی کارێک وەها کە بیانووکانی تەواو بووبن، بیانوو نەمان. ~ **پێ نەهێشتن:** بڕینەوەی بیانووی کەسێک. ~ **داتاشین:** بیانوو ساز کردن بۆ ئەنجام نەدانی کارێک، بیانوو هێنانەوە. ~ **دیتنەوە:** بیانوو ساز کردن، بیانوو هێنانەوە، بیانوو داتاشین. ~ **ساز کردن:** بیانوو دیتنەوە، بیانوو هێنانەوە. ~ **کردن:** بڕ: بیانوو هێنانەوە. ~ **گرتن:** ١ـ بیانوو هێنانەوە. ٢ـ ئیراد گرتن. ~ **نەمان:** بڕ: بیانوو پێ نەمان. ~ **هێنانەوە:** عوزر و بیانوو هێنانە گۆڕ بۆ ئەنجام نەدانی کارێک، بیانوو کردن، بیانوو داتاشین. **لە ~ بوون:** لە خۆوە و بێ هیچ بەڵگەیەک بیانوو پێگرتن. **لە بیانوویەک گەڕان:** دیتنەوەی بیانوویەک بۆ بەڕێوە نەبردن و خستنە پشت گوێی کار و مەسەلەیەک. ؛؛ ئەوانە لە بیانوویەک دەگەڕێن هەتا شەرت و بەڵێنەکەی خۆیان هەڵوەشێننەوە. عەلی لە بیانوویەک دەگەڕێ هەتا دەرسەکەی نەخوێنێ. **لێ لە ~ بوون:** بیانوو گرتن لە خۆوە، بیانوو داتاشین. ؛؛ دوژمن لێمان لە بیانوویە هەربینا شەڕێکی پێ

فرۆشتین.

**بیانی**[1] (نا. ئان.) بڕ: بێگانە

**بیانی**[2] (نا.) بڕ: بیانوو

**بیاوان** (نا.) بڕ: بیابان

**بیبار** (گیا.)[سان: pippalī] ١ـ بەری گیایەکی ساقەت درێژ و باریکە و لە دار دەهاڵێ و لە شوێنی گەرم وەک هیندوستان دەڕوێ و هەتا سی ساڵان بەر دەدا. بەرەکەی دەنکێکی ورد و ڕەشە و زۆر تیژە و بە هێشوویە، لە کوردەواری ئەم دەنکە دەهاڕن و لە چێشتی دەکەن. & بیبەر، ئیسۆت، ئیسیوەت، باجک، ئالات، ئاڵەت1. ٢ـ بەری گیایەکە هەر بەم ناوە کە جۆری زۆرە و لە ژێرەوە هاتوون، بیبەر، باژک. || **بیباری ترشی:** هەمان بیباری دۆڵمەیە کە بۆ ترشی کەلکی لێوەردەگرن. **بیباری دۆڵمە:** بیبارێکی گەورە و گۆشت دارە کە بە شینی تیژ نیە و بە کاڵی دەخورێ و بۆ ترشی و دۆڵمە دەکار دەکردرێ، بیباری ترشی. **بیباری سپی:** بەری دریشتی بیبارە کە لە ئاو دا دەیخووسێنن تۆکڵی سەری لا دەبەن. **بیباری سوور:** بەری گەیشتووی بیباری شینە کە ویشکی دەکەن و دەیکوتنەوە و

دە چێشت دەکردرێ. **بیباری شین:** ١ـ گیایەکی یەک ساڵەی دەسچێنە، ساقەت کورتە و گوڵی سپی دەکا کە لە دوایی سوور دەبێ. بیباری شین وەک سەوزی خواردن بە شینی دەگەڵ چیشت دەخورێ، مەیلی خواردن پتر دەکا و تامێکی تیژی هەیە. دوای سوور بوون ئیشکی دەکەن و دەیسوون و لە چێشتی دەکەن. **بیباری ویشک:** بیباری سووری ویشک کراو کە هەم بە ساغی دە ئاش و دۆکلیوی دەکەن هەمیش دەیکوتنەوە و دەچێشتی دەکەن، بیباری ئیشک. **بیباری ئیشک:** بڕ: بیباری ویشک

**تێبینی:** زێدی بیبار هیندوستان بوە و لەوێوە بۆ خۆی و ناوەکەی بە دنیا دا بڵاو بوونەوە. لە کوردیی دا مانای بیبار پتر بۆ بیباری شین بە کار دەبردرێ.

**بیبک** (نا.)[باک] بڕ: بیبیلە

**بیبل** (ئا.)[باک] بڕ: بیبیلە

**بیبن** (نا. ل)[بی ؟ + بن (بەند)][هەو] بڕ: پشتێند

**بیبۆک** (ئا.)[باک] بڕ: بیبیلە

**بیبەر** (نا.)[باک] بڕ: بیبار

**بیبی**[1] (نا.)[تور: bibi] ١ـ خاتوون، خانم. ٢ـ نەنک، دایەگەورە. ٣ـ بووکۆڵەی منداڵ. ٤ـ یەکێک لە پەڕەکانی قومار کە وێنەی ژن یا مەلەکەیەکی لە سەرە.

**بیبی**[2] (نا.)[باک] بڕ: بیبیلە

**بیبیلانک** (نا.)[باک] بڕ: بیبیلە

**بیبیلە** (نا.)[تات: بەبەک. باک: بیبیلانک، بیبی، بیبۆک، بەبەلە، بیبل، پیبپک، پیبک ـ ناو: بیبیلە ـ باش: بیبیلە] کونی نێو رەشکێنەی چاو کە لە مرۆڤ دا سێ هەتا شەش میلیمێترە. بیبیلەی چاو بە پێی نوورێک کە وە چاو دەکەوێ کونەکەی تەنگ و گەورە دەبێتەوە.

**بیتاقە** (نا.)[؟] بڕ: بلێت

**بیتک** (نا.)[؟][باک] باپشکێو

**بیجاد** (نا.) ١ـ بڕ: بیجادە. ٢ـ (گیا.)[باک] عەنبەر، داری عەنبەر.

**بیجادە** (نا.)[؟] جۆرێک یاقووتی سوور، ئەقیق، بیجاد. ⁂ بە قیمەت گرانی، بیجادە و دوڕی / نەکەی وەک باڵدار لە دڵم هەڵفڕی / مەمکت لە دوو جێ کراسیان دڕی (بارام و گوڵندام ل ٧٢). سم وەکوو یەشم و لە پەشم و تووکی پێدا سەرنگوون / چاو وەکوو بیجادە یا دوو شەوچراغی شوعلەڕێژ

(نالی ل ٢٢٦).

**بیجەک** (نا.)[؟] کوتە کاغەزێک کە فرۆشیار ناو و رادە و ئەندازەی کالا و شمەکی تێدا دەنووسێ و بۆ کڕیاری ت□یەتا بە پێی ئەم کاغەزە کالاکەی

ماوەیەکە بیری دایکم دەکەم. ٢ـ بڕ: لە بیر کردن. **~ کردنەوە:** فکر کردنەوە، چوونە نێو خەیاڵ و لێکدانەوە بۆ چارەسەر کردنی مەسەلەیەک، بیر لێکردنەوە. **~ کەفتن:** بڕ: وەبیر هاتنەوە. **~ کەوتنەوە:** بڕ: وەبیر هاتنەوە. **~ لێکردنەوە:** بڕ: بیر کردنەوە. **~ هاتنەوە:** بڕ: وەبیر هاتنەوە. **~ هێنانەوە:** بڕ: وە بیر خستنەوە. **لە ~ بردنەوە:** پەرت کردنی کەسێک و لە مێشک چوونە دەری مەسەلە یا قسەکەی. ¤ هێندە چوویە نێو قسەمەوە قسەکەت لە بیر بردمەوە. **لە ~ بوون:** لە مێشک دابوون، لە بیر نەکردن، لە بیر مان. **لە ~ چوون:** بڕ: لە بیر کردن. **لە ~ چوونەوە:** لە بیر کردنی شت یا مەسەلەیەک بە یەکجاری. **لە ~ کردن:** لە بیر چوونەوە مەسەلەیەک، لە بیر چوون، بیر چوونەوە. **لە ~ مان:** بڕ: لە بیر بوون. **وە ~ خستنەوە:** هێنانەوە بیری مەسەلەیەک کە کەسێک لە بیری کردبێ، بیر خستنەوە، بیر هێنانەوە، وەبیر هێنانەوە. **وە ~ هاتنەوە:** هاتنەوە نێو مێشکی شتێکی لە بیر کراو، بیر کەوتنەوە، بیر هاتنەوە، بیر کەفتن. **وە ~ هێنانەوە:** بڕ: وەبیر

خستنەوە.

**بیر**[2] (نا.)[عەر: بئر] چاڵێکی قوڵ کە بۆ گەیشتن بە ئاو هەڵیدەکەنن، چاڵاو.

**بیـــراز** (نا.)[؟] ١- گـــڕنی کـــردنی بەرداش. ٢- زەوی لێک و لووس کراو بۆ چاندن. **~ کردن:** ١- تیـژ کـردنەوە و گـڕنی گـڕنی کـردنی بەرداش. بەرداش دوای قـەدەرێک کـار دەسوێ و دان جـوان ناهاڕێ، لەبەر ئەوە هەرچەند جـارێک بە قـەڵەم گڕنی گڕنی دەکەنەوە هەتا دان بە وردی بـهـــــاڕێ، ئـاردی بەرداشـی تـازە بیـــراز کـــراو هـەندێک وردە و بـەردی تێـــدادەبێ. ٢- ڕێک کـــردنی زەوی بـۆ چاندن. & بیـرازتـن. ٣- (کنـ.) دارکـاری کردن و لێدان.

**بیرازتن** (چا. م)[لە: بیراز] بڕ: بیراز کردن/١ و ٢.

**بیراو** (نا. ل)[بیر2 + ئاو] بیرێک کە گەیشتۆتە ئاو و ئاوی هەیە، چاڵاو.

**بیـربزوێن** (ئان. فـا)[بیـر1 + بزوێن] هەر کـار و ڕووداو و دیمەن و شـتێک کە مێشکی ئینسـان ببزوێنێ و کاری تێکا و بیـــری لێـــبکاتـەوە. ‌:: بەهـار وەرزێکی بیربزوێنە بە تایبەت بۆ شاعیر.

**بیـــربڵاو** (ئان. ل)[بیـــر1 + بڵاو] کەسێک کە بیر و مێشکی بە تەواوی لە سەر خۆ نیە و شت زوو لە بیر دەکا.

**بیـــربڵاویی** (حم.)[بیـــربڵاو + ئی] کردەوەی کەسی بیربڵاو.

**بیـرتەسک** (ئان. ل)[بیـر1 + تەسک] بڕ: بیرکورت

**بیرتەسکیی** (حم.)[بیـرتەسک + ئی] بڕ: بیرکورتیی

**بیـــرکـــورت** (ئان. ل)[بیـر1 + بڵاو] کـەسـێک کـە ڕێز بۆ بیـر و بـاوەڕی دیکە دانـانـێ و مـــــەیـدانـی بیـنـین و ڕوانـگـەی فـرەوان نیـە، کەڵلەوشک، مێـشک وشک، بیرتەسک.

**بیـرکورتیی** (حم.)[بیـرکـورت + ئی] کردەوەی کەسی بیرکورت، بیرتەسکیی، کەڵلەوشکیی.

**بیـــرمـــشـک** (نا.)[بیـــر (بی1) + مشک2] ١- (گیا) چەشنە دارەبییەکە کە گـوڵی بۆنـخـۆش دەگـرێ و بـۆ ئارەق2 و شـەربەت کـەلکی لێوەردەگـرن، Salix aegyptiaca ناوی لاتینی ئەم دارەیە، بیمشک. ٢- جۆرێک شیرنی وردی ڕەنگ سپی کە لە ئارەقی ئەم گوڵە بۆ تامەکەی کەلک وەردەگرن، نوقڵ.

**بیروهۆش** (نا. ل)[بیر1 + و + هۆش] بڕ: بیرەخەو. **دە ~ ڕاچوون:** بڕ: دە بیرەخەو ڕاچوون.

**بیرۆ** (نا.)[باک: بیرۆڤ، بیرۆڤە ـ ناو: بیرۆ] نەخۆشییەکی پێستە، پێست لەش سوور دەبێتەوە و دەماسێ و بلۆقی ورد دەردەدا کە زۆر دەخورێ. وشک و تەڕی هەیە، هۆیەکەی شێوانی دەلاوی لوویەکانی لەش یا ئالێرژی توند بە شتێکە. (فەر: Eczema)

**بیرۆڤ** (نا.)[باک] بڕ: بیرۆ

**بیرۆڤە** (نا.)[باک] بڕ: بیرۆ

**بیرۆکە** (نا. ل)[بیر + ئۆکە] بنەما و بنەڕەتی بیر و مەسەلەیەک. ⁂ بیرۆکەی زۆربەی چیرۆکەکانم فۆلکلۆرن.

**بیرە** (نا.)[تور: bira لە هولەندیی] بڕ: ئاوجۆ

**بیرەبیرە** (ئان. ل)[بیر1 + ئە + بیر1 + ئە] حاڵی کەسێک کە هەردەم لە سەر بیر و بڕوایەکە، وازوازی.

**بیرەخەو** (نا. ل)[بیر1 + ئە + خەو] خەوێکی سووک کە مرۆڤ بە تەواوی ئاگای لە خۆی نابڕێ، بیروهۆش، بیرەهۆش. **دە ~ ڕاچوون:** خەوتنێکی سووک، بۆرژان، دەبیرەهۆشەوە چوون، دە بیروهۆش ڕاچوون، دە بیرەهۆش ڕاچوون.

**بیرەوەری** (نا. ل)[بیر1 + ئە + وەر + ئی] ١ـ ئەو یاد و بەسەرهاتانەی ژیان کە زەمانی بە سەر داهاتوە و لە بیر ماون. ⁂ جا خۆ من بە بیرەوەری خۆم لە دوام دەڕۆیشت سێسەت پیادە و سوارە/ ئەلعان مردن بۆ من گەلێک خۆشترە لەو ژیانە و لەو ڕەفتارە (سەعید و میرسێوەدین ل ٤). ٢ـ یاد و بیرێک کە کۆمەڵێک خەڵک لە کەسی مردووی دەکەن.

**بیرەهۆش** (نا. ل)[بیر1 + ئە + هۆش] بڕ: بیرەخەو. **دە ~ ڕاچوون:** بڕ: دەبیرەخەو ڕاچوون. **دە بیرەهۆشەوە چوون:** بڕ: دە بیرەخەو ڕاچوون.

**بیزا** (گیا.)[؟] ١ـ گیایەکی بۆنخۆشی خۆرسکی کوێستانییە، پتر لە موکریان ناوبانگی هەیە و بۆ ترشیات و بۆ نێو شیرێژ کەلکی لێوەردەگرن. ٢ـ (مجـ.) باڵای یار و گراوی.

**بیزەر** (گیا.)[بی1 + زەر][باک] بڕ: شۆڕەبی

**بیژ** (ئان.)[پەه: ڤێچ. باک: بیژی، پیچ،



پینج ـ ناو: بیــژوو، بیــژی ـ زا: بینج، پینج] بڕ: بیژوو

**تێبینی:** ئەم وشەیە بە تەنیا نەماوە و بە شـێـوەی تێکەڵاو کـە خـوارەوە نووسـراون دێ و دەگـەڵ ڤـێج لە زمـانی پەهلەویی دا بە مـانای تۆو، رەچەڵەک و رەگـەز هـەر یەک ریشـەیان هەیە بەو جیاوازییە کە بیژ یا بیژوو بە تۆو و رەگەزی خراپ و حەرام دەکوترێ.

**بیژک** (ئان. ل)[بیژ + ک][باک] بڕ: بیژۆک/٢.

**بیژۆک** (ئان. ل)[بیژ + ئۆک] ١ـ حەیوانێک کە زووتر لە کاتی ئاسایی خۆی بزێ. ٢ـ دانەوێڵەیەک کە درەنگ بکوڵێ، بیژک. ٣ـ قامکی زێدەی دەست، قامکی شەشەم.

**بیژوو** (ئان. ل)[بیژ + ئوو] ١ـ منداڵێک کە باوکی دیار نەبێ کێیە. ٢ـ (مجـ.) بێشەرم، بێحەیا، زۆڵ، زووڵ. & حەرامزادە، بیژ، بیژی.

**بیژی** (ئان. ل)[بیژ + ئی][باک ـ سۆر] بڕ: بیژوو

**بیس**[1] (ر.) لە چاوگـەی بیسـتن دەکـەوێ و بە ناوەوە دەلکێ و مـانای بیسەر دەدا، بیست1 :: گوێ بیس

**بیس**[2] (ژ.)[هەو ـ ئەر] بڕ: بیست2

**بیست**[1] (ر.) بڕ: بیس1. :: گوێ بیست.

**بیست**[2] (ژ.)[هیک: ڤیمسەتی ـ ئێک: ڤییسەتی ـ ئەو: ڤییسەئیتی ـ پار: ویست ـ خوت: بیستا ـ پەه: بیست، ڤیست. تات: ڤیست ـ فار: بیست. باک: بیست ـ ناو: بیست، بیس ـ باش: بیس ـ هەو: ویس، بیس ـ زا: ڤیست، ڤیشت] ١ـ ژمارەی ٢٠، ژمارەی دوای نۆزدە، دوو دە. ٢ـ نمرەی یەکەم و هەرەباش لە ئیمتەحان و تاقی کردنەوە دا.

**بیستان** (نا. ل)[بی3 + ستان][باک] بڕ: بێستان

**بیستراو** (نا. مفـ.)[لە: بیستن] مەسەلە و باسێک کە گەیشتبێتە گوێ، بیسراو. :: لە هیچ کوێ نەدیتراوە و نەبیستراوە.

**بیستن** (چا. م)[باک: بیستن، بهیستن ـ ناو: بیستن، بیسن] ١ـ هەست بە دەنگ کردن لە رێگەی گوێچکەوە، گوێ لێبوون، ژنەوتن، شنەفتن، ئەژنیەی، ژنەفتن. ٢ـ خەبەر دار بوون لە هەواڵ یا

مەسەلەیەک. :: بیستوومە کاکت ژنێ دێنێ.

**بیستنەوە** (چا. م)[لە: بیستن] ١ـ پێ گەیشتنەوەی قسە و باسێک بە یەکێک کە باسی کراوە، پێ گەیشتنەوە. :: نەبیسمەوە جارێکی دیکە شەڕ بکەی ٢ـ گوێ لێبوونەوە، لە سەر ڕا بیستن.

**بیست و چوار ساعەتە** (ئاک. ل) [بیست2 + و + چوار + ساعەت + ئە] ١ـ ماوەی یەک و شەو و یەک ڕۆژ پێکەوە کە بیست و چوار ساعەت دەکا، شەو و ڕۆژ. :: هەندێک دوکانی نێو شار بیست و چوار ساعەتە ئاوەڵەن. ٢ـ (مـجـ.) هەمیشە، دایم. :: بیست و چوار ساعەتە خەریکی دەرس خوێندنە.

**بیستووم** (ژ.)[بیست2 + ئووم] بڕ: بیستەم

**بیستوومی** (ئان.)[بیستووم + ئی] بڕ: بیستەمی

**بیستوومین** (ئان.)[بیستووم + ئین] بڕ: بیستەمین

**بیستەم** (ژ.)[بیست2 + ئەم] هەرچی کە لە پلە و ڕیزی بیست دابێ، بیستووم.

**بیستەمی** (ئان.)[بیستەم + ئی] ئەوەی کە لە پلە و ڕیزی بیست دابێ، بیستوومی.

**بیستەمین** (ئان.)[بیستەم + ئین] ئەوەی کە لە پلە و ڕیزی بیست دابێ، بیستوومین.

**بیسراو** (نا. مف.)[لە: بیسن] بڕ: بیستراوە

**بیسکویت** (نا.)[فەر: biscuit] جۆرێک نان شیرینی وشک و سووکە.

**بیسن** (چا. م)[ئەر] بڕ: بیستن

**بیسەر** (نا. فا)[لە: بیستن] کەسێک کە گوێی لە دەنگ یا قسەیەک ڕاگرتوە، گوێگر، گۆهدار، گوێدێر.

**بیش** (گیا.)[پەھ: بێش] گیایەکی خۆڕسکی چەند ساڵەیە، هەتا گەز و نیوێک بەرز دەبێتەوە، گەڵاکانی گڕنی گڕنین، گوڵەکانی شین و شێوەی گوڵە مەیموونە دەدەن، بنەکەی ڕەق و پتەوە، گیایەکی سەمییە و خواردنەکە مرۆڤ دەکووژێ، Aconitum napellus ناوی لاتینی ئەم گیایەیە.

**بیشەنگ** (گیا.)[بی1 + شەنگ][باک] بڕ: شۆڕەبی

**بیشی** (نا.)[باک] بڕ: بێشە

**بیڤل** (ئا.)[؟][باک: بیڤل، بێڤل] بڕ: کەپۆ

**بیق** (نا.)[قوچ] بڕ: نایە

**تێبینی:** بۆ ریشەی بیق بڕ: پیک1 و بۆق7

**بیک** (نا.)[باش] بڕ: پیک1

**بیکار** (نا.)[باک] ئامرازی دارتاشینی نەجار، رەندە. (هس: مەکارە)

**بیکۆڵ** (گیا.)[بی1 + کۆڵ][هەو] بڕ: بی1

**بیگودی** (نا.)[فەر: ؟] لوولەیەکی چووکی پلاستیکیی (کژانزا یا سیم) کە ژنان بۆ لوول دانی پرچیان کەلکی لێوەردەگرن.

**بیلاتەژبی** (شر.)[عەر: بلاتشبیە] وشەیەکی سەرزارە لە کاتی باس کردنی کردەوە و رەفتارێکی ناڕەوا. ‌‌:: بیلاتەژبی خەڵکی ئەوڕۆکە نازانن چاکە یانی چی.

**بیلامانێ** (شر.)[عەر: بلامعنا] وشەیەکی سەرزارە کە لە کاتی دەربڕینی قسەیەک کە هەندێک بۆنی بێ ئەدەبی لێبێ دەردەبڕدرێ. ‌‌:: کابرا هەر پێی عەیب نەبوو، بیلامانێ دەرپێکەی داکەند لە بەر چاوی ئەو خەڵکە هەڵمیزت.

**بیمار** (نا.)[پەه: ڤێمار، ڤیمار] ١ـ نەخۆش، ناساز، بێمار. ٢ـ (مجـ.) چاوی بە خومار ‌‌:: بە مەرگی من بە رەمزێکی بڵێ بەو چاوە حاڵیم کا / ئەتۆ نازدار و بیماری ئەمن بۆچ زار و بێحاڵم (وەفایی ل ٦١). دڵ بۆیە خۆشی دێ لە نەخۆشی پڕ بە دڵ/ بیمارە چاوی یار و خۆشی دێ لە دەرد و دا (مەحوی ل ٦).

**بیمارستان** (نا. ل)[بیمار + ستان] شوێنێک کە نەخۆش لێی دەکەوێ و دەرمان دەکرێ، نەخۆشخانە، خەستەخانە.

**بیمشک** (گیا.)[بی1 + مشک2] بڕ: بیرمشک

**بیمە** (نا.)[هند: بیما (زەمانەت)] پەیمان و بەڵێن نامەیەک دە نێوان کەسێک و یانەیەک کە کەسێک گیان، ماڵ و منداڵ و کەرەسەی خۆی بە دانی پارەیەکی مانگانە لە دەست قەزا و بەڵا، بەم یانەیە دەسپێرێ و هەر کات زەرەزێکی وێکەوت پارەی زەرەرەکە وەردەگرێتەوە، سیگۆرتە. ~ **بوون:** ئەندامی یانەی بیمە بوون. ~ **کردن:**

بەستنی پەیمان و قەرار دەگەڵ یانەی بیمە بۆ کارەسات و پێشهاتی چاوەڕوان نەکراو.

**بین** [1] (نا.)[پەھ: ڤێن. بەل: گیین. باک: بین، بێهن، بیهن، بهن. ناو: بین، بینگ] ١ـ هەناسە. ٢ـ گەروو، قورگ، ئەوک. **~ خواردنەوە:** هەناسە هەڵکێشان و دە سینگ دا ڕاگرتنی لە کاتی لێدانی ئامێری مۆسیقای وەک شمشاڵ و تووزەلە. **~ پێوە نان:** دم پێوە نان و یەک پشوو خواردنەوەی ئاوەکی. ⁂ بۆ کەسێکە مەی چزیلکی پێوە نێ / بۆچی ملهوڕ لێرە بینی پێوە نێ (ناڵەی جودایی ل ١٢). **~ ڕاگرتن:** هەناسە لە سینگ دا ڕاگرتن، پشوو نەدانە دەر. **~ کێشان:** هەناسە دە سینگ دا ڕاگرتن کاتی خۆم قووم کردن و چوونە بن ئاو. **~ گرتن:** دەست دە ئەوکی کەسێک نان، ئەوکی کەسێک گرتن. بینی کابرای گرتبوو و دەیەویست بیخنکێنێ.

**تێبینی:** ڤەئێنا لە ئەوێستا دا بە مانای کەپۆ هاتوە و کەپۆش ئەندامی هەناسە یا بین هەڵکێشانە هەروەکی هەناسە و nase لە ئاڵمانی و زمانەکانی دیکەی ئورووپایی بە هەندێک ئاڵوگۆڕییەوە کە بە مانای کەپۆیە. هەروەها ڤێن لە پەهلەویی دا بە مانای هەناسە و بین و ڤێنییک بە مانای کەپۆ هاتوون و لە فارسیش دا بینی مانای کەپۆی هەیە.

**بین** [2] (ر.)[پەھ: ڤێن] ١ـ ڕەگی بینین. ٢ـ بە وشەوە دەلکێ و ناوی فاغلی ساز دەکا. ⁂ دووربین، تیژبین، وردبین.

**بین** [3] (نا.)[باک] بڕ: بۆن

**بینا** [1] (ئان. فا)[لە: بینین][پەھ: ڤێناک] ١ـ کەسێک کە ببینێ و چاوەکانی ساغ بن. // کوێر. ٢ـ کەسێک کە چی لە بەر چاو ون نابێ و هەموو شت دەبینێ، وردبین، تیژبین. ٣ـ ئاگادار، وریا. ٤ـ دە گەڵ (هەر، هە، ها) دێ و مانای دیتت دەدا، لەپڕ، لەنەکاو. ⁂ هابینا سبەی مردین. هەربینا لە سەفەر هاتەوە.

**بینا** [2] (نا. ل)[بن + یا] بڕ: بنیات. **بینا نان:** بڕ: بنیات نان.

**بیناو** (نا.)[پەھ: ڤێناپ] دیمەنی خەیاڵی، دیمەنێکی خەیاڵی کە لە بێداری و بەئاگایی دا دەبیندرێ. (عالم مکاشفه)

**تێبینی:** ئەم وشەیە تەنیا فەرهەنگی مەردووخ بەخۆیەوە گرتوە (ب ١ ل ٢٣٧).



**بیناهی** (حم.)[باک] بڕ: بینایی ‖ **بیناهی چاو:** بڕ: بینایی چاوان. ⁖ قەسەم بە وەی کەم ئەگەر بیناهی چاوە / هەتا زیندووم و رووح لە سەر یەخەی کراسم ماوە / ئەمن دەست هەڵناگرم لەو مژانگەی ئەگەر دەڵێی تیرە و لە کەوانت ناوە (شۆڕ مەحموود ل ٧٠)

**بینایی** (حم.)[پەه: ڤێناکییە][بینا + ئی] ١ـ یەکێک لە هەستەکانی مرۆڤ کە ناوندەکەی چاوە و پێی دەبینێ، هێزی چاو، سۆما، سۆمایی، سۆ، بیناهی. ٢ـ (نا.) چاو، دیدە. ‖ **بینایی چاو:** بڕ: بینایی چاوان. * **بینایی چاو رژان:** کوێر بوون، سۆمایی چاو نەمان. **بینایی چاوان:** ١ـ سۆمای چاو، نووری دیدە. ٢ـ (کن.) خودا ⁖ بە قوربانت دەبم بینایی چاوان/ قوبووڵی بۆ دەکەی تۆ سووچ و تاوان (ناڵەی جودایی ل ٨٦). ٣ـ (کن.) گراوی زۆر خۆشەویست. ⁖ ئامان، هەی ئازیز بینایی چاوان/ گلەم هەن جە تۆ خەیلێ فراوان (مەولەوی ل ١٦). & بیناهی چاو، بینایی چاو.

**بینج** (ئان.)[زا] بڕ: بیژوو

**بینگ** (نا.)[ئەر] بڕ: بین1

**بینە** (نا. ل)[بین1 + ئە] هەناسە. ~ **کێشان:** ١ـ لە بن ئاو پشوو راگرتن و مەلە کردن. ٢ـ (کن.) خۆ دزینەوە، خۆ ون کردن. & بینە لێدان. ~ **لێدان:** بڕ: بینە کێشان.

**بینەر** (نا. فا)[لە: بینین] کەسێک کە شاهیدی دیتنی شتێکە، تەماشاچی.

**بینەقاقا** (ئا.)[بینە + قاقا] لوولەی نێو مل کە هەوای پێدا دەچێتە نێو سییەکان، قورگ، گەروو، بینەقاقە. ⁖ دەستی دە بینەقاقای نابوو بەتەمابوو بیخنکێنێ.

**بینەقاقە** (ئا.)[بینە + قاقە] بڕ: بینەقاقا

**بینەکێش** (ئان. فا)[بینە + کێش][لە: بینە کێشان] کەسێک کە لە بن ئاو بینی خۆی باش رادەگرێ و مەودایەکی زۆر دەبڕێ. ⁖ کەریم بینەکێشێکی چاکە ئەم سەر ئەو سەری چۆم دەڕوا.

**بینین** (چا. م)[هیک: ڤێنەتی ـ ئەو: ڤەئێنە ـ هەخ: ڤەئینە. ناو: بینین ـ هەو: وینای ـ زا: ڤینایش] ١ـ هاتنە بەر چاو، دیتن. ٢ـ سەیر کردن، چاو لێکردن. ٣ـ چاو پێکەوتن. ⁖ لە شوێنێک عەلیم بینی و گەلێکمان دەردی دڵ پێکەوە کرد. ٤ـ سەر دان.

**بینینەوە** (چا. م)[لە: بینین] ١ـ لە سەرڕا دیتن، دیتنەوە. ٢ـ دۆزینەوەی شت یا کەسی ونبوو، دیتنەوە.

**بیور** (نا.) بڕ: تەور

**بیۆشیمی** (نا.)[فەر: biochimie] لێکۆڵینەوە و لێکدانەوەی ئەندامەکانی گیانلەبەران لە باری شیمییەوە.

**بیۆک** (گیا.)[باک] بڕ: بەی1

**بیۆگراف** (نا.)[فەر: biographe] کەسێک کە چلۆنایەتی ژیان و بە سەرهاتی کەسی دیکە دەنووسێ، بەسەرهاتنووس.

**بیۆگرافی** (نا.)[فەر: biographie] بەسەرهاتنووسیی، کاری بیۆگراف.

**بیۆلۆژی** (نا.)[فەر: biologie] زانست و عیلمێک کە لە گیانداران دەکۆڵێتەوە.

**بیهر** (نا.)[باک] بڕ: بیر1

**بیهن** 1 (نا.)[باک] بڕ: بین1

**بیهن** 2 (نا.)[باک] بڕ: بۆن

**بی هەنجیر** (نا. ل)[بی1 + هەنجیر] بڕ: گەرچەک

**بیهنشک** (نا.)[باک] بڕ: باوێشک

**بێ** 1 (نا.) ناوی دووهەم پیتی ئەلفوبێی کوردیی.

**بێ** 2 (ئەمر)[ئەر] ئەمرە لە هاتن، وەرە، بەو. :: بێ بۆ ئێرە!

**تێبینی:** بێ ( ب + ئێ) لە چاوگی ئەی ay ئەوێستایی و هەخامەنشی بە مانای ڕۆیشتن کەوتوە و لە گەردانی کاریش دا خۆ دەنوێنێ وەک بێم (ب + ئێ + م)، دەبێ (دە + بێ)

**بێ** 3 (نا.) بڕ: بەی

**بێ** 4 (پێشـ.)[پەه: بێ، ئەبێ، ئەپێ، ئەڤی، ئەڤێ. باک: بێ ـ ناو: بێ، بەبێ ـ هەو: بێ ـ زا: بێ، بیە] ١ـ نەبوون و بێخاوەنی دەگەیەنێ و لە پێش ناو دێ و ئاوەڵناو بە مانای نەبوون ساز دەکا. ٢ـ بەر لە هەندێک ناو دێ و ئاوەڵکردار ساز دەکا. :: بێشک، بێ یەک و دوو. ٣ـ پێش چاوگ دێ و مانای نەبوون و نا دەدا بە کار. :: بێبڕانەوە، بێ خواردن و خواردنەوە. ٤ـ ڕەدی کار و کردەوەیەک دەکا. :: پێکەوە دادەنیشین بەڵام خەو بێ خەو هیچۆش ناخۆین نان بێ نان.

**بێ ئابڕوو** (ئان. ل)[بێ4 + ئابڕوو] کەسێک کە ریسوا کراوە، ئابڕوو براو، بێشەرم، بێ ئاوڕوو. ~ **بوون:** ریسوا



بوون، ئابڕوو نەمان. ~ **کردن:** ریسوا کردن، ئابڕووی کەسێک نەهێشتن.

**بێ ئابڕوویی** (حم.)[بێ ئابڕوو + ئی] کار و ئاکاری بێ ئابڕوو، بێشەرمی.

**بێ ئارام** (ئان. ل)[بێ4 + ئارام] کەسێک کە حەجمینی نیە، نا ئارام، دانەسەکناو، بە جووڵە، بێقەرار.

**بێ ئاقڵ** (ئان. ل)[بێ4 + ئاقڵ] بێمێشک، گەوج، گێژ، شێت، نەفام، بێ ئاوەز. ~ **بوون:** ١ـ گەوج بوون، شێت بوون، نەفام بوون. ٢ـ تێنەگەیشتن، حاڵی نەبوون. **خۆ ~ کردن:** کاری گەوجانە کردن، خۆ گەوج کردن.

**بێ ئاقڵانە** (ئاک. ل)[بێ ئاقڵ + ئانە] کار و کردەوەی لە بەر بێ ئاقڵی و نەفامی، نەفامانە، گەوجانە. :: ئەوەی تۆ کردت کارێکی زۆر بێ ئاقڵانە و نەفامانە بوو.

**بێ ئاقڵێتی** (حم.)[بێ ئاقڵ + ئێتی] کاری نائاسایی کردن، کردەوەیەک کە لە ئاقڵ نەوەشێتەوە، بێ ئاقڵی. ~ **کردن:** کاری نائاقڵانە کردن، کاری لە ئاقڵ بە دوور ئەنجام دان، بێ ئاقڵیی کردن.

**بێ ئاقڵیی** (حم.)[بێ ئاقڵ + ئیی] بڕ: بێ ئاقڵێتی. ~ **کردن:** بڕ: بێ ئاقڵێتی کردن.

**بێ ئاکار** (ئان. ل)[بێ4 + ئاکار] کەسێک کە ئاکار و کردەوە و ئەخلاقی باش نەبێ، ئاکار خراپ.

**بێ ئاگا** (ئان. ل)[بێ4 + ئاگا] بێهەواڵ، بێخەبەر، نائاگا. ~ **بوون:** خەبەردار نەبوون، ئاگادار نەبوون. ~ **کردن:** خەبەر نەناردن و خەبەردار نەکردن.

**بێ ئاگایی** (حم.)[بێ ئاگا + یی] بێخەبەریی، بێهەواڵیی، نائاگایی. **دە ~ دا بوون:** دە بێخەبەریی دابوون، نائاگا بوون، بێ ئاگا بوون.

**بێ ئاوڕوو** (ئان. ل)[بێ4 + ئاوڕوو] [ئەر] بڕ: بێ ئابڕوو

**بێ ئاوەز** (ئان. ل)[بێ4 + ئاوەز] بڕ: بێ ئاقڵ.

**بێباب** (ئان. ل)[بێ4 + باب1] ١ـ کەسێک کە باوکی مردبێ. ٢ـ سەغیر، هەتیو. ٣ـ زۆڵ، بیژوو. & بێباوک

**بێبارە** (ئان. ل)[بێ4 + بارە3] بێبەش، بێبەری.

**بێباک** (ئان. ل)[بێ4 + باک] حاڵی



کـــــەسـی نـەترس، بـوێر. ~ بـوون: نەترسان، وێران.

**بێـبـاکـانە** (ئاک. ل)[بێـبـاک + ئانە] ئەنجـام دانی کـارێک لەبەر نەترسی، بە بێباکی، دلێرانە، بوێرانە.

**بێـبـاکـیی** (حم.)[بێـبـاک + ئیی] نەترسیی، بوێریی.

**بێـبـاوک** (ئان. ل)[بێ4 + باوک] بڕ: بێباب

**بێبژار** (ئان. ل)[بێ4 + بژار] ١ـ حاڵی زەوی و بێستانێک کە گژ و گیای زێدەی تێـدا نەبێ. زەوییـەک کـە پێـویسـتی بە گیابژار نەبێ. ٢ـ بڕ: بێژمار

**بێبن** (ئان. ل)[بێ4 + بن] ١ـ حـاڵی هەرشتێکی قوڵ کە دوایی و ژێری نەبێ. ⁙ دەریـای بـێـبن، چـاڵاوی بـێـبن. ٢ـ کچێکی بەر لە زەماوەند پەردەی کچێنی نەمـابێ، بن پڕاو. ~ بوون: کـیژێک کـە پەردە و کـچێنـی هەڵگیراوە. ~ کردن: بن هەڵگرتنی کـیـژێک لە لایـەن پیـاو بەر لەوەی زەماوەندی کردبێ.

**بێبۆ** (ئان. ل)[بێ4 + بۆ] بڕ: بێبۆن

**بێـبـۆن** (ئان. ل)[بێ4 + بۆن] هەر شـتـێکی بۆی لێ نـەبێـتـەوە، بێـبـۆ. // بۆندار.

**بێـبـەخت** (ئان. ل)[بێ4 + بەخت] کەسێک بەخت هاوڕێی نەبێ، چارەڕەش، کڵۆڵ.

**بێبەختیی** (حم.)[بێبەخت + ئیی] چارەڕەشیی، کڵۆڵیی

**بێبەر** (ئان. ل)[بێ4 + بەر1] ١ـ دار و درەختێک کە بەر نەگرن. ٢ـ ماینێک کە نەزێ، ماینی نەزۆک.

**بێـبـەرگ** (ئان. ل)[بێ4 + بەرگ] ١ـ ڕووت، بەبێ جل. ٢ ـ هـەژار، فـەقـیـر، نەدار.

**بێبەرگیی** (حم.)[بێبەرگ + ئیی] ١ـ ڕووتیی، بێجلیی. ٢ـ هـەژاریی، نەداریی. ⁙ هەرچەندە کە ڕووتم، بە خـودا مـائیلی ڕووتم/ بێـبـەرگـیـیـە عـیللەت کـە هەتیـو مەیلی هەتاوە (نالی ل ٥٣٤).

**بێبەرەکەت** (ئان. ل)[بێ4 + بەر] ١ـ بێـپـیت و بـەرەکـەت، بێـرزق و ڕۆزی. ٢ـ بێقازانج، بێسوود.

**بێـــبـــەری** (ئان. ل)[بێ4 + بەری (بەهر)] کەسێک کە بەشی پێ نەبڕدرێ، بەش پێنەبڕاو، بێبەش، بێبارە، بێوەری. ~ بوون: ١ـ بێبەش بوون. ⁙ قامـەتی

تۆ کە گوڵ و بەی بەری بێ، بێبەری بێ /
بۆچ دەڵێن ئیــدی سنەوبەر بەری بێ،
بێبەرییە (وەفایی ل ١٦٢). ٢ـ نەبوون.
:: لە پیاوەتی بێبەرییە. **~ کردن:**
بێبەش کردن، بەش برین. :: باوکم
منداڵەکانی لە میرات بێبەری کرد.

**بێبەزە** (ئان. ل)[بێ4 + بەزە] کەسێک
کە بەزە و رەحمی نەبێ، بێرەحم، دڵڕەق.

**بێبەزەیی** (حم.)[بێبەزە + یی]
کردەوەی کەسی بێبەزە، بێڕەحمیی.

**بێبەش** (ئان. ل)[بێ4 + بەش] بڕ:
بێبەریی. **~ بوون:** بڕ: بێبەریی بوون.
**~ کردن:** بڕ: بێبەریی کردن.

**بێبەینەت** (ئان. ل)[بێ4 + بەینەت]
بکەسێک کە شەرت و پەیمانی نەباتە
سەر، بێوەفا.

**بێبیر** (ئان. ل)[بێ4 + بیر] کەسێک
کە هۆش و بیری لە سەرخۆ نیە، بێفیکر،
بێهۆش.

**بێپایان** (ئان. ل)[بێ4 + پایان]
هەرچی کە پایان و نەهایەتی نەبێ،
بێنەهایەت، بێ کۆتایی و دوایی. ::
ئاخر سەفەرن، را خەیلێ دوورەن/
مەنزڵ بێپایان تۆشە زەروورەن (مەولەوی
ل ٦). **~ بوون:** نەهایەت و کۆتایی
نەبوون.

**بێپاوپەل** (ئان. ل)[بێ4 + پا + و +
پەل] بڕ: بێدەست و پێ :: نە پێیەک
هەڵگرێ شوێنی، نە دەستێ گەییە
داوێنی / خودا دەرحەق بە ئەحواڵی منی
بێ پاوپەل، چارێ (مەحوی ل ٣٠٠).

**بێپەردە** (ئاک. ل)[بێ4 + پەردە]
قسەی و کردەوە و ئاکارێک بە راشکاوی
و بە بێنهێنی و شاردنەوەیەک. بێپەردە
قسەکانت بکە و لە کەس مەترسێ!

**بێپەنا** (ئان. ل)[بێ4 + پەنا] ١ـ
کەسێک کە شوێنێکی بۆ ژیان نەبێ، بێ
ئەنوا. ٢ـ کەسێک کە خەڵک وەخۆی
ناگرن، بێکەس.

**بێپەنایی** (حم.)[بێپەنا + یی] ١ـ بێ
ئەنوایی. ٢ـ بێکەسیی.

**بێپەی** (ئان. ل)[بێ4 + پەی] ئاوی
زۆر قووڵ و بێبن.

**بێتاقەت** (ئان. ل)[بێ4 + تاقەت] ١ـ
بێهێز، بێقەوەت. ٢ـ بێواز، ماندوو،
بێحەوسەلە، وەڕەز. **~ بوون:** ١ـ بێهێز
بوون، قەوە نەبوون. ٢ـ بێواز بوون،
حەوسەلە نەبوون. ٣ـ حەجمین لێبڕان،
بێ ئۆقرە بوون. **~ کردن:** ١ـ لە هێز و
قەوە خستن. ٢ـ بێواز کردن، وەڕەز

کردن، حەوسەلەی کەسێک بردن.

**بێتاقەتیی** (حم.)[بێتاقەت + ئی] ١- بێهێیزی. ٢- بێوازیی، بێحەوسەلەیی، وەڕەزیی. **~ کـردن:** ئارەزوو و وەڕەزیی کردن بۆ کەسێک، شوێنێک، یا شتێک.

**بێتام** (ئان. ل)[بێ4 + تام] ١- چێشتی کەم ڕۆن و بێ ئاڵەت کە چێژی خۆش نەبێ.// بەتام. ٢- قسەی پڕ و پووچ و قۆڕ. **~ بوون:** ١- بێ تام و چێژ بوونی خۆراک، ناخۆش بوونی چێشت. ٢- قۆڕ و پووچ بوونی قسە و کردار. **خۆ ~ کردن:** خۆ ناحەز کردن، خۆ لە بەرچاو خستن.

**بێتاوان** (ئان. ل)[بێ4 + تاوان] کەسی بێسووچ و بێگوناه، بێگوناه.// تاوانبار. **~ بوون:** بێگوناه بوون، بێسووچ بوون.

**بێتاوانیی** (حم.)[بێتاوان + ئی] تاوانبار نەبوون، بێسووچیی، بێگوناهیی.

**بێتر** (ئان.)[باک] بڕ: پتر

**بێتوان** (ئان. ل)[بێ4 + توان] بێهێز، بێتاقەت، ناتوان.

**بێتۆن** (نا.)[فەر: beton] تێکەڵاوێکە لە سمیت و ڕەڵم و خیز کە بۆ پتەو بوونی بناغەی ماڵ و پرد و شوێنی دیکە بە کاری دەبەن.

**بێتۆن ئارمە** (نا.)[فەر: beton arme] بێتۆنێکە کە میلەی ئاسنیان دە نێو ناوە هەتا پتەوتر و قایمتر بێ.

**بێتووک** (ئان. ل)[بێ4 + تووک] فەقیر، هەژار، نەدار.

**بێتووکیی** (حم.)[بێتووک + ئی] نەداریی، هەژاریی. ⁘ بێتووکی جیفەخواری و گورگین و بێوجوود/ لەم ئاو و خاکە زاهیر و باتین موکەدەرە (نالی ل ٤٢٠).

**بێتەربیەت** (ئان. ل)[بێ4 + تەربیەت] کەسێک کە تەربیەتێکی باشی نەبووبێ و خراپ بار هاتبێ، نەعاملاو، بێ ئەدەب. **~ بوون:** خراپ بار هاتن، نەعاملان. **~ کردن:** خراپ بارهێنانی منداڵ، خراپ عاملاندن.

**بێتەربیەتیی** (حم.)[بێتەربیەت + ئی] کار و ئاکاری کەسی بێتەربیەت، نەعاملاویی. **~ کردن:** ئەنجام دانی کار و کردەوەیەک کە لە تەربیەت بە دووربێ.

**بێتەرەف** (ئان. ل)[بێ4 + تەرەف]
بڕ: بێلایەن

**بێتەرەفیی** (حم.)[بێتەرەف + ئیی]
بڕ: بێلایەنیی

**بێتەکلیف** (ئان. ل)[بێ4 + تەکلیف]
حاڵی کەسێک کە داهاتوو و چارەنووسی دیاریی نەکراوە. ~ **بوون:** عەلاف بوون، چارەنووس و داهاتووی کار و مەسەلەیەک نەزانین.

**بێتەکلیفیی** (حم.)[بێتەکلیف + ئیی]
بێتەکلیف بوون.

**بێتەل** (نا. ل)[بێ4 + تەل] بڕ: بێسیم

**بێتەماح** (ئان. ل)[بێ4 + تەماح]
کەسێک کە تەماحی نەبێ. ~ **بوون:** تەماح نەبوون، قانع بوون.

**بێتەماحیی** (حم.)[بێتەماح + ئیی]
کار و کرداری کەسی بێتەماح.

**بێجا** (ئان. ل)[بێ4 + جا] بڕ: بێجێ

**بێجگە** (ئاک.)[پەھ: بێهەچ] جیا لە کەسێک یا شتێک، جگە، بەدەر. :: بێجگە لە من و تۆ، کێی دیکەش دێ؟

**بێجەرگ** (ئان. ل)[بێ4 + جەرگ]
کەسی ترسەنۆک و بێغیرەت.// بەجەرگ. :: ساحێب غیرەت بە پەلەن و دەرۆن، بێجەرگان چاریان بێ چارە/ ئی وا هەیە خۆی دەدزێتەوە، خۆی دەگرێ لە پەسیو و لە کەنارە (لاس و خەزاڵ ل ١٥١).

**بێجەوهەر** (ئان. ل)[بێ4 + جەوهەر]
کەسێک کە هونەر و جەوهەری نەبێ، بێهونەر.

**بێجێ** (ئان. ل)[بێ4 + جێ] قسە یا کاری ناڕەوا کە جێ نەگرێ، بێجا.// بەجێ. :: دەربڕینی ئەو قسانە لە سەرڕاوە زۆر بێجێیە.

**بێچارە** (ئان. ل)[بێ4 + چارە] ١ـ حاڵی کەسی چارە لێبڕاو و بێعیلاج، چارەڕەش، بەدبەخت. ٢ـ بێشانس و بەخت، هەژار. ٣ـ مرۆی بەستەزمان و فەقیرۆکە. ~ **بوون:** ١ـ ناعیلاج بوون، چارە لێبڕان، بەدبەخت بوون. ٢ـ لێقەومان و هەژار بوون. ~ **کردن:** بەدبەخت کردن، چارەڕەش کردن.

**بێچارەیی** (حم.)[بێچارە + یی] ١ـ بەدبەختیی، چارەڕەشیی. ٢ـ هەژاریی، نەداریی.

**بێچاووڕوو** (ئان. ل)[بێ4 + چاو + و + ڕوو] کەسێک کە چاکەی لە چاو دا



نەمێنێ، سپڵە، پێ نەزان، بێچاوەڕوو. ~ **بوون:** چاکە لە چاو دا نەبوون، سپڵە بوون، بێچاوەڕوو بوون. ~ **کردن:** سپڵە بار هێنانی منداڵ یا کەسێکی دیکە، بێچاوەڕوو کردن. :: ئەو منداڵەشت وەک خۆت بێچاووڕوو کردوە!

**بێچاوەڕوو** (ئان. ل)[بێ4 + چاو + ئە + روو] بڕ: بێچاووڕوو. ~ **بوون:** بڕ: بێچاووڕوو بوون. ~ **کردن:** بڕ: بێچاووڕوو کردن.

**بێچکە** (نا. ل)[بێچ؟ + کە][زا] قامک، ئەنگوست، بێچی2.

**بێچوو** (نا. ل)[بێچ (بەچ) + ئوو] منداڵی گیانلەبەر بە گشتی کە هەندێکیان ناوی تایبەتیان هەیە و ئەگەر ناویان نەبێ هەندێک جار دەگەڵ ناوی گیاندارەکە دێ، & وەچە، بەچە، بەچگە. :: بێچوو مراوی، بێچوو چۆلەکە، بێچوو ورچ.

**بێچوولە** (نا. ل)[بێچوو + لە] منداڵی چووکی گیاندار، ساوای گیاندار، بێچوو

**بێچی**[1] (نا. ل)[بێچ (بەچ) + ئی][باک] ١ـ بێچووی ئاژەڵ، بەرخ و کاریلە. ٢ـ ئاولەمە.

**بێچی**[2] (ئا.)[بێچ؟ + ئی][باک] ١ـ ئەنگوست، قامک، بێچکە، بیچک. ٢ـ قامکی پێ.

**بێچیڤان** (نا. ل)[بێچی1 + ڤان] بڕ: بەرخەلەوان

**بێحاڵ** (ئان. ل)[بێ4 + حاڵ] ١ـ کەسێک کە حاڵی باش نەبێ، نیوەنەخۆش، بێتاقەت. ٢ـ فەقیر، هەژار، بێحاڵ و ماڵ. ~ **بوون:** حاڵ باش نەبوون، بێتاقەت بوون. ~ **کردن:** بێتاقەت و بێحەوسەلە کردن.

**بێحورمەت** (ئان. ل)[بێ4 + حورمەت] کەسێک کە ڕێز و حورمەتی خەڵک نەگرێ. ~ **بوون:** ڕێز و حورمەت نەگرتن.

**بێحورمەتیی** (حم.)[بێحورمەت + ئیی] سووکایەتی، بێڕێزیی. :: ئەوە زۆر بێحورمەتییە کە لەبەر میوانی هەڵنەستی. ~ **پێکران:** سووکایەتی لە لایەن کەسێک یا کەسانێکەوە پێکران. ~ **پێکردن:** سووکایەتی بە کەس یا کەسانێک کردن، ڕێز نەگرتن. ~ **کردن:** ڕێز دانەنان، حورمەت نەگرتن.

**بێحەد** (ئاک. ل)[بێ4 + حەد] لە رادە بەرد، گەلێک زۆر، بێ ئەندازە، بێشێو. :: شێرکۆ بێحەد کوڕی چاکە.

**بێحەوسەلە** (ئان. ل)[بێ4 + حەوسەلە] بێواز، وەڕەز، بێتاقەت. ~ **بوون:** بێواز بوون، حەوسەلە بوون، بێتاقەت بوون. ~ **کردن:** بێتاقەت کردن و بێواز کردنی کەسێک.

**بێحەوسەلەیی** (حم.)[بێحەوسەلە + یی] بێوازیی، بێتاقەتیی.

**بێحەیا** (ئان. ل)[بێ4 + حەیا] ١ـ رووهەڵماڵاو، بێشەرم. ٢ـ بەدفەڕ، شلووق. ~ **بوون:** ١ـ بێشەرم و رووهەڵماڵاو بوون. ٢ـ بەدفەڕ بوون، شلووق بوون. ~ **کردن:** بێشەرم بارهێنانی منداڵ و کەسێک.

**بێحەیایەتی** (حم.)[بێحەیا + ئایەتی] ١ـ بێشەرمی. ٢ـ بەدفەڕی، شلووقی، بێحەیایی. ~ **کردن:** ١ـ بێشەرمی کردن. ٢ـ بەدفەڕی کردن، شلووقی کردن. & بێحەیایی کردن.

**بێحەیایی** (حم.)[بێحەیا + ئی] بڕ: بێحەیایەتی. ~ **کردن:** بڕ: بێحەیایەتی کردن.

**بێحیساب** (ئان. ل)[بێ4 + حیساب] هیچ لە هیچ، پاک. :: قەرزەکەم دایەوە ئێستا من و تۆ بێحیساب. ~ **بوون:** پاک لە پاک بوون، پاک بوونەوەی حیساب دەگەڵ کەسێک، حیساب پاک بوون.

**بێخ** (نا.)[پەش: بێخ ـ فار: بیخ. ناو: بێخ ـ هەو: بێخ] ١ـ بن، ژێر. ٢ـ بنەڕەت، ریشە، ئەسڵ. ٣ـ دوایی، ئاکام.

**بێخاوەن** (ئان. ل)[بێ4 + خاوەن] حاڵی هەر شتێک کە هی کەس نەبێ، هەرچی کە خاوەنی نەبێ، بێخێو، بێخودان، بێساحێب. ~ **بوون:** هەرچی و هەرشتێک کە خاوەنی نەبێ. **خۆ لێ ~ کردن:** وەخۆ نەگرتن و حاشا لە کەسێک یا شتێک کردن و خۆ بە خاوەنی دانەنان، خۆ لێ بێساحێب کردن. :: کابرا وای خۆی لە منداڵانە بێخاوەن کردوە هەر دەڵێ بابی وانیش نیە.

**بێخود** (ئان. ل)[بێ4 + خود] ١ـ بێسوود، بێکەلک، بێهوودە، بێخۆ. ٢ـ لەخۆوە، بە بێویست.

**بێخودا** (ئان. ل)[بێ4 + خودا] ١ـ کەسێک کە خودای نەبێ، بێدین، بێ ئیمان، خودانەناس. ٢ـ زاڵم، زۆردار، دڵڕەق، بێبەزە.

**بێخودان** (ئان. ل)[بێ4 + خودان] بێخێو، بێخاوەن. :: ئێستا هەزار و

چوارســـەد مـــاڵی خـــۆم و مـــامم ســەرەوێرانە/ خـانزادەخـانی حـەریرێ بێساحێبە و بێخودانە (مان ل ٨٦).

**بێخـوست** (ئان. ل)[بێ4 + خـوست] بێدەنگ و جووڵە، بێـهەست، بێـهەست و خوست.

**بێخۆ** (ئان. ل)[بێ4 + خۆ] بێسـوود، بێخود، بێهوودە.

**بێخەبەر** (ئان. ل)[بێ4 + خەبەر] ١ـ بێ ئاگا، نائاگا. ٢ـ لەپڕ، لەنەکاو.

**بێخەبەری** (حم.)[بێخـەبەر + ئیی] خەبەردار نەبوون، بێ ئاگایی.

**بێـــخـــەم** (ئان. ل)[بێ4 + خـەم] ١ـ کـەسـێک کـە غـەم و پەژارەی نـەبێ. ٢ـ کەسێک کە گوێ نەداتە هیچ، بێخـەیاڵ. & بێـغـەم. **~ بوون:** ١ـ پەژارە و خـەم نـەبوون. ٢ـ لـە خـــەیاڵ و خـــەم بـە دوور بـوون، بێـــخـــەیاڵ بـوون. **~ کـــردن:** کەسێک لە خەم و پەژارە خلاس کردن.

**بێخەمیی** (حم.)[بێخەم + ئیی] کار و کردەوەی کەسی بێخەم، بێخەیاڵیی.

**بێـخـەوش** (ئان. ل)[بێ4 + خـەوش] بێـعـەیب، بێکەمـوکووڕیی، پاک و بێگەر، بێغەوش.

**بێخەوشیی** (حم.)[بێخـەوش + ئیی] بێگـەردیی، پاکـــیی، خـــاوێنیی، بێکەمایەسیی، بێغەوشیی.

**بێـــخـــەیاڵ** (ئان. ل)[بێ4 + خـەیاڵ] کەسێک کە گوێ نەداتە هیچ و هیچی لا گـــرینگ نـەبێ، بێـــخـــەم. **~ بوون:** گرینگایەتی نەدان بە هیـچ، گـوێ نەدانە هیچ.

**بێخەیاڵیی** (حم.)[بێخـەیاڵ + ئیی] چلۆنایەتـی و کـردەوەی کـەسی بێخـەیاڵ، بێـغـەمـیی. **خـۆلـە ~ دان:** غـەم نە خواردن و بە تەواوەتی بێخەیاڵ بوون.

**بێخێر** (ئان. ل)[بێ4 + خێر] کەسێک کـە خـێـر و قـازانج و چاکـەی بـۆ کـەس نەبێ.

**بێخێو** (ئان. ل)[بێ4 + خێو] کەس یا گیانداری بێخاوەن.

**بێــــداد** (ئان. ل)[بێ + داد] ١ـ زوڵم، زۆریی. ٢ـ هـاوار، سـکاڵا، شـکایـەت. ∷ یاگـێـوتەر نیـیـەن داد وێم کـەروون/ جـە دەس تـۆ بێـــــــداد وە لای کێ بـەروون (مـــەولـەوی ل ٣٣). ٣ ـ زیاد لـە ئەندازە، زۆرزۆر. ∷ ئەوە پارەیەکی بێـــداد زۆرە. **~ کـــردن:** ١ـ زوڵم کـــردن. ٢ـ هـاوار کردن.

**بێدار** (ئان.)[هەخ: ویغراد] ١ـ بەئاگا، وەخەبەر، نەخەوتوو. ٢ـ ئاگادار، وریا، تێگەیشتوو. **~ بوون:** وەخەبەر هاتن، وە ئاگا هاتن، بە ئاگا بوون. **~ کردن:** وەخەبەر هێنان، لە خەو هەستاندن.

**بێداریی** (حم.)[بێدار + ئی] ١ـ بەخەبەریی. ٢ـ وریایی، ئاگاداریی.

**بێددان** (ئان. ل)[بێ4 + ددان] ١ـ کەسێک کە ددانی دە زاری دا نەبێ یا نەمابێ. ٢ـ کەسی کەم ددان بۆ تەوس و گاڵتە.

**بێدەر** [1] (ئان. ل)[بێ4 + دەر] بێپەنا، بێکەس.

**بێدەر** [2] (نا.)[عەر: بیدر] خرمان، جێخوون، جۆخین، بێندەر.

**بێدەرد** (ئان. ل)[بێ4 + دەرد] ١ـ کەسێک کە ئێش و دەردی نەبێ. ٢ـ کەسێک کە ناخۆشی و مەینەت و بەدبەختی نەبێ، بێوەی.

**بێدەرەتان** (ئان. ل)[بێ4 + دەرەتان] کەسێک کە ڕێگای هیوا و نەجاتی لێبڕاوە، چارە لێبڕاو.

**بێدەست** (ئان. ل)[بێ4 + دەست] ١ـ کەسێک کە دەستی بڕابێ. ٢ـ بێدەستەڵات، داماو، ناتوان، بێچارە.

**بێدەست و پێ** (ئان. ل)[بێ4 + دەست + و + پێ] ١ـ کەسێک کە دەست و پێی نەبێ. ٢ـ (مجـ.) کەسێک کە هیچ کارێکی لە دەست نەیە، خوێڕی. & بێ پاوپەل. **~ بوون:** هیچ کارێک لە دەست نەهاتن، هیچ پێ ئەنجام نەدران، خوێڕی بوون، بێ پاوپەل بوون.

**بێدەستەڵات** (ئان. ل)[بێ4 + دەستەڵات] ١ـ کەسێک کە لە ئاست کار و مەسەلە یا کەسێک هێز و توانایی مادی و مەعنەوی نەبێ، بێدەست. :: لە ئاست ژنەکەی بێدەستەڵاتە. ٢ـ هەژار، فەقیر، دەستکورت. **~ بوون**: ١ـ خاوەن دەستەڵات و هێز نەبوون. ٢ـ هەژار و دەستکورت بوون. **~ کردن:** لە دەستەڵات خستن.

**بێدەستەڵاتیی** (حم.)[بێدەستەڵات + ئیی] چلۆنایەتی بێدەستەڵات، بێدەستەڵات بوون، توانایی نەبوون، بێهێزیی، بێدەستیی.

**بێدەستیی** (حم.)[بێدەست + ئیی] بڕ: بێدەستەڵاتی. :: سەراپامی بەر ئەشکەنجەی عوقووبەت گرتوە دەوران/ لەبەر بێدەستییە واتێدەگەن خەڵقی کە

بێچارەم (مەحوی ل ٢٢٩).

**بێدەمار** (ئان. ل)[بێ4 + دەمار] ١ـ خۆ بە زل نەزان، بێدەعێ. ٢ـ بێغیرەت، بێرەگ

**بێدەنگ** (ئان. ل)[بێ4 + دەنگ] ١ـ کەسێک کە زۆر خۆ لە قسە کردن هەڵناقوتێنێ. ٢ـ ئارام، کپ، بێهات و هاوار. ٣ـ دڵ بە غەم، مات، خەمناک. ٤ـ کەسی کەم قسە و فەقیرۆکە. ~ **بوون:** ١ـ ئارام بوونی وڵات. ٢ـ مات بوون، خەمناک بوون. ٣ـ دەست لە قسە هەڵگرتن، تەواو کردن و برینەوەی قسە. ٤ـ کپ بوون، بێهات و هەرا بوون. ~ **کردن:** لە دەنگ خستن، ئارام کردن.

**بێدەنگیی** (حم.)[بێدەنگ + ئیی] ١ـ هات و هاوار و دەنگ نەبوون، ئارامیی، ئەهوەنیی. ٢ـ خەمناکیی، ماتیی.

**بێدین** (ئان. ل)[بێ4 + دین] کەسێک کە بڕوای بە دین نەبێ، ، بێ ئیمان، کافر. ~ **بوون:** ١ـ خاوەن ئیمان نەبوون ٢ـ کافر بوون، لە دین چوونەدەر. ~ **کردن:** کافر کردن، لە دین بردنە دەر.

**بێدینیی** (حم.)[بێدین + ئیی] ئیمان و دین نەبوون، بێ ئیمانیی، کافریی.

**بێر**[1] (نا.)[؟] ١ـ کاری کۆ کردنەوەی ئاژەڵ بۆ دۆشین، بێرە، بێری. ٢ـ بڕ: بەردەبێر. **لە ~ دان:** کۆ کردنەوەی و ئامادە کردنی ئاژەڵ بۆ دۆشین.

**بێر**[2] (نا.)[باک] بڕ: بێڵ

**بێرا** (نا.)[سۆر] بڕ: بێلا. ❊ سینگ مافوورەی خۆرەسان هینام لە لای بەغدایێ/ رۆژێ یارم میوان بی رایبێخەم لە بێرایێ (فۆلکلۆر ل ٢٥).

**بێرک**[1] (نا. ل)[بێر2 + ک][باک] ١ـ بێڵچە، خاکەنداز. ٢ـ ئێسکی شان.

**بێرک**[2] (نا.)[بڕ: بەریک][باک] گیرفان

**بێرکەر** (نا. ل)[بێر1 + کەر] بڕ: بێری

**بێروون** (نا.) بڕ: بیابان

**بێرە** (نا.) بڕ: بێر1/١.

**بێرەدۆش** (نا. ل)[بێر1 + ئە + دۆش] ١ـ مەڕدۆش، بێری. ٢ـ دەفری شیر تێدا دۆشین.

**بێری** (نا. ل)[بێر1 + ئی] ١ـ ژن یا کچێک کە ئاژەڵ دەدۆشێ، بێریڤان، بێرکەر، بێرەدۆش، بێریوانە. ٢ـ [باک]

شـوێنی مـەڕ دۆشین، بێـر. ٣ـ ناوە بۆ مێینە.

**بێـریڤـان** (نا. ل)[بێـری + ڤان][باک] بڕ: بێری

**بێـــــریک** (نـا.)[بڕ: بەریک][بـاک] گیرفان

**بێـریوانە** (نا. ل)[بێـری + وان + ئە] [زا] بڕ: بێری

**بێـــــڕوحم** (ئـان. ل)[بـێ4 + ڕوحم] کـەسـێک کـە ڕوحم و بەزەیی دە دڵ دانەبێ، دڵڕەق، بێڕەحم، بێبەزە.

**بێڕوحمیی** (حم.)[بێڕوحم + ئیی] کار و کردەوەی کـەسی بێـڕوحم، دڵڕەقـیی، بێبەزەیی، بێڕەحمیی.

**بێـــڕۆح** (ئان. ل)[بێ4 + ڕۆح] بڕ: بێگیان

**بێـڕووح** (ئان. ل)[بێ4 + ڕووح] بڕ: بێگیان

**بێـڕەحم** (ئان. ل)[بێ4 + ڕەحم] بڕ: بێڕوحم

**بێڕەحمیی** (حم.)[بێڕەحم + ئیی] بڕ: بێڕوحمیی

**بێـــــڕەزا** (ئان. ل)[بێ4 + ڕەزا] ١ـ بێڕەحم، بێبەزە، دڵڕەق. ٢ـ خوێنتاڵ، ڕەزاگران، ڕەزاقورس، گۆشتتاڵ. ~ **بوون:** ١ـ دڵڕەق بوون، زاڵم بوون. ٢ـ خوێنتاڵ بوون. **خۆ ~ کردن:** خۆ ناحەز کردن و خۆ لەبەرچاوان خستن، خۆ خوێنتاڵ و ئێسک گران کردن.

**بێڕەگ** (ئان. ل)[بێ4 + ڕەگ] کەسێک کە نامووسی زۆر لا گرینگ نیە، بێدەمار، بێغیرەت.

**بێـڕەنگ** (ئان. ل)[بێ4 + ڕەنگ] ١ـ حاڵی هەر شتێکی کە ڕەنگی نەبێ. ٢ـ ڕەنگ پەڕاو.

**بێـڕەنگیی** (حم.)[بێـڕەنگ + ئی] ١ـ چلۆنایەتی شـتی بێـڕەنگ. ٢ـ ڕەنگ پەڕاویی.

**بێز**[1] (نا.)[باک: بێز ـ ناو: بێز، قێز ـ باش: قێز، بێز ـ هەو: بێزی، قیزی ـ زا: بێز] حاڵەتێکە لە مرۆڤ و هەندێک گیانلەبەر دا کە بە دیتن و بۆن کردن و خواردنی هەندێک خواردەمەنی و شتی دیکە دڵی تێکدەچێ. ~ **کردن:** دڵ تێکچوون و دڵ شێوان لە شتێک یا کەسێک. ~ **لێبوونەوە:** بێمەیلی و دڵ شێوان لە خواردنی شتێک یا لە دیتنی ئەو شتە یا کەسێک، بێز لێهەستان، بێز

لێهاتن، بێز لێکردن. ~ **لێکردن:** بێز لێهاتن، بێز کردن. ~ **لێهاتن:** بڕ: بێز لێبوونەوە. ~ **لێهەستان:** بڕ: بێز لێبوونەوە. ~ **هاتن:** بێز کردن، بێز لێهاتن. :: بێزم نایە گۆشتی کەروێشکی بخۆم. ~ **هەستان:** دڵ شێوان و بێز لێبوونە لە شتێک، بێز هەڵستان. ~ **هەستاندن:** بوونە هۆی بێز هەستانی کەسێک، بێز هەڵستاندن.. :: هێند بە پیسی نانی دەخۆی بێزی پیاو هەڵدەستێنی. ~ **هەڵستان:** بڕ: بێز هەستان. ~ **هەڵستاندن:** بڕ: بێز هەستاندن.

**بێز**$^2$ (نا.)[؟] رەنگ. :: بێزی ئەم قاڵییە لە بێزی ئەو قاڵییەیە.

**بێزات** (ئان. ل)[بێ4 + زات] کەسێک کە زات و ورەی نەبێ، ترسەنۆک.

**بێزار** (ئان. ل)[بێ4 + زار] ١ـ حاڵی کەسێک کە لە کار و کردەوەیەک زۆر ماندوە، وەڕەز، جاڕز. ٢ـ حاڵی کەسێک کە لە دیتن یا کاری کەسێک حاڵی تێکچێ. ~ **بوون:** ١ـ وەڕەز بوون، جاڕز بوون. ٢ـ رق هەستان، حاڵ تێکچوون. ~ **کردن:** ١ـ جاڕز کردن. ٢ـ حاڵ تێک دان.

**بێزاریی** (حم.)[بێزار + ئیی] ١ـ بێمەیلیی. ٢ـ توورەیی.

**بێزان** (چا. ل)[لە: بێز1] لەبەر چاو کەوتن، بێز لێکردن، لێ بێزار بوون، بێزران، بێزیای. :: گۆتمێ بێنە ماچت کەم خۆی هاوێشتەی ئامێزێ/ لەبەر ئەو کیژە جوانە دنیام لەبەر دەبێزێ (فۆلکلۆر ل ٦٠)

**بێزران** (چا. ل) بڕ: بێزان

**بێزراو** (نا. مف.)[لە: بێزران] لەبەرچاو کەوتوو، ناخۆشەویست. :: ئەمن پێم خۆش نیە ئاودەنگی قەل بم / ئەمن پێم خۆش نیە بێزراوی گەل بم (تاریک و روون ل ١١٤).

**بێزگ** (نا. ل)[بێز1 + گ][باش ـ ئەر] بڕ: بێزوو

**بێزگەوان** (ئان. ل)[بێزگ + ئە + وان][ئەر] بڕ: بێزووکەر

**بێزمان** (ئان. ل)[بێ4 + زمان] ١ـ کەسێک کە نەتوانی قسە بکا، لاڵ. ٢ـ بەستەزمان، فەقیرحاڵ، فەقیرۆکر.

**بێزوو** (نا. ل)[بێز1 + ئوو][باک: بێزوو ـ ناو: بێزوو، بێزگ، بێزی ـ باش: بێزگ] ئارەزوو و مەیلی ژنی زگپڕ بۆ

هەندێک خواردن، مەگیرانی، نەوریانی، مەورانی، مژن. ~ **کردن:** ئارەزوو کردن و ئیشتیا کردنی ژنی زگپڕ بۆ خواردەمەنی، مەگیرانی کردن. ⁑ چیە دنیا، ژنێکە هەر شەوێ سکپڕ بە سەد فیتنە / سبەینێ زوو بە خوێنی جەرگی ئەهلی دڵ دەکا بێزوو (مەحوی ل ٢٥٥).

**بێزووکەر** (؟)[بێزوو + کەر] ژنێک کە مەگیرانی دەکا، مەگیرانی کەر.

**بێزەحمەت** (ئاک. ل)[بێ4 + زەحمەت] ١- بێکوێرەوەری و رەنج، هاسان. ⁑ هەروا سووک و سانا و بێزەحمەت کارێکی باشی دەست خست. ٢- (شر.) زەحمەت نەبێ!، تکایە! ⁑ بێزەحمەت کوتێکم نان دەیە!

**بێزەروو** (گیا.)[؟] گیایەکی تیژ و توندە، لە ئاو دا سەوز ئەبێ، گەڵاکانی وەکوو گەڵای کەرەوزە، ساقی ئەستوور و ناسک و پڕاوە، خواردنی باشترین شتە بۆ فرێدانی لمی گورچیلە، کووزەڵە (کشت و کاڵ ب ١ ل ٥٣).

**تێبینی:** هەژار ئەم وشەی بە شێوەی بێزەرۆ نووسیوە (بڕ: هەنبانە ب ١ ل ٩١) و خاڵیش بە شێوەی بێزەڕوو (بڕ: خاڵ ب ١ ل ١٨٥).

**بێزی** (نا. ل)[بێز1 + ئی] ١- [سۆر] بڕ: بێزوو. ٢- (نا.)[هەو] بڕ: بێز1

**بێژ**[1] (ر.)[لە: بێژتن1] ١- بە هەندێک ناو کە پێوەندییان بە ئاوازەوەوە هەیە دەلکێ و ناوی فاعلی ساز دەکابە مانای خوێن. ⁑ گۆرانی بێژ، قامبێژ، بەیت بێژ، دەنگبێژ. ٢- بە مانای وێژەر، وێژ. ⁑ هەتڵەبێژ

**بێژ**[2] (ر.)[لە: بێژتن2] بە ناوەوە دەلکێ و دەکەوێ و مانای دابێژەر دەدا. ⁑ ئاردەبێژ، ئاڵەبێژ

**بێژ**[3] (نا.)[زا] بڕ: باج

**بێژان**[1] (گیا.)[ناو: بێژان، بێژانە، بۆژانە] گیایەکی خۆڕسکە، بونێکی توندی هەیە، گوڵەکانی زەرد و ورد و بە کۆمەڵە.

**بێژان**[2] (چا. م) بڕ: بێژتن

**بێژانن** (چا. م) بڕ: بێژتن2

**بێژانە** (گیا.) بڕ: بێژان1

**بێژانەوە** (چا. م) بڕ: بێژتن2

**بێژتن**[1] (چا. م)[ئەو: ڤەچ، ڤەک، ڤەش - سان: ڤەج - پەه: ڤاچیێتەن. باک: بێژتن - ناو: بێژتن - هەو: واتەی - زا: ڤاجەییش، ڤاجیاییش] چاوگی ئێستا و

داهاتووی کوتن، قسە کردن، ئاخاوتن، کوتن. ⁘ ئێژم، دبێژن، بێژە!

**تێبینی:** کوتن دوو چاوگی هەیە (وەک هێشتن و هێلان). یەک چاوگی رابوردوو کە بە کوتن دەردەبڕدرێ (کوتم، پێیکوت، کوتبوویان ..) دووهەم چاوگی ئێستا و داهاتوو کە لە هەندێک زاراوە و ناوچە بە چاوگێکی وەک (ڵێین) دەردەبڕدرێ وەک: (دەڵێم، بڵێ، ...) و لە هەندێک ناوچە و شوێنی دیکە بە بێژتن (بێژە، ئێژێ، ...). بێژتن وەک چاوگ بە گشتی دەکار ناکرێ بەڵام کۆمەڵە وشەیەکی زۆر لەم چاوگە کەوتوون وەک: وێژەر، وشە، واژە، واتە، واتا، راوێژ، لاوژە، لاوک، هەوا، ئاواز،...

**بێژتن**[2] (چا. م)[ئەو: ڤەئێک ـ پەه: ڤێختەن. باک: بێژتن ـ ناو: بێژتن، بێژان، بێژانن، بێژانەوە ـ باش: بێژانن] جیا کردنەوەی دوو شتی ورد و درشت بە بێژینگ لە یەکتر، لە هێلەگ دان، دابێژتن. ⁘ نووری چاوم! چاوەکەم بێ نوورە بێ تۆ، زەرڕەیی/ خاکی دەرگاکەت ببێژم بیکەمە کوحلی بەسەر (نالی ل ٢٠٢).

**بێژک** (نا.)[باک] بڕ: بژ1

**بێژمار** (ئان. ل، ئاک. ل)[بێ4 + ژمار] ئەوندە زۆر کە لە بژاردن نەیە، لە رادە بەدەر، بێبژار/٢، بێ ئەژمار، بێڕادە.

**بێژنگ** (نا. ل)[بێژ2 + نگ] بڕ: بێژینگ

**بێژوو** (ئان. ل)[بێ4 + ژوو (ژەک)] بڕ: بێژەک

**بێژەک** (ئان. ل)[بێ4 + ژەک] مەڕ و بزنێک کە دوای زان شیریان وشک دەبێ یا لە کەمێ دەدا، بێژوو، ئەبرەش، بێشیر.

**بێژینگ** (نا. ل)[بێژ2 + ئینگ][باک: بێژنگ ـ ناو: بێژنگ، بێژینگ ـ باش: بێژنگ] دەفرێکی خڕی هەندێک قووڵە، بە قەرا دەفەیەک دەبێ، بنەکەی تۆڕی سیمی کون کونی تێگراوە، دەوروبەری دارە کە بە خەرکەمان خواری دەکەنەوە، بۆ دابێژتن کەلکی لێوەردەگرن. بێژینگ لە پەیوەندی دەگەڵ ئەو شتەی کە پێی دا دەبێژن گەورە و چووک و کونی ورد و درشتی هەیە، (هێلەگ، داشگیر، باڵەکەو، سەرەد).

**بێژینگ فرۆش** (نا. فا)[بێژینگ + فرۆش] ١ـ کەسێک کە بێژینگ ساز دەکا

و دەیفرۆشێ. ٢ـ (کنـ.) مرۆڤی بێشەرم و بێحەیا.

**بێژینگ فرۆشیی** (حم.) ١ـ کار و پیشەی کەسی بێژینگ فرۆش. ٢ـ (کنـ.) بێشەرمیی، بێحەیایی.

**بێساحێب** (ئان. ل)[بێ4 + ساحێب] بڕ: بێخاوەن. **خۆ لێ ~ کردن:** بڕ: خۆ لێ بێخاوەن کردن.

**بێسان** (نا. ل)[بێ + سان][ئەر] بڕ: بێستان

**بێسانەوان** (نا. ل، ئان. ل)[بێسان + ئە + وان][ئەر] بڕ: بێستانەوان

**بێستان** (نا. ل)[بێ + ستان][پەه: بۆستان، بۆییستان. باک: بیستان، بۆستان ـ ناو: بێستان، بێسان ـ باش: بێسان] پارچەی زەوییەکی تایبەت بۆ سەوزی و تەڕەبار و میوەی بڕکەیی، پارێز. || **بێستانی چۆمی:** بێستانێک کە لە بەستێنی چۆم کرابێ، بێستانی خیزی، چواربێستان. **بێستانی خیزی:** بڕ: بێستانی چۆمی

**تێبینی:** بێ شکڵێکی دیکەی بێن و بۆنە. زوو بێستان پتر بۆ گوڵ و گیای بۆندار تەرخان دەکردرا و بێستان مەبەست لە جێی بە بۆن بوو لە دوایی ئەم ناوە درا بە هەر پارچە زەوییەک کە شتی بۆندار و سەوزی تێدا بچێندرێ.

**بێستانچی** (نا. ل)[بێستان + چی] بڕ: بێستانەوان

**بێستانەوان** (نا. ل، ئان. ل)[بێستان + ئە + وان][پەه: بۆستانپان] کەسێک کە بێستان رەغەمەڵ دێنێ و ئاگای لە بێستانە و پێیڕادەگا، بێسانەوان، بێستانچی.

**بێستانەوانی** (حم.) کار و پیشەی بێستانەوان.

**بێسفەت** (ئان. ل)[بێ4 + سفەت] کەسێک کە چاکەی دە چاو دانەمێنێ، سپڵە، پێنەزان. **~ بوون:** سپڵەبوون.

**بێسووچ** (ئان. ل)[بێ4 + سووچ] بێتاوان، بێخەتا، بێگوناه. ⁘ کابرایان بێسووچ و بێتاوان گرتوە و دە زیندانیان کردوە. **~ بوون:** بێتاوان بوون، بێگوناه بوون.

**بێسەروبن** (ئان. ل)[بێ4 + سەر + و + بن] قسە و کردەوەیەک کە روون و شیاوی تێگەیشتن نەبێ، سەر و بن نادیار، تێکەڵ پێکەڵ. **~ بوون:** روون نەبوونی قسە و کردەوەیەک. ⁘ ئەمن هەر تێتنەگەیشتم دەڵێی چی، قسەکانت

زۆر بێسەروبەن! کارەکانت هەموو بێسەروبەن.

**بێسەروپا** (ئان. ل)[بێ4 + سەر + و + پا] حاڵی مرۆڤی خوێڕی و لات و لووت، هیچ و پووچ و بێکارە، مرۆڤی بێنرخ و بێکەسایەتی، بێسەر و پێ.

**بێسەروپێ** (ئان. ل)[بێ4 + سەر + و + پێ] بڕ: بێسەروپا

**بێسەروشوێن** (ئان. ل)[بێ4 + سەر + و + شوێن] ون، نادیار، کەسی بێسوراغ. **~ چوون:** ون بوون و کەس بە سواغی کەسێک نەزانین، شرت و گوم بوون.

**بێسەرەوبەرە** (ئان. ل) [بێ4 + سەر + ئە + بەر3 + ئە] حاڵی شوێن، جێگا یا کۆمەڵێک کە لە سەر باری ئاسایی و یاسایی نەبێ و ئاڵۆز و تێکەڵ پێکەڵ بێ، کەس لە کەس، بێقانوون.

**بێسەواد** (ئان. ل)[بێ4 + سەواد] ١- کەسێک کە نەتوانێ بنووسێ و بخوێنێتەوە، نەخوێندەوار، ئوممی. ٢- نەزان، کەسێک کە لە عیلم و زانست نەگا.

**بێسەوادیی** (حم.)[بێسەواد + ئیی] حاڵ و چلۆنایەتی کەسی بێسەواد، نەخوێندەواریی.

**بێسیم** (نا. ل)[بێ4 + سیم] دەزگایەکە کە شەپۆلی دەنگ بە بێ پەیوەندی سیم لە شوێنێکی دیکەوە وەردەگرێ و دەینێرێ، بێتەل، لاسلکی، تەلسز.

**بێش** (ژ.)[تور: beş] پێنج، پەنج لە یاری تەختەنەرد دا. ⁂ شەش و بێش.

**بێشعوور** (ئان. ل)[بێ4 + شعوور] کەسێک کە ئەقڵ و شعووری نەبێ، نەزان، بێ ئاقڵ، نەفام، گەوج.

**بێشعووریی** (حم.)[بێشعوور + ئی] بێ ئاقڵیتی، نەزانیی، نەفامیی.

**بێشک**[1] (ئاک. ل)[بێ4 + شک] بێگومان، یەقین.

**بێشک**[2] (نا.) بڕ: بێشکە

**بێشکە** (نا.)[تور: beşik] لانک، لانکە، بێشک، بێشیگە. [بڕ: لانک]

**بێشۆ** (ئاک. ل)[بێ4 + شۆ2] لە رادە بەدەر، گەلێک زۆر، بێحەد. ⁂ واوەیلام بێحەد، زاریم بێشۆمەن/ جە لای تۆ فەریاد جە دەس تۆمەن (مەولەوی ل ٣٣).

**بێشوو** (ئان. ل)[بێ4 + شوو1] ژنێک کە مێردی نەبێ، بێوەژن، بێمێرد.

**بێشە** (نا.)[ئەو: ڤەرێشە ـ سان: ڤرکشە ـ سوغ: ڤیشاک ـ پەه: ڤیشەک. باک: بیشی ـ ناو: مێشە، بێشە ـ هەو: بێشە، وێشە ـ زا: مێشە] دارستانی خۆڕسکی چووک.

**بێشەرم** (ئان. ل)[بێ4 + شەرم] کەسێک کە شەرم لە کەس ناکا، رووهەڵماڵاو، بێحەیا. ~ **بوون:** شەرم نەبوون، بێحەیا بوون.

**بێشەرمیی** (حم.)[بێشەرم + ئی] کار و کردەوەی کەسی بێشەرم، بێحەیایی. ~ **کردن:** بێحەیایەتی کردن.

**بێشەریک** (ئان. ل)[بێ4 + شەریک] ١ـ کەسێک کە مەعاملە و کار و مەسەلەیەک دا شەریکی نەبێ. ٢ـ بێهاوتا، تاک و تەنیا. ٣ـ (مجـ.) خودا.

**بێشەریکیی** (حم.)[بێشەریک + ئیی] بێشەریک بوون، بێهاوتایی، تاک و تەنیایی.

**بێشەرەف** (ئان. ل)[بێ4 + شەرەف] ١ـ کەسێک کە nامووس و شەرەف لای گرینگ نەبێ. ٢ـ پەست، رەزیل، ناپیاو. ~ **بوون:** ١ـ بێناموووس بوون. ٢ـ رەزیل و ناپیاو بوون.

**بێشەرەفیی** (حم.)[بێشەرەف + ئی] ١ـ بێناموووسیی، بێغیرەتیی. ٢ـ رەزیلیی، ناپیاوەتی.

**بێشەلان** (نا. ل)[بێشە + لان] مێشەی گەورە و چڕ و پڕ، مێشەلان.

**بێ شەما** (نا.)[؟] جۆرێک تووتنی باش و بۆن خۆشە، بێ شەمە.

**بێ شەمە** (نا.) بڕ: بێ شەما

**بێشیر** (ئان. ل)[بێ4 + شیر] ئاژەڵ و ماڵاتێک شیری ویشک کردبێ یا شیری زۆر کەم بێ، بێژەک، ئەبرەش.

**بێشیگە** (نا.)[زا] بڕ: بێشکە

**بێعار** (ئان. ل)[بێ4 + عار] ١ـ کەسێک کە عەیب و شوورەیی لا گرینگ نەبێ. ⁂ بێعاران، تێیان بکوتن بە داران / هەر دەچنەوە جێی جاران (امثال و حکم ل ٧٦). ٢ـ کەسی دم هەراش و دڕ و بێشەرم. ٣ـ منداڵی هار و هاج و بەدفەڕ. ~ **بوون:** ١ـ پێ عەیب نەبوونی کار و کردەوەیەک، بێشەرم بوون. ٢ـ بەدفەڕ بوون، هار و هاج بوون. ~ **کردن:** بەدفەڕ بار هێنانی منداڵ یا کەسێکی دیکە.

**بێعاریی** (حم.)[بێعار + ئیی] ١ـ بێشەرمیی. ٢ـ بەدفەڕیی، شلووقیی.

**بێــغــەم** (ئان. ل)[بێ٤ + غـەم] بڕ: بێخەم

**بێغەوش** (ئان. ل)[بێ4 + غەوش] بڕ: بێخەوش

**بێغەوشیی** (حم.)[بێغـەوش + ئیی] بڕ: بێخەوشیی.

**بێـفــایده** (ئان. ل)[بێ4 + فـایده] بێسـوود، بێکەلک. **~ بوون:** بێسـوود بوون، بێکەلک بوون، فایده نەبوون.

**بێـفرۆفـێڵ** (ئان. ل)[بێ4 + فرِ + و فێڵ] کەسێک کە فـێڵ و تەڵەکەی دە بن سەر دانەبێ و دەگەڵ خـەڵک سادە و پاک و راسـت بـێ. **~ بـوون:** رووراسـت و سادە و پاک بوون، فێڵ نەکردن.

**بێــفــەزیحــەتیی** (حم.)[بێ4 + فـەزیحـەت + ئیی] هـەتک، سـووکـایەتی، رسوایی. **~ پێکردن:** ئابڕووی کەسێک بردن، سـووکـایەتی پێکردن، هەتک پێکردن.

**بێـفـیکر** (ئان. ل)[بێ4 + فـیکر] ١ـ بێهۆش، بێ ئاقڵ، بێ ئاوەز. ٢ـ بێخەیاڵ، بێغەم.

**بێڤل** (ئا.)[باک] بڕ: بیڤل

**بێقسەیی** (حم.)[بێ4 + قسـە + ئی] بێگوێیی. **~ کردن:** لە قسـە دەر چوون، بە قـسـە نـەکـردن. :: ئەوەی پێت دەڵێم وابکە بێقسەیی مەکە!

**بێــقــەدر** (ئان. ل)[بێ4 + قــەدر] کەسێک یا شتێک کە رێز و نرخی نەبێ، سووک، بێڕێز، بێنرخ. :: کابرایەکی زۆر بێـقـەدرە! **~ بوون:** رێز لێنەگـیران، بە سووک چاو لێکران.

**بێقەدریی** (حم.)[بێقـەدر + ئیی] حاڵ و چلۆنایەتی شـت یا کـەسی بێـقــەدر و سووک، بێڕێزیی.

**بێـقـەرار** (ئان. ل)[بێ4 + قـەرار] بێ ئارام، ئارام لێبڕاو، نائارام، نەحـەجماو. **~ بوون:** حــەجــمـین لێــبــڕان، ئارام لێهەڵگیران، نائارام بوون. **~ کردن:** حەجمین لێهەڵگرتن، ئارام لێبڕین.

**بێـقـەراریی** (حم.)[بێـقـەرار + ئیی] نائارامیی، نەحەجمین، ئارام لێبڕاویی.

**بێقەوارە** (ئان. ل)[بێ4 + قەوارە] ١ـ حــاڵی کــەســێکی کــە بەژن و بـاڵا و ئەندامـێکی نارێک و پێکی هەیە. ٢ـ هەر شتێکی نارێک و پێک. :: ماڵی بێقەوارە، گوڵدانی بێقـەوارە. **~ بوون:** ١ـ نارێک و پێک بـوونـی بـەژن و بـاڵا. ٢ـ نـارێک و پێک بوون.

**بێقیمەت** (ئان. ل)[بێ4 + قیمەت] ١ـ بێنرخ، خۆڕایی. ٢ـ (کنـ.) مرۆڤی هیچ و پووچ، خوێڕی. ٣ـ زۆر گرانبایی وەها کە قیمەتی دیاریی نەکرێ. ∷ پاکی گوارەی گـوێی زێڕی بێـقـیـمـەتە، قـیـمـەتی لە خەزێنەی کەس دانییە (لاس و خەزاڵ ل ٧٦). ~ **بوون:** ١ـ بێنرخ بوون، هیچ و پووچ بوون. ٢ـ زۆر بە قیـمـەت بوون، لە قیمەت نەهاتن.

**بێکار** (ئان. ل)[بێ4 + کـــار] ١ـ کەسێک کە ئیش و کاری نەبێ. ٢ـ بڕ: بێکارە. ٣ـ [باک] بێـژن، سـەڵت. ~ **بوون:** ١ـ بێ ئیش بوون، پشـوو دان. ٢ـ لە کـار دەرکـراو. ~ **کردن:** لە کـار و ئیش دەرکردن.

**بـێـکـارە** (ئـان. ل. ـ نـا. ل)[بـێ4 + کـارە] ١ـ کـەسـێک کـە بێکارویار دەخولێتەوە و مەیلی لە کار کردن نیە، بێکار/٢/، لەشگران، تەوەزەل. ٢ـ شتێکی کە بە کەلک نەیە و دە کار نەکردرێ.

**بێکاریی** (حم.)[بێکـار + ئیی] ١ـ ئاکـامی بێکار بوون، کـار نەبوون. ٢ـ تەحتیلیی، پشوو.

**بێکەس** (ئان. ل)[بێ4 + کـــەس] کـەسێک کـە خزم و دۆست و بنەماڵەی نەبێ، کەسی بێپشت و بێپەنا. ~ **بوون:** هیـچکەس نەبوون، بێ خـزم و بنەمـاڵە بوون، پشت و پەنا نەبوون. ~ **مانەوە:** کەس و کار لە کیس دان و تەنیا مانەوە.

**بێکەلک** (ئان. ل)[بێ4 + کـەلک] [موک] حاڵی کەس یا شتێک کە کەلکی نەبێ، بێفایدە، بێسوود، بێکەڵک. ~ **بوون:** بێفایدە بوون، بێسوود بوون.

**بێکەڵک** (ئان. ل)[بێ4 + کەڵک] بڕ: بێکەلک.

**بێکەیف** (ئان. ل)[بێ4 + کـەیف] کەسێک کە لە سەر کەیف نیە و کەیفی ساز نیە، پەشێو، خەمین. ~ **بوون:** پەشێو بوون، کەیفساز نەبوون.

**بێگار** (نا.)[پەه: بێکار] کاری زۆری و خۆڕایی رەعیەت بۆ ئاغا و ئەرباب، سوخرە، بێگاری. ~ **پێکردن:**١ـ کاری زۆری و خۆڕایی ئەنجام دان. ٢ـ ئەزیەت کردن و تووشی کار کردنی کەسێک، کاری نابەدڵ پێ ئەنجام دان. & بێگاری پێکردن

**بێگارچی** (ئان. ل)[بێگار + چی] کەسێک کە بێگاری دەکا، کەسی بە سوخرە گیراو.

**بێگاریی** (حم.)[بێگار + ئی] بڕ: بێگار. **~ پێکردن:** بڕ: بێگار پێکردن.

**بێگانه** (ئان. ل ـ نا. ل)[پەه: بێگانەک، بێگانییک. باک: بیانی ـ ناو: بێگانه ـ هەو: بێگانه] ١ـ کەسێک ئاشنایەتیت دەگەڵ نەبێ، غەریبە، نەناس. ٢ـ کەسی خەڵکی هەندەران، لاوەکی، هەندەرانی.

**بێگانەپەرست** (ئان. فا)[بێگانه + پەرست] ١ـ کەسێک کە بێگانەی پێ لە خزم و کەس و کار و ئاشنا باشترە. ٢ـ کەسێک کە پێوەندی دەگەڵ بێگانە هەیە و بە قازانجی ئەوان و بە دژی هاونیشتمانەکانی دەجووڵێتەوە. **~ بوون:** ١ـ بێگانە خۆش ویستن. ٢ـ پێوەندی دەگەڵ بێگانە هەبوون.

**بێگانەپەرستیی** (حم.)[بێگانەپەرست + ئیی] کاری بێگانەپەرست. **~ کردن:** بێگانە خۆش ویستن. ꞉꞉ سەد ساڵ بکەی بێگانەپەرستی/ ئاخری هەر دێنی نوشستی (پەند)

**بێگوێ** (ئان. ل)[بێ4 + گوێ] کەسێک کە قسان دە گوێ ناگرێ و قسەی پێکوتراو ئەنجام نادا، بێگۆش. **~ بوون:** قسە دە گوێ نەگرتن و ئەنجام نەدانی راسپاردە و کارێک.

**بێگوێیی** (حم.)[بێگوێ + ئی] کار و کردەوەی کەسی بێگوێ. **~ کردن:** بە قسەی کەسێک نەکردن، گوێ لێ ئاخنین لە قسەی کەسێک.

**بێگۆش** (ئان. ل)[بێ4 + گۆش][هەو] بڕ: بێگوێ

**بێگیان** (ئان. ل)[بێ4 + گیان] ١ـ هەر بوونەوەرێک کە خاوەنی گیان نەبێ. // گیاندار. ٢ـ خاوەن گیانێک کە گیانی نەمابێ، مردوو، بێڕووح، بێڕۆح. **~ بوون:** ١ـ مردن، رووح دەرچوون. **~ کردن:** کوشتن.

**بێل** (نا.)[باک] بڕ: بێڵ

**بێلایەن** (ئان. ل)[بێ4 + لایەن] ١ـ کەسێک کە تەعەسووبی بۆ لایەنێک نەبێ. ٢ـ کەسێک کە لایەنگری بیر و باوەڕێکی سیاسی نەبێ. ٣ـ دەوڵەتێک کە لاگری دەستەلاتدار و هێزێکی گەورەی جەهانی نەبێ. & بێتەرەف. **~ بوون:** ١ـ لە نێوان دوو لایەن و دوو مەسەلە و دوو بەرژەوەندی دا تەعەسوب نەبوون و بۆ لێکدانەوە و نێوبژی کردن لایەنی هیچ کامیان نەگرتن. ٢ـ سەر بە دەستەلاتدار و هێزێک نەبوون.



**بێــلایەنی** (حم.)[بێــلایەن + ئی] بێلایەن بوون، بێتەرەفی.

**بێلوو** (نا.)[باک] بڕ: بێلۆ.

**بێلە** (نا. د) دەنگی ئاژەڵ، دەنگی بزن و مەڕ، باعە، بالە، باڕە.

**بێلەبێل** (نا. د)[بێلە + بێل] دەنگی پەیتاپەیتای ئاژەڵ، باعەباع، بالەبال، بێلەبێل.

**بێلەزەت** (ئان. ل)[بێ4 + لەزەت] ١ـ کەلاک و مەیتێک کە زۆر لەت و پەت کرابێ. ٢ـ زۆر، گەلێک. ~ **کردن:** (کنـ.) کەلاک و مەیتێک زۆر لەت و پەت کردن، لە شکڵ و شەمایل خستن.

**بێڵ** (نا.)[پەه: بێل، ڤـیلەک. تات: بەرە، بیلە ـ لار: بیر ـ فار: بیل. باک: بێر، بێل، مەر ـ ناو: بێڵ ـ باش: بێڵ ـ زا: مەر، مەڕ] ١ـ ئامرازی هەڵقەندنی زەوی و راگوێزتن و هەڵگرتنی کۆما شتی دیکە، کە بریتیە لە دەسکێکی درێژی چێوی و ئاسنێکی پان و ساز کراو کە هەندێک جار بۆ هەڵکەندن کوتە دارێکی بە ناوی ئەسپەرە تێدەخەن، پێمەرە. ٢ـ ئامرازی چێوی بۆ بەفر ماڵین و رادان و هەڵگرتنی کۆما شتی دیکە. ئەم ئامرازە بریتیە لە دەسکێکی درێژ و دەمێکی چوارگۆشەی پان، بێڵەدارینە، پارووە. ~ **لە بەر میچ چەقاندن:** (کنـ.) تەواو بوونی کار، رزگار بوون لە کار، خلاسی هاتن.

**تێبینی:** هەر وەکی نووسراوە بێڵ و مەر بە یەک ریشە داندراون. ئەم دوو وشە هەر چەند بە رواڵەت دوو وشەی سەر بە خۆ دیاری دەدەن بەڵام لە راستی دا هەر یەکن و ئاڵوگۆڕی دوو پیتی (م) دەگەڵ (ب) و (ڵ یا ل) دەگەڵ (ر) یان بە سەر دا هاتوە. هەروەها لە زاراوەی ناوەندی دا مەڕ بە تەنیا دەکار ناکردرێ بەڵام لە وشەی پێمەرە [پێ + مەڕ + ئە] دا خۆ دەردەخا.

**بێلا** (نا.)[؟] سەکۆی پێشەوەی خانوو کە سەری دا پۆشراوە بەڵام پێشی بێ دەرک و پەنجەرە و ئاواڵەیە، لە کاتی گەرما بەرەی لێرادەخەن و لە ژێر سێبەری دادەنیشن و لە کاتی دیکەش باران و بەفر بەر دەرگای تەڕ ناکا، بێرا، هەیوان.

**بێڵچە** (نا. ل)[بێڵ + چە1] ئامرازێکە وەک بێڵ/١ ـ ی بەڵام چووکتر و هەمان کاریشی پێدەکردرێ، پێمەڕەی چووک، بێڵۆچکە، بێرک.

**بێڵۆ** (نا.)[باک: بێلوو ـ ناو: بێڵۆ] [ئەر] کانییەک کە بەهاران دەژێتەوە، کوێرەکانی.

**بێڵۆچکە** (نا. ل)[بێڵ + ئۆچکە] بڕ: بێڵچە

**بێڵەدارینە** (نا. ل)[بێڵ + ئە + دارین + ئە] بڕ: بێڵ/٢

**بێڵەکان** (نا. ل)[بێڵ + ئە + کان] ئامرازێکی چووکە وەک بێڵ بەڵام زۆر چووکتر، کوتە ئاسنێکی دەم باریکە، دەسکی لە دار و پەیاغ بۆ دەکەن و بۆ بژار و گیا و گوڵ هەڵقەندن کەلکی لێوەردەگرن، پیشک، بژارچن، گیاکەن.

**بێڵەکەڕە** (گیانـ.)[بێڵ + ئە + کەڕ + ئە] مارمێلکەی شەوگەڕ (هەنبانە بۆرینە ب ١ ل ٩٣). شەوگەرد، سۆل سۆلە جۆرە دووپشکێکی زۆر بچووکە (کشت و کاڵ ب ١ ل ٥٤).

**بێڵەهەڕ** (گیا.)[بێڵ + ئە + هەڕ] گیایەکی کوێستانی بەهارییە وەک گونۆڕ وایە، گزرە ئەکرێ بۆ ئاژەڵ (خاڵ ب ١ ل ١٨٨).

**بێمار** (نا.) بڕ: بیمار

**بێماڵ و حاڵ** (ئان. ل)[بێ4 + ماڵ + و + حاڵ] حاڵی کەسێک کە هیچی نەبێ، هەژار، فەقیر، نەدار. ~ **بوون:** هەژار بوون، فەقیر بوون، هیچ نەبوون.

**بێمایە** (ئان. ل)[بێ4 + مایە] ١ـ نانێک کە هەویرەکەی هەڵنەهاتبێ یا هەویرترشی لێنەدرابێ، فەتیر. ٢ـ مرۆڤی بێقەدر و بێڕێز. ٣ـ نەزان، تێنەگەیشتوو. ~ **بوون:** ١ـ فەتیر بوون. ٢ـ بێقەدر و بێڕێز بوون. ٣ـ نەزانین، تێنەگەیشتن.

**بێمەزەڕەت** (ئان. ل)[بێ4 + مزەڕەت (عەر: مضرة)][موک] بێوەی، بێ دەرد و بەڵا، بێ زەرەر و زیان، مێمزەڕەت. ⁘ یاخوڵا خاڵ و مامی تۆم بێمزەڕەت بێنەوە لەوێ سەفەرێ (کانی مرادان ل ١٧). ~ **بوون:** بێوەی بوون، بێ دەرد و بەڵا بوون.

**بێمنەت** (ئان. ل)[بێ4 + منەت] حاڵی هەرچی یا هەر شتێک کە منەتی نەبێ. ~ **بوون:** هەرچی کە دەکار کردن و کەلک لێوەرگرتنی منەتی نەبێ. ⁘ چەندەتان پێخۆشە بیخۆن، میوەی ئەو باغەی بێمنەتە. ~ **کردن:** ئەنجامی کارێک بە هیچ دانان و پێ گرینگ نەبوون. ⁘ ئەو هەمووو حەولەم بۆ دای بەڵام تۆ کارەکەمت بێمنەت کرد.



**بێمەیل** (ئان. ل)[بێ4 + مەیل] ١- کەسێک کە مەیل و ئیشتیای نەبێ. ٢- کەسێک کە مەیلی ئەنجام دانی کارێکی نەبێ. ٣- نەویست، نەخواز، سارد و سڕ. ~ **بوون:** ١- ئیشتیا نەبوون. ٢- مەیلی کارێک نەبوون. ٣- نەویستن، نەخواستن.

**بێمەیلیی** (حم.)[بێمەیل + ئیی] ١- بێ ئیشتیایی. ٢- پێخۆش نەبوون. ٣- ساردوسڕیی. ~ **کردن:** نەخواستن و نەویستنی کەسێک یا پەیوەندییەک، سارد و سڕ بوون لە دۆستایەتی و پەیمان دا.

**بێمێشک** (ئان. ل)[بێ4 + مێشک] کەسێک کە لە هیچ حاڵی نابێ وەک ئەوەی مێشکی نەبێ، بێ ئاقڵ، گێژ و حۆل، گەوج.

**بێمێشکیی** (حم.)[بێمێشک + ئیی] چلۆنایەتی بێمێشک، بێ ئاقڵیی، گەوجایەتیی، نەفامیی.

**بێن**[1] (ر.)[لە: بەستن] ١- رەگی بەستن ٢- بە ناوەوە دەلکێ و مانای بەستراو دەدا. ⁘ دەمبێن، دەزبێن، زاربێن، پشتبێن.

**بێن**[2] (نا.)[باک] بڕ: بۆن

**تێبینی:** بێن هەرچەند هی زاراوەی باکوورییە بەڵام لە ئەدەبی کلاسیکی زاراوەی ناوەندیی دا زۆر کەلکی لێوەرگرتراوە. ⁘ کوتی رووم وا دەکەم تێرم ببینی، چاوەڕێم داخۆ/ لە لای قیبلەم کە کەی بای وەعدە بێنی نەستەرەن بێنێ (وەفایی ل ٢٠٤). بۆ کەمێ لەو عەنبەرە، بۆ تەقوییەی رۆحی دەماغ/ بێنی کا، وەک ئێمە دایم چاوەڕێی ئێحسانە رۆژ (مەحوی ل ١٤١).

**بێناز** (ئان. ل)[بێ4 + ناز] حاڵی کەسێک کە نازی نەکێشرابێ، کەسێک کە خەمخۆری نەبێ، بێخێو، بێکەس. ~ **بوون:** خەمخۆر نەبوون، بەبێ ناز گەورە بوون.

**بێنازیی** (حم.)[بێناز + ئیی] ناز نەکێشران، بێناز بوون، بێکەسیی.

**بێناو** (ئان. ل)[بێ4 + ناو1] ١- کەسێک کە ناوبەدەرەوە نەبێ. ٢- کەسێک کە کەس نەیناسێ، گومناو. ~ **بوون:** ١- ناوبانگ نەبوون، ناوبەدەرەوە نەبوون. ٢- گەمناو بوون.

**بێناویی** (حم.)[بێناو + ئیی] ئاکامی بێناو بوون، ناوبەردەرەوە نەبوون.

**بێندەر** (نا.)[باک] بڕ: بێدەر2

فرۆشتن.

**بێنرخ** (ئان. ل)[بێ4 + نرخ] ١ـ هەر شتێکی بە خۆڕایی. ٢ـ مرۆڤی بێرێز، هیچ و پووچ، بێوەج، سووک، بێقیمەت. **~ بوون:** هیچ و پووچ بوون، سووک بوون، بێقیمەت بوون. **~ کردن:** بێقیمەت کردن، سووک کردن.

**بێنرخیی** (حم.)[بێنرخ + ئیی] هیچ و پووچیی، سووک بوون، بایەخ نەبوون، بێقیمەتیی.

**بێنزین** (نا.)[فەر: benzine] ١ـ ئاوکییەکی بێرەنگی بۆندارە، لە ئاو سووکترە، زوو گڕ دەگرێ و ئەگەر سەری ئاوەلا بێ دەچێتە هەواوە، لە ٧٠ دەرەجەی دا دەکوڵێ، فۆرمۆڵەکەی C6H6ە کە لە تەقتیری قەترانی رەژی بەردینە ساز دەبێ. ٢ـ بێنزینی ئاسایی کە لە نەفت دەگرترێ و بۆ وەکار خستنی مەکینە و ماشێن کەلکی لێوەردەگرن. & بەنزین

**بێنزین فرۆش** (ئان. فا) [بێنزین + فرۆش] کەسێک کە بێنزین دەفرۆشێ.

**بێنزین فرۆشیی** (حم.)[بێنزین فرۆش + ئیی] ١ـ کاری کەسی بێنزین فرۆش. ٢ـ (نا. ل) شوێن و جێگای بێنزین

**بێنسرین** (ئان. ل)[بێ4 + نسرین] بێغەم، بێخەفەت. ⁂ میر دەڵێ: کاکەمەم بەو خولایەی کەم بێنسرینە / پادشایێکی بێشەریکە، هیچ شەریکی لەبۆ نینە (مان ل ٦٧).

**بێنوێژ** (ئان. ل)[بێ4 + نوێژ] ١ـ حاڵی پیاوێک یا ژنێک کە لە بەرنزیکی لە یەکتر لەشیان پیس بوە و دەبێ غوسڵ دەرکەن. ٢ـ ژنی دە حەیزەوە چوو. **~ بوون:** ١ـ لەش پیس بوون دوای نزیکی. ٢ـ دە حەیزەوە چوون.

**بێنوێژیی** (حم.)[بێنوێژ + ئیی] ١ـ لەش پیس بوون لەبەر نزیکی. ٢ـ ئاکامی دە حەیزەوە چوون.

**بێنەبێن** (نا. ل)[بێن + ئە + بێن] دەنگ و هەرای زۆر، هەرمێن. ⁂ هەڵڵاهەڵڵا و گرمەگرم و بێنەبێنە/ مەرزینگان دەگری بە دوو چاوی باز و بە ئەبرۆیەکە شەهێنە (شۆڕمەحموود ل ٥٢).

**بێنەسیب** (ئان. ل)[بێ4 + نەسیب] بێبەش، بێبەریی.

**بێنەهایەت** (ئان. ل)[بێ4 + نەهایەت] ١ـ هەرچی کە نەهایەتی نەبێ،



بێ کــوتـایی و دوایی، بێـپــایـان. ٢ـ لە رادەبەدەر، گەلێک زۆر.

**بێنە و بەرە** (نا. چا)[لە: هـێنـان و بردن] کـاری هێنان و بردنی کـەسـێک. **~ پێکردن:** کەسێک ئەزیەت کردن بە هێنان و بردنی، ئەورۆ و سبەی پێکردن. :: ئـەو بێنـە و بـەرە چیـــە بـەو کـــابرا بەستەزمانەی دەکەی!

**بێنیاز** (ئان. ل)[بێ4 + نیاز] کەسێک کـە پێـویسـتـی بە هیـچ شـتـێک نـەبێ، دەســــرۆیـو، دەوڵەمـــــەند. **~ بوون:** پێـویست بە هیـچ شـتـێک نەبوون، نیـاز نەبوون. **~ کـردن:** کــەسـێک تێــر و تەســەل کـردن وەها کــە نیــازی بە هـیـچ نەبێ.

**بێنیازی** (حم.)[بێنیاز + ئیی] بێنیاز بوون، دەوڵەمەندیی.

**بێنێـوبڕ** (ئاک. ل)[بێ4 + نێـو + بڕ] بێـوچان، لەسـەریەک، پـەیتاپەیتا. :: دوو ساعـەتە بێنێـوبڕ قسـان دەکا. دوو ڕۆژە بێنێوبڕ باران دەبارێ و لێناکاتەوە.

**بێـــوادە** (ئان. ل)[بـێ4 + وادە] بێ وەخت و کـاتی دیاری کـراو، نەخـوازراو. :: کەڵەبابێک کە بێوادە بخـوێنی سـەری دەبڕن.

**بێواز** (ئان. ل)[بێ4 + واز] بێتاقـەت، بێحەوسـەلە، جاڕز. **~ بوون:** بێتاقەت و بێحەوسەلە بوون. **~ کردن:** بێتاقەت کردن، بێحەوسەلە کردن، جاڕز کردن.

**بێـــوچان** (ئـان. ل)[بـێ4 + وچان] پەیتـاپەیتا، بێپشـوو دان، یەکپشـوو. :: بێوچان کار دەکا و بێوچان دەنووسێ.

**بێورە** (ئان. ل)[بێ4 + ورە] کەسـێک کە ورە و بوێریی نـەبێ، ترسـەنۆک. **~ بوون:** لە ئـەنجـام دانـی کــارێک ترســان، نەوێران، تەسەنۆک بوون.

**بێوڵە** (گیانـ) بڕ: بێوەڵە.

**بێـوە** (نا. ـ ئان.)[ئەو: ڤـیـدەڤا ـ پەه: ڤیـیـپەک، ڤیوەک. فـار: بیوە ـ لار: بۆڤە ـ تات: ڤیـڤە ـ بیر: بێـوە، بیوە. باک: بی ـ ناو: بێـوە ـ باش: بێوە ـ هەو: بێـوە ـ زا: ڤیـیا] ژن یا پیاوێکی جووتەکەی مردبێ یا ئەوە کە لێک جیـا بووبنەوە و بە تەنیا بژین.

**بێوەپیا** (نا. ل ـ ئان. ل)[بێوە + پیا2] [هەو] بڕ: بێوەپیاو

**بێـوە پیــاگ** (نا. ل ـ ئان. ل)[بێـوە + پیاگ][ئەر] بڕ: بێوەپیاو

**بێــوەپیــاو** (نا. ل ـ ئان. ل) [بێـوە +

پیاو] پیاوێک کە لە ژنە کەی جیا بووبێتەوە یا ئەوە کە ژنەکەی مردبێ و بە تەنیا مابێتەوە، بێوەپیا، بێوەپیاگ، بێوەمێرد.

**بێوەج** (ئان. ل)[بێ4 + وەج] حاڵی کەسێک کە نرخ و ڕێزی نەبێ، هیچ و پووچ، بێنرخ.

**بێوەخت** (ئاک. ل)[بێ4 + وەخت] ١ـ درەنگ، ناوەخت. ٢ـ لەپڕ، کوتوپڕ.

**بێوەری** (ئان. ل)[بێ4 + وەری (بەهر)][ئەر] بڕ: بێبەری

**بێوەژن** (نا. ل ـ ئان. ل)[بێوە + ژن] ژنێکی تەنیا کە مێردەکەی مردوە یا ئەوە کە تەڵاق دراوە، بێوەژەنی. **بێوەژن کۆشی:** (کنـ.) حەول و تێکۆشانی زۆر وەک حولی بێوەژنێک بۆ بە خێو کردنی منداڵ و پەیدا کردنی بژیو.

**بێوەژەنی** (نا. ل ـ ئان. ل) [بێوە + ژەنی][هەو] بڕ: بێوەژن

**بێوەسیری** (نا.) بڕ: بەواسیر

**بێوەفا** (ئان. ل)[بێ4 + وەفا] کەسێک کە لە سەر وەفا و عەهدی خۆی نەبێ، بێبەینەت. ~ **بوون:** لە سەر بەڵێن و پەیمان نەبوون.

**بێوەفایی** (حم.)[بێوەفا + ئیی] کار و کردەوەی کەسی بێوەفا. ~ **کردن:** وەفا و بەڵێن نەبردنە سەر، بێوەفا بوون.

**بێوەمێرد** (نا. ل، ئان. ل)[بێوە + مێرد] بڕ: بێوەپیاو

**بێوەڵە** (گیانـ.)[؟] بێچووی ورچ، بێوڵە.

**بێوەی** (ئان. ل)[بێ4 + وەی] ژیانێکی خۆش کە لە بەر ئازار وەی نەکوترێ، بێناخۆشی، بێزیان، بێ ئازار. ‡ ژیانی بێوەی کەی خودا پێمانی ڕەوا دەبینێ! ~**بوون:** بێ ئازار و بە خۆشی ژیان تێپەڕ کردن.

**بێویژدان** (ئان. ل)[بێ4 + ویژدان] کەسێک کە لە ئاست کار و مەسەلەیەک ناپیاوەتی ڕەچاو دەکا و بیر و ویژدانی لە بەر چاو نیە، ویژدان مردوو. ~ **بوون:** خاوەن هەست و ویژدان نەبوون لە ئاست کار و کردەوەیەک دا.

**بێویژدانیی** (حم.)[بێویژدان + ئیی] کار و کردەوەی کەسی بێویژدان، ناپیاوەتی. ~ **کردن:** ویژدان لەبەر چاو نەگرتن، ناپیاو بوون.

**بێوێنە** (ئان. ل)[بێ4 + وێنە] هەر شتێک یا کەسێک لە بارێکەوە تاک بێ و

وێنە و هاوتای نەبێ، بێهاوتا، بێهەمتا. ~ **بوون:** هاوتا و وێنە نەبوون، تاک بوون، نێهاوتا بوون.

**بێوێنەیی** (حم.)[بێوێنە + ئیی] تاک بوون، وێنە نەبوون، بێهاوتایی.

**بێه** (گیا.)[باک] بڕ: بەی1

**بێهاوتا** (ئان. ل)[بێ4 + هاوتا] بڕ: بێوێنە. ~ **بوون:** بڕ: بێوێنە بوون.

**بێهاوتایی** (حم.)[بێهاوتا + ئیی] بێوێنەیی، هاوتا نەبوون، بێهەمتایی.

**بێهن**[1] (نا.)[باک] بڕ: بۆن

**بێهن**[2] (نا.)[باک] بڕ: بین1

**بێهۆ** (ئاک. ل)[بێ4 + هۆ] لە خۆوە، بێ هیچ بەڵگەیەک.

**بێهۆش** (ئان. ل)[بێ4 + هۆش] ١ـ کەسێک کە بە دەرمان یا لە ترسان یا لە بەر هەر هۆیەکی دیکە دڵی لە خۆ بۆتەوە و ئاگای لە خۆی نەماوە. ٢ـ کەسی گێژ و حۆل کە هۆشی بە تەواوی کار ناکا. // بەهۆش. ~ **بوون:** ١ـ دڵ لە خۆوە بوون، بێ ئاگا کەوتن، بێهۆش کەوتن. ٢ـ گێژ و حۆل بوون، نائاگا بوون. ~ **کردن:** ١ـ دەرمانی بێهۆشی دان بە کەسێک بۆ لە خەو کردنی هەتا لە کاتی عەمەل دا هەست بە ئێش نەکا ٢ـ لە هۆش بردن. ⁂ مستێکی قورسی لە سەری دا و بێهۆشی کردن. ~ **کەوتن:** دڵ لەخۆوە بوون، بێهۆش بوون.

**بێهۆشی** (حم.)[بێهۆش + ئی] ١ـ حاڵەتی بێهۆش بوون. ٢ـ گێژی، حۆلی.

**بێهوودە** (ئان. ل)[بێ4 + هوودە] لەخۆڕا، بێهۆ، بێخود، بێفایدە.

**بێهەست** (ئان. ل)[بێ4 + هەست] ١ـ کەسێک کە لە ئاست کار و مەسەلەیەک هەست و کاردانەوەی نەبێ. ٢ـ بێدەنگ، بێهەست و خوست. ⁂ کاکە گیان لاوی کوردی شۆخ و شەنگ / تا کەنگێ دەبی وا بێهەست و دەنگ (تاریک و روون ل ٥٠).

**بێهەست و خوست** (ئان. ل)[بێ4 + هەست + و + خوست] زۆر بێدەنگ.

**بێهەم** (ئان. ل)[بێ4 + هەم] کەسێک کە هەم و غەمی نەبێ، بێغەم، بێدەرد، بێوەی. ⁂ ئێستەکە کوردە هەموو بێهەم و بێدەرد و خەمە / شادە، ئازادە، دەکا گاڵتە و گەپ، کەیف و گەمە (تاریک و روون ل ٨٢).

**بێهەمتا** (ئان. ل)[بێ4 + هەمتا] شتێک یا کەسێک کە وێنە و هەمتای

نەبێ، بێهاوتا، بێوێنە. ~ **بوون:** بێوێنە بوون، هاوتا نەبوون، بێهاوتا بوون.

**بێهەمتایی** (حم.)[بێهەمتا + ئیی] هاوتا نەبوون، بێهاوتایی.

**بێهێز** (ئان. ل)[بێ4 + هێز] ١ـ کەم تاقەت و بێقەوەت. ٢ـ بێحاڵ و داماو و نەخۆش.

**بێهێزیی** (حم.)[بێهێز + ئی] ١ـ کەم تاقەتیی، بێقەوەیی. ٢ـ داماویی، بێدەستەڵاتیی.

**بێ ئۆقرە** (ئان. ل)[بێ4 + ئۆقرە] ئارام لێبڕاو، نائارام، حەجمین لێهەڵگیراو. ~ **بوون:** ئارام لێبڕان، حەجمین لێهەڵگیران، نائارام بوون.

**بێ ئەدەب** (ئان. ل)[بێ4 + ئەدەب] ١ـ کەسێک کە ئەدەبی نەبێ، بێتەربیەت. ٢ـ پڕڕوو، بێشەرم، بێچاوەڕوو. ~ **بوون:** ١ـ ئەدەب نەبوون، بێ تەربیەت بوون. ٢ـ پڕڕوو بوون، بێشەرم بوون. ~ **کردن:** بێ تەربیەت بار هێنان.

**بێ ئەدەبیی** (حم.)[بێ ئەدەب + ئیی] ١ـ کار و کردەوەی کەسی بێ ئەدەب، بێتەربیەتیی. ٢ـ پڕڕوویی، بێشەرمیی. ~ **کردن:** ١ـ بێتەربیەتیی کردن. ٢ـ پڕڕوویی کردن، بێشەرمیی کردن.

**بێ ئەزموون** (ئان. ل)[بێ4 + ئەزموون] کەسێک کە ئەزموون و تەجرووبەی لە بابەت شتێکەوە کەمە یا هەر نییەتی. ~ **بوون:** تەجرووبە نەبوون.

**بێ ئەزموونیی** (حم.)[بێ ئەزموون + ئیی] ئاکامی ئەزموون نەبوون، کەم ئەزموون بوون.

**بێ ئەژمار** (ئاک. ل)[بێ4 + ئەژمار] بڕ: بێژمار

**بێ ئەمەگ** (ئان. ل)[بێ4 + ئەمەگ] کەسێک ئەمەگ و چاکەی لە چاو دا نەبێ. // ئەمەگدار. ~ **بوون:** ئەمەگ و چاکە دە چاو دانەبوون، سپڵە بوون.

**بێ ئەمەگیی** (حم.)[بێ ئەمەگ + ئیی] کار و کردەوەی کەسی بێ ئەمەگ، سپڵەیی.

**بێ ئەندازە** (ئاک. ل)[بێ4 + ئەندازە] لە رادە بەدەر، بێحەد. :: ئەو ماڵەی جیرانمان بێ ئەندازە ماڵێکی باش و رێک و پێکن.

**بێ ئەندێش** (ئان. ل)[بێ4 + ئەندێش] بێترس، بێخەیاڵ. ~ **بوون:**



نەترسـان، غـایلە نەبوون. ⁙ برۆ بێ ئەندێش بە، خەیاڵ ماوێژە بەر دڵییە/ حەول و قەوەت بە خولایە، لە خولای واوە کارسازی دیکەت نییە (لاس و خەزاڵ ل ٤٥).

**بێ ئەنوا** (ئان. ل)[بێ4 + ئەنوا] ١- کەسی بێحاڵ و ماڵ. ٢- هەژار، نەدار.

**بێ ئەنوایی** (حم.)[بێ ئەنوا + ئیی] ١- بێماڵ و حاڵیی ٢- هەژاریی، نەداریی.

**بێ ئیراد** (ئان. ل)[بێ4 + ئیراد] هەر شتێک یا کەسێک کە عەیب و کەمایەسی نەبێ. ~ **بوون:** عەیب و کەمایەسی نەبوون.

**بێ ئیقباڵ** (ئان. ل)[بێ4 + ئیقباڵ] کەسێک کە شانس و ئیقباڵی نەبێ، بێ بەخت، بەدشانس. ~ **بوون:** بێ شانس و بەخت بوون، بەدبەخت بوون

**بێ ئیقباڵیی** (حم.)[بێ ئیقباڵ + ئیی] بێبەختیی، شانس نەبوون، بێ شانس بوون.

**بێ ئیمان** (ئان. ل)[بێ4 + ئیمان] کەسێک کە دینی نەبێ، بێدین، بێدین و ئیمان. ~ **بوون:** بێدین بوون، ئیمان نەبوون. ~ **کردن:** لە دین وەرگەڕاندن.

**بێ ئیمانیی** (حم.)[بێ ئیمان + ئیی] ١- بێدینیی. ٢- ناڕاستیی. ٣- خیانەت. ٤- سپڵەیی.

**بێ ئینساف** (ئان. ل)[بێ4 + ئینساف] ١- کەسێک کە لە کار و مەعامەلە و عەداڵەت دا ئینسافی نەبێ، بێویژدان. ٢- زاڵم، زۆردار. ~ **بوون:** ١- ئینساف نەبوون، ئینساف لەبەر چاو نەگرتن. ٢- زاڵم و زۆردار بوون.

**بێ ئینسافیی** (حم.)[بێ ئینساف + ئیی] کار و کردەوەی کەسی بێ ئینساف. ~ **کردن:** ئینساف و عەداڵەت لە بەر چاو نەگرتن، بێ ئینساف بوون.

